# نەخۆشیەکانی پێست














د. محمود فقی رسول

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ پەردوەرگاری گەورە کە یارمەتی دام بۆ نووسینی ئەم کتێبە لەسەر نەخۆشیەکانی پێست.

ئەم کتێبە بە شێوەیەکی زانستی و کورتکراوە دارێژراوە کە نەخۆش لە ڕوانگەیەکی زانستیەوە سوودی لێ وەربگرێت. ناوەڕۆکەکەی بە تەواوی لەسەرچاوە پزیشکیە جیهانیەکانەوە وەرگیراوە.

مەبەست لە نووسینی ئەم کتێبە ئەوەیە کە گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵ کەڵکی لێ وەربگرن، بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە نەخۆشی پێستی درێژخایەنیان هەیە. هەروەها دەتوانرێت وەك سەرچاوەیەکی کوردی پزیشکی لە بواری پێست دا بەکار بهێنرێت لەلایەن کارمەندانی تەندروستی وەك پەرستار، یاریدەدەری پزیشك، پزیشکی گشتی و تەنانەت پسپۆرانی پێستیش.

یەکێك لەو ئاستەنگانەی کە ڕووبەڕووم بۆوە دۆزینەوەی زاراوە پزیشکیەکان بوو بۆ زمانی کوردی، چونکە ئەم کتێبە پێشەنگە کە بە کوردی بنووسرێت.

ئەم کتێبە بەرهەمێکی نوێ و بچووکە بە زمانی کوردی دەربارەی نەخۆشیەکانی پێست و هیوادارم ببێتە خاڵێکی سەرەتایی لە داهاتوودا بۆ نووسین و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی پزیشکی بە زمانی کوردی بۆ گەلەکەمان.

ئەو نەخۆشیانەی کە زۆر باون وەك نەخۆشی بیرۆ، لیردەرکردن، زیپکەی عازەبە، بەڵەکی، نەخۆشی سەدەف، ...تاد، بە تەسەلی  باسم لێ کردوون، بەڵام نەخۆشیە دەگمەنەکان زۆر بە کورتی بە سەریاندا تێپەڕیوم.

لە کۆتایی دا زۆر سوپاسی بەڕێز د. هیوا عمر، پسپۆڕی نەشتەرگەری دەکەم کە زۆر بە دڵسۆزی یارمەتی زمانزانی زاراوە و شێوەی داڕشتنی ڕێزمانی کتێبەکەی داوم.

لەگەڵ ڕێزدا.

دکتۆر محمود فقی رسول

پسپۆڕی نەخۆشیەکانی پێست و زوهری

2011

ناوی کتێب: نەخۆشییەکانی پێست

نووسەر: دکتۆر محمود فقی رسول

بابەت: پزیشکی

ژمارەی لاپەڕە: ٥٦٠لاپەڕە

قەبارەی کتێب: ٢٩.٧سم X ٢١سم

تیراژ: ١٠٠٠دانە

ساڵی چاپ: ٢٠١١

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

مۆنتاژ و فیلم: سامان محمدساڵح

تایپی کۆمپیوتەر: چاپەمەنی ئەزمر

ژمارەی سپاردن: ١٣٩٦ی ساڵی ٢٠١١.

**توێژی باڵق** Adult epidermis، لە سێ جۆر خانەی سەرەکی پێکهاتووە:

١- خانەی کاژ keratinocyte.

٢- خانەی تۆخ melanocyte.

٣- خانەی لانگەرهانس langerhans cells.

خانەی چوارەم (خانەی میرکڵ Merkel cell). لە هەندێك شوێنی پێستدا هەیە، وەك چینی بنکەیی basal cell layer پێست ، بەری دەست و پێ، ناوپۆشی mucosa ناودەم، ئەندامی زاوزێ، دۆشەکەی نینۆك nail bed و داڵانی سەلکی موو follicular infundibulum.

لەبەر ئەوەی زانیاری دەربارەی ئەم خانانە گرنگن کورتە باسێکیان لێدەکەین.

## خانەی کاژ Keratinocyte

خانەی کاژ بریتییە لە خانەی سەرەکی توێژ و ئەرکی تایبەتمەندی دروستکردنی قۆچەکاژ (keratin)ی هەیە کە بریتییە لە پرۆتینێکی دەزوویی ئاڵۆز complex filamental protein کە لە چینی کاژی توێژ (stratum corneum) و پێکهاتە پرۆتینیەکەی نینۆك و مووەدا هەیە. دوو جۆرە ژێر خێزانی جینی کیراتین (کاژ) 2 gene sub families of keratin هەن، ترش و تفت (acidic & basic)، بە کۆبوونەوەی یەك جینی ترش و یەك جینی تفت لە دروستکردنی کیراتین زۆر جار کیراتین لە شانەکاندا tissues دروست دەبێت.

کیراتین بۆ کارە ئاساییەکانی توێژ زۆر پێویستە ، بازدانی mutation جینی کیراتین هۆی ئاشکرای نەخۆشیەکانی پێستە بۆ نموونە: بازدانی جینی کیراتینی ٥، ١٤ دەبێتە هۆی (نەخۆشی توێژ شیبوونەوەی بڵقی سانا – epidermolysis bullosa simplex) و بازدانی جینی بۆ کیراتینی ١، ١٠ دەبێتە هۆی ( زێدە قۆچەکاژی توێژ شیبوونەوە – epidermolytic hyperkeratosis).

شێوەکانی *خانەی کاژ* لە خوارەوە بۆ سەرەوە لە چینەکانی توێژدا دەگۆڕێت:

توێژ لە چوار ( لە هەندێك شوێنی لەشدا لە پێنج) چین بەم شێوەیە پێکهاتووە (لە خوارەوە بۆ سەرەوە):

١- **چینی بنکەیی** Basal cell layer (Stratum germinativum)

بریتییە لە چینێك لە خانەی ستونی columnar cells، خانەکە ناوکی گەورەی تۆخی large dark staining nuclei هەیە و سایتۆپلازمی خەست dense cytoplasm کە ژمارەیەکی زۆر لە رایبۆزۆم (ribosoms) و باقەی دەزووی وردی tonofilament bundles تێدایە. هەندێك جار ٢-٣ چین خانەی بنکەیی وەك لە بەری دەست و پێ و توێژی

زێدەپەرەسەندوودا hyper proliferative epidermis هەن. دوای باسکردنی چینەکانی توێژ بە دوور و درێژی باسی ئەرکەکانی ئەم چینە بنکەییە دەکەین. (وێنەی ٢)




وێنەی (٢) چینەکانی پێست – وردبینی ئەلیکترۆنی (راست) – رۆشنە وردبین (چەپ)

## ٢- چینی درکی Prickle cell layer (Stratum spinosum)

خانەکانی ئەم چینە لەلایەن چینی بنکەییەوە دروست دەبن، قەبارەیان لە خانەکانی چینی بنکەیی گەورەترە و کیراتین دروست دەکەن و بە توندی بەیەکەوە ،بە درکی سەر رووی دیواری خانەکانیان، بەستراونەتەوە کە بریتین لە دەرپۆقینی سایتۆپلازم بە شێوەی درکی بچووك، ئەم درکانە لەگەڵ دێسمۆسۆم و چیمەنتۆی نێوان خانەکان (کە لە گلایکۆپرۆتین و لایپۆپرۆتین پێکهاتووە) سایتۆپلازمی خانە دراوسێکان بە یەکەوە دەلکێنن ،بەم جۆرە تۆرێکی تێکسمڕاو لە خانەکان دروست دەبێت.

دێسمۆسۆم desmosomes بریتییە لە خاڵی توندکەری تایبەتمەند کە دێسمۆپلاکین و دێسمۆگلاین و دێسمۆکۆڵینی تێدایە.

تۆنۆفیلەمێنتەکان tonofilaments (دەزووە وردەکان) بریتین لە دەزووی بچووك کە بە ناو سایتۆپلازمدا بۆ دێسمۆسۆمەکان دەکشێن و بە شێوەی چەپك (گورزە) پەستێوتراون و پێیان دەوترێت تینەدەزوولە tonofibrils (تۆنۆفیبریلەکان).

دەزگای گۆڵجی Golgi apparatus زۆر لە دەنکۆڵە پیازیەکان lamerllar granules (تەنەکانی ئۆدلاند Odland bodies) لە بەشی سەرەوەی ئەم چینەدا دروست دەکەن. ئەم دەنکۆڵانە ناوەرۆکەکانیان {پۆلیسەکەراید، ئەنزیمی ئاوشیکەرەوە hydrolytic enzymes و گورزە چەوری پەستاوتراو کە بریتین لە فۆسفۆلپید، شەکر، کۆڵیستیرۆڵ و گلوکۆزیل سیرەماید} فرێدەدەنە نێوانەخانەکان و دەبنە پێش پێکهاتەی چەوری لە نێوان خانەکانی چینی کاژ.

### ٣- **چینی دەنکۆڵەیی** Granular cell layer (Stratum granulosum)

ئەم چینە لە ٢-٣ ریز خانە دروستبووە و خانەکان پان بوونەتەوە بەڵام تینەدەزوولەی پترە، ئەم خانانە دەنکۆڵەی تفتی خواروخێچی گەورەیان تێدایە کە پێی دەوترێت دەنکۆڵەی شووشەکاژی keratohyaline granules کە لەگەڵ تۆنۆفیبریلەکان tonofibrils پاڵپشتن، ئەم دەنکۆڵانە پرۆتینی (profilaggrin, loricrin, involucrin) تێدایە و لە بەشی سەرەوە دەشکێن و ناوەرۆکەکەیان لە ناو سایتۆپلازمدا بڵاودەبێتەوە و دەبێتە هۆی دروستبوونی زەرفی کاژ horny envelope کە بەرگێکی ئەستوورو رەقە و پرۆتینەکانی بریتین لە involucrin & loricrin.

### ٤- **چینی کاژی** Keratin cell layer (Stratum corneum)

لە چەند ریزێکی پەستاوتراو لە خانەی پانبووەوەی مردوو ( واتا خانەی کاژ corneocytes) پێکهاتووە، ئەم ریزە پەستاوتراوانە بەهۆی چەوری نێوان خانەکان بە یەکەوەلکاون. سایتۆپلازمی خانە کاژەکان لەگەڵ دەزووە کاژەکان keratin filaments بەیەکەوە پەستاوتراون و لە ناو ناواخن (matrix)دایە و بە زەرفی کاژ دەوردراوە. ئەم زەرفە کاژە لەگەڵ کاژی پەستاوتراو خانەی کاژ پتەودەکات و بەم جۆرە پێست دەتوانێت بەرهەڵستی زەبری میکانیکی و کیمیکی بکات.

خانەی کاژ لە باری ئاساییدا بە هۆی کاری ئەنزیمەکان کە لە ناو دەنکۆڵە پیازیەکان lamellar granules و لایسۆزۆمەکانی lysosome خانە دەنکۆڵەییەکاندا granular cells هەن ناوك و ئەندامۆکەکانی ناو سایتۆپلازمی تێدا نەماوە.

لە پرۆسەی process توێژ فڕێداندا (کاژەوەرێ دا) desquamation چەوری lipid نێوان خانەکان و پردە دێسمۆسۆمەکان شیدەبنەوە.

### ٥- **چینی روون** Stratum lucidum

ئەم چینە تەنیا لە بەری دەست و پێ دا هەیە و دەکەوێتە نێوان چینی سێ و چوار، خانەکانی ئەم چینە ناوکیان هەیە و بە خانەی کاتی دادەنرێن.

**پرۆسەی (کۆتایی) کاژ دروستکردن:** چەند گۆڕانکارییەکن لە کاژ (کیراتین)، پرۆتینی زەرفی کاژ، گلایکۆپرۆتینی پەردەی پلازما، چەوری نێوان خانەکان، دێسمۆسۆمەکان و پرۆتینە لکێنەکانی

خانەکان. لە ژیانی باڵقیدا کاژ فرێدان و دروستبوونەوەی خانە کاژەکان لەلایەن چینی بنکەییەوە هاوسەنگ دەکرێن.

**شانەکانی لەش لەبارەی خۆنوێکردنەوە (لە باڵقدا)**

سێ جۆرن:

دەمارەکان nerves و ماسوولکە پەیکەریەکان skeletal muscles خانە دابەشبوونیان نییە و ئەگەر بە نەخۆشی یان زەبر بریندار بن ئەوە هەروا دەمێننەوە و خانە لەبەرخستنەوە روونادات.

نوێکردنەوەی هەلی (conditioned renewal)، بۆ نموونە خانەی جگەر لە باری ئاساییدا دابەش cell devision نابێت بەڵام دوای برینداربوون injury خۆی نوێ دەکاتەوە.

نوێ بوونەوەی بەردەوام continuous cell turn over ، لە هەندێك شانەی لەشدا وەك پێست و پەردەی ناوپۆش mucosa (وەك ناودەم، ریخۆڵە و گەدە – تاد) بە هەمیشەیی روودەدات، چونکە خانەکان تەمەنیان کورتە short life span و لە دایکەخانەوە stem cells بە خانەدابەشبوون خانەی نوێ دروست دەبێت.




**وێنەی (٣) هێلکاری سووڕی خانە**

**سووڕی خانە Cell cycle**

چونکە سووڕی خانە لە پێستدا گرنگە بە کورتی باسی دەکەین، سووڕی خانە چوار قۆناغە:

١- قۆناغی G1 (کەلێنی ١) Gap 1 phase: ئەم قۆناغە کاتەکەی نادیارە و قۆناغی گەشەیە، ئەگەر هەژانێك روویدا خانە دەچێتە قۆناغی ٢. (وێنەی ٣)

٢- قۆناغی دروستکردن Synthesis phase (S): خانە دەچێتە ناو لەبەرگرتنەوەی DNA (دووهێندەبوونی DNA) DNA-replication و لە خانەی کاژی بنکەییدا basal keratinocytes ٧-١٦ کاتژمێرە و DNA کرۆمۆسۆمەکان لەبەری دەگیرێتەوە DNA replication.

٣- قۆناغی G2 (کەلێنی ٢) Gap phase 2: ٦-٨ کاتژمێرە، خانەکە پتر گەشەدەکات و قۆناغەکانی کۆتایی دابەشبوونی خانە تەواو دەکات.

٤- قۆناغی M – Mitosis phase: ١-٢ کاتژمێرە، دوو خانەی نوێ دروست دەبن، ئەم خانە نوێیە یەکێك لەم سێ رێگایانە دەگرێت:

أ- دەچێتەوە سووڕێکی نوێی خانە.

ب- تایبەتمەنددەبێت differentiation و بەرەو سەرەوە بۆ خانەی دڕکی prickle cell کۆچ دەکات.

ج- دەچێتە قۆناغی پشوودان G0 (کەلێنی سفر).

لە قۆناغی G0 خانە پشووی داوە و بەرەو پێشەوە ناچێت هەرچەندە کاردانەوەی بۆ هەژان لە کاتی پێویستدا هەر تێدایە (واتا لە کاتی هەژاندا دەچێتە سووڕێکی نوێی خانە).

سووڕی خانە ٥٠-٢٠٠ کاتژمێرە.

## بزووتی توێژ Dynamics of epidermis

لە توێژی باڵقدا دابەشبوونی خانە cell devsion پێویستە بۆ لەبەرخستنەوەی ئەم خانانەی کە بە کاژ فڕێدان نامێنن (مردنی خانە – apoptosis)، لەناوچوونی ئەم خانانە دوو جۆرە، یان سروشتییە (کاژفڕێدان desquamation) یان بەهۆی بریندداربوون injury ڕوودەدات. لە توێژی ئاساییدا دوو جۆر دایکەخانە stem cells هەن، یەکێکیان لە چینی بنکەییدا و ئەویتر لە سەلکی موودایە.

لە چینی بنکەییدا ٣ جۆر خانە هەیە: ١) دایکەخانە: ڕێژەی ٣,٥٪ی خانەکانی چینی بنکەیین، ئەم خانانە سووڕی خانەی سستیان (لەسەرخۆیان) slow cell cycle هەیە و بە بەردەوامی دابەش دەبن devide و دەبنە هۆی دروستبوونی ٢- خانە گەورەکەری کاتی transient amplifying cells: کە ڕێژەی ٩٠٪ی خانەکانی چینی بنکەیین، یەك دایکە خانە لەگەڵ نۆ لەم خانانە یەکەی زۆربوونی توێژ epidermal proliferative unit پێکدەهێنن، ئەم خانانە توانایەکی سنوورداریان (محدود) بۆ چەند کەڕەتێك بۆ دابەشبوون هەیە و دەبن بە ٣- خانەی تایبەتمەند diffentiated cells: کە ڕێژەی ٦,٥٪ی خانەکانی چینی بنکەیی پێکدەهێنن و دەچنە ناو چینی دڕکی و بەرەو سەرەوە بۆ پرۆسەی کاژاندن دەڕۆن.

ئەم پرۆسەی بزووتی توێژە ٥٢-٧٥ ڕۆژ دەخایەنێت، کەمبوون و پتربوونی ئەم کاتە لە نەخۆشیدا ڕوودەدات، بۆ نموونە نەخۆشی کاژۆکی (کاتەکە کورت دەبێتەوە) و نەخۆشی ماسی (کاتەکە درێژ دەبێتەوە).

لە سەلکی موودا، دایکەخانەکان stem cells لە ناوچەی هەڵئاوساو bulge region دا هەن، ئەم دایکە خانانە ئەگەر هەژانی دابەشبوونیان وەرگرت دابەش دەبن و دەستبەکاردەبن و کچەخانەکان daughter cells دەدەن بە (١) چینی بنکەیی لە کاتی بریندداربوون( وەك

سووتان) بۆ دروســـتکردنەوەی پێســـت، (٢) ناواخنی hair matrix سەلکی موو کە لە گۆی بن توێژە dermal papilla بۆ دروستکردنەوەی مووی نوێ (٣) گلاندە چەوریەکان.

## ڕێکخستنی نوێ بوونەوەی توێژ Regulation of epidermopoesis

وەك وتمان ژمارەی خانەکانی توێژ و ئەستووری توێژ( بەهۆی هاوســەنگی کــاژکردن و فرێـدانی کاژ و دروستبوونی بەردەوامی لـە دایکەخانەکان) چەسپ و سەقامگیربووە.

دوو جۆر هۆکاری گەشەپێدان growth factors و گەشەوەستێن growth inhibitors ئەم کارە ئەنجام دەدەن ( کە بریتین لـە خانەبزوێنە جێیەکان local cytokines و هۆکارە گەشەهێن و هۆرمۆنەکان).

## خانەی تۆخ Melanocyte

سەرچاوەی ئەم خانەیە پۆپنەی دەمارە neural crest کە لـە حەفتەی هەشتەمی ژیانی کۆرپەلـە لـە توێژدا دەبینرێت.

ئەم خانەیە لـە توێژ، ســەلکی مــوو، تــۆڕی چــاو retina و مــۆخ pia arachnoid (نەرمــە پەردەی مێشك) دا هەیە، لـە پێستدا لـە چینی بنکەییدا هەیە، لە نێوان هــەر دە خانــەی بنکەیــیدا یــەك خانەی تۆخ هەیە و خانەلکێن نییە، بۆیە بە خانەکانی دەورووپشتی نەلکاوە.

یەکەی میلانینی توێژ epidermal melanine unit لە یەك خانەی تۆخ و ٣٦ خانەی کاژ پێکدێت.

ڕەن

خانەی تۆخ لقدارە dendritic و ( ڕەنگی بۆیەی ) دروست دەکات لـە ژێر کاریگەری:

١- هۆکارە تواوەکان soluble factors کە خانەی کاژ keratinoyte دروستیان دەکات و دەبنە هۆی پڕبوونی خانەی تۆخ و لقەکانی و تۆختربوون.

٢- هۆرمۆنی هەژێنی خانەی تۆخ melanocyte stimulating hormone (M.S.H).

٣- هۆرمۆنی سێکسی sex hormons.

٤- گوێزەرەوەکانی سۆ inflammatory mediators.

٥- ڤیتامین D3 لـە پێستدا.

خانەی تۆخ لقەکانی دەخاتە ناو سایتۆپلازمی خانــەی کــاژ و ئــەمیش دەیقرتێنێــت و بــەم شــێوەیە خانەکاژەکان ڕەنگ (بۆیەی میلانین) وەردەگرن، ڕەنگەکە لـە خانە کاژەکانی خوارەوەدا زۆرە ، بەڵام بەرەوسەرتر بەهۆی ئەنزیمی شیکەرەوە lytic enzymes کــەم دەبێتــەوە تــا لــە توێکڵــە کاژەکــانی کۆتایی سەرەوە ڕەنگ (میلانین) نامێنێت.

دوو جۆر رەنگی میلانین هەن:

١- ئیومیلانین Eumelanine: رەنگی قاوەیی یان رەشە، چونکە ئەندامۆکـەکانی (organells) کە پێیان دەوترێـت میلانۆسـۆمەکان melanosomes لـە نـاو سـایتۆپلازمی خانـەی تۆخـدا هێلکەیی هەڵکەوتوون و بە شێوەی پیازە درێژە بۆیەکەی تێدایە، ئەم میلانۆسۆمانە تاك تـاك لـە ناو سایتۆپلازمدان و گەورەن و ژمارەیان زۆرە.

٢- فیۆمیلانین Phaeomelanin: رەنگی سوور و زەردە، میلانۆسۆمەکان بچووکن و خڕن و بە کۆمەڵ بە یەکەوەن لە ناو پەردەدان.

جۆری ئیومیلانین پێستی گەنم رەنگ و قژی رەش دێنێتە کایەوە، بەڵام فیۆمیلانین پێستی سـپی و قژی زەرد و سوور دێنێتەکایەوە.

کاری میلانین بریتییە لە پاراستنی پێست لە تیشك.

## خانەی مێرکل Merkel Cells

ئەم خانەیە لـە ناو چینی بنکەیی یان نزیکی ئەم چینەدا هەیە، قەبارەی نزیکی قەبارەی خانەی کاژە و پتر لـە نزیك سەلکی موودا هەیە، لـە ناو سایتۆپلازمەکەیدا دەنکۆڵـەی خـڕی دەورەدراو بـە پـەردە membrane bound spherical granules هـەن، ئـەم خانانـە لقیـان نییـە non-dendritic بـەڵام دێسمۆسۆمێکی کەم بە خانە کاژەکانی دراوسێ دەیانبەستێتەوە و ناوکێکی پێچاوپێچی تێدایە و هەستی سووك fine touch بۆ دەمارەکانی ژێر توێژ دەگوازێتەوە و کیراتینی ٢٠ تەنیا لـەم خانانەدا هەیە.

## خانەی لانگەرهانس Langerhans cells

ئـەم خانانـە رێـژەی ٣-٥٪ی چـینی درکـی پێکـدەهێنن و لقیـان هەیـە dendritic بـەڵام بـە دێسمۆسۆم بە خانە کاژەکانەوە نەلکاون و لـە نێوان خۆیاندا تۆڕێکی "بەهۆی لقەکانیان" تـەواو پێـك دەهێنن، ناوکی ئەم خانەیە پێچاوپێچە و لـە ناو سایتۆپلازمدا دەنکۆڵەی شێوە رەکتەی تێنسی Tennis raquet تێدایـە و پێـی دەڵـێن دەنکۆڵـەی بیربیـك birbecq granules . کـاری ئـەم خانەیـە لـە جێبەجێکردنی سیستمی بەرگری جۆری ٤ دا زۆر گرنگە.

## لکینی توێژو بن توێژ Dermo-epidermal junction

لکانی توێژ و بن توێژ بریتییە لە ناوچەی پەردەی بنکەیی basement membrane zone (BMZ)، ئەم پەردەیە لە چوار بەش پێکهاتووە: (وێنەی ٤)

١- پەردەی پلازمای خانەی بنکەیی لەگەڵ نیوە دێسمۆسۆمەکانیاندا hemidesmosomes کە دوو پرۆتینی سەرەکییان (Bp 180 & Bp 230) تێدایە لەگەڵ B4 integrin.

٢- بەرینەی (پەڕەی) ڕوون Lamina Lucida: لە ناو ئەم بەشەدا چەندین دەزووی توندکەر anchoring filaments بە شێوەیەکی ئەستوونی بەشی یەکەم و سێیەم بەیەکەوە دەبەستنەوە. ئەم بەرینەیە لامینین laminin (لامینین I و لامینین 5) و ئیناکتینی enactin تێدایە، ئەمانە مژادی جەوین (کەتیرەیین) بۆ بەیەکەوە لکاندنی بەشی یەك و سێ.




وێنەی (٤) پێکهاتەی گەردی لکینی توێژ و بن توێژ

٣- بەرینەی خەست Lamina densa: پێکهاتە سەرەکییەکەی کۆلاجینی چوارە Collagen IV کە لە لایەن خانەی بنکەییەوە دروستبووە.

٤- بەرینەی تۆڕی ریشاڵی Lamina fibroreticularis: پێکهاتووە لە:

أ) وردە ریشاڵی توندکەر Anchoring fibrils: (کە زۆربەی ئەم بەرینەیە پێکدەهێنێت) و پێکهاتەکەی کورتی کەوانەیین و لەسەرەوە دەچێتە ناو بەرینەی خەست و لە خوارەوە دەکشێتە ناو بەشی سەرەوەی بن توێژ. کۆلاجینی VII پرۆتینی ئەم بەشەیە.

ب) وردە ریشاڵۆکەی جیڕ Elastic microfibrils: بە شێوەی تاك و پرچ لەگەڵ وردە ریشاڵۆکە جیڕەکانی بن توێژ دەئاڵۆسکێت.

ج) ریشاڵی کۆلاجینی بچووکی تاك Single small collagen fibers: **کۆلاجینی I و کۆلاجینی III ی تێدایە.**

**ئەرکی ئەم پەردەی نێوان توێژ و بن توێژە بریتییە لە:**

١- پاڵپشتی میکانیکی **بۆ یارمەتیدانی: أ) پێکەوە لکاندنی، ب) گەشەکردنی، ج) پێگەیشتنی و د) هەڵچوونی – خانە بنکەییەکانی سەرووی خۆی.**

٢- نیمچە پاڵێوەر Semipermeable filter، **بۆ ڕێکخستنی گواستنەوەی خۆراك و خانەکان لە بن توێژەوە بۆ توێژ.**

# **پاشکۆکانی توێژ** Epidermal appendages (Adnexia)

1- **درشتە گلاندی ئارەق** Eccrine sweat glands.

2- **گەندە گلاندی ئارەق** Apocrine sweat glands.

3- **چەوریە گلاندی موو** Pilosebaceous glands.

**هەرسێکیان( دوای نەخۆشی و برینداربوون و سووتان – تاد) بەشداری لە دروستکردنەوەی خانەکانی توێژ دەکەن.**

**درشتە گلاندی ئارەق**

**ژمارەیان لە پێستدا ٢-٥ ملیۆنە ، لە بەری پێدا ڕێژەیان زۆرە "٦٢٠/سم٢" و لە پشتدا کەمە "٦٤/سم٢". لە دوو بەش پێکدێت:**

١- **پێچراوە لوولەی ڕژێن** Secretory coil، **دەکەوێتە بەشی خوارەوەی بن توێژ و بەشی سەرەوەی شانەی ژێر پێست، دوو بەشە:**

أ) ڕوپۆشەخانەی ناوەوە **کە دوو جۆر خانەی تێدایە:**

١- خانەی گەورەی کاڵ Large pale cells، **ئەمانە گلایکۆجینیان زۆرە و بە ئارەق دروستکردن تایبەتمەندن.**

٢- خانەی بچووکی تاریك Small dark cells.

ب) **ماسولکەڕووپۆشەخانە (Myoepithelial)، ئەمە بەشی دەرەوەیە.**

٢- بۆری ئارەق Sweat duct: **لە پێچراوە لوولەی ڕژێنەوە تا ڕووی پێست بۆ "کونی ئارەق sweat pore" بەرز دەبێتەوە، لە بن توێژدا ڕاستە بەڵام لە توێژدا لوولەی پێچاوپێچە coiled، ئەم بۆریە بە چالاکی سۆدیۆم هەڵدەمژێتەوە بۆ ئەوەی کەمتر سۆدیۆم لە دەست بچێت (کە زۆرە لە شلەی ئارەقی دروستبووی ناو گلاندەکە).**

ئەم رژێنانە لە هەموو پێستدا هەن، بەڵام ژمارەیان لە بەری دەست و پێ و ناوچەوان و ژێر باڵ دا زۆرە. دەماری رژێنەکە جۆری وزەکۆلینییە cholinergic.

**ئارەق پێکهاتووە لە:** ئاو، خوێ NaCl، لاکتەیت lactate، ئامۆنیا، ترشە ئەمینەکان amino acids، پرۆتین و پرۆتین شکێن proteases.

**کاری درشتە گلاندی ئارەق Functions:**

١- رێکخستنی پلەی گەرمای لەش.

٢- رشتنی ئارەق لە کاتی سۆز و هەڵچووندا، بە تایبەتی لە بەری دەست و پێ و ژێر باڵ و ناوچەواندا (ئارەقکردنەوەی سۆزی emotional sweating)، ئەوەی شایانی باسە لە ئەوپەڕی هەژاندا maximum stimulation ١٢ – ١٥ لتر ئارەق لە شەو و ڕۆژێکدا دەردەچێت.

## گەندە گلاندی ئارەق Apocrine sweat glands

ئەم گلاندە (رژێنە) لە بەشی سەرەوەی سەلکەموو دەڕوێت، لە دوو بەش پێکهاتووە:

١- بۆری راست Straight duct: کە دەکرێتەوە ناو دالانی سەلکەموو follicular infundibulum و لە دوو چین خانەی خشتەکی پێکهاتووە.

٢- پێچراوە لوولەی رژێن Secretory coil: کە دەکەوێتە لکینی junction بن توێژ و ژێر پێست، لە یەك چین خانە پێکهاتووە کە بە چینی ماسوولکەرووپۆشەخانە myoepithelium دەور دراوە.

**پێکهاتەی گەندە ئارەق:** پرۆتین، کاربۆهیدرات، ئامۆنیا، چەوری و ئاسن Fe. گەندە ئارەق شیرییە milky، کە لە ناو گلاندەکەدا دروست دەبێت بێ بۆنە بەڵام لەسەر رووی پێست بەهۆی کارتێکردنی بەکتریاوە بۆن پەیدادەکات.

ئەم ئارەقە بە دوو جۆر (هۆ) دەرژێت:

١- بەهۆی دەماری وزەئەدرینال adrenergic nerve stimulation.

٢- بەهۆی مژادی ئەدرینالین و هەندێك پۆلیپیپتایدی چالاکی ریخۆڵەیی active intestinal polypeptides.

**ئەم رژێنانە لەم شوێنانەدا هەن:** ژێر باڵ، مەمیلە areola، دەوروبەری کۆم و ئەندامە سێکسیەکان، بۆری دەرەوەی گوێچکە و پێڵووی چاو. دوای باڵق بوون چالاك دەبن.

**ئەرکەکانی (کارەکانی):**

١- دروستکردنی بۆن کە لەوانەیە راکێشەری سێکسی بێت.

٢- نیشانەی وریاکەرەوە لە باری ترس و تووڕەبوون و سۆزدا.

٣- پڕکردنی بەرهەڵستی لێخشاندن frictional resistance.

٤- پڕکردنی هەستی بەرکەوتن increase tactile sensation

## چەوریە گلاند Sebaceous glands

لە ژیانی کۆرپەلەدا وەك دەرپەڕینێك (دەرەگەشەیەك) out growth لە بەشی سەرەوەی سەلکی موودا دروست دەبن.

**پێکهاتەی:** لە چەند پلۆکەیەك (لۆچکەیەك) lobules دروستبوون و لە خانەی کاڵ pale cells پێکهاتوون کە بڕێکی زۆر دڵۆپە چەوریان lipid droplets لە ناو سایتۆپلازمدا تێدایە و بە خانەی تفتی وەبەرهێنەرbasaloid germinative cells دەور دراون کە خانەی جۆری یەکەم (خانەی کاڵ) دروست دەکەن.

خانە کاڵەکان لەگەڵ دڵۆپە چەوریەکان لە ڕێی بۆری ڕژێنە چەوری sebaceous duct بە بەردەوامی بۆ ناو دالآنی سەلکەموو follicular infundibulum، کە بۆریەکی کورتە ،فڕێ دەدرێنە دەرەوە.

ڕژێنە چەوریەکان بە چڕیەکی زۆر لە دەمو چاو و سەردا هەن، بەڵام جگە لە بەری دەست و پێ لە هەموو لەشدا هەن.

هەمیشە لەگەڵ سەلکەمووودان و بە یەك کون pilosebaceous opening لەسەر رووی پێست دێنە دەر بەڵام لە چەند شوێنێکی لەشدا بەیەکەوە نایەنە دەرەوە، وەك: لێواری پێڵووی چاو، ناودەم، لێواری دەرەوەی لێو، پێستی خەتەنە prepuce، لچی بچووکی کیلەك labium minora و مەمیلەی مەمکی مێینە female areola.

**چالاکی** لە کۆرپەدا new born زۆرە ، پاشان وردە وردە کەمدەبێتەوە و لە ٢-٦ ساڵیدا سست دەبێت. لە تەمەنی ٧ ساڵیدا چالاکتر دەبێتەوە تا باڵقبوون، لە تەمەنی بیستەکان بە ڕێژەی ٢٣٪ بۆ هەر ١٠ ساڵ لە تەمەن کەمدەبێتەوە.

**پێکهاتەی چەوری سەرپێست لە باڵقدا:**

پێکهاتووە لە: سکوالین squalene، کۆڵیستیرۆڵ cholesterol، ئیستەری کۆڵیستیرۆڵ cholesterol esters، ئیستەری مۆم wax esters و ترایگلیسراید tryglycerides. بەهۆی بەکتریا

لە ناو بۆری رژێنە چەوریەکان هەندێك لە کۆلیستیرۆڵ دەگۆرِرێت بۆ: ترشە چەوریە سەربەخۆکان free fatty acids لەگەڵ مۆنۆگلیسراید monoglycerides و دایگلیسراید diglycerides.

**هۆکارەکانی** قەبارە و کاری چەوریە گلاندەکان رێکدەخەن ئەمانەن:

١- هۆرمۆنی نێرینە Androgenes: رژێنەکان گەورە و چالاك دەکەن.
٢- رێتینۆیدەکان Retinoids: وەك ئایزۆترێتینۆین isotretinoin بە پێچەوانەی ئەندرۆجین، قەبارە و چالاکی رژێنە چەوریەکان زۆر کەم دەکەنەوە.
٣- میلانۆکۆرتین Melanocortins: وەك هۆرمۆنی هەژێنی خانەی تۆخ (M.S.H.) melanocyte stimulating hormone و ئەدرینۆکۆرتیکۆترۆفین ACTH، چالاکیەکان پتر دەکەن.

## سەلکەموو Hair follicles

لە مرۆڤدا موو فرمانی function زۆر گرنگی نیە بەلام چەند ئەرکێك دەبینێت:

١- گرنگی دەروونی Psychological importance: بۆ نموونە رووتانەوەی موو بە هەموو جۆرەکانییەوە یان پتربوونی موو لە دەموچاو و لەشی مێینەدا کاریگەری دەروونی هەیە.
٢- برۆ و برژانگ و مووی ناولووت و بۆری گوێچکە، ئەرکی پارێزگاری و پاککردنەوە دەبینن.
٣- قژەسەر پارێزگاری پێستی سەر لە تیشك دەکات.
٤- ئەندامێکی هەستی یە، بەهۆی ئەوەی زۆر دەمار لە سەلکی موودا هەیە هەست بە پەستان pressure لەسەر موو دەکرێت.
٥- جوانی: بەشێکە لە جوانی لەش و راکێشانی سێکسی.

### دروستبوونی موو

لە حەفتەی نۆیەمی ژیانی کۆرپەلە دا موو لە برۆ و سمێڵ و چەناگە دروست دەبێت و لە مانگی ٤-٥ دا هەموو سەلکەمووەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوەی لەش دروستبوون.

موو بە رِیزی rows سیانی دروست دەبێت: مووی ناوەراست مووی بنەرِەتییە primary follicles و دوو مووەکەی راست و چەپیشی لاوەکین(دووەمین) secondary follicles.

لە ژیانی ئاسایی مرۆڤدا هیچ سەلکەمووی نوێ دروست نابێت، بەڵکو بە درێژایی ژیان ژمارەی مووەکان کەمدەبنەوە بەهۆی:

١- کەمبوونەوەی سەلکەمووە لاوەکیەکان (دووەمییەکان).

٢- کەمبوونەوەی چڕی موو بەهۆی پێستکشان (گەورەبوونی ڕووی لەش surface area).

**لە ژیانی کۆرپەلەدا** لە یەك لای سەلکەمووی کۆرپەلە foetal H. follicle دوو چرۆ two buds دروست دەبن ، ئەوەی سەرەوە دەبێت بە ڕژێنە چەوری و ئەوەی خوارەوەش دەبێت بە لکینی (لکانی) attachment ماسولکەی ڕەپکەری موو arrector pilli muscle، لە هەندێك شوێنی لەشدا چرۆی bud سێیەم لەلای پێچەوانەی سەلکەمووە ساواکە دروست دەبێت و دەبێت بە گەندە گلاندی ئارەق apocrine gland.

## بەشەکانی موو

١- دالآن Infundibular segment: بریتییە لە قەدی موو لە نێوان کونی موو لەسەر ڕووی پێست تا پێوەلکانی بۆری چەوری sebaceous duct بە قەدی مووەکەوە.

٢- کەمەر Isthmus: بریتییە لە بەشی نێوان لکینی بۆری چەوری تا لکینی ماسولکەی ڕەپکەری موو.

٣- بەشی خوارەوە Inferior portion: بریتییە لە بەشی خوار کەمەر، ئەمیش دوو بەشە: خوارترین بەشی سەلکەموو + پیازەی موو hair bulb.

## پێکهاتەی موو Hair structure

أ) **بڕگەی پانی (مقطع عرضي)** Horizontal section: لە بڕگەی پانیدا موو بە شێوەی چەند بازنەیەکی هاوچەق concentric rings لە دەرەوە بۆ ناوەوە بەم شێوەیەی خوارەوە دەردەکەوێت:( **وێنەی ٥**)

١- پەردەی شووشەیی Glassy membrane، بریتییە لە پەردەیەکی بێ خانە acellular membrane.

٢- بەرگی دەرەوەی ڕەگی موو Outer root sheath: لە سەرەتاوە یەك چین خانەیە کە لە پیازەی مووەوە دەست پێدەکات بەڵام بەرەو سەروتر لە چەند چینێك خانەی خشتەکی پێکهاتووە، لە ئاستی چەوریە گلاند تا سەر ڕووی پێست پێکهاتەکەی وەك کاژ وایە.

٣- بەرگی ناوەوەی ڕەگی موو Inner root sheath: ٣ بەشە، چینی هینلیس henles، چینی هوکسلیس huxles و پێستۆکە (توێژەڕەقە) cuticle.

٤- قەدی موو Hair shaft: ٣ بەشە:

أ) توێژە ڕەقە (پێستۆکە) Cuticle، لەگەڵ پێستۆکەی بەرگی ناوەوەی ڕەگی موو بەیەکەوە بەستراون.

ب) توێکل Cortex، زۆربەی قەدی موو پێکدەهێنێت.

**برگەی درێژی موو**




**برگەی پانی موو**




**وێنەی ( ٥ ) سەلکەمووی مرۆڤی باڵق**

ج) نیان یان کرۆك Medulla.

ب) **برگەی درێژی (مقطع طولی)** Longitudinal section: **حەوت بەشە:**

١- کەناڵی موو Hair canal: لە ڕووی پێست دەست پێدەکات تا لکینی توێژ و بن توێژ dermo-epidermal junction.

٢- داڵانی موو.

٣- لکینی ڕژێنە چەوری بە سەلکی موو.

٤- کەمەری موو.

٥- ناوچەی هەڵئاوساوی موو Bulge area: شوێنی لکینی ماسولکەی ڕەپکەری مووە، ئەم ناوچە هەڵئاوساوە دایکەخانەی stem cells سەلکی مووی تێدایە و تا قوڵترین شوێنی سەلکەموو دەڕوات.

٦- سەلکی خوارەوە Lower follicle: دەکەوێتە نێوان ناوچەی هەڵئاوساو و پیازەی موو.

٧- پیازەی موو Hair bulb: قوڵترین شوێنی سەلکەمووە، وەك زەرف دەوری گۆی سەلکی follicular papilla داوە.

**ئەوەی شایانی باسە** بەشی خوارەوەی inferior portion سەلکەموو کە دەکەوێتە خوار کەمەری موو لە شێوەی سووڕدا وەپاش دەچێتەوە involution و نوێ دەبێتەوە regeneration .

موو بە شێوەیەکی نائەستوونی بە پێستەوە رواوە و لە کاتی هەڵلەرزیندا بەهۆی سەرما یان تا ماسولکەی ڕەپکەری موو گرژدەبێت و موو دەخاتە شێوەی ئەستوونی بەمەش باشتر گەرمی ناو لەش دەپارێزێت.

**ژمارەی سەلکە مووەکان** لە باڵقدا ٥ ملیۆن سەلکەمووە، یەك ملیونی لەسەر و دەمو چاودایە و سەد هەزاری لە پێستی سەردایە.

**چڕی سەلکە مووەکان،** لە ڕوومەت و ناوچەواندا ڕێژەیان بریتییە لە ٨٠٠ موو/سم٢ و لە لاقدا ٥٠موو/سم٢.

**کیراتینی** موو بریتییە لە پرۆتینی کیراتینی ڕەق hard keratin چونکە گۆگردی sulphur زۆر تێدایە بە پێچەوانەی کیراتینی نەرم soft keratin کە گۆگردی کەمە و لە کاژی پێستدا هەیە.

## سووڕی موو Hair cycle

بە درێژایی ژیان موو بە سێ هەنگاودا، بێ پشت بەستن بە مووەکانی دراوسێی، دەڕوات (مووەکان لە چەند کاتێکی جیاوازدا سووڕەکەی خۆیان دەبەنەسەر)( **وێنەی ٦**).



(أ) (ب) (جـ)

**(وێنەی ٦ ) سووڕی گەشەی موو:**

**أ ) هەنگاوی گەشەکردن. ب ) هەنگاوی وەپاش چوونەوە. جـ ) هەنگاوی پشوودان**

١- هەنگاوی گەشەکردن Anagen: قۆناغی گەشەکردنی چالاکە بۆ موو دروستکردن کە بۆ هەر موویەك لە مووی سەردا ٢-٦ ساڵە ، لە مووی لاقدا ١٩-٢٦ حەفتەیە ، لە مووی قۆڵدا٦-١٢ حەفتەیە و لە سمێڵدا٤-١٤ حەفتەیە. ئەوەی شایانی باسە تا کاتی ئەم قۆناغە درێژتربێت درێژی مووەکان لە مرۆڤدا پترە.

٢- هەنگاوی وەپاش چوونەوە Catagen: لەم قۆناغەدا خانەکانی پێشوو دەمرن apoptosis و مووەکە لە بنکەی قەدی مووەوە زەرد و لاواز دەبێت و کۆتایی مووەکە وەك کۆتایی کوتەکە club shaped (گۆپاڵەموو club hair)، کاتی ئەم قۆناغە تەنیا دوو حەفتەیە.

٣- هەنگاوی پشوودان Telogen : لە کۆتایی ئەم قۆناغەدا کە ١-٣ مانگی پێدەچێت گۆپاڵە موو فڕێ دەدرێت و مووی پێگەیشتووی نوێ new anagen hair دێتە جێی.

لە مووی سەردا ڕێژەی ٨٥٪ی مووەکان قۆناغی یەکن، ١٣-١٤٪یان لە قۆناغی سێدان و ١٪یان لە قۆناغی دوودان، ڕۆژی نزیکەی ١٠٠ موو لە پێستی سەر هەڵدەوەرن و سەدی تریش دروست دەبنەوە.

## ڕەنگی موو Hair colour

ناواخن matrix ی موو ئەو شوێنەیە کە دەور دراوە بە پیازەی موو و ڕۆڵی دروستکردنی (وەبەرهێنانی) هەیە و خانەی تۆخ و زۆر جۆر خانەی تر و بۆری خوێن و دەماری - تاد، تێدایە.

لە هەنگاوی گەشەکردنی موودا خانە تۆخەکان (میلانۆ سایتەکان) بە چالاکی دروست دەبن و ڕەنگ (میلانین) دروست دەکەن، لە دوو هەنگاوەکەی تری سووڕی موودا خانەی تۆخ ڕەنگ دروست ناکات.

دوو جۆرە بۆیەی میلانین (ڕەنگ) هەیە:

١- ڕەنگی ئاسایی( ئیومیلانین ) eumelanin: ئەم ڕەنگە ڕەشە یان قاوەییە.

٢- ڕەنگی( فیۆمیلانین) سوور یان زەرد phaeomelanin.

ڕەنگ بە زۆری لە توێکڵی قەدی موو (cortex) دایە.

کەواتا ڕەنگی موو چەند جۆرێکە:

١- مووی ڕەش یان قاوەیی، بەهۆی بوونی ڕەنگی ئاسایی (eumelanin) واتا ئیومیلانین.

٢- مووی سوور یان زەرد، بەهۆی بوونی ڕەنگی فیۆمیلانین phaeomelanin.

٣- مووی خۆڵەمێشی grey hair، بەهۆی کەمبوونی ڕەنگی ئاسایی( ئیومیلانین) Eumelanin ( واتا لە ئاستی خۆی کەمترە).

٤- مووسی سپی white hair، بەهۆی نەمانی ڕەنگی ئاسایی( ئیومیلانین).

## جۆرەکانی موو Types of hair

سێ جۆر موو هەن:

١- مـووی کۆرپەلـە Lanugo hair: نـەرم و باریـك و درێـژن، پێسـتی کۆرپەلـە بـەم مـووە داپۆشراوە و یەك مانگ پێش لەدایکبوون ئەم مووە فرێ دەدرێت Shed.

٢- گەندەموو Vellus hair: مووی کاڵ و باریك و کورتە، زۆربەی لەش دادەپۆشێت و لە ١ سم کورتترە، ئەم گەندە مـووە لـە شـوێنی مـووی کۆرپەلـە پـێش لـەدایکبوونی کۆرپەلـە دروست دەبێت.

٣- مـــووی کۆتـــایی (زبـــر) Terminal (Coarse) hair: ئەمانـــە مـــووی درێـــژی کرۆکدارن medullated و لە ١ سم درێژترن، بۆ نموونە مووی سەر.

**ئەوەی شایانی باسە،** مووی زبر لە قژی سەر رووتانەوەدا بۆ گەندەموو دەگۆڕێت و بە پێچەوانەوە گەندەموو لە نەخۆشی تووکنی hirsutism دا بۆ مووی زبر دەگۆڕێت.

## چۆنێتی (ڕێکخستنی) گەشەی موو Regulation of hair growth

لە ناوچەی هەڵئاوساودا bulge area دایکەخانەکان stem cells دوای وەرگرتی هەژێن لـە گۆی بن توێژ dermal papilla زۆر دەبن proliferation و خانەی گەورەکـەری کـاتی transient amplifying cells دروســت دەکــەن و ئــەمانیش ســتوونێك column لــە بەستەرەشــانە خانــە connective tissue cells (کە بەرەو خوارەوە بۆ گۆی بن توێژ dermal papilla دەڕۆن) دروست دەکەن، ئەم پرۆسەیە بەردەوامدەبێت تا موویەکی نوێ لەجێی مووە کۆنەکە دروست دەبێت

## جۆرەکانی مووی کۆتایی (زبر) Types of coarse hair

سێ جۆرن:

١- مووی ڕاست Straight hair: خەڵکانی ئاسیا مووی ڕاستیان هەیە. قەدی مووەکە بازنەییـە round hair.

٢- مووی لوول (وەك خوری) Woolly (Curly) hair: لە زنجیەکاندا (ڕەشپێستەکاندا) هەیە. قەدی مووەکە هێلکەیە (پان بۆتەوە).

٣- مووی شەپۆلی Wavy hair: لە ئەورووپیەکاندا (وە زۆر لە ئێمەومانانیشدا) هەیـە، قـەدی موو تەشیلـەییە elliptical.

# نینـــۆك Nail

## پێكهاتەی نینۆك Nail structure

پێكهاتووە لە:( وێنەی ٧)

١- پلێتی نینۆكیNail plate: لە كیراتینی رەق Hard keratin دروستبووە لە لایەن:

٢- رواندنگەی (ناواخنی)نینـۆك Nail matrix كە دەكەوێتە ناو كـالانێكی invagination توێژ و ئەمیش بریتییە لە:

٣- نوشتاوەی نینۆك Nail fold كـە دەكەوێتـە پشـــتی دوا پەنجـــەی پـــەڕی terminal phalanx of digit. رواندنگەی نینـۆك لــە بەشی دواوەی ژێری نوشتاوەی نینۆك بـۆ لێواری دەرەوەی نینۆك دەكشێت.







**وێنەی (٧) نینۆك و دۆشەكەی نینۆك**

٤- مانگیلـــــــە Lunula: شـــــــێوەی نیمچەبازنەیەكی سپی هەیە، لەم شوێنەوە پلێتی نینۆك بەرەو پێشەوە گەشەدەكات لەسەر:

٥- دۆشـەكەی نینـۆك Nail bed، پلێـتی نینۆك بـە لێوارێــكی بـەرەڵا free margin كـۆتـایــی پێـدێـت. بەشی نزیكی رواندنگە proximal matrix بەشی سـەرەوەی پلێـتی نینـۆك دروسـت دەكات و بەشی پەڕی رواندنگە distal matrix دوو بەشەكەی ناوەڕاسـت و ژێـرەوەی پلێـت دروست دەكات.

٦- توێكڵی نینۆك Nail cuticle، لە چینی كاژی بەشی سـەرەوە و خـوارەوەی نوشـتاوەی نینـۆك پێكدێت ، نوشتاوەی نینۆك بەشی نزیك proximal nail fold و تەنیشتی (لایی) lateral nail fold هەیە.

دۆشەكەی نینۆك دەكەوێتە نێوان مانگیلە و بـن نینـۆك hyponychium و بـە تونـدی بـە پلێـتی نینۆكەوە نووساوە.

ژێری نینۆك بۆری خوێنی چڕوپڕی لە ناو بەستەرەشانەیەكی روون تێدایە و ئەمەش رەنگی پەمـەیی بە نینۆك دەدات.

**كارەكانی (فرمانەكانی) نینۆك Functions of nail:**

١- یارمەتی گرتنی شتی بچووك بە پەنجەكان دەدات.

٢- پاراستنی پەنجە لە زەبر و برین.

٣- جوانی.

٤- دەرکەوتنی نیشانەی نەخۆشی " واتا نەخۆشیەکانی لەش" لە نینۆکدا، ئەمەش یارمەتی دەستنیشانکردنی diagnosis نەخۆشی دەدات.

**گەشەی نینۆك:** لە دەستدا نینۆك ١,٠ ملم لە رۆژێکدا گەشەدەکات و ٤-٦ مانگی دەوێت تا بە تەواوی دروست دەبێتەوە، بەڵام نینۆکی پێ ١٢-١٨ مانگی دەوێت.

نینۆك لە ١) هاویندا، لە ٢) گەنجدا و ٣) دوای نینۆك گەستن (جوین) nail biting خێراتر گەشەدەکات. لە منداڵدا نینۆك تەنکە و لەگەڵ تەمەندا ئەستوورتر و تۆختر دەبێت.

## بن توێژ Dermis

زۆربەری قەبارەی پێست پێکدەهێنێت و بریتییە لە شێوازێکی تێکەڵ لە:

١- بەستەرە شانەی ریشاڵ و دەزوولە و بێ شێوە fibrous & filamentous connective tissue & amorphous substance.

٢- بۆری خوێن و دەمار blood vessels & nerves.

٣- پاشکۆ توێژەکان.

٤- خانەکانی فایبرۆبلاست (دایکەخانەی ریشاڵ) fibroblast ، ماکروفەیج (زلەخانەی قەپگر) macrophage، کۆلکەخانە (خانەی ماست) mast cells و هەندێك خانەی تر کە لە خوێنەوە دێنە ناویەوە وەك: خانەی لیمفۆسایت (لیمفەخانە) lymphocytes، خانەی پلازما plasma cells و خڕۆکەی سپی خوێن white bloos cells.

بن توێژ لەگەڵ توێژ بە شێوەیەکی شەپۆلی پێکەوە لکاون interdigitat ، ئەم شەپۆلانە (گۆی بن توێژ dermal papillae) کە شێوەی زنجیرەیەك گردۆلکەی هەیە و لەگەڵ ئەو بن توێژەی کە لە خۆی دەگرێت بن توێژی گۆیی papillary dermis پێکدەهێنن و ژێر ئەم بەشە بریتییە لە توێژی تۆڕی reticular dermis. بە پێچەوانەوە بەشی خوارەوەی توێژ زنجیرە گردۆلکەیەکی بەرەوخوارەوەن و پێیان دەوترێت مێخی تۆڕی rete pegs.

ئەم پێکەوەلکانەی توێژ و بن توێژ لە بەری پەنجەکان هێڵە شەپۆلیە تایبەتمەندیەکانی پەنجەمۆر پێکدەهێنن.

## پێکهاتەی بن توێژ Structure of dermis

١- بەستەرە شانەی کۆلاجین Collagen connective tissue

ئەم بەستەرە شانەیە رێژەی ٧٥٪ی کێشی وشکی پێست پێکدەهێنێت و جوداگانەی هێزی گرژی tensile strength و جیری elasticity بە پێست دەبەخشێت. زۆربەی کۆلاجینی باڵق بریتییە لە کۆلاجینی ١ (collagen type I ٨٠-٩٠٪ ) و کۆلاجینی ٣ (type III

collagen ۸-۱۲٪) و کـۆلاجینی ٥ (collagen type V) کـه کـەمترن لـه ڕێـژەی ٥٪ی کۆلاجینی بن توێژە.

پتر له ۱٥ جۆر کۆلاجین له پێستی مرۆڤدا هەیه و هەر گەردە کۆلاجینێك له سێ زنجیره بەشێوەی مارپێچ helical پێکهاتووە.

۲- **بەستەرە شانەی جیڕی** Elastic connective tissue

ئەم بەستەرە شانەیه ڕێژەی ٤٪ی کێشی پرۆتینی بن توێژ پێکدەهێنێت، ریشـاڵە جیڕەکـان elastic fibers کەوتوونەتە نێوان گورزە ریشاڵی کۆلاجین collagen fibers bundles. ئەم ریشاڵە جیڕانە تورێکی گەورە گـەردی macromoelecules ئـاڵۆزن و لـه بەرینـەی چـڕەوە lamina densa تـا بەستەرەشـانەی ژێـر پێسـت subcutaneous connective tissue بەردەوامن و ئەرکیان بریتیه لە:

گێڕانەوەی پێست بۆ دۆخی ئاسایی خۆی دوای ڕاکێشانی پێسـت stretching of skin یان دوای شێوانی پێست deformed skin.

بەستەرە شانەی جیڕی لە شوێنی تریش وەك دیواری بۆری خوێنی پێست، بـۆری لیمـف lymphatics و سەلکی موو hair follicle دا هەیە.

۳- **ناواخنی بن توێژ** Dermal matrix

ئـەم شـانەیه تـەنیا ڕێـژەی ۲٪ی کێشـی وشـکی dry weight بـن توێـژ پێکـدەهێنێت. پێکهاتەکەی بریتییه لە دەزوو filaments و پێکهاتەی بێ شێوە amorphous structures کـه بریتییه لە:

۱- پرۆتیۆگلایکانس proteoglycans (PG).

۲- گلایکۆز ئەماینۆگلایکانس glycosaminoglycans (GAG).

۳- گلایکۆپرۆتین (GP).

**کارەکانی:**

۱- PG و GAG دەتوانێت هەزار ئەوەنـدەی خـۆی ئـاو هەڵبمـژێت و بەمـەش کاردەکاتـه سـەر قەبارەی بن توێژ و پێست بەرهەڵستی پەستان دەکات.

۲- دەتوانێت بە هۆکارەکـانی گەشـه growth factors بلکێـت binding و خانـەکانی نـاوی بـه ریشـاڵ و دەزووی نـاواخن matrix دەبەسـتێت بەمـەش کاردەکاتـه سـەر پترکـردن و proliferation جیابوونەوەی (تایبەتمەنـدبون) differentiation خانـەکان و شـانه سـارێژکردن tissure repair

### ٤-خانەکانی بن تویژ Cells of dermis

**خانە هەمیشە نیشتەجێبووەکانی بن تویژ ٣ جۆرن:** فایبرۆبلاست "ڕیشاڵە دایکەخانە"، ماکرۆفەیج "زلەخانەی قەپگر" و کۆلکەخانە (خانەی ماست).

ئەم خانانە بە چڕیەکی زۆر لە بن تویژی گۆیی لە دەوری تۆڕی تێکهەڵچووی ژێر گۆکاندا papillae of subpapillary plexus هەن بەڵام لە بن تویژی تۆڕیدا reticular dermis کەمترن.

**١- ڕیشاڵە دایکەخانە** Fibroblast

ئەم خانانە بە ناو شانەدا tissues دەسووڕێنەوە و کارەکانی بریتین لە:

١- دروستکردن و لەناوبردنی پرۆتینە ریشاڵی و ناڕیشاڵیەکانی fibrous & non-fibrous proteins ناو بەستەرە شانە.

٢- دروستکردنی ژمارەیەك لە هۆکارە تواوەکان soluble factors.

کەواتا ریشاڵەدایکەخانە ریشاڵی کۆلاجین و جیرو ناواخن (مژادی زەمینی) ground substance دروست دەکات. یەك ڕیشاڵە دایکەخانە لە یەك کاتدا دەتوانێت پتر لە یەك جۆر پرۆتین دروستبکات.

**٢- خانەی قەپگر** Macrophage

لە ناو مۆخی ئیسکدا bone marrow دایکەخانەی قەپگر دروستدەبێت و بۆ ناو خوێن دەڕوات (لێرە پێی دەڵێن تاکەخانە monocyte) و کە گەیشتە بن تویژ پێی دەڵێن خانەی قەپگر macrophage.

**کارەکانی**

١- قوتدەرە phagocytic (بۆ نموونە بەکتریا قوتدان)

٢- پرۆسەکردن و هەڵگرتنی processing & presenting دژە ژیندەر بۆ خانە لیمفۆسایتەکانی سیستمی بەرگری.

٣- بکوژی میکرۆبە microbicidal.

٤- بکوژی شێرپەنجەیە tumoricidal.

٥- یەکێکە لە مژادەکانی (خانەکانی) خوێن.

٦- بەشداریکردن لە خوێن مەیین coagulation، خوێنبۆریەچەوریە سارێژبوون atherogenesis، برین سارێژبوون wound healing و شانە ڕێکخستنەوە tissue remodelling.

٣- **کۆلکەخانە (خانەی ماست) Mast cells**

ئەم خانانە بریتین لە خانەی رژێنی تایبەتمەندبوو specialized secretory cells و لە ناو بەستەرەشانەکانی هەموو لەشدا بەتایبەتی لەو ئەندامانەی لەشدا کە رووکارن وەك پێست دەبینرێن.

لە پێستدا بە شێوەیەکی چڕ لە بن توێژی گۆیی papillary dermis ، نزیك لکینی توێژ و بن توێژ، لە پەردەکانی پاشکۆکانی توێژ adnexial sheathes ، لە دەوری دەمار و بۆری خوێنی تۆڕی تێکهەڵچووی ژێر گۆکان vessels & nerves of sub- papillary plexus و لە چەوری ژێر پێستدا هەن.

خانەی ماست ناوکی خڕ یان هێلکەیی هەیە و لە ناو سایتۆپلازمدا دەنکۆڵەی تاریکی dark granules تێدایە کە دوو جۆرن: ١) رژێن secretory، ٢) شیکەرەوە lysosomal.

رووی خانەکەی تیسکنە microvilli و دیواری خانەکە بە فایبرۆنێکتین fibronectin بەرگکراوە coated .

ئەم خانەیە لە دایکەخانەی stem cells مۆخی ئێسك دروست دەبێت و وەك خانەی تفتخواز (بەیزۆفیل) basophil دەنکۆڵەی تفتی basophilic granules تێدایە و مژادی هیستامین کۆدەکاتەوە.

ئەم دوو جۆر خانەیە هەردوو کیان هەڵدەستن بە بەرهەمهێنانی هۆکاری راکێشەری کیمیکی بۆ ئیۆزینۆفیلەکان (خانەی ترشخواز) eosinophilic chemotactic factor و دژەتەنی جۆری IgE یان لەسەر پەردەی پلازما plasma membrane دا هەیە.

**کارەکانی**

١- دروستکردن و هەڵگرتنی: هیستامین histamine، هیپارین heparin، ئەنزیمی تریپتەیز tryptase، ئەنزیمی کایمەیز chymase، ئەنزیمی کاربۆکسی پیپتادەیز carboyx peptidase و هۆکاری راکێشەری کیمیکی بۆ هاوتاخوازو ترشخواز neutrophil & eosinophil chemotactic factor .

٢- دروستکردن و synthesis رشتن و release پەسەندەکردنی storage ئەمانەی خوارەوە: هۆرکارەکانی گەشە growth factors، سایتۆکاینەکان (خانە بزوێنەکان) cytokines (بۆ نموونە: IL-1 ، IL-3، IL-4)، لیوکۆتراینەکان Leukotreines، هۆکاری خەپلەهەژێن، platelet activating factor و ترش شکێن acid hydrolase. کۆلکەخانە لێپرسراوی جۆری یەکی سیستمی بەرگرییە ( immune reaction Type I) کە پێی دەوترێت

فرەهەستیاری دەست بەجێ، هەروەها لێپرساوی درووستبوونی نەخۆشی سـۆی تیـژ و ژێـر تیژە acute & sub-acute inflammatory diseases.

٤- **خانەی لقدار** Dendrocytes

ئەم خانانە بە زۆری لـە بەشی سەرەوەی بن توێژ دەبینرێن و بـە بەستەرەشـانەی بـن توێـژ بەستراونەتەوە fixed.

خانـەکان لقـدارن dendritic و شـــێوەیان تەشـیلەییە spindle shaped و دوو ئـەرك دەبینین: ١) قووتدەرێکی چـالاکن highly phagocytic، ٢) وەك خانـەکانی لانگـەرهان دژە ژیندەر پرۆسەدەکەن و پێشکەشی لیمفەخانەکانی سیستمی بەرگری دەکەن.

## **خوێنبۆریەکانی بن توێژ** Dermal vasculature

بریتین لـە دوو تۆڕی تێکهەڵچووی بەیەکەوە بەستراو:

١- **تۆڕی تێکهەڵچووی ژێرگۆ** subpapillary plexus یـان پێـی دەوترێـت تـۆڕی تێکهەڵچـووی ئاسۆیی سەرەوە upper horizontal plexus کـە دوا دەزوولـە - خوێنهێنەرۆکـەکانی post capillary venules تێدایە و بەرەو خوارەوە تێپەڕدەبێت، ئـەم تـۆڕە تێکهەڵچـووە موولوولـە capillary وخوێنبەرۆکـە areteriols وخوێنهێنەرۆکـە venules بـە بەشـی گـۆیی بـن توێـژ دەبەخشێت.

٢- **تۆڕی تێکهەڵچووی ژێرەوە** lower plexus یان پێـی دەوترێـت تـۆڕی تێکهەڵچـووی ئاسـۆیی ژێرەوە lower horizontal plexus و دەکەوێتە نێـوان بـن توێـژ و ژێـر پێسـت dermis & subcutaneous tissue و بۆریە خوێنەکانی ئەم بەشە لـە بەشی سەرەوە گەورەترن.

لەگـەڵ ئـەم دوو تـۆڕە دەمارەکـان و لیمفەبۆریـەکان lymphatics & nerves شـان بەشـان دەکشێن.

# **دەمارەکانی پێست** Cutaneous nerves

بن توێژ لـە دەماردا دەوڵەمەندە و گورزە دەمارەکان شان بە شانی بۆریـە خوێنـەکان لـە بەشـی خوارەوەی بن توێژ "بە شێوەیەکی ئاسۆیی" دەڕۆن. چەند تایبەتمەندیەك لـە کۆتایی دەمارەکـانی nerve endings پێستدا هەن:

١- **بەرکەوتن و پەستان** touch & pressure: ئەمانە وەردەگیرێن بەهۆی:

١) خڕیلەی (خڕۆکەی) پاسینی Pacini corpuscles لە بەشی قوولایی بن توێژدان و لە کۆئەندامی زاووزێ genitalia، لکینی پێست و ناوپۆش muco-cutaneous junctions، بن توێژی گۆیی papillary dermis و لە پێستی بێ مووی گۆڕاو modified hairless skin واتا دەوری کۆم و لێواری لێودا هەن.

٢- پلەی گەرما، ئازار، خوران، ئەمانە بەهۆی ریشاڵە دەمارە بێ پەردەکان unmyelinted nerve fibers دەگوازرێنەوە کە لە گۆی بن توێژ و سەلکی موودا کۆتاییان دێت.

٣- ڕێکخستنی گرژبوونی بۆری خوێن regulation of vasoconstriction، رژاندنی ئارەقەگەندەکان apocrine secretion و گرژبوونی ماسوولکەی ڕەپکەری موو arrector pilli muscle contraction، ئەمانە بەهۆی ڕیشاڵە وزە ئەدرینالەکانی دوا دەمارەگرێکان post ganglionic adrenergic fibers روودەدەن ، بەلاّم ئارەقی درشتە ئارەقەگلاندەکان بەهۆی دەماری وزەکۆلین cholinergic fibers دەرژێت.

## فرمانەکانی (کارەکانی) بن توێژ Functions of dermis

١- زۆربەی قەبارەی پێست پێکدەهێنێت.

٢- گونجاندن pliability، جیری elasticity و هێزی گرژی "بەرگری لە زەبر" tensile strength.

٣- پاراستنی لەش لە زەبری میکانیکی mechanical injury.

٤- ئاو بەخۆیەوە دەبەستێت (مشتنی ئاو).

٥- یارمەتی ڕێکخستنی پلەی گەرمای لەش دەدات.

٦- کاری هەستیاری "وەرگرەکانی receptors بۆ هەست هەژاندن sensory stimulation تێدایە".

٧- کارلێککردن interaction لەگەڵ توێژدا ، بۆ بەردەوامبوونی هەردووکیان و برین سارێژکردن wound repair.

## بەستەرەشانەی ژێر پێست (چەوری ژێر پێست) Subcutaneous connective tissue (Subcutaneous Fat)

لەژێر پێستدا چەوری panniculus هەیە کە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك پلۆکە lobules و ئەمانیش لە خانەی چەوری lipocytes (fat cells) پێکهاتوون، ئەم پلۆکە چەوریانە بە بەربەستی ریشاڵی fibrous septa لەیەکتر جیاکراونەوە و ئەمیش لە ریشاڵی کۆلاجینی و بۆری خوێنی گەورە پێکهاتووە و کۆلاجینەکە لەگەڵ کۆلاجینی بن توێژ بەردەوامە. ئەستووری چەوری لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تری پێست جیاوازە.

**کارەکانی چەوری ژێر پێست:**

١- هەڵگرتنی بن توێژ و توێژ لە سەر رووی خۆی.

٢- پەسمەندەکردنی چەوری.

٣- شوێنی گۆڕینی هۆرمۆن: بۆ نموونە گۆڕینی هۆرمۆنی ئەندرۆستینیدیۆن androstenedion بەهۆی ئەنزیمی ئەرۆماتەیز aromatase بۆ هۆرمۆنی ئیسترۆن Oestron و دروستبوونی هۆرمۆنی لیپتین leptin کە کارەکەی بریتییە لە:

١) رێکخستنی کێشەی لەش بەهۆی هایپۆثالامەسە (ژێر لانکە) وە hypothalamus.

٢) کارکردن بۆ سەر کاردانەوەمان بۆ تامی خواردن.

# سیستمی بەرگری پێست Skin immune system (SIS)

**پێست گەورەترین ئەندامی چالاکی سیستمی بەرگری لەشە.**

**پێشەکی:**

چینی کاژی پێست ناهێڵێت شلە و خوێی لەش fluid & electrolyte دەرچێتە دەرەوە و هاتنەناوەوەی تەنی زیانبەخش دەوەستێنێت. چونکە ئەم چینە کاژە پۆشتەیەکی میکانیکی یە mechanical barrier بۆیە میکرۆبی بەر پێست کەوتوو contamnined organisms و توخمی کیمیکی chemicals بە بەردەوامی بەهۆی شتن washing و کاژفڕێدان desquamation لادەبات.

بەڵام ئەم میکرۆب و توخمانە ئەگەر توانیان چینی کاژ بۆ ناوەوەی پێست ببڕن لەم کاتەدا خانە تایبەتمەندەکانی سیستمی بەرگری دەکەونەگەڕ.

زۆر کاردانەوەی بەرگری پێست دەگرێتەوە، بۆ نموونە: لیردەرکردن، پێستە سوی لێککەوتنی هەستیاری allergic contact dermatitis، نەخۆشی کاژۆکی و خوێن بۆریە سۆ vasculitis.

**لەبەر گرنگی ئەم سیستەمە بەرگریەی پێست کەمێك بە تێروتەسەلی باسی دەکەین.**

**هەندێك لەو خانانەی بەشداری لە سیستمی بەرگری پێست (SIS) دەکەن**

**١- خانەی کاژ (کیراتینۆسایت)** Keratinocyte

کارەکانی:

١- دروستکردنی چینێکی پارێزەری بەردەوام (چینی کاژ).

٢- پاڵپشتیکردنی چینی کاژ.

**٣- کارە بەرگریەکانی:**

أ) دروستکردنی ژمارەیەکی زۆر لە خانەبزوێن cytokines وەك ئینتەرلوکینەکان interleukins (ئینتەرلوکینی ١، ٣، ٦، ٨، ١٠، ١٢)، هۆکاری مۆڵگەهەژێن colony stimulating factors، هۆکاری گۆڕینی گەشە transforming growth factors، هۆکاری لوودارژێن tumour necrosis factor و ئینتەرفیرۆنی ∝ و ℘.

ب) ئینتەرفیرۆنی ℘ کاردەکاتە سەر کیراتینۆسایت بۆ دروستکردنی دژە ژیندەری HLA-DR (دژە ژیندەری لیوکۆسایتی "خانەی سپی"مرۆڤ – جۆری DR).

ج) دروستکردنی هۆرمۆنی خانەی تۆخ هەژێن melanocyte stimulating hormon (MSH) و ئەمیش بەرگری دادەبەزێنێت.

د) دوای برین و زەبر رۆڵێکی سەرەکی لە سارێژکردن healing دا دەبینێت.

٢- **خانەی لانگەرهانس** Langerhans cells

ئەم خانەیە لقدارە و لە مۆخی ئێسك پەیدا دەبێت. لەناو توێژ و بن توێژ و لیمفەبۆریەکان و لیمفەگرێکان lymphatics (بەشی خانەی T) T. cell area دا دەسووڕێتەوە و ڕۆڵی کلیلیان لە هەڵگرتن و دەرخستنی دژە ژیندەر Ag. presentation دا هەیە

٣- **خانەی لقداری بن توێژ** Dermal dendritic cells

وەك خانەی لانگەرهانس کاردەکەن بەلآم تەنیا لە دەوری خوێنبۆریە باریکەکانی بن توێژ (لە بن توێژی گۆپی papillary dermis) دا هەن.

٤- **خانەی لیمفۆسایتی** T – (T-lymphocytes)

ئەم خانانە کە لە دایکبوون تایبەتمەندی وەرگری دژە ژیندەری (antigene receptor) لە لایەن ژێرکۆڵەگلاندەوە thymus دەدرێتێ، دوای ئەوە بۆ چەند کۆمەڵێك بەپێی جیاوازی گەردی سەر پەردەی پلازماکانیان جیادەبنەوە و کاری جیادەکەن، جۆرەکانی ئەمانەی خوارەوەن:

١) **خانەی لیمفۆسایتی یارمەتیدەر** (T-helper cells) $CD_{4+}$

ئەم خانانە یارمەتی خانەی لیمفۆسایتی B (B-lymphocyte) دەدەن بۆ

١- دروستکردنی دژەتەن (antibody).

٢- ڕەخساندنی (induction) خانە بکوژی cytotoic لیمفۆسایتیT ( cytotoxic T cells)، ئەم ڕەخساندنە بە مانای ناسین و کوشتنی أ) ئەو خانانەی لەش کە بە ڤایرۆس تووشبووون ب) شانە یان ئەندامی چێنراو graft.

٣- ناسینی دژە ژیندەر بە بوونی دژە ژیندەر و گەردی MHC molecule class II (دژە ژیندەری پۆلی دوو لە دژە ژیندەری لیوکۆسایتی مرۆڤ).

٤- دوای وریابوونەوە و چالاك بوونی بەهۆی دژە ژیندەر خانەی یارمەتیدەر دەست بە بەرەلآکردنی release سایتۆکاینەکان cytokines دەکات ئەمانیش خانە سۆکەرەکانی تر رادەکێشن و چالاکیان دەکەن.

خانەی یارمەتیدەر بەپێی ئەو سایتۆکاینانەی دروستی دەکەن دوو جۆرن، جۆری ١ و جۆری ٢ [$Th_I$, $Th_2$].

٢) **خانەی لیمفۆسایتی بکوژ** (T-cells) $CD_{8+}$ T-cytotoxic cells: ئەم خانانە هەڵدەستن بە

أ) کوشتنی خانەکانی لەش کە بە ڤایرۆس تووشبوون.

ب) کوشتنی خانە یان شانەی چێنراو grafted cells & tissues.

ئەم دوو ئەركەش بە بوونی دژە ژیندەری جۆری MHC class I جێبەجێ دەكرێن.

٣- **خانەی ناونەنراو (بێ ناو)** Null cells (Non-T, Non-B cells)

ئەم خانانە وەرگری (receptor) FcIgG یانڤ هەیە و دوو جۆرن:

١- جۆری بكـوژی سروشـتی NK cells (natural killer cells)، ئەمانـە خڕۆكـەی سـپی دەنكۆڵـەدارن granular leucocytes كـە دەتـوانن خانـەی تووشـبوو بـە میكرۆب و خانەی لووەكان tumour cells بێ ئەوەی بە دژە تـەن هەسـتیاربووبن بكوژن.

٢- جۆری بكوژ killer cells (K-cells): سێ جۆرن:

١) لیمفۆسایتی T (T-lymphocyte).

٢) خانەی بكوژی سروشتی (NK-cells).

٣) خڕۆكەی سپی جۆری مۆنۆسایت (تاكە خانە) monocyte.

ئـەم خانانـە (K-cells) دەتـوانن خانـەی نیشـانەكراو target cells بكـوژن بـە مەرجێك بە دژەتەن هەستیاركرابێت sensitized by antibody.

٥- **كۆلكەخانە (خانەی ماست)** Mast cells: پێشتر باسمان كردووە.

**پێكهاتەی گەردی سیستمی بەرگری پێست** Molecular components of SIS

١- **دژە ژیندەر و نیمچە دژە ژیندەر** Antigenes & haptens

١) دژە ژیندەر Antigenes : ئەو گەردانەن molecules كە لە لایەن سیسـتمی بـەرگری لـەش دەناسرێنەوە و ئەمەش دەبێتە هۆی كاردانەوەی بـەرگری immune response بـە شێوەی:

أ) كاردانەوەی دژە تەنی humoral antibody response، یان

ب) كاردانەوەی دژە تەنی خانەیی cell bound antibody response

٢) نیمچە دژە ژیندەر Haptens: بریتییە لە توخمێكی كیمیكی كە كێشە گەردییەكـەی نزمـە low molecular weight و پێویستە بە پرۆتین protein بلكێت بۆ ئەوەی كاردانـەوەی بەرگری دروستبكات، ئەمانە لـە روودانی پێستەسـۆی لێككـەوتنی هەسـتیاری allergic contact dermatitis زۆر گرنگن.

٢- **دژە ژیندەری گەورە** superantigene: بۆ نموونە ژەهری بەكتریا bacterial toxin بە تایبەتی ژەهری بەكتریای ستافیلۆكۆكەس staphylococcus، لێرەدا هەستیاربوون sensitization بـۆ دروستبوونی كاردانەوەی بەرگری immune reaction پێویست ناكـات. جگـە لـەوەش دژە ژیندەری گەورە لـەگەڵ گەردی دژە ژیندەر جۆری MHC-class II خـۆی تێكـەڵ دەكـات و بەمەش هەژێن بە چەند پۆلێكی جیاواز لـە خانەكانی لیمفۆسایتی T كـە وەرگـری جـۆری VB

لەسەربێت دەدات و ئەمەش دەبێتە هۆی زۆربوونی خانە لیمفۆسایتەکانی T و رژاندنی زۆری خانەبزوێن و سەرهەڵدانی زۆر نەخۆشی.

٣- **دژە تەن** Antibodies (Immunoglobulins Ig)

**پێنج جۆرن:**

١- IgG: رۆڵی لە زۆربەی وەڵامدانەوە دووەمینەکان secondary responses دا بۆ زۆربەی دژە ژیندەرەکان antigenes هەیە.

IgG دەتوانێت لە وێلاشەوە placenta بۆ کۆرپەلە تێپەڕبێت و هەروەها دەتوانێت بە تەواوکەرەوە complement بۆ چالاککردنەوەی رێچکە تەواوکەری ئاسایی classical complement pathway بلکێت.

وە دەتوانێت بە ماکرۆفەیجو نیوترۆفیل (macrophages & neutrophils) (بەهۆی وەرگری Fc IgG) بلکێت و وەك ئۆپسۆنین opsonine بە پرد دروستکردن لەگەڵ دژە ژیندەردا رۆڵی خۆی ببینێت.

وە خانە نیشانەکراوەکان target cell بۆ کوشتنیان بە خانەی بکوژ (K. cells) هەستیاردەکات (sensitizing).

٢- IgM: گەورەترین گەردی دژە تەنە Ig(Ab) و لە زۆربەی وەڵامە سەرەتاییەکان primary reponses بەرپرسە و دەتوانێت لەگەڵ تەواوکەر complement یەك بگرێت بەڵام ناتوانێت بە وێلاشدا بپەڕێتەوە.

٣- IgA: لە رژاوەکاندا (دەردانەدا) secretions باوترین دژە تەنە و ناتوانێت بە تەواوکەرەوە بلکێت بەڵام دەتوانێت تەواوکەر بەهۆی رێچکەی دۆمان alternative pathway چالاك بکات. لە ناوپۆشەخانەکاندا mucosa دژە ژیندەری سەرەکییە و بەرگری سەرەکی لەم ناوپۆشە خانانە دەکات و دەرژێتە شیری مەمکی دایك.

٤- IgE: دەتوانێت بە وەرگری Fc کە لەسەر رووی خانەی ماست mast cells و خانەی بەیزۆفیل basophil cells دا هەن بلکێت و بەمەش ئەم خانانە هەستیار دەکات و دەبێتە هۆی دەردانی تۆخمە سۆییەکان inflammatory substances و بەرگری جۆری I (کاردانەوەی فرە هەستیاری دەستبەجێ immediate hypersensitivity reactions).

٥- IgD: بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە ناو پەردەدایە membrane bound form و دەتوانێت وەك وەرگری دژە ژیندەر بۆ خانەی لیمفۆسایتی B سانا (naive B cells) رۆڵ ببینێت.

## پێکهاتەی دژە تەن Antibody structure

**پێشەکی**

وەك باسمانکرد بەرگری تایبەت specific immunity دوو جۆرە:



(وێنەی ٨) دژە تەن

١- بەرگری دژەتەنی Humoral: دژەتەن پێی هەڵدەستێت و ئەم دژەتەنانە لە لایەن لیمفۆسایتی B دروست دەکرێن. تایبەتە بە لەناوبردنی بەکتری و ژەهر لە ناو خوێندا.

٢- بەرگری خانەیی Cellular immunity: لیمفۆسایتی T پێی هەڵدەستێت و هێرش دەکاتە سەر ئەو خانانەی دژە زیندەریان چۆتەسەر یان چۆتە ناو.

**پێکهاتەی دژە تەن**: ئەمانە خێزانێکی گلایکۆپرۆتینن، گەردی Ab شێوەی پیتی Y هەیە و لە دوو زنجیرەی سووك light chains ی وەك یەك identical و دوو زنجیرەی قورسی heavy chains وەك یەك دروستبووە، زنجیرەی سووك و قورس هەردووکیان ناوچەی نەگۆڕ و گۆڕاویان هەیە constant & variable regions، کاری ناوچەی گۆڕاو ناسینی دژە زیندەرە antigene recognition، بەڵام کاری ناوچەی نەگۆڕ فرمانی کاریگەرییە (بەکاربوونە) effector function. (وێنەی ٨)

### ٤- سایتۆکاینەکان "خانە بزوێنەکان" Cytokines

**بریتین لە**: پرۆتینی بچووك small proteins کە لەلایەن خانەکانەوە وەك خانەی لیمفۆسایت، ماکرۆفەیج و خانەی کیراتینۆسایت (خانەی کاژ) دەرژێن.

**کارەکانیان**: هەڵدەستن بە ڕێکخستنی پلە و (زۆری و کەمی) ماوەی سۆ inflammation بەم شێوانە:

١- کاریگەری جێیی (locally): لە سەر خانە نزیکەکانی سایتۆکاینە ڕژاوەکە (paracrine effect).

٢- کاریگەری خۆیی: کاریگەری لەسەر ئەم خانەیەی دروستیکردووە autocrine effect.

٣- کاریگەری دوور-ڕا: بەهۆی بڵاوبوونەوەی لە خوێندا کار لەسەر خانە دوورە نیشانەکراوەکاندا far target cells دەکەن و ئەمەش کاری کوێرەیی یە endocrine effect " واتا وەك کاری کوێرە گلاندی وایە".

**جۆری سایتۆکاینەکان**

١- ئینتەرلیوکینەکان (IL) Interleukines.

٢- ئینتەرفیرۆنەکان Interferones.

٣- هۆکاری مۆڵگە هەژێن Colony stimalating factors

٤- ژەهری خانەکان Cytotoxins

٥- هۆکاری گەشە Growth factors.

٥- **گەردە لکێنەکان** Adhesion Molecules

(Cellular adhesion molecules = CAMs)

بریتین لە گلایکۆپرۆتینەکان Glycoproteins کە لەسەر چەند جۆر خانەیەك دەردەکەون و بەشداری دەکەن لە:

١- پێکەوەلکاندنی خانە بەخانە یان خانە بە ناواخن matrix.

٢- پێویستن بۆ کارلێککردنی interaction خانەی لیمفۆسایت لەگەڵ:

١) خانەکانی دژە ژیندەر هەڵگر (پیشاندەر) antigene presenting cells.

٢) خانە کاژەکان.

٣) ناوپۆشە خانەکان endothelial cells.

٣- لە هاتووچۆ پێکردنی trafficking خانە لیمفۆسایتەکان لە کاتی سۆدا inflammation گرنگن.

چوار جۆر CAMs هەن:

١- کادهێرینەکان cadherins.

٢- دژە تەن Ig.

٣- ئینتیگرینەکان integrins.

٤- سێلێکتینەکان selectins.

٦- **گەورە دژە ژیندەری شانەگونجێن** Major histocompatability antigenes (MHCag)

= **دژە ژیندەری خانەی سپی (لیوکۆسایتی) مرۆڤ** HLA (Human leucocyte antigenes).

جینەکانی MHC پرۆگرام بۆ دیاریکردنی recognition ئەو خانانەی کە کاردانەوەی بەرگری ڕێکدەخەن regulation of immune responsiveness دادەنێن، لە مرۆڤدا MHC دەکەوێتە سەر کرۆمۆسۆمی ٦. سێ پۆلی MHC هەیە:

١- پۆلی MHC I، Class I: لەسەر هەموو خانە ناوکدارەکانی لەش nucleated cells جگە لە خڕۆکە سوورەکان (RBCs)دا هەن. لە کاتی کاردانەوەی بەرگریدا بڕی ئەم جۆرە (پۆلی ١) پتر دەبێت و ناوەڕۆکی دژە ژیندەری کەسایەتی هەر کەسێکن core of

individuality (ناسینەوەی تاك) و بۆ خانەی لیمفۆسایتی T (جۆری بكوژ CD8) هەژێنی ناساندنن signal recognition. ئەم پۆلە بریتین لە A، B، C {وە گلایكۆپرۆتینن لەسەر رووی خانە}. HLA (A-B-C).

٢- پۆلی ٢ Class II MHC: بریتییە لە HLA جۆری D (HLA-D)، لە سێ شوێن لەسەر كرۆمۆسۆمی ٦ HLA-DP – HLA-DQ – HLA-DR دا پرۆگرام كراوە، جینەكانی كلاسی ٢ (پۆلی ٢) كە جینی (D)یە ئاماژە بە دژە ژیندەرە خۆییەكانی لیمفۆسایتی B یان Ia (دژە ژیندەری پەیوەست بە بەرگری immune associoted antigene دەكەن (كۆد دانان) كە تەنیا لە خانە تایبەتمەندیەكانی بەرگری وەك لیمفۆسایتی B، ماكرۆفەیج، خانە لقدارەكان و لانگەرهانەكاندا هەن. گەردی پۆلی ٢ دژە ژیندەر بۆ وەرگری خانەی لیمفۆسایتی یارمەتیدەر $Th[CD_4+ve]$ دەردەبڕێت.

٣- پۆلی ٣، MHC class III: لەسەر كرۆمۆسۆمەكەی (٦) دەكەویتە نێوان پۆلی ١ و پۆلی ٢ و ئەم جینانەی هەیە:

١) جینی تەواوكەر complement.
٢) جینی فاكتەری لوو دارزێن tumor necrosis factor (TNF).
٣) جینی پرۆگرام كردن بۆ تەواوكەری C2 و C4 كە لە ناو رێچكەی تەواوكەری ئاساییدا (classical complement pathway) بەشدارن.
٤) جینی پرۆگرام كردنی فاكتەری B لە رێچكەی تەواوكەری دۆمان alternative complement pathway.

**ئەوەی شایانی باسە:**

جینەكانی پۆلی ١و ٢ و ٣ بۆماویی وەك یەكەیەكە haplo type (unit) – كەواتا ئەم یەكەیە (unit) لە سێتێكی تەواو لەم دژە ژیندەرانە {A B C D (=DR, DQ, DP)} كە لەسەر یەك كرۆمۆسۆمن (لە ٩٩٪ ی خەڵكیدا) پێكهاتووە بەلام ١٪یان پەڕینەوەی جینی (cross over) تێدایە. هەر تاكە كەسێك دوو دژە ژیندەر بۆ هەریەكێك لە A, B, C, D دەردەبڕێت وە هەر باوكێك یان دایكێك دوو یەكە (haplo type)ی هەیە و كە منداڵیان دەبێت نیو لە باوك و نیو لە دایك وەردەگرێت و بەمەش باوك و دایكی منال بە پشكنینی HLA دەناسرێنەوە.

**HLA و نەخۆشی:**

دیاریكردنی جۆرێكی تایبەت لە HLA بە رێژەیەكی پتر لە خەڵكانیتر لە زۆر نەخۆشیدا نیشانەیەكە، واتا ئەوانەی ئەم جۆرە HLA یان هەیە پتر تووشی ئەم نەخۆشیانە دەبن.

**شێوانی HLA و نەخۆشی:**

١- **خۆگۆڕین** Molcular mimicry:

أ) میکرۆبی تووشێن هەمان شێوەی HLAی هەیە، لەبەر ئەوە سیستمی بەرگری لەش دژی ناوەستێت و میکرۆبەکە کاری خۆی دەکات و نەخۆشی دروست دەکات.

ب) شێوەکان زۆر کەم جیاوازن، بۆیە سیستمی بەرگری لەش هێرش دەکاتە سەر هەردووکیان و نەخۆشی دروست دەبێت، ئەمەش پێی دەڵێن زیانی بەرگری دژە خۆیی autoimmune damage.

٢- **پێکەوەلکانی جینی** Genetic linkage: لەوانەیە جینەکەی HLA نزیك جینێکی تر بێت لەسەر هەمان کرۆمۆسۆم و ئەم جینەی دووەم نەخۆشی دروست دەکات بە:

١) شێوەی ڕاستەوخۆ directly، بۆ نموونە نەبوونی ئەنزیم enzyme deficiency.

٢) شێوەی ناڕاستەوخۆ indirectly، بۆ نموونە کاریگەریەك لەسەر کاردانەوەی بەرگری:

أ- بەدکاردانەوە، ئەمەش دژەتەنی دژبەخۆ autoantibody دروست دەکات.

ب- کەمتر کاردانەوە، ئەمەش تووشێن infection دروست دەکات.

٣- **کاریگەری وەرگر** Receptor effect: هەندێك پێکهاتەی کیمیکی وەك دەرمان یان ژەهر toxins پێش چوونە ناو خانە (سایتۆپلازم) بە رووی دەرەوەی (پەردەی) خانە دەلکێت چونکە HLA لەسەر رووی خانەیە، لەوانەیە ئەم لکانە بە شێوەیەکی ناسروشتی بگۆڕێت و ببێتە هۆی نەخۆشی.

## کاردانەوە فرەهەستیارەکانی پێست Hypersensitivity reactions in the skin

فرەهەستیاری hypersensitivity بریتییە لە: ١) کاردانەوەی بەرگری زێدەڕۆ، یان ٢) نابەجێ.

**چوار جۆری سەرەکی هەن:**

١- **جۆری (Typer I) کاردانەوەی فرەهەستیاری دەستبەجێ (یەکسەر)**

Immediate hypersensitivity reaction

لەم جۆرە کاردانەوەدا بۆری خوێن فراوان دەبێت vasodilatation و شلەی ناوخوێن دەدەڵێتە دەرەوەی بۆریەکانی خوێن.

دژەتەنی IgE و IgG4 کە لەلایەن خانەی پلازما plasma cells دروستکراون لە شوێنەکانی تری لەش (جگە لە پێست) بە خانەی ماست mast cells دەلکێن لە بن توێژدا بەهۆی جەمسەری Fc یانەوە و کاتێك دژە ژیندەر بە جەمسەری Fab دژەتەن دەلکێت لەم کاتەدا خانەی ماست دەست دەکات بە فڕێدانی مژادە سۆهێنەکان بۆ ناو شانەکان کە بریتین لە

هیستامین، لیوکۆتراینەکان – تاد. بەمەش سۆ inflammation دروستدەبێت (سووربوونەوە، ئاوسان، ئازار، – تاد)، بۆ نموونە لیردەرکردن urticaria.

**دژە ژیندەر** لەوانەیە لە ژینگەوە بێت وەك پێوەدانی هەنگ، یان لە ناو لەشەوە بێت وەك خۆراك.

-٢ **جۆری ٢ (Types 2) کارلێکی دژەتەنی خانەکوژی** Humoral cytotoxic reaction

دژەتەنی IgG بەم جۆرەی٢ هەڵدەستێت و لە بۆشایی نێوان خانەکانی پێستدان. کە دژە ژیندەر پەیدابوو لەگەڵیدا یەك دەگرن و بەمەش تەواوکەر چەسپ و چالاك دەکەنەوە و بە ڕێگەی چەند کارلێکی ئەنزیمی سۆو پرۆتینی خانەبکوژ cytotoxic proteins دروستدەکات، بۆ نموونە:

١– ئەگەر بەکتریا هاتە ناو پێست دژەتەنی IgG بە دژە ژیندەری سەر بەکتریاکە دەلکێت و تەواوکەر بە ڕێچکەی ئاسایی classical pathway چالاك دەبێت و چەند گوێزەرەوەیەك mediators دروستدەبن، وەك هۆکاری ڕاکێشە کیمیکی chemotactic factors بۆ نموونە C5a (تەواوکەری ٥ أ)، ئەمیش خرۆکە سپیەکانی جۆری (پۆلیمۆرف) polymorphs بۆ شوێنی هێرشی بەکتریاکە ڕادەکێشێت و هەروەها ئۆپسۆنین C3b (تەواوکەری ٣ب) ڕادەکێشێت کە بە بەکتریاکەوە دەلکێت بە شێوەیەك کە ئەم بەکتریایە لە لایەن خرۆکە سپیەکان polymorphs قووت بدرێن یان بکوژرێن.

٢– لە هەندێك کاتدا تەواوکەر (دوای چالاك بوونەوەی) دەتوانێت بەکتریا یان خانە ڕاستەوخۆ بەهۆی ئاوێتەی هێرشی پەردە membrane attack complex (C5b 6789) بکوژێت لە ڕێچکەی تەواوکەری کۆتایی terminal complement pathway دا.

٣– تەواوکەر بە ڕێچکەی تەواوکەری دۆمان alternative complement pathway بێ پێویستی دژەتەن دەتوانێت ڕاستەوخۆ بە بەکتریا چالاك بێت.

کەواتا جۆری ٢ دژی هێرشی بەکتریا و تووشێنەکان دەوەستێت و هەندێك نەخۆشی توند لەوانەیە بەم جۆری دووە دروست بێت وەك نەخۆشی بلّقی ئاسایی {pemphigus vulgaris}.

-٣ **جۆری ٣ (Type 3) کاردانەوەی ئاوێتە بەرگریەکان** Immune complex reactions

دژە ژیندەر لە نزیك شانە گرنگەکان vital tissues بە دژەتەنەوە دەلکێت و سۆ دروستدەبێت و شانەکان وێران دەبن.

ئەم لکانــەی دژە ژینــدەر و دژەتەنــە تەواوکــەر چــالاك دەکــات و خرۆکــە ســپیەکانی جــۆری پولیمۆرف polymorphs دێنە شوێنەکە و ئەنزیمــە شــیکەرەوەکانیان lysosomal enzymes دەرێژن و سۆ دروست دەبێت، ئەمەش پێی دەوترێت کاردانەوەی ئــارثــەس arthus reaction، لەوانەیە ئەم ئاوێتە (دژە ژیندەر – دژەتەن)یە بچێتە ناو سووڕی خوێن و ئەوسا بۆ نــاو بۆریــە خوێنە بچووکەکانی پێست و تەواوکەر چالاك دەبێت و خانە سۆدروستکەرەکان پەیــدادەبن و بۆری خوێنەکان بریندار دەبن (وەك کاردانەوەی ئارثەس) بۆ نموونە خوێنبۆریەسۆ vasculitis.

٤- **جۆری ٤ (Type 4) کــارلێکــی بــەرگــری خانــەیی (کــاردانــەوەی بــەرگــری گــوێزراوەی خانەیی)** Cell mediated immun reactions

ئەم جۆرە بەهۆی لیمفۆسایتەکان دروستدەبێت (نەك بە دژەتەن) و گرنگە لە:

١- گۆشتە زوونەگمۆڵ granuloma.

٢- کاردانەوەی فرەهەستیاری درەنگ delayed hypersensitivity reactions.

٣- پێستەسۆی بەرکەوتەی (لێککەوتنی) هەستیاری allergic contact dermatitis.

٤- پارێزگاری دژی شێرپەنجە.

٥- کاردانەوە دژی مێروو پێوەدان insect bites.

٦- هەندێك نەخۆشی هەستیاری بە تیشك.

**لە جۆری چواردا، دوو قۆناغ phase هەن:**

١- **قۆناغی هەستیاریکردن (هاندان)** Induction (sensitization) phase

کاتێــك کــە بەربەســتی barrier توێــژ بــە دژە ژینــدەر بــڕا penetrated ، ســیســتمی بــەرگری دەکەوێتەگەڕ.

لــە نێوان خانەکانی کاژ keratinocytes لــە توێژدا تۆڕێکی تەواو لــە خانە لانگەرهانسەکان کــە تایبەتمەندن بە گرتنی دژە ژیندەر (وەك بەکتریا، مژادی کیمیکی و خانــەی لــوو tumor cells) هەیە و ئەم دژە ژیندەرانە دەگرێت و لــە ناو سایتۆپلازمدا پرۆسەی دەکات (مامەڵەی دەکات) و لقەکانی (خانە لانگەرهانسەکە) رادەکێشێتەوە نــاو خــۆی و هەڵیــدەگرێت و دەســتدەکات بــە جووڵە بەرەوخوارەوە دژی شەپۆلی خانە کاژەکان (کە بەرەو سەرەوە هەڵدەچن) تا دەگاتە بــن توێژ و دەچێتە ناو بۆریە لیمفەکانی پێست بەرەو لیمفــەگرێ نزیکــەکان، لــەم گەشــتەدا دوای مامەڵەکردنی دژە ژیندەر دیسان دەیهێنێتەوە سەر رووی دەرەوەی پەردەی پلازما و دەیخاتــەڕوو بۆ خانە لیمفۆسایتەکان دوای هەڵسانی بە بەستنەوەی دژە ژیندەر بە گــەردی Class2 MHC،

لە ناو لیمفەگرێکان خانەی لانگەرهانسی دژەژیندەر هـەڵگر تێکـەڵ بـە کۆمـەڵێکی جـەنجاڵی لیمفۆسایتەکان دەبێت و لـە ناویاندا بۆ دۆزینەوەی خانەی لیمفۆسایتی لەبار لـە جۆری T ،کـە وەرگری receptor بۆ ئەم دژەژیندەرەی تێدایە ، دەگەڕێت.

لیمفۆسـایتی Th (یارمەتیـدەر) $CD_{4+}$ دژە ژینـدەر (بـە بـوونی Class II MHC لەگـەڵ دژە ژیندەرەکە) دەناسێت.

دوای کارلێککردنی هەردوو خانەی لانگەرهانس لەگەڵ لیمفۆسایتی یارمەتیدەر لیمفۆسایتەکان "Th" دەستدەکەن بە دابەشبوون و زۆربوون، ئەم دابەشبوونە پێویستی بە ئینتەرلیوکینی ۲ IL-2 هەیە ، دوای ئەوە لیمفۆسایتی یارمەتیدەر دەبێت بە لیمفۆسایتی بیرمەنـد memory T cells و بۆ شوێنی رووداوەکە دەڕوات (کە دژە ژیندەر یەکەمجار هاتبوو بۆ ناو پێست) بـۆ هێرشـبردنە سەر دژەژیندەر وە هەر لە ناو بۆریە لیمفەکاندا دەستووڕێتەوە بەرەو شانە هێرش لێکراوەکان و لیمفە گرێکان و بۆری سنگ thoracic duct و بۆریەکانی خوێن و شلـەی نێوان شانەکان .

ئەم گەڕانەوەی لیمفۆسایتی یارمەتیـدەر Th پێویسـتی بـە یارمـەتی گـەردی ماڵکـەر homing molecules هەیـە کـە بریتییـە لـە گـەردی دژە ژینـدەری لیمفۆسـایتی پێسـت cutaneous lymphocytic antigene، ئـەم گـەردە ماڵکـەرە رێگـەی جـووڵان بـەرەو پێسـت نیشـانی لیمفۆسایتی یارمەتیدەر دەدات. کە گەڕانەوە بـۆ پێسـت وە دژە ژینـدەر نـەمابوو ئـەوە دیسـان دەچنەوە ناو سووڕی خوێن و هەر سووڕ دەخۆن recirculate چونکە تایبەتمەند بوون بـەم دژە ژیندەرە نەوەك دژە ژیندەرەکە جارێکیتر بێتەوە ناو پێست.

٢- **قۆناغی بەگژداچوون (وەگەڕکەوتن)** Eliciting (challenge) phase

هەر کاتێك دژە ژیندەر هێرشی بۆ ناو پێست کردەوە ئەوە لیمفۆسایتەکان بۆ جەنگان ئامـادەن، لێرەدا دوو جۆر دژە ژیندەر هەن:

١) **دژە ژیندەری دەرەوەی خانە** Extracellular antigenes: وەك:

بەکتریا، ژەهر toxin و خانەی لوو tumor cells. خانەی لیمفۆسایتی یارمەتیدەر $CD_{4+}$ دەکەونەگەڕ، هەروەك قۆناغی یەکەم خانەی لانگەرهانس دژە ژیندەر دەگرێت و مامەڵەی لەگەڵ دەکات و دەریدەبڕێت expressing، خانـە لقـدارەکانی بـن توێـژیش dermal dendrocytes هـەمان کـار لـە بـن توێـژدا دەکـەن، ئەوسا خانـەی CD4+ دوای کـارلێککردن لەگـەڵ دژە ژینـدەر هـەڵگر چـالاك دەبـن و دەسـتدەکەن بـە رشـتنی سایتۆکاینەکان، ئەمانیش دەبنە هۆی راکێشان و کۆبوونـەوە و وەسـتانی لیمفۆسـایتەکان لەگەڵ خڕۆکەی سپی جۆری پۆلیمۆرف polymorphs و مۆنۆسایت "کە لـە خوێنـەوە دێن" لـە پێسـتدا و دروسـتکردنی سـۆ inflammation. هـەردوو خانـەی لیمفۆسـایتی

یارمەتیدەر و خانە بکوژ هەڵدەستن بە بەرهەڵستیکردنی تووشێن infection یان دەرکردنی دژە ژیندەرەکە Ag-elimination، خانەی خڕۆکەی سپی جۆری polymorph دژە ژیندەر قووتدەدات، سایتۆکاینەکان تەنیا لەلایەن لیمفۆسایتەکان دروست نابن بەڵکو خانەکانی کاژیش کە بریندابوون دروستیدەکەن.

ئەم سایتۆکاینانە دەبنە هۆی چالاك کردنەوەی خانەی لانگەرهانس و خانەی لیمفۆسایتی T، هەروەها ئینتەرلیوکین ٨ "IL-8" کە خانەی کاژ دروستیدەکات فاکتەرێکی کیمیکی راکێشەرە بۆ خانەکانی لیمفۆسایت و خڕۆکەی سپی جۆری polymorphs بۆ بن توێژ و لەوێشەوە بۆ توێژ.

٢) **دژە ژیندەری ناوخانە** Intracellular antigines

ئەم دژە ژیندەرانە (وەك کەڕوو، ڤایرۆسی ناوخانە و دژە ژیندەری لوو tumor-antigens) پێشکەش بە خانەی لیمفۆسایتی بکوژ $CD_{8+}$ (cytotoxic T-cells) دەکرێن بەهۆی (واتا بە بوونی) Class I MHC، دوای ئەوە لیمفۆسایتی بکوژ و خانەی بکوژ جۆری K (K-cells) خانە تووشبووەکە دەکوژن.

خانەبکوژی سروشتی NK cells پێویستی بە هەستیارکردن بە دژەتەن نییە بەڵکو راستەوخۆ خانە تووشبووەکە دەکوژێت.

٣) **گۆشتە زوونەگمۆڵ Granuloma**: ئەگەر هاتوو سیستمی بەرگری نەیتوانی دژە ژیندەرەکان دەربکات ئەوە گۆشتەزوونەگمۆڵ دروست دەبێت.

أ) **گۆشتە زوونە گمۆڵ جۆری تەنی بێگانە (بیانی)** Foreign body granuloma:
دروستدەبێت چونکە تەنەکە (تۆخمەکە) بەبێ هەرسکردن undigested دەمێنێتەوە.

ب) **گۆشتەزوونەگمۆڵ جۆری بەرگری** Immunological granuloma:
ئەم جۆرە بۆ دروستبوونی پێویستی بە دژە ژیندەری بەردەوامبوو persistent antigene هەیە ، لێرەدا کاردانەوە بەرگریەکەی لەش بە بەرگری جۆری ٤ گەورە دەکرێت. سایتۆکاینەکان کە لیمفۆسایتەکان دروستیان کردوون ( واتا لیمفۆکاینەکان) دەبنە هۆی گۆڕینی ماکرۆفەیج بۆ خانەی رووپۆش ئاسا epithelioid cells و خانەی زەبەلاح giant cells و ئەمانەش سایتۆکاینی تر دەرێژن و کاردەکەنە سەر سۆ.

ئەم گۆشتەزوونە گمۆڵە لە نەخۆشی سیل، گولی، لە دەوری تۆخمی کیمیکی کە لەش ناتوانێت فرێی بدات وەك زرکونیۆم، نەخۆشی سارکۆید، نەخۆشی گوڵی rosacea و هەندێك جەوریە سۆ panniculits دا دەبینرێت.

## Functions of the skin ئەرکەکانی پێست

١- **بەربەستێکی پارێزەرە** protective barrier لە نێوان لەش و ژینگەدا بە گرتن و لابردنی میکرۆب و مژادە کیمیکە تێکدەرەکان و هەڵمژینی تیشکی خۆر و دژە ژیندەر و نیمچە دژە ژیندەر haptens.

٢- **پاراستنی** شلەی لەش و خوێ و گەردە گەورەکان لە ناو لەشدا دەهێڵێتەوە.

٣- **هەڵمژینی** دەرمان و هەتوان بۆ چارەسەری نەخۆشی پێست و مەبەستی تر.

٤- **رێکخستنی** پلەی گەرمای لەش.

٥- **کاردانەوەی بو هێزە زەبرەکان**: پێست تواناى ١٠-٥٠٪ی راکێشانی هەیە و دەگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی و زەبری کتوپڕ (لێدان) هەڵدەمژێت shock absorption.

٦- **بەرگری**: سیستمێکی بەرگری بەتوانایە.

٧- **هەست**: ئەرکە هەستیارەکان sensory functions وەك گواستنەوەی هەست، ئازار، لەرینەوە، پاڵەپەستۆ، گەرمی، ساردی، خوران و ختووکە بە پێست ئەنجام دەدرێت.

٨- **کۆمەڵایەتی**: ئەرکی کۆمەڵایەتی (جوانی) و سێکسی دەبینێت.

٩- **هاوسەنگی**: هێشتنەوەی ژینگەیەکی هاوسەنگ بۆ ناوەوەی لەش.

١٠- **توانین**: بەهێز و توووند و پتەوە لەگەڵ ئەوەشدا شل و نەرم و جیرە.

١١- **دابڕین**: ئەندامێکی دابڕە (عازل)، بۆ نموونە بۆ تەزووی کارەبا، سەرما، - تاد.

١٢- **چەورکەر** lubrication: پێست چەورە و دژی کارتێکردنی لێخشاندنە.

١٣- **پەسمەندەکەرە** reserve : بۆ وزە calories پەسمەندەکەرە.

١٤- **دروستکەرە** بۆ ڤیتامین D.

١٥- **بۆن دروستکەرە** Body odor (بۆنی لەش) بۆ راکێشانی سێکسی.

١٦- **پیشاندەرە**: وەك ئاوێنەیەك باری دەروونی و تەندروستی و زۆرنەخۆشی ناوەوە دەردەخات.

## دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکانی پێست Diagnosis of skin disorders

خۆشبەختانە نەخۆشیەکانی پێست لەبەرچاون و بە پشکنینی پێست بە چاو لەلایەن پسپۆی شارەزا ﴿هەندێك جار بە چاو و هەندێك جار بە بەکارهێنانی هاوێنەی گەورەکەر (عدسە)﴾ نەخۆشیەکە دیاریدەکرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا هەموو نەخۆشێك بەم شێوازەی خوارەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێت.

١- **مێژووی نەخۆشیەکە**: History بە تەسەلی لە لایەن پسپۆر وەردەگیرێت.

٢- **پشکنین** Examination: دوای پشکنینێکی باش لە رووناکیەکی سروشتی یان رووناکی کارەبایی و سەیرکردنی هەموو پێست و موو و نینۆك و ناوپۆشەکان و دەستنیشانکردنی جۆری دەردەکان lesions و دابەشکردنی لە لەشدا distribution و پێکهاتەی رواڵەتی (شێوەیی) morphology دەردەکان، ئەوسا نەخۆشیەکە دەستنیشان دەکرێت.ئەگەر بەمەی سەرەوە دیاریکردنەکە ناتەواو بوو ئەوسا دەچین بۆ هەنگاوەکانی تر.

## زاراوەزانی ناساغیەکانی پێست Terminology of skin lesions

دوو جۆر ناساغی پێستی هەن: ١- دەردە سەرەتاییەکان primary lesions.

٢- دەردە لاوەکییەکان (دووەمییەکان) secondary lesions.

أ) **دەردە سەرەتاییەکان بریتین لە:**

١- **لەکە** macule: **رووبەرێکی راستایی بچووکە** small flat area لە گۆڕانی رەنگی پێست یان ناوەرۆکی texture پێست کە لە ٥ ملم کەمتربێت.

٢- **سووربوونەوە** erythema: سووربوونەوە لە ئەنجامی فراوانبوونی موولوولە capillary dilatation روودەدات.

٣- **تەنۆچکە** papule: بەرزبوونەوەیەکی پتەوی بچووکە کە لە ٥ ملم کەمتربێت.

٤- **قوتکە** plaque: رووبەرێکی بەرزبووەوەی پێستە کە تیرەکەی لە ٢ سم گەورەتر بێت بەبێ قووڵیەکی ئەوتۆ.

٥- **بلۆق** vesicle: بەرزبوونەوەی پڕ ئاوە کە تیرەکەی لە ٥ ملم کەمتر بێت.

٦- **بلّق** bulla: بەرزبوونەوەی پڕ ئاوە کە تیرەکەی لە ٥ ملم پتربێت.

٧- **پیزۆکە** pustule: بەرزبوونەوەی پڕ کێمە.

٨- **دوومەڵ** abscess: کۆبوونەوەی کێمە لە بۆشایی cavity دا کە تیرەکەی لە ١سم پتربێت.

٩- لیر wheal: بەرزبوونەوەیەکی کاتی نەرمە بەهۆی زێدە شلە excess fluid لە بن توێژدا، قەبارەی دیاریکراو نییە.

١٠- لیری قوول (پەنەمانی بۆری) angio-oedema: پەنەمانی بلاو و قوولە بەهۆی فرەبوونی ئاوی پێست و ژێر پێست.

١١- لوو tumor: گەورەبوونی شانە tissue enlargement یە بە هۆی پڕبوونی خانەکان بە پێکهاتەی خانەی سروشتی یان ناساغ کە تیرەکەی لە ١سم گەورەتر بێت.

١٢- فرە دەزوولە telangiectasia: فراوانبوونی خوێنبۆریە باریکەکانە کە بە چاو دیارە.

١٣- خاڵە خوێن petechiae: لەکەی خوێنی بچوکە بە قەبارەی سەری دەرزی.

١٤- پەڵەخوێن purpura: لەکەی یان تەنۆچکەی خوێنە کە لە خاڵە خوێن گەورەتربێت (یان بریتییە لە دەرچوونی خوێن لە خوێنبۆریەکان بۆ پێست و ناوپۆش).

١٥- شین بوونەوە ecchymosis: پەڵەی گەورەی تێچوونی خوێنە بۆ ناو شانە.

١٦- خوێنەگمۆڵ haematoma: ئاوسانە بەهۆی خوێنبەربوون bleeding.

١٧- گرێیۆکە nodule: بریتییە لە پارچەیەکی پتەوی کەڵەکەبوو لە شانە کە تیرەکەی لە ٥ ملم پڕبێت و بە چاو دەبینرێت یان بە دەست هەستی پێدەکرێت.

١٨- پۆرگ cyst: بریتییە لە گرێی پۆرگی (توورەکە).

١٩- پێستەگۆڕاو poikiloderma: بریتییە لە پێکەوە روودانی ئەم گۆڕانکاریانە لە پێستدا: پوکانەوە atrophy + شلی تۆڕی reticular hyperpigmentation + فرە دەزوولە telangiectasia.

٢٠- سەرەزیپکە comedo: بریتییە لە سەرقاپێکی بچووکی قۆچەکاژی چەوری لە ناو کونی فراوانبووی سەلکەموودا.

٢١- قۆرت (کەندەک) burrow: بریتییە لە تەنۆچکەیەکی هێڵی یان کەوانەیی هێڵی لەگەڵ هەندێك کاژ، بەهۆی مشەخۆری گەڕی scabies دروستدەبێت.

**ب) ناساغیە لاوەکییەکان (دووەمییەکان) Secondary skin lesions**

ئەم دەردە لاوەکییانە لە دەردە سەرەتاییەکان پەیدادەبن و ئەمانەی خوارەوەن:

١- کاژ scale: تەنکە توێژێکی (پوولەکەی) چینی کاژە.

٢- قۆچەکاژ keratosis: ئەستووربوونی چینی کاژە وەك قۆچ (شاخ).

٣- قەتماغە crust: لە کاژ دەچێت، بەڵام لە خوێن و شلەی شانەی وشکبووەوە پێکهاتووە.

٤- **چاڵەبرین** ulcer: بریتییە لە پارچەیەك لە رووی پێست کە هەموو توێژ و کەمەکەی بەشی سەرەوەی بن توێژی تێدا نەماوە و لەوانەیە بۆ چەوری ژێر پێست بکشێت و دوای چاکبوونەوە جێ زام جێبهێڵێت.

٥- **داماڵان** erosion: پارچەیەك لە پێست کە هەندێك یان هەموو توێژەکەی داماڵرابێت (نەمابێت).

٦- **رووشان** excoriation: بریتییە لە چاڵەبرین یان داماڵان کە بەهۆی خوراندن scratching دروست دەبێت.

٧- **قلێش یان قلێشان** fissure: درزی پێستە.

٨- **کەلێن** sinus: بریتییە لە کەناڵ یان گیرفان کە رێگە بە دەرچوونی شلە fluid یان کێم pus دەدات.

٩- **جێ زام** scar: بریتییە لە نەمانی پێستی ئاسایی و جێگرتنی (وەبەرخستنەوەی) بە شانەی ریشاڵی fibrous tissue.

١٠- **پووکانەوە** atrophy: تەنکبوونەوەی پێستە (توێژ یان بن توێژ یان ژێر پێست) و لەوانەیە وەك پەرەسیگاری لێبێت و موولوولەی تێدا بە چاو دیاربێت.

١١- **پێستەستوورە** lichenification: پارچەیەك لە پێست ئەستووربووە و هێڵە ئاساییەکانی پێستی skin markings تێدا زەقترن.

١٢- **تەقینی پێست - جێ راکێشان** striae (stretch marks): شێوە هێڵێکی سپی یان پەمەیین لە پێستدا بەهۆی گۆڕانکاری بەستەرە شانەی بن توێژ.

١٣- **رەنگ گۆڕی** pigmentation: بریتییە لە گۆڕانی رەنگی پێست بەرەو کاڵتر یان تۆختر.

١٤- **تۆکمەبوون** induration: بریتییە لە دەرد کە چڕ و چەسپ و سەخت بێت.

**هەندێك لە تەکنیك و ئامێری تایبەتی دەستنیشانکردنی نەخۆشی پێست، کە پزیشك خۆی لە** دیدەنگاکەی بۆی دەکرێت:

١- **هاوێنەی دەست** hand-lens: بەم هاوێنەیە باشتر و جوانتر ناساغیە بچووکەکان دەبینرێن.

٢- **تیشکی وود** woods light: لە هاوێنەی چاو دەچێت، لە ناو ژوورێکی تاریکدا بەم تیشکە زۆر نەخۆشی باشتر دەردەکەون، بۆ نموونە کەرووی سەر، نەخۆشی بەڵەکی، کەرووی ناو ران - تاد.

٣- **تیڕوانین بە شووشە** diascopy: کەرتێك شووشە (سلاید) لەسەر ناساغیەکە دادەنرێت و پەستانی دەخرێتەسەر بۆ ئەوەی خوێنی ناو ناساغیەکە لابچێت و باشتر و روونتر خۆی نیشان بدات، بۆ نموونە ناساغی سیلی پێست.

٤- **وێنەگرتن** photography: وێنەیەك یان چەند وێنەیەکی نەخۆشیەکە دەگیرێت و لە کاتێکی دواتردا لەگەڵ نەخۆشیەکە بەراورد دەکرێت تا بزانرێت نەخۆشیەکە چۆن گەشەی کردووە بۆ پتر دەرکەوتنی نیشانەکانی یان کارتێکردنی چارەسەر بۆ لابردنی نەخۆشیەکە - تاد.

٥- **پێست بین** dermatoscopy: ئامێرێکە وەك لایتی دەست بۆ گەورەکردنی ناساغیەکە ١٠ جار دوای داپۆشینی ناساغیەکە بە زەیت یان ئەلکوهول یان ئاو، ئەوسا روونناك دەکرێتەوە و سەیر دەکرێت، رەنگی ناساغیەکە زۆر روون و ئاشکراتر دەبینرێت، بۆ نموونە نەخۆشی میلانۆما، بالووکە و خوێنبۆریە گمۆڵ hemangioma.

## هەندێك پشكنینی لای پزیشك:

١- **پشكنینی هایدرۆكسیدی پۆتاسیۆم** KOH examination: بە تایبەتی بۆ نەخۆشی کەڕوو fungus بەکاردەهێنرێت، چەند کاژێك یان موویێك لەسەر سلایدێکی شووشە دادەنرێت و چەند دڵۆپەیەك شلەی KOHی دەخرێتە سەر و لە ژێر مایکرۆسکۆب (وردبین)دا سەیر دەکرێت.

٢- **دۆزینەوەی مێرووی گەڕی** Detection of scabies mite: بە تایبەتی لە نێوان پەنجەکانی دەست دا، بە کۆتایی دەرزیەکی ئاسایی یان بە بەکارهێنانی زەیت کاژەکان کۆدەکەینەوە سەر سلایدێك و بە وردبین سەیری دەکەین.

٣- **خانەزانی سڕینی تزانك** Tzanc smear cytology: بۆ دۆزینەوەی نەخۆشی بڵقی یان ڤایرۆسی تامیسك بەکاردەهێنرێت ، سەری بڵقەکە لادەبرێت و خانەکانی ژێر بڵقەکە لەسەر سلاید دادەنرێت بۆ دۆزینەوەی خانەی تایبەت بەم نەخۆشیە.

٤- **نەزموونی پارچە** Patch test: تاکە دژە ژیندەر یان کۆمەڵێك دژە ژیندەر کە ئامادەکراون لەسەر پێستی پشت بۆ ماوەی ٤٨ کاتژمێر دادەنرێن (دەلکێنرێن) و ئەوسا لادەبرێن، دوای ١٠ خولەك و دوای ٩٦ کاتژمێر سەیری شوێنەکانی پێست دەکرێت بۆ زانینی فرەهەستیاری بۆ ئەم دژە ژیندەرانە و بەپێی کردن و نەکردنی سۆ لەم شوێنانەدا لە سفرەوە تا ٤ پلە دەستنیشان دەکرێت.

٥- **نەزموونی دەرزی بە پێستداکردن** Prick test: لە نەخۆشی پێستدا زۆر بەکەڵك نییە. بۆ زانینی هۆی لیردەرکردن یان بیرۆی جێگۆڕاو بەکاردەهێنرێت. ئەم تاقیکردنەوەیە جۆری یەکی

سیستمی بەرگری نیشان دەدات، دڵۆپەیەك لە دژە ژیندەری گومانلێکراو لەسەر باسك دادەنرێت و دەرزیەکی پاك دەچەقێنرێتە ناو پێست (بە ناو دڵۆپەکەدا)، ئەوسا دڵۆپەکە لادەبرێت و دوای ١٠ خولەك جێگا دەرزیەکە "دڵۆپەکە" بۆ بینینی لیر دەپشکنرێت و لە (سفر تا ٤) پلە (٠، ١، ٢، ٣، ٤) دەخوێنرێتەوە. لەجیاتی ئەم جۆرە پشکنینە پشکنینی RAST ئێستا لە تاقیگە بەکاردەهێنرێت کە زۆر باشترە.

٦- **نموونەوەرگرتن** Skin biopsy: ئەم جۆرە پشکنینە لە پێستدا زۆر گرنگە، بە ٣ جۆر نموونەکە وەردەگیرێت:

١) بڕینی هەموو ناساغیەکە exisional biopsy.

٢) بڕینی پارچەیەك لە ناساغیەکە incisional biops.

٣) نقورچە نموونە punch biops، پەنج ئامێرێکە وەك قوچەکەیەکی بچووکی دەمتیژە.

ئەم نموونانەی وەرگیراون لە ناو شلەی فۆرمالین دادەنرێن و بۆ پسپۆری لێزان دەنێردرێن بۆ خوێندنەوەی وردەکاریەکان و گۆڕانکاریەکان.

## پشکنینی تاقیگە Laboratory tests:

بۆ نموونە:

١- پشکنینی خوێن – زەرداوی خوێن serum، میز، پیسایی، چڵم – تاد.

٢- ڕواندنی culture بەکتریا، کەڕوو و ڤایرۆس لە پێست و ئەوانەی خاڵی ١.

٣- پشکنینی بەرگریە درەوشێ immunoflorescent.

٤- بەرگریە شانە کیمیکی immunohistochemical.

ئێکسبەرداری radiography

سۆنار ultrasonography

٥- وێنە گەورەکەرەکان image magnifications .

# نەخۆشیەکانی پێست دەرئە نجامی هۆکارە سروشتیەکان
# Dermatoses resulting from physical factors

لەش پێویستی بە برێکی دیاریکراو لە گەرمی هەیە ، بەڵام پتربوونی یان کەمبوونی ئەم برە گەرمییە دەبێتە هۆی نەخۆشی، چونکە پێست بۆ ژینگە ئۆرگانێکی کراوەیە و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پێست یەکەم ئەندام بێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم گۆڕانە لە پلەی گەرما و لەم بوارەدا یەکەم قوربانییە.

## I ) زەبرەکانی گەرمی Heat injuries

### أ) سووتان Thermal burns

#### ١- سووتان بە ئاگر یان ئاو و شلەی کوڵاو

گۆڕانکاریەکان کە بەسەر پێستدا دێن چوار پلەن:

١) **پلەی یەکی سووتان** First degree burn: **نموونەکەی هەتاوبردنە sunburn، بۆریە خوێنە رووکاریەکانی پێست ئاوساو و پڕخوێن دەبن لەگەڵ سووربوونەوە و پاشان کاژکردن desquamation، لەوانەیە لەم پلەیەدا ئازار و پێست گەرمبوون زۆر بێت و ئەگەر رووبەرێکی زۆری لە پێست گرتبێتەوە ئەوە تا و لەرزیشی لەگەڵدا دەبێت.**

٢) **پلەی دووی سووتان** Second degree burn:

**دوو جۆرە: (وێنەی ٩)**



**(وێنەی ٩) پلەی دووی سووتانی رووکاری**

أ) پلەی دووی ڕووکاری Superficial second degree

**زەرداوی خوێن serum لە موولوولەکان بۆ سەر پێست دەردەچێت لەگەڵ پەیدابوونی ئاوسان oedoma و بلۆق و بڵق، ئەم جۆرە بێ جێهێشتنی شوێنەوار سارێژدەبێت.**

ب) پلەی دووی قووڵ Deep second degree: **پێست کاڵ pale و سڕە چونکە بن توێژی تۆڕی گرتۆتەوە و دەمار و بۆری خوێنەکان و پاشکۆکان لە ناوچوون، دوای یەك مانگ بە جێهێشتنی جێ زام scar سارێژ دەبێت**

٣) **پلەی سێی سووتان** Third degree burn: ئەم جۆرە هەموو چینەکانی پێست و هەندێك لە ژێر پێستیش دەگرێتەوە و بە جێهێشتنی جێ زام سارێژ دەبێت.

٤) **پلەی چواری سووتان** Fourth degree burn: هەموو پێست و ژێر پێست و پەتکی ماسولکە tendons دەگرێتەوە. ئەم دوو جۆرە لەرز و تا و دابەزینی پەستانی خوێن و ئازارێکی زۆری لەگەڵدایە و ونبوونی خوێ و ئاوی لەش و تووشبوونی بەکتریا و پیسبوونی خوێن و toxemia ئەندامەکانی organs ناوەوە( وەك پەردەسۆی مێشك و سی و گورچیلە) بە مەرجێك ڕووبەرێکی زۆری پێستی گرتبێتەوە ڕوودەدەن و ئاکامی تریشی لێدەکەوێتەوە. پلەی سێ و چوار پێویستیان بە متوربە grafting ی پێست هەیە.

کەواتا سێ فاکتەر ڕۆڵیان لە سووکی و توندی سووتاندا هەیە:

١- قووڵی.

٢- ڕووبەری پێستی سووتاو.

٣- شوێنی سووتان (شوێنێك بۆری خوێنی زۆر بێت ئەنجامەکەی بەدترە)

## چارەسەر Treatment

بڵقەکانی پلەی دوو نابێت لابرێن چونکە پارێزگاری چینەکەی پێستی ژێر خۆیان لە بەکتریا دەکەن ، ئەگەر ئازاری زۆریان پەیداکرد ئەوە بە دەرزیەکی پاك کون دەکرێن و ئاوەکەی ناویان لەسەرخۆ دەردەدرێت و دیواری بڵقەکان بۆ سەر پێستی ژێریان پاندەکرێنەوە.

- هەتوانی (مەرهەمی) سلڤەر سەلفادایازین silver sulfadiazine بۆ کۆنترۆڵکردنی سۆ بە بەکتریا bacterial infection بەکاردێت.
- شلەی سیلڤەر نایترەیت silver nitrate solution یان پێچەری خوساو بە زیو silver impregnated dressings بەکاردەهێنرێن.
- سەلفامایلۆن sulfamylon زۆر بەکاردەهێنرێت یان دۆمانی پێستی دەستکرد synthetic skin substitutes وەك پەردەی کۆلاجین و بیلامینەیتی دەستکرد collagen- synthetic bilaminate membrances .
- دەرمانی کەمکردنەوەی ئازار.
- بەکارهێنانی دژەبەکتریا antibiotics و کەڕوو.
- چارەسەری ئاو وخوێی لەش (کە لە لەش دەرچووە).
- پاککردنەوەی شانە پیسبووەکان debridment.
- خۆراکێکی باش و پرڤیتامینەکانی دەدرێتێ.
- پێست متوربەکردن.

که ڕێژەی ڕووبەری پێستی سووتاو لــە ١٥٪ پتربــوو دەبێــت لــە نەخۆشــخانەی تایــەت چارەسەربکرێت.

## ٢- سووتان بە تەزووی کارەبا Electrical burns

بە دوو شێوە ڕوودەدات: (وێنەی ١٠)

١) **لێککەوتن** Contact: بە بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی شوێنێکی لەش بە سەرچاوەی تەزووی کارەبا ڕوودەدات، ئەم جۆرە ســووتانە بچووکە بەڵام قووڵە و لە باری قۆڵتیەی نزمدا باش سارێژ دەبێت. بەڵام قۆڵتیــەی بــەرز دەبێتــە هــۆی زیــانێکی زۆر لــە ئەندامەکانی ناوەوە هەرچــەندە ســووتانە ڕووکەشیەکە کەم و سانا دەردەکەوێت.



(وێنەی ١٠) سووتان بە تەزووی کارەبا

٢) **ســووتان بــە کڵپــەی کارەبــایی** Flash burns: ڕووبەرێکی زۆری پێست وەك سووتان بە ئاگر و گیراوەی کــوڵاو دەگرێتــەوە، بەڵام کڵپەی کارەبایی ڕاستەوخۆش بە لێککەوتن لەگەڵ پێستدا هەیــە و لێــرەدا چــوونە ژوورەوە و دەرەوەی سووتانەکە دیارە و لەوانەیە ببێت بەهۆی دڵوەستان یان ماکی تر.

## ب) گەرمەژنە Miliaria

بریتییە لە هێشتنەوەی retension ئارەق لە ناو پێستدا لە ئەنجامی داخرانی کونی ئــارەقی درشتە ئارەقە گلاند. جۆرەکانی:

**گــەرمەژنــەی بلــووری (ڕوون)** Miliaria crystallina: (وێنەی ١١) لە منــاڵی ساوای پێچراودا، پیری پەککەوتــە لــە جێــدا یــان لــە ئــەنجامی تــا دا fever ڕوودەدات، بلۆقی بچــووکی ڕوون و ڕووکــاری بــێ ئــەوەی پێســتەکە ســووربووبێتەوە دەردەچــن، ئــازار و خورانی نییە و چارەسەری ناوێت.



(وێنەی ١١) گەرمەژنەی بلووری بڵقی.

١- **گەرمەژنەی سوور** Miliaria rubra: لە ئەنجامی داخرانی کونی درشتە ئارەقە گلاند بۆری گلاندەکە لە چینی درکەیدا دەپچڕێت و ئارەق دەچێتە دەرەوەی بۆریەکە بۆ ناو توێژ و دەبێتە هۆی دروستبوونی تەنۆچکە و بلۆقی سوور لەگەڵ خوران و کزانەوە. ئەم گەرمەژنەیە لە شوێنە گەرمەکاندا کە مرۆڤ زۆر ئارەق دەکاتەوە روو دەدات و شوێنە گەرمەکانی لەش دەگرێتەوە وەك ژێر باڵ، ژێر مەمك، ناوران و لۆچی ئانیشك و ئەژنۆ – تاد. **(وێنەی ١٢)**



**(وێنەی ١٢) گەرمەژنەی سوور.**

٢- **گەرمەژنەی کێمی** Miliaria pustulosa: ئەم جۆرە لەو شوێنانەدا کە پێشتر نەخۆشیان تێدابووە و بۆتە هۆی داخرانی کونی ئارەقە گلاندەکان روودەدات وەك نەخۆشی بیرۆ، ناوگەڵ سووتانەوە، پێستەسۆی فرەهەستیاری، – تاد، لەوانەیە دوای چاکبوونەوەی ئەم نەخۆشیانە ئەم جۆرە گەرمەژنەیە وەك پیزۆکە ،کە کێمی تێدایە، روویدات و خورانی زۆر دروست دەکات.

٣- **گەرمەژنەی قووڵ** Miliaria profunda: لە شوێنە گەرمەکاندا دوا بە دوای گەرمەژنەی سوور ،کە بووە بەهۆی برینداربوونی گلاندەکان و لەکارکەوتنیان، روودەدات. لێرەدا تەنۆچکەی سپی قووڵ یان رەنگ پێستی، بێ خوران ،روودەدەن چونکە تێکشکانی بۆریەکان قووڵە (لە بن توێژدایە).

٣ باری تریش هەن کە پەیوەندییان بە گەرمەژنەوە هەیە وەك:

١- **کەمبوونەوەی ئارەقڕشتن دوای گەرمەژنە** Post milarial hypohidrosis: لە ئەنجامی داخرانی کون و بۆری درشتە ئارەقە گلاندەکان روودەدات ، لەوانەیە وابکات مرۆڤەکە توانای ئیشکردنی لە شوێنی گەرمدا نەمێنێت چونکە کەمبوونەوەی ئارەقڕشتن دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی توانای کارکردن، زوو تووڕەبوون، نەمانی ئارەزووی خواردن، خەواڵوویی، گێژبوون و سەرئێشە و لەوانەیە سێ حەفتە بخایەنێت.

٢- **سستی لە ئەنجامی ئارەق نەکردنەوە لە شوێنە گەرمەکان** Tropical anhidrotic asthenia: دەگمەنە و لە ئەنجامی داخرانی درێژخایەنی کونی ئارەقە گلاندەکان روودەدات و دەبێتە هۆی ئارەق نەکردنەوە و سستی و لاوازی.

٣- **گەرمەژنەی داخستن (بەستن)** Occlusion miliaria: کە رووبەرێکی پێست بۆ ٤٨ کاتژمێر یان پتر، بەهۆی نایلۆن - تاد دابخرێت ،روودەدات.

**چارەسەر** Treatment

١- نەخۆشەکە بۆ شوێنێکی فێنك و سارد بگوێزرێتەوە.

٢- بەکارهێنانی هەواجوولێن (پانکە) بۆ فێنك کردنەوەی پێست.

٣- مەرهەمی لانۆلین lanolin و ڤازیلین بۆ کردنەوەی کونی گلاندەکان بەکاردەهێنرێن.

٤- خۆشۆردن بە ئاوی فێنك.

٥- هەندێکجار بۆدرەی نیشاستە corn-starch powder و بۆدرەی تالك baby powder بەکەڵکن.

## ج) سووربوونەوەی گەرمی دوور لە ئاگر (سووربوونەوەی خۆگەرمکردنەوە) Erythema Ab Igne

بریتییە لە سووربوونەوەیەکی بەردەوام و دواتر رەنگ گۆڕانێکی تۆڕی (پەمەیی ، سووری تۆخ ، قاوەیی و رەش - بە تێکەڵاوی) بەتایبەتی لەسەر پێ و لاق و هەندێکجار ران و باسك لە ئەنجامی خۆگەرمکردنەوەی درێژخایەن نزیك زۆپا و هیتەر و سەرچاوەی تری خۆگەرمکردنەوە (بە دانیشتنی زۆر نزیك لەم سەرچاوانە) لە وەرزی سەرمادا. (وێنەی ١٣)



(وێنەی ١٣) سووربوونەوەی خۆگەرمکردنەوە.

**چارەسەر:**

١- وازلێهێنانی ئەم خووە (نزیك دانیشتن لە سەرچاوەی خۆگەرمکردنەوە).

٢- مەرهەمی ئەلفا هایدرۆکسی ئەسیدەکان ∝ hydroxy acids، یان کرێمی کۆرتیزۆنی (وەك فلوسینۆلۆن) + هایدرۆکینۆن + ترێتینۆین.

## د) زێدەتای گەرمی و لێدانی گەرمی Heat hyperpyrexia and heat stroke

بەهۆی تێشکانی رێکخستنی پلەی گەرما thermoregulatory failure روودەدات و دەبێتە هۆی نەمانی ئارەق دەردان لە هەموو لەشدا و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەش (پلەی گەرمای کۆم پتر لە ٤٠,٥ پلەی سەدی بێت) و تێکچوونی کۆئەندامی دەماری ناوەندی C.N.S. وەك سەرلێشێوان mental confusion، بوورانەوە یان فێ، پێست وشك و گەرم

دەبێت. لە دواییدا خوێنڕێژی ناو مێشك و ڕژێنی ئەدرینال و زیان هێنانی گورچیلە و جگەر ڕوودەدەن و خەپلەخوێنەکان لەگەڵ فایبرینۆجین کەمدەبنەوە.

**چارەسەر**

١- خێرا ساردکردنەوەی لەش بە هەرچی ڕێگایەك لە بەر دەستدا بێت، وەك خستنی نەخۆش بۆ ناو ئاوکۆی بەفر یان ئاوی زۆر سارد تا پلەی گەرمای کۆم بۆ ژێر ٣٩ پلەی سەدی دادەبەزێت.

٢- بەکارهێنانی کلۆرپرۆمازین chlorpromazine.

٣- بەکارهێنانی ستیرۆید steroids بە دەم یان بە خوێن.

٤- چاودێریکردنی کاری گورچیلە و جگەر.

ئەگەر چارەسەر نەکرێت هەموو نەخۆشەکان خێرا دەمرن، بە چارەسەرکردنیش ٣٥٪یان هەر دەمرن.

## II)زەبرەکانی ساردی Cold injuries

**کاردانەوەی فیسیۆلۆجی بۆ ساردی (سەرما):** ئەم کاردانەوەیە پشت بە چەند فاکتەرێك دەبەستێت:

١- پلەی گەرماکە (نزمی پلەی گەرماکە).

٢- تێکڕای ساردبوونەوەکە (خێرا یان لەسەرخۆ) rate of chilling.

٣- تێکڕای گەرمبوونەوەکە rate of rewarming.

- نزمی پلەی گەرما کە بەس بێت بۆ بەستنی freezing شانەکان خانەکان لەکاردەخات و کریستاڵی سەهۆڵی ورد لە ناوەوە و دەرەوەی خانەکاندا دروستدەبێت.
- بەڵام کە پلەی گەرما بۆ ئاستێك (کە نەبێتە هۆی بەستنی شانەکان) نزم بۆوە ئەوە هەر دارمانێکی کەمتر دروستدەبێت و کاری هەموو ئەنزیم و پرۆسە گرنگەکان دادەبەزێت.

**کاریگەریەکانی کەوتنە بەر سەرما:**

١- بۆریە خوێنەکان بەم ڕێگایانە تەسك دەکاتەوە:

١) ڕاستەوخۆ.

٢) پتربوونی تۆنی دەماری وزەوالا sympathetic tone لە ڕێی وەرگرە ساردیەکانی پێست.

٣) کە پلەی گەرمای ناو خوێن دابەزی مەڵبەندی ڕێکخستنی پلەی گەرما heat regulating center لە ژێر لانکە hypothalamus بۆریە خوێنەکان تەسك دەکاتەوە.

لە دابەزینی پلەی گەرمادا تەسك بوونەوەی vasocontriction خوێنبەرەکان arteries لە هی خوێنهێنەرەکان veins پتر بەڵام لە گەرمکردنەوەدا بە پێچەوانەیە، بۆیە دوای گەرمکرنەوە ئەم بەشەی بەر سەرما کەوتووە سوور دەبێتەوە و دەئاوسێت.

٢- کارێکی تری نزمبوونەوەی پلەی گەرما ئەوەیە کە لینجی viscosity خوێن پتر دەکات.

٣- گۆڕانی پێوە نوسانی (لکانی) خەپلە خوێنە.

٤- تەزووی گەیەنەری دەمارەکان کەم دەبێتەوە.

٥- گۆڕینی ئۆکسی هیمۆگلۆبین بۆ هیمۆگلۆبین کەم دەبێتەوە.

**هەندێك هۆکاری تر** ڕۆڵ لە زیانی ساردیدا دەبینن وەك:

١- خێرایی با، زیان پتر دەکات.

٢- شێی هەوا، ئەمەش زیان پتر دەکات.

٣- بەرزی (وەك لوتکەی شاخەکان)، ئەمەش هەر زیانی سەرما پتر دەکات.

**دوو جۆر نەخۆشی بە سەرما (ساردی) دروست دەبن:**

## أ- نەخۆشیەکانی بەرکەوتنی سەرما: Diseases of cold exposure

### ١) سەرماگەستە Frost bite

بریتییە لە بەستنی freezing شانەکان بە خێرایی.



**(وێنەی ١٤ أ) سەرماگەستەی رووکاری.**



**(وێنەی ١٤ ب) سەرماگەستە (کاردانەوەی بلقی).**

بە فرەنزمی پلەی گەرما، چەند چرکەیەك لەم سەرمایە لەوانەیە دروستی بکات. ئەم بارە بەهۆی هەوای سارد، کانزای metal یان شلەی liquids سارد ڕوودەدات.
گەستنی سەرما دەبێتە هۆی مردنی شانەکان، خانە تۆخەکان زووتر دەمرن و رەشپێستەکان پتر زیان پێگەیشتوو دەبن، هەروەها دەمارەکانیش زوو لە ناودەچن.

بۆری خوێن و لیمفەبۆری و چەوری ژێر پێست تێکدەچن.

**گەستنی سەرما سێ پلەی هەیە:**

١- **پلەی یەك، بەستنی سەرمای سووك** Frost nip: تەنیا پێست دەگرێتەوە، نەخۆش هەست بە ساردیەکی زۆر دەکات، سڕبوون

و ئازار و سووربوونەوە لە روومەت، گوێچکە، لووت و هەرچوار پەلەکان limbs روودەدەن. ئاوسان و بڵق رووناداەن، بێ زیانی دواتر نەخۆش چاکدەبێتەوە.

٢- **پلەی دوو، گەستنی سەرمای رووکاری** Superficial frost bite: (وێنەی ١٤ أ) پێست و کەمێك ژێر پێست دەگرێتەوە، نیشانەکانی پلەی یەکی تێدایە بەڵام ئازار بۆ سووتانەوە دەگۆڕێت. ئەمەش نیشانەیەکی باش نییە و پێست وەك مۆمی لێدێت waxy بەڵام شانەکانی ژێرەوە ئاسایین، ئاوسان و سووربوونەوە لە ماوەی ٢٤-٣٦ کاتژمێردا روودەدەن و دوای تووانەوە thawing ی بەشە بەستووەکە بڵقی روون دروستدەبن.

٣- **پلەی سێ ، گەستنی سەرمای قووڵ** Deep frost bite: (وێنەی ١٤ ب) لەم پلەیەدا پێست و هەموو ژێر پێست دەیبەستێت، پێستە بەستووەکە سپی یان سپی شینە blue white لەگەڵ سڕبوون و نەبوونی ئازار، پەشێوی بە سەرما نامێنێت. شانەکان بە تەواوی سڕ numb و تۆکمە indurated بوون و جومگەکان و پەلەکان توانای جووڵەیان نامێنێت و ماسوولکەکان ئیفلیج دەبن. دەمارەکان و بۆریەکانی خوێن و هەندێکجار ئێسکەکان تێك دەشکێن، دوای یەك دوو رۆژ لە گەرمبوونەوە بڵقی گەورە دروست دەبن و وەك سووتان (بۆ چوار پلە) دابەش دەبێت. لە ماوەی ٥-١٠ رۆژدا ئاوی ناو بڵقەکان هەڵدەمژرێت و ئەوسا لارەشەی رەق دروست دەبێت، دوای چەند حەفتەیەك هێڵی جیاکەری شانەی لارەشەکە و شانە ئاساییەکە دەردەکەوێت و شانە لارەشەکە بۆ خۆی لێدەبێتەوە autoamputation ، لەوانەیە دوای سارێژبوونیش سڕی و فرەهەستیاری بە سەرما و کەمخۆراك چوون بۆ شانەکان بمێنن.

گەستنی سەرما لەو خەڵکانەدا کە لە شوێنی زۆر سارد بن روودەدات وەك چیاکان لە وەرزی سەرما و بەفربارین دا بۆ نموونە لە رێبوار و یاریکەر و گەڕۆکدا، - تاد، لە کاتی جەنگ دا لە سەربازەکان دا زۆر روودەدات.

لە ناو کۆمەڵ دا مەیخۆر و بێماڵەکان پتر تووشیان دەبێت.

**چارەسەر**

١- خێرا گەرمکردنەوە بە ئاوی گەرم (٤٠-٤٢ پلەی سەدی) بۆ ماوەی ٢٠ خولەك.

٢- دەرمانی دژە ئازار.

٣- هیپارین + دێکستڕانی کێشی گەردی بچووك low molecular weight dextran.

٤- فراوانکەری خوێنبۆریەکان vasodilators + مەیین توێنەرەوەکان thrombolytic agents.

٥- پشوودان bed rest، خۆراکی باش و گرنگیدان بە برینەکان (وەك باری سووتان).

٦- دژە بەکتریا antibiotics.

٧- بەرزکردنەوەی پەلە بەستراوەکە و چەماندنەوەی.

٨- پێکوتەی vaccin دژە دەردەکۆپان tetanus.

٩- بڕینی (بە نەشتەرگەری) شانە بە لاڕەشەبووەکە چەند حەفتەیەك یان مانگێك دواتر ئـەنجام دەدرێت.

٢) **پێی کەندر (نقووم بوو)** Trench (Immersion) foot



**وێنەی ١٥) پێی کەندر**

لە ئەنجامی مانەوە یان وەستانی دوور و درێژ لە کـەش وهەوایـەکی سـارد و شـێداردا (پلـەی گەرما سەرووی بەستن بێت بە تایبەتی بە بوونی با) سووربوونەوە و ئاوسان و سڕبوونی پێ روو دەدات و هەندێکجار بۆریە خوێنەکان دەشێوێن و لەوانەیە لاڕەشە دروست بێت. **(وێنەی ١٥)**

**چارەسەر:** وەك گەستنی سەرمایە.

**وشکە پێستی زستان Winter xerosis :**

زۆر خەڵك لە زستانی ساردا پێستیان بە تایبـەتی لاقەکانیان وشك دەبێت بەڵام لەوانەیە دەست و باسك و روومەت و لێو و قەدیش بگرێتەوە. خوران، وشـکبوونەوەی پێـست، کـاژکردن و درز روو دەدەن، کرێمی چەورکەر emolients چارەسەرەکەیەتی لەگەڵ خۆپاراستن لە داهاتوودا بـە شێوەیەکی گەرم وگوڕ.

لەوانەیـە سـووربوونەوەی هەمیشـەیی پێسـت( بـە تایبـەتی لـە دەموچـاودا ) ئـەنجامی ئـەم دووبارەبوونەوەی سەرمایە بێت.

## ب) نەخۆشیەکانی هەستیاری نائاسایی بە سەرما

## Diseases of abnormal senstitivity to cold

هەندێك کەس بۆ سەرمای ئاسایی کاردانەوەی ناسروشتیان پتر لە سنووری ئاسایی هەیە و لە ئەنجامدا نەخۆشی دروست دەبێت. وەك:

١- **تەنۆچکـەی (هـەڵتۆقیوی) سـاردی** Chilblains: بریتییـە لـە تەنۆچـکەی سـووری بەخورووی بە ئازار و لەوانەیە چاڵەبرین و بڵقیشی لەگەڵـدابێت، بـە تایبـەتی لـە پەنجـەکانی دەست و پێدا بـەڵام لەوانەیـە دەسـت و پـێ و لـوت و گوێچـکە و سمتـیش بگرێتـەوە. بـە دەستلێدان ئازاری هەیە و پێستەکەی دەوروبەریشی زۆر جار شین و سووربۆتەوە.

لە پایز و زستاندا بە تایبەتی لە منالّ و گەنجدا روودەدات.

بوونی نەخۆشی تر یان هۆکاری تر وەك بۆماوەیی، کەم تەمەنی، بەسالاّچوون، نەخۆشی بۆری خوێنەکان، بەد خۆراکی، تێکچوونی پرۆتینی خوێن dysproteinaemias و نەخۆری پتر ئەم بارە دروسەت دەکەن. (وێنەی ١٦ و ١٧)





(وێنەی ١٦) تەنۆچکەی ساردی

**چارەسەر:** پاراستن لە سەرما، دەستکێشی خوری و گۆرەوی خوری ئەستوور لەگەلّ خۆگەرمداپۆشین گرنگن، ئەندامە ناساغەکە راستەوخۆ نزیك سۆپا و هیتەر گەرم نەکرێتەوە. خوێنبۆری فراوانکەرەکان وەك:

دەرمانی نیفیدیپین nifedipine ، دیلتیازیم diltiazem ٢٠ ملگم × ٣، نیکۆتینیك ئەسید nicotinic acid ٥٠٠ ملگم × ٣ یان داپیریدامۆلّ dipyridamole ٢٥ ملگم × ٣ بەکەلّکن.



(وێنەی ١٧ أ) تەنۆچکەی ساردی

٢- **دیاردەی راینۆد** Raynaud's phenomenon:

بریتییە لە ناوبەناو دروستبوونی سپی هەلّگەڕان palor دواتر شین هەلّگەڕان cyanosis و ئەوسا سوورهەلّگەڕانی redness پەنجەکان (یان یەك یان چەند پەنجەیەك) لە ئاکامی کاردانەوەی نائاسایی بۆ سەرما cold و هەندێکجار بۆ کارتێکردنی سۆزی emotional effect. دوو جۆری هەیە:



(وێنەی ١٧ ب) تەنۆچکەی ساردی

١) **دیاردەی راینۆدی سەرەتایی** Primary Raynaud's phenomenon: هۆکاری دیار نییە و بەشێك نییە لە نەخۆشیەکی تر. زۆربەی نەخۆشەکان گەنجن و مێینەن، پەنجەکانی هەردوو دەست لە وەرزی سەرمادا دیاردەکەیان تێدایە. ئاکامی نەخۆشیەکە لە ٨٠٪ی بارەکاندا باشە و لە ٢٠٪یاندا باش نییە.

٢) **نەخۆشی راینۆد** Raynaud's disease: ئەم جۆرە بەهۆی نەخۆشیەکی تر روودەدات و تەمەن یان رەگەز (نێر و مێ) گرنگ نییە چونکە نەخۆشیە سەرەتاییەکەی تر رۆلّ دەبینێت و ئەم جۆرە لەوانەیە یەك یان چەند پەنجەیەك یان پەنجەکانی یەك دەست بگرێتەوە و زۆربەی بارەکان ئاکامی بەدی وەك لارەشە و سالّ بەسالّ توندتربوونی هەیە، ئەمە جگە لە نیشانەکانی نەخۆشیە سەرەتاییەکەش.

نەخۆشیە سەرەکیەکان ئەمانەن:

زەبر یان لەرینەوە trauma or vibration: لەرینەوە وەك میوزیکژەن، ئامێری کۆنکرێت شکێن "هزازە".

نەخۆشی بەستەرەشانەکان و خوێنبۆریەسۆ connective tissue diseases & vasculitis، وەك نەخۆشی گورکە سوورە S.L.E و رەقبوونی پێست scleroderma.

نەخۆشیەکانی داخرانی خوێنبەرەکان obstructive arterial diseases.

١- نەخۆشی دەمارەکان.

٢- نەخۆشی خوێن.

٣- دەرمان و ژەهر toxins وەك دەرمانی ئێرگۆت، ئینديراڵ، بلیۆمایسین و کانزا قورسەکان heavy metals.

٤- هی تریش.

## چارەسەر

لە نەخۆشی راینۆددا نەخۆشیە سەرتاییەکە چارەسەر دەکرێت.

بۆ دیاردەی راینۆدی سەرەتایی:

١- لەبەرکردنی جل و بەرگی ئەستوور و گەرم، دەستکێشی خوری و گۆرەوی ئەستوور و پێلاوی لەبار لە وەرزی سەرمادا بەکاردەهێنرێن.

٢- دەرمانی نیفیدیپین nifedipine ١٠-٨٠ ملگم/رۆژ، دیلتیازیم diltiazem ٦٠-١٢٠ ملگم × ٣، فراوانکەری بۆری خوێن بە شێوەی کرێم وەك ١-٢٪ هێکزایل نیکۆتینەیت hyxyl nicotinate ١-٢٪، یان گلیسریل ترایانیترەیت glyceryl trinitrate ٢٪. پرازۆسین prazocin ١ ملگم × ٣ ، ئەملۆدیپین amlodipine، ئیزترادیپین istradipine ، سیلدیفینیل sildefenil و پێنتۆکسی فیللین pentoxyfylline، - تاد.

٣- برینی گرێی دەماری وزەوالا sympathectomy.

## ٣- سووربوونەدەمارەئێش Erythromelalgia

بارێکی دەگمەنە کە تێیدا بۆریەکانی خوێنی پێ ناوبەناو فراوان دەبن و پێ بە ئازار و سووربووەوە دەبێت و گەرمدادێت و دەکزێتەوە، هەندێکجار دەستیش دەگرێتەوە و چەند خولەکێك تا چەند رۆژێك دەخایەنێت.

ئەم بارە سەرەتاییە (بێ هۆیە) یان ئەنجامی چەند نەخۆشیەکی ترە وەك: خوێن فرەخانەبوونی سەرەتایی polycythemia rubra، فرەخوێن خەپلەبوون thrombocythemia،

گورگەسوورەی سەراپایی S.L.E، جومگەسۆی باداری، نەخۆشی شەکرە و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**چارەسەر:**

١- هۆ سەرەتاییەکە ئەگەر هەبوو چارەسەردەکرێت.

٢- ئەسپرین یان NSAIDS وەك ئایبۆبرۆفین، ئەلفاوەستێن (∝ blockers) ، پێنتۆکسی فیلین pentoxyphylline ، مێثیسێرجاید mythysergide و ئیلۆپرۆست Iloprost.

٣- هەردوو پێ بخرێنە ناو ئاوی سارد.

## ٤- تۆڕەمۆربوونەوە Livedo reticularis

بریتییە لە رەنگ گۆڕانی پێست بەشێوەیەکی تۆڕی پەڵەپەڵاوی پەمەیی یان سوور و شین تێکەڵ، بە تایبەتی لە پێستی لاقدا. بەرکەوتنی ساردی و سەرما ئەم دیاردەیە پتر دەر دەخات. زۆربەی بارەکان ئازاری نییە بەڵام هەندێکجار ئازار و سڕبوون و هەستکردن بە ساردی لاقەکان هەن(**وێنەی ١٨**). سێ جۆرە:



**( وێنەی ١٨ ) تۆڕە مۆربوونەوە**

١- تۆڕە مۆربوونەوەی فیسیۆلۆجی physiological L.R.: لە ساوا و منداڵ (هەردوو رەگەز) و مێینەدا هەیە.

٢- تۆڕە مۆبوونەوەی هۆنەزانراو.

٣- تۆڕە مۆربوونەوەی دووەمی secondary livedo reticularis، هۆکانی ئەم جۆرەی سێیەم ئەمانەن:

١) نەخۆشیەکانی دیواری بۆری خوێن vessel wall disease، وەك چەوریەرەقبوونی بۆری خوێن atherosclerosis، نەخۆشی بەستەرەشانەکان connective tissue ds.، سیل و سفلس.

٢) پتربوونی خەستی خوێن hyperviscosity.

٣) دەردە سەرمایی cryopathies وەك خوێن - ساردەگلۆبیولینی cryoglobulinemia.

٤) بەرگری دژە خۆیی autoimmnity.

٥) زگماکی.

٦) نەزانراو.

**چارەسەر**

١- خۆپاراستن لە سەرما.

٢- چارەسەری هۆکارەکەی بکرێت.

٥- **پەڵەشینکێ** Acrocyanosis

بریتییە لە شین و سوورهەڵگەڕانی هەمیشەیی دەست و دەموچاو بە شێوەی پەڵەپەڵەیی، جگە لە دەست و دەم وچاو لەوانەیە پێ و گوێچکە و لووت بگرێتەوە. زۆر جار خێزانییە familial، بەری دەست سارد و شێدارە clammy.



**وێنەی (١٩) پەڵەشینکێ**

لەم بارەدا خوێنبەرۆکەکان چوونەتەوە یەك constriction، بەلام تۆڕی خوێنهێنەرەکانی ناو گۆی بن توێژ بە پێچەوانەوە فراوان بوون، هەندێکجار خەستی خوێن لە ئاسایی پترە. (وێنەی ١٩)

**چارەسەر:**

جل و بەرگی گەرم و دوورکەوتنەوە لە سەرما.



**وێنەی (٢٠) سووربـاوەمۆربوون**

٦- **سووربـاوەمۆربوون** Erythrocyanosis

بریتییە لە شین و سووربوونەوەی پەڵەپەڵەیی بەردەوام لە پێستدا کە چینێکی چەوری ئەستووری لەژێر دابێت، بە تایبەتی لە مێینەی گەنجی قەڵەودا، لە ران و لاق و هەندێکجاریش لە قۆڵ و سمتدا دەردەچێت. سەرما دروستی دەکات و هەست بە سووتانەوە دەکرێت. (وێنەی ٢٠)



**(وێنەی ٢١) لیری سەرما**

**چارەسەر**

١- جل و بەرگی گەرم.

٢- وەرزش کردن.

٣- کێش دابەزاندن.

٤- گۆرەوی (کۆڵۆنی) لاستیکی.

٧- **لیری سەرما** Cold urticaria (وێنەی ٢١)

بەرکەوتنی سەرما دەبێتە هۆی پەیدابوونی لیرو ئاوسـان لـە شـوێنە بەرەڵاکانـدا بـە تایبـەتی دەسـت و دەم وچـاو، ئـەم بـارە کـاتی بەرسـەرماکەوتنەکە دەرناکـەوێت بـەڵکو دوای گەرمکردنەوە روودەدات. ٣ جۆری هەیە:

١) **جۆری خێزانی** Familial: لیرەکان دەکزێنەوە بەلام نـاخورێن و ٢٤-٤٨ کاتـژمێر دەمێننەوە، لەوانەیە لـەگەڵ لیرەکان تا و هەڵـلەرزین و سەرئێشە و ئازاری جومگەکان و ماسولکەکان و سکئێشە روودەن و خڕۆکەی سپی خوێن پتر دەبێت leukocytosis.
**چارەسەر:** لەوانەیە ستانۆزۆلۆڵ stanozolol چارەسەری بکات.

٢) **جۆری سەرەتایی** primary: لیرەکان لە شوێنە بەر سەرماکەوتووەکان دەردەکەون و هەندێکجار هەناسەتوندی و پەستانی خوێن دابەزینی لەگەڵدایە و لەوانەیە مەلەکردن لە ناو ئاوی سارددا بەهۆی بوورانەوە shock کوشندەبێت. ئەم جۆرە سـەرەتایە دوای باڵقبوون روو دەدات.

**چارەسەر**

١- دۆکسیپین doxepin ٢٥ ملگم کاتی خەوتن و ٥٠ ملگم بەیانی و ئێواری.
٢- سیپرۆهیپتادین cyproheptadine ٤ ملگم × ٣.
٣- ئەکریڤاستین acrivastine یان سیتیریزین cetirizine.
٤- سیتیریزین + زافیرلوکاست zafirlukast.
٥- نەستیارکردن desensitization بە خشتەکی سەهۆڵ بەپێی بەرنامەیەکی تایبەت.

٣) **جـۆری دووەمـی** secondary: بـەهۆی نەخۆشـی تـر روودەدات وەك: خـوێن - سـاردەگڵوبیولینی cryoglobulinemia، خـوێن - سـاردەفایبرینۆجینی cryofibrinogenemia، سفلسی دووەمی، سۆی جگـەر، - تـاد... نـەخۆش لـەگـەڵ لیردەرکردنەکەدا تووشی سەرئێشـە و دابـەزینی پەسـتانی خـوێن و ئاوسـانی قـورگ و بوورانەوە دەبێت.

٨- **چەوریەسـۆی سـەرما** Cold panniculitis:
دوای بەرکەوتنی سەرما گرێی پتەو (لـە ئەنجامی دارزانی چەوری) لەسەر کوڵمەی ساوا و منالـدا دەردەکـەوێت و بـێ شوێنەوار سارێژ دەبێت. (وێنەی ٢٢).


(وێنەی ٢٢) چەوریەسۆی سەرما

## Actinic injury زەبرەکانی تیشك (III

خۆر سەرچاوەی سەرەکی تیشکی ئاسایی و سەروو وەنەوشەییە، شەبەنگی ئێلێکترۆ ماگنێتیکی electromagnetic spectrum، بەپێی درێژی شەپۆلەکانیان، ئەم بەشانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- تیشکی گەردوونی cosmic rays.

٢- تیشکی گاما gamma rays.

٣- تیشکی X X-rays.

٤- تیشکی سەروو وەنەوشەیی UVR.

٥- تیشکی ئاسایی (بینراو) visible light.

٦- تیشکی ژێر سوور infrared light.

٧- تیشکی رادار و تەلەفزیۆن و رادیۆ.

درێژی شەپۆلەکان لە $10^{-16}$ تا $10^{+6}$ مەترە.

تیشکی ئێلێکترۆماگنێتیك بریتییە لە جۆرێك لە وزە، تیشکی ئاسایی و سەروو وەنەوشەیی بەشێکن لەم شەبەنگە، درێژی شەپۆلەکانی ئەم شەبەنگە لە بەشێك لە نانۆمیتر ($10^{-9}$ مەتر) تا هەزارەها مەتر دەڕوات.

شەپۆلی کورت و وزەبەرز بریتین لە تیشکی X و گاما کە بۆ لەناوبردنی شێرپەنجە بەکاردەهێنرێن چونکە ئەم شەپۆلە کورتانە گەردەکان دەئایۆنن ionize و ئەلیکترۆنەکان لادەبەن.

شەپۆلی درێژتر و وزەکەمتر بریتین لە تیشکی ژێر سوور کە وەك گەرما heat هەستی پێدەکرێت و هەندێك نەخۆشی دروست دەکەن وەك لیردەرکردنی وزەکۆڵین cholinergic urticaria.

تیشکی ئاسایی و سەروو وەنەوشەیی دەکەونە نێوان تیشکی X و گاما لە لایەکەوە و تیشکی ژێر سوور لە لایەکەی ترەوە و بۆ پێست گرنگن چونکە زۆر نەخۆشی پێست بەم تیشکانە پەتر دەبن و بە پێچەوانەوە بۆ چارەسەر کەڵکیان لێوەردەگیرێت وەك چارەسەرکردن بە تیشکی سەروو وەنەوشەیی جۆری UVB یان PUVA یان تیشکی شینی ئەماینۆلیڤۆلینیك ئەسید ALA یان لەیزەر وەك لەیزەری (pulsed dye laser, Q-switched Ruby Laser).

٣ جۆر تیشکی سەروو وەنەوشەیی هەن:

١- ت س و C (UVC): درێژی شەپۆلەکەی ٢٠٠-٢٩٠ نم (نانۆمیتر $10^{-9}$ مەترە).

٢- ت س و B (UVB): درێژی شەپۆلەکەی ٢٩٠-٣٢٠ نم.

٣- ت س و A (UVA): درێژی شەپۆلەکەی ٣٢٠-٤٠٠ نم.

ت س و C: ئەم تیشکە ناگاتـە سـەر زەوی چـونکە چـینی ئـۆزۆن لـە ستراتۆسـفیر stratosphere دەیپاڵێوێت بەڵام کە بگاتە سەر زەوی بۆ درەخت و گیاندارەکان زۆر زیانبەخشە و کە گەیشتە سەر پێست خانە زیندووەکانی توێژ دەکوژێـت چـونکە ئـەم تیشـکە لەلایـەن DNA، RNA، پرۆتین و چینی کاژی پێست هەڵدەمـژرێت. چـرا میکرۆبکوژەکـان germicidal lamps ئـەم تیشکە بەرهەم دێنن. درێژی شەپۆلەکەی ٢٥٤ نم (نانۆمیتر).

ئەوەی شایانی باسە ئۆزۆن (لـە ستراتۆسـفیر) بـە بـەردەوامی دروسـت دەبێـت و شـیدەبێتەوە. هالۆکاربۆنەکان (کە کلۆر و برۆمایدیان تێدایە) کە لـە کارگـە پیشەسـازیەکان و سـووتەمەنی ناوماڵ دروست دەبن بۆ چینی ستراتۆسفیر بەرزدەبنـەوە و دەبـن بـە هانـدەری catalysts لـە ناوبردنی ئۆزۆن. بەمجۆرە زیانی تیشکی سەروو وەنەوشەیی C کە دێتە سەر زەوی پتر دەبێـت و دەبێت بەهۆی:

١- پتربوونی رێژەی شێرپەنجە.
٢- سستبوونی سیستمی بەرگری لەش immunosuppresion جۆری ٤.

ت س و A: دوو جۆرە: $A_1$ (٤٠٠-٣٤٠ نم) و $A_{II}$ (٣٤٠-٣٢٠ نم).

کە تیشکی ئاسایی و سەروو وەنەوشەیی کەوتنە سەر پێست هەندێك لـەو تیشـکانە دەدرێنـەوە reflected و بڵاودەبنەوە scattered. هەندێکی تر لەو تیشکانە دەچنە ناو پێست، لە ناو چینی توێژدا لەم بەشە تێپەڕبووە هەندێکی دیسان بۆ دەرەوە دەدرێتەوە و هەندێکی تریشی دەچێتە نـاو بن توێژەوە، لە بن توێژدا:

١- هەندێکی هەڵدەمژرێت absorbed.
٢- هەندێکی بۆ ناو بن توێژ و توێژ بڵاو دەبێتەوە scattered.
٣- هەندێکی سێیەمیشی بۆ سەرەوە بە رێگای توێژدا بۆ ژینگە دەدرێتەوە.

رێژەی ٥٪ ی ت س و کە کەوتۆتە سـەر پێسـت دەدرێتـەوە، بەشـە زۆرەکـەی تـری (٩٥٪) دەچێتە ناوەوە: یان

١- هەڵدەمژرێت، یان،
٢- بڵاودەبێتەوە، یان،
٣- بەرەوخوار بۆ بن توێژ تێدەپەڕێت.

زۆربەی تیشکی شەپۆل کورتتر لە ٣٠٠ نم لە ناو توێژدا بەهۆی یورۆکانیك ئەسید urocanic acid، DNA، RNA، تریپتۆفان، تایرۆسین و میلانین لادەبرێت.

زۆربەی شە پۆلی سەرووی ۳۰۰ نم دەچێتە ناو بن توێژ.

گە تیشکی ئاسایی و سەرووی وەنەوشەیی چوو بۆ ناو پێست وە وەك وتمان هەندێکی لەلایەن گەردەکانی پێست هەڵدەمژێت، لە هەنگاوی یەکەمدا گەردی تیشك هەڵمژ (بۆ نموونە DNA و یورۆکانیك ئەسید urocanic acid) دەبێت بە کرۆمۆفۆر chromophore (رەنگگر) و لەوانەیە لە دەرەوەی پێست چووبێتە ناو پێست بۆ نموونە دەرمانی تێتراسایکلین (بۆ نەخۆشی بەکارهێنرابێت).

دوای هەڵمژینی وزەی تیشکەکە گەردە رەنگگرەکە chromophore دەکەوێتە باری ورووژان excited state بۆ کاتێکی کەمتر لە چرکەیەك، لەگەڵ ئەم گۆڕانکاریەدا لەم کاتە کەمەدا ئەم گەردە بووە بە گەردێکی تر (تیشکەبەرهەم photoproduct) وەك بۆ نموونە لێکدراوی DNA – پسورالین (psoralen – DNA adduct) دوای وەرگرتنی خەپلەی پسورالین و بەرکەوتنی ت س و بۆ چارەسەری نەخۆشی.

تیشکەبەرهەم لە ناو خانەدا دەبێتە هۆی وەڵامدانەوەی زیندەکیمیکی biochemical response ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانی خانەکە و کاردانەوەی توندی پێست وەك ئاوسان oedema، دروستکردنی رەنگ melanine، ئەستووربوونی پێست و سووربوونەوە. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا و دووبارەبوونەوەی ئەم کارلێکانە گۆڕانکاری روودەدات، وەك پەیدابوونی شێرپەنجەی پێست، چرچبوونی پێست، خاڵ و نیشانە و پەڵە.

## رەنگی پێست و تیشك

وەك وتمان نزیکەی ٥٪ی تیشك لە پێستەوە بۆ ژینگە بەهۆی چینی کاژەوە دەدرێتەوە، ئەم دانەوەی تیشکە reflection هۆی رواڵەتی appearance پێستە کە بریقەدارە ئەگەر پێست لووس یان تەڕ یان چەور بێت. کە کرێمی پێست بەکاردەهێنین (بۆ پێستی زبر) ئەم دیاردەی دانەوەی تیشکە وا دەکات پێستمان لووس و جوانتر دەرکەوێت.

پێستی سپی رێژەی ٥٠٪ی تیشکی ناو بن توێژ بەرەو دوا (بۆ سەرەوە) بڵاو دەکاتەوە scattering . میلانین (کە لە توێژدا هەیە) ئەم تیشکە بڵاوبووەوەی بن توێژ هەڵدەمژێت و کەمتر بەرەو دەرەوەی پێست رێی پێدەدات و پێست گەنم رەنگ دەکات.

خوێنی ناو بۆریە خوێنەکانی بن توێژ پتر رەنگی شین لە تیشکە دراوەکەی ناو بن توێژ هەڵدەمژێت، بۆیە رەنگی پێستەکە سوورتر دەنوێنێت (کە بۆری خوێنەکان زۆر بن یان فراوان بووبن یان لە باری نیشانەی خوێنبۆریەگمۆڵ دا).

## خۆپاراستن لە تیشك

١- دوورکەوتنەوە لە بەرکەوتنی راستەوخۆی خۆر کاتێك کە خۆر بەتین بێت وەك ناوەڕاستی رۆژ (نیوەڕۆ)، لە کاتی ئاسمانی ساماڵدا، نزیك هێڵی کەمەرەیی زەوی، شوێنی بەرز (وەك لوتکەی شاخەکان)، بوونی بەفر (چونکە ٨٥٪ی خۆر لە شوێنی بەفراویدا دەدرێتەوە)، بوونی لم (٢٥٪ی تیشك لە زەوی لماویدا دەدرێتەوە)، یان ئاوی شەپۆلدار وەك دەریا (٥٪ ی تیشك دەدرێتەوە).

بەڵام هەور ٢٠-٩٠٪ی تیشك کەمدەکاتەوە و مەلەکردن بۆ ژێر ئاو هەر ½ مەتر بۆ ژێرەوە ٦٠٪ی کەمدەکاتەوە.

لە نزیك شوێنە مەترسیدارەکانی سەرەوە گەرما و سەرما و با کارتێکردنی تیشك بە رێژەیەکی ئەوتۆ کەمناکەنەوە.

٢- بەکارهێنانی جلوبەرگی فراوان و پڕدووراو زۆربەی لەش داپۆشێت و تیشك نەیبڕێت و کاسکێتی پان بۆ سەر.

٣- بەکارهێنانی دژەخۆر بە شێوەیەکی بەردەوام و رێك وپێك بۆ کاتی بەرخۆرکەوتن، ٣ جۆر دژەخۆر هەن:

أ) دژەخۆری دانەوە (پەرچدەرەوە) reflectant sunscreens: ئەم جۆرە دژە خۆرانە ت س و A پەرچدەدەنەوە، بەڵام وەك دژە ت س و B یش بەکارن، وەك زنك ئۆکساید ZnO و تیتانۆیۆم دایۆکساید titanium dioxide.

ب) دژەخۆری هەڵمژ absorbants: وەك سینامەیت cinnamates، ئۆکسی بێنزۆن oxybenzone، - تاد، (ت س و B هەڵدەمژێت).

ج) تێکەڵەی ئەم دوانەی سەرەوە: لە هەمووی باشترە.

پێوەری دژەخۆر بە ژمارەیە (لە یەکەوە بۆ سەد) کە پێی دەوترێت هۆکاری لە خۆر پاراستن sun protection factor (SPF).

تیشکی خۆر گرنگ و پێویستە بۆ ژیان، تەندروستی مرۆڤ، رووناکی ، ژیان بەسەربردن بەهۆی بەرهەمەکانی رووەك، سەرچاوەی وزە و گەرمی، دروستکردنی ڤیتامین D لە پێستدا ، گۆڕینی سیستمی بەرگری خوێن و بۆ باری دەروونی

## کاریگەری تیشکی سەروو وەنەوشەیی لەسەر پێست

Normal cutaneous effects of UVR exposure:

دوو جۆر کاریگەری هەیە:

أ) **کاریگەری زوو (خێرا)** Early effects: ئەمانەی خوارەوەن

١- سۆ Inflammation: باسمان کرد.

٢- پێست تۆخکردن Tanning ، دوو جۆرە

أ- تۆخبوونی پێستی دەستبەجێ Immediate tanning

(Immediate pigment darkening =)

بەرکەوتنی ت س و بۆ یەك خولەك تا چەند کاتژمێرێك بە تایبەتی لە مرۆڤی پێست تۆخدا دەبێتە هۆی تۆخبوونی پێست، بەڵام تۆخبوونەکە پتر خۆڵەمێشییە grey. ئەم جۆرە تۆخبوونە بە ت س و A و هەندێك شەپۆلی تیشکی بینراو واتا ئاسایی visible (شەپۆلی نزیك لە ت س و A) دروستدەبێت و لە ماوەی ٢ کاتژمێردا لەبەر سێبەر نامێنێت.

لێرەدا میلانینی پتر دروست نابێت بەڵکو تیشکە ئۆکساندنی photo-oxidation میلانین و دووبارە دابەشبوونەوەی میلانین لە نزیك ناوکەوە بۆ چێوەی periphery خانە روودەدات. ئەم تۆخبوونە پارێزەر نییە.

ب) تۆخبوونی پێستی درەنگ (دواکەوتوو) Delayed tanning: دوای بەرکەوتنی ت س و بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك یان رۆژێك پێست تۆخ دەبێت کە لەوانەیە چەند حەفتەیەك یان مانگێك بمێنێتەوە، لێرەدا ت س و B پتر رۆڵی هەیە، بەڵام ت س و A کە پتر تۆخبوونی دەستبەجێ دروست دەکات ئەم جۆرە تۆخبوونەش دروست دەکات بەڵام زووتر لە تیشکی س و B (لە چەند کاتژمێرێکدا) هەرچەندە ئەمیش درەنگ لادەچێت.

لەم تۆخبوونەدا میلانینی پتر دروست دەبێت چونکە خانە تۆخەکان (میلانۆسایتەکان) دابەشدەبن و لقەکانیان پتر دەکەن و پتر خانە کاژەکان تۆخدەکەن.

ئەم تۆخبوونە توانای بەرگری پێست بۆ سووتان بە خۆر sun burn ٢-٤ کەرەت پتر دەکات.

٣- پێست ئەستووربوون Hyperplasia: چەند کاتژمێرێك تا چەند رۆژێك دوای بەرکەوتنی ت س و B یان ت س و C (بەڵام نەك ت س و A) پێست ئەستووردەبێت و لەوانەیە چەند رۆژ تا چەند مانگ بمێنێتەوە.

چونکە خانە پتر دابەش دەبێت (DNA و RNA و پرۆتین پتردروست دەبن ) و توێژ و بن توێژ دەگرێتەوە بە تایبەتی چینی کاژ کە ٢-٤ کەرەت ئەستوورتر دەبێت و ئەمەش پێست لە ت س و دەپارێزێت.

٤- گۆڕانكاریەكانی بەرگری Immunological changes: تیشكی س و B و ت س و C (وە كەمتر ت س و A) دەبنە هۆی دابەزینی بەرگری و كەمكردنەوەی فرەهەستیاری بەركەوتن contact hypersensitivity چونكە خانەی لانگەرهانس و خانە لقدارەكانی بن توێژ و لیمفۆسایتی T هەموویان بەهۆی ئەم تیشكانە سست دەبن.

٥- دروستكردنی ڤیتامین Vit. D synthesis – D: ت س و دەبێتە هۆی گۆڕینی خێرای ٧- دیهایدرۆكۆلێستیرۆڵ بۆ پێش ڤیتامین provitamin D3، پاشان دەچێتە ناو خوێن.

ب) **كاریگەریە درەنگەكان Late effects** : بریتین لە

١- تیشكە پیربوون Photo-aging: بریتییە لە وردە وردە داكەوتنی پێكهاتە و كارەكانی پێست دوای بەركەوتنی دووردرێژی ت س و و خۆر یان ت س و دەستكرد artificial UVR.

ئەم پیربوونی پێستی پێش وەختە بریتییە لە وشكبوونەوەی پێست ، چرچ بوون، نەمانی جیری (وەك چەرم لێهاتوو)، فرە دەزوولە دروستبوون telangiectasias، ناوبەناو تۆخبوونی نارێكوپێك، شل بوون و دروستبوونی سەرە زیپكە comedones. ئەمە هەمووی پێی دەوترێت بەخۆرچوونی پێست dermatoheliosis. (وێنەی ٢٣)



(وێنەی ٢٣) تیشكە پیربوون

ئەم گۆڕانكاریانە دەرئەنجامی گۆڕانكاری توێژ و بن توێژن وەك كۆبوونەوەی مژادی جیری ناسروشتی (بەجیربوون elastosis)، پرۆتیۆگلایكانی ناسروشتی و تێكچوونی ریشاڵی كۆلاجینی. ت س و B پتر ئەم گۆڕانكاریانە دروست دەكات.

٢- تیشكە شێرپەنجەهێن Photocarcinogenesis: شێرپەنجە پتر بەهۆی ت س و Bدروست دەبێت بەلام جۆرەكانی تریش هەر رۆلیان لە دروستبوونیدا هەیە و ئەم تیشكانە دەبنە هۆی برینداربوونی DNA ، بازدانیmutations پرۆتینی و خانە برینداربوون و ئەوسا پەیدابوونی:

أ) قۆچەکاژی خۆری Actinic keratosis، کە لەوانەیە دواتر ببێت بە شێرپەنجە.



ب) شێرپەنجەی خانەی بنکـەیی Basal cell carcinoma. (وێنەی ٢٤)

(وێنەی ٢٤) شێرپە نجەی خانەی بنکەیی



(وێنەی ٢٥) شێرپە نجەی خانەی کاژی

ج) شێرپەنجەی خانەی کاژیSquamous cell carcinoma . (وێنەی ٢٥)





د) شێرپەنجەی خانەی تۆخ Melanoma (کەمتر لەوانەی سەرەوە)

(وێنەی ٢٦) سووتـان بەخۆر.

# سووتـان بە خۆر sunburn

دوای خۆرڕووتکردنەوە بۆ مەلەکردن، وەرزشکردن، - تاد بە تایبەتی لە شوێنە گەرمەکان و لە ناوەڕاستی ڕۆژدا (کاتژمێر ٩ی بەیانی تا ٣ی دوای نیوەڕۆ کـە تیشـکی س و B ٢-٤ کـەڕەت لـەم کاتەدا لە بەیانی و ئێوارای پڕە) ڕوودەدات.

سووتانی خۆر هۆکەی ت س و B یە چونکە ئەم تیشکە ١٠٠٠ کـەرەت پـڕ لـە ت س و A سووربوونەوە دروستدەکات. (وێنەی ٢٦).

بڕی سـوورکردنـەوەی پێـوەری (ب س پ) standard erythema dose (SED) بریتییە لە بڕی ت س و بۆ سوورکردنەوەی پێست ( کە بڕی ١٠٠ جوولە بۆ یەك مەتر دووجای پێست).

سووتانی خۆر بەپێی جۆری پێست ڕوودەدات، چونکە شەش جۆر پێست هەن:

١- جۆری ١ Typ I: سپی پێستی تەواو، هەمیشە بە خۆر دەسووتێت و قـەت بـە خـۆر گـەنم ڕەنگ نابێت.

٢- جۆری ٢ Type II: سپی پێست، هەمیشە بە خۆر دەسووتێت و زۆر کـەم بـەخۆر گـەنم ڕەنگ دەبێت.

٣- جۆری ٣ Type III: سپی پێست، بە مامناوەندی بە خـۆر دەسـووتێت و وردە وردە بـە خۆر گەنم ڕەنگ دەبێت.

٤- جۆری ٤ Type 1V: پێست زەیتوونی olive skin، زۆر کەم بـە خـۆر دەسـووتێت و باش بە خۆر گەنم ڕەنگ دەبێت.

٥- جۆری ٥ Type V: پێستی قاوەیی brown، بە دەگمەن بە خۆر دەسووتێت بە خۆر تۆخ دەبێت.

٦- جۆری ٦ Type VI: پێستی قاوەیی تۆخ dark brown، قەت بە خـۆر ناسـووتێت و بـە خۆر ڕەشێکی تۆخ دەبێت.

ئەگـەر (ب س پ) چـوار جـار لـە ئاسـتی ئاسـایی پتربـوو ئەوسـا سـووتانی خـۆر ڕوودەدات. سووربوونەوە دوای ٦ کاتژمێر لـە بەرکـەوتنی خـۆر ڕوودەدات و لـە ١٢-٢٤ کاتـژمێردا دەگاتـە لوتکەی سووربوونەوە، لەوانەیە زووتریش ڕووبدات ئەگەر کـاتی بەرکـەوتنی خۆرەکـە درێـژتربێت، دوای سووربوونەوە پێست بە دەست لێدان بە ئازار دەبێت tender و لەوانەیە بڵق دروسـت بێـت و بڵقەکان یەك بگرن، ئێش و ئازار پتردەبێت و پەلەکان دەئاوسێن و هەروەها دەم وچاو، لەوانەیە تا و هەڵـلەرزین و دڵەکوتێ و دڵتێکەڵهاتن و پەستانی خوێن دابەزین بێنە کایەوە، لەوانەیە لە باری تونددا یەك حەفتە بخایەنێت و دوای یەك حەفتە پێست کاژ دەدات (فرێ دەدات).

## چارەسەر

١- پشوودان،

٢- دەرمانی ئازار، وەك ئەسپرین یان NSAIDs بۆ نموونە برۆفین.

٣- هەندێکجار ستیرۆید وەك بێتامیثازۆن (کرێم).

لە هەمووی باشتر خۆپاراستنە بەم شێوەیە:

١- لە ناوەڕاستی ڕۆژدا خۆت ڕووت مەکەرەوە.

٢- شوێنی سێبەر بدۆزەرەوە.

٣- جلوبەرگی داپۆشەر و فێنك و فراوان بەکاربهێنە.

٤- دژەخۆر sunscreens بەکاربهێنە.

## شـــــلی و کونجە Freckles &lentigenes

بریتین لە پەڵەی (بچووکتر لە ٠,٥ سم) قاوەیی کەزۆر جار بە کۆمەڵ لەو شـوێنانەی پێست کـە بەرخۆرکـەوتوون دەردەکـەون وەك دەم وچاو، مل، شان و پشتی دەست. لە هاویندا پـتر و تـۆختر دەبـن و بـە زسـتان کـاڵتر و کـەمتر دەبنەوە.



(وێنەی ٢٧) شلی خاڵی مەرمکەیی

چـاوکاڵ و قـژ زەرد و پێسـت سـپی پـتر شـلّیان تێـدا دەبێـت (پێسـتی جـۆری ١ و ٢). (وێنەی ٢٧)

هەندێك جار بۆماوەیی یە و زۆرتـر دوای٤-٥ ساڵی تەمەن دەردەکەون. دوو جۆری تر شـلّی هەیە، جۆرێکیان شلّی سانا lentigo simplex یـە کە لەوانەیە لە هـەموو تەمەنێکـدا و لـە هەرچـی شوێنێکی پێستدا دروست بێت و بـە خـۆر ڕەنگـی ناگۆڕێت. جۆری سێیەمیان لە تەمەنی درەنگدا کە لـــە ڕابـــووردوودا زۆر خۆریـــان بەرکـــەوتووە دەردەچێت و پشتی دەست و دەم وچاو بە تایبـەتی ناوچەوان دەگرێتەوە. (وێنەی ٢٨)



(وێنەی ٢٨) شلی خۆری زەبەلاح

**چارەسەر:** جۆری یەکەم لە دوای ١٥-٢٠ ساڵیدا هەندێکیان خۆیان نامێنن.

ئەوەی مایەوە لەگەڵ جۆری دووەم و سێیەمدا یان چارەسەری بە تەزینەچارە cryotherapy یـان هەندێك جار بە کرێمی ترێتینۆین tretinoin دەکرێت یان بە لەیزەر لادەبرێن.

## خاڵــی بـــل Colloid milium

بریتییە لە تەنۆچکەی بچووکی (١-٥ ملم) رەنگ پێست یان کەمێك زەردباوی روون لــە دەم وچاو و دەست و مل و باسك و گوێچکەدا.

جۆرێکیان لە منالّ دا و جۆرێکیان لە گەورەدا هەیە، بەرخۆرکەوتن هۆیەکە، بەلاّم هۆی تر هەن وەك بۆماوەیی، بەرکەوتنی کەرەسەی پـەترۆکیمیکی و بـەکارهێنانی کرێمـی دژە مالّــە (پەلّــە) واتــا هیدرۆکینۆن hydroquinone.

**تێبینی:** زۆربەی نەخۆشی خۆمان مێینەن، بە هاوین دەردەکان دەردەکەون و پەردەبن بەلاّم بە زستان کەم دەبنەوە.

**چارەسەر:**

١- تاشینی پێست dermabrasion بە ئامێری تایبەت یان بە لەیزەر.

٢- دژە خۆر بەکارهێنان.

٣- کرێمی رێتینۆید retinoids یان HA ∝ (ترشی هایدرۆکسی ئەلفا) وەك گلایکۆلیك ئەسید glycolic acid.

## تیشکە هەستیاری Photosensitivity

ئەم جۆرانەی خوارەوە دەگرێتەوە

١- کیمیکە تیشکە هەستیاری

Photosensitivity induced by chemicals

نیشــانەکانی ئــەم جــۆرە لەســەر پێســت هــەروەك ســووتانی خــۆرە sunburn، پێکهاتــە کیمیکییەکان یان أ) سەرچاوەیەکی دەرەکی external source هەیە وەك دەرمان بــە رێگــەی دەم یان خوێن یان سمت وەك تێتراسایکلین یان دۆکسیسایکلین یان بە بەرکــەوتنی راســتەوخۆی پێکهاتە کیمیــکیــەکە بە پێســت روودەدات وەك کرێـــمـــی دژەخـــۆر یــان کرێمـــی تــر بــۆ چــارەســەری نەخــۆشــی پێســت وە یـــان ب) سەرچــاوەکەی نــاو لەشــی مرۆڤــە بــۆ نموونــە نەخۆشی هەندێك جۆری پۆرفیریا porphyrias (نەخۆشی ترشــەکان). بــە بــوونی تیشــك ئــەم مژادانەی سەرەوە نەخۆشیەکە لــەو شــوێنانەی بەرخۆرکــەوتوون دروســت دەکــەن و سیســتمی بەرگری رۆڵی تێدا دەبینێت، بەلاّم هەندێك لــەو مژادانــە کارکردنەکــەی راســتەوخۆیە و پێــی دەڵێن تیشکە ژەهر phototoxic و بەرگری لەش رۆڵی تێــدا نابینێــت و تــەنیا بــوونی شــەپۆلی تیشکی پێویست لەگەڵ مژادە کیمیکە تایبەتمەندەکە نەخۆشی دروست دەکات.

٢- شێوازەکانی کەموکووری پێنەکردنەوەی DNA repair-defective disorders DNA

وەك نەخۆشــی بلــوم Blooms syndrome یــان پێســتە وشــکەی رەنگاڵــە xeroderma pigmentosum.

- نەخۆشییەکانی بەتیشکبوو (سەرهەڵداوە) بە ت س و Dermatoses exacerbated by UVR وەك نەخۆشی ترش porphyria، تامیسك، گورگەسوورە .L.E، داریەر .Darier's ds، کاژۆکی (سەدەف) و نەخۆشی گەغەشامی pellagra.
- تیشکە پێشنەبێکچوونی هۆنەزانراو Idiopathic photodermatoses: ئەمانەی خوارەوەن:

۱) تیشکە هەڵتۆقیوی فرەشێوەیی Polymorphic light eruption


(وێنەی ۲۹) تیشکە هەڵتۆقیوی فرەشێوەیی


(وێنەی ۳۰) تیشکە هەڵتۆقیوی فرەشێوەیی

لە هەموو جۆرەکان باوترە، لەوانەیە تیشك پێکهاتەیەکی سروشتی لەش بۆ هەستیارکەر allergen بگۆڕێت و ببێتە هۆکاری نەخۆشیەکە، ڕێژەی ٥-٢٠٪ی خەڵکی ئەم نەخۆشیەیان تووش دەبێت، لە ۳۰ ساڵی یەکەمی تەمەندا و پتر لە مێینەدا (۲:۱) هەیە، پێستەکە سووردەبێتەوە و تەنۆچکە papules یان بلۆقی vesicles لەسەر دەردەکەوێت و خوران و کزانەوەی لەگەڵدایە و هەندێکجار وەك بیرۆی eczematous لێدێت یان کاژی سپی فرێدەدات، ئەم نەخۆشیە دوای ۲٤ کاتژمێر یان ٤-٥ ڕۆژ لەبەرکەوتنی ت س و یان خۆر دەردەکەوێت. (وێنەی ۲۹ و ۳۰)

ئەو شوێنانەی کە بەرخۆرن وەك دەم وچاو و مل و دەست - تاد دەگرێتەوە. هەموو بەهاران و هەندێکجار لە هاوینیش دا سەرهەڵدەداتەوە و لە زستاندا نامێنێت.

**چارەسەر**

١- خۆپاراستن لە خۆر وەك باسمانکرد.
٢- کرێمی ستیرۆید،
٣- هایدرۆکسی کلورۆکوین hyroxychloroquin.

**٢) تەنۆچکەخورووی خۆری Actinic prurigo**

ڕێژەی زۆریان منالن، بەلام گەورەش تووشی دەبێت، ناساغیەکە بە تەنۆچکە یان تەنۆچکە و بلۆق، کە دوایی قەتماغەی لەسەر دروست دەبێت، دەست پێدەکات و وەك نەخۆشی ئاگرەی لێدێت (ئاو و زلزلەی لێدەتکێت) لەگەڵ خورانی توند و بەتەوژم و بە خوراندن دەڕووشێنرێت ، ڕوومەت و لووت و گوێچکە و لێوی خوارەوە و



(وێنەی ٣١) تەنۆچکەخورووی خۆری

پەردەی چاو (هەندێکجار) و باسك و لاق دەگرێتەوە و شوێنە داپۆشراوەکانیش وەك سمت لەوانەیە تووشبن ، بەهار و هاوین زۆر بەتین و تەوژمە بەلام بە زستانیش کەمتر هەر هەیە. (وێنەی ٣١ و٣٢)



(وێنەی ٣٢) تەنۆچکە خورووی خۆری

**چارەسەر:** وەك جۆری یەکەمە، ئەگەر کۆنترۆڵ نەبوو ثالیدۆماید thalidomide یان سایکلۆسپۆرین أ cyclosporine A بەکاردەهێنرێن.

**٣) لیری خۆری Solar urticaria**

پتر لە مێینەدا لە تەمەنی ٢٠-٤١ ساڵیدا هەیە. لە ماوەی چەند چرکەیەك یان خولەکێك دوای بەرخۆرکەوتن لیر دروست دەبێت و لە ١-٢ کاتژمێردا نامێنێت، لە باری زۆر تیژدا بوورانەوە و هەناسەسواری و دابەزینی پەستانی خوێن ڕوودەدەن. (وێنەی ٣٣)



(وێنەی ٣٣) لیری خۆری

**چارەسەر:** چونکە ت ش و A و تیشکی ئاسایی دروستی دەکەن لەبەر ئەوە کرێمی دژەخۆر کەڵکی کەمە.

١- دژە هیستامین antihistamine وەك لۆراتادین loratadine و سیتیریزین citirizine.

٢- PUVA.

٣- سایکلۆسپۆرین أ cyclosporine A و ئیمیونۆگلۆبیولین immunoglobuline.

٤- لە باری زۆر توندا پلازما فێرێسیس plasmapheresis.

: **پێستەسۆی خۆری درێژخایەن** Chronic actinic dermatitis

پتر لە نێرینەی سەرو ٤٠ ساڵیدا هەیە.

ت س‌وA و ت س‌وB و تیشکی ئاسایی هەموویان ئەم نەخۆشیە دەجۆشێنن و سووربوونەوە و خورانێکی زۆر و بیرۆی ئەستوور لە دەوم وچاو و مل و هەندێکجار دەست و شوێنی داپۆشراویش دروست دەکەن و بە درێژایی ساڵ بەردەوامە. بەڵام لە وەرزی هاوین و بەهاردا پتردەبێت. نەخۆش تووشی دەروون ڕمان و هەندێکجار خۆکۆشتن دەکات. لەوانەیە گلۆپی نیۆنیش نەخۆشیەکە بەجۆش بێنێت. (وێنەی ٣٤)



(وێنەی ٣٤) پێستەسۆی خۆری درێژخایەن

**چارەسەر**

١- ڕێگاکانی خۆپاراستن لە خۆر بە تەواوی وەگەڕ بخرێن.

٢- کرێم و خەپلە و دەرزی ستیرۆید لەگەڵ دژەهیستامین.

٣- ئیمیوران imuran.

٤- سایکلۆسپۆرین أ cyclosporine A و مایکۆفینۆلەیت موفێتیل mycophenolate mofetil.

## IV) زەبرە میکانیکیەکان Mechanical injuries

بریتین لە هۆکاری میکانیکی وەك پەستان pressure، لێخشاندن friction و تەنی بێگانە چوونە ناوپێست foreign substances، ئەمانەی خوارەوەن:

١- **رەقەقۆچەکاژ** Callus: بریتییە لە زێدە قۆچەکاژی hyperkaratosis پێست بێ چوونە ناو پێست non-penetrating و بەهۆی پەستان pressure دروست دەبێت. لەو شوێنانەدا کە پەستان لەسەر ئەم بەشی پێستە بەردەوام بێت یان دووبارە بێتەوە روودەدات وەك پەستانی پێڵاوی تەسك بۆ پەنجە تووتەی پێ، چەناگەی کەمانچەژەن، ئەژنۆی نوێژکەر، سەرە پەنجەی پێی یاریکەری تێنس - تاد. (وێنەی ٣٥)



(وێنەی ٣٥) رەقەقۆچەکاژ

**چارەسەر**

١- فشارەکە دووربخرێتەوە.

٢- بەکار هێنانی پێڵاوی فراوان و نەرم.

٣- کرێمی ترشی سالیسالیك ئەسید salicylic acid ٤٠٪.

٤- ١٢٪ شلەی لاکتەیتی ئەمۆنیۆم 12% ammonium lactate solution.

٢- **مێخەکە** Corn

بریتییە لە ئەستووربوونێکی سنووورداری قۆچەکاژی قوچەکی کە بەشی سەرەوەی تەسکە و ژێری بڵاوە. ٢ جۆری هەیە:



(وێنەی ٣٦) مێخەکە.

١- مێخەکەی رەق Hard corns

لە ژێر پێ و ژێری پەنجەی پێدا روودەدات(وێنەی ٣٦).

٢- مێخەکەی نەرم Soft corns

لە نێوان پەنجەکانی پێدا روودەدەن (بەهۆی خووسان بە تەڕی ئارەق).

مێخەکە ئازار دروست دەکات چونکە ناوکەکەی core پەستان دەخاتە سەر کۆتایی دەمارەکان، زۆرجار پرنچکە ئێسقانێکی بەرەڵابووی bony spur لە ژێر دایە . پێڵاوی تەسك و تەسکی نێوان پەنجەکان پڕ یارمەتی دروستبوونی دەدەن.

جیاوازی مێخەکە لەگەڵ بالووکەی ژێر پێدا بەوە دەردەکەوێت کە کەمێك بەشی سەرەوەیان بکرێنین، ئەگەر خاڵێکی خوێنین دەرکەوت ئەوە بالووکەیە بەڵام ئەگەر ناوکی مێخەکە کە دەرکەوت ئەوە مێخەکەیە. •

### چارەسەر

١- لابردنی پەستان بە پێڵاوی لەبار.

٢- ترشی سالیسیلیك salicylic acid ( S.A. ) 40%، دوای تاشینی مێخەکەکە پلاستەری S.A. بۆ ٤٨ کاتژمێر دادەنرێت ئەوسا لادەبرێت و پاکدەکرێتەوە و دووبارە چەندین جار دادەنرێتەوە تا بە تەواوی مێخەکەکە لادەچێت.

٣- یان تێکەڵەی ترشی سالیسیلیك لەگەڵ ترشی لاکتیك lactic acid، باشتر وایە پێشتر پێ بۆ ٥ خولەك بخووسێنرێت ئەوسا ئەم کارە بکرێت.

### ٣- هەوی جێ خواردوو یان پەستان (چاڵە برینی جێ خواردوو)

Bed or pressure sores (قرحة الفراش)

بریتییە لە چاڵەبرین بە پەستان pressure لە هەر شوێنێکی لەش کە ژێرەکەی ئێسکی زەقی تێدابێت و پەستانەکە بەردەوام بێت، لەو خەڵکانەدا کە ناتوانن بجووڵێن وەك ئیفلیجی، پیری، شکانی ئێسکی سمت، تێکچوونی دەروونی - تاد روودەدات. (وێنەی٣٧)


(وێنەی٣٧) چاڵە برینی جێ خواردوو.

ئەم پەستانە کە بەردەوامبوو ناهێڵێت خوێن بۆ شوێنی چاڵەبرینەکە بچێت و شانەکان لە خۆراك و ئۆکسجین بێبەش دەبن و خانەکان دەمرن.

چوار قۆناغی هەیە:

١- قۆناغی I: سووربوونەوەی بەردەوام، کە پەستان بە پەنجە بخەینە سەر پێستەکە سووربوونەوەکە لاناچێت unblanchable.

٢- قۆناغی II: چاڵەبرینێکی رووکاری superfictal دروست دەبێت (توێژ و بن توێژی گرتۆتەوە).

٣- قۆناغی III: چاڵەبرینی قووڵ deep، کە پێست و چەوری ژێر پێستی گرتۆتەوە.
٤- قۆناغی IV: چاڵەبرینەکە زۆر قووڵ بووە و ماسولکە و ئێسك و ماسولکەژێ tendon و توێکڵی جومگەکانیشی گرتۆتەوە.

ئەم چاڵەبرینە بە ئازارە و بۆگەنی لێدێت و ئاو و زلْزلە و کێمی تێدا دروست دەبێت و میکرۆب پیسی دەکات و لەوانەیە نەخۆش تووشی خۆرەزانەخوێن bacteraemia بێت و کە چارەسەر نەکرێت دەبێتەهۆی مردنی نەخۆشەکە.
پتر لە بڕبڕەی کلك coccyx، سمت، قولەپێ، پشتەسەر، کۆڵەی سنگ sternum – تاد دروست دەبێت.
بوونی نەخۆشی شەکرە و بەرزی پەستانی خوێن و ئێسك شکان و ئیفلیجی و تەسکبوونەوەی خوێنبەرەکان و هۆی تریش پتر ئەم بارودۆخە دروست دەکەن.
**خۆپاراستن:** بریتییە لە زۆر جووڵەپێکردنی نەخۆشی کەوتووی سەر جێگا و نابێت لە ٢ کاتژمێر پتر لەسەر ئەم شوێنانە پاڵبکەوێت.

**چارەسەر**

لابردنی پەستان لەسەر شوێنی چاڵەبرینەکە بە زوو زوو گۆڕینی باری پاڵکەوتنی نەخۆش.
١- گرنگپێدانی چر و پڕ بۆ چاڵەبرینەکە ،بە نۆرماڵ سەلاین پاك بکرێتەوە و لابردنی پیسی و کێم و شانە مردووەکان ئەنجام بدرێت و خوارەوەی چاڵەبرینەکە هەمیشە تەر بێت و دەورووبەرەکەشی وشك بێت.
٢- بەکارهێنانی دژە بەکتریا antibiotics و کرێمی میترۆنیدازۆڵ metronidazole بۆ لابردنی بۆگەنی برینەکە (کە بە بەکتریای ناهەوایی anaerobic دروست دەبێت).
٣- دەرمانی ئازارشکێن.
٤- جێگەی تایبەتی (قەرەوێڵەی تایبەت) کە پڕ هەوایە، پڕ هەوا و ئاوە یان پڕ شلەیە بۆ ئاسانکاری بارگۆڕینی نەخۆشەکە.
٥- خواردنی باش و پڕ پرۆتینی بدرێتێ.
٦- ئاوەڵ نەخۆشیەکانی وەك ئیفلیجی، نەخۆشی شەکرە – تاد چارەسەر بکرێن.
٧- پاڵپشتی دەروونی بکرێت.

٤- **بلقی لێخشاندن** Friction blisters
بریتییە لە دروستبوونی بلۆق vesicleو بلّق bulla کە لە ئەنجامی پەستان "فشار" و لێخشاندن دروست دەبێت ، گەرما و شێ یارمەتی دروستبوونی دەدەن. ڕاهێنانی سەربازی، یاریکەر بە ڕاکردنی زۆر، پاچەکۆڵە – تاد ئەم بارە دروست دەکەن.
**چارەسەر**: بلّقی گەورە کون دەکرێت و ئاوی ناوەوەی دەردەدرێت و دەپێچرێت و دژە بەکتریاش بەکاردەهێنرێت.

٥- **کارلێکی تەنی بێگانە** Foreign body reactions
١- **خاڵ کوتان** Tatoo: بریتییە لە ڕەنگی نەتواوە insoluble pigments بردنە ناو پێست.
سێ جۆری هەیە: (وێنەی ٣٨)


(وێنەی ٣٨) خاڵ کوتان.

١- دەرئەنجامی برین (زەبر) trauma: وەك بەکارهێنانی دەرزی گەرمکراو بە ئاگر بۆ بەکارهێنانی مۆادە هۆشبەرەکان، ئەو کاربۆنە کەمەی بەسەری دەرزیەکەوە دەنووسێت و دەخرێتە ناو پێست (بۆ ناو خوێنهێنەرەکان) دەبێت بە خاڵ، یان بەهۆی برینی پیس بوو بە مۆادی کاربۆنی لە ڕووداوی ئۆتۆمبیلدا یان بارود" بە تەقەکردن" ڕوودەدات.
٢- جوانکاری: ڕەنگەکانی دەخرێنە ناو پێست ئەمانەن: ئاڵ carmine، نیلی indigo، کبریتۆزی جیوە (سوور و ئاڵ) vermilion، مەرەکەبی هیندی indian ink، کرۆم (سەوز) chromene green، مەنگەنیز (ئەرخەوانی)، سووری ڤینیسی venetian red، ئەلەمنیۆم، تیتانیۆم و ئۆکسیدی زنك، کاربۆنی قورقوشم lead carbonate، مس، ئاسن، کۆباڵت (شین)، سەلفایدی جیوە (سوور) و سلفایدی کادمیۆم (زەرد).
٣- لەوانەیە بەکارهێنانی سەلفای ئاسن یان کلۆریدی ئاسن بۆ چارەسەرکردنی سۆی پێست خاڵی قاوەیی سووری لێبکەوێتەوە.

**زیانەکانی خاڵ کوتان**
١- میکرۆب خستنە ناو لەش introduction of infection وەك بەکتریای باو و سفلس و سیل و گولی leprosy و ڤایرۆسی سۆی جگەر hepatitis و بالووکە.
٢- فرەهەستیاری بۆ ڕەنگەکە: دوای چەند حەفتەیەك، مانگێك یان ساڵێك سووربوونەوە و ئاوسان و خوران و ئازار لە شوێنی کوتانەکە دروست دەبێت.

لابردنی خاڵ کوتان ئەنجام دەدرێت چونکە:

-١ یان خاوەن خاڵەکە پەشیماندەبێتەوە و دەیەوێت لایبات.

-٢ یان لەبەر ئەم نەخۆشیانەی سەرەوە کە باسمانکرد . خاڵ کوتان بەم ڕێگایانەی خوارەوە لادەبرێت.

١) برینی خاڵەکە بە نەشتەرگەری و دروونەوەی یان متوربەکردنی شوێنەکەی بە پێست.

٢) کڕاندن بە خوێ salabrasion.

٣) لەیزەر Q-switched laser، Ruby laser لە هەموو ڕێگاکان باشترە.

٤) کڕاندنی شوێنەکە بە ئامێر(پێست تاش) dermabrasion یان نەشتەرگەری کیمیکی.

-٢ گۆشتەزوونەگمۆڵ Granulona


(وێنەی ٣٩) گۆشتەزوونە گمۆڵ.

وەك گۆشتەزوونەگمۆڵی: (وێنەی ٣٩)

١) سلیکۆن کە بۆ جوانکاری بەکاردێت.

٢) جیوە.

٣) بریلیۆم.

٤) زرکۆنیۆم کە لە شلەی دژە ئارەقکردنەوە دایە.

٥) سیلیکا silica دوای ڕووداوی ڕێگەوبان.

٦) کۆلاجین بۆ جوانکاری.

چارەسەر:

نەشتەرگەری.

# خـــوران *Pruritus*



(وێنەی ٤٠)
خورانی توند لەگەڵ رووشان.

خـوران بریتیـە لــە هەسـتکردنێك کـە دەبێتـە هـۆی ئـارەزووی خوراندن. نزیکەی رێژەی ١٠٪ی باریکە ریشاڵە دەمارە بـێ بەرگـەکان جـۆری C unmyelinated fine C nerve fibers کاردانـەوەیان بـۆ هاندەرە گەرمی و خوران هێنەکان هەیە بەڵام کاردانەوەیان بـۆ هانـدەرە میکانیکی و ئازارهێنەکان نییە. (وێنەی ٤٠)

خـوران لەم کـۆتاییـە دەمارانـەی بن توێـژ بە رێچکـەی ژێر لانکە درکـەی لایـی lateral spino-thalamic tract بـۆ ژێـر لانکـەی thalamus مێشـك تێپـەڕ دەبێـت و لەوێشـەوە بـۆ تـوێکڵی مێشـك cortex و ئەوسا هەست بە خوران دەکەین.

چوار جۆر خوران هەن:

١- خورانی خوران وەرگر لە پێستدا Pruritoceptive itch :- کە نەخۆشـی پێسـت دروسـتی دەکات وەك پێوەدانی هەنگ، مێروو – تاد، بەم شێوەیەی سەرەوە خورانەکە دەگوازرێتەوە.

٢- خورانی ئاسائی دەمار Neuropathic itch :- نەخۆشیەکە لە دەمارە گوێزەرەوەکە دایە نەك لـە پێست، وەك برینداربوونی دەمار بەهۆی نەخۆشی تامیسکی دەمار (تـەپخاڵ) Herpes zoster.

٣- خورانی مەڵبەندی (دەماری) Central or neurogenic itch: بـە هـۆی کارتێکچـوونی گەردی یان فیسیۆلۆجی دەماری (لـە سەراپای دەمـاری nervous system) روودەدات، بـۆ نمونە داسستی زراو لـە سك پڕی دا، یان خورانی دەرمانە هۆشبەرەکان opioids.

٤- خورانی دەروونی Psychogenic itch :- وەك خوران لە ئاکامی تـرس لــە مشـەخۆر parasitophobia.

خوران لــە ئـەنجامی زۆر هانـدەرە ئاسـاییەکان دروسـت دەبێـت وەك دەسـت بەرکـەوتنی روکەشـی superficial touch، گۆڕانی پلەی گەرما (سارد یان گەرم)، مانـدووبوونی دەروونـی، هـەروەها هاندەری میکانیکی و کیمیکی و گەرمی و ئێلێکتریکی.

مژادە خورروو هێنەکانی (خورروو گوێزەرەکانی) ناو پێست بریتین لـە:

١- هیستامین ٢- سیرۆتۆنین ٣- تریپتەیز tryptase.

٤- مژادی پ substance-p ٥- ئینتەرلیوکین٢ IL-2 هەندێك جار.

٦- هەندێـك دەرمـانە هۆشـبەرەکان opioids خـورانی مەڵبەنـدی و کەمـەرەیی central & peripheral itching دروست دەکەن .

**شێوەکانی خوران:-** کاردانەوە بۆ خوران لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، وە لەیەك کەسیشدا هەر جیاوازە بەپێی:

١- گەرمی ،گەرمی خوران پتر دەکات.

٢- شێواوی دەروونی و شپرزەبوون پتری دەکات.

٣- نەبوونی هەل و مەرجی خۆشی و یاری..- تاد پتری دەکات.

٤- ترس پتری دەکات.

٥- بە شەو کاتی جل داکەندن و پشوو دان پتر دەبێت.

٦- هەندێك شوێنی لەش وەك کونی گوێچکە، پێڵووی چاو، کونی لووت، دەوری کۆم و ئەندامە سێکسیەکان پتر دەخورێن.

٧- خورانی بە تەوژم (بەردەوام یان ناو بە ناو) بە کتوپڕی دێت، بەرز و نزم دەبێتەوە و نەخۆش لە خەو بێدار دەکاتەوە و کەی بە خوراندن (scratching) ئازارمان دروست کرد دەستبەجێ خورانەکە نامێنێت چونکە نەخۆش دڵی بە لەناوبردنی خورانەکە خۆشتر دەبێت و زۆر جار پێست بریندار دەکات.

**ئەم نەخۆشیانەی ئەم خورانە بە تەوژمە دروست دەکەن زۆر نین و هەندێکە لەوانەی خوارەوەن:**

١- **پێستەسۆی سانای کۆنینە** Lichen-simplex chronicus "LSC": بریتیە لە ڕووبەرێکی پێستی ئەستوور بوو lichenified لەگەڵ زەق بوونەوەی هێڵەکانی پێست لە سەر ئەم ڕووبەرە و هەندێك جار تۆخترب‌وونی پێستەکە و کاژکردن، زۆر بە خورووە و بە خوراندن بریندار بووە، زۆربەی کات نەخۆش خەریکی خوراندنیەتی، شوێنەکانی تووشی ئەمە دەبن بریتین لە پشتی مل و باتوو و کۆم و پێستی کۆئەندامی زاووزێ و خوارەوەی لاق و شوێنی تریش، لە تێکچوونی دەروونی و شپرزەییدا باوە. (وێنەی ٤١)



(وێنەی ٤١) پێستەسۆی سانای کۆنینە

**چارەسەر:** کرێمی ستیرۆید (وەك کلۆبێتازوڵ، فلوسینۆلون) بە ئاسایی یان لەژێر بەستندا (نایلون دا) under occlusion ، یان ستیرۆید بە دەرزی بۆ ناو ڕووبەرەکە intralesional steroids، لەگەڵ دژە خوران و چاککردنی بارە دەروونیەکە.

٢- پێستەسۆی جێگۆڕاو "بێ شوێنی" Atopic dermatitis.

٣- بیرۆی بازنەیی (خڕپان) Nummular eczema.

٤- نەخۆشی ئەیوب (پێستەسۆی تامیسکی) Dermatitis herpetiformis.

٥- روشاندنی دەروونی (پێست هەڵکۆڵینی دەروونی) Neurotic excoriation.

٦- سەلکەسۆی ئیۆزینۆفیلی Eosinophilic folliculitis:

٧- خورانی بەرزی ژەهری میز (سستی گورچیلە) Uraemic pruritus.

٨- خورووی مامناوەنجی "ژێر تیژ" (تەنۆچکە خورووی ژێر تیژ) Subacute prurigo

٩- خورووی گرێیی (تەنۆچکەخورووی گرێیی) Prurigo nodularis

## نەخۆشیە بەخوروەکانی پێست Itchy dermatoses

١- خورانی زستانە Winter itch

زۆربەیان پیرن، چونکە پێستی مرۆڤی پیر چەوری کەمتر دروست دەکات و پێست کەمتر خۆی سارێژ دەکاتەوە. بە وەرزی سەرما زۆربەی لەش، بە تایبەتی هەر چوار پەلەکان وەخروو دێن و پێستەکەش وشک و کرێشاوی و چرچتر دەنوێنێت. کەمتر تووشی سەر و دەم و چاو و ژێر باڵ و ناوگەڵ دەبێت. (وێنەی ٤١، ٤٢)



(وێنەی ٤١) خورانی پێست وشکی..



(وێنەی ٤٢) خورانی زستانە.

**چارەسەر**

١- کەم خۆشۆردن، لفکە بەکار نەهێنێت، سابونی چەور بەکاربهێنێت، زۆر لە گەرماو (حمام)دا نەمێنێتەوە و ئاوەکە زۆر گەرم نەبێت.

٢- دوای خۆشۆردن کرێمی چەورکەر emollients لە پێستی بدات (وەك یوریا Urea-10%) یان ڤازیلین.

٣- جلی ژێرەوەی لۆکەیی cotton made بێت.

٤- هەندێك جار کرێمی ستیرۆیدی سوك بەکار دەهێنرێت.



(وێنەی ٤٣) خورانی کۆم

٢- خورانی کۆم Pruritus ani

خورانی کۆم زۆر باوە و لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە لەخۆش پێی وەڕس دەبێت، ئەم خورانە زۆرجار دەبێتە هۆی ڕوشان و بریندار کردنی پێستی دەوری کۆم و لە دوایشدا بیرۆ و پێستەستوریێ سالای کۆلینە (LSC) دروست دەبێت. (وێنەی ٤٣)

**هۆكانی**

١- **هۆی دەروونی** Psychogenic:- **دەرئەنجامی شپرزەیی و شێواوی دەروونی نەخۆش كۆمی دەخورێنێت و برینداری دەكات و بە دووبارە بوونەوەی ئەم خووە بیرۆ و پێستەستوریَ ساناى كۆنینە LSC دروست دەبێت.**

٢- **پێستەسۆی هەستیاری لێككەوتنی** Allergic contact dermatitis:- **هەستیار بوونە بە** كرێم **و** دەستەسڕی كاغەز **بۆ پاك كردنەوەی كۆم.**

٣- **ورووژێنەپێستەسۆی لێككەوتنی** Irritant contact dermatitis:- **هەندێك مژادی ورووژێن لەگەڵ پیسایدا هەیە وەك** بەهارات، دەرمانی ڕەوانی، **یان باش** پاك نەكردنەوەی كۆم **دوای پیسایی كردن.**

٤- **چڵمە دەڵاندنی ڕیخۆڵە بۆ دەرەوە** Mucus leakage:- **چڵم دەڵاندن بۆ دەوری كۆم بە هۆی** مایەسیری، درزی كۆم anal fissure **و** كوێرە بۆری دەوری كۆم (ناسۆر) anal fistula **ڕوو دەدات.**

٥- **بالووكەی دەوری كۆم.**

٦- **كەڕووی دەوری كۆم:** وەك كاندیدا Candida و قارچ Fungus.

٧- **بوونی بەكتریای ستڕێپتۆكۆكەس** Streptococcus.

٨- **كرمی ناو ڕیخۆڵە بەتایبەتی لە منداڵدا، گەڕی**Scabies **و ئەسپێی بەر** Pediculosis pubis.

٩- **نەخۆشی پێست: وەك** چەورە بیرۆ، سەدەف "كازۆكی" **و پانە** پێستەستوریَ Lichen planus.

١٠- **شێرپەنجە بە تایبەتی** نەخۆشی پاجێت .Paget's ds.

**چارەسەر**

١- **پاك كردنەوەی كۆم بە ئاو و سابونێكی سوك (وەك سابونی منداڵ) دوای پیسایی كردن ئەوسا وشك كردنەوەی بە كلینیكسی تەڕ یان پارچە پەڕۆیەكی نەرم.**

٢- **لایەنی دەروونی نەخۆش ڕەچاوبكرێت و چارەسەر بكرێت.**

٣- **نەخۆشیەكە (ئەوانەی سەرەوە) بدۆزرێنەوە و چارەسەر بكرێن.**

٤- **ستیرۆید (كرێم یان مەرهەم)، كرێمی تاكرۆلیمۆس Tacrolimus یان پراگزۆمین Praxomine (سركەرە) بە تێكەڵی لەگەڵ هایدرۆكۆرتیزۆن.**



**(وێنەی ٤٤) خورانی باتوو**

٣- **خورانی باتوو** Pruritus scroti

**لە وڵاتی ئێمەدا باتوو خوران زۆر باوە(وێنەی ٤٤)، لەوانەیە**

بەهۆی پڕ لە ئاستی پێویست پاك و خاوێنی بێت كاتی خۆ پاك كردنـەوە بـە تایبـەتی بـەكارهێنانی زۆری ئاوی سارد و سابوون و شلەی پاكژكەرە واتا میكرۆب كوژ (معقمات).

زۆربەی هۆكانی باتوو خوران دەروونین و نەخۆشـی زۆر كـەم توشـی بـاتوو دەبێـت جگـە لـە كاندیدا candida. بیرۆ بە تایبەتی پێستەستوری ساناى كۆنینە LSC دروست دەبێت.

هەستیاری لێكەوتنی (وەك كۆم خوران) لە پێستی بـاتوودا بـەهۆی كـرێم و مەرهـەمی نابـەجێ لەلایەن نەخۆشەوە دروست دەبێت.

## چارەسەر

١- پڕ لە ئاستی پێویست تەڕ نەكرێت، سابونی سوك بەكار بهێنرێت.

٢- كرێم و مەرهەمی ستیرۆیدی سوك یان مام ناوەندی.

٣- تاكرۆلیمۆس tacrolimus یان پراگزۆمین praxomin، دوكسێپین Doxepin یان ڤازیلین.



(وێنەی ٤٥) خورانی دامێنی مێ

٤- خورانی دامێنی مێ Pruritus vulvae

خورانی دامێنی مێینە زۆر باوە (لە جیـاتی بـاتووخورانی نێرینەیـە)، لە رووی كۆمەلایەتیەوە زۆر ناخۆشە، زۆرجـار بەردەوامـە یـان نـاوە بەناوە سەرهەلدەداتەوە و ئـەم پێسـتە تووشـی سـووربوونەوە و كـاژ كردن و رووشـاندن و بـیرۆ و پێستەسـوری سـاناى كۆنینـە LSC دەبێت. (وێنەی ٤٥)

هۆكانی

١ پێستە سوی ناتایبەت Unspecified dermatitis:- واتا هیچ هۆیـەكی زەق و دیـاری كراوی نیە، بەلكو چـەند هۆیـەك پێكـەوە بـوون بـە هـۆی دروست بوونی وەك دەروونی، كالای (قماش) جلی ژێـرەوەی هەستێن – تاد.



(وێنەی ٤٦)
رەقە پێستەستووری (دامێنی مێ)

٢ رەقە پێستەستوری Lichen sclerosus: هۆی دیار نیـە، رەق و سپی بوون و خورانی بەردەوام روودەدەن. (وێنەی ٤٦)

٣ - بەهەلە هەست پە ئازارکردنی جیلەك dysethetic vulvodynia: ئەوسا خورالدلی.

٤- تووشێنی کاندیدا (تووشبوون بە کەڕووی کاندیدا)

.Candida infection

(وێنەی ٤٧)



(وێنەی ٤٧) تووشێنی کاندیدا

٥- سەدەف (= کاژۆکی).

ئەمانەی سەرەوە هۆ سەرەکیەکان بوون، زۆر هۆی تریش هەن وەك:

مشەخۆری ترایکۆمۆناس trichomonas، بەکتریای سترێپتۆکۆکەس streptococcus، کرمی دەرزی Entrobius vermicularis، ئەسپێی بەر، گەڕی، قارچ، بالوکە، تامیسك، تراکوما Chlamydia trachomatis و سوزەنەك.

پێستە سۆی هەستیاری و وروژێن، پانەپێستەستوری L. planas، پێستەستوری سانای کۆنینە LSC ، نەخۆشی شەکرە، سستی گورچیلە و جگەر و شێرپەنجە - تاد.

**چارەسەر**

١- دوای پشکنینی باش لەلایەن پزیشکی پسپۆڕەوە چارەسەری هۆکەی بکرێت.

٢- لابردنی وروژێنەکان irritants، بەکار نەهێنانی سابون، سانتی، کرێم و هەتوان (لەلایەن نەخۆشەوە).

- تارات بە ئاوی ڕووت بگیرێت و بە پەڕۆی نەرم لە پێشەوە بۆ دواوە بیسرێتەوە.
- هەموو ڕۆژێك دەرپێ بگۆڕێت و جوان بە ئاو بیشواتەوە.
- کلینێکس(دەسری کاغەز) بەکار نەهێنرێت.
- نەخۆش ئەو خووەی کە پێشتر بۆ پاك کردنەوە پەیرەوی کردووە وازی لێ بێنێت.
- ئاوی شلەتێن بێ سابوون بۆ تارات بەکاربێنێت.

٣- کرێمی زنك هەندێك جار بەکەڵکە.

٤- مەرهەم نەك کرێمی ستیرۆید بەکار دەهێنرێت.

٥- بۆ باری زۆر گران ستیرۆید بە دەرزی بۆ ناو پێست (intralesional steroids) بەکار دەهێنین یان مەرهەمی ئیسترۆجین .oestrogene oint یان ستیرۆیدی سەراپایی (systemic steroids).

٦- بە شەو هایدرۆکسی زین یان دۆکسیپین لە ڕێگای دەمەوە بەکاربهێنێت.

٧- لەیزەری $CO_2$ یان دەرزی چینی یان خەواندنی موگناتیسی hipnosis و چارەسەری دەروونی هەندێك جار .

٥- **خاڵەخوروو** Itchy points

هەندێك جار یەك دوو خاڵی بچووك لەسەر پێست دا زۆر دەخورێت و هۆی نەزانراوە.

چارەسەری: هەڵکەندنی ئەم خاڵە یان تەزینەچارە croyotherapy چاکی دەکاتەوە.

٦- **خورانی بەرئاوکەوتن**Aquagenic pruritus

بریتیە لە خوران (پڕ وەك دەرزی پێداکردنە) دوای بەرکەوتنی ئاو بۆ پێست (ئاوی سارد یان گەرم). لەم کاتەدا بەرکەوتنی ئاو بە پێست دەبێتە هۆی رژانی هیستامین (histamine) و ئەسیتایل کولین (acetyl-cholin) لە کۆلکەخانەکاندا mast cells. زۆر جار خێزانییە familial.

هەندێك جار هۆکەی نادیارە و هەندێك جاریش دەرئەنجامی نەخۆشی تر دروست دەبێت وەك: خوێن فرەخانەبوونی سەرەتایی policythemia vera، زەردە گۆشتەزوونەگموڵی منداڵی juvenile xanthogranuloma یان ناساغی (کەموکوڕی) پەتکە دەمار myelodysplasia.

**چارەسەر:** ئەنتی هیستامین، ستیرۆیدی سەراپایی، پرۆپرانۆلۆل، ت س و B یان PUVA.

٧- **خورانی پێستی سەر** Scalp pruritus


(وێنەی ٤٨) خوران و کرێژی پێستی سەر

سەر خوران بەتایبەتی لە بەساڵا چوودا زۆر باوە، لەگەڵ خوران کرێژ و سووربوونەوە و ڕوشان excoriation دروست دەبن. هەندێك جار هۆکەی دیارە وەك نەخۆشی سەدەف (کاژۆکی)، چەورە بیرۆ seborrhoeic dermatitis و هەندێك جاریش هۆکەی دیار نییە و لەوانەیە سەلکەسۆی chronic folliculitis درێژ خایەن بێت . (وێنەی ٤٨)

**چارەسەر:** شامپۆی قیر (قەتران)، شامپۆی ترشی سالیسلیك، جێڵی ستیرۆید، یان شلەی ستیرۆید. کەبسولی ماینۆسایکلینminocycline، حەپلەی دژەهیستامین یان دۆکسێپین بەکاردێت.

٨- **خوران بە دەرمان** Drug-induced pruritus

لێرەدا تەنیا خوران بێ ئەوەی رواڵەتی پێست تێك بچێت دروست دەبێت، نموونەی ئەو دەرمانانەی کە وەردەگیرێن بۆ چارەسەری نەخۆشی تر وەك:

١- کلۆرۆکوین chloroquine بۆ نەخۆشی مەلاریا، (هەروەها ئەمۆدیا کوین

٢- هایدرۆکسی مەثیل ستارچ hydroxy methyl starch بۆ پڕکردنی قەبارەی خوێن.

**چارەسەر:** بە یەکجاری دەرمانەکانی بوەستێنە.

٩- **پێستەستوری سانای گۆنینە**LSC باسمان کرد.

## ١٠- خورووی گرێیی (تەنۆچکەخورووی گرێیی) Prurigo nodularis

چەند گرێیەکی یەکجار بە خوورو بە قەبارەی دەنکە نۆك یان گەورەتر دروست دەبن بە تایبەتی لە رووی پێشەوەی ڕان و لاق دا، گرێکان سوور دەبنەوە و رووکەشەکانیان وەك بالوکەن یان درزاوی دەبن و ئەوسا رەنگی قاوەیی و رەش دەگرن و زۆر جار خوێنیان لێدێت (بە خوراندنی بە تەوژم) وە کە چاکیش بۆوە جێ زام جێدەهێڵێت، خورانەکە ئەوەندە زۆرە و بە کتوپڕی دێت لەخۆش خۆی بۆ ناگیرێت تا بە خوێنی دێنێت و بە قووڵی بریندارى دەکات، خەو نامێنێت و ڕواڵەتی پێست تێك دەدات بەڵام پێستی نێوان گرێکان ئاسایيە. ئەم نەخۆشیە درێژخایەنە و زۆر بە سستی چاك دەبێتەوە. (وێنەی ٥٠ أ و ب)


(وێنەی ٥٠ ب)
تەنۆچکەخورووی گرێیی


(وێنەی ٥٠ أ)
تەنۆچکەخورووی گرێیی

هۆکەی نەزانراوە، بەڵام کۆمەڵێك هۆکار هاندەرەی ئەم نەخۆشیەن وەك بیرۆی جێگۆڕاو، کەم خوێنی anemia، نەخۆشی جگەر، سك پڕبوون، سستی گورچیلە renal failure، پێستەسۆی خۆری، دەروون تێکچوون، پێوەدانی مێروو insect bite و ئەیدز.

### چارەسەر

١- هۆکەی ئەگەر زانرا ،دوای پشکنینێکی ورد لەلایەن پزیشکی پسپۆڕ، چارەسەر بکرێت.

٢- دژە خوران وەك مێنتول menthol، فینۆل phenol بە" شلە یان کرێم" و پرامۆکاین بەکاردەهێنرێن لەگەڵ کورت کردنەوەی نینۆکی دەست بۆ کەم کردنەوەی بریندار کردنی پێست.

٣- ستیرۆیدی بەهێز لە ژێر بەستن دا under occlusion یان بێ بەستن.

٤- ستیرۆید بە دەرزی بۆ ناوگرێکان وەك ترایئەمسینۆلون triamcinolon.

٥- کەپسایسین capsaicin.

٦- تەزاندن cryotherepy ، ت س و B یان PUVA یان ت س و B تەسك 311mm narrow band UVB.

٧- ثالیدۆماید thalidomide ١٠٠ ملگم/یەك رۆژ، دوایی کەم بکرێتەوە.

٨- سایکلۆسپۆرین A cyclosporine A ٣-٥ر٤ ملگم/ کگم / رۆژ.

٩- ئەنتی هیستامین وەك هایدرۆکسی زین ٢٥ ملگم ×٢.

## نەخۆشیە دەروونپێستیەکان psychodermatology

لێرەدا هیچ نەخۆشیەکی پێست نیە بەڵام نەخۆش خۆی دروستی دەکات بە ئاگا لـێبوونی یـان نـاگا لێنەبوونی خۆی، دوای دووبارە بوونەوەی ئازاردان و برینداركردنی پێست، نینۆك، موو یان پەردە ی لینجۆش mucosa نەخۆشیەکە دروست دەبێت وەك:

### ١- گەستنی نینۆك Nail biting

پلێتی نینۆك و پێستی دەوروبەری دۆشەکەی نینۆك هەموویان بە گەستنی نینۆك بە دان بریندار دەکرێن یان بە نینۆکەکانی دەستەکەی تر ئازار دەدرێن. دوای دووبـارە بوونـەوەی ئـەم خـووە، گەشەی نینۆك ،بەهۆی زیانی ڕواندنگەی نینـۆك، تێـك دەچـێت. نینۆك زبر و ناسك دەبێت وکورت دەبێتەوە، هەندێك جار هێڵی درێژ و پانی تێدا دروست دەبێت و ڕەنگی سروشتی خۆی نامێنێت - زۆر جار بالوکە لە لێواری دەرەوەی ئـەم نینۆکانـە دروسـت دەبن. پر منالْ و گـەنج ئـەم خووەیـان هەیـە و لـەوالەیـە پێسـتی دەوری نینۆك تێك بچێت. (وێنەی ٥١)



(وێنەی ٥١) گەستنی نینۆك

#### چارەسەر

چارەسەری دەروونی و مەرهەمی دژە بەکتریا هەندێك جار بەکار دەهێنن.



(وێنەی ٥٢) لێوەسۆ.

### ٢- لێوەسۆی دەستکرد Factitious cheilitis

بریتیە لـە سوربوونەوە و کاژکردن و درزبوونی لێو و دەوروبەری بەهۆی زمان لـێخستن، خورانـدن، گەسـتن یـان دەسـتکاری کردن. ( وێنەی ٥٢)

#### چارەسەر

چارەسەری دەرونی، مەرهەمی چەور وەك ڤازیلین و وازلـێهێنانی خووەکە.



(وێنەی ٥٣) زێدەشۆردنی دەست

### ٣- زێدە شۆردنی دەست Repeatitive hand washing

دەبێتە هۆی پێستەسۆی ورووژێن. (وێنەی ٥٣)

### ٤- ئەندێشەی بوونی مشەخۆر Delusions of parasitosis

پتر ژنان (٢:١) لە تەمەنی ناوەڕاست بۆ پیری تووشی دەبن، هەمیشە خەریکی دەست لێدان و هەڵکەندنی کاژی پێست یان بریندارکردنیەتی بە هیوای ئەوەی کە ئەو کرم و مێروو و مشەخۆرانەی سەر یان ناو پێستی دەربێنێت و فڕێیان بدات، بەڵام لە ڕاستی دا هیچ لەوانەی نییە. هەندێك جار پێستی خۆی هەڵدەکەنێت و چاڵەبرین و گرێ و سۆی لاوەکی دروست دەکات.

زۆربەیان باری دەروونییان تەنیا ئەم لاریەی هەیە، هەندێکی تریان نەخۆشی دەروونی قوڵتریان هەیە وەك خەمۆکی (depression)، شیزۆفرینیا (schizophrenia) - تاد، هەندێکی تریشیان کۆکاین خۆرن یان ئەمفیتامین بە نابەجێ بەکار دێنن یان خڵەفاون dementic، هەندێکی تریشیان شێرپەنجەی مێشك یان خوێنبەربوونی ناو مێشك یان کەمی ڤیتامین B12 یان هەیە.

#### چارەسەر

١- ئەگەر هۆ هەبوو بیدۆزەرەوە و چارەسەری بکە.
٢- پشکنینی تەواوی تاقیگەی بۆ دەکرێت.
٣- پەیداکردنی متمانە لەنێوان پزیشك و نەخۆش.
٤- دەرمانی پیمۆزاید pimozide (١-٤ ملگم)/ ڕۆژ.

### ٥- ڕووشاندنی دەروونی Neurotic excoriations

زۆر نەخۆش دەست دەکات بە نقورچ گرتن لە پێستی تا ئاستی بریندار کردن (بەبێ ئاگایی خۆی unconsciously) بە زۆری لەو شوێنانەی دەستی دەیگاتێ، ئەگەر ڕاستە بێت (دەستی ڕاستی چالاك بێت) زۆربەی برینەکان لەلای چەپن، ئەگەر بڕوانین دەبینین هەندێك برین نوێن و هەندێکیان کۆنن و جێ زامیان جێهێشتووە، پەڵە و چاڵ و گرێ هەموو ئەوانە دەبینرێن. (وێنەی ٥٤)


(وێنەی ٥٤) ڕووشاندنی دەروونی

دەم و چاو و باسك و سەرەوەی پێست پتر جێی ئەم دیاردەیەن، لە دەم و چاودا عازەبەی (زیپکەی) ڕوشاندن دروست دەکات acne excoriae.

#### چارەسەر

١- لایەنی دەروونی چارەسەر دەکرێت.
٢- دۆکسیپین doxepin ١٠٠ ملگم/ڕۆژ، کلۆمیپرامین clomipramine، فلۆکسیتین fluoxetine و سێرترالین sertraline.

## ٦- پێستەسۆی دەستکرد Factitious dermatitis

لێرەدا نەخۆش برینی پێست دروست دەکات و بەئاگایە consciously لـێی بۆ ئەوەی:



(وێنەی ٥٥) سووتاندنی دەروونی بە جگەرە

أ) سـەرنجی خـەڵکی تـر ڕابکێشـێت و سکیان پێ بسووتێت.

ب) ڕاکـردن لـە بەرپرسـیارێتی responsibility.

جـ) بۆ وەرگرتنی بژاردن (تعويض).

(وێنەی ٥٥)

ئەم برینانە دەستکردن بە:

١- هۆی میکانیکی وەك نینۆکی خۆی، ئامێری تیژ (وەك بزمار و دەرزی – تاد)و کـانزای گـەرم کراو.

٢- هۆی کیمیکی وەك ترشی نایتریك، ترشی کاربۆلیك، سرکە، خوێ و میز و پیسایی.

برینەکان یەك جۆرن و ڕێك و پێکن، لەو شوێنانەی دەستی دەیگاتێ ڕوودەدەن.

### چارەسەر

زۆر گرانە، بەڵام چارەسەری دەروونی و متمانە لەنێوان نەخۆش و پزیشك زۆر گرنگن.

هەندێك جار پیمۆزاید Pimozide بەکاردێت.

## ٨- خووی مووەدەرهێنان (شێتی مووهەڵکێشان) Trichotillomania

بریتیە لە هەڵکێشانی موو بە شێوەیەك هەندێك لە مووەکان شکاون و هەندێکیان لە هەندێکی تـر درێـژترن، بـە زۆری لـە ئـەم لاولای قـژی سـەر یـان لـە ناوەڕاستیدا یان سمێڵ یان برۆ و برژانگ و ڕیش هەڵدەکێشرێن. بە زۆری لە منداڵدا هەیە و پـتر لـە کچـان دا کـە تێکچـوونی دەروونییان هەیە. (وێنەی ٥٦)



(وێنەی ٥٦) خووی موودەرهێنان.

### چارەسەر

چارەسـەری دەروونـی لەگـەڵ دەرمـان وەك کلـۆمیپرامین، فلوکسێتین، ڤینلافاکسین و ئۆلازاپین.

٩- ترسی بۆگەنی پێست Bromidrosiphobia

ڕێژەی ٧٥٪ یان کوڕن لە دەوری ٢٠-٣٠ساڵیدا، وە وا دەزانن کە پێستیان بۆنی ناخۆشی هەیە و خەڵکی لێیان دووردەکەونەوە و بە قسەی پزیشك و کەس وکار بڕوا ناکەن کە ئەم شتە بوونی نییە، لەوانەیە نیشانەیەکی شیزوفرینیا بێت.

چارەسەر

پیمۆزاید.

١٠-ترسی ناکار ناتەواوی (ناشیرینی) Dysmorphophobia

نەخۆش وا دەزانێت ئاکارێك یان ئەندامێکی زۆر ناتەواوە و بە ئاوێنە چەندین جار لە ڕۆژێکدا سەیری خۆی دەکات وەك ناتەواوی لووت، چاو، کۆئەندامی سێکسی، قژ - تاد. لەوانەیە شتێکی زۆر کەم لەم ئەندامەی دەرەوەی نائاسایی بێت، بەڵام زۆربەیان تەواون.

چارەسەر

چارەسەری دەروونی و دەرمان وەك (سەرەوە).

# نەخۆشیە کنێتی و زگماکیەکانی پێست

# Genodematoses & congenital anomalies

هەندێك لەو نەخۆشیانەی پێست کە هۆکارەکەی کنێتییە یان زگماکییە باس دەکەین، بۆ نموونە:

أ ) ناساغیەکانی کرۆمۆسۆمی Chromosomal disorders

## ١- کۆنیشانەی داون (مەنگۆلی) Down's syndrome

هەر لە (٧٠٠) لەدایکبوودا یەکێك ئەم نەخۆشیەی هەیە، ڕێژەی ٩٥٪یان لە جیاتی دوو کرۆموسۆم سێ کرۆمۆسۆمیان لە جێگەی ٢١ (trisomy 21) هەیە، لە دایکی بەتەمەندا زۆر هەڵدەکەوێت، بەلام ٥٪ یان ئەم کرۆمۆسۆمە پترەی نییە بەڵکو بەشێك لە کرۆمۆسۆمی ٢١ی بۆ پەڕیوەتەوە translocation.

بە سەیرکردن مەنگول دەناسرێتەوە diagnosed، سەر بچوکە، دەم و چاو پانە، لووت کورت و نزمە، گوێچکە بچووکە و ئاکاری تێکچووە، چاو مەنگۆلییە، پێڵووی چاو ئەستوورە، برژانگی کورت و تەنکە، گلێنەی چاو بچووکە و بەشی لای دەرەوەی پەڵەی ڕوونی تێدایە، چوار پەلەکان کورت و ئەستورن، جومگەکان شلن، پەنجەکان کورتن و قۆچەکەین و هەندێك جار بەیەکەوە نووساون، پەنجە تووتە زۆر جار کەوانەییە، کەم ژیری (کەمتر لە ٥٠٪ی ئاساییە)، تێکچوونی دڵ و ئاوی سپی و ناتەواوی تریش هەندیك جار هەن.

<u>لە پێستدا</u>

هەڵتۆقیوی سەلکە تەنۆچکەیی درێژخایەن chronic papular follicular eruption هەیە، موو زۆر جار باریك و کاڵە، دەردە ڕێوی زۆر باوە و بە گرانی چارەسەر دەکرێت، ددانەکان بچوکن، ئەستوربوون و درزی لێو، زمانی باتوویی (درزاوی) لە زۆریان دا هەیە. تووشسێن infection ، گۆشە لێوەسۆ، پێڵووسۆ و چڵمی کێمی باون. ڕوومەت زۆر جار سوورە، شینکی دەست، تۆڕەشینبوونەوە livedo reticularis و هەندێکجار شێوانی تریش هەن.

## ٢- کۆنیشانەی تێرنەر Turner's syndrome

ڕێژەی ٨٠٪یان لە جیاتی ٤٦ کرۆمۆسۆم ٤٥ کرۆمۆسۆمیان هەیە، بەلام ٢٠٪یان ٤٦ کرۆمۆسۆمیان هەیە. هەر لە ٢٥٠٠ لە دایکبوودا یەك کچ ئەم نەخۆشیەی هەیە و هەر لە کچان دا هەیە.

ڕێژەی ٩٥٪یان پێش وەخت بە مردوویی لەدایك دەبن، نیشانەکان ئەمانەن:

باڵا کورتە، سنگ پان و قەبەیە، گۆی مەمکەکان لە ئاسایی لەیەك دوورترن، پەردەی ملی هەیە (وەك نێوان پەنجەکانی پێی مراوی)، هێڵی پشتەوەی کۆتایی مووەکانی سەر بەرەو خوارترە، گوێچکە شێواوە ، مەڵاشووی لە ئاسایی بەرزترە، پێست شلە، ئێسکی پشتی دەستی ژمارە ٤ (هەندێك جار ژمارە ٥) کورتە ، هەروەها ئێسکی پشتی پێ. نینۆك بچووکە، نیشانەی تۆخیان melanocytic naevi لە ئاسایی پترە، شێوانی پەیکەری ئێسکی و دڵ و چاو و ئەندامی تر پتر لەم کچانەدا هەن.

هۆرمۆنی ئیسترۆجین لە ئاسایی کەمترە و بێ نوێژ نابن (تێ ناکەون) و نیشانەی پێگەیشتنی سێکسیان نییە یان ناتەواوە.

**چارەسەر:** هۆرمۆنی ئیسترۆجینیان دەدرێتێ.

## ٣- کۆنیشانەی کلاین فیلتەر Klinefelter's syndrome

لە ٦٠٠ لەدایکبووی نێرینەدا یەکێکیان ئەم نەخۆشیەی هەیە، ٤٧ کرۆمۆسۆمی هەیە ((کرۆمۆسۆمێك بەم شێوەیە یە xxy))، باتووی باش دروست نەبووە، مەمکی گەورەیە، ئاکاری لەشی لەسەر شێوەی مێینەیە، هێڵی پێشەوەی قژ نزمە، مووی لەشی تەنکە، ریش و سمێڵی یان نییە یان تەنکە، پەنجەی پێنجەمی کورتە، خوێنهێنەرەسۆی لاق و چاڵە برینی (هەوی) خوێنهێنەری لاق باون، پتر لە ئاسایی شێرپەنجەیان توش دەبێت بە تایبەتی شێرپەنجەی مەمك (پیاو) و شێرپەنجەی سارکۆما sarcomas. ئەم نێرینانە باڵایان درێژە، هەندێکیان قەڵەو و گێژن mentally dull و پتر لە ٣٠٪یان نەخۆشی دەروونیان هەیە.

**چارەسەر:-** هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن.

## ب) کۆنیشانەکانی فرە گرێیی خێزانی Familial multiple tumor syndromes

### ١- دەمارەریشاڵەگموڵی (Von Recklinghausen disease) Neurofibromatosis (N.F.)

هەر لە ٣٠٠٠ لە دایکبوودا یەك کەس ئەم نەخۆشیەی هەیە، دوو جۆرە

أ) جۆری ١ (NF1):- ڕێژەی ٨٥٪یان دەگرێتەوە و جینی gene ئەم جۆرە دەکەوێتە سەر کرۆمۆسۆمی ١٧، بۆماوەیی لەشی زاڵە autosomal



(وێنەی٥٧ أ) دەمارە ریشاڵە گموڵی (کونجەی ژێر باڵ و پەڵەی قاوەیی هێلکەیی)



(وێنەی٥٧ ب) گرێیۆکەی لیش



(وێنەی٥٧ جـ) دەمارە ریشاڵەگموڵ

dominant، ئەمانەی خوارەوەی تێدایە: (وێنەی ٥٧)

١- شەش یان پتر پەڵەی قاوەیی هێلکەیی café au late macule لە ساڵی یەکەمی ژیانـدا هەن.

٢- کونجەی ژێر باڵ axillary freckling لە (٣/٢)ی نەخۆشدا هەیە.


وێنەی ٥٨- أ) دەمارە ریشاڵەگمۆڵ


(وێنەی ٥٨ب) دەمارە ریشاڵە گمۆڵ.

٣- ژمارەیەك لە دەمارە ریشـاڵەگمۆڵ لـە پێسـت دا skin neurofibromas هــەن، هەنــدێکیان بچــووك و ڕووکەشــین superficial و هەنــدێکیان گــەورەتر و قووڵترن و ڕەنگیان پێستییە یان پەمەیی یان ئەرخەوانی یان قاوەییــە، هەنــدێکیان نــەرم و هەنــدێکی تــریش پتــەون، هەندێکیان قۆچەکەیی و هەندێکی تـریش پـانن(قوتکـەیین) plaques و دەپەســـــــــیۆرێن compressible و هەندێکیان دەڵێی کرمن (لە بن دەستدا). (وێنەی ٥٨ أ،ب) لەوانەیە ئەم دەمـارە ریشـاڵەگمۆڵانە تـا کـاتی بـاڵقبوون دەرنەکەون و لـەگەڵ تەمەندا هەر گەورەتر دەبن. لـەسەر زۆربەی ڕووی پێست بڵاوبوونەوە.

٤- تێکەڵەشــانەگمۆڵ (hamartoma) ی تـۆخ و خـڕ و بچـووکی گلێنــە small circular pigmented hamartomas of the iris لە مناڵیـەوە دەردەکـەوێت (پێی دەڵێن گرێۆکەکانی لیش Lisch nodules).

نیشانەکانی بەپێی تەمەنە: بەم شێوەیە دەردەکەون خاڵی ١ ئەوسا خاڵی ٢ ئەوسا خاڵی ٤ ئەوسا خاڵی ٣ی ئەمانەی سەرەوە.

ب) جـۆری ٢ NF2:- جینـی ئـەم جـۆرە دەکەوێتـە سـەر کرۆمۆسـۆمی ٢٢، ئەمانـەی خوارەوەی تێدایە:

١- دەمارە گرێ بیستنی هەردوولا bilateral acoustic neuroma.

٢- کەم یان هیچ نیشانەی لە پێست و چاودا نییە.

لە دەمارە ریشاڵەگمۆڵی دا جگە لەوانەی سەرەوە نیشانە و ئاکامی تر لەوانەیە هەبن وەك:

- گۆڕانی دەمارە ریشاڵەگمۆڵ بۆ شێرپەنجە neurofibrosarcoma.
- پشت کۆم و لاری kyphoscoliosis.
- کەم ژیری.
- فێدداری.

- تەسك بوونەوەی خوێنبەری گورچیلە.
- بوونی فیۆکرۆمۆسایتۆما (ڕەنگەخانە گمۆڵی ئاسایی) pheochromocytoma (گرێی ڕژێنی ئەدرینال و دەردانی زۆر لە ئەدرینالین و نۆرئەدرینالین ).
- گرێی ناو مێشك و گلایۆما و مەنینجیۆما gliomas & meningiomas.

**چارەسەر:-**

جگە لە لابردنی دەمارە ریشاڵەگمۆڵە گەورەکان بە نەشتەرگەری هیچ چارەسەرێکی نییە. ئامۆژگاری باوك و دایك بکرێت کە ئەگەر منالّی تریان لە داهاتوودا ببێت ئەوە ئەگەری ڕێژەی ٥٠٪ی تووشبوونی ئەم نەخۆشیە هەیە.

### ٢- ڕەق بوونی لوولەیی Tuberous sclerosis

بۆماوەیی لەشی زاڵە autosomal dominant، بازدان mutation لە دوو جین لە دوو شوێنی جیاوازدا هەیە، یەکێکیان دەرئەنجامی جینی بازدەر لەسەر کرۆمۆسۆمی $9_{q34}$ و دووەمیان لەسەر کرۆمۆسۆمی $16_{p13.3}$ ڕوودەدات، چونکە توانای نەخۆش بۆ منالّ بوون کەم دەبێتەوە زۆر لەم بارانە دەرئەنجامی بازدانی جینین. نیشانەکانی نەخۆشیەکە ئەمانەن:-


وێنەی ٥٩ أ) ڕژێنە گمۆڵی چەوری.


وێنەی ٥٩ ب) پەڵەی گەڵای دارەڕەش.

١- پەڵەی سپی بچووکی هێلکەیی (پەڵەی گەڵای دارە ڕەش Ash leaf macules) لە ڕێژەی ٨٠٪ی نەخۆشدا هەن و خێرا دوای لە دایکبوون دەردەکەون. (وێنەی ٥٩ ب)

٢- ڕژێنە گمۆڵی چەوری Adenoma sebaceum، لە ٨٥٪ی نەخۆشدا هەن، کاتی باڵقبوون وردە وردە دەردەکەون و گەورە دەبن، تەنۆچکەیی پەمەیی یان زەردباو وەك زیپکەی عازەبە لە دەم و چاو (بەتایبەتی دەوری لووت) دەنوێنن. (وێنەی ٥٩ أ)


وێنەی ٥٩ جـ) ریشاڵەگمۆڵی دەوری نینۆك

٣- ریشاڵەگمۆڵی دەوری نینۆك Periungual fibromas، لە ٥٠٪ی نەخۆشدا هەن، لە تەمەنی پێگەیشتوودا adult دەردەکەون، گرێی پەنجەیی بچووکی دەرپەڕیون لە دەوری یان ژێر نینۆك دا(وێنەی ٥٩ ج). لەوانەیە لە پووك دا دەرکەون.

٤- نیشانەی بەستەرە شانە (پارچەی شاگرین Shagreen patches) لە ٤٠٪ی نەخۆشدا هەیە. لە ١٠ ساڵی یەکەمی ژیان دا دەردەکەوێت، لە مژادی کۆلاجینی پێکهاتووە،

بەشێوەی پێستی ماسی شارك (بەرز و نزمی تێدایە) لە بەشی خوارەوەی بڕبڕەی پشتە lumbosacral و زەرد باوە.

٥- نیشانەکانی تر بریتین لە فیداری (٧٥٪ی نەخۆش)، کەمبوونەوەی ژیری mental retardation (لە ٥٠٪یان دا)، شێوانی چاو( لە ٥٠٪یان دا)، پوکەگریێ و گلایۆما (gliomas) ﴿کە بریتین لە گرێی جۆرێك لە بەستەرەخانەی دەمار و مێشك﴾ لە مێشك و دڵ و گورچیلەدا.

**چارەسەر:**

تێگەیاندنی نەخۆش کە منالی ببێت لەوانەیە ئەم نەخۆشیەی توش بێت . گریێ زەقەکان بۆ جوانی بە نەشتەرگەری، سووتاندن یان بە لەیزەر لادەبرێن .

## ٣- کۆنیشانەی گاردنەر Gardner's syndrome

بۆماوەیی لەشی زاڵە autosomal dominant، بازدانی جینی لە کرۆمۆسۆمی $5_q$ (chromosome $5_q$) روودەدات، نیشانەکانی:

١- زێدەخڕەگۆشت Polyps : لە ڕیخۆڵەی ڕێکە rectum و ڕیخۆڵە ئەستورە colon لە ١٠-٢٠ ساڵیدا دەردەچن، دوای ١٥-٢٠ ساڵ ڕێژەی ٤٠٪یان دەبن بە شێرپەنجە.

٢- پۆرگی چەوری و توێژی Sebaceous & epidermoid Cysts : لەوانەیە ژمارەیان زۆر بێت و لەسەر و دەم و چاو و پەلەکان دەردەچن. لە هەموو نەخۆشەکان دا دەردەکەون.

٣- ئێسکەگمۆڵ Osteomas: بەتایبەتی لە ئێسکی شەویلاگ و ئێسکی تریشدا دەردەکەون.

٤- ڕیشاڵەگمۆڵ Fibroma: لە سك و جێزامی کۆندا دەردەچن.

٥- چەورییەگمۆڵ و ماسولکەگمۆڵ Leiomyomas: هەندێك جار هەن.

## جـ) بەدشێواوی توێژەشانە Ectodermal dysplasias

بریتین لە کۆمەڵێك نەخۆشی جینی کە تێیاندا دروست نەبوونی یان دواکەوتنی یان دروست بوونی شێواوی یان دروست بوونی ناتەواوی یەکێك یان پتر لە پاشکۆکانی توێژ یان ناوپۆش وەك موو، ڕژێنە چەوریەکان یان نینۆك یان ددان یان ڕژێنی ناوپۆشەکان ڕوو دەدات .

## ١-   بەدشێواوی توێژەشانەی ئارەق دەرنەدان یان کەم ئارەق دەردان

Hypohidrotic ectodermal dysplasia   or   Anhidrotic ectodermal dysplasia

نیشانەکانی:

١- تەنکی موو hypotrichosis: مووی هەموو لەشی تەنك و باریکە، پێست تەنك و نەرم و وشکە، ددانەکان کەمن یان نین، نینۆك تەنك و ناسك و نارێکە، لەوانەیە ددانەکان قۆچەکی بن.

٢- ئارەق کردنەوە یان کەمە یان هەر نییە، پلەی گەرمای لەش بە تایبەتی لەوەرزی گەرمادا بەهۆی ئارەق نەکردن بەرز دەبێتەوە و لەوانەیە تووشی بوورانەوەی (فێی) بکات.


(وێنەی ٦٠ أ)
بەدشێواوی توێژەشانەی کەم ئارەق دەردان.

ئێسکی کوڵمە بەرزە و پانە، خوارەوەی دەموچاو بە پێچەوانەوە تەسکە، پردی لووت وەك زینی ئەسپ نزمە، سەری لووت تەسکە و بەرەو سەرەوە چۆتەوە، کونی لووت فراوانە، لە گۆشەی لێودا هێڵی چاڵی بەرەو ئەم لاولا دەڕۆن. (وێنەی ٦٠ أ،ب)


(وێنەی ٦٠ ب)
بەدشێواوی توێژەشانەی ئارەق دەرنەدان.

بۆماوەیی بەزیووە و سێکس لکاوە X-linked recessive، بەڵام هەندێکی تریان بۆماوەیی لەشی زاڵ و بەزیوون autosomal dominant & recessive.

## ٢-   بەدشێواوی توێژەشانەی ئارەقێن

Hidrotic ectodermal dysplasia

بۆماوەیی لەشی زاڵە autosomal dominant، ئارەق دەردان ئاساییە، دەم وچاو ئاساییە بەڵام تەنکی موو و موو ڕوتانەوە، نینۆك تێکچوون، ئەستوربوونی پێستی بەری دەست و پێ و تێکچونی چاو (وەك ئاوی سپی)یان هەن.

### د ) گنجنەنەستورێی‌نێسکپۆش و پێست pachydermoperiostosis

دوو جۆری هەیە:-

١- **بۆماوەیی:-** بۆماوەیی لەشی زاڵە autosomal dominant، پێش باڵقبوون دەردەکەوێت، توشی شێرپەنجە نابێت و نیشانەکانی ئەمانەن:

پێست ئەستوور دەبێت و لۆچی تێدەکەوێت، هێڵەکانی دەم وچاو و سەر زەق و قووڵترن، نینۆك کوڕبوون clubbing of fingers و ئەستووربوونی ئێسکپۆشی periostium ئێسکە

درێژەکان هەن، لێو و گوێچکە و پێڵووی چاو ئەستوور دەبن، زمان لە ئاسایی گەورەترە، پێستی سەر لۆچاوی و ئەستوورە، ئانیشك و ئەژنۆ و دەستەکان گەورەن و ئارەق کردنەوە پتر دەبێت.

**٢-دەست کەوتوو(وەرگیراو)** acquired: لە ئەنجامی نەخۆشی درێژخایەنی سییەکان، دڵ یان شێرپەنجەی سی ڕوو دەدات.

**هـ) پێستەوشکەی ڕەنگی (ڕەنگاڵە)** Xeroderma pigmentosum

بۆماوەیی لەشی بەزیوە aut. Recessive، حەوت جۆری هەیە، بەڵام هەموویان بەهەمان ڕێبازدا تێپەڕ دەبن و ئەم ناساغیە بەهۆی نەبوونی توانای سارێژکردنی DNAی تێکچوو بە ت س و ڕوودەدات. (وێنەی ٦١)





نەخۆش فرەهەستیارە بە ت س و و خۆر، پێست وشك و شڵە (کونجە) (وێنەی ٦١) پێستەوشکەی رەنگالە.

freckles، لە پێش تەمەنی دووساڵیدا پێست وشکە و قۆچەکاژ keratoses لەو شوێنانەی خۆر لێیان دەدات دروست دەبن ، پێست تەنك تر دەبێت و فرە دەزوولە و telangiectasia خوێنبۆریە گمۆڵی angioma تێدا دەردەچێت ئەوسا شێرپەنجە وەك شێرپەنجەی خانەی بنکەیی basal cell carcinoma، شێرپەنجەی خانەی کاژی .squmous cell ca و شێرپەنجەی خانەی تۆخ melanoma دروست دەبن. زۆربەیان پێش ٢٠ ساڵی دەمرن.

پێڵووی چاوی خوارەوە هەڵدێتectropion، تیشکە هەستیاری چاو photophobia و لێڵ بوونی پەرگلێنە cornea ڕوو دەدەن، هەندێکیان سەریان بچووکە و کەم ژیرن، کورتە باڵان، کەڕن و هاوسەنگیان تێکدەچێت"لارە لارەیان"ataxia" تووش دەبێت .

**چارەسەر**

١- خۆ پاراستنێکی تەواو لە خۆر و ت س و بەهەموو ڕێگاکان.

٢- خێرا دیارکردنی شێرپەنجە و لابردنیان بە نەشتەرگەری.

٣- چارەسەری جینی gene therapy لە دروست بون دایە.

٤- کرێمی پێنج فلۆرۆیوراسیل 5-fluorouracil یان ئیمیکوێمۆد ٥٪ imiquimod.

٥- ڕێتینۆیدەکان وەك ئایزۆترێتینۆین isotretinoin ٥ر٠ ملگم – ٢ملگم/کگم/ڕۆژ.

٦- روکەشی پێست نوێکردنەوە resurfacing بە لەیزەر یان بە تاشینی کیمیکی chemical peels یان متوربەکردن skin grafting.

٧- ئەنزیمی سارێژکەری DNAی تێکچوو endonuclease V of bacteriophage T4 هێشتا هەر لە باسکردن دایە.

## و-دەلاَندنی ڕەنگی Incontinentia pigmenti

بۆماوەیی سێکسی زاڵە X-linked dominant، هەر لە مێینەدا هەیە(وێنەی ٦٢).

جینەکە لەسەر کرۆمۆسۆمی $X_{q28}$ یان $X_{p11}$ دایە ، سێ یان چوار قۆناغی هەیە:

١- قۆناغی بلۆقی Vesicular phase:- لە ٤-٦ حەفتەی یەکەمی ژیان دا بلۆقەکان دروست بوون و شێوەیەکی هێڵیان هەیە، پتر لەسەر پەلەکان دان دواتر لە قەد دا. دوای چەند حەفتەیەك یان مانگێك ئەم بلۆقانە جێگاکانیان دەبێت بە (دوای نەمانیان)قۆناغی بالوکەیی.


(وێنەی٦٢) دەلاَندنی ڕەنگی.

٢- قۆناغی بالوکەیی Warty phase:- بریتییە لە تەنۆچکەی papules ڕوکەشی بالووکەیی لە ٢/٣ی نەخۆشدا و دوای یەك ساڵ زۆربەیان نامێنن بەلاَم لەوانەیە پتر بەردەوام بن.

٣- قۆناغی ڕەنگی Pigmentary phase:- پەڵەی ڕەنگی (تۆخ) بە شێوەی ژمارەیی و هێڵی و ئاو پرژاو و پێچاوپێچ دەردەکەون و دوای چەند ساڵ نامێنن، بەلاَم هەندێك ژنی پێگەیشتوو adult women دەچنە قۆناغی چوار.

٤- قۆناغی دەردی سپی و پێستە پوکاوەی هێڵی Hypochromic or atrophic linear lesions:- بە تایبەتی لەسەر پەلەکان دەبینرێن.

جگە لەوانەی سەرەوە لەوانەیە چەند شێواوی تر هەبن وەك: ڕێژەی ٢٥٪ یان شێواوی کۆئەندامی دەماری ناوەندیان C.N.S. هەیە وەك کەم ژیری، فێ، سەربچووکی microcephaly و شێواوی کەللەی سەر و مەلاَشوو، دواکەوتنی ددان دروستبوون یان نەبوونی ددانەکان، لە ١/٣ی نەخۆشدا شێواوی چاو وەك خێلی و ئاوی سپی و پووکانەوەی دەماری بینین optic atrophy هەن


(وێنەی٦٣)
کۆنیشانەی ئێهلەرس – دانلۆس.

## ز- کۆنیشانەی ئیهلەرس – دانلۆس (Cutis hyperelastica) Ehlers danlose syndrome

بریتین لە کۆمەڵێك شێوانی disorders بەستەڕەشانە بەهۆی تێکچوونی یان گۆڕانی کۆلاجین و ناواخنەکانی نێوانیان، ئەم کۆمەڵە ۱۰ جۆری جینی جیاواز لە یەکتر لەخۆی دەگرێت. ( وێنەی ٦٣ )

نیشانەکانی:-

١- فرە جیڕی پێست hyperelasticity.

٢- فرەجووڵەیی جومگەکان joint hyperextensibility.

٣- تەقیو باو و ناسکی پێست و بۆریەکانی خوێن.

٤- زوو خوێنتێچوونی پێست (زوو شینکی بوونی پێست) easy bruising.

٥- جێ زامی پەرەسیگاری tissue paper scars.

ماکەکانی complications بەپێی جۆرەکەیە و بریتین لە: لەجێچوونی جومگەکان، خوێنهێنە گمۆڵ varicose veins، باوی گەدە پۆست (قۆڕی)، پشت کوڕی و لاری kyphoscoliosis، کشانە لۆچی شاخوێنبەر aortic aneurysm ، تەقینی خوێنبەرە گەورەکان و خوێن بەربوونی ناوچاو.

## ح-جیرە گەندەزەردەگمۆڵێ Pseudoxanthoma elasticum

بۆماوەیی لەشی زاڵ و بەزیوە (هەردووکیان)، لە ئەنجامی بازدانی جینی لەسەر کرۆمۆسۆمی ١ ڕیشاڵە جیرەکان elastic fibers لەت و پەت دەبن لەگەڵ نیشتنی کالسیۆم لەسەریان. ێنەی ٦٤ أ،ب،ج )



(وێنەی٦٤: ا ) جیرە گەندە زەردەگمۆڵێ. ب) جیرە زەردەگمۆڵێ. جـ) جیرە زەردەگمۆڵێ.

کانی:-

ێستی مل و ژێر باڵ و شوێنە چەماوەکانی تر نەرم و چرچ دەبن، کۆمەڵێك تەنۆچکەی ، زەرد لەم شوێنانەدا ((وەك پێستی مریشکی پاك کراو دەنوێنێت)) دەردەکەون. لەوانەیە و retina خوێنرێژی وەك هێڵی سوور بۆ هەموو دەورووپشتی تێدا بێت. لەوانەیە دیواری کان لە پەلەکان و دڵ و مێشك و ڕیخۆڵەدا تووشی خوێنبەربوون بن ، هەندێکیان پەستانی ،رز دەبێتەوە.

## خ- پێسته شله Cutis laxa

دوو جۆری هەیە:

١- بۆماوەیی لەشی زاڵ aut.dominant کە هەر لە پێست دەدات و ئەنجامی باشە.

٢- بۆماویی لەشی بەزیوو aut. recessive باوترە، جگە لە پێست زۆر ئەندامی تر دەگرێتەوە وەك: گەدە پۆست hernias، لالۆچی ریخۆڵە diverticulae، سی ئاوسان، هەناسە سواری، سستی دڵ heart failure، کشانە لۆچی شاخوێنبەر، ددان تێکچوون و ئێسکەفشۆڵ osteoporosis. (وێنەی ٦٥)



(وێنەی٦٥) پێستە شلە.

لە نەخۆشی پێستە شلەدا پێست شل و شۆڕە، بەڵام جیری نەماوە بەتایبەتی لە دەوری پێڵووی چاو و ڕوومەت، مل وەك پێستە شۆڕەی سەگی ڕاوکردن وایە. لەم نەخۆشیەدا ریشاڵە جیرییەکان بە شێواوی دروست دەبن و جوداگانەی جیریان نامێنێت.

## ی- پێست تەقین ((قلیشانی پێستە کشاو (چنگی پشیلە)) Striae distensae

بریتیە لە هێڵ یان پەت (نزمتر لە ڕوی پێست) لە پێستی تەنك و سووورباو و لە دواییدا بۆ ڕەنگی سپی دەگۆڕێت و پێست لوست و بریقەدارتر دەبێت.



(وێنەی٦٦) پێست تەقین.

سێ هۆكار ڕۆڵی تێدا دەبینن: بۆماوەیی + هۆی میکانیکی (کشانی پێست) + گۆڕانی هۆرمۆنی (کورتیزۆڵ و ئیسترۆجین). (وێنەی ٦٦)

**هۆکانی:-**

١- پتر بوونی کێش و ماسولکە ئەستووربوون (بۆ نمونە بە وەرزش).

٢- لەسەر سك دا striae gravidarum لە کاتی سکپڕی و دوای منالبوون، وە لەسەر مەمك لەکاتی شیردان دا.

٣- کاتی پێش بالقی و بالقبوون (واتا لە پڕ گەورەبوون) لەسەر سمت، ڕان، بەشی ناوەوەی سەرەوەی ڕان و سەر ئانیشك و ئەژنۆ.

٤- نەخۆشی کوشینگ cushing syndrome دوو جۆری هەیە:

أ) هۆی ناوەوە (تێکچوونی ڕژێنی ئەدرینال کە زۆر مژادی کۆرتیزۆن دروست دەکات).

ب) هۆی دەرەوە وەك ستیرۆیدی سیستمی یان کرێمی ستیرۆیدی بەهێز بەتایبەتی لە لۆچەکان دا.

٥- هەندێك نەخۆشی وەك كۆنیشانەی مارفان Marfan syndrome.

لەگەڵ كاتدا ئەم قڵیشانە وەك تاڵە دەزووی سپی باریكیان لێ دێت و كەمتر دیار دەبن.

## چارەسەر

١- وازی لــێ بێنە.

٢- كرێمی ترێتینۆین tretinoin بۆ ٣-٦ مانگ، ٨٠٪ یان پێی باشتر دەبن.

٣- لەیزەری pulsed dye laser (٥٨٥ نم).

٤- لەیزەری excimer (٣٠٨ نم).

٥- IPL .

٦- ٢٠٪ ترشی گلایكۆلیك + ٠٫٠٥٪ ترێتینۆین.

٧- ٢٠٪ گلایكۆلیك ئەسید + ١٠٪ ترشی ئەسكۆربیك (ڤیتامین C).

٨- ٧٠٪ جێڵی گلایكۆلیك + ٤٠٪ ترشی سێ كلۆری سركە TCA بۆ كاژكردنی (تاشینی) كیمیكی chemical peel.

٩- وورده تاشینی پێست micro -dermabrasion.

## دەستنیشانکردنی نەخۆشیە جینیەکانی (بۆماوەییەکانی) پێست بەر لە دایکبوون
## Prenatal diagnosis of genetic skin diseases

مەبەست لە دیارکردنی نەخۆشیە کنێتیەکان و کرۆمۆسۆمیەکان پێش لەدایکبوون ئەوەیە کە منالّی پەککەوتە و تێکشکاو چ لەباری ژیری یان لەشیدا لە قۆناغێکی زوودا لەبەر بریت abortion، ڕێگاکانی ئەم دیارکردنە بریتین لە:-

١- دەرهێنانی شلەی دەوری کۆرپەلە Amniocentesis: بە سرنج شلەی fluid دەوری کۆرپەلە ڕادەکێشین و دەپشکنین. ئەم شلەیە خانەی پێست و ناوپۆشی ڕیخۆڵە و سەراپای سێکسی و میزی تێدایە و زۆر نەخۆشی پێ دەست نیشان دەکرێت وەك پێستە وشکەی ڕەنگاڵە xeroderma pigmentosum و نەخۆشی ماسی سێکس لکاو X linked icthyosis– تاد.

٢- سۆنار Ultrasonography: بە تایبەتی بۆ دیارکردنی نەخۆشی ئێسك، وەك ناتەواوی دروست بوونی ئێسك osteogenesis imperfecta.

٣- بینینی ڕاستەوخۆی کۆرپەلە Fetoscopy بە ئامێری کۆرپەلەبین Fetoscope.

٤- نموونە وەرگرتن Biopsy بە ئامێری کۆرپەلەبین Fetoscope.

٥- وردبینی ئاسایی و وردبینی ئەلیکترۆنی Light & Electron microscopy بۆ پشکنینی نمونەی وەرگیراو .

٦- پشکنینی ئەنزیمی Enzymatic assay: بۆ نموونە خانەی فایبرۆبلاستی(دایکەڕیشاڵەخانەی) وەرگیراو بە شێوازەکانی پێشوو کە دەپشکنرێت بۆ ئەنزیمی کۆلاجین شکێن collagenase و نەخۆشی توێژ شیبوونەوەی بلّقی جۆری بەدگەشەیی dystrophic type E.B. پێی دەستنیشان دەکرێت.

٧- هەستەوەری دژەتەن Antibody probes:- بە بەکارهێنانی کۆمەڵێك لە دژە تەنی یەك بابەت (تاك مۆڵگەیی) monoclonal antibodies بۆ کارتێکردن لەگەڵ دژە ژیندەر لە چینە جیاکانی لکینی توێژ و بن توێژ بۆ دۆزینەوەی جیاوازی ئاسایی و نائاسایی.

٨- تەکنیکی DNA techniques DNA:- شیکردنەوەی DNA ی ڕاستەوخۆ زۆر گرنگ و خێرایە بۆ دۆزینەوەی نەخۆشییە کنێتیەکان (واتا نەخشەی جینی gene mapping و ریزبەندی جینی gene sequencing).

## نەخۆشیەکانی منالّی نەوزاد( نۆبوو=کۆرپە ) Neonate & Neonatal diseases

کۆرپە: واتا ٤ حەفتەی یەکەمی ژیان.

ساوا: واتا سالّی یەکەمی ژیان.

**ڕوالّەتی پێستی نۆبوو:** چەند ڕوالّەتێکی نائاسایی کە فیسیۆلۆجین دەبینرێن وەك:

١- داپۆشی پەنیری Vernix caseosa :- لەکاتی لەدایکبوون دا پێست بە پەردەیەکی چەوری سپی داپۆشراوە، لەسەر هەموو پێستە یان تەنیا لە پێستی لۆچەکان دایە، لەچەند ساتێکدا دەتەقێت و فڕێ دەدرێت .ئەم پەردەیە لە چەوری دروستبووە.

٢- شین هەلّگەڕان لەبەری دەست و پێ و دەوری دەم، لە ٤٨ کاژێردا نامێنێت.

٣- سووربوونەوەی کۆرپە Erythema neonatorum :- چەند کاژێرێك دوای لەدایکبوون کۆرپە بە گشتی سورر دەبێتەوە، لە ١-٢ ڕۆژدا نامێنێت.

٤- ڕەنگ گۆڕانی تیزەجار Harlequin colour change لە ٥٪ ی کۆرپەدا لە حەفتەی یەکەم دا ئەگەر لەسەر کەلەکە پالّ بخرێت نیوەی سەرەوەی لەشی شین و نیوەی خوارەوەی لەشی سوور دەبێتەوە وە بەپێچەوانە پێچەوانەیە و نیو تا ٢٠ خولەك دەمێنێتەوە. پێش چوار حەفتەی ژیان ئەم دیاردەیە نامێنێت.

٥- مەڕمەڕ ڕەنگی پێست Cutis marmorata :- کە کۆرپە بەر سەرما بکەوێت لەشی تۆڕێکی شین باو دروست دەکات، کە گەرمی بۆوە نامێنێت.

٦- کاژکردن: ڕێژەی ٧٥٪ی کۆرپە دەست و پێی کاژ دەکات و لەدوایی دا نامێنێت.

٧- مووکەوتنی پشتی سەر: زۆر کۆرپە پشتی سەریان مووی نییە و لە دواییدا دەردەچێتەوە.

٨- گەورەبوونی ڕژێنە چەوریەکان: لە زۆر کۆرپەدا "بەهۆی بوونی ئەندرۆجینی دایك لە خوێنی دا" ڕژێنە چەوریەکان دەئاوسێن و وەك تەنۆچکەی بچووکی زەرد لە دەم و چاو و هەندێك جار بەشی سەرەوەی قەد دا دەردەکەون. تەنۆچکەی بچووکی سپی کە پێی دەلّێن میلیا milia هەروەها لە هەمان شوێندا دەردەکەون، لە ٤ حەفتەدا نامێنن.

٩- گچکە بالّقبوون: واتا گەورە بوونی ئەندامی سێکسی کۆرپەی نێر و مێ بەهۆی ئەندرۆجینی دایك لە خوێنی کۆرپەدا، دوایی نامێنێت.

١٠-مەمك گەورەبوون لە کۆرپەی نێر و مێ دا لە ٤ حەفتە کەمتردا نامێنێت. لەوانەیە ببێتە مەمکە سۆ.

١١-ڕێژەی ٨٥٪ ی کۆرپە تەنۆچکەی ڕوونی بچوك لە لێواری پوکیان دا هەیە و پێی دەوترێت (مرواری ئێپساین) Epstein pearls، لە چەند حەفتەیەکدا نامێنێت.

## نەخۆشیە باوەکانی کۆرپە (نۆبوو) و ساوا

١- ژەهرە سووربوونەوەی کۆرپە Toxic erythema of the newborn

ڕێژەی ٥٠٪ی کۆرپە لە چەند ڕۆژی یەکەمی ژیان دا چەند پەڵەیەکی سوور یان سەدان پەڵەی سوور لەسەر لەشیدا جگە لەبەری دەست و پێ دەردەکەون، لەماوەی ٢-٣ حەفتەدا نامێنن و چارەسەری ناوێت(وێنەی ٦٧ أ،ب).



(وێنەی٦٧ أ) ژەهرە سووربوونەوە.



(وێنەی٦٧ ب) ژەهرە سووربوونەوە.

٢- گەرمەژنە Miliaria: باسمان کرد.

٣- پەلەپیزۆکەی ساوا Infantile acropustulosis

بریتیە لە دووبارە دروستبوونەوەی کۆمەڵێك تەنۆچکە و پیزۆکە(١-٤ ملم) بەتایبەتی لەبەری دەست و پێ و لێواری پێ دا، بەڵام هەندێك جار لە پشتی دەست و پێ و پەنجە و باسك و لاقیش دا دەردەچن. لە سەرەتادا تەنۆچکەی سووری بچووکن و دواترلە ماوەی یەك ڕۆژدا بۆ پیزوکەی بچووك دەگۆڕێن. لە ٦-١٢ مانگی یەکەمی ژیان دا ڕوودەدات و پێش تەمەنی دوو ساڵی نامێنێت.

هەر کۆمەڵێك لەمانە١-٢ حەفتە دەمێنێتەوە و ٢-٤ حەفتە پشوودانە و چەندین جار پەیدا دەبێتەوە و زۆر بەخورروون.

**چارەسەر**

١- داپسۆن dapson ١ملگم/کگم/ڕۆژ.

٢- باشتر وایە ستیرۆید بەکرێم و مەرهەم لەژێر بەستن دا لەگەڵ ئەنتی هیستامین بەکار بهێنرێت.

٤- کرێشە کڵاو Craddle cap

لەوانەیە پاشماوەی داپۆشی پەنیری vernix caseosa بێت لە تەپڵەسەری کۆرپەدا، کرێژ و چەوری هەندێك جار وەك چینێکی پەستاوتراو وایە، جار جاریش کرێژ وکاژ لە برۆ و پشتی گوێچگە و مل و ناوگەڵ'دا هەن. نابێت بەدەست هەڵبکەنرێت وەك هەندێك دایك بە زۆر لێی دەکەنەوە.

**چارەسەر**

چەورکردن بە زەیتی (ڕۆنی) زەیتون olive oil یان مەرهەمی چەور، ڕۆژی ١-٢ جار.

شامپۆی بەهێز وەك سەڵسن یان ترشی سالیسلیك بەکار ناهێنرێت.

٥- کۆرپەی کۆلۆدیۆن Collodion Baby

کۆرپەی لەدایکبوو سوورە و لەناو کیسێکی (زەرفێکی) ڕوون دایە، دەم وچاو جوولەی لێبڕاوە و پێڵووی چاو بۆ خوارەوە هەڵگەڕاوەتەوە، هەروەها لێوی خوارەوەی وەك دەمی ماسی وایە، لووت و گوێچکە شێواون، لەچەند سائێکدا ئەم پەردەیە (کیسە) درز دەبات و لەوانەیە خوێن لە درزەکان بێتە دەرەوە، لە ١-٢ ڕۆژدا پەردەکە دەبێت بە توێکڵ و فڕێ دەدرێت بەڵام لەوانەیە چەند کەرەتێك پەردەکە دروست بێتەوە. لەماوەی چەند حەفتە بۆ چەند مانگێك جۆرێك لە جۆرەکانی نەخۆشی ماسی لە ساواکەدا دەردەکەوێت(وێنەی ٦٨).


(وێنەی ٦٨) کۆرپەی کۆلۆدیۆن

**چارەسەر**

١- چەورکردنی پێست هەر ٢/١ کاتژمێر جارێك بەتایبەتی بە تێکەڵەی پارافینی نەرم و سپی و پارافینی شل white soft paraffin + liquid paraffin.

٢- لە کابینەی تایبەت بە ساوا لە پلەی گەرمای گونجاودا دادەنرێت.

٣- ئاگامان لە ونبوونی شلەی ناو لەش body fluid بێت.

٦- پێستەسۆی دەوری کۆمی کۆرپە Perianal dermatitis of newborn

سووربوونەوەی پێستی دەوری کۆم (٢-٤ سم دەوری کۆم) لە ٧-٨ ڕۆژی دوای لەدایکبوون دا ڕوودەدات، لەوانەیە ئاوسان و ڕووشانیشی تووش بێت و لە ماوەی ٧-٨ حەفتەدا چاك دەبێتەوە.

**چارەسەر**

دوای پیسایی کردن کۆم و دەورووبەری بە ئاو و سابونی تایبەت بە منداڵ دەشۆرێتەوە و مژادێکی چەورکەر وەك پارافینی نەرمی سپی لێ دەدرێت.

٧- پێستەسۆی ورووژانی دایبی سەرەتایی (پێستەسۆی دایبی)
Primary irritant napkin dermatitis

هەرچەند هۆی بنەڕەتی نەزانراوە بەڵام چەند هۆکارێك گرنگیان هەیە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- لێخشانی دایبی و پێست.

٢- خووسانی ناوگەڵ بە تەڕی میز و پیسایی.

٣- بوونی ئەنزیمی پەنکریاس لە پیسایی دا وەك ئەنزیمی چەوری و پرۆتین شكێن lipolytic and proteolytic enzymes، ئـەم ئەنزیمانـە پێستە خوساوەكە دەورووژێنن و pH ی بەهۆی میز بەرز دەكەنـەوە (بـۆ سەررووی٨).


(وێنەی٦٩) پێستەسۆی داییبی.

٤- شیری مانگا لە جیاتی شیری دایك pH بەرزتر دەكاتەوە.

٥- قارچی كاندیدا (كەڕوو) candidal invasion لـە پیسـاییەوە دێتە سەر پێستە سۆبووەكە . (وێنەی ٦٩)

**نیشانەكانی**

دوای حەفتەی ٣ لە تەمەن دەردەكەون ، زۆربەیان لە ٧-١٢ مانگی دا تووشی دەبن و رێژەی ٥٠٪ی ساوا دەیگرن.

سووربوون لە شوێنە قۆقزەكان كە پڕ لێك كەوتنیان لەگەڵ داییبی دا هەیە وەك سمت، ئەندامی زاووزێ، خوارەوەی سك و پێستی بەر و سەرەوەی ران ڕوودەدات، قوولایی ناوگەڵ تووشی نابێت، كەمێك ئاوسان ڕوودەدات و لەدوایی دا كاژ دروست دەبێت، هەندێك جار تەنۆچكە و پیزۆكـەی بچـووك دروسـت دەبـن و چـاڵە برینـی رووكەشـی جێـدەهێڵن، ئەگـەر ئەندامـە سێكسیەكان زۆر سووربنەوە ئەوە ئازار لەكاتی میزكردندا dysuria ڕوودەدات.

لەوانەیە ئەم پێستە سۆیە تووشێنی بەكتریا و كاندیداشی بچنە پاڵ و نیشانەكانی ئەم نەخۆشیانەش دەركەون.

**چارەسەر**

١- دەبێت داییبی پەرۆ زوو زوو بگۆڕێت و بشۆرێت (خاوێن كردنەوە بەمژادی بێنزالكۆنیـوم كلۆراید benzalkonium chloride زۆر باشە)، بەلام زۆر باش بە ئاو بشۆردرێتەوە و باش وشك كرابێتەوە، كاتی خەوتنی كۆرپە و زۆر كـاتی تـریش داییبـی دانـەخرابێت (كرابنەوە)، داییبـی دیسـپۆزەبڵ disposable بەتایبـەتی جـۆری سـوپەر ئەبسـۆربانت superabsorbent زۆر باشە و لەهی پەرۆ باشترە چونكە تەڕی هەڵدەمژێت و خوسانی پێست كەمترە. كۆرپە ٢٠ جار لە ٢٤ كاتژمێردا میز دەكات بەلام بە تەمەنی یەك سـاڵی تەنیا ٧ جار خۆی پیس دەكات.

٢- گرنگی ڕۆتینی بە پێست: دوای چاكبوونەوە لە دوای شۆردنەوە بەئاو و سابونی تایبەت، باش پێستەكە وشك بكرێتەو و مەرهـەمی زنـك كاسـتەر ئـۆیڵ Zinc castor oil یـان پارافینی شل یان پارافینی نەرمی سپی لـێ بدرێت، پاودەر (بۆدرە) باش نییە.

٣- چارەسەری دەرمانی: مەرهەمی ستیرۆید وەك هایدرۆكۆرتیزۆن و هەندێك جار لەگەڵ دژە کاندیدا و بەکتریا ، ڕۆژی ٢ جار دوای شتنی و وشك کردنەوەی پێست بەکاردێت.

٨- چەورە بیرۆی ساوا Infantile seborrhoeic dermatitis

لە حەفتەی ٢-٦ی ژیاندا دەست پێدەکات، سووربونەوە و کاژی چەور کە بە پێستەوە نووساوە دەردەکەون و هەندێك جار پیزوکەش هەن، خورانی کەمە، تووشی سەر و دەم وچاو بەتایبەتی برۆ و لاکانی لووت و پشت گوێچکە دەبێت، مل و ناوڕان و ناوك، هەندێك جار سنگ و پشت و شوێنی تریش دەگرێتەوە، چەند حەفتەیەك یان مانگێك دەمێنێتەوە ئەوسا بۆ خۆی نامێنێت. (وێنەی ٧٠)


(وێنەی ٧٠) چەورە بیرۆی ساوا.

چارەسەر

ڕۆژی جارێك منداڵە ساواکە بە ئاوی چەورکراو دەشۆرێت dispersing bathing oil، سابون بەکار ناهێنرێت، ئەوسا کرێمی دژە هەوێن yeast وەك کرێمی کیتۆکۆنازول ٢٪ ڕۆژی ١-٢ جار تا ١٠ ڕۆژ بەکار دەهێنرێت، سەر بە شامپۆی کیتۆکۆنازۆل ٢٪ دەشۆرێت.خواردنی باشیش بدرێتە منداڵەکە.

٩- عازەبەی (زیپکەی) کۆرپە Acne neonatorum

لە ٣٠ ڕۆژی یەکەمی ژیاندا دروست دەبێت، ڕێژەی ٥٠٪ ی کۆرپە تووشی دەبێت، هۆی ئەم دیاردەیە بوونی ئەندرۆجینی دایکە لە ناو خوێنی کۆرپەدا، هەندێك جاریش هۆکەی سۆی بەکتریا یان کەڕووی مالاسیزیایە. (وێنەی ٧١)


(وێنەی ٧١) زیپکەی عازەبەی کۆرپە.

چارەسەر

پێویست ناکات، بەڵام لە باری توندا کرێمی بەنزایڵ پیرۆکساید، ئیریثرۆمایسین یان کیتۆکۆنازوڵ بەکار دەهێنرێت.

# شێواویەکانی کاژکردن Disorders of keratinization

## نەخۆشی ماسی Icthyosis

کۆمەڵە نەخۆشیەکن لە ئەنجامی تێکچوونی هاوسەنگی دروستبوون و فڕێدانی کاژ ڕوو دەدەن ، واتا یان کاژ دروست کردن یان پێکەوە لکانی کاژەکان هەڵەی تێدایە ، بە مانایەکی تر جیاکاری ((تایبەت مەندبوونی)) differentiation تویژ نائاساییە. جۆرە سەرەکیەکانی ئەمانەن:

١- نەخۆشیەکانی ماسی زگماکی Congenital icthyoses

أ ) نەخۆشی ماسی ئاسایی ((باو)) Icthyosis vulgaris




(وێنەی٧٢ أ) نەخۆشی ماسی باو.

بۆماوەیی لەشی زاڵە autosomal dominant، یەك لە ٣٠٠ لە دایکبوو تووشی دەبێت. جینە تێکچووەکە تایبەتمەندە بۆ وەبەرهێنانی ڕۆفیلاگرین profilaggrin کە ئەمیش مزادی سەرەتایی precursor فیلاگرینە filaggrin و ئەمیش بەشێکە لە دەنکۆڵەی کیراتۆهیالین keratohyalin granules. لەم نەخۆشیەدا ئەم دەنکۆڵانە شێواو و بچووکن ، لەباری ئاسایی دا ئەم دەنکۆڵانە لە کۆکردنەوە و بەیەکەوە نووسانی دەزووە ناوەندیەکانی کیراتین keratin (intermediate) filaments گرنگن بەمەش تۆڕێکی تەواو بۆ پێکهاتەیەکی پتەوی خانەی کاژەکان دروست دەکەن. (وێنەی٧٢ أ،ب)




(وێنەی٧٢ ب) نەخۆشی ماسی باو.

ئەم نەخۆشیە لەکاتی لەدایکبوون دا نیە بەڵکو دوای (٣-١٢)مانگ دەردەکەوێت، هەندێك لە نەخۆشەکان لەدوای باڵقبوون باشتر دەبن بەڵام بەیەکجاری لاناچێت، لە هەموو جۆرەکانی تری نەخۆشی ماسی سووك ترە.

پێست کەمێك وشکە، کاژەکان بچووکن و وەك کەپەکن branny و زۆربەی لەش جگە لە لۆچەکان" وەك ژێر باڵ، نێوان ڕمتەکان، لۆچی پشت ئەژنۆ و پێش ئانیشك" کاژاویە، کاژەکان لە پەلەکانی خوارەوە (لاقەکان)دا گەورەتر و زبرترن.

بە وەرزی سەرما زۆربەی نەخۆش نەخۆشیەکەی توندترە و لە هاوین دا باشتر دەبێت، زۆر جار جگە لە کاژکردن ئەمانەی خوارەوەش هەن:

- قوڵتر دیابوونی هێڵەکانی پێست و پێست ئەستووربوونی بەری دەست.

- قۆچەکاژی کونی مووەکان keratosis pilaris لەسەر پێست.
- پێستی سەر کاژکردنێکی کەمی هەیە.
- خاڵی جیاجیای قۆچەکاژ لە هێڵە نزمەکانی بەری دەست.
- بوونی نەخۆشی بیرۆی جێگۆڕاو atopic dermatitis، تای کایی (پوشی) hay fever، تەنگە نەفەسی((بەرهەنگ)) asthma یان لیر دەرکردن.

ب) **نەخۆشی ماسی سێکس لکاوی بەزیوو** X-linked recessive icthyosis

هەر لە نێرینەدا هەیە چونکە بۆماوەیی سێکسی بەزیوە X-linked recessive و لە ٦٠٠٠ نێرینەدا یەکێکیان تووشی دەبێت، لێرەدا ئەنزیمی ستیرۆید سەلفاتەیس steroid sulfatase لە ناو خانەی کاژ و خڕۆکەی سپی و فایبرۆبلاستەکان دا نەماوە یان کەمە و بەمەش سەلفاتی کۆلێستیرۆل cholesterol sulfate ڕێژەی لە ناو زەرداوی خوێن serun، پەردەی خڕۆکەی سوور و لە کاژ دا بەرز دەبێتەوە. ئەم جینەی لێپرسراوی ئەم نەخۆشیەیە دەکەوێتە سەر بەشی کۆتایی کرۆمۆسۆمی X لە شوێنی $X_{p22.3}$. (وێنەی ٧٣)



(وێنەی ٧٣)
نەخۆشی ماسی سێکس لکاوی بەزیوو.

**نیشانەکانی**

هەر کە کۆرپە لەدایکبوو کاژکردن لەسەر هەموو لەشی هەیە و لۆچەکانیش body folds وەك پێستی ژێر باڵ و مل و پێستی لۆچی ئەژنۆ و ئانیشك دەگرێتەوە. کاژەکان لە جۆری ئاسایی کە باسمان کرد گەورەت و قاوەیی ترن.

بەری دەست و پێ ئاساین، نەخۆشی تری لەگەڵدا نییە، بە درێژایی تەمەن دەمێنێتەوە و ناگۆڕێت بەڵام دەم وچاو و سەر و لۆچەکانی ئانیشك و ئەژنۆ کەمتر نەخۆشیەکەیان لێ دەردەکەوێت (واتا سوك ترە). لە هاوین دا زۆر سووك تر دەبێت.

هەندێك جار لە پاڵ ئەم جۆرە نەخۆشی ماسیەدا لێڵ بوونی گلێنە corneal opacities، بەدی یان کەموکوڕی توخمدانەکان hypogonadism، بۆن نەکردن anosmia و کەموکوڕی دەماری neurological defects هەن.

جـ) **کۆرپەی کولۆدیۆن** Collodion Baby: باسمان کرد.

د ) **نەخۆشی ماسی پلەیتی** Lamellar icthyosis

بۆماوەیی لەشی بەزیوە autosomal recessive. نیوەی نەخۆشەکان کەمی یان نەبوونی ئەنزیمی ترانسگلوتامینەیز (transglutaminase) یان هەیە و ئەمە جۆری یەکەمە، جۆری دووەم بازدانی جینی یان هەیە.

**نیشانەکانی**

نەخۆشیەکە لەکاتی لەدایکبوونەوە هەیە و وەك کۆرپەی کۆڵۆدیۆنە، لە ٢-٣ حەفتەدا ئەم بەرگە جیلاتینیە فڕێ دەدرێت و کاژی گەورەی (٥-١٥ ملم) قاوەیی و خۆڵەمێشی چوار پاڵویی دەردەکەون، ئەم کاژانە لێوارەکانی لە پێست پچڕاون بەلام چەقەکەیان بە پێستەوە نووساون. بەری دەست و پێ لە ئاسایی ئەستوورترە و کونەکانی پێست (pores) چاڵین و پێڵووی چاو هەمیشە بەرەو خوارەوە هەڵدراوەتەوە ectropion (وێنەی ٧٤).







(وێنەی ٧٤) نەخۆشی ماسی پلەیتی.

**هـ) پێستەسووریی ماسی زگماکی نابڵقی**

Non-bullous congenital icthyosiform erythroderma

بۆماوەیی و هۆکەی هەروەك نەخۆشی ماسی پلەیتی وایە بەلام نیشانەکانی هەندێك جیاوازیان هەیە.

**نیشانەکانی**



(وێنەی ٧٥)
پێستەسووریی ماسی زگماکی نابلقی.

کۆرپەی کۆلۆدیۆن لە دایك دەبێت بەلام لە ٢٤ کاتژمێردا دوای لەدایکبوون درز و کاژ دەست پێدەکەن و پلەیتە کاژیە گەورەکان لە ماوەی ١٠-١٤ ڕۆژدا فڕی دەدرێن و ئەوسا سووربونەوە و redness کاژ لە ژێر پەردە فڕێ دراوەکەدا دەردەکەون، هەموو لەشی کۆرپە (دەم وچاو و بەری دەست و پێ لۆچەکانیش) دەگرێتەوە. (وێنەی ٧٥)

موو هەڵوەرینی کونێتی cicatricial alopecias، نینۆك شێواوی nail dystrophy و پێڵوو هەڵدرانەوە ectropion باون.

کاژەکان لەسەر لاقەکان دا گەورە و پلەیتین بەلام لە دەم وچاو و قەد و پێستی سەردا وردترن.

**و) کۆرپەلەی تیزەجاڕ (گاڵتەجاڕ)** Harlequin foetus



(وێنەی ٧٦) کۆرپەلەی تیزەجاڕ.

بۆماوەیی لەشی بەزیووە بەلام هەندێك جار بۆماوەیی لەشی زاڵە (وێنەی ٧٦)، کۆرپەلە بە مردوویی لە دایك دەبێت یان خێرا لە دوای لەدایکبوون دەمرێت بەلام بە چارەسەری

چالاك هەندێکیان دەژین و دەبن بە جۆری (د) یان (هـ) کە لەسەرەوە باسمان کردن، کۆرپەلە لـ پلەیتێکی زرێی armour ئەستور و قۆچی horny دایە، گوێچکەکان هەر نین یـان بچـوك و شێواون، پێڵووی چاو هەڵدراوەن، هەناسەی بۆ نادرێت و بارەکە ترسناکە.

ز) پێستەسوورێی ماسی بلّقی Bullous icthyosiform erythroderma

= ((زێدەقۆچەکاژی تویژ شیبوونەوە)) Epidermolytic hyperkeratosis



(وێنەی ۷۷) پێستەسوورێی ماسی بلّقیَ

بۆماوەیی لەشی زاڵە ، بازدان لە جینەکانی سەر کرۆمۆسۆمی [12q13, 17q21] کە کۆنترۆڵی دروست کردنی کیرایتنــی I و ۱۰ دەکەن ڕوو دەدات، لە نموونە وەرگرتنی پێست دا دەبینین کـە چـینی دەنکۆڵــەیی granular cell layer ئەســتوور بــووە و دەنکۆڵەی granuls گەورەی تێدایە و هەندێك درزیش clefts لە بەشی سەرەوەی توێژدا هەن. (وێنەی ۷۷)

**نیشانەکانی**

هەردوای لەدایکبوون پێستی کۆرپە هەمووی سوور دەبێتەوە و بلّقی زۆری تێـدا دەردەکـەون ســووربوونەوەکە لەچەند مانگێك دا نامێنێت و بلّق دروست بونیش کەمتر دەبێتەوە، بەلام لە تەمەنی منالّی دا پێست تووشــی ئەســتوربوون (قۆچـەکاژی hyperkeratosis) دەبێـت و هەنـدێك جـار بەشێوەی هێڵی بە تایبەتی لە لۆچەکانی (folds) پشت ئەژنۆ و لۆچەکانی تـری لــەش دا. پێســتیان بۆنێکی تیژی تایبەتیان هەیە pungent odor و لەگەڵ تەمەن دا نەخۆشیەکە سووك تر دەبێت.

حـ) نەخۆشی ماسی چەماوەهێڵی Icthyosis linearis circumflexa



(وێنەی ۷۸) نەخۆشی ماسی چەماوەهێڵ

بۆماوەیی لەشی بەزیوە، بریتییە لــە دروســتبوونی کــاژ بەشـێوەی کەوانەیی annular و چـەند کەوانـەیی polycyclic جـولاوە migratory (وێنــەی۷۸)، لەوانەیــە لـــە ســـەرەتادا بەشــێوەی ســوربوونەوەی زگمــاکی بـلاو بێـت لەســەر هــەموو پێســت دا، لەدوایی دا کاژکردنەکە تـەنیا لــە قــەد و پەلــەکان دەمێنێتــەوە و بەردەوام شێوەکەی خۆی بە هۆی جـوولانی ئـەم دەردانـە لەسـەر پێست دا دەگۆڕێت، لـەیەك حەفتەدا گـەورەترین قـەبارەی شـێوە کاژکردنەکە دروست دەبێت و لە هاوین دا هەر نامێنێت.

زۆر نەخۆش جۆرە موویەکیان (کە پێی دەووترێت مووی گۆچانی bamboo hair) لـەژێر پێست دا هەیە، ئەم مووانە دەڕووتێنەوە و سەر ڕووتانەوە baldness دیار دەبێت.
زۆر جۆری تریش لـە نەخۆشی ماسی هەن بەڵام زۆر دەگمەنن.

۲) **نەخۆشی ماسی وەرگیراو** Acquired icthyosis

کە نەخۆشی ماسی بۆ یەکەم جار لـە پێگەیشـتوودا adult دەرکـەوت ئـەوە بـیر لـەهۆی تـر دەکەینەوە کە دەبێتە هۆی نەخۆشیەکە (واتا بۆماوەیی نییـە)، وەك نەخۆشـی هـۆجکن Hodjkin's disease، شێرپەنجەی لیمفۆما lymphoma، گولی leprosy، نەخۆشـی سارکۆیدۆسـس (لـە وڵاتی ئێمەدا زۆر دەگمەنە)، بەدمژین malabsorption ، بەدخۆراکی و سسـتی ملـە قۆرتەگلانـد (کەمی ثایرۆکسین) hypothyroidism.

## چارەسەری نەخۆشیەکانی ماسی

سکاڵای نەخۆشی ماسی لـە جۆرێك بۆ جۆرێکی تر جیاوازە، لـە هەمان نەخۆشیش دا کاتێك بـۆ کاتێکی تر هەر جیاوازە، لـە بەر ئەوە هەر نەخۆشە و بەپێی بارەکەی چارەسەر دەکرێت.
سێ جۆر کلیلی سەرەکی چارەسەر کردن ئەمانەن:

۱- به ئاوکردنی پێست ((تەڕکردنی پێست)) hydration.
۲- چەورکردن lubrication.
۳- کاژ شیکردنەوە keratolysis.

لـە باری سووك دا بە ئاوکردن و چەورکردن نەخۆشیەکە بەرەو باشتر دەبات.

- لـە زستانی سارد دا پڕکردنی شێی ماڵ، قوتابخانە و شوێنی ئیش کردن زۆر گرنگن.
- خۆشۆردن bathing لـە ڕێگا سەرەکیەکانە بۆ بەرەو باشتربردنی باری نەخۆش، زۆر مانـەوە لـە گەرماودا پێست دەخوسێنێت و کاژە خوساوەکە لـەسەر خۆ بە لفکە یان پارچە ئەسفنجێکی زبر لادەبرێت. هەندێك چەوری دەخرێتە ناو حـەوزی مەلـە و پێسـت بـە چـەوریەوە دوای خۆشۆردن دەهێڵێتەوە.
- دوای خۆشۆردن بێ سڕینی پێست، کرێمی چەور و مەرهەمی چەور لـە پێستە تەڕەکە دەدرێـت بۆ ئەوەی ئەم تەڕیەی پێست ،کە کرێم و مەرهەمی لـەسەرە، بمێنێتەوە.

نموونەی ئەم چەورکەرانە emollients وەك:
پارافینی سپی نەرم white soft paraffin.
ڤازلین vaselin
emulsifying ointment.
E45 range

oilatum range

urea 10%

unguentum M. – تاد.

زەیتی زەیتون و گلیسرین:

نموونەی کاژ شیکەرەوەکان keratolytics وەك ترشی سالیسلیك، یوریا urea و ترشی ئەلفا هایدرۆکسیدەکان ∝- hydroxy acids (وەك لاکتیك ئەسید، گلایکۆلیك ئەسید – تاد) بۆ کەمکردنەوەی پێکەوەنووسانی خانەکاژەکان بەکاردەهێنرێن بۆ ئەوەی کاژەکان فڕێ بدرێن و پێست پڕ ئاو وەخۆ گرێت.

تازەرۆتین tazarotene و کالسیپۆتریۆڵ calcipotriol بە مەرهەم یان کرێم بەکار دەهێنرێن. لە باری توندا ، ناوە بە ناوە، نەك بە هەمیشەیی دەرمان بە ڕێگەی دەم بەکار دەهێنرێت وەك:

ئایزۆترێتینۆین isotretinoin ٠٫٢٥ ملگم – ملگم/ کگم/ ڕۆژ وردە وردە پتر دەکرێت.

ئەسیت ڕێتین acitretin ١٠ ملگم – ٤٠ ملگم/ ڕۆژ.

## کاژە( قۆچەکاژە ) ئەستووریی بەری دەست و پێ Palmoplantar keratoderma (PPK)

بریتیە لە زێدە دروستبوونی کیراتین لە بەری دەست و پێ دا، بەم شێوەیە دابەشکراون

أ ) کاژەئەستووریی ئاسایی Simple keratodermas

تەنیا بەری دەست و پێ ئەستوور دەبێت و هیچ ئەندامێکی تری لەش نائاسایی نییە، ئەمانەی خوارەوەن:

١ – کاژەئەستووریی توێژشیبوونەوەی بڵاو

Diffise epidermolytic ppk

باوترین جۆرە، بۆماوەیی لەشی زاڵە، لەچەند مانگی یەکەمی ژیان دا دەردەکەوێت، بەری دەست و پێ بە گشتی ئەستوور بووە و وەك پێستی ماری پیس dirty دەردەکەوێت، بازدانی جینی بۆ کیراتینی ٩ یان ١ دروستی دەکات(وێنەی٧٩).



(وێنەی ٧٩ ) کاژە ئەستووریی توێژشیبوونەوەی بڵاو

٢- کاژە ئەستووریی تویژشینەبوونەوەی بلاو
Diffise non-epidermolytic ppk


(وێنەی ٨٠) کاژە ئەستووریی تویژشینەبوونەوەی بلاو.

بۆ ماوەیی لەشی زاڵە، لە تەمەنی ساواییەوە دەردەکەوێت، بەری دەست و پێ بە ئاشکرایی ئەستوور و مۆمییە waxy و تا مەچەك هاتووە و لەوانەیە پشتی پەنجەکان و دەست و مەچەك بگرێتەوە. تووشێنی کەڕوو زۆرە و دەبێت بە هۆی خوساندن و کاژکردنی بەری دەست و پێ(وێنەی٨٠).

٣- کاژە ئەستووریی مال دی میلیدا MaL De meleda
بۆ ماوەیی لەشی بەزیوە، شێوەی دەستکێش وەردەگرێت (هەموو بەر و پشتی دەست و پێ دەگرێتەوە) پەتی بازنەیی constricting bands لە دەوری پەنجەکان دروست دەبێت و پەنجەکان دەگوشێت و لەوانەیە پەنجە بقرتێنێت.


(وێنەی ٨١) شێوەهێڵی کاژەئەستووری

٤- جۆری جیجگەیی سانا Simple focal ppk
بە شێوەی هێڵی striate (وێنەی ٨١)، یان خاڵی punctuate (وێنەی٨٢) یان دڕکی spiny ئەستوربوونەکە ڕوودەدات.


(وێنە ی ٨٢) شێوەخاڵی کاژەئەستووری.

ب) کاژە ئەستووریی ئاوێتەیی Complex keratodermas

لەم جۆرەدا جگە لە ئەستووربوونی بەری دەست و پێ ناساغی تریش لە نینۆك، موو، ددان و ڕژێنە ئارەقیەکان دا هەن. وەك نموونەیەك بۆ ئەم جۆرە نەخۆشییە: زگماکە نینۆك گنجنەستووری pachyonychia congenita (وێنەی ٨٣ أ، ب)کە بۆماوەیی لەشی زاڵە و پێست ئەستوربوون پتر توشی بەری پێ دەبێت و لەوانەیە تا تەمەنی ٧ساڵی دەرنەکەوێت، گۆڕانکاری نینۆکەکان لەکاتی لەدایکبوون یان چەند مانگی یەکەم دا دەردەکەون، ژێر نینۆك تووشی قۆچەکاژی دەبێت و نینۆك بەرەو سەر بەرز دەکاتەوە ((قۆچە کاژیەکە وەك سینگ


(وێنەی ٨٣ أ) زگماکە گنجنەستووری


(وێنەی ٨٣ ب) زگماکە گنجنەستووری

لەژێر نینۆك دایە)). لەوانەیە تێکچونی موو و ئەستوربوونی قورقوڕاگە و پەردەی ناودەم هەبن.

**جـ) کاژە ئەسوورێی کۆنیشانەیی** Syndromic keratodermas

لێرەدا جگە لە ئەستوربوونی بەری دەست و پێ ئەندامی تری لەشیش شێواوی یان هەیە وەك کەڕبوون deafness و شێرپەنجە cancer بە تایەبتی شێرپەنجەی سورێنچك carcinoma of esophagus. هەندێك ئەستوربوونی بەری دەست و پێ لەگەڵ ئەم نەخۆشیانەی خوارەوە دا دەستکەوتە واتا وەرگیراوە aquired :

١- توشبوون بە (کەڕوو، بالوکە، سفلس یان گەڕی).

٢- دەرمان (وەك مەرگەموش arsenic).

٣- شێرپەنجەی ناوەکی internal malignancy.

٤- نەخۆشی سەراپایی systemic diseases وەك بلّەئاوسان myxoedema، نەخۆشی شەکرە، لیمفۆمای خانەی T پێستی cutaneous T-cell lymphoma، ئەکزیما(بیرۆ)، سەدەف(کاژۆکی) و کۆنیشانەی رایتەرس Reiters syndrome.

**چارەسەر**

چارەسەری بنەڕەتی نییە بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت باری نەخۆش بە چارەسەرکردن سووك دەکەین، چونکە دەرمانەکان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ زیان بەخشن.

١- چارەسەری سووك وەك: خووساندن لە ناو خوێاودا و کڕاندنی کاژە ئەستوورەکان.

٢- کاژ شیکەرەوەی جێیی topical karatolytics: بۆ نموونە ٥-١٠٪ ترشی سالیسلیك S.A، ١٠-٤٠٪ پرۆپیلین گلایکۆل propylene glycol، ١٠٪ ترشی لاکتیك lactic acid یان تێکەڵەی ١٠٪ یۆریا urea + ٥٪ ترشی لاکتیك ڕۆژی ٢ جار. دەتوانین ئەمانەی سەرەوە لەژێر بەستن دا occlusion (بە نایلۆن) بەکاربێنین.

٣- ڕێتینۆیدەکان وەك ترێتینۆین tretinoin (0.01%gel ، cream 0.1%) پێست دەوروژێنێت بەڵام بە کاردەهێنرێت.

٤- ستیرۆیدەکان steroids وەك کلۆبێتازۆل پرۆپیۆنەیت clobetasol propionate 0.05%، هەندێك جار لەگەڵ ترشی سالیسلیك S.A. بۆ ئەو بارانەی سۆی لەگەڵدایە inflammatory ppk.

٥- پێنج فلۆرۆیوراسیل 5-fluoro-uracil cream 5% بۆ ئەستووربوونی دڕکی spiny keretodermas زۆر بەکەڵکە.

٦- ڕێتینۆیدەکان بە دەم oral retinoids وەك ئایزۆترێتینۆین isotretinoin یان ئەسیترێتین acitretin، بۆ ماوەیەکی کورت بۆ باری توند وەك مال دی مێلیدا بە کاردەهێنرێت.

٧- کالسیپۆتریۆڵ calcipotriol کرێم، ڤیتامین D3 ، repuva واتا ڕێتینۆید بەدەم لە گەڵ PUVA.

٨- لەیزەری $CO_2$.

٩- نەشتەرگەری:

کراندنی ئەستوریەکە واتا تاشین dermabrasion.

لابردنی پێستە ئەستورەکە و متوربەکردنی بە پێستی ئاسایی

. reconstructive surgery + grafting

١٠- پێلاوی لەبارو چارەسەرکردنی سۆ و تووشێنی کەڕوو و بەکتریا.

## نەخۆشی داریەر Keratosis follicularis (Darier's disease)

بۆماوەیی لەشی زاڵە، زۆر باری نوێ بە بازدان mutation دێنە کایەوە، جینە شێواوەکە دەکەوێتە سەر کرۆمۆسۆمی $12q_{23} - q_{24.1}$ کە سیگناڵ دەدات بە ڕێکخستنی بەیەکەوە نووساندنی خانە بەخانەوە( وێنەی ٨٤ و ٨٥ ).







(وێنەی ٨٤ ) نەخۆشی داریەر.





(وێنەی ٨٥ ) نەخۆشی داریەر.

**نیشانەکانی**

لە ١٠-٢٠ ساڵیدا دەردەکەون، تەنۆچکەی کاژی قاوەیی کە وەك پارچەی گەورە یەك دەگرن و کاژەکانیان چەورن و بەشێوەی چەورە بیرۆ seborrhoeic fashion لە مل و شان و دەموچاو و پەلەکان و پێشی سنگ و هێڵی ناوەڕاستی پشت و پشتی گوێچکە دابەش دەبن، دوایی بۆ هەموو قەد و سمت و کۆئەندامی سێکسی بڵاو دەبێتەوە.

لە لۆچەکان دا قەبارەی دەردەکان گەورەتر و بالوکەیی دەبن، پێستی سەر بە قەتماغەی چەور داپۆشراوە، لێوەکان درزاوی وقەتماغەیی و ئاوساون، لەوانەیە زمانیش ڕووشاو و کاژی بێت، مەلاشوو و پووکەکان هەندێك جار بە تەنۆچکەی سپی دادەپۆشرێن.

ئەستوربوونی خاڵی punctate kerotoses بەری دەست و پێ زۆر باوە، لەوانەیە پشتی دەست و پێ دەردی بالوکەیان لەسەر بێت، نینۆك تێکچووە و ئەستووربوونی کاژی ژێر نینۆك و

ناسکبوون و هێڵی سوور و سپی بە درێژی لە سەر پلێتی نینۆك دەردەکەون.و لێواری پەڕی نینۆك پارچەی سێگۆشەیی triangular nicks تێدا دەردەکەوێت.

ئەم نەخۆشیە بە ئارەق کردنەوە لەهاویندا توندترە، بۆنی پێست تایبەتمەندە، هەندێك جار تووشێنی بەکتریا و کەڕوو و ڤایرۆسی تامیسك روودەدەن.

**چارەسەر**

١- باری سوك: سابوونی تایبەتی و مەرهەمی چەورکەر و ستیرۆید بە کرێم ورووژان irritation کەم دەکەنەوە، لەبەرکردنی جل و بەرگی لەبار و لۆکەیی و بەکارهێنانی دژە خۆر بۆ ئەو کەسانەی بەخۆر و ت ش و وەرِس دەبن.

٢- رێتینۆیدەکان بە کرێم وەك کرێمی ئایزۆترێتینۆین isotretinoin 0.05-0.1%، کرێمی ترێتینۆین tretinoin و جێڵی تازەرۆتین tazarotene gel. ئەم کرێمانە یان شەو نا شەو بەکار دەهێنرێن یان شەوێك ئەمان و شەوێك کرێمی ستیرۆید.

٣- باری بلاو و تیژ، رێتینۆیدەکان بەدەم بەکار دەهێنرێن وەك ئەسیت رێتین acitretin، ئایزۆترێتینۆین isotretinoin و ئیترێتینەیت etretinate.

٤- بۆ جۆری بلّقی کە دەگمەنە: ستیرۆید بەدەم وەك پرێدنیزۆلۆن prednisolon بەکار دەهێنرێت.

٥- بۆ هەندێك باری یاخی لە چارەسەر کرێمی پێنج فلۆرۆیوراسیل 5FU بەکاردێت.

٦- بۆ ئەو بارانەی کە بەسکپڕبوون باشتر دەبن ئەوە خەپلەی نەزۆکێن بۆ ژنان بەکەڵکە.

٧- ترشە چەورەکان لە خواردەمەنی دا بەکەڵکن.

٨- تیشکە بزێوەچارە photodynamic therapy بە بەکارهێنانی شلەی پێنج ئەماینۆ لیڤۆلینیك ئەسید 5-amino laevulinic acid.

٩- تاشینی پێست dermabrasion یان پاککردنەوەی تەنۆچکەکان debridment.

١٠- لەیزەری $CO_2$ یان Erb. YAG.

١١- سایکلۆسپۆرین A (A) cyclosporin بۆ باری بیرۆیاوی eczematization.

## قۆچەکاژی کونی موو Keratosis pilaris

بۆماوەیی لەشی زاڵە، بازدان لە جینی سەر کرۆمۆسۆمی ١٨ یە، لێرەدا شێواوی قۆچەکاژکردن keratinization لە سەلکە مووەکان دا ڕوودەدات و بەمەش ئەم کونانەی موو-ڕژێنە چەوریەکان پڕ دەبن لە "پەستاوتراوی" قۆچی horny plugs.



(وێنەی ٨٦) قۆچەکاژی کونی موو.

**نیشانەکانی**

گۆڕانکاریەکان لە تەمەنی منالیەوە دەست پێدەکەن و لەدوای باڵقی دا کەمتر دەبنەوە. بەشێوەی سەرقاپی (پەستاوتراوی) قۆچی خۆڵەمێشی بچووك لە ناو کونەکانی پێست دا (کونی موو) دەردەکەون و هەندێك جار بە پەڵەیەکی سووری بچووك دەوردراون، پێست بە دەست لێدان زبرە (لمی یە)و وەك پێستی مریشکی پاك کراوە، ئەو شوێنانەی بەزۆری تووشی دەبن بریتین لە بەشی دەرەوەی ڕان و قۆڵ upper arms یان لاکانی ڕوومەت، سمت، باسك، قەد و لاقەکان، لەوانەیە لە دەموچاودا جێ زامی چاڵی خاڵی pitted scars جێ بهێڵن، بەشێوەی کۆمەڵ دەردەکەون و پتر لە پێستی بڕۆی جێگۆڕاو atopic eczema و پێستی وشك xerotic skin دا هەن. (وێنەی ٨٦)

**چارەسەر**

١- ئاسان نییە بەڵام هەندێك جار کەڵك لە ڕێتینۆید بە کرێم و مەرهەم وەردەگیرێت ، یان کرێمی کالیسپۆتریۆل بەڵام کرێمی تازەڕۆتین بەکەڵکترە.

٢- کرێمی یوریا و سۆدیۆم لاکتەیت.

٣- ترشی سالیسیلیك ٢٪ لە ناو ٢٠٪ کرێمی یۆریا و ٦٪ ترشی سالیسیلیك لە پرۆپیلین گلایکۆڵدا.

٤- ستیرۆید بە کرێم ئەگەر خوران و سووربوونەوە هەبوون.

٥- ئەگەر تووشێنی بەکتریای هەبوو ئەوە دژە بەکتریا فلۆکساسیلین یان دایفلۆکساسیلین یان ماینۆسایکلین بەکار دەهێنرێن.

٦- ٣ مانگ بەکارهێنانی خەپلەی ڤیتامین A ٥٠٫٠٠٠ یەکە (unit) ڕۆژی ٣ جار.

٧- ئایزۆترێتینۆین بەدەم oral isotretinoin کە ترسی چاڵ جێهێشتن هەبوو.

٨- لەیزەری KTP, PDL یان Ruby Laser.

## کونەقۆچەکاژی Porokeratoses

بۆماوەیی لەشی زاڵە، دەردەکان لە منداڵی دا دەردەکەون و وردە وردە گەورە دەبن، ئەم دەردانە لە سەرەتا دا تەنۆچکەی قاوەیی بچووکن، دواتر گەورە دەبن و شێوەیەکی بازنەیی وەردەگرن بەشێوەی زێدە قۆچەکاژی یان بالوکەیی، لێوارەکانی پتر لە ١ملم بەرزبوونەتەوە و ناوەڕاستی واتا ناوەندی ئەم لێوارە بەرزبووە هێڵێکی چاڵی تێدا دروست دەبێت، ناوەندی دەردەکە پوکاوەیە، بێ مووە، ئارەق ناکاتەوە و ڕەنگی لە ڕەنگی ئاسایی پێست کاڵترە یان تۆخترە. (وێنەی ٨٧)



(وێنەی ٨٧) کونەقۆچە کاژی میبێللی.

زۆربەی دەردەکان لەسەر پەلەکانن limbs و لەوانەیە بەری دەست و پێ و چاو و لێو و ناودەم و کۆئەندامە سێکسیەکانیش بگرێتەوە.

لە ڕێژەی ٥٠٪ یان دا دەردەکان پتر لەو شوێنانەدا کە بەر خۆر دەکەون هەن و لەوانەیە لەبەر خۆر خوران و کزانەوە دروست بکەن.

ئەمەی سەرەوە جۆری میبێللی porokeratosis of Mibelli پێدەڵێن، چوار جۆری تریشی هەیە:

٢- کونەقۆچەکاژی ڕوکەشی بڵاوبووەوە.

٣- کونەقۆچەکاژی ڕوکەشی بڵاوبووەوەی خۆری.

٤- کونەقۆچەکاژی بڵاوبووەوەی بەری دەست و پێ(وێنەی٨٨).

٥- کونەقۆچەکاژی هێڵی. (وێنەی ٨٩)

(وێنەی ٨٨) کونەقۆچە کاژی بڵاوبووەوەی بەری دەست و پێ.

### چارەسەر

١- دەردی بچووك: بە نەشتەرگەری لادەبرێت و متوربە دەکرێت، یان لە ناو دەبرێت بە: سووتاندنی کارەبایی((داخکەری ئێلێکتریکی)) electro cautery ، تەزینە چارە cryotherapy، تاشین dermabrasion، لەیزەری $CO_2$ یان لەیزەری Nd.YAG.

٢- چەورکردن و بەکارهێنانی قۆچەکاژشیکەرەوە keralytics.

٣- پێنج فلۆرۆیوراسیل 5FU کریم.

٤- کرێمی کالسیپۆتریۆل یان تاکالسیتۆڵ tacalcitol.

٥- ڕێتینۆیدەکان بەدەم وەك ئایزۆترێتینۆین.



(وێنەی ٨٩) کونەقۆچە کاژی هێڵی

٦- كریمی ڕێتینۆیدەکان وەك ترێتینۆین و تازەڕۆتین.
٧- ئەلفا هایدروکسی ئەسیدەکان ∝hydroxy acids.

## نەخۆشی کاژە گوڵی P.R. Pityriasis rosea

هۆکەی نەزانراوە، بەڵام لەوانەیە خۆرەیەکی لەپشتەوە بێت لەوەش دەچێت ڤایرۆس بێت بەتایبەتی ڤایرۆسی تامیسك جۆری ٦ یان ٧ [Human Herpes virus 6 or 7] چونکە دەردی دایك(دەردە سەرەکیەکە mother lesion ) لە ٨٠٪ ی بارەکان دا کە پێی دەڵێن پارچەی هیراڵد [herald patch] هەیە و دوای چەند ڕۆژێك دەردە بەچکەکان دەردەکەون، لە ڕێژەی ٩٧-٩٨٪ی بارەکان دا یەك جار لە ژیانی مرۆڤ دا دروست دەبێت و زۆر جار وەرزییە (بەهار و پایز). (وێنەی ٩٠)



(وێنەی ٩٠) نەخۆشی کاژە گوڵی.

پارچەی هیراڵد herald patch هێلکەیی یان بازنەییە (٢-٥سم دەبێت)و لە دەردە بەچکەکان گەورەترە و سوورتر و کاژاویتریشە، ئەم پارچە هیراڵدە هەندێك جار هەر نییە و هەندێك جاریتر دووانن یان پژیشن وە هەندێك جاریتر هەر بۆ خۆیەتی و دەردە بەچکەکان دروست نابن و لە قەد یان مل یان ڕان یان شوێنیتر دەردەکەوێت. دوای چەند ڕۆژێك دەردە دووەمیەکان (بەچکەکان) دەردەکەون بە تایبەتی لەسەر قەد بەڵام لەوانەیە لە مل و پەلەکانیش دا دەرکەون یان لەسەر زۆربەی پێست. (وێنەی ٩١)


(وێنەی ٩١) نەخۆشی کاژە گوڵی.

هەر یەك لەم دەردە دووەمیانە secondary lesions هێلکەییە ، پەمەیی کاڵە و کاژێکی ناسکی بە شێوەی زنجیری مل بە سەرەوەیە، لە بەشی دەرەوەی دەردەکەدا کاژەکان بە پێستەوە نووساون و لە بەشی ناوەوەی دا نەنووساون collarette of scaling، ئەم دەردە دووەمیانە بەشێوەی درەختی سنەوبەر بە هێڵی هاوتەریب بۆ پەراسووەکان دابەش بوون.

هەندێك جار ئەم دەردە دووەمیانە تەنۆچکەن papular یان بلۆقن vesicular یان خوێنیان تێزاوە(خاڵی خوێنین) petechiae، هەندێك جاریتر زۆر چڕن تا ڕادەیەك کەم پێستی ئاسایی لە نێوانیان دا دیارە.

ئەم نەخۆشیە زۆری لە تەمەنی ١٥-٤٣ ساڵیدا هەیە و ٢٥٪یان خورانی نی یە بەڵام ٢٥٪ یان زۆر بەخورووە و ٥٠٪ یان خورانی مامناوەندییان هەیە.

هەندێك جۆری ئەم نەخۆشیە هەڵگەڕاوەیە inverse type واتا پەلەکان limbs تووش دەبن بەڵام دەردەکان لە قەددا نین.

هەندێك جاریش تەنیا پارچەی هێراڵد و چەند دەردێکی دووەمی کەم بەدەوروبەری دا هەن. هەندێك جاریش بەتایبەتی لە لۆچەکان دا پارچەی هێراڵد بە چەند دەردی دوومی گەورە و بازنەیی دەوردراوە کە لەوانەیە بە یەکەوە بنووسێن و پێی دەڵێن کاژە گوڵێی زەبەلاح P.R. gigantea و لەوانەیە چەند مانگێك، لە جیاتی کاتی ئاسایی نەخۆشیەکە کە تەنیا ۳-۱۰ حەفتەیە ،بمێنێتەوە

## چارەسەر

١- دڵنیاکردنەوەی نەخۆش کە لە نزیکەی ٦ حەفتەدا (۳-۱۰ حەفتە) نامێنێت و چارەسەری ناوێت.

٢- لەبەرکردنی جلی لۆکەیی کەم کردنەوەی خۆشۆردن و لفکە بەکارهێنان.

٣- دژەهیستامین بۆ خوران وەك سیتیریزین citirizine، لوراتادین loratadine – تاد.

٤- ستیرۆید بە کرێم و مەرهەم topical steroids.

٥- مژادە فێنك کەرەوەکان وەك شلەی کالامین calamine lotion یان ئیمۆڵیانت emollients.

٦- ستیرۆید بە ڕێگەی دەم یان ماسولکە بۆ باری تیژ و زۆر بەخوروو بۆ ماوەیەکی کورت.

٧- تیشکی س و B (تا ئاستی پێست سوورکردنەوە) بەڵام لەوانەیە پەڵە لەسەر پێست جێ بهێڵێت.

٨- کەبسولی یان حەپلەی ئێریثرۆمایسین erythromycin ۲۵۰ ملگم × ٤ ((یان ۲۵-٤٠ملگم/ کگم/ڕۆژ بۆ منال)) تا ۲ حەفتە، لەوانەیە بە یەکجاری دەردەکان سارێژ بکات.

٩- داپسۆن dapson یان ئەسایکلۆڤیر acyclovir لە ژێر تاقیکردنەوەدان.

## کاژە سووریی موویی Pityriasis rubra pilaris (P.R.P)

نەخۆشیەکی درێژخایەنی پێستە کە تێیدا تەنۆچکەی بچووکی دڕکی قاوەیی و سووربا و پڕ لە سەرقاپی (پەستاوتراوی) چەوری horny plugs لە کونی سەلکە مووەکان دا دەردەکەوێت و لەوانەیە پارچەیەك موو لە ناوەڕاستەکەی دا هەبێت لەگەڵ پارچەی patches زەردی پەمەیی کاژاوی بڵاوبووەوە و زێدە قۆچەکاژی بەری دەست و پێدا (palmoplantar hyperkeratosis).

پێنج جۆری (جگە لەو جۆرەی کە لە گەڵ ئەیدزدا دەردەچێت) هەیە:

١- جۆری ئاسایی باڵقی Classical adult onset:- لە ٤٠-٦٠ ساڵیدا پتر ڕوودەدات و لە ١-٣ ساڵدا لە ٨٠٪ ی نەخۆشەکان دا نامێنێت بەڵام ڕێژەی ٢٠٪یان هەر دەمێنێتەوە.

٢- جۆری نائاسایی باڵقی Atypical adult onset:-ڕێژەی ٥٪ ی بارەکانە بەڵام وەك جۆری یەکەم بەرێك و پێکی لەسەرەوە بۆ خوارەوە دەست پێناکات و هەندێك شوێن بیرۆزاوی eczematous دەبن و کەمتر تووشی پێستەسووریٚ erythroderma دەبن و لە لاقەکان دا کاژی پلیٚتی دروست دەبێت ( lamellar scaling) .


(وێنەی ٩٢) کاژە سووریێ موویی.

٣- جۆری ئاسایی منداڵی Classical juvenile onset: لە ٥-١٠ ساڵی دا دەردەکەوێت و لە ١-٢ ساڵدا نامێنێت، نیشانەکانی وەك جۆری ١ وان.

٤- جۆری سنووورداری منداڵی Circumscribed juvenile onset:- لە ئەژنۆ و ئانیشکی منداڵ دا دەردەکەوێت و چەند پەڵەیەکی سووری کاژاوی بڵاوبووەوە لەسەر پێستی سەر و قەد دا هەن، لەوانەیە بەری دەست و پێ تووشی زێدە قۆچەکاژی palmoplantar hyperkeratosis بن و بەشێکیان دوای چەند ساڵ چاك دەبنەوە.


(وێنەی ٩٣)
کاژە سووریێ موویی.

٥- جۆری نائاسایی منداڵی Atypical juvenile onset:- لە کاتی لەدایکبوون دا یان چەند ساڵێك دواتر دەردەکەوێت، ئەستووربوونی کاژی بەری دەست و پێ باوە و پەستاوتراوی چەوری کونی سەلکە موو و سووربوونەوە هەن.

٦- جۆری بوونی .P.R.P لەگەڵ تووشێنی ئەیدز HIVدا.

**نیشانەکانی جۆری ئاسایی** classical type بەم شێوەیە: (وێنەی ٩٢ و ٩٣)

سووربوونەوە و کاژکردنی پێستی سەر، ئەوسا بەرەوخوار نەخۆشیەکە بڵاو دەبێتەوە (لاکانی مل و قەد و بەشی دەرەوەی پەلەکان limbs) ئەوسا هەموو پێست بەرێکی دەگرێتەوە جگە لە چەند پەڵەیەکی ئاسایی لە ناو ئەم پێستەسووریٚ یە (erythroderma)دا، ڕواڵەتی پێست وەك پێستی قازی پاك کراو وایە، بەری دەست و پێ ئەستووربوون و وەك نەعلی بەرپای لە پێدا بێت، نینۆکەکان ناشیرین و زبر و ئەستوور و هێڵاوین( واتا میلدارن).

هەندێك نەخۆش خورانیان هەیە.

ئەم نەخۆشیە بۆماوەیی لەشی زاڵە یان بەبێ هۆ دروست دەبێت.

## چارەسەر

ڕێژەی ٨٠٪ی نەخۆش لەماوەی ٣ ساڵ دا چاك دەبنەوە.

١- بەكارهێنانی ئیمۆڵیانت (پێست نەرم كەرەوە) وەك emulsifying ointment، پارافین – تاد.

٢- ڕێتینۆیـدەكان retinoids بـەدەم وەك ئـایزۆترێتینۆین isotretinoin، ئەسـیت ڕێـتین acitretin یان ئێترێتینەیت etretinate بۆ ٦-٩ مانگ.

٣- ڕێتینۆید + پۆڤا PUVA یان ت س و B تەسك narrow band UVB.

٤- میثۆترێكسەیت methotrexate.

٥- ئازاثایۆپرین azathioprine.

٦- هەندێك جار كاژ شـیكەرەوەكان وەك پـرۆپیلین گلایكـۆل propylene glycol یـان ترشـی لاكتیك lactic acid لە ژێر بەستن دا (under occlusion) بۆ ماوەی ٢-٤ كاتژمێر لـە دوایی دا كرێمی ستیرۆید بۆ ٤-٨ كاتژمێر لەژێر بەستن دا بەكەڵكن، یان كرێمی كالسیپۆتریۆل calcipotriol.

## نیمچە سەدەف ( لێچوی سەدەف= گەندە كاژۆكی ) Parapsoriasis

كۆمەڵێك نەخۆشی پێستن بە هەڵتۆقیوی eruption كاژاوی سۆركردووی بەردەوام ناسـراون.

سێ جۆری سەرەكی هەن:-

### ١- نیمچە سەدەفی قوتكە گەورە Large plaque parapsoriasis (LPP)



(وێنەی ٩٤) نیمچە سەدەفی قوتكە گەورە.

پتر لە تەمەنی گەورە و پیری دا هەیە و پـتر لـە پـیاوان دا، لە منالان دا دەگمەنە و ڕێژەی نێرینە بۆ مێینە سێ بـۆ یەكە"٣:١".

دەردەكان هێلكەیین یان شێوەی نارێكن یان قوتكـەی تـەنكن و خـورانێكی كـەمیان هەیـە یـان بـێخوروون، plaques چێوەكانیان زەق و دیارن، یان تێكەڵ بە پێستی دەوریان دەبنەوە بـێ ئەوەی ڕوون و دیار بن. (وێنەی ٩٤و ٩٥)



(وێنەی ٩٥)
نیمچە سەدەفی قوتكە گەورە.

قەبارەیان گەورەیە و ٥-١٠سم دەبن یان گەورەتریشن، ئـەم قەبارەیە وەستاوە (جـێگیرە) stable و لەوانەیـە وردە وردە لەگـەڵ كات دا گەورەتریش بێت.

زۆربەی دەردەکان لەسەر پێستی قەد و لۆچەکانی flexures ، ڕەنگیان سوری کاڵ و قاوەییە یان پەمەییە، ڕوپۆشەکانیان بە کاژی کەم و بچووك داپۆشراوە ، هەندێك جاریش پەرەسیگارین و چرچن، لەدوایی دا تۆخ بوونی خاڵاوی mottled pigmentation و فرە دەزوولە telangiectasia ی لەسەر دەردەکەون و لەم بارەدا دەبێتە هۆی دروستبوونی پوکاوە پێستە گۆڕاوی بۆریەخوێن [poikiloderma atrophicans vasculare]، لەوانەیە لە داهاتوودا ڕێژەی ١٠-٣٠٪یان ببێت بە شێرپەنجەی پێست (جۆری شێرپەنجەی کەڕووی قارچکی mycosis fungoides).

٢- نیمچە سەدەفی قوتکە بچووکە Small plaque parapsoriasis (SPP)


(وێنەی ٩٦) نیمچە سەدەفی قوتکە بچووکە.

لێرەدا دەردی بچووکتر بە قەبارەی ١-٥سم بەشێوەی هێلکەیی یان بازنەیی تۆخ یان سوور و زەرد و کاژاوی scaly و لێوار دیار و ڕێك بەتایبەتی لەسەر قەد دا دەردەکەون. هەندێك جار دەردەکان شێوەی پەنجەیی digitate وەردەگرن ((وەك پەنجەمۆرە یان وەك پیستی قەد چنگی لێدرابێت)) (وێنەی ٩٦و٩٧).

زۆربەی جار بێخوروون و پتر لە نێرینەدا هەن و هەرگیز نابن بە شێرپەنجە.

**چارەسەر**

١- چارەسەری نیمچە سەدەفی قوتکە گەورە

چارەسەری بەهێز و بەردەوامی پێویستە وەك:


(وێنەی ٩٧)
نیمچە سەدەفی قوتکە بچووکە.

أ) ستیرۆیدی بەهێز یان ت س و جۆری B، ت س و B تەسك narrow band UVB یان پوڤا PUVA (= پسۆرالین psoralen + ت س و A).

ب) خەرتەلەی نایترۆجینی topical nitrogene mustard جێیی.

جـ) ٢-٤ داینایترۆکلۆرۆبێنزینی جێیی topical 2-4 dinitrochlorobenzen

د) تیشکی باقەی ئەلیکترۆن electron beam radiation.

دەبێت هەرچەند مانگێك جارێك نموونە biopsy وەربگیرێت نەوەك نەخۆشیەکە بەرەو شێرپەنجە ڕۆیشتبێت.

٢- چارەسەری نیمچە سەدەفی قوتکە بچووکە :

أ) کرێمی نەرم کەرەوە emollients، قیر یان ستیرۆیدی جێی topical steroids.

ب)   PUVA، ت س و B،  ت س و B تەسك،  یان هەردوو UVA/UVB.

جـ)   خەرتەلەی نایترۆجینی جێی topical nitrogene mustard.

### ٣-   كاژە پێستنەستووڕێی Pityriasis lichenoides

ئەم نەخۆشیە لە ئەنجامی كاردانەوەی بەرگری درێژخایەن chronic immune- reactive یان پڕبوونی لیمفۆسایتەكان lympho-proliferative لە پێست دا ڕوودەدات.  چەند مانگ تا چەند ساڵێك دەخایەنێت و هۆكانی نەزانراون بەڵام دەرئەنجامی خوێنبۆریەسۆی لیمفەخانەیین lymphocytic vasculitides و دووجۆری هەیە:

١-   كاژە پێستئەستووڕێی ئاوڵەیی تیژ(پێستئەستووڕێی  كاژی ئاوڵەیی تیژ) PLEVA
Pityriasis lichenoides et varioliformis acuta

هەندێك جار تا و سەرئێشە و ئازاری جومگەكان پێش یان لەگەڵ دەرهاتنی دەردەكان دا هەن، چەندین تەنۆچكەی ئاوساوی سوور و بڵاوبووەوە دەردێن و لە دوایی دا بلۆقیان لەسەر دروست دەبێت ((هەندێك جار زیپكەی كێمی و خوێنڕێژی )). (وێنەی ٩٨)





(وێنەی ٩٨)
كاژە پێست ئەستووڕێی ئاوڵەیی تیژ.

لەدوای ئەوە بلۆقەكان دەتەقن و قەتماغە جێدەهێڵن و هەندێك جار چاڵە برین، كە دواتر چاك دەبنەوە جێ زام scar و هەندێك جار ڕەنگ گۆڕان بۆ تۆختر یان كاڵتر جێ دەهێڵن، پتر لە منداڵ و گەنج دا هەیە و لە ١-٣ ساڵ دا نامێنێت.

هەندێك جار دەخورێن یان دەكزێنەوە، ئەم دەردانە لەسەر پێستی قەد و لۆچەكان Flexuresدا بڵاوبونەتەوە.  لە یەك كات دا كە سەیری پێست بكەین چەند جۆر لەم دەردانەی باسمان كرد دەبینرێن.

جۆرێكی تیژ كە پێی دەڵێن جۆری دارزانی چاڵە برینی زۆرتیژ hyperacute ulcero-necrotic type هەیە.(وێنەی ٩٩)



(وێنەی ٩٩)
جۆری دارزانی چاڵەبرینی زۆر تیژ

لێرەدا خوێن تێزانی پێست،  چاڵە برینی گەورە،  لەرز و تا و ئازاری ماسولكە و جومگەكان و تێكچونی سەراپای گەدە و ڕێخۆڵە و سیستمی دەماری ناوەندی C.N.S. ڕوودەدەن،  خوران و ئازاری پێست زۆرە و بەجێ زام چاك دەبێتەوە.

### ٢- كاژە پێستئەستووریی درێژخایەن Pityriasis lichenoides chronica





(وێنەی ١٠٠) کاژە پێستئەستووریی درێژخایەن.

هەندێك جار دەردی جۆری تیژ ودرێژخایەنە کە لەیەك کاتدا هەن. ئەم جۆرە درێژخایەنە لە جۆری تیژ باوترە، لێرەدا چەند کۆمەڵێك تەنۆچکەی دوابەدوای یەك دا هاتوو دەردێن کە ٣-١٠ملم ڕوبەرەکانیانە و ڕەنگیان سوور و قاوەییە و بازنەیی یان هێلکەیی پەون. ئەم تەنۆچکانە papules لە ناوەڕاستیان دا کاژی پێوە نوساوە و لە چێوەکەی کاژەکە کەمتر نووساوە و دیارتریشە. (وێنەی١٠٠)

تەنۆچکەکان بە گشتی لە قەد و ڕان و قۆڵ دا دەردەکەون و لە (٤-٦) حەفتە دا نامێنن و پەڵەی تۆخ جێدەهێڵن، ئەوسا کۆمەڵێك دەردی تر دەردەکەون و بەم جۆرە دەردەکان لە یەك کات دا هەمەجۆرن. چەند ساڵ دەخایەنێت و نزیکەی پەنجا (٥٠) تەنۆچکە لەیەك کات دا هەن ((بەڵام لەوانەیە ١-١٠٠ دەرد هەبن)).

## چارەسەر

**جۆری تیژ**

١- ئیریثرۆمایسین بۆ ٦ حەفتە، لە ١٢ ساڵ گەورەتر دەتوانێت تێتراسایکلین بەکار بێنێت.

٢- ت س و B، ت س و A، پۆڤا PUVA یان ئەسیترێتین acitretin + پۆڤا PUVA.

٣- میثۆترێکسەیت methotrexate، سایکلۆسپۆرین cyclosporine A، پێنتۆکسیفیلین pentoxifylline یان داپسۆن dapson یان ستیرۆید بەدەم بۆ باری زۆر تیژ .

**جۆری درێژخایەن**

١- ت س و B، بە یەکەوە ت س و B + ت س و A، پۆڤا PUVA.

٢- تێتراسایکلین tetracycline، ئیریثرۆمایسین erythromycin.

٣- میثۆترێکسەیت، ئەسیترێتین، ئەسیترێتین + پۆڤا، ت س و AI، کرێمی تاکرۆلیموس tacrolimus.

٤- دەتوانین هەرچارەسەری نەکەین.

## تەنۆچکەیی لیمفۆمایی Lymphomatoid papulosis

زۆر باو نییە و لە هەموو تەمەنێك دا بەڵام بە زۆری لە پێگەیشتوودا adult (٤٤ ساڵی تێکڕایی تەمەنی دەرهاتنیەتی) دەردەکەوێت، دەردەکان لە PLEVA (جۆری١) دەچن بەڵام لێرەدا گەورەتر و کەمترن (١٠-٢٠ تەنۆچکە بەڵام لەوانەیە پترین) وە پتر خانە لەناوچوونی (دارزان) necrosis تێدایە و بریتین لە تەنۆچکەی papule سوور (تیرەکەی تا ١سم دەبێت) ئەوسا دەبێت بە بلۆق vesicle یان تەنۆچکە کێمی papulopustular یان خوێنڕێژی hemorrhagic و دواتر تەنۆچکەی دارزاو necrotic لە چەند ڕۆژ بۆ چەند حەفتەیەك دا. دەردەکان لەسەر پێستی لەش بلاوبوونەتەوە. (**وێنەی ١٠١**)





(**وێنەی ١٠١**)
**تەنۆچکەی لیمفۆمایی**

کۆمەڵ کۆمەڵ بەدوای یەك دا دەردێن یان دەردی نوێ دەردێن و کۆنەکانیش هەر هەن، ئەم نەخۆشیە درێژخایەنە، کە تەنۆچکەکان چاکبوونەوە جێ زامی scar ڕەنگ گۆڕاو بۆ تۆختر یان کاڵتر جێدەهێڵن (وەك جێ زامی ئاوڵە وایە).

دیاریکردنی نەخۆشیەکە بە نموونە وەرگرتنە biopsy کە دوو جۆرە، جۆری خانەی A و جۆری خانەی B. لە ١٠-٤٠٪ بارەکان دا نەخۆشی شێرپەنجەی لیمفۆما lymphoma لە گەڵ ئەم نەخۆشیەدا شان بەشان دەردەکەوێت.

شێرپەنجەکە یان شێرپەنجەی کەڕووی قارچکییە (M.F.) mycosis fungoides لە ٤٠٪ی بارەکان دا یان لیمفۆمای خانەی Tیە(لە ٣٠٪یان دا) یان شێرپەنجەی هۆجکنە Hodjkin's disease (لە ٢٥٪ی بارەکاندا). جۆری خانەی B کەمتر تووشی شێرپەنجە (بە بەراورد لەگەڵ جۆری خانەی A) دەبن.

### چارەسەر

**تێبینی:-** چارەسەری ئەم نەخۆشیە زۆر پێویست نییە چونکە چارەسەرکردنی پەیوەندی نییە بە پەیدابوونی شێرپەنجە.

١- ستیرۆیدی زۆر بەهێز super-potent بەکرێم یان مەرهەم بۆ باری منالان.
٢- بێکسارۆتین bexarotene ی جێیی یان بەدەم.
٣- ت س و B، ت س و B تەسك.
٤- میثۆترێکسەیت methotrexate:

# پانە پێستەستووری (L.P.) Lichen planus

ئەم نەخۆشیە دەگمەن نیيە بەڵام هۆكەی بەتەواوی نەزانراوە هەرچەندە سیستمی بەرگری ڕۆڵـی لـە پەیـدابوونی دا هەیـە (جـۆری چـوار = بـەرگری گـوازراوەی خانـەیی cell mediated immunity). لیمفۆسایتی T بە میكانیزمێكی نەزانراو وا لـە خانەكاژەكان keratinocyte دەكەن كە بفەوتێن apoptosis.

دژە ژیندەری لیوكۆسایتی مرۆڤـ HLA جـۆری HLA $B_8$ لـە جـۆری نـاودەم بـاوترە بـێ تووشبوونی پێست، بەڵام HLA $B_w35$ لە جۆری توشبوونی پێست باوە.

مێینە پتر لـە ٤٠-٦٠ ساڵی دا تووشیان دەبێت، بەڵام نێرینە زووتر دەیگرن هەرچـەندە هـەموو تەمەنێك دەیگرێت، لـە مانگی ١٢ و ١ دا پتر دەردەكەوێت.

**نیشانەكانی جۆری ئاسایی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:-**

تەنۆچكەی فرەگۆشـەیی ploygonal پـان بـووەوە flat topped ی سـووربۆوە و وەنەوشـەیی ڕەنگ (هەندێك جار لەناوەڕاستی دا ناوكۆكەیەك هەیە)) دەردەكەون و لـەوانەیە كاژێكی تەنكی ڕوون بەسەر تەنۆچكەكەوە نووسابێت.

خاڵی سپی بچووك یان تورێكی باریكی سپی زۆرجار لـەسەر تەنۆچكە پێكەیشتووەكان دا هەیە و پێـی دەوترێـت هێڵـەكانی (پەتـەكانی) وكهـام Wickham's striae بەتایبـەتی دوای تـەڕكردنی تەنۆچكەكان بە ئاو یان زەیت و بە هاوێنەی دەست hand lens سەیر بكرێت باشـتر دەردەكـەون. یەكەم جـار دەردەكـان وەك پەڵـەی سـووری كـاڵ دەردەكـەون و لـەچـەند حەفتەیـەك دا دەبـن بـە تەنۆچكەی ئەرخەوانی purplish. (وێنەی ١٠٢و ١٠٣)



(وێنەی ١٠٣) پانە پێستەستووری.





(وێنەی ١٠٢) پانە پێستەستووری.

ئەم دەردانە هەندێك جار لـەماوەیـەكی كـەم دا (١-٤ مـانگ) بڵاودەبنـەوە، جـاری وایـە زۆربەی پێست دەگرێتەوە.

یەكەمین دەردەكان لـە پەڵەكان بەتایبەتی پەڵـەكانی خـوارەوە lower limbs لەهـەردوو لای لەش (ڕاستو چەپ) بە ڕێكی دەردەكەون، ئەم نەخۆشیە چەند شـوێنێكی دیـاریكراو هەڵدەبـژێرێت وەك مەچەك wrists (دیـوی نـاوەوەی مەچـەك flexural areas)، باسـك، لاقـەكان، بـەڵام

لەوانەیە ڕان و خوارەوەی پشت و قەد و مل توشی بن، ناودەم و پێستی کۆئەندامە سێکسیەکانیش توش دەبن.

جۆری هەڵگەڕاوە inverse L.P. توشی لۆچەکان (folds) وەك ژێر باڵ و ناوڕان و ژێر مەمك دەبێت. پانەپێستەستووری L.P. زۆربەی جار زۆر دەخورێت هەرچەندە هەندێك نەخۆش خورانیان نییە، توندی خوران پەیوەندی بە بڵاوی نەخۆشیەکەوە هەیە، خوران لە باری زۆر بڵاودا پترە، بەڵام جۆری زێدە ئەستووربوو hypertrophic type هەرچەندە ڕووبەرێکی کەم دەگرێتەوە یەکجار بە خورووە.

لەناو دەم دا گرفتی ئازار و خوران لە زۆربەیان دا نیە مەگەر چاڵەبرین یان داماڵین دروستبکات کە زۆر بە ئازارە. لەم نەخۆشیەدا دیاردەی کۆبنەر Koebner's phenomenon بەتایبەتی لە باری تیژ و نوێ دا هەیە کە بریتیە لە دەرهاتنی دەردەکان لە شوێنی زەبر و ڕوشان و پەستان دا.

دوای چاکبوونەوە پەڵەی تۆخ بەتایبەتی لە پێستی گەنمڕەنگ دا جێدەهێڵێت بەڵام ڕێژەیەکی کەمتر پێستی کەمڕەنگی (سپیتر) hypopigmentation جێدەهێڵێت.

لە منداڵ دا سەر و نینۆك و موو کەمتر ئەم نەخۆشیەی لێ دەردەچێت.


(وێنەی ١٠٤)
پانە پێستەستووری (جۆری بازنەیی)

## جۆرەکانی

١- **جۆری بازنەیی** Annular L.P:- لە ڕێژەی ١٠٪ی بارەکان دا شێوەی بازنەیی وەردەگرێت بە یەکگرتنی تەنۆچکە بچووکەکان و کشانیان بەرەو دەرەوە و نەمانیان لە ناوەڕاستی بازنەکەدا،لە ڕەش پێستەکاندا لەسەر باتوو و چوك penis یان جۆری خۆری actinic L.P ئەم شێوەیە وەردەگرێت. (وێنەی ١٠٤)


(وێنەی ١٠٥) پانە پێستە ستووری (جۆری هێڵی).

**جۆری هێڵی** Linear L.P.:- بە شێوەی هێڵی بە تایبەتی لەسەر پێستی پەلەکان limbs دا تەنۆچکەکان دروست دەبن، ئەم شێوە هێڵیە بەشێکە لە دیاردەی کۆبنەر واتا دەرکەوتنی تەنۆچکەکان لەسەر زەبری هێڵی یان بە دەگمەن هەر خۆی هێڵی یە. (وێنەی ١٠٥)


(وێنەی ١٠٦) پانە پێستەستووری (جۆری زێدە ئەستوور

٣- **جۆری زێدە ئەستوور** Hypertrophic L.P.:- بەشێوەی دەردی ئەستوور و بەرزو کاژاوی یان بالوکەیی سوور (وێنەی ١٠٦)، قاوەیی یان ئەرخەوانی دەردەکەون و زۆر بەخوروون و دوای چاکبوونەوە جێ زام (شوێنی برین scar)

جێدەهێڵن. بەتایبەتی لە لاق و جومگەی نێوان پەنجەکان دەردەکەون. لەوانەیە دوای چاکبوونەوە جگە لە جێ زام پەڵەی تۆخ یان لە ئاسایی کاڵتر جێبهێڵن.

٤- **جۆری پوکاوە** Atrophic L.P. :- دەگمەنە، لەسەر لاق و قەد پتر هەن و بە شێوەی تەنۆچکە و قوتکەی plaques سنوور ئاشکرا و شین و سپی و ناوەڕاست پوکاوە دەردەکەون.

٥- **جۆری بڵقی و بلۆقی** Vesico-bullous L.P. :- دەگمەنە، بلۆق و بڵق لە سەر دەردەکان بەتایبەتی لە سەر لاقەکان دەردەکەون. (**وێنەی ١٠٧**)

٦- **جۆری داماڵراو و چاڵە برینی** Erosive and ulcerative L.P. :- دەگمەنە، بەشێوەی بڵق و چاڵە برینی درێژخایەنی بەئازار لە پێ دا دەردەکەوێت، دوای چاکبوونەوە جێ زام جێدەهێڵێت، ئەم جۆرە پتر لەگەڵ جۆری بڵقی و نینۆك و ناودەم و شوێنی تری پێست و سەر دەردەکەوێت و لەوانەیە لە داهاتوودا شێرپەنجەی خانەی کاڵی جێبهێڵێت. (**وێنەی ١٠٨**)

٧- **جۆری سەلکەموویی** Follicular L.P -(Lichen plano- pilaris) :- ئەم جۆرەیان هەر تەنیا خۆی هەیە یان لەگەڵ جۆری ئاسایی پێست و ناودەم دەردەکەوێت. (**وێنەی ١٠٩**)

تەنۆچکەی بچووکی قۆچەکاڵی keratotic لە کونی سەلکە مووەکان دا بەتاکە تاکی یان قوتکەیی plaques بەتایبەتی لە قەد و بەشی ناوەوەی قۆڵ و ڕان دا دەردەکەون، لەسەردا دەبێتە هۆی موو ڕووتانەوەی هەتایی (کۆنێتی) cicatricial alopecia.

کۆنیشانەی گراهام لیتل – فێڵدمان Graham Little Feldman syndrome: بریتیە لە بوونی:

١- جۆری سەلکەموویی لە پێست دا.

٢- موو ڕووتانەوەی هەمیشەیی چەند شوێنێکی سەر.

٣- ڕووتانەوەی (بێ جێ زام) مووی ژێر باڵ و بەر.

٨- **جۆری تۆخبوونەوە** Lichen planus pigmentosus :- پەڵەی تۆخی قاوەیی لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان و لۆچەکان flexures دا دروست دەبن.

٩- **جۆری خۆری** .Actinic L.P:- لە ولاتی ئێمەدا بەتایبەتی لە بەهار و هاوین دا باوە چونکە تیشکی خۆر نەخۆشیەکە دەردەخات، توشی دەم و چاو و مل و دەست و باسک دەبێت (ئەو شوێنانەی خۆر لێ یان دەدات)، تەنۆچکەکان تۆخ و قاوەیی و بنەوشەیین و لێوارەکانیان لوولەیە rolled borders و لەوانەیە جۆری ئاسایی لەسەر پەلەکان دا هەبێت.



(وێنەی ١٠٨)
پانە پێستەستووریٚ (جۆری چاڵەبرینی)



(وێنەی ١٠٧) پانە پێستەستووریٚ
(جۆری بلّقی و بلۆقی).





(وێنەی ١٠٩)
پانە پێستەستووریٚ (جۆری سەلکەمووییی).

١٠- نەخۆشی گەندە کەچەڵی Pseuopelade: کە بریتیە لە موو ڕووتانەوەی هەمیشەیی (کۆنێتی) دەرئەنجامی بە چەقبونی (بەڕیشاڵبوونی) fibrosis سەلکەمووەکان چەند بارێك دروستی دەکەن کە ئەمانەن:

١- نەخۆشی پانە پێستەستوری .L.P.

٢- نەخۆشی گورکە سورە Lupus erythematosus.

٣- کێمە سەلکەسۆی جێزامێن Pustular-scarring folliculitis.

٤- ڕەقبوونی پێست Scleroderma.

٥- تووشێنی کەڕوو Fungal infection.

٦- نەخۆشی سارکۆید Sarcoidosis.

١١- **جۆری ناوپۆشی** .Mucosal L.P:- واتا لە ناوپۆشەکان دەدات و ڕێژەی ١٪ ی خەڵکی تووشیان دەبێت.


**(وێنەی ١١٠) پانە پێستەستووری (جۆری ناوپۆشی ناودەم).**

أ) **ناودەم**: ڕێژەی ٦٠-٧٠٪ی نەخۆشی L.P ناودەم دەگرێتەوە و لە ٢٠-٣٠٪ی بارەکان دا تەنیا ناودەم تووشی بووە و پێست و نینۆك ساغن.

جۆرەکانی: **(وێنەی ١١٠)**

١- جۆری تۆڕی Reticular pattern: وەك تۆڕە هێڵی سپی دەردەکەوێت.

٢- جۆری قوتکەیی Plaque like.

٣- جۆری پوکاوەیی Atrophic.

٤- جۆری تەنۆچکەیی Papular.

٥- جۆری داماڵراو و چاڵە برینی Erosive & ulcerative type.

٦- جۆری بڵقی Bullous type.

جۆری پێنجەم پتر لە پیردا هەیە و زۆر بەئێش و ئازارە و نەخۆشەکان پتر ڕوو لە پزیشکی ددان دەکەن.


**(وێنەی ١١١)**
**پانە پێستەستووری (دەوری کۆم).**

ب) **کۆئەندامە سێکسیەکان**:- ڕێژەی ٢٥٪ی نەخۆشی .L.P کۆئەندامی سێکسی نێرینە بەتایبەتی پۆپەی چووك glans penis دەگرێتەوە و دەردەکان پتر بازنەیین annular(**وێنەی ١١١**). لە مێینەدا سپیە قوتکە leukoplakia یان سوورەقوتکە erythroplakia لەگەڵ داماڵین erosions یان

کیلەکەسۆی کاژێن desquamative vaginitis هەن.

لـە کـۆم دا دەبێتـە هـۆی سـپیە قۆچـەکاژێ leukokeratosis، زێـدە قۆچـە کـاژی hyperkeratosis، درزبوون fissuring و داماڵین erosions.

لەوانەیە لە پێڵووپۆش دا conjunctiva تووشی پێڵووپۆشەسۆی ڕەقبوون بێت.

١٢- **جۆری پانەپێستەستووریی نینۆکـەکان** Lichen planus of the nails:- ڕێـژەی ١٠-١٥٪ تووشی نینۆك دەبێت، لە منداڵ دا کەمـە، تێکچـوونەکان ئەمانـەن: پلێـت nail plate تـەنك بـوون، هێڵـی زەقبـووەوەی درێـژی longitudinal ridging، درزدانـی کۆتـایی پـەڕی پلێتی نینۆك onychoschizia، شـیبوونەوەی پلێتـی نینۆك onycholysis، هێڵـی نزمبـووەوەی درێـژی onychorrhexis، زێـدە قۆچـەکاژی ژێـر نینـۆك subungual hyperkeratosis، نـەمانی نینـۆك anonychia و بەدگەشـەیی dystrophy هـەموو نینۆکەکان (tachyonychia).



**(وێنەی ١١٢)**
**پانە پێستەستووریَ -نینۆك (نینۆکی باڵی).**

سەر نینۆك eponychium بـەرەو پێشچـوون و نووسـانی بـە پلێتـی نزیکـی proximal nail plate نینۆك دەبێتە هۆی بارێکی تایبەت بەم نەخۆشیە پێی دەڵێن نینـۆکی بـاڵی pterygium unguum.(وینەی ١١٢)

ئەگەر دۆشەکەی نینۆك تووشی نەخۆشیەکە بوو ئەوە پلێتی نینۆك بەرز و درزاوی دەبێت.

١٣- **جـۆری هەڵگـەڕاوە** Lichen planus inversus:- دەگمەنـە و تووشـی لۆچـەکان flexures دەبێت (ژێر باڵ، ناو ڕان، ژێر مـەمك، پشـتی ئـەژنۆ و ئانیشـك و مـل) و وەك تەنۆچکە یان گرێی سوور و قاوەیی دەردەچێت، لـە وڵاتی ئێمەدا ئەم جـۆرە دەگمـەن نییـە و پەڵەی ڕەش و پوکاوە جێدەهێڵێت و لەوانەیە چەند ساڵ بمێنێتەوە (تێبینی نووسەر).

١٤- **جۆری بەری دەست و پێ** Palmoplantar L.P.: دەگمەنە، تەنیا لـەبەری دەست و پێ دا هەیە و دیارکردنی ئاسان نییە، قوتکەی plaques زۆر بەخورووی کاژاوی و سوور لـەگەڵ یان بەبێ زێدە قۆچەکاژی لە قووڵایی بەری پێ دا دەردەچێت یـان تەنۆچـکە و تەنۆچـکەگرێی قۆچە کاژی پتەوی زەردباو لـە لاکانی پەنجەی دەست و بەر و پشتی دەست دەردەکەون و هەر دەڵێی پێست ڕەقبوونن callosities و بە سووربوونەوەی پێست دەوردراوە.

١٥- **جۆری دروست بوو بە دەرمان** Drug induced L.P.:- بریتین لـە کۆمەڵێك دەرد بـەهۆی خواردنی، هەڵمژینی یان بەرکەوتنی پێکهاتەی کیمیکی یان دەرمان، دەردەکان وەك پانەپێستە ستوریی ئاساین یان لـەوان دەچـن، هەنـدێك جـار تەنۆچـکەی بریۆیـی بڵاوبـووە و کـاژاوی

دروست دەبێت و دوای چاکبوونەوە تۆخبوون و قژرووتانەوە جێدەهێڵێت بەڵام هێڵی وکهامی لەسەر دروست نابێت، ئەم دەردانە بەشێوەیەکی ڕێك و پێك لەسەر قەد و پەلەکان دەردەچن و لە لۆچەکاندا (وەك جۆری ئاسایی) دروست نابن، دوای وازلێهێنانی دەرمانەکان لە ٣-٤ مانگدا نامێنێت. دەرمانەکان:-

١- بە شێوەی بەرکەوتن Contact chemicals وەك پەرەسێنەری فلیمی وێنەگرتن color film developers کە مژادی پ-پارافینیلین دایئەمینی (PPD) P -Paraphenylene diamine ی تێدایە و مژادی تریشی تێدایە (وە وێنەگرەکان تووشیان دەبێت). یان مژادی بینانانی ددان dental restorative materials، نیکڵ nickle یان ئەنتیبایۆتیکی ئەمینۆگلایکۆ سایدەکان amino glycoside antibiotics و ئاڵتون gold.


**(وێنەی ١١٣)**
**پانە پێستەستووری بلقە گردەیی**

٢- دەرمان بەدەم: وەك خوێی ئاڵتون gold salts، بێتاوەستێن β-blockers وەك ئیندیراڵ inderal، دژە مەلاریا anti malarials وەك کلۆرۆکوین، دەرمانی میزێن diureties وەك ثایەزایدەکان thiazides، سپایرونۆلاکتۆن و پێنسیلامین و زۆری تریش.

٣- دەرمان لەگەڵ خۆر Photodistributed L.P.:- وەك کاربامازیپاین carbamazepine، ئیثامبیوتۆڵ و تێتراساکلین - تاد.

٤- پتر ناودەم توشبوون بە: کیتۆکۆنازۆڵ، مەثیل دۆپا، دەرمانی دژە شەکرە - تاد.

١٦- **پانەپێستەستوریی بلقەگردەیی** Lichen planus pemphigoides: بلق لە سەر تەنۆچکە ئاساییەکان دەردەچن یان بلق و بلۆق لەسەر پێستی ساغ، نەك هەر لەسەر تەنۆچکەکان، دروستدەبن.
**(وێنەی ١١٣)**


**(وێنەی ١١٤) نەخۆشی نیکام**

١٧- **نەخۆشی نیکام** Nekam's disease:- جۆرێکی نەخۆشی پانەپێستەستووریە (**وێنەی ١١٤**) ، لێرەدا تەنۆچکە و گرێی وەنەوشەیی بەشێوەی هێڵی و تۆڕی لە پشتی دەست و پێ و پەلەکان و سمت دەردەچن، لەوانەیە ناوپۆش و کۆئەندامە سێکسیەکان و نینۆك و بەری دەست و پێش بگرێتەوە. فرە دەزوولە و کاژکردن بە شێوەی

چەورە بیرۆ seborehoeic dermatitis لەسەر و دەم و چاو و مل دەردەکەوێت ، ئەم نەخۆشیە دەگمەنە و لە چارەسەرکردن یاخییە بەلآم پۆڤا Puva و کرێمی کالسیپۆتریۆل بەکەڵکن.



(وێنەی ١١٥)

**پانە پێستەستووریی ناودەم (زمان) لەگەڵ سەرهەڵدانی شێرپەنجەی خانەی کاژی.**

**١٨- پانەپێستە ستوری دەرئەنجامی متوربە بەرامبەر خانەخوێ:**

Lichenoid reaction of graft-versus-host disease

دوای ١٠٠ رۆژ لـــە متوربـــەکردنی ئەنـــدام (وەك گورچیلە) دەردێکی پێست دروست دەبێت کە هەر وەك پانەپێستەستوری L.P. وایە. (وێنەی ١١٥)

نموونە وەرگرتن Biopsy: گۆڕانکارییە سەرەکییەکان بریتین لە:

١- زێدە قۆچەکاژی.

٢- پارچەی فرە بوونی چینی دەنکۆڵەیی areas of hypergranulosis.

٣- درێژ بوونی مێخی تۆری rete pegs وەك دەمە مشار.

٤- بوونی خانەی مردوو بە شێوەی تـەنی بـڵ colloid bodies لـە لکینـی توێـژ و بـن توێژدا.

٥- بونی پەتێکی (هێڵێکی) تەنینەوەی infiltration خانەی لیمفۆسـایتەکان لـە گـۆی بـن توێژدا.

٦- پڕبوونی رەنگی میلانین.

## چارەسەر

أ) ناودەم:-

١- خواردەمەنی وروژێن، زەبری میکانیکی و بەردی ددان دەبێت دوور بخرێنـەوە، پڕکـەرەوەی ددان کە بە پشکنینی پارچە patch test وەك هۆکارگومانی لێ کرا دەبێت بگۆڕێت.

٢- بۆ باری ئاسان: ستیرۆیدی جێیی بـەهێز strong topical steroids وك فلوسـینۆلۆن یـان کلۆبێتازۆل لە ناو مژادی پێوەلکێن adhesive رۆژی ٣-٤ جـار بـۆ مـاوەی ٢-٤ حەفتـە، وەك کینالۆگ لەناو بنچینەی دەمی orabase بەکاردەهێنرێت.

٣- بـــەرگری ســـــتکەری جێـــــی وەك تـــاکرۆلیمۆس tacrolimusو پیمیکرۆلیمـــۆس pimecrolimus.

٤- ستیرۆید بە دەرزی بۆ ناو دەردەکان وەك ترایئەمسینۆلۆن triamcinolon.

٥- تێکەڵەی سڕکەر + دژە هیستامین + دژە بەکتریا و کاندیدا.

٦- ستیرۆید بە دەم یان بە سمت بۆ چەند حەفتەیەك.

٧- ڕێتینۆیدەکان بە کرێم + کرێمی ستیرۆید، یان بە دەم وەك ئەسیترێتین acitretin.

٨- هایدرۆکسی کلۆرۆکوین.

٩- بەرگری سستکەر بەدەم وەك ئازاثایۆپرین azathioprin و مایکۆفینۆلەیت مۆفێتیل mycophenolate mofetil.

١٠-سایکلۆ سپۆرین، ثالیدۆماید یان لەیزەری ئێگزایمەر excimer laser.

**تێبینی:-**

لە ناودەمدا ئەم نەخۆشیە درێژخایەنە، وە لەوانەیە ئەگەر جۆری داماڵراو یان چاڵە برینی بێت ١٪یان ببێت بە شێرپەنجە هەر بۆیە ئەم چارەسەرە بەهێزانەی سەرەوە، لە سووکەوە بۆ قورستر، دەدەین.

ب) پێست:-

١- دوورخستنەوەی دەرمانی هۆکار ئەگەر هەبوو، وە لابردنی زەبری میکانیکی.

٢- دژە خورانی جێیی بەکەڵکن وەك شلە و کرێم کە ئەم مژادانەی تێدابێت: مێنثۆل، فینۆڵ، کامفور، لیدۆکاین، پرامۆکزین pramoxine یان دۆکسیپین لەگەل دژە هیستامین بەدەم.

٣- ستیرۆیدی جێیی زۆر بەهێز ڕۆژی ٢ جار بۆ ٢-٤ حەفتە وەك کلۆبێتازۆل.

٤- ستیرۆید بەدەرزی بۆ ناو دەردەکان intralesional steroides.

٥- ستیرۆید بەدەم بۆ چەند حەفتەیەك یان بە دەرزی (سمت).

٦- خەپلەی میترۆنیدازۆل oral metronidazole ٥٠٠ ملگم ڕۆژی ٢ جار بۆ ٢٠-٦٠ ڕۆژ.

٧- ئایزۆترێتینۆین ١٠ ملگم ڕۆژی ٢ جار بۆ ٢ مانگ، یان ئەسیترێتین ٣٠ ملگم/ ڕۆژ.

٨- PUVA یان ت س و B تەسك.

٩- سایکلۆسپۆرین، مایکۆفینۆلەیت مۆفێتیل، ئازاثایۆپرین و ثالیدۆماید.

١٠-هەندێك جار (کۆترایمۆکسازۆل =بەکتریم)، گریزیۆفوڵڤین griseofulvin ٥٠٠ ملگم/ڕۆژ بۆ ٢ مانگ، لیڤامیسۆل ١٥٠ ملگم/ ڕۆژ حەفتەی ٢ ڕۆژی دوای یەك بۆ ٦ حەفتە، ئینتەرفیرۆن، مەرهەمی تاکرۆلیمۆس ١ر٠٪، ت س و A1، تیشکەبزێوەچارە photodynamic therapy بە بەکارهێنانی ترشی دێلتا ئەماینۆ لیڤولینیك delta-amino laevulinic acid، ئەمانە جار جار بۆ هەندێك بار بەکار دەهێنرێن.

# رۆشنە پێستەستووری Lichen nitidus

زۆر باو نییە و هۆی نەزانراوە، ٣-٤ کەس لە ١٠٠٠٠ کەسدا دەیگرێت، بریتییە لە چەندەها تەنۆچکەی جیاجیای خڕی سەرپانبووەوە و لووس ( تیرەکەی ١ -٢ملم دەبێت)، ڕەنگی پێستی یە یان پەمەیی کاڵە یان لە پێست سپی ترە (لە گەنمڕەنگ دا) و ڕۆشن دارە glistening و هەندێك جار کاژێکی بچووکی بەسەرەوەیە، هەندێك جار تەنۆچکەکان کۆمەڵ دەبن و دیاردەی کۆبنەری تێدایە، لەوانەیە لە هەموو شوێنێکی پێست بە تایبەتی لە لۆچەکانی قۆڵ، مەچەك، خوارەوەی سك، مەمك، پۆپە و قەدی چووك دا glans penis دەربچن. (وێنەی ١١٦)





(وێنەی ١١٦) رۆشنە پێستەستووری.

ئەم نەخۆشیە لە .L.P جیاوازە و بە نموونە وەرگرتن زۆر باش جیا دەکرێتەوە.

**چارەسەر**

١- چارەسەری ناوێت کە خورانی نەبێت چونکە چەند مانگ یان ساڵ دەمێنێتەوە و ئەوسا چاك دەبێتەوە.

٢- چارەسەری بە ستیرۆیدی جێیی ،پوڤا، ت س و B یان A، دژە هیستامین جۆری ئەستیمیزۆل astemizole (لە بازاڕدا نەماوە) یان سیتیریزین cetirizine دەکرێت.

٣- ڕێتینۆیدەکان بەدەم.

٤- سایکلۆسپۆرین و ئیتراکۆنازۆل itraconazole بەدەم.



(وێنەی ١١٧) ریشاڵە پێستەستووری.

# ڕیشاڵە پێستەستووری Lichen striatus

باوە و پتر لە منالّ دا ((پێش ٦ ساڵی بەڵام تەمەنی تریش دەیگرن)) هەیە و هۆی نەزانراوە. (وێنەی ١١٧)

**نیشانەکانی:** دەردەکان بە تەنۆچکەی بچووکی (١-٣ ملم) سوور و کاژاوی دەست پێدەکەن ، ئەم تەنۆچکانە کۆدەبنەوە بۆ پێکهێنانی پەتی یان ڕیشاڵی پان (١-٣ سم پانە)، ئەم ڕیشاڵە پچڕپچڕە یان بەردەوامە و لە چەند حەفتەیەك دا بە پەلێك دا دەچێتە خوارەوە یان دەوری قەد دەدات

، ڕێژەی ١٠٪ لەدەم وچاو دەدات، کە بگاتە پەنجەکان ئەوە لە نینۆك دەدات، هەندێك جار بۆ چەند مانگێك لە نینۆك دەدات ئەوسا بەرەو پێست بە شێوەی پەت دەکشێت. لەماوەی (١-٤) ساڵدا نامێنێت.

**چارەسەر**

پێویست ناکات یان ستیرۆیدی جێیی یان تاکرۆلیمۆس بەکار دەهێنین.

## ڕەقە پێستەستووری

## Lichen sclerosus (lichen sclerosus et atrophicus)

بریتیە لە نەخۆشیەکی درێژخایەنی پێست و ناوپۆشەکان mucosae، پتر مێینە پێش باڵقبوون و دوای لێچوونەوە menapause تووشی دەبێت، لە سپی پێست دا باوترە، زۆر جار نەخۆشی تریش لە ئەنجامی بەرگری دژە خۆیی autoimmunity لەگەڵیدا هەن وەك نەخۆشی بەڵەکی، نەخۆشی ملە قۆرتە گلاند thyroid disease، دەردەڕێوی و کەم خوێنی توند (پیس) pernicious anaemia.


(وێنەی ١١٨) ڕەقە پێستەستووری

دەردە نوێیەکان بریتین لە تەنۆچکەی ڕووپانبووەوەی فرەگۆشەیی سپی یان پارچەی پوکاوە و خاڵی ڕەشی لەناودایە و بە خەرمانەیەکی وەنەوشەیی و سوور دەوردراوە، لە دوایی دا دەردەکە چرچاوی و سپی و نەرم دەبێت. (وێنەی ١١٨)

هەندێك جار بڵق و بڵقی خوێنڕێژی لەسەر دەردەکان دەردەچن. خورانی زۆرە بە تایبەتی لە دەوری کۆم و کۆئەندامی سێکسی دا و درز و دامالینیش باون، ئەمەش دەبێتە هۆی میزەچورکێ و دەلاندنی میزەجۆ urethral discharge و کیلەك vaginal discharge و ئازار و کزانەوە لە کاتی جووتبوون دا.

لەدوایی دا شانە ئاساییەکان تەسك دەبنەوە و لێوە بچووکەکانی labia manora دەوری کیلەك نامێنن، سەرەوەی میتکە و کونی میزەجۆش دەشێوێن، لە مێینەدا وەك ژمارە (8)ی ئینگلیزی دەوری کیلەك و کۆم دەگرێتەوە بەلام ناوپۆشی کیلەك vagina و ملی منالدان (cervix) تووشی نابن. لە دەوری کۆم تەسکبوونەوەی کۆم و ڕەقبوونی پێستەکە و ناوپۆشەکەی دەبنە هۆی قەبزی و پیسایی هێشتنەوە و دەلاندن بەهۆی درز دروستبوون.

لە نێرینەدا دەردەکان پووکاوەن و پێست، وەك بەڵـەکی، ڕەق و سـپی بـووە . زۆربـەی جـار پۆپکەی چووك دەگرێتەوە بـەڵام لەوانەشـە قـەدی چـووك و باتوو بگرێتەوە، لـە پۆپکە و چووك دا خوێنبەربوون و داماڵین دروسـتدەبن و چـەرمی سـەر پۆپکـە زۆر تەسـك دەبێتـەوە و هەڵنادرێتەوە و کونی میزەجۆش تەسك دەبێتەوە، لە نێرینەدا زۆر کەم کۆم تووشی ئەم نەخۆشیە دەبێت. (وێنەی ١١٩)





(وێنەی ١١٩) ڕەقە پێستەستووری.

جگە لـە کۆئەندامە سێکسیەکان و کۆم پێسـتی تـریش تووشی ئەم نەخۆشیە دەبێت وەك سەرەوەی پێستی سـنگ و مەمك. هیچ خوران و ئازاری نییە.

هەروەها لـەوانەیە دەوری ناوك و مل و ژێر باڵ و بەشی ناوەوەی مەچەك و دەوری چاو بگرێتەوە. لـێرەدا دەردەکان بچووك و سپی و لـووسن بەشێوەی پەڵە یان تەنۆچـکە و لـەوانەیە بەشێوەی پارچەی گـەورەتر کۆبنـەوە.(وێنـەی ١٢٠)



(وێنەی ١٢٠) ڕەقە پێستەستووری.

لە منالی مێنەدا دوو بەشیان کاتی باڵقبوون چاك دەبنەوە، سێیەکەکەی تریان چاك نابنەوە و لـەوانەیـە لـە داهاتوودا شێرپەنجەی لـێدەرچێت.

## چارەسەر

کۆئەندامە سێکسیەکان زەرەرمەند بوون و چارەسەری چالاکی دەوێت:

١- ستێرۆیدی جێیی زۆر بەهێز ultrapotent steroids وەك کلۆبێتازۆل (مەرهەم) شەوانە تا ٤ حەفتە دواتر شەو ناشـەو بـۆ ٤ حەفتـە، ئەوسـا حەفتـەی ٢ شـەو بـۆ مـانگی سـێیەم. ئەگـە نەخۆشیەکە دیسان هەڵیدایەوە ئەم ڕێجیمەی سەرەوە دەسـتپێدەکەینەوە. کرێمـی نەرمکـەرەوو emollients لە کاتی تردا بەکار دەهێنرێت.

٢- تاکرۆلیمۆسی جێیی، خەتەنە کردن، ترێتینوێنی جێیی.

٣- ستیرۆید بەدەرزی بۆ ناو دەردەکان intralesional، ئەسیت ڕێتین acitretin، ئیسترۆجینی جێیـی، تەزینەنەشـتەرگەری cryosurgery، لـەیزەری $CO_2$، سـتانازۆلۆل tanazolol بەدەم، ت س و AI، بڕینی تاشین tangential exision – تاد.

## Seborrhoeic eczema (dermatitis) چەورە بیرۆ

بریتیە لە پێستەسۆیەکی تەنۆچکەیی کاژاوی درێژخایەن، ڕێژەی ٣-٥٪ خەڵکی تووشی دەبن، دوو جۆری هەیە، لە منالّی ساوادا لە ٣ مانگی سەرەتای ژیان دا یان زووتر دەردەکەوێت و جۆری دووەمی لە بالّقی دا بە تایبەتی لە ٤٠-٧٠ سالّی دا و نێرینە پتر لە مێینە دەیگرێت. لە ٨٥٪ ی نەخۆشی ئەیدزدا هەیە.

هۆکەی نەزانراوە بەلاّم:

١- هەندێك جار خێزانییە.

٢- هەوێنی yeast پیتیرۆسپۆرەم pityrosporum ڕۆلّی تێدا دەبینێت.



(وێنەی ١٢١) چەورە بیرۆی ساوا

٣- تێکچوونی گوێزەرەوە دەمارییەکان neurotransmittersچونکە لە نەخۆشی فێ، شەپلّە، ئیفلیجی دەماری ڕوومەت و ئیفلیجی منال دا - تاد پتر هەیە.

٤- دەرمان وەك ئالّتون، مەثیل دۆپا و تاگامێت - تاد هەندێك جار هۆکارن.

٥- تێکچونی دەروونی stress.

**دوو جۆری سەرەکی هەن:-**

١- **جۆری ساوا** Infantile type: باسمان کردووە. (وێنەی١٢١)

٢- **جۆری بالقی** Adult type:- لە هەموو جۆرەکان دا پێست سوور و زەرد یان سپی خۆلّەمێشی دەنوێنێت و کونی سەلکەمووەکان زەقتر دیارن و کەم یان زۆر کاژکردن هەیە(وێنەی ١٢٢ و ١٢٣). پێستی سەر، پێستی برۆ، پێلّووی چاو، درزی نێوان لووت و دەم، لێو، گوێچکە، کۆلّەی سنگ sternum، ژێر بالّ و مەمك، ناوك، ناوڕان و





(وێنەی ١٢٢) چەورە بیرۆ.

نێوان سمتەکان دەگرێتەوە. نەخۆشیەکە سووربوونەوەی پێستە و بەکاژ داپۆشراوە، کاژەکە زەرد و چەورە و کرێژی سەر بریتیە لە جۆرێکی سووکی ئەم نەخۆشیە.

هەر لەسەر دا جۆری قەتماغەیی چەور هەیە، لە پێستی لەش دا جۆری بازنەیی، کەوانەیی، فرە پارچەکەوانەیی، جۆری سەدەفی (وەك سەدەف وایە) و جۆری ئاووزلزلەدار هەن.

لەسەردا نەخۆشیەکە پتر لە هێڵی مووەکان بۆ ناوچەوان، گوێچکە، پشت گوێچکە و مل دادەبەزێت. لە باری تیژدا هەموو پێستی سەر دەگرێتەوە و قەتماغەیی و چەور و تەڕە و بۆنی ناخۆشە. لە ریش دا (لە نێرینەدا) پێستەسۆی کونی سەلکەمووەکان زۆر باوە.

پشتی گوێچکە درز دەبات و سوور و ئاوساوە، لێواری پێڵووی چاو سوور و کاژاویە و لەوانەیە ناوچەوانیش سووربوونەوە و خورانی تووشبێت.

لە ژێر باڵ دا، لە قووڵی ژێر باڵ دا دەست پێدەکات و بۆ دەوروبەرەکەی بڵاو دەبێتەوە (بەپێچەوانەی پێستەسۆی ژێر باڵ بە هۆی فرەهەستیاری یان ورووژان بە بۆن و پاك کەرەوەکان).


(وێنەی ١٢٣) چەورە بیرۆ.

ژێر باڵ و ژێر مەمك و ناوك و کۆڵەی سنگ و ناوران بەکپەمی سووربوونەتەوە یان سووربووەوە و ئاوساون و درزیان تێکەوتووە.

لەوانەیە ئەم نەخۆشیە ببێت بە پێستەسووری erythroderma و بەخورووە و لەوانەیە لە پیاوان دا جۆری سەلکەسۆ هەموو پشت و سنگ و سك بگرێتەوە. نەخۆشیەکە درێژ خایەنە (چەند یان دەیان ساڵ سەر هەڵدەداتەوە)، بە هاوین باشترە و بە زستان توندترە، بەڵام تیشکی خۆر و گەرمای زۆر و ئارەق کردنەوە دەیوروژێنێت.

## چارەسەر

تەنیا کۆنترۆڵ دەکرێت و بە دەرمان بەیەکجاری چاك نابێتەوە.

١- **چارەسەری سەر:-**

أ) شامپۆی کیتۆکۆنازۆڵ، سایکلۆ پایرۆکس ciclopirox، زینك پایریثیۆن zinc pyrithion. حەفتەی ٢-٣ جار.

ب) شلەی پرۆپیلین گلایکۆل، مایکۆنازۆڵ یان سیلینیۆم سەلفاید.

جـ) ستیرۆید یان سالیسیلیك ئەسید، زەیتی نەهەنگ یان قیر و ترشی سالیسلیك بۆ لابردنی قەتماغەی ئەستوور.

د ) بۆ باری تیژ ستیرۆید بەدەم بۆ ماوەیەکی کەم و دژە بەکتریا بۆ تووشێنی بەکتریا بەکاردەهێنرێت.

٢- **چارەسەری لەش:-**

١- کیتۆکۆنازۆل یان ستیرۆیدی سووك بەکرێم و مەرهەم.

٢- لیثیۆم سەکسینەیت یان گلوکۆنەیت lithium succinate or gluconate.

٣- تاکرۆلیمۆس یان پیمیکرۆلیمۆس.

٤- ئیتراکۆنازۆل بەدەم، تیربینافین، ت س و B یان پۆڤا.

٥- میترۆنیدازۆڵ (جێیی) ١-٢٪ بە کرێم، کالیسپۆتریول، تاکالسیتۆل یان کالیسترایۆڵ بە مەرهەم.

٦- ئایزۆترێتینۆین بەدەم ١٠ملگم رۆژ نا رۆژ بۆ چەند مانگێك.

# نەخۆشی سەدەف (کاژۆکی) Psoriasis

نەخۆشیەکی باوە، ڕێژەی ١-٣٪ خەڵکی تووشی دەبن، لە هیندیە سوورەکان دا هەر نییە و لە سپی پێستەکان دا پترە، هەموو تەمەنێك تووشی دەبێت بەڵام پتر لە ١٥-٤٠ ساڵی دا دەردەکەوێت، ئەم نەخۆشیە درێژخایەنە و قوتکەی دیارکراوی سۆیی داپۆشراو بە کاژی زیوی (کە بە پێستەوە نووساوە) تێدا دەردەکەوێت، هەمیشە لە پتربوون و کەمبوون دایە. لەوانەیە تا زووتر لە ژیان دا دەست پێبکات توند sever تر بێت و پتر ئەگەری بۆماوەیی هەیە.

## چۆنیەتی دروستبوونی

هۆکاری بنەڕەتی نەزانراوە بەڵام لەوە دەچێت بۆماوەیی و وروورژێنی ژینگە ڕۆڵیان هەبێت. دوو تێکچوونی سەرەکی هەن:

١- پتر بوونی خانە (پتر دابەش بوونی)ی کاژ keratinocytes.

٢- سۆکردن، کە تێیدا تەنینەوەی خانە بەتایبەتی خانەی نیوترۆفیل و لیمفۆسایتی یارمەتیدەر جۆری Th$_I$ I بە بەربلاوی کۆدەبنەوە. هەر یەك لەم دوو تێکچوونە ئەوی تر دروست دەکات وەك بازنەیەکی بەردەوام بوو. لە ئەنجامی ئەمەدا بەربەستی barrier چینی کاژی تێکدەچێت و هۆکارەکانی ژینگە دەچنە ناو پێست و لەوانەیە دژە ژیندەری شاراوەی hidden antigene ناو پێست دەرکەوێت و کاردانەوەی بەرگری دەست پێبکات و ببێتە هۆی دەرکەوتنی نەخۆشی سەدەف (کاژۆکی).

لە سەرێکی ترەوە لەوانەیە نەخۆشی سەدەف کاردانەوەیەکی بۆماوەیی بێت بۆ زۆر جۆر لە زەبر trauma وەك زەبری فیزیکی، وروورژێنی ژینگەیی و دەرمان، لەم کاردانەوەیەدا پرۆسەی سارێژکردن یان زێدەڕۆیی دەکات یان کۆنترۆڵ ناکرێت.

ئەگەر یەك لە باوك و دایك نەخۆشی سەدەفیان هەبێت ئەوە دەشێت ٦٪ ی منالّیان توشبێت، ئەگەر دایك و باوك هەردووکیان نەخۆشیەکەیان هەبێت دەشێت ٥٠٪ی منالّیان توشبێت. بەڵام باوك پتر لە دایك منالّی توشبووی لەدوا جێدەمێنێت.

ئەگەر باوك و دایك نەخۆشیەکەیان نەبێت بەڵام منالّێکیان نەخۆشیەکەی تووشبووبێت ئەوە دەشێت ڕێژەی ١٠٪ ی خوشك و براکانی تری بیگرن.

جۆری بۆماوەییەکە فرەجینیە polygenic و تا ئێستا ٧ شوێنی ئامۆزادیی بۆ سەدەف psoriasis susceptibility locus(بۆ نموونە 17q ، 6p – تاد) لەسەر کرۆمۆسۆمەکان دیارکراون. جگە لەوەش دژە ژیندەری لیوکۆسایتی مرۆڤ HLA بەپێی جۆری سەدەف پەیوەندنی هەیە، بۆ نموونە HLA-B$_{12}$ ، HLA- Bw$_{57}$ ، HLA-Cw$_6$ و HLA-DR$_7$.

سەدەفی کێمی بڵاو generalized pustular psoriasis و سەدەف لەگەڵ جومگەسۆ arthritis دا پتر جۆری $HLA_{27}$ یان هەیە.

### جوڵەی (بزووتنی) خانەی توێژ Epidermal cell kineties

خانە پتربوونی توێژ لە سەدەف دا هۆکەی پتربوونی ژمارەی خانەی خانە دروستکەرەکانە (germinative cells) کە دەچنە ناو سووڕی خانەوە، لێرەدا ١٠٠٪ی ئەم خانانە کاردەکەن (لەجیاتی ٣٠٪ بۆ پێستی ئاسایی). وە لەجیاتی کاتی ئاسایی خۆدروستکردنەوەی توێژ epidermal turnover time کە ٦٠ ڕۆژە ئەم کاتە دەبێتە تەنیا ١٠ ڕۆژ و سووڕی خانەی توێژ لە ٣١١ کاتژمێرەوە دەبێت بە ٣٦ کاتژمێر. پێستی ئاسایی نێوان پارچە سەدەفەکانیش دوو کەڕەت خێراتر خۆی نوێ دەکاتەوە.

ئینتەرفیرۆنی گاما (δ-interferon) لە باری ئاسایی دا کۆنترۆڵی دابەشبوون و جیابوونەوەی (=تایبەتمەندبوونی) خانەی کاژ دەکات، بەڵام لە سەدەف دا ئەم کۆنترۆڵە نامێنێت، لەوانەیە ئەمەش بەهۆی تێکچوونی جینی بێت، لە ئەنجام دا خانەکاژەکان هەر دابەشدەبن و زۆر دەبن.

بیردۆزێکی تر ئەوەیە کە سەدەف بەهۆی تێکچوونی جینی(بۆسیگناڵکەری وەرگری ترشی ڕێتینۆیك retinoic acid receptors (RARs))دەردەچێت هەر بۆیە بە دەرمانی ڕیتینۆیدەکان نەخۆشیەکە بەرەو باشی دەچێت.

دوو جۆر خێزانی وەرگری ڕێتینۆید لە توێژدا هەن:

١- وەرگری ترشی ڕێتینۆیك retinoic acid receptors (RARs).

٢- وەرگری xی ڕێتینۆید retinoid X receptors (RXR). ئێستاکە دەرمان بۆ وەرگری جۆری I هەیە.

### سوورکردن Inflammation

لەسەرەتادا هەندێك لە ئینتەرلیوکینەکان interleukins (IL) و هۆکاری گەشەکان growth factors ڕێژەیان بەرز دەبێتەوە و گەردە لکێنەکان adhesion molecules لە پێستی بەسەدەفبوو دەردەکەون یان ڕێکدەخرێن و کۆمەڵێك کاردانەوەی بەرگری دروستدەبن و دەبنە هۆی پەیدابوونی دەردەکان.

لە بن توێژدا dermis موولوولەکان capillaries لە پارچەی سەدەف دا فراوان و لوولخواردوون و فایبرۆبلاستەکان پتر دابەش دەبن و پتر گلایکۆس ئەماینۆگلایکانس GAG دروستدەکەن.

**فاکتەرە هاندەرەکان** (Triggering = Precipitating factors)

١- **زەبر** Trauma:- دیاردەی کۆبنەری Koebner phenomenon لە کاتی چالاکی نەخۆشیەکەدا تێدایە، واتا دروستبوونی پارچەی سەدەف لە شوێنی برین و زەبری میکانیکی و خوراندن.

٢- **تووشبوون** Infection:- ئالوو کەوتن tonsillitis بەهۆی بەکتریای ستریپتۆکۆکەسی تێکشکانی جۆری بێتا β-haemolytic streptococci زۆر جار سەدەفی دڵۆپەیی guttate psoriasis دەورووژێنێت یان دەریدەخات و ئەیدز AIDS سەدەف توندتر دەکات یان جۆری زۆر بەربڵاو دەهێنێتە کایەوە.

٣- **هۆرمۆن** Hormonal:- سەدەف لە سکپڕی دا باشتردەبێت و دوای منالبوون توندترە و کەمی کالیسیۆم hypocalcaemia (وەك سستی پاراثایرۆید hypoparathyroidism) هەندێك جار هۆیەکی هاندەرە.

٤- **تیشکی خۆر** Sun light: زۆربەی خەڵکی پێی باشتردەبن، بەڵام ڕێژەی ١٠٪یان پێی توندتر دەبن.

٥- **دەرمان** Drugs:- دژە مەلاریا، بێتا وەستێن β-blockers، ئینتەر فیرۆن ئەلفا (∝ IFN) و لیثیۆم lithium توندتری دەکەن، دوای پێدانی ستیرۆیدی سیستمی یان ستیرۆیدی جێیی "جۆری بەهێز" ئەوسا کتوپڕ برینی لە نەخۆش دەبێتە دووبارە سەرهەڵدانەوەی توندی نەخۆشیەکە.

٦- **جگەرەکێشان و خواردنەوەی مەی**: لەوانەیە توندتری بکەن.

٧- **باری دەروونی (فشار)** Stress: هەندێك جار دەیورووژێنێت.

**ژیانی نەخۆش**

چونکە نەخۆشیەکی درێژخایەنە و لەگەڵ ژیان دایە لەبەر ئەوە شێوازی (ستایلی) ژیان لەباری دەروونی و فیزیکی تێکدەچێت ، واتا هەروەك نەخۆشی تری درێژخایەن بۆ نموونە جومگەسۆ، نەخۆشی شەکرە، شێرپەنجە – تاد، توانای دەروونی و کارکردن کەمدەبنەوە، جگە لە بارگرانی دارایش، ئاسان نییە کە نەخۆش ئومێدی چاکبوونەوەی بنەڕەتی نەمێنێ و هەر مەرهەم و دەرمان و تیشك و– تاد بەکار بهێنێت.

ئەگەری بوونی نەخۆشی تر لەگەڵ نەخۆشی سەدەفدا Concomitant diseases

**هەندێك نەخۆشی تر پتر لە سەدەف دا هەن وەك:**

١- جومگەسۆ (١٠-١٥ کەرەت پترە).

٢- نەخۆشی کرۆن Crohn's diseas ٤ جار پترە.

٣- نەخۆشی دڵ و بۆریەکانی خوێن cardiovascular diseases، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن hypertension و نەخۆشی شەکرە ٥ر١ کەڕەت پترن.

بەلام:

نەخۆشی جێگۆڕاو atopy و بیرۆی جێگۆڕاو atopic dermatits و لیردەرکردن urticaria لەگەڵ سەدەف دا لە ئاسایی کەمترن. هەروەها تووشێنی بەکتریا و هەندێك ڤایرۆس هەر کەمترن.

### نائاساییەکانی تاقیگە Abnormal laboratory findings

زۆر کەم و ناگرنگن، ئەمانەن:

١- بەرزبوونەوەی ڕێژەی ترشی میزی uric acid و کەمخوێنی anemia یەکی سووك هەیە.

٢- هاوسەنگی نایترۆجینی نەری negative nitrogen balance.

٣- پتربوونی ئیمیونۆ گلۆبیولین Ig جۆری A و ئاوێتەی بەرگری immune complexes و ماکرۆگلۆبیولین ئەلفا ٢ ∝ 2 macroglobulines.

### نموونە وەرگرتن

ئەمانەی تێدایە:

١- دەوری قرچەکاژی parakeratosis ( واتا مانەوەی ناوك لە خانەی کاژی چینی کاژی دا).

٢- ئەستووربوونی نارێکی توێژ، بەلام تەنکبوونی لە ئاستی گۆی بن توێژدا dermal papillae، ئەمەش بە لابردنی کاژی سەر دەردەکان(بە کڕاندن بە نینۆك )دەردەکەوێت و ئەوسا خاڵی بچووکی خوێناوی بە چاو دەبینرێن ،ئەمەش پێی دەڵێن نیشانەی ئۆسپیتز Auspitz sign.

٣- دوومەڵۆکە (زووخاوۆکە)ی مونرۆ Munro micro-abscesses واتا بوونی خانەی پۆلیمۆرف (خڕۆکەی سپی).

٤- موولوولەی فراوانی لولخواردوو لە گۆی بن توێژدا.

٥- تەلینەوەی لیمفۆسایتی T لەسەرەوەی بن توێژدا.

## نیشانەکانی

وەك وتمان نەخۆشی سەدەف نەخۆشیەکی باوی درێژخایەنە و هەر دووبارە سەرهەڵدەداتەوە. یەکەمین دەردەکان وەك پەڵەی سووری بچووك دەردەکەون و هەر لەسەرەتاوە بە کاژی زیوی وشك داپۆشراون، دەردەکان بە کشانی بەرەو ئەم لاولاوە گەورە دەبن و یەك دەگرن.

کاژەکان چین لەسەر چینن micacious و پڕ لە ناوەڕاستی دەردەکان بە پتەوی بە پێستەوە نووساون، کە کاژەکانمان لابرد خاڵی خوێنی دەردەکەون (نیشانەی ئوسپیتز Auspitz sign)، سەدەف پتر ئەم شوێنانە دەگرێتەوە: پێستی سەر، لینۆك، ڕووی دەرەوەی پەلەکان، ناوك و دەوری ناوك و بڕبڕەی سمت sacral area، لە هەردوو لای لەش بە هاوسەنگی دەردێن و لەسەرخۆ دروست دەبن بەڵام لەوانەشە کتوپڕ لەسەر زۆربەی لەش دەرچن وەك جۆری دڵۆپەیی guttate psoriasis. هەندێك جار خوران و کزانەوەی لە گەڵدایە.







(وێنەی ١٢٤) نەخۆشی سەدەف (جۆری قوتکەیی).

## Common Types جۆرە باوەکان

١- جۆری قوتکەیی Plaque type:- لە هەموو جۆرەکان باوترە، دەردەکان بە زەقی سنووردارن (چەند ملیمێك تا چەند سانتیمەترێکن)، سوور یان پەمەیین، کاژەکانی سەریان گەورە و زیوی وشکی فرەگۆشەن، ئانیشك و ئەژنۆ و بڕبڕەی سمت و پێستی سەر پتر دەگرنەوە. (وێنەی ١٢٤)

٢- **سەدەفی چەورەبیرۆیی** Seborrhoeic like psoriasis:- هەندێك جار سەدەف و چەورەبیرۆ دەچنەوە سەریەك، دەردی وەك چەورەبیرۆكان پتر لە دەموچاو و ژێر مەمك و پێستی سەر و لۆچەكان flexures و ژێر باڵ دەردەكەون ، لەم شوێنانەدا تەڕ و سوورن و كاژەكانیان نەرم و چەور و زەردن و پێی دەوترێت ((چەورە سەدەف)) .(sebopsoriasis)



٣- **سەدەفی هەڵگەڕاوە** Inverse psoriasis زۆر جار تەنیا لەم شوێنانەدا سەدەف دەردەچێت و كاژی تێدا نییە بەڵام لێوارەكانی بە ئاشكرایی دیارن و ڕۆشنن، شوێنەكان: ژێر مەمك، ژێر باڵ لۆچەكانی كۆئەندامە سێكسیەكان، پشت گوێچكە، لێوەكان و نێوان پەنجەكان. لەوانەیە لە قووڵایی لۆچەكان دا درز دروستبێت، ئەم جۆرە پتر لە مێینە و پیر و نەخۆشی ئەیدز دا هەیە. (وێنەی ١٢٥)



**(وێنەی ١٢٥) نەخۆشی سەدەف (جۆری هەڵگەڕاوە).**

٤- **سەدەفی داییبی** Napkin psoriasis:- لە شوێنی داییی لە تەمەنی ٢-٨ مانگی دا بەشێوەی پارچەی ڕۆشنی سووری سنوور ئاشكرا دەرچێت و ئەوسا پترپش بۆ دەوروبەری شوێنی داییبی بڵاودەبێتەوە، زوو بە یەكجاری چاك دەبێتەوە بەڵام لە داهاتوودا هەندێكیان سەدەفی ئاسایی دەگرن. (وێنەی ١٢٦)



**(وێنەی ١٢٦) سەدەفی داییبی**

٥- **سەدەفی پێستی سەر** Scalp psoriasis:- سەدەفی پێستی سەر زۆر باوە، ناوچە ناوچە یان هەموو سەر تووشی دەبێت، زۆر جار هێڵی قژی سەر بۆ پێستە بێ مووەكەی دەوروبەری دەبەزێنێت بەڵام بە دەگمەن قژ دەڕووتێنێتەوە یان هەر قژ ناڕووتێنێتەوە. (وێنەی ١٢٧).



**(وێنەی ١٢٧) سەدەفی پێستی سەر**

٦- **سەدەفی دڵۆپەیی** Guttate psoriasis

پتر تووشی منداڵ و گەنج دەبێت (ژێر تەمەنی ٣٠ ساڵی). پتر لە ئەنجامی تووشبوونی ئاڵوودەکان یان قورگ بە بەکتریای سترێپتۆکۆکەس streptococcus دەردەچێت ، ژمارەیەکی زۆر دەردی وەك دڵۆپە باران ( قەبارەیان ٢-٥ ملم دەبێت) لەسەر قەد دا دەردەکەون و زوو کاژاوی دەبن، لەچەند مانگێك دا بە چارەسەر بە تایبەتی بە ت س و B بە ژەمی سوورکەرەوە erythema dose لەگەڵ ئەنتیبایۆتیك وەك دایفلۆکساسیلین difloxacillin نامێنێت. لە داهاتوودا هەندێکیان سەدەفی ئاسایيان تووشدەبێت. (وێنەی ١٢٨)



(وێنەی ١٢٨) سەدەفی دڵۆپەیی.

٧- **سەدەفی نینۆك** Psoriasis of nails

باوە بە تایبەتی: چاڵبوون Pitting، نینۆك شیبوونەوە onycholysis (واتا جیابوونەوەی پلێتی نینۆك لە دۆشەکەی نینۆك nail bed)، زێدە قۆچەکاژی ژێر نینۆك subungual hyperkeratosis، پەڵەی زەیتی oil spots و پارچەی پەمەیی salmon patches لەژێر پلێتی نینۆك دا. (وێنەی ١٢٩)





(وێنەی ١٢٩) سەدەفی نینۆك.

٨- **جومگەسۆی سەدەفی** Psoriatic arthritis:

نزیکەی نیوەی بارەکان HLA-B-27 یان هەیە و پێنج جۆرە:

١- گرتنەوەی ناجووتیسەکی assymetrical جومگەی نێوان پەنجەکانی سەر پەڕ



(وێنەی ١٣٠) جومگەسۆی سەدەفی.

distal interphalangeal joints لەگەڵ گرتنەوە و تێکشکانی نینۆکەکان لە دەست دا. (وێنەی ١٣٠)

٢- جومگەسۆی تێکدەر arthritis mutilans لەگەڵ توانەوەی ئێسکی osteolysis (ئێسکی پەنجەکان و پشتی دەست).

٣- ئێسکەسۆی چوونیەکی symmetrical وەك جومگەسۆی باداری "ڕۆماتیزمی جومگەکان" rheumatoid arthritis لەگەڵ دەستی چنگی claw hands.

٤- کەم جومگە سۆیی وەك یەك یان چەند جومگەیەکی دەست لەگەڵ ئاوسان.

٥- بڕبڕەسۆی پێکەوەلکان ankylosing spondylitis.

٩- سەدەفی کێمی بڵاو (گشتی) Generalized pustular psoriasis (Von Zumbusch)

پێش ئەوەی ئەم جۆرە دەربکەوێت نەخۆشی سەدەفی قوتکەیی plaque psoriasis و زۆرجار جومگەسۆی سەدەفی هەبووە و ئەوسا جۆری کێمی دەردەکەوێت بەڵام لەوانەشە سەدەفی کێمی لەسەرەتاوە بۆ خۆی بێتە کایەوە. (وێنەی ١٣١)







(وێنەی ١٣١) سەدەفی کێمی بڵاو.

بە کتوپڕی بە دروستبوونی کێم لە دەوری نینۆکەکان، بەری دەست و لە لێواری قوتکەی سەدەف دەست پێدەکات، سووربوونەوە لە لۆچەکاندا ڕوودەدات ئەوسا سووربوونەوە هەموو پێست دەگرێتەوە و پیزۆکەی پڕ دروستدەبن، خوران و کزانەوەی بە تەوژم زۆرە، لێوەکان سووردەبنەوە و کاژ دروستدەکەن و چاڵەبرینی ڕوکەشی لە زمان و ناودەم دەردەچێت و زمانی درزاوی زۆر باوە.

نەخۆش زۆر بێ هێزە و تای هەیە (٣٩-٤٠س°)، پێستە سووری erythroderma، کەمی کالسیۆم لە خوێندا hypocalcaemia، لاوازبوون، هەندێك جار سیەسۆ pneumonia و سستی دڵ congestive heart failure ڕوو دەدەن.

زۆر جار ئەم جۆرە ڕوودەدات:

١- دوای بڕینی ستیرۆیدی سیستمی systemic corticosteroids.

٢- بەکارهێنانی دەرمانی ئایۆدایـد iodides، تێربینافین، ماینۆسایکلین و هایدرۆکسی کلۆرۆکوین - تاد.
٣- دوای سەدەفی کێمی دەست و پێ.

١٠- **سەدەفی کێمی بازنەیی Annular pustular psoriasis**:- دەگمەنە، لەگەڵ سەدەفی کێمی بڵاو یان لەگەڵ سەدەفی ئاسایی دەردەچێت، پێست بەشێوەی موستیلەیی سووردەبێتەوە و پیزۆکەی لەسەر دروستدەبێت.

١١- **سەدەفی کێمی سنوردار Localized pustular psoriasis**

دوو جۆری هەیە:

أ) پەلەپێستەسۆی بەردەوام Acrodermatitis continua

دەگمەنە(وێنەی ١٣٢)، برتییە لە دەرهاتنی پیزۆکەی پاکژ sterile لە پەنجەی دەست و پێ و لەسەر خۆ بەرەو سەر دەکشێت و دەبێتە هۆی تێکشکاندنی نینۆك و پوکانەوەی پلی پەنجەی ئەوپەڕ distal phalanx و لەوانەیە بۆ سەدەفی کێمی بڵاو بگۆڕێت.




(وێنەی ١٣٢) پەلەپێستەسۆی بەردەوام.

ب) پیزۆکەیی بەری دەست و پێ Palmoplantar pustulosis:- دەگمەنە، تەمەنی ٢٠-٦٠ ساڵی و مێینە پتر لە نێرینە (١:٣) دەیگرێت. لە ١٠٪ی نەخۆشەکان دا سەدەفی ئاسایی لەگەڵیدا هەیە و هۆکەی نەزانراوە، نیشانەکانی بریتین لە دەرهاتنی پیزۆکە (٢-٤ ملمی) و کۆمەڵێك لەم پیزۆکانە لە ماوەی چەند کاتژمێرێك دا لەسەر پێستی ئاسایی بەری دەست و پێ دەردەکەون و هەر پیزۆکەیەك لە دوایی دا بە بازنەیەکی سووربووەوە دەوردەدرێت، بەدەگمەن پشتی دەست و پێ دەگرێتەوە. (وێنەی ١٣٣)




(وێنەی ١٣٣) پیزۆکەیی بەری دەست و پێ.

که پیزۆکەکان کۆن بوون ڕەنگە زەردەکەیان دەبێت بە قاوەیی تاریك و لەماوەی ٨-١٠ ڕۆژدا وشکدەبنەوە و فڕێدەدرێن، دوای چەند حەفتە بۆ چەند مانگ دیسان شەپۆلێکی تر دەست پێدەکاتەوە بەڵام جار بەجار ژمارەیان کەمدەبێتەوە.

هەردوو دەست و پێ دەیگرن و لەوانەیە کەمێك خوران و کزانەوەی لەگەڵدابێت، دوای هەر شەپۆلێك پێستی بەری دەست و پێ بە سووری و زێدە قۆچەکاژی دەمێنێتەوە. ئەم نەخۆشیە زۆر جار ئێسکەسۆی osteomyelitis لەگەڵدایە.

١٢- **پێستە سووریی سەدەفی** Psoriatic erythroderma:- بریتیە لە بڵاوبوونەوەی سەدەفی ئاسایی بۆ هەموو پێست (هەرچەندە لەوانەیە چەند پەڵەیەك پێستی ئاسایی توشنەبوو هەر هەبێت). پێست سووربۆتەوە و کاژی سەدەف کەمترە، ئەم بارە دروستدەبێت لە ئەنجامی: (وێنەی ١٣٤)

١- بەکارهێنانی کرێم و مەرهەمی وروژێن وەك قیر tar، ئەنثرالین anthralin و ت س و B.

٢- گۆڕانی سەدەفی کێمی بڵاو بۆ پێستەسووریی سەدەفی.

٣- تووشێنی بەکتریا، کەمبوونی ڕێژەی کالسیوم لەخوێن دا، بڕینی ستیرۆید و تێکچوونی دەروونی.

(وێنەی ١٣٤)
**پێستەسووریی سەدەفی.**

١٣- **ناگرەی تامیسکی** Impetigo herpetiformis بریتیە لە سەدەفی کێمی بڵاو لە سکپڕدا. لە سەرەتادا سووربوونەوەی لۆچەکان ڕوودەدات لەگەڵ دەرهاتنی پیزۆکە لەسەری ،ئەوسا بۆ هەموو پێست بڵاودەبێتەوە لەگەڵ ژەهراویبوون toxicity (( واتا لەرز و تا، لاوازی و فرەبوونی لیوکۆسایتەکان leukocytosis)).

## چارەسەر

هەرتاکە کەسێك کە نەخۆشی سەدەفی هەبێت دەبێت بە پێی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت. چارەسەرکردن پشت دەبەستێت بە: تەمەن، ڕەگەز، پیشە، کەسایەتی، باری تەندروستی، ژیری، باری ئابووری، جۆری سەدەفەکە و ماوەکەی و ڕووبەری توشبوو و شوێنی پێستی توشبوو. دڵدانەوەی نەخۆش و پشتگیریکردنی باری دەروونی گرنگن . ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستیە ،کە نەخۆشیەکە ناگوێزرێتەوە و دەتوانن منداڵیان ببێت و لە کارەکەی (پیشەکەی) بەردەوام بێت پیویستە، نابێت چارەسەرەکە لە نەخۆشیەکە بە ئەرکتر و زیان بەخشتربێت،

تێگەیاندنی نەخۆش بۆ دوورکەوتنەوە لە هۆ وورووژێنەکان و ماندووبوونی دەروونی و لەشی و کەڵکی تیشکی خۆر و ناگرنگی جۆری خواردن، ئەمانە بۆ نەخۆش شی دەکرێنەوە.

**بەپێی جۆری سەدەف چارەسەرەکە باس دەکەین**

١- **جۆری قوتکەیی** Plaque psoriasis و جۆرە بەگرفتەکان

چارەسەری جێیی local therapies: ئەگەر ڕووبەرێکی وا توشبووبوو کە بە کەڵکی کرێم و مەرهەم بێت ئەوە یەك یان چەند لەمانەی خوارەوە هەڵدەبژێرین:

١- کۆرتیکۆستیرۆیدی جێیی Local corticosteroids بۆ شوێنی سنووردار، ستیرۆیدی سووك و مام ناوەندی ڕۆژی ١-٢ جار بەکار دێنین.

٢- ترشی سالسیلیك salicylic Acid ٢-١٠٪ لە ناو ڤازیلین یان نەرمکەرەوەکانی تر emollients یان لەگەڵ ستیرۆیدەکان دا، ئەمە بە ئاسانی کاژەکان لادەبات.

٣- هاوتاکانی ڤیتامین D vitamine D analogues: وەك کالسیتڕایۆل calcitriol، تاکالسیتۆڵ tacalcitol و کالسیپۆتریۆل calcipotriol بە کریم یان مەرهەم.

٤- خۆدانە بەر خۆر sun exposure.

٥- ئەنثرالین anthralin: ڕێژەی ١ر٠٪ تا ٢٪، ڕۆژی ١٠-٣٠ خولەك و ئەوسا لادەبرێت.

٦- قیری خەڵوزی coal tar.

٧- تازارۆتین tazarotene.

ئەگەر بەمانەی سەرەوە کۆنترۆڵ نەکرا یان نەخۆش گرفتی تووشبوو ئەوسا ئەمانەی خوارەوە بەکاردێنین:

١- ت س و B، ت س و B تەسك 311 nm narrow band یان پۆڤا PUVA.

٢- ئەسیتڕێتین acitretin.

٣- میثۆترێکسەیت methotrexate، سایکلۆسپۆرین cyclosporin.

٤- ئەدالیموماب adalimumab، ئەلیفاسێپت alifacept، ئیفالیزوماب efalizumab، ئیتانێرسێپت etanercept یان ئینفلیکسیماب infliximab.

بۆ هەندێك باری یاخی لە چارەسەر یان شوێنی تایبەتی تووشبوو یەك یان هەندێك لەمانەی خوارەوە بەکار دەهێنرێن:

١- کرێمی پێنج فلورۆیوراسیل 5-fluorouracil.

٢- کرێمی پرۆپیل ثایۆیوراسیل topical propyl thiouracil.

٣- تێزاندنی intralesional 5FU.

٤- کۆکردنەوەی چەند چارەسەرێك بەیەکەوە combined therapy.

٥- سەلفاسالازین sulfasalazine، مایکۆفینۆلەیت مۆفێتیل mycophenolate mofetil، هایدرۆکسی یوریا hydroxyurea، ٦-ثایۆگوانین 6-thioguanine ، ئازاثایۆپرین azathioprin، ئیستەری ترشی فیوماریك fumaric acid esters، کۆلچیسین colchicinو لەیزەری ئێگزایمەر excimer laser.

٢- سەدەفی چەورەبیرۆیی Seborrhoeic like psoriasis: **چارەسەری لە سەردا وەك سەدەفی سەر دەکرێت و لە لۆچەکان دا وەك سەدەفی هەڵگەڕاوە دەکرێت.**

٣- سەدەفی داییبی Napkin psoriasis:- ستیرۆیدی سووك mild وەك هایدرۆکۆرتیزۆن لەگەڵ گرنگیدان بە وشککردنەوەی شوێنی داییبی و چارەسەرکردنی بیرۆی ورووژێن و کاندیدا و بەکتریا، بەمەش لەماوەیەکی کەم دا کۆنترۆڵ دەکرێت.

٤- سەدەفی هەڵگەڕاوە Inverse psoriasis:- چونکە ئەم شوێنانە هەستیارن بۆیە چارەسەری تایبەتی دەوێت، ستیرۆیدی جێیی topical steroids دەبێت سوك mild بن و بۆ کاتێکی سنووردار بەکاربهێنرێن چونکە زیانی لاوەکییان لێدەکەوێتەوە، هاوتاکانی ڤیتامین D بەکەڵکن بەلاٌم کزانەوە دروست دەکەن لە بەرئەوە سووك کردنی لەگەڵ ڤازیلین بۆ دەکرێت یان ناوبەناو لەگەڵ ستیرۆید بەکاردەهێنرێن.

بۆ دەم وچاو ستیرۆیدی سووك یان هاوتاکانی ڤیتامین D بە تەنیا و لەگەڵ ستیرۆید، یان تازارۆتین بە تەنیا یان لەگەڵ ستیرۆید، تازارۆتین ڕۆژی ١-٥ خولەك کارەکەی وەك شەو تا بەیانی وایە.

٥- سەدەفی پێستی سەر Scalp psoriasis:- باشتر وایە شلە یان جێڵ یان کەف foams بەکاربهێنرێن نەك مەرهەم و کرێم، شامپۆکان کە ترشی سالیسیلیکی salicylic acid یان قیر و ستیرۆیدی تێدایە زۆر شیاون بەلاٌم کە کاژی پەستاوتراو و کەمڕەبەستوو هەبوو ئەوە مەرهەم کە ترشی سالیسیلیکی تێدایە حەفتەی ٣ جار بەکاردەهێنرێت و بە شامپۆی قیر دەشۆرێتەوە و هەندێك جار هاوتاکانی ڤیتامین D یان ستیرۆید بە شلە یان جێڵ بەکاردەهێنرێن و هەندێك جار لەژێر بەستن دا under occlusion.

٦- سەدەفی دڵۆپەیی Guttate psoriasis: دەرمانی دژە بەکتریا وەك پەنسیلین ڤ penicillin V یان ئیریثرۆمایسین یان دایکلۆکساسیلین dicloxacillin بەکاردەهێنرێن و چارەسەری جێیی سووك وەك مەرهەمی نەرمکەرەوە emulsifying ointment، زنك، ئیکثامۆڵ icthamol بە کرێم و هەندێك جار ستیرۆید و قیر بە مەرهەم یان ت س و B بەکاردەهێنرێن.

٧- سەدەفی نینۆک Nail psoriasis: چارەسەری سەدەفی پێست بە گشتی دەبێتە هۆی چارەسەری نینۆکەکان، بۆ نموونە ئەگەر میثۆترێکسەیت یان پوڤا یان سایکلۆسپۆرین یان ئەسیترێتین یان بایۆلۆجیکەکان biologics (وەك ئیتانێرسێپت) بەکارهاتن. بەڵام کە تەنیا سەدەفەکە نینۆك و دەوروپشتی گرتەوە ئەوە چارەسەری جێیی دەکەین بە:

١- دوای سڕکردن ستیرۆید بە تێچزاندن intralesional steroids .
٢- 5FUی جێیی.
٣- سایکلۆسپۆرینی جێیی.
٤- تازارۆتینی جێیی ١ر٠٪.
٥- کالیسپۆتریۆلی جێیی.

٨- جومگەسۆی سەدەفی Psoriatic arthritis :- پشوودان، هەڵبەستنەوە splinting، جوڵاندنی جومگەکان (بێ کاردانەوە passive movement)، نسایدس NSAIDs وەك ئایبوبروفێن، میلۆکسیکام - تاد بۆ ئازار لابردن و نەهێشتنی جومگە ڕەقبوون ئەوسا میثۆترێکسەیت، تاکرۆلیمۆس، بایۆلۆجیکەکان، ئازا ثایۆپرین و هەندێك جار پۆڤا + ئێترێتینەیت.

٩- سەدەفی کێمی بڵاو Generalized pustular psoriasis

١- لە نەخۆشخانە چارەسەر دەکرێت.
٢- هۆ وورووژێنەکان وەك قیرو ئەنثرالین لادەبرێن، ستیرۆیدە بەهێزەکان بۆ ستیرۆیدی سوك تر دەگۆڕێن، تووشێن infection بە ئیریثرۆمایسین یان فلوکلۆکساسیلین flucloxacillin چارەسەر دەکرێت. لەوانەیە لە سکپڕدا لەبەر بردن abortion یان منداڵبوونی پێش وەخت ئەنجام بدرێت.
٣- چارەسەرە گشتیەکان general measures: پشوودان لە نەخۆشخانە، دەرمانی ئارامکەرەوە و کرێمی جێیی سووك (emollients)، پلەی گەرمای ژوورەکە گونجاو بێت، شلە خواردنەوە بۆ هاوسەنگ کردنی شلە و خوێی لەش fluid & electrolyte balance.
٤- چارەسەری جێیی topical therapy :- کرێمی نەرمکەرەوە یان ستیرۆیدی سووك بەکار دەهێنرێن.
٥- چارەسەری سیستمی (سەراپایی) systemic therapy:-

میثۆترێکسەیت ٥ر٧-١٠ ملگم بە ڕێی خوێن، هەر ٥-٧ ڕۆژ جارێك لە دوایی دا ٢ر٠-٤ر٠ ملگم/کگم بۆ یەك حەفتە، هەندێك جار داپسۆن ٥٠-٢٠٠ملگم/ ڕۆژ، لە

بـاری زۆر ترسـناك دا لەگـەڵ میثـۆترێکسـەیت دا پریـدنیزۆلۆن prednisolon ۳۰-
٤٠ملگم/ ڕۆژ بۆ ماوەیەکی زۆر کورت بەکاردەهێنرێت.

هەنـدێك جـار ئەسـیترێتین acitretin یـان ئێترێتینـەیت etretinate ٥ر٠ ملگـم-١ ملگم/ کگم/ڕۆژ + پۆڤا بە ژەمی کەم low dose حەفتـەی ٣ جـار ئەوسـا وردە وردە ژەمەکان پتربکرێن. یان سایکلۆسپۆرین ٩-١٢ ملگم/ کگم/ ڕۆژ + سـتیرۆیدی جێیـی، دوایی ژەمەکە کەمبکرێتەوە.

١٠- سەدەفی کێمـی بازنـەیی Annular pustular psoriasis:- بـەپێی بارەکـەی وەك سەدەفی قوتکەیی یان سەدەفی کێمی بڵاو چارەسەر دەکرێت.

١١- سەدەفی کێمی سنوردار Localized pustular psoriasis

أ ) پەلەپێستەسۆی بەردەوام Acrodermatitis continua

١- پۆڤا بە بەکارهێنانی شـلەی میثـۆکسـالین بـە چـەورکردن لـەگـەڵ ت س و A حەفتەی ٢-٣ جار تا ٤٠ جار. پۆڤا بە بەکارهێنانی خەپلەی میـثۆکسـالین + ت س و A کەمتر کاریگەرە.

٢- ڕێتینۆیدەکان بەدەم بە تەنیا یان لـەگەڵ پۆڤا.

٣- ژەمی کەمی سایکلۆسپۆرین ٢٥ر١ ملگم/کگم/ ڕۆژ.

ب) پیزۆکەیی بەری دەستو پێ PPP وەك سەرەوە (أ) چارەسەر دەکرێت.

١٢- پێستەسووریی سەدەفی Psoriatic erythroderma:- هـەر وەك سـەدەفی کێمـی بـڵاو چارەسەر دەکرێت.

١٣- ئاگرەی تامیسـکی Impetigo herpetiformis:- وەك سەدەفی کێمی بڵاو چارەسەر دەکرێت بەڵام دەرمانی سیستمی یەك لـە دووانە:

١- ستیرۆیدی سیستمی systemic steroids.

٢- سایکلۆسپۆرین ٤-٥ ملگم/کگم/ ڕۆژ، دوای منـاڵبوون یـان منـاڵ لـەبـەربردن ئەوسـا دەتوانین ڕێتینۆیدەکان یان میثۆترێکسەیت بەکار بهێنین.

**بۆ کەم کردنەوەی زیانەکانی چارەسەرکردن سێ ڕێگا لە چارەسەرکردن دا پەیڕەوی دەکرێن**

١- چارەسەرکردنی سووڕی Rotational therapy:- هەر ماوەیەك دەرمانێـك بـەکار دەهێنین بۆ چەند مانگێك و ئەوسا بۆ دەرمانێکی تر دەیگۆڕین (بۆ نموونـە ڕێتینۆیـدەکان ئەوسا میثۆترێکسەیت ئەوسا سایکلۆسپۆرین - تاد).

٢- چارەسەرکردن بە چەند دەرمانێك Combination therapy:- لـەیەك کـات دا چەند دەرمانێك بەیەکەوە بەکاردەهێنین بۆ ئـەوەی ژەمـی دەرمانـەکان کەمبکەینـەوە و

بەمەش ماکەکانیان کەمدەبنەوە، بۆ نموونە: چارەسەری جێیی + ت س و یان پۆڤا، ڕێتینۆیدەکان + UVB یان پۆڤا.

٣- چارەسەری دوا بە دوای یەك (ڕیزبەندی) Sequential therapy:- واتا چارەسەرکردن بە دەرمانێکی بەهێز تا نەخۆشیەکە لادەبات ئەوسا دەرمانێکی سوکتر بۆ بەربەستکردنی هەڵدانەوەی نەخۆشیەکە بەکاردێت بۆ نموونە بەکارهێنانی سایکلۆسپۆرین تا سەدەفەکە نامێنێت و ئەوسا ڕێتینۆید + ت س و بەکاردەهێنرێت، یان ستێرۆیدی جێیی بەهێز بەکاردێت دواتر سووك تر، یان کاتی نێوان ژەمەکان درێژتر دەکرێتەوە.

## پێستەسووری ( پێستەسۆی کاژەوەری ) Erythroderma (Exfoliative dermatitis)

بریتیە لە سووربوونەوەی هەموو پێست و کاژ فڕێدان، هەندێك جار چەند پارچەیەك پێستی ئاسایی (سوورنەبووەوە) دەمێنێتەوە، خورانی زۆرە و تا و لەرزی لەگەڵدایە و ئەگەر چارەسەر نەکرێت تووشێنی دووەمی بەکتریایی ڕوودەدات.


(وێنەی ١٣٥)
پێستەسۆی کاژەوەری.

ماکەکان complications بریتین لە تووشێنی بەکتریا و پیسبوونی پێست و خوێن، سستی دڵ جۆری بەرز دەرچوو high output Heart failure، کۆنیشانەی دژواری هەناسەیی باڵقی adult respiratory distress syndrome و کۆنیشانەی دەلاندنی لوولەیی capillary leak syndrome. ڕێژەی مردن دەگاتە ٧٪. (وێنەی ١٣٥)

زۆربەی نەخۆش گرێ لیمفەکانیان گەورە دەبن lymphadenopathy و هەروەها سپڵ و جگەریش گەورە دەبن، کە نەخۆشیەکە زۆر مایەوە ئەوە پێست پتەو و ئەستوورتر دەبێت و دەبێتە هۆی هەڵدرانەوەی پێڵووی چاو ectropion و نەمانی مووی سەر و پێست، نینۆکەکان ئەستوور دەبن و لەوانەیە بکەون، ڕێکخستنی پلەی گەرمای لەش تێکدەچێت و ونبوونی گەرمای لەش دەبێتە هۆی هەڵلەرزین. ئاوسانی لەش، دڵەکوتێ، کەم خوێنی، ئارەقەکردنەوە و وشکبوونەوە و ونبوونی پرۆتینی لەش و ترشی فۆلیك folic acid لەگەڵ کاژەکان دا و هاوسەنگی نایترۆجینی لەرێی (ناهاوسەنگی نایترۆجینی) negative nitrogene balance ڕوودەدەن.

## هۆكارەكان

أ ) نەزانراو (ڕێژەی ٢٥٪).

ب) زانراو وەك:

١- نەخۆشی پێست: وەك سەدەف، بیرۆ (وەك بیرۆی جێگۆڕاو) atopic dermatitis یان بیرۆكانی تر.

٢- شێرپەنجەی لیمفوما و خوێن.

٣- دەرمان وەك ئالْتون، جیوە، ئەمینۆفلین، ئەسپرین، بەكتریم، فێنیتۆین، لیثیۆم - تاد.

٤- نەخۆشی بلْقی كاژی pemphigus foliacious.

٥- نەخۆشیە بۆماوەییەكان وەك نەخۆشی ماسی و كاژەسووریێ موویی .P.R.P.

٦- هەندێك نەخۆشی تر وەك پانەپێستە ستووری .L.P، كەرووی پێست، گەڕی قەتماغەیی و پێستەماسولكەسۆ dermatomyoscitis.

٧- ئەیدز، تووشێنی میكرۆب وەك كۆنیشانەی SSSS (پێستە سووتاوی ستافیلۆكۆكەسی) و سفلسی زگماكی.

٨- نەخۆشی سەراپایی systemic diseases وەك نەخۆشی ڕایتەر Reiter' disease و جگەرسۆ hepatitis.

## چارەسەر

١- وا باشترە لە نەخۆشخانە چارەسەربكرێت (وە هۆكەی بە پشكنین بدۆزرێتەوە)، پلەی گەرمای ژوور لەبار بێت و خواردن و خواردنەوەی باشی بدرێتێ، ئاو و پرۆتین و ئیلێكترۆلایت هاوسەنگ بكرێنەوە.

٢- هۆكارەكەی لابرێت یان چارەسەربكرێت، وەك هۆی دەرمان - تاد.

٣- بەكارهێنانی ئیمۆلْیانت (نەرمكەرەوە) یان ستیرۆیدی سوك.

٤- ئەسیترێتین، سایكلۆسپۆرین و میثۆترێكسەیت چارەسەری بەكەلْكن.

٥- جگە لە سەدەف هەندێك جار ستیرۆیدی سەراپایی لە باری تایبەت دا بەكار دەهێنرێت.

## كۆنیشانەی ڕایتەر Reiter syndrome

**ڕایتەر:** پیاوێكی نازی تاوانباربوو كە لێپرسراوی نەزۆك كردنی خەلْكی بوو و هەلْدەستا بە بەدواداچوونی دۆزینەوەی پێكوتەی vaccin تایفەس typhus كە سەدەهای پێ كوشت.

ئەم نەخۆشیە جگە لە تووشبوونی پێست سێ نیشانەی هەیە:

١- میزه جۆسۆ Urethritis ( به بەکتریا بەلام له دوایی دا بێبوونی بەکتریا) لـه دوایـی دا میزەڵدانەسـۆ و سـۆی پرۆسـتات و تۆواودانەسـۆ یـان چـاڵه برینـی کیلـەك seminal vesiculitis .vulva



(وێنەی ١٣٦) نەخۆشی رایتەر (چووکەسۆی بازنەیی).

٢- پێڵووپۆشەسۆ Conjunctivitis.

٣- جومگەسـۆی ناچـونیەکی Assymetrical .arthritis

گرتنەوەی پێست به شێوەی دەرهاتنی دەردی کێمی یان قەتماغـەیی زێده قۆچەکاژی لـەسەر ئەندامه سێکسیەکان یان بـەری دەسـت و پێ دەردەچێت، گرتنەوەی پۆپەی چووك لـه ٢٥٪ ی نەخۆشەکان دا هەیـه (چووکەسـۆی بازنـەیی circinate balanitis وینەی١٣٦ ) له بەری دەست و پێ دا پێـی دەڵـێن کاژەئەسـتوورێی چـلْمدەڵێن keratoderma blenorrhagicum (وینه١٣٧). نـاودەم و مەلاشـوو و زمـان دامـاڵینی ڕووکەشـی superficial erosions سووریان لێ دێت، هەروەها نینۆك تێکدەچێت.

ئەم نەخۆشیه دوای میزەجۆسۆ یان سکچوون دەردەچێت.

پتر تووشی پیاوی گەنج دەبێت که هەڵگری $HLAB_{27}$ بێت و ڕێژەی خڕۆکـەی سپی خـوێن بەرزدەبێتەوه leukocytosis لەگەڵ تێکڕایی نیشتنی خڕۆکەی سوورESR .





(وێنەی ١٣٧) نەخۆشی رایتەر (کاژەئەستوورێی چلمدەڵێن).

**چارەسەر**

پێسـت بەسـیتڕۆیدی جێـی چارەسـەر دەکرێـت، ئەگـەرنا بـه ئەسیترێتین یان سایکلۆسپۆرین.

دژه بـــــەکتریا وەك دۆکسیسایکلین بەکار دەهێنرێت.

بـۆ جومگـەکان نسـایدس NSAIDs ، ئینفلیکسـیماب infliximab یان میثـۆترێکسەیت methotrexate بـــەکار دەهێنرێن.

# بــيــرۆ Eczema

بيرۆ جۆرێكــه لــه پێستەسـۆ dermatitis و ڕێـژەی ٢٠٪ی نەخۆشـی پێسـت كـه دێـن بـۆ نەخۆشخانە بيرۆكانن، بيرۆ لـه وشەی ئەكزيما eczema ی یۆنانی بەمانای كوڵان واتا بلۆقی بچووك وەرگیراوە.

**نیشانەكانی بیرۆ بە شێوەیەكی گشتی٣ قۆناغن**

١- قۆناغی تیژ *Acute*: دەڵێنەر و قەتماغەییە و بلۆق و بڵقی تێدایە، سووربوونەوە و تەنۆچكە و ئاوسان هەن و لێوارەكانی نادیارن، هەندێك جار كاژاویە.

٢- قۆناغی ژێرتیژ *Subacute*:- دەلاندن و قەتماغە كەمترن، هەندێك بلـۆقی بچـووك لەگـەڵ سووربوونەوە و ئاوساویەكی كەم هەن، بەڵام لە جۆری تیژ ئەستوورتر و كاژاوی ترە.

٣- قۆناغی درێژخایەن *Chronic*:- ئاو و تەڕی زۆر كەمن یان هەر نـین، بـەڵام ئەسـتوربوون و كاژكردن و درز و تۆخبوون و هەندێك جار قووڵترو تۆختر بوونی هێڵەكانی پێست هەن.

دوو جۆری سەرەكی هەن:

أ ) بیرۆی دەرەكی Exogenous eczemas.

ب) بیرۆی ناوەكی Endogenous eczemas.

أ ) **بیرۆ دەرەكیەكان**، ئەم جۆرانەی خوارەوەن:

١- پێستەسۆی ورووژێن (ورووژاو) Irritant dermatitis:- كاردانەوەیەكی سۆییە لە پێست دا و دەبێتە هۆی هەڵتۆقیوی eruption لە ئـەنجامی بەركـەوتنی پێسـت بـە مـژادی ورووژێـن، لـە زۆربەی خەڵكی دا هەستیاركردنی تێدا نییە، مەرجەكانی:

١- چونكە جۆری هەستیاری نییە یەكەم بەركەوتن دروستی دەكات.

٢- لە زۆربەی یان هەموو كەسێك دا ڕوودەدات.

٣- چڕیەكی پێویست لە مژادی ورووژێنەكە دروستی دەكات.

٤- پێستەسۆكە لەچەند خولەك تا چەند كاتژمێر دوای بەركەوتنی مژادەكە دروست دەبێت.

٥- باری پێست لەكاتی بەركەوتنەكەدا ڕۆڵی هەیە بۆ نموونە:

أ ) پێستی خوساو یان تەڕ بە چڕیەكی كەمتری ورووژێن تووشـی دەبێـت (زووتـر و پـتر ڕوودەدات).

ب) گەرما و سەرما و پەستان و لێـخشاندن یارمەتی دروستبوونی دەدەن.

جـ) پێستی وشك كەمتر تووشی دەبێت (چـڕی ورووژێـن دەبێـت پـتر بێـت یـان كـاتی بەركەوتن درێژتر بێت).

د ) پێستی ئەستوور كەمتر دەیگرێت.

ئازار و خوران یان کزانەوە لە جۆری ورووژێن باوترن نەك لە جۆری هەستیاری، ئەم جۆرە پێستەسۆیە زۆر جار جۆرێکە لە سووتانی کیمیکی بۆ نموونە سووتان بە ترشی نایتریك (تێزاب) یان مژادی کیمیکی تر و نیشانەکانی وەك یەك نین، جاری وایە وەك سوتان ٤ پلەی هەیە، جاری واشە کەمێك سووربوونەوە و کزانەوەیە، هەندێك جار بلۆق و بڵق یان ئاوسان و سووربوونەوە یان وشکبوونەوە دوای ماوەیەك، بە پێی مژادی ورووژێن و ماوەی بەرکەوتن و باری پێست، ڕوودەدەن.

ئەو مژادانەی دروستی دەکەن یەکجار زۆرن، چەند نموونەیەك باس دەکەین:

١- **تفتەکان** Alkalies:- وەك سابون، تاید، مژادی سپیکەرەوە، فاست، زاهی و دەسڕی کاغەز، تفتەکان بەچڕی بەرز بەهێزن و کەسوتان ڕوویدا خێرا بە ترشێکی دژی هاوسەنگی دەکەین، بۆ نموونە شلەی ترشی هایدرۆکلۆرین ٥ر٠٪.



(وێنەی ١٣٨ أ) سووتان بە سۆدیۆم

مژادە بنەڕەتییەکانی ئەمانەی سەرەوە بریتین لە: سۆدیۆم، پۆتاسیۆم، ئەمۆنیۆم و هایدرۆکسیدی کالسیۆم. (وێنەی ١٣٨ أ،ب)

بیرۆی دەست کە بە زۆری لە ژنان دا هەیە جۆرێکە لەوەی باسمان کرد. سەلفایدی تفتی بۆ موولابردن زۆر دروستی دەکات، پلاستەر جاری وایە سووتانی توند دروست دەکات.



(وێنەی ١٣٨ ب) سووتان بە تفت.

٢- **ترشەکان** Acids:- ترشە بەهێزەکان خۆرەی پێستن بەڵام لاوازەکان وشککەرەوەی پێستن. بۆ نموونە ترشی هایدرۆکلۆریك سووتانی ڕووکەشی بەشێوەی بڵق دروست دەکات بەڵام ترشی گۆگرد sulfuric acid و نایتریك سوتانی قووڵ دروست دەکەن. ترشی ئۆگزالیك oxalic acid سەری پەنجەکان سڕ دەکات و شینی هەڵدەگەڕێنێت و دەبێتە هۆی گانگرین (= لاڕەشە) و بە شیر milk هاوسەنگ دەکرێت. (وێنەی ١٣٩)

ترشی هایدرۆفلۆریك hydrofloric acid شووشە دەتوێنێتەوە و کە بەر پێست کەوت بڵق و چاڵە برین و دارزانی شانەی پێست دروست دەکات.



(وێنەی ١٣٩) سووتان بە ترش

فینۆڵ (کاربۆلیك ئەسید) کە بۆ جوانکاری پێست بەکار دەهێنرێت پێست سپی هەڵدەگەڕێنێت و قووڵ دەچێتە ناو

پێست و لەوانەیە بۆ ناو خوێن هەڵبمژرێت و گورچیلە دابرزێنێت و لێدانی دڵ تێک بدات، بە ئەلکهول (ئیثانول ٦٥٪) هاوسەنگ دەکرێت.

**چارەسەری ئەوانەی سەرەوە:-**

زۆر ئاوی پێدا بکرێت و تفتی لێ بدرێت وەك بیکاربۆناتی سۆدیۆم، هایدرۆکسیدی کالسیۆم یان سابون.

٣- **پێستە سۆی ئەیرباگ** Air bag dermatitis:- لە ڕووداوی ئۆتۆمۆبیل دا ئەیرباگ دێتە دەرێ و دەئاوسێت و چەند مژادێك وەك بۆدرەی تالك، هایدرۆکسیدی سۆدیۆم و کاربۆناتی سۆدیۆم فڕێ دەدات، ڕووشاندن و سوتانی لێخشاندن و گەرمی و کیمیکی دروست دەکات.

**چارەسەری:** ستیرۆیدی جێیی بەلاّم لە سوتانی قووڵدا پاك کردنەوە و متوربەی پێستی دەوێت.

٤- **ورووژێنی تر:** وەك: خوێی کانزاکان بۆ نموونە: سیانایدەکانی کالیسیۆم و مس و جیوە و نیکڵ و زیو و زنك، یان کلۆریدەکانی کالسیۆم و زنك یان برۆمین، کلۆرین، فلۆرین، ئایۆدین، یان مێرووکوژەکان insecticides کە فۆسفاتی دوو مەثیلی دوو کلۆرۆ فەنیلی تێدایە کە بە بۆدرە بۆ دوورخستنەوە و کوشتنی مێش دەرشێنرێت، لەوانەیە ئەمانە هەموویان پێستەسۆی ورووژێن دروستبکەن.

٥- **پێستەسۆی فایبەر گلاس (شووشەی ڕیشاڵی)** Fiberglass dermatitis:- دڕکە بچووکەکانی فایبەر گلاس دەچەقنە ناو پێست و تەنۆچکەی سوور و خوران و جێ خوران دروست دەکەن و جاری وایە وەك سۆی سەلکە مووەکان یان جێ مێروو گەستن یان گەڕی دەردەکەوێت.

چارەسەری خێرا شۆردنە بە ئاو. پێش بەرکەوتنی فایبەرگلاس بەکارهێنانی بۆدرەی تالك پێست لووس دەکات و ناهێڵێت دڕکەکان بچنە ناو پێست.

٦- **تۆز** Dust:- وەك تۆزی تەختە (لە دارتاشەکان دا)، توتن، یان تۆزی زنك و زەرنیخ (مەرگەمووش) یان تۆزی ئەلجامی تەقینەوە، ئەم تۆزە بەتایبەتی کە پێست تەڕ بێت یان ئارەقی کردبێتەوە ورووژێنە.

٧- **کەپسایسین** Capsaisin:- لە بیبەری توون (تیژ) دا هەیە و دەست دەورووژێنێت، پۆلیس بەشێوەی سپرای spray بەکاری دەهێنێت و لەوانەیە سووتانی قووڵ دروستبکات.

**چارەسەری:** چونکە ئاو بەکەڵك نایەت ،ترشی ئەسیتیك ٥٪ یان دژە ترشی بۆ نەخۆشی گەدە وەك مالۆکس maalox لە کەمتر لە کات ژمێرێك دوای بەرکەوتن بەکەڵکە.

٨- **پێستەسۆی گازی فرمێسکرێژ Ear gas dermatitis**

١- **فرمێسکرێژی کلۆرۆ ئەسیتۆ فینۆن** *Chloro aceto phenone*:- **بە چڕی دەبێتە هۆی پێستەسۆ و لەوانەیە دوای ٢٤-٧٢ کاتژمێر دەرکەوێت، سووربوونەوە و بلۆق و بڵق دروست دەبن. چارەسەری: شۆردنەوەی پێست بە شلەی بیکاربۆناتی سۆدیۆم و بۆ چاو دڵۆپەی ترشی بۆریك boric acid drops و جلەکان فڕێ بدرێن.**

٢- **گازی خەرتەلەی گۆگرد** Sulphur mustard gas:- **ناسراوە بە پیرایت yperite و لە جەنگی ئێراق ئێران بەکارهاتووە (لە هەڵەبجەش بەکار هاتووە)،ئەم گازە دەبێتە هۆی دروستبوونی سووربوونەوە و بلۆق و بڵق دروستبوون و دوای یەك حەفتە چاك دەبێتەوە و پێستی تۆخ جێدەهێڵێت، ئەگەر چڕیەکەی زۆر بێت پێست دادەماڵرێت و نەخۆشی ژەهرە توێژ دارزانەشیبوونەوە toxic epidermal necrolysis دروست دەکات ، زۆرترین شوێن کە دەیگرێتەوە شوێنە داپۆشراوەکانن بە جل و بەرگ کە ئارەقیان کردۆتەوە وەك ژێر باڵ و ناوگەڵ و کۆئەندامە سێکسیەکان. (وێنەی ١٤٠)**



**(وێنەی ١٤٠)**
**سووتان بە گازی خەرتەلەی گۆگرد.**

٣- **ماك** MAC:- **بریتییە لە تێکەڵەی گازی فرمێسکرێژ (کلۆرۆ ئەسیتۆفینۆن) لە ناو ترایکلۆرۆ ئیثان trichloroethane لەگەڵ چەند هایدرۆکاربۆنێك دا و وەك نەوت kerosene وایە و بە سپرا spray بۆ بەرگریکردن لە خۆ بەکاردێت، بۆ پێست وروژێن و هەستیارکەرە.**

**چارەسەری: جل گۆڕین، شۆردنەوە بە زەیت یان شیر، دوای ئەوە شۆردنەوە بە ئاوێکی زۆر.**

٩- **عازەبەی کلۆر** Chloracne:- **ئەو کەسانەی لە کارگەکانی دروستکردنی ئاوێتە کلۆرینکراوەکان chlorinated compounds کاردەکەن تووشی عازەبەی کلۆر دەبن.**

١٠- **هایدرۆکاربۆنەکان** Hydrocarbones:- وەك نەوتی خام، فیتەر و گازۆلین فرۆشەکان - تاد یان کارمەندی کارگەی وەبەرهێنەر تووش دەبن. خوران و سەلکەسۆ و عازەبە دروست دەبن.

١١- **توێنەرەوەکان** Solvents:- بۆ پاك کردنەوەی دەست لە چەوری بەکاردێن و پێستەسۆی درزاوی درێژخایەن دروست دەکەن و کە لە رێگای پێستەوە بۆ ناو خوێن هەڵبمژرێن دەبنە هۆی دەردەدەمار neuropathy و لیمفەبۆریەسۆ. (وێنەی ١٤١)



(وێنەی ١٤١) پێستەسۆی لێککەوتن بە توێنەرەوە.

١٢- **پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری** Allergic contact dermatitis:

بریتیە لە پێستەسۆ بەهۆی هەستیارکەرێك allergen کە پێشتر بەر پێست کەوتبێت، لێرەدا سەراپای بەرگری جۆری چوار ( واتا فرە هەستیاری گوێزراوەی خانەیی) cell mediated hypersensitivity رۆڵ دەبینێت.

ئەم جۆرە چەند مەرجێکی هەیە:

١. لە هەموو کەسێك دا روونادات بەلکو تەنیا لەوانە دایە کە بە مزادی تایبەتمەند هەستیارن.

٢. دەبێت پێشتر مژادەکە بەر پێست کەوتبێت یان چوبێتە ناو لەش، بۆ نموونە دەرمان بەدەم یان بەخوێن.

٣. لەوانەیە یەکەم جار بڕی مژادی هەستیارکەر زۆربێت بۆ هەستیارکردن بەلام جارانی دواتر بڕێکی زۆر کەمیش نەخۆشیەکە دروست دەکات.

٤. هەمیشە دەمێنێتەوە.

٥. لابردنی هەستیارکردنەکە بە پرۆسەی ناستیارکردن ناکرێت.

**چارەسەر:** ئەگەر رووبەرێکی کەم لە پێست تووشبووبوو ستیرۆیدی جێیی بۆ چارەسەری بەسە بەلام کە رووبەرێکی زۆر تووشی بووبوو ئەوە ستیرۆیدی سەراپایی systemic steroids لەگەل ستیرۆیدی جێیی بەکاردەهێنرێن (وە هۆکارەکەش دوور بخرێتەوە)) لەگەل دژە هیستامین.

## ئەزموونەکان tests بۆ فرەهەستیاری

ئەزموونی پارچە Patch test:-

بۆ دۆزینەوەی فرەهەستیاری بە مژادێك کە بەرپێست کەوتبێت یان بەری بکەویت (بۆ دۆزینەوەی هەستیارکەر allergen) بەکاردەهێنرێت. ئەگەر ئەنجامی ئەم ئەزموونە لەگەڵ مێژووی نەخۆشیەکە و نیشانەکانی بگونجێت کەڵکی لێ وەردەگیرێت (وێنەی ١٤٢أ،ب) . دژە زیندەرە تاکەکان individual Ag یان کۆمەڵێك دژە زیندەر بە پەتێکەوە (شریط) بەکار دەهێنرێن و لەسەر پێستی پشت یان قۆڵ دا دەلکێنرێن . مەرجە شوێنی ئەم پەتە پێستی ئاسایی (سۆنەکردوو) بێت، ئەوسا دوای ٤٨ کاتژمێر لادەبرێت بەڵام دوای ١٠ خولەك ئەوسا ٤ رۆژ ئەوسا ٦-٧ رۆژ (هەندێك جار) سەیر دەکرێت و بەم جۆرە دەخوێنرێتەوە:



(وێنەی ١٤٢أ) ئەزموونی پارچە



(وێنەی ١٤٢ ب)
ئەزموونی پارچە (کاردانەوە)

١- ئەزموون نەکراو (ئە – ن) not (N.T) tested.

٢- نەبوونی کاردانەوە(سفر) No (O) reaction.

٣- کاردانەوەی گومانلێکراو doubtful ± reaction ،کەمترین سووربوونەوە minimal erythema.

٤- کاردانەوەی لاواز+ weak reaction ، (سووربوونەوە و لەوانەیە تەنۆچکەش هەبێت) erythermatous and may be papular

٥- کاردانەوەی بەهێز ++ strong reaction، سووربوونەوە، ئاوسان و لەوانەیە بلۆقیش هەبێت erythematous, oedematous & may be vesicular.

٦- کاردانەوەی ئەوپەڕی بەهێز +++ extreme reaction ، سووربوونەوە و بلقییە erythematous & bullous .

٧- کاردانەوەی وورووژێنی (ك.و) IR = irritant reaction سووربوونەوەی سنووردار و بریقەدار و زەقبوونەوەی هێڵەکانی پێست sharply circumscribed with a : .glazed appearance & increased skin markings

٢- ئەزموونی دووبارەهەستیارکردن (بەکارهێنانی سەلمێنەر) *Provacation use test*

بۆ دڵنیابوون لە ئەنجامی ئەزموونی پارچەی موجەب (پۆزەتیف) مژادەکە لە پێستی ئاسایی بەشی ناوەوەی باسك forearm دەخشێنین (چەند جارێك لە ڕۆژێك دا بۆ پێنج ڕۆژ) بۆ دروستکردنی هەستیارکردن.

٣- ئەزموونی تیشکەپارچە Photopatch test

ئەم جۆرە بۆ دۆزینەوەی فرەهەستیاری کە پێویستی بە ت س و هەیە بۆ دروست بوونی بەکاردەهێنرێت بۆ نموونە بۆ سەلفۆن ئەمایدەکان sulfonamides و فینۆثایازینەکان phenothiazines. لێرەدا ئەزموونی پارچەی ئاسایی بۆ ٤٨ کاتژمێر دادەنرێت، ئەوسا ت س و A لێدەدرێت (٥-١٥ جول/م٢) و دوای ٤٨ کاتژمێریتر دەخوێنرێتەوە (وەك سەرەوە).

**شوێنەکانی پێست کە بەزۆری جۆرێکی تایبەتی فرەهەستیاری دەیگرێتەوە** Regional predilection

١- **سەر و مل:-** بە بەکارهێنانی بۆیەی قژ، سپرای قژ، شامپۆ، یان شلەی شەپۆلکردنی هەمیشەیی قژ تووشدەبێت، پێستی دەوروبەری قژ وەك گوێچکە و ناوچەوان و مل و دەموچاو پتر سووربوونەوە و ئاوسان و تەنۆچکەی لە پێستی سەر توشدەبێت. (وێنەی١٤٣)لەوانەیە پێستەسۆی بەردەوامی کونی گوێچکە بەهۆی دڵۆپەی گوێچکە دروست ببێت وەك نیومایسین کە بەشێکە لە پێکهاتەی



(وێنەی ١٤٣) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری بۆ بۆیەی قژ



(وێنەی ١٤٤) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری.

دڵۆپەی گوێچکە.

پێڵووی چاو ((ئاوسان و سووربوونەوە) بەهۆی بۆیەی نینۆکەوە تووش دەبێت چونکە نەخۆش هەندێك جار بە نینۆك دەستکاری پێڵووی چاوی دەکات، هەروەها پێوەلکێنی برژانگی دەستکرد، مژادی جوانکاری پێڵوو و ماسکارا و ئیسفنجی بۆدرە - تاد ئەمە دروست دەکەن(وێنەی ١٤٤)

. پێستەسۆی لێو و دەوروبەری بە هەویری (معجون) ددان دروست دەبێت کە مژادی تام خۆشکەرەکەی دروستی دەکات، جگە لەوەش مژادی جوانکاری لێو (ماکیاج) ئەمە دروست دەکات. بۆن perfumes سۆ لە گوێچکە و مل دروست دەکات.


(وێنەی ١٤٥) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری

سۆی گوێچکە بەهۆی نیکل (گوارە) دروست دەبێت.

تیشکەپێستەسۆی لێککەوتن بە دەرمان و ماکیاج و بۆن - تاد هەموو دەم وچاو و مل (وێنەی ١٤٥) (کە بە جل و بەرگ دانەپۆشرا بێت) بەشێوەی پیتی V (لە مل دا) دەگرێتەوە.


(وێنەی ١٤٦) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری قەد بە نیکلی ئاڵقەی پشتێن

٢- **قەد**: کەمتر تووش دەبێت، بەڵام رەنگی (بۆیەی) جلی ژێرەوە یان مژادی کاڵاکە لەوانەیە پێستەسۆ دروست بکات (وێنەی ١٤٦)، ژێر باڵ بە بۆنلابەر (معطّر) یان رەنگی جل و بەرگ سۆی تووشدەبێت.

لە باری بەکارهێنانی بۆنلابەردا، سۆ چاڵی سەرەوەی ژێر باڵ دەگرێتەوە، بەڵام سۆ بە رەنگی جل لۆچەکانی خوار چاڵەکە دەگرێتەوە، سوخمەی مەمکی ژنان بەهۆی مژادی سوخمەکە یان قولابی لاستیکی و کانزای سوخمەکە یان وایەرەکانی ناوەوەی پێستەسۆ دروست دەکات. (وێنەی ١٤٧)



(وێنەی ١٤٧) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری بۆ پێکهاتەی سوخمەی مەمك

٣- **مەچــەك:-** (وێنــەی ١٤٨)
مەچــەك بــەهۆی بازنــە و زنجیری سەعات کە نیکلیان تێدایــە تووشــی پێستەســۆ دەبێت و چەرم پێستەسۆی کرۆم دروست دەکات.




(وێنەی ١٤٨) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری مەچەك بۆ زنجیری سەعات (نیکل).

٤- **دەســت:-** مـڕادی یـەکجار زۆر پێستەســۆی دەســت دروست دەکەن، هەر پشتی دەست دەگرێتــەوە ئەوسا سەری پەنجە و نێوان پەنجەگان ، درەخــت زۆر دەســت و باسك تووشی پێستەسۆ دەکات، دەستکێشی نـایلۆن زۆر دروستی دەکات هەروەها کرێمەکانیش. (وێنەی ١٤٩)



(وێنەی ١٤٩) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری بۆ سیر.

٥- **سك:-** پڕ لاستیکی بەنەخوێن یان پشتێن دروستی دەکـات (لە ناو ناوقەد دا). (وێنەی١٥٠)



(وێنەی ١٥٠) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری کەمەر بۆ پشتێن.

٦- **ناوڕان:-** پڕ سەرەوەی ڕان و سمت بەهۆی ڕەنـگ (بۆیە) تووشی دەبێت، چووك بە کۆندۆم، کیلەك بە کرێم و کۆم بە دەسڕی کاغەز و کرێمی مایەسیری.

٧- **لاقەکان:-** بە گۆرەوی لاستیکی (کۆلۆن).

٨- **پێ:-** بەری پێ هەر وەك بەری دەست تووشی نابێت چونکە چینی کاژی ئەستوورە، لە بـەر ئـەوە هـەر پشتی پێ بە تایبەتی سەر جومگەکان توشی دەبێت، بەڵام ئەگەر ژێر پێ تووشی بوو ئەوە چاڵی ژێر پێ و نێوان پەنجەکان ناگرێتەوە. (وێنەی ١٥١)



(وێنەی ١٥١) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری پێ.

هەستیارکەرە سەرەکیەکان بـریتین لـە: کـەتیرەی لاســــتیکی rubber glues پـــێڵاو، ئایزۆسیانەتەکان isocyanates، بیوتایل فینـۆل فۆرمەڵدیهایـد (کـەتیرە) glue یـان پۆتاســیۆم

دایکرۆمەیت (پێستە خۆشکەر)، بۆیەی پێڵاو و گۆرەوەی بە دەگمەن پێستەسۆ دروست دەکەن. ئەنتیبایۆتیکی جێیی وەك کرێم کە نیومایسینی تێدایە یان دژە کەڕوو دروستی دەکات، تەنانەت ستیرۆیدی جێیی کەم جار دروستی دەکات.

## نیشانە کۆئەندامیەکان (سەرا پاییەکان) Systemic manifestations

زۆر باو نیە، کە کەسێك پێشتر بە هەستیارکەری جێیی فرەهەستیار بووبێت لە دوایی دا ئەم هەستیارکەرە بچێتە ناولەش بەشێوەی سەراپایی (دەم، هەناسە، بۆری خوێن)، لێرەدا پێستەسۆ لە جێگەی پێشتر کە مژادی هەستیارکەرەکەی بەرکەوتبوو ڕوودەدات و خێرا بۆ زۆربەی یان هەموو پێست بلاو دەبێتەوە. (وێنەی ١٥٢)



(وێنەی ١٥٢) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری. (لەخۆوە هەستیاربوون) لە پێستەسۆی وەستاندا.

**جۆری پێستەسۆکان:-**

١- **بیرۆیی** Eczematous:- لە پێستی بەرکەوتوو، بۆ نموونە پشتی دەست و بە لێککەوتنی دەست بۆ شوێنی تر وەك دەمو چاو، مل، پێڵوو - تاد، لەو شوێنەی دووەمیش بیرۆ دروست دەبێت چونکە مژادەکە بە دەستەوە دەگوێزرێتەوە یان وەك وتمان ئەگەر بە شێوەی سەراپایی چووە ناو لەش ئەوە زۆربەی یان هەموو پێست تووشی دەبێت.

**چەند نموونەیەك:-** نیکڵ nickle کە لە خشڵ jewelary و قژ و برژانگ شەپۆلکەرەکان curlers دا و لە قولاب و قۆپچە و کونی قەیتانی پێڵاو و مژادی ددان پڕکردنەوە و پارە و هەندێك جار لە خۆراك و ئاو دا هەیە، ئەم نیکلە پێستەسۆی بیرۆیی دروست دەکات.

هەروەها فۆرماڵدیهاید formaldehyde لە زۆر شتی چاوەڕوان نەکراو دا هەیە وەك: مژادی جیاکەرەوە (عازل)، بەرە و بەرماڵ و بەتانی، کاغەز، دەسری کاغەز، دوکەڵ، میکیاج، دەرمان، جل و بەرگ، سابون و کەفکەرەکان (پاکژکەرەوەکان) detergents.

هەروەها بەڵسەمی پیرو balsam of peru کە دوو بەشی پێکهاتەکەی بریتیە لە سینامیك ئەسید، سینامیل سینامەیت، بێنزایڵ بێنزۆوەیت، بێنزۆیك ئەسید، بێنزایڵ ئەلکهول و هیتریش، سێیەکەکەی تری کە پتر هەستیارکەری تێدایە بریتییە لە پولیمەری ئیستەرکراو، بەنزۆیك ئەسید

و سیناميك ئەسيد، ئەم بەڵسەمە لە میکیاج دا، دەرمانی جێیی، دەرمان بە کۆم، شلە و چیمەنتۆی ددان و بۆن و تام خۆشکەرەکان (خۆراك)دا بەکاردێت.

هەروەها لاستیکی rubber سروشتی و دروستکراو کە لە زۆر مژادی ڕۆژانە دا هەیە پێستەسۆ لە دەم وچاو ( بە هۆی ماکیاج )، کونی گوێچکە، دەوری چاو ( بە هۆی چاویلکە)، شوێنی سوخمەی مەمك و بەنەخوێن، دەست ( بە هۆی دەستکێش) و پێ ( بە هۆی پێلاو)و جومگەکان ( بە هۆی مژادی هەڵبەستنەوەی شکان) دروست دەکات، مژادە هەستیارکەرەکان بریتین لە ثایۆرام، کارباماتەکان، گوانیدینەکان، بەنزۆثایۆزۆڵەکان و پارافەنیلین دایئەمین.





(وێنەی ١٥٣)
هەڵتۆقیوی پێستەستووریی.

٢- هەڵتۆقیوی پێستەستووریی Lichenoid eruptions

ئەم جۆرە جێییە یان بڵاوە، هەستیارکەرەکان بەزۆری کانزان وەك ڕەنگی خاڵ کوتان ( وەك جیوە، پالیدیۆم، زیو، ئالتون، کۆباڵت، کرۆم و نیکل) پارافەنیلین دایئەمین، مینثۆل، بیبەر، ئەمینۆگلایکۆسایدەکان، درەخت ( واتا پریمیولا ئۆبکۆنیکا primula obconica)، کینین quinine، هایدرۆکسی یوریا، بێتا وەستێن β.blockers و دەرمانی دژە فێ. (وێنەی ١٥٣)

٣- سووربوونەوەی فرەشێوەیی Erythema Multiforme
وەك بەرکەوتنی تەختە، درەخت و دەرمانی جێیی.

٤- بەڵەکبوون (= پێست سپیبوون) Leukoderma:- پارافەنیلین دایئەمین، هایدرۆکینون، کاتیکۆلەکان، فینۆلەکان و مێرکەپتۆئەمینەکان.




(وێنەی ١٥٤) لیری بەرکەوتن.

٥- پەڵەخوێن Purpura: لاستیکی ڕەش، پارافەنیلین دایئەمین، بەڵسەمی پیرو، فایبەر گلاس و ئۆکسی کوینۆلین oxyquinoline.

٦- لیری بەرکەوت (بەرکەوتن) Contact urticaria:- (وێنەی ١٥٤)

به سێ شێوه دروست دەبێت:-

١- [illegible] هەر شوێنی لێککەوتنەکە بە یەکەم بەرکـەوتن تووشـی سـووربوونەوە و لـیر دەبێت.

٢- [illegible] بۆ دووەم یان پتر جار تووشی دەبێت و لەوانەیە جگە لە شوێنە بەرکەوتووەکە هەموو لەش تووشی لیردەرکردن بێت و لەوانەیە سەرئێشە و هەناسە سواری و چاو ولوت هەوکردن و دابەزینی پەستانی خوێنی لەگەڵ دا بێت.

٣- [illegible]

نموونەی هۆکارەکانی لیردەرکردن ئەمانەن : لاستیکی ڕەش ( وەك دەستکێشی دروسـتکراو لـە لاستیکی سروشتی)، سەوزە، گیا، ماسی، پەتاتە، بۆیەی قـژ، مـژادی مێشـکردن ( واتـا ئـەمۆنیۆم پێرسەلفەیت)، مێروو، ئارد، گۆشت، جگەری گا و مانگـا، مـۆز، دەرمـان، گێـزەر، ئاڵـەت، ئاوریشم، فۆرماڵدیهاید، گەنم و کرێمەکان – تاد.

لێـرەدا ئـەزموونی پارچـە patch test ی کـراوە open بـۆ دۆزینـەوەی هەسـتیارکەرەکە allergen بەکاردەهێنرێت. مژادەکە بۆ ٢٠-٣٠ خولەك لـە ڕووبـەری ١ سـم لـە پێسـتی باسـك forearm دەدرێت و چاودێری دەکرێت بـۆ بینینـی سووربوونەوە کە دەبێت بە لیر و ئاوسان.





(وێنەی ١٥٥) پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری ڕووەکی (ژەهری لاولاو).

چارەسەر:-

١- دوورخسـتنەوەی هەسـتیارکەرەکە (allergen).

٢- دژە هیستامین وەك هایدرۆکسـی زیـن بـە کەڵکە.

٣- ئەگـەر کاردانەوەکـە سـەراپایی بـوو (بڵاوبـۆوە) سـتیرۆیدی سـەراپایی بـەکار دەهێنرێت.

تێبینی:-

پێستەسۆی هەستیاری بە درەخت و گیا، سووربوونەوە و بلـۆق و بڵـق و ئاوسـان خـوران و کزانەوە لەو شوێنانەی گەڵای درەختیان یان گیایان بەرکـەوتووە دروسـت دەکـەن، لـە لاقـەکان دا بەشێوەی هێڵی نارێك و خاڵ و پەتی و ناشێوەیی دەردەچێت، گوڵ و درەختـی بەرسـێبەر و چـیمەنی حەوشە و درەختی باخی میوەکان و دارستانەکان – تاد لەوانەیە هەمووی لە هەندێك کەس دا ئەم نەخۆشیە دروست بکەن،(وێنەی ١٥٥) زۆر جار نەخۆشیەکە شێوەی هێڵی هەیە.

**تێبینیەکی تر:-**

**ئەم هەستیارکەرانە allergens زۆر جار دژە ژیندەری ناتەواون واتا لـە لـەش دا پێویستی بـە یەکگرتن لەگەڵ پرۆتین هەیە بۆ ئەوەی ببێت بە دژە ژیندەری تەواو و ئەوسا کاردانەوەی بەرگریەکـە ڕوودەدات و پێستەسۆ دروست دەبێت.**

### **تیشکەپێستەسۆ** Photodermatitis

**بریتییە لـە دروستبوونی بیرۆ بە بوونی تیشك، چونکە ئەم مژادانەی ئەم پێستەسۆیە بـەهۆی تیشکەوە ( درێژی شەپۆلی تیشکەکە بریتی یە لـە٢٨٠-٦٠٠ نم) دروست دەکـەن دەبـن بـە ورووژێن یان هەستیارکەر بە هۆی تیشکەکە (واتا بێ بوونی تیشك نەخۆشی دروست ناکەن).**

**جۆرەکانی**

١- **کاردانـەوەی تیشـکە ژەهـر** (Phototoxic reactions): **مـژادەکان کاردانـەوەی پێسـت بۆ ت س و و خـۆر پـتر دەکـەن و سـەراپایی بـەرگری لـەش وەگـەڕ ناکـەوێت. زۆربەری خەڵکی بە بوونی چڕی پێویسـت لـە مـژادە ورووژێنەکـە و شـەپۆلی پێویسـت لـە تیشکەکە بە یەکەم بەرکـەوتن تووشـی دەبـن، ئەم کاردانەوەیە جۆرێکە لـە سـووتان بـەخۆر،** مژادە تیشکەژەهرەکان ئەمانەن:



**(وێنەی ١٥٦) کاردانەوەی تیشکەژەهر (بۆ ڕووەك).**

١- قیر tar.

٢- درەخـت: **چونکە مـژادی فیورۆکاومارینی furocoumarinesی تێدایە** (پسۆرالین، ٨ **میثـۆکسی پسۆرالین، ٥ میثـۆکسی پسۆرالین یان ٤، ٥، ٨ ترایمیثـۆکسی پسـۆرالین) وەك گێزەری سپی، مەعدەنۆس، سەوزە، ڕازیانـە، گێـزەر، کـەرەوز، لیمـۆ، پرتـەقاڵ ،لالەنگی و هەنجیر**(وێنەی ١٥٦).

٣- بۆیە (ڕەنگ) **وەك ئەنثرۆکوینۆن، ئەکریفلاڤین، ریڤـانۆڵ، مـەثیلین بلـو، تۆلیـدین بلـو، نیوترال ڕێد، ڕۆزبێنگاڵ - تاد.**

٤- دەرمان وەك: **سەلفۆن ئەمایدەکان، ثایەزایدەکان، سەلفۆنیل یوریاکان، فینۆ ثـایازینـەکان، تێتراسایکلین، گریزیۆفولڤین، نالیدیسیك ئەسید و هەندێك نسایدس NSAIDs.**

٥- کادمیۆم سەلفاید (**بۆ خاڵ کوتان).**

٢- کاردانەوەی تیشکەهەستیاری Photoallergic reactions:- لەم جۆرەدا سەراپای بەرگری لەش وەگەڕ دەکەوێت و ژمارەیەکی کەم خەڵك تووشی دەبن و پێشتر مژادەکەیان بەرکەوتووە، تیشکە هەستیارکەرەکان ئەمانەن:- (وێنەی ١٥٧)

١- فینۆثایازینەکان، دژەهیستامینی جێیی، سەلفۆنەمایدەکانی جێیی و نسایدسی جێیی.

٢- بیثیونۆل و هێکساکلۆرۆفان لە ناو سابونی تەوالێت و شامپۆو بۆنلابەرەکاندا.

٣- دژەخۆر وەك سینامیك ئەسید و دایبەنزۆیڵ میثان.

٤- ئیۆسین eosin لە ناو ماکیاجی لێودا.

٥- کوینین quinine( لە ناو قژ بەهێزکەردا هەیە) و کوینیدین.

٦- بۆن.

٧- ثایۆ یوریا.

٨- سالیسیلئەنەلایدی هالۆجینکراو و تێتراکلۆرسالیسیلئەنەلاید.

تێبینی: ئەگەر مژادە سۆهێنەکە رووەك و گیابوو ئەوە پێیدەڵێن رووەکە تیشکەپێستەسۆ Phytophotodermatitis

(وێنەی ١٥٧)
کاردانەوەی تیشکە هەستیاری.

نموونە وەرگرتن لە ئەکزیما دا

١- قۆناغی تیژ Acute stage: کۆبوونەوەی ئاو لە توێژدا ( واتا توێژزێدەئاوی spongiosis )ئەوسا دەبێت بە بلۆقی ناوتوێژ و ئەمانیش لەوانەیە یەکبگرن و ببن بە بڵق لە ناو توێژدا یان بۆ دەرەوە بدرێت.

٣- قۆناغی درێژخایەن Chronic stage: توێژزێدەئاوی کەمترە و بلۆقیش کەمترن و بچووکترن بەڵام چینی دڕکەیی ئەستوور دەبێت (دڕکەچین ئەستووری) acanthosis و هەروەها چینی کاژی ئەستوور دەبێت (زێدە قۆچەکاژی) hyperkeratosis و ناوکی تێدا دەمێنێتەوە (دەوری قۆچەکاژی) parakeratosis. لە بن توێژدا بۆریە خوێنەکان فراوانتر دەبن (خوێنبۆریە فراوانی) vasodilatation و تەنینەوەی لیمفۆسایتەکانی lymphocytic infiltration تێدایە.

## ب) بیرۆی ناوەکی Endogenous eczemas

### ١- بیرۆیی جێگۆڕاو (بێ شوێنی) Atopic dermatitis (eczema)

[a(=no) top (=place) y(=ness)] = [out of place]

**بریتییە لە پێستەسۆی سەرهەڵداوەی ralapsing درێژخایەنی بەخوروو و پەیدابوونی تەنۆچکەی یان بڵقی بەخورووی ڕوشاو بەتایبەتی لە لۆچەکاندا و زۆربەی جاریش جۆرەکانی تری جێگۆڕاوی atopy لەگەڵدایە وەك هەناسەتوندی asthma و تای کاگەنین hay fever. ڕێژەی ٣٪ی منالان ئەم نەخۆشیەیان هەیە. هۆکاری بۆماوەیی و ژینگەیی ڕۆڵیان لە دروستبوونی دا هەیە.**

١- جینەکانی سەر کرۆمۆسۆمی $11q_{13}$، $3q_{21}$، 14q، 16p و 17p پەیوەندن بەم نەخۆشیە، **دایك پتر لە باوك کاریگەری بۆماوەیی بۆ منالەکە هەیە.**

**پتر لە ڕێژەی ٢٥٪ی منالی دایکی تووشبوو لە سێ مانگی یەکەمی ژیان دا نەخۆشیەکەیان دەبێت. ئەگەر یەکێکیان باوك یان دایك جێگۆڕاوی atopy هەبێت ئەوە پتر لە نیوەی منالەکانی جێگۆڕاویان پێش تەمەنی دوو ساڵی لێدەردەکەوێت، ئەگەر هەردووکیان هەیانبێت ئەوە نزیکەی ٨٠٪ی منالیان دەیان بێت.**

٢- ڕووداوە بەرگریەکان immunological events: **بریتین لە چالاکبوونی لیمفۆسایتی یاریدەدەر جۆری دوو $Th_2$ لەگەڵ دروست کردنی سایتۆکاینی ئینتەرلوکینی $IL-_4$، $IL-_5$، $IL-_{10}$، $IL-_{13}$ و کەمبوونی چالاکی $Th_1$. ئینتەرلوکینی $IL-_4$ و $IL-_5$ دەبنە هۆی پتر دروستبوونی ئیمیونۆ گلۆبیۆلینی جۆری IgE و ئیۆزینۆفیلەکان لە شانە و ناوخوێن دا. $IL-_{10}$ دەبێتە هۆی سستکردنی سەراپای بەرگری جۆری چوار، $IL-_4$ دەبێتە هۆی کەم دروستبوونی ئینتەرفیرۆنی گاما [ IFNδ]. ئەم گۆڕانکاریانە لە بەرگری دا دەبنە هۆی سستی لەش لە پەرەپێدانی خانە بکوژەکانی ڤایرۆسەکان، هەر بۆیە لەم نەخۆشیەدا تامیسکی ئاسایی بڵاودەبێتەوە و مەترسی پەیدادەکات.**

**هەروەها بەرکەوتنی پێست بە بەکتریای ستافیلۆکۆکەس (کە وەك گەورە دژە ژیندەر ڕۆڵ دەبینێت) پتر $Th_2$ دروست دەکات بەمەش پێستەسۆکە پەرەدەستێنێت.**

**کەمبوونەوەی $Th_1$ کاردانەوەی پێست بۆ هەستیاری جێیی کەمدەکاتەوە، بۆ نموونە تەنیا ڕێژەی ١٥٪ی ئەم نەخۆشانە بە درەختی لاولاوی ژەهراوی poison ivy هەستیار دەبن لە جیاتی ڕێژەی ٦١٪ لە باری ئاسایی دا. کە نەخۆشیەکە بوو بە درێژخایەن ئەوسا سایتۆکاینەکانی $Th_1$ لە سۆکردن دا ڕۆڵ دەبینن. خانە لانگەرهانەکان نائاسایین و ڕاستەوخۆ بێ بوونی دژە ژیندەر دەست دەکەن بە چالاك کردنی لیمفۆسایتە یاریدەدەرەکان و ئەم چالاککردنە بەرەو خانەی**

یاریدەدەری جۆری دووە $Th_2$ ، مۆنۆسایتی ناوخوێن پتر پرۆستاگلاندینی ۲ 'G-E2 دروست دەکات ئەمیش -IFN کەم دەکاتەوە و $PGE_2$ ڕاستەوخۆ *IgE* پتر دەکات هەروەها مۆنۆسایت چالاکی فۆسفۆدایئیستەرەیسی phosphodiesterase لەناودا پتر بووە.

٣- ناتاسایی دەمارەکانی پێست:- ئەمەش دەبێتە هۆی کاردانەوەی ناتاسایی خوێنبۆریەکان کەمبوونەوەی ئاستانەی threshold خوران و ناهاوسەنگی کاردانەوەکانی بەرگری و مژادەی ئەسیتایل کولین لە پێست دا پتر دەبێت.

٤- ناتاسایی بەربەستی barrier توێژ: ئەمەش دەبێتە هۆی پتر دەرچوونی ئاو لە پێستەوە بۆ دەرەوە. بۆیە پێست وشکە و بە مەرهەم چارەسەر دەکرێت.

٥- هۆکارە ژینگەییەکان:- وەك تۆزی ناوماڵ، توکی ئاژەڵ، هەڵاڵەی گوڵ و بۆن گرنگن.

٦- کەمتر لە ڕێژەی ١٠٪ ی منالٚ پێستەسۆکەیان بە هەندێك خۆراك وەك هێلکە، شیر، گەنم، پاقلەی سۆدانی و پاقلە پتردەبێت. بەڵام هەندێك لێکۆڵەرەوە بڕوایان وایە ٣٠-٤٠٪ی باری سوك و مامناوەندی پێستەسۆکەیان بەهەندێك خواردەمەنی پتردەبێت.

دەبێت ئەوەش بزانین کە IgE هۆکار نییە بەڵکو ئەنجامی دروستبوونی گۆڕانکاریەکانی بەرگرییە و تەنیا لە ٨٠٪ی نەخۆشەکانی بیرۆی جێگۆڕاودا بەرز دەبێتەوە.


(وێنەی ١٥٨)
بیرۆی جێگۆڕاو (لە ساوادا).

**نیشانەکانی**

ئەم نەخۆشیە سێ قۆناغی هەیە: (وێنەی ١٥٨)

١- بیرۆیی جێگۆڕاوی ساوا (٢ مانگ - ٢ ساڵ) Infantile atopic dermatitis:- ڕێژەی ٦٠٪ی بارەکان لە ساڵی یەکەم دا دەردەکەون (بەڵام پێش دوو مانگی تەمەن زۆر کەمە)، بیرۆکە لە ساوادا بە سووربوونەوە و کاژ لە ڕوومەت دا دەردەکەوێت، لەوانەیە دەردەکان بەرەو مل و ناوچەوان و سەر و مەچەك و بەشی دەرەوەی پەلەکان بکشێن و لەوانەیە ببن بە تەنۆچکە و دەڵێنەر بن exudative و هەر شوێنێك منالەکە دەستی بیگاتێ دەیخورێنێت و بیرۆکەی لێدەردەچێت و کاردانەوە دووەمیەکان لە ئەنجامی خوراندن دەردەچن وەك تووشێنی بەکتریا و قەتماغەکردن، بلۆق و ئەستووربوونی پێست. بیرۆکە بە کوتان *vaccination* و تووشێنی ڤایرۆسەکان توندتر دەبێت. بە هاوین باشتر دەبێت و


(وێنەی ١٥٩) بیرۆی جێگۆڕاو (لە منالٚ دا).

به زستان توندتره (بەهۆی سەرما و هەوای وشك و جلوبەرگی خوری).

کەم جار هەندێك خواردەمەنی ڕۆڵــی تونــدتربوونی پێستەسـۆکە دەبینــت وەك شــیر، هێلکــە، پاقلە، گوێز، دانە وێڵە و ماسی. لە ۲ ساڵی دا ئەم قۆناغە تەواو دەبێت.

۲- بیرۆی جێگۆڕاوی منالی (۲-۱۰ ساڵ) Childhood atopic dermatitis: دەردەکان کەم دەڵێنەڕن، پڕ لۆچی ئانیشك و ئەژنۆ دەگرێتەوە، یان بەشی چەمینەوەی مەچەك، پێڵــووی چاو، دەموچاو و مل. دەردەکان پڕ پێست ئەستورە lichenified و تۆکمەن indurated و نێوانەکانیان تەنۆچکەی ڕەشاوی تێدا بلاّو بۆتەوە. (وێنەی ۱۵۹)

خــوران زۆرە و زۆربــەی ڕواڵــەتی نەخۆشــیەکە ئــەنجامی ئــەم خورانــە زۆرەیــە و نــەخۆش وا دەیخورێنێت هەست بە ئازاری بریندداربوون ناکــات و گەشـــەی منـــاڵ دوادەخـــات و بـــاری دەروونـــی تێکدەچێت.



(وێنەی ۱٦۰)
بیرۆی جێگۆڕاو (لە بالقدا).

۳- بـــیرۆی جێگـــۆڕاوی بـــالقی Adult atopic dermatitis:- (دوای ۱۰ ســـاڵی تەمـــەن) دوو بەشی نەخۆشەکان لە قۆناغی یـەك و دووی سـەرەوە بە یەکجاری چاکبوونەتەوە و لەوانەیـە جـار جـار بـۆ ماوەیەك نەخۆشیەکە سەرهەڵداتەوە. (وێنەی ۱٦۰)

لـەم قۆناغەدا قوتکەی پێستەستوورە یان دەڵێنـەر یـان تەنۆچکەی ســووری کـاژاوی سـنووردار localized دەردەچـن، لــە تەمــەنی هەرزەکاریــدا هەروەك قۆناغی دوو لۆچەکانی ئانیشك و ئەژنۆ و پێش و لاکانی مل و ناوچەوان و دەوری چاو دەگرێتەوە، لە بەتەمەنترا دابەشبوونی نەخۆشیەکە لــەم شـێوەیە لادەدات،بـۆ نموونـە بـیرۆی دەستی درێژخایەن باوە.

هەندێك جار نەخۆشیەکە زۆر بلاّودەبێتەوە بەلاّم هەر پڕ لە لۆچەکان دا دەرکەوتووە. پێسـت بەگشتی وشکە و کەمێك لە باری ئاسایی سوورترە، پێستەستوورە و تەنۆچکەی تەنۆچکەخورروو *prurigo* زۆر بــاون، تەنۆچــکەکان وشــك و بــەرزبووە و پــان و ڕوشــاون و بەیەکــەوە کۆدەبنەوە، تۆخبوون و ناوبەناو کاڵبوونی (کەمرەنگی) پێستیش هــەن، خــوران بــە تینــە و لــە پرە،بە تایبەتی کاتی فشاری دەروونی و هەوا گۆڕکێ وەك گەرما یان کاتی پشوودان و خــەوتن، دەست پێدەکات. ئەم نەخۆشانە باش ئارەق بۆ ڕووی پێست دەرنادەن بۆیە پێست کــاتی وەرزش و گەرما وشك و بە خورروە.

لەگەڵ کات دا نەخۆشیەکە سووکتر دەبێت، بەڵام هەر پێست وشکترە و و زووتر لــە خــەڵکی ئاسایی بۆ وورووژێنی ژینگەیی و دەروونی وەخورودێــت، دەســت و مەچــەك لــە بــاڵق دا زۆر توشدەبن و دوای چاکبوونەوەش کە هۆکاری وروورژێن هاتەکایەوە ئەوە دیسان بیرۆی دەست و مەچەك بە تایبەتی لـە ژنی ماڵ دا، بەهۆی زۆر بەکارهێنانی ئاو (پتر لـە ژنی خاوەن منداڵ دا)، یـان لـە کرێکاری بینا و کرێکاری میکانیك دا – تاد سەرهەڵدەداتەوە.

لـە دەست دا بەر و پشتی دەست بیرۆکـەی تێدایـە و هەنـدێك جـار نەخۆشـیەکە، لــە ئـەنجامی هەستیاربوون ورووژان بە کرێم و چارەسەر یان بەهۆی جۆری کارەکەی کە ئەم مژادانـەی تێـدا بێـت ،ئاڵۆزتر دەبێت.

**عات و سکاڵا و نیشانەکانی پێکەوەیی** Associated features & complications

- لـۆچی fold ئاسـۆیی هێـڵی لە خـوار لێواری پێڵووی چاوی خوارەوە (لۆی دێنـی مۆرگـان) Dennie-morgan-fold لــە زۆر جــۆری بــیرۆی درێژخایەن و بیرۆی جێگۆڕاودا هەیە (وێنەی ١٦١).


**(وێنەی ١٦١) بیرۆی جێگۆڕاو (لۆچی ئاسۆیی هێلی "دێنی مۆرگان").**

٢- پێستە ساغەکەی نەخۆش وشکتر و کەمێك لەهی خـەڵکی ئاسایی سورباوترە ، ئاو دەردان لە پێــست پــترە و پێــست زووتر بە وروووژێنەرەکان تێکدەچێت.

٣- کرێــژە (کرێشـــــە) ســـپیە pityriasis alba:- پێستەسۆیەکی سووکی سنوور نادیارە بەزۆری لە نەخۆشـی پێستەسۆی جێگۆڕاودا هەیە.
بریتیە لە پارچەی سپیاوی کەمێك کرێژاوی سەر ڕوومەت و قۆڵ و سەرەوەی قەد بە تایبەتی لە منداڵان دا، چارەسەری ئیمۆڵیانتە یان کۆرتیزۆنی سوکە بە مەرهەم.

٤- قۆچەکاژی کونی موو keratosis pilaris:- بریتییە لــە دەرهــاتنی پەســتاوتراوی plugs کونی مووەکان لە بەشی دەرەوەی قۆڵ، لاق، ڕوومەت و سمت دا، لە بیرۆیـی جێگـۆڕاودا زۆر باوە و لـە چارەسەر یاخییە.
چارەسەری: تەڕکەرەکان moisturizers، لاکتیك ئەسیدی جێیی، یۆریا و ڕێتینۆیدەکان ،کە پێست دەوورووژێنن ،بۆیە حەفتەی ١-٢ جار بەکاردەهێنرێن.

٥- تەنکبوونی بەشی دەرەوەی برۆ (نیشانەی هێرتۆگ Hertoghe's sign) هەندێك جار هەیە.

٦- ملی پیس dirty neck:- بەهۆی زێدە قۆچەکاژی و تۆخبوونی پێستی مل باوە.

٧- نیشانەی لایتی سەر head light sign:- بریتیە لە کاڵبوونی pallor پێستی دەوری دەم و لووت و چاڵی چاو.

٨- لیری نەخشدێی سپی white dermographism:- بریتیە لە سپی بوونی پێست لە ئەنجامی خشاندنی تەنێکی کول بە پێست دا.

٩- لیری لێککەوت (لیردەرکردنی لێککەوتن) contact urticaria:- ئەم جۆرە و جۆری تریش لە لیردەرکردن باون.

١٠- ئاوی سپی چاو catarracts:- ڕێژەی ١٠٪ی نەخۆشەکان دووچاری ئاوی سپی دەبن یان جۆری پێش یان جۆری دواوەی ژێر قاوغ subcapsular، پڕ لە باری بیرۆی بلاو و توند دا هەیە، پەرگلێنەی قوچەکی keratoconus کە بریتیە لە دەرپەڕینی قوچەکەیی پەرگلێنەی چاو بۆ پێشەوە و لە ١٪ی نەخۆشەکان ا هەیە.

١١- تووشبوونی میکرۆب: پتر لە ٩٠٪ی دەردە درێژخایەنەکان بە کتریای ستافیلۆکۆکەس staphylococcus aurius یان بە ژمارەیەکی زۆر تێدایە، تەنانەت پێستی تووشنەبووش بەم بەکتریایە مۆڵگەکراو colonized بووە ،بەمەش دەردەکان پڕ دەڵێن oozing دەبن و قەتماغە و سەلکەسۆی مووەکان و سۆی گرێ لیمفەکان ڕوودەدەن. ئەم بەکتریایە وەك دژە ژینەدەری گەورەش هەر ڕۆڵ دەبینێت ،بۆیە چارەسەری ئەم تووشێنە زۆر گرنگە. هەروەها هەندێك جار تووشێنی بەکتریای سترێپتۆکۆکەس streptococcus ڕوو دەدات و دەبێتە هۆی تا و لەرز و بەژەهربوون toxicity.

تووشێنی ڤایرۆسی بەتایبەتی تامیسکی لێو Herpes simplex labialis کە زۆر جار لە ئەندامانی تری خێزان دەیگرێتەوە و دەبێتە هۆی بلاوبوونەوەی ڤایرۆسەکە و دروستبوونی نەخۆشی بەتامیسکبوونی بیرۆ eczema herpeticum کە نیشانەکانی بریتین لە: کتوپڕ دەرهاتنی تەنۆچکەی داماڵراو یان قەتماغەیی و بلۆق vesicle و پیزۆکە pustules کە پڕ لە سەر بیرۆکانن و بۆ زۆربەی پێست بلاودەبنەوە، تووشێنی دووەمی بە بەکتریای ستافیلۆکۆکەس زۆر باوە و ئاوسانی جێیی و گرێ لیمفەسۆی جێیش ڕوودەدەن.(وێنەی١٦٢)

چارەسەری دژە ڤایرۆس ودژە بەکتریای سەراپاییە، هەروەها کوتان بە پێکوتەی vaccin دژە ئاوڵە



(وێنەی ١٦٢) بە تامیسکبوونی بیرۆ.

قەدەغەیە، چونکە لەوانەیە نەخۆشی کوشندەی ڤاکسینیای vaccinia تووش بکات.

* تووشبوون بە بالوکە (ڤایرۆسی پاپیلۆما) بەتایبەتی پانە بالوکە plane warts یان گوازەرەملّی molluscum contagiosum زۆر باوە.

١٢- نیشانەکانی تری جێگۆڕاوی other manifestations of atopy:- نزیکەی ڕێژەی ١٠٪ی ساوایانی بیرۆی جێگۆڕاو لەدوایی دا هەناسە تووندی asthma و تای کاگەنین یان لە منالّی دا تووش دەبێت، هەندێکیان لەم بارەدا بیرۆکانیان نامێنێت.

١٣- لێوەسۆی لێولێسینەوە lip-lick cheilitis، بیرۆی تەڕ یان درزاوی لە دەوری دەم دا باوە.

١٤- بوونی جۆرەکانی تری بیرۆ لەگەڵ پێستەسۆی جێگۆڕاو دا وەك: بیرۆی بازنەیی (خڕپان) discoid eczema، کرێژە سپیە، سۆی ژێر پێی منالّی juvenile plantar dermatosis، تەنۆچکەخورووی گرێیی purigo nodularis و پێستەسۆی ژێر گوێچکە infra-auricular dermatitis لەگەڵ درزدان.

١٥- هەستیاری بە دەرمان drug sensitivity:- باوە چونکە IgE یان بۆ دژە ژیندەرەکان زۆر دروست بووە.

١٦- هەستیاری بۆ خۆراك food allergy: باوە.

١٧- دەردە ڕێوی alopecia areata: لە ئاسایی باوترە.

## هەل و مەرجەکان بۆ بیرۆی جێگۆڕاو Criteria for atopic dermatitis

١- هەل و مەرجە گەورەکان *Major criteria*:- دەبێت سێ لەوانەی خوارەوەی تێدابێت:

١- خوران.

٢- دابەش کردن و شێوازی نموونەیی typical morphology & distribution دەردەکان.

أ) پێستەستووریی لۆچەکان لە بالّق دا.

ب) گرتنەوەی دەم وچاو و بەشی دەرەوەی پەلەکان لە ساوادا.

٣- پێستەسۆی درێژخایەن یان چەند جارە سەرهەلّداوەی درێژخایەن.

٤- مێژووی جێگۆڕاوی لە نەخۆش یان خێزان دا (هەناسە توندی، تای کاگەنین و بیرۆی جێگۆڕاو).

**٢-هەل ومەرجە بچووکەکان** Minor criteria:-هەروەها دەبێت سێ لەوانەی خوارەوەشی تێدا بێت:

١- پێست وشکی.
٢- نەخۆشی ماسی icthyosis، بەرەدەستی فرەهێڵی hyperlinear palms، قۆچە کاژی کونی موو keratosis pilaris.
٣- کاردانەوەی IgE (کاردانەوەی ئەزموونی پێستی دەستبەجێ immediate skin test reactivity یان ئەزموونی RAST) پۆزەتیف بێت.
٤- بەرزبوونەوەی ئاستی IgE لە خوێن دا.
٥- دەرچوونی نەخۆشیەکە لە تەمەنێکی زوودا.
٦- پتر تووشێنی میکرۆب (بەتایبەتی بەکتریای S.aureus یان ڤایرۆسی H.simplex.).
٧- پتربوونی بیرۆی دەست و پێ.
٨- بیرۆی گۆی مەمك.
٩- لێوەسۆ cheilitis.
١٠- سۆی پێڵووپۆش conjunctivitis ی چەند جارە recurrent ( واتا سەرهەڵداوە).
١١- بوونی لۆچی ژێر چاڵی چاو Dennie – morgan infraorbital fold.
١٢- پەرگلێنەی قوچەکی keratoconus.
١٣- ئاوی سپی جۆری ژێر قاوغی پێشەوە anterior sub-capsular cataracts.
١٤- تۆخبوونی پێستی چاڵی چاو orbital darkening.
١٥- کاڵی (زەردباوی) دەم وچاو یان سوورباوی دەموچاو.
١٦- کرێژە سپیە pityriasis alba.
١٧- خوران بە ئارەق کردن.
١٨- بەرگەنەگرتن (بێ حەوسەڵەیی) intolerance بە جلی خوری و بەکارهێنانی چەوری توێنەرەوەکان ( وەك سابون و تاید).
١٩- زەقتر دەرکەوتنی نەخۆشییەکە لە دەوری کونی مووەکان دا.
٢٠- فرەهەستیاری بە هەندێك خواردەمەنی.
٢١- توندی نەخۆشیەکە، بە هۆکاری دەروونی و ژینگەیی کاری تێدەکرێت.
٢٢- لیری نەخشەیی سپی white dermographism یان سپی بوونەوەی درەنگ بۆ مژادە وزەکۆڵینەکان delayed blanch to cholinergic agents

## چارەسەر

### ١- ئامۆژگاریەکان

١- دوورکەوتنەوە لە خۆشۆردن لە گەرماوی زۆر گەرم، با ئاوەکە شلەتێن بێت و سابوونی تایبەتی سوک وەك سابونی زەیتون، گلیسرین، دۆڤ، ڕەقی و سابوونی منالآن Johnson بەکاربهێنرێن، تەنیا بە دەست خۆی بشوات یان بشۆرێت نەك بە لفکە و شتی زبر، دوای خۆشۆردن با ئیمۆڵیانت (پێست تەڕکەرێك) لە پێستەکە بدرێت. بۆ ڕێگرتن لە دەرچوونی ئاوی ناوپێست بۆ دەرەوە مەرهەمی چەور لە کریم باشترە، ئەکوافۆر aquaphor (ئیوسێرین eucerin ) زۆر بەکەڵکە یان ڤازیلین. دایبی تەڕ دەبێت بگۆڕێت، لەوانەیە دژە بەکتریای جێی هەستیاری دروستبکات بۆیە باشتر وایە بەکارنەهێنرێت.

٢- دوورکەوتنەوە لە فشاری دەروونی، گەرما، ئارەقکردنەوە و وروژێنە دەرەکیەکان.

٣- لە خورانی کتوپڕدا دانانی پارچەیەك سەهۆڵ لە سەر پێستەسۆکە بۆ ماوەیەکی کورت بەکەڵکە.

٤- دژەهیستامین بە ڕێك وپێکی بەتایبەتی بە شەو بەکەڵکن بەڵام دەبێت جۆری ئارامکەر بن، وەك هایدرۆکسی زین، کلۆرفێنیرامین، ترایمیپرازین و دۆکسیپین *doxepin*.

٥- ئەگەر گومانی هەستیاری بە خواردەمەنی هەبوو دەبێت دڵنیا بین، ئەوسا خواردەمەنیەکە دوور بخەینەوە (بەتایبەتی شیر و هێلکە)، ئەم دڵنیابوونە بە ٣ جۆر دەکرێت:

١- لابردنی خواردەمەنیەکە بۆ چەند حەفتەیەك و بزانین باشتر بووە یان نا.

٢- دووبارە بەکارهێنانی خواردەمەنیەکە *foot challenge* و بزانین توندتر بووە یان نا.

٣- ئەزموونی IgE تایبەتمەندی خواردەمەنی food spiecific IgE testing. یان ئەزموونی دڕکە پشکنین prick test یان RAST بۆ دۆزینەوەی خواردەمەنیە گومان لێکراوەکە دەکرێن.

٦- لە گەورەدا سابون بۆ سەر و ناو ڕان بەکاردەهێنرێت، شوێنەکانی تر بە سابونی تایبەت وەك (دۆڤ، ئەڤینۆ، نیوترۆجینا، ئیمولاڤ، باسس، کێری - تاد) دەشۆرێت.

٧- لە ماڵ دا هێنانەدی پلەی گەرما و شێی لەبار باشترە.

٨- بۆ کەمکردنەوەی هەستیاری بە تۆزی ناوماڵ باشتر وایە بەرگی پشتی و دۆشەك - تاد کوناوی نەبن، تۆز بە ئامێری هەڵمژ نەهێڵرێت و ئاژەڵی ماڵی (پشیلە و سەگ و باڵندە) لە ژووردا نەبن.

٩- کوتانی منال بە پێکوتە vaccin ی سورێژە و ئینفلەوەنزا و تای زەرد yellow fever دەبێت لەژێر چاودێری دا بێت لە ترسی پەستان دابەزینی کتوپڕ بە تایبەتی کە ساواکە هەستیاری بۆ هێلکە هەبێت.

١٠- ئەو کەسانەی تامیسکیان herpes simplex هەیە، دەبێت لە نەخۆش دووربکەونەوە ،چونکە مەترسی بڵاوبوونەوەی هەیە (بەتامیسکبوونی بیرۆ eczema herpeticum.

١١- پێچانی تەڕ wet wrap dressings: دوای خۆشۆردن ستیرۆیدی جێیی لە بیرۆکە دەدرێت ئەوسا دوو چین پێچانی بۆ دەکرێت، یەکەمیان لەناو هەڵکێشراوە و دووەمیان بە وشکی دادەنرێت، بیجامەی لۆکەیی یان کراسی T-shirt لەسەر ئەم دوو چینە لەبەر دەکرێت، ئەم پێچانە چەند کات ژمێرێك جێ دەهێڵرێت، ستیرۆیدەکە با جۆری مامناوەندی بێت وەك بێکلامیثازۆن ، کرێمی ترایئەمسینۆلۆن یان بۆ ساوا کرێمی هایدرۆکۆرتیزۆن . ئەم باندەجە (پێی دەووترێت باندەجی پانسمان) دەتوانین دووبارە بیشۆین و بەکاری بهێنینەوە.

بەم رێگایە بەهەڵمبوونی تەڕی باندەچە تەڕەکە پێست فێنك دەکاتەوە و خوران ناهێڵێت، دوای باشتربوون کاتەکانی باندەجەکە کەمتر دەکەینەوە و لە جیاتی ستیرۆید ئیمۆڵیانت بەکار دەهێنین.

٢- **چارەسەری بیرۆی دەڵێنەری تیژ** *Acute weeping eczema*

پشوودان و بەکارهێنانی شلە لە دەست و پێدا، دەست و پێ دەخرێنە ناو شلەی ئەلۆمینیۆم ئەسیتەیت ٦٥ر٠٪، سەلاین یان ئاوی ئاسایی بۆ ١٠ خولەك رۆژی ٣ جار، دوای ئەم کاتە شلەی یان کرێمی ستیرۆیدی لێدەدرێت و هەندێك جار وەك باسمانکرد دەپێچین، شلەی پەرمەنگەناتی پۆتاسیۆم $KMNO_4$ ١/٤٠٠٠ زۆر بەکەڵکە بەڵام بە شێوەیەکی کاتی پێست قاوەیی و رەش دەکات.

بۆ رووبەری گەورەی قەد دیسان ستیرۆیدی جێیی بە شلە یان کرێم بەکاردەهێنین، هەندێك جار زوو زوو بەکارهێنانی شلەی کالامێن *calamine lotion* فێنك کەرەوەیە یان بۆیەی ماجێنتا agenta paint (نیوچڕی) بۆ لۆچەکان بەکەڵکە.

٣- **چارەسەری بیرۆی ژێرتیژ** Subacute

ستیرۆیدی جێیی بە کرێم و شلە بەکار دەهێنرێت و ئەگەر گومانی تووشێنی infection بەکتریا هەبوو ئەوە دژە بەکتریای لەگەڵ تێکەڵ دەکرێت وەك ڤایۆفۆرم، بەسیتراسین، ترشی فیوسیدیك یان میوپایرۆسین mupirocin، بەڵام نیومایسین کە بەکەڵکە لەوانەیە هەستیاری دروستبکات.

٤- **چارەسەری بیرۆی درێژخایەن** Chronic eczema

ستیرۆیدی جێیی بەمەرهەم ointment بە چڕی گونجاو بەپێی تەمەن و شوێنی بیرۆکە و رووبەری توشبوو و ماوەی بیرۆکە بەکاردەهێنرێت. بۆ دەم وچاو هایدرۆکۆرتیزۆن بە چڕی ٥ر٠-١٪ و بۆ ساوا بەکاردەهێنرێت، لە باڵق دا نابێت لە حەفتەیەك دا پتر لە ٢٠٠ گم ستیرۆیدی سوك یان مامناوەندی بەکاربهێنرێت یان ٥٠ گم ستیرۆیدی بەهێزتر یان ٣٠ گم

ستیرۆیدی زۆر بەهێز، کە تووشێن هەبوو دژە بەکتریای وەك باسمان کرد لەگەڵ تێکەڵ دەکرێت، بەڵام کە تووشێنەکە ئاشکرابوو ئەوە دژە بەکتریای سەراپایی systemic route وەك ئیریثرۆمایسین، دایکلۆکساسلین یان هی تر بۆ ٢-٤ حەفتە بەکار دەهێنرێن.
بۆ بیرۆی کۆنی ئەستوربووی دەست و پێ ١-٦٪ سالیسیلیك ئەسید یان یۆریا بەکار دەهێنرێن.

گۆڕینەکانی بەرگری Immunomodulators، دواغان هەیە:

١- تاکرۆلیمۆس مەرهەم٣٠ر٠٪ و ١ر٠٪ tacrolimus ointment

٢- پیمیکرۆلیمۆس کریم ١٪ pimecrolimus *cream*، ئەمانە زۆر بەکەڵکن و ماکەکانی complication ستیرۆیدیان نییە، بەڵام هەندێك کزانەوە دروست دەکەن لەبەر ئەوە دەتوانین پێشتر بە ستیرۆید دەست پێبکەین و دواتر بەم دەرمانانە.

- ستیرۆیدی سەراپایی systemic steroids، بۆ باری زۆر بڵاو و تیژ ،کە بە سیترۆیدی جێیی چارەسەر نەکرابێت ، بۆ ماوەیەکی کورت بەکاردەهێنرێت و ئەوسا دەگەڕێنەوە سەر ستیرۆیدی جێیی، لە باڵق دا پرێدنیزوڵون ٦٠-٨٠٪ ملگم/ رۆژێك بۆ یەك حەفتە و ئەوسا وردە وردە کەمی دەکەینەوە و لە ٢ حەفتەی داهاتوو دا دەیبڕین.

- چارەسەر بە تیشك phototherapy:- هەندێك جار، بۆ ئەوانەی بە ستیرۆیدی جێیی چاکنەبوونەتەوە یان زۆربەی لەشیان بیرۆکەی هەیە،بەکاردێت.
بەکارهێنانی ت س و B + ت س و A بە یەکەوە، بە UVA ٣-٥ جول/سم٢ + UVB ٣٠-٥٠ مللی جول/ سم٢ دەست پێدەکەین و وردە وردە بۆ ١٠جول/سم٢ UVA + ١٠٠ مللی جول/سم٢ UVB پڕیان دەکەین یان ت س و تەسك ٣١١نم 311nm narrow band UVB یان UVAI (٣٤٠-٤٠٠نم)، پۆڤا PUVA بەدەم و بە لەناو حەوزدا bath (جێیی) + ستیرۆیدی سەراپایی، دواتر تەنیا PUVA و ستیرۆیدەکە دەبڕین، چونکە پۆڤا بە تەنیا لە سەرەتا دا ورووژێنە.

- بەرگری سستکەری سەراپایی systemic immunosuppressant therapy: بۆ باری زۆر توند یان کە بەوانەی سەرەوە چاکنەبوویتەوە بە کار دەهینرێن، وەك سایکلۆسپۆرین ٥ر٢ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ماوەیەکی کورت. ئازاثایۆپرین *azathioprin* ١٠٠-٢٠٠ملگم/رۆژ ٤-٦ حەفتەی دەوێت بۆ ئەوەی ئەنجامی دەرکەوێت، مایکۆفینۆلەیت مۆفیتیل mycophenolate mofetil ١-٢گم/ رۆژ یان میثۆترێکسەیت ٥ر٢ ملگم/ رۆژ -٤ رۆژ لە حەفتەیەك دا + UVB، پاشان میثۆترێکسەیتەکە کەم دەکەینەوە و ئەوسا دەیبڕین.
ئیمیونۆ گلۆبیولین بە خوێن I.V. immunoglobuline.

پرۆپیل ثایۆیوراسیل propyl thiouracil **١٠٠ ملگم رۆژی ٣جار بۆ ١٢ حەفتە،** زوفیرلوکاست *zofirlucast* **( کە دژی لیوکۆترراینە) leukotrine antagonist و** زیلیۆتۆن zileuton **٦٠٠ملگم × ٤**. زەیتی پریمرۆز oil of primrose **(کە گاما لینۆلێنیك ئەسیدی) δ-linolenic Acid تیدایە بۆ ئێواران.**

سۆدیۆم کرۆمۆگلایکەیت sod. cromoglycate **جێی یان بەدەم.**

دەرمانی گیایی چینی chinese herbal therapy **بە کەڵکە.**

چارەسەری نوێ **کە هێشتا لەژێر تاقیکردنەوەدایە وەك:** نەهێڵی inhibitors فۆسفۆدایئیستەرەیس phosphodiesterase، ئینتەر لوکین ٢ $IL_{-2}$، ثالیدۆماید thalidomide **و** ثایمۆپینتین thymopentin.

- پرۆبایۆتیکەکان probiotics **وەك** لاکتۆبەسیللەس lactobacillus **بەدەم دەدرێتە دایك کە گومانی بوونی منالّی توشبووی لێدەکرێت، کە منالّەکەش لەدایك بوو بۆ ٦ مانگ دەیدرێتێ.**
- دژە ڤایرۆسی تامیسك ئەسایکلۆڤیر acyclovir **٤٠٠ملگم × ٣ بۆ ١٠ رۆژ بە دەم یان بە خوێن بۆ باری زۆر بلاّو لە کاتی تووشبوون بە ڤایرۆسەکە.**
- قیر tar **یان** ئیکثامۆڵ icthamol **بۆ باری درێژخایەن هەندێك جار بەکار دەهێنرێن.**
- ئینتەرفیرۆنەکان **وەك** IFN-δ **و** IFN-∝ **هەندێك جار بەکاردێن.**

## ٢- **چەورە بیرۆ** Seborrhoeic dermatitis**: باسمان کرد.**

## ٣-**بیرۆیی خڕپان (بازنەیی)** Discoid (Nummular) eczema


**(وێنەی ١٦٣) بیرۆی خڕپانی زەبەلاح لە ناوەڕاستی پشتدا.**

**بریتییە لە پێستەسۆی (بیرۆی) خڕ یان هێلکەیی سنووردیار پڕ لە پیاوی بالّق دا هەیە و زۆر دەمێنێتەوە. (وێنەی ١٦٣)**

**هۆکەی دیار نییە بەلاّم هۆی دەروونی و کاردانەوە بۆ تووشێنی بەکتریا رۆڵیان هەیە. لە لاقەکان و پێستی دەست و بەشی دەرەوەی باسکەکان دەست پێدەکات.**

**دەردەکان پارچەی (٢–٤سم)قەتماغەیی یان بلۆقی یان ئاوساو و سووربووەوەی خڕی ( وەك پارەی کانزایی یە) جیاجیان، هەندێك جار دوای زەبر دەردەچن (دیاردەی کۆبنەری تێدایە)، کە دەردی نوێ دروست دەبن دەردە کۆنەکان بە دروست بوونی تەنۆچکە و پیزۆکەی نوێ لە دەوری**

دەردە دێرینەکە هەر دەکشێن و ئەوسا تێکەڵ دەبنەوە و جاری وایە بە قەدەر لەپی دەستی لـێ دێت، خوران وەك بیرۆی جێگۆڕاو زۆرە و کتوپڕە و پتر لە شەو دایە.

هەندێکیان لە ١-٢ ساڵ دا چاك دەبنەوە و هەندێکی تریش درێژخایەنە و دەبێت ناوە ناوە چارەسەر بکرێت.

**چارەسەر**

شۆردن و ستیرۆید لە ژێر بەستن دا under occlusion، ئەگەر تووشێنی بەکتریا هەبوو دەبێت دژە بەکتریای بدەینێ و دژە هیستامین بۆ خوران، هەندێك جار قیر و ئیکثامۆل یان ستیرۆیدی سەراپایی بۆ ماوەیەکی کەم یان تاکرۆلیمۆس یان ت س و $B$ یان ت س و $B$ تەسك بەکاردەهێنرێن، جلوبەرگی لۆکەیی و لەبار کردنی هەواو شێی ژوور پێویستن.

## ٤- بیرۆی بلۆقی Pompholyx

بریتییە لە بیرۆی ناوخۆیی endogenous eczema کە تێیدا بلۆق و بڵق لە دەست و پێدا دروست دەبن. هۆکانی نەزانراوە بەلام گەرما و ئارەقکردنەوەی دەست و پێ، هەستیاری بەتایبەتی بۆ نیکل و کاردانەوەی بڵقی بۆ کەڕووی پێ ڕۆڵیان هەیە. (وێنەی ١٦٤)



**(وێنەی ١٦٤) بیرۆی بلۆقی.**

**نیشانەکانی**

شەپۆلی دەرهاتنی بلۆق و بڵقی سەرهەڵداوە لەبەری دەست و پێ و پەنجەکان لە باڵق دا بۆ چەند حەفتەیەك ناوبەناو ڕوودەدات، تووشێنی دووەمی بەکتریا و سۆی لیمفە بۆریەکان ناساغیەکە توندتر دەکەن، زۆر بەخوروون و ورووژێن و هەستیارکەرەکان پەرەی پێدەدەن هەربۆیە هەندێك جار ئەزموونی پارچە و پشکنینی کەڕووی پێ پێویستە بکرێن.

چارەسەری وەك چارەسەری بیرۆی جێگۆڕاوی تیژە، دوایش ستیرۆیدی جێیی و دژە بەکتریاش دەدرێن و ئەگەر کەڕووی پێ tinea pedis هەبوو ئەمیش چارەسەر دەکرێت.

## ٥- سۆی (پێستەتێکچووی) ژێر پێی منالی Juvenile plantar dermatosis

لە تەمەنی ٤-١٠ ساڵیدا هەیە و دوای دەرکەوتنی لە ٤ ساڵ دا نامێنێت.

هۆكەی: گۆرەوی و پێڵاوی ناپارێزیە (داخراوە) impermeable بەمەش كونی ڕژێنە ئارەقیەكان دادەخرێن، زۆریان جێگۆڕاویان هەیە(وێنەی ١٦٥).



(وێنەی ١٦٥) سۆی ژێرپێی منالی.

پێستی ژێر پێ (جگە لە چاڵی ژێر پێ) بە تایبەتی نیوەی پێشەوەی لەگەڵ ژێری پەنجەكانی پێ وشك و ڕۆشن shiny هەڵدەگەڕێت لەگەڵ درزی قوولی بە ئازار كە ڕۆیشتن گران دەكات، نێوان پەنجەكانی پێ ناگرێتەوە، ئەم نەخۆشیە دوای لەپێكردنی پێلاو دەردەچێت، بە پێچەوانەوە بیرۆی هەستیاری بۆ پێلاو پشتی پێ دەگرێتەوە.



(وێنەی ١٦٦) مەنگەبیرۆ

چارەسەر:- بەكارهێنانی ناوفەرشی (ناوكەفی) كوناوی لە ناو پێلاودا و گۆرەوی خوری و لۆكەیی نەك نایلۆن.

چارەسەر بە ئیمۆلیانت، ١٪ ئیكثامۆل ( بە شێوەی هەویر paste ) یان لاكتیك ئەسید (مەرهەم). ئەشتوانین ستیرۆیدی جێبی مامناوەندی یان یۆریا ٥٪ - ١٠٪ بەكاربهێنین.

٦- **پێستەسۆی دایبی** *Napkin dermatitis*: باسمان كرد.

٧- **مەنگەبیرۆ (بیرۆی وەستان)** *Gravitational (stasis) eczema*

ئەم پێستەسۆیە زۆربەی جار لە ئەنجامی ناتەواوی خوێنهێنەرەكان (كەموكوڕی خوێن هێنەكان Venous insufficiency) دروستدەبێت. (وێنەی ١٦٦)

بریتیە لە سووربوونەوە و تۆخبوونی زەرد و قاوەیی كاڵ لە سێیەكی خوارەوەی لاق دا بەتایبەتی بەشی ناوەوەی سەروی قولەپێ medial malleolus، لەوانەیە پێستەسۆی بیرۆیی دەركەوێت، لەوانەیە ئەم پێستەسۆیە وشك ، دەڵێنەر weepy ، كاژاوی، یان پێستەستوورێیی بێت،

پێستەکە بەهۆی میلانین و بۆیەی خوێنناسن hemosiderin ڕەش وبۆرە، زۆربەی جار خوێنبۆریە گمۆڵـێ varicose veins لاق هەیە.

**چارەسەر**

١- چارەسەری کەموکوڕی خوێنهێنەکان، لابردنی ئاوساویەکە بە لاق بەرزکردنەوە، باندەچی لاستیکی pressure bandages و گۆرەوی لەخۆگر support stockings.

٢- ستێرۆیدی جێیی مامناوەندی، کرێمی زنك و ئیمۆڵیانت، ئەم نەخۆشیە زۆر جار سەرهەڵدەداتەوە.

٨- **بیرۆی وشکە پێستی** asteatotic eczema : باسمان کرد.

٩- **پێستەستووری سانای کۆنینە** :lichen simplex chronicus باسمان کرد.

## ١٠- بیرۆی ناوچەیی Regional eczema

أ) **بیرۆی گوێچکە** Ear eczema: بیرۆی گوێچکە (پێستەسۆی گوێچکەی دەرەوە otitis externa). لە پەڕەی گوێچکە، لۆچی دواوە و کەناڵی دەرەوەی گوێچکە دەردەچێت ، بەتایبەتی کەناڵەکە ،کە بیرۆی هەستیاری و چەورەبیرۆ زۆر دەیگرنەوە، بریندارکردن بە پەنجە و داری باریك و ئامێری تر بۆ پاککردنەوەی لە مۆم پێستەسۆ دروست دەکات، تووشێنی دووەمی بەکتریا باوە، هەستیار بوونی لێککەوتن بە دڵۆپە و (قطرة) کرێم زۆرە، تووشێنی بەکتریای پسودۆمۆنەس pseudomonus گوێچکەسۆی دەرەکی گران malignant otitis externa دروست دەکات و چاڵەبرین و کێم پەیدا دەبن. کونکردنی گوێچکە زۆر جار (بیرۆ بە نیکڵ) پێستەسۆ دروست دەکات.

ب) **پێستە سۆی پێڵووی چاو** Eyelid dermatitis:- پتر بەهۆی بیرۆی جێگۆڕاو و هەستیاری لێککەوتن یان دڵۆپەی چاو پەیدا دەبێت، ، لە کاتی هەستیاری دا پێڵووی سەرەوە و لە بوونی بیرۆی جێگۆڕاو دا هەردوو پێڵووەکان سۆدەکەن.
ئاوسان و سووربوونەوە و قەتماغە و کاژ نیشانەکانیەتی.

ج) **بیرۆی مەمک** Breast eczema:- تووشی گۆی مەمك و دەوروبەری دەبێت، زۆربەی جار بیرۆکە تەڕە و قەتماغەییە، درزی بە ئازار بەتایبەتی لە دایکی شیردەر باوە، بەڵام جۆرەکانی تری بیرۆش لەم شوێنە دەردەکەون وەك بیرۆی جێگۆڕاو، پێستەستووری سانای کۆنینە L.simplex chronicus، بیرۆی هەستیاری لێککەوتن و چەورە بیرۆ.

ئەگەر بیرۆ لەم شوێنە پتر لە ٣ مانگی خایاند بەتایبەتی کە یەك لای گرتبوو ئەوە ئەگەری نەخۆشی پاجێتی Paget's disease (کە شێرپەنجەیە) لێ دەکرێت و خێرا

نموونەی لـێوەردەگیرێت. چارەسەری بیرۆی مەمك: بە ستیرۆیدی جێیی یان بە تێچزاندن intralesional دەکرێت.

د ) **بیرۆی دەست** Hand eczema:


**(وێنەی ١٦٧) بیرۆی دەست**

سێ نەخۆشی سەرەکی تووشی دەست دەبن: ١) بیرۆی جێگۆڕاو. ٢) نەخۆشی سەدەف (کاژۆکی). ٣) پێستە سوێ لێککەوتنی هەستیاری، زۆر جار ئاسان نییە بزانین کامەیان پێستەسۆکەی دروستکردووە. (وێنەی ١٦٧)

١- **بیرۆی دەستی پیشەیی** Occupational hand ezema:-

بیرۆی دەست گرفتێکی پیشەیی گەورە دروست دەکات و ڕێژەی ٨٠٪ی پێستەسۆی پیشەیی دەست دەگرێتەوە، ئەو پیشانەی دەست تەڕبوونی تێدایە ڕێژەیەکی زۆر پێستەسۆی دەست دروست دەکەن وەك:

١- سەرتاش و ئیشی سالۆن

٢- کارمەندی چێشتخانە و شەربەتفرۆش و شیرینیفرۆش و چایخانە بەتایبەتی تووشی دەبن.

٣- کارمەندی تەندروستی.

٤- نانەواو ئیشی هەویر.

٥- کرێکاری چیمەنتۆ (بیناسازی) بە هۆی کرۆم و کوباڵتی ناو چیمەنتۆ.

٦- ئەو کەسانەی بیرۆی جێگۆڕاویان هەیە پتر پێستەسۆی پیشەییان بە هەردوو جۆرەکەی وروژێن و هەستیاری لێککەوتن تووشدەبێت.

٢- **بیرۆی بلۆقی** (Pompholyx):- باسمانکرد.

٣- **بیرۆی دەستی بلۆقی و بڵقی درێژخایەن** Chronic vesiculobullous hand eczema :-

لێرەدا دەردەکان زێدە قۆچەکاژێن و کاژاوای و درزاوین، مێینە سێ ئەوەندەی نێرینە تووشی دەبێت. بلۆقی (١-٢ملمی) بە خورروو لاکانی پەنجەکان دەگرێتەوە، لە باری درێژخایەن دا نینۆکەکان تێکدەچن.

٤ – **بیرۆی دەستی زێدە قۆچەکاژی** Hyperkeratotic hand eczema:-

**نێرینە دوو ئەوەندەی مێینە دەیگرێت و لە باڵق دا ڕوودەدات، لێرەدا دەردەکان بریتین لە ڕووبەری سووربووی درزاوی و زێدە قۆچەکاژی لە ناوەڕاست و بەشی نزیکی *proximal* دەست، لەوانەیە بەری پەنجەکانیش بیگرێتەوە، ژێر پێ لە ١٠٪ی نەخۆشەکان دا هەمان دیاردەی تێدایە. (وێنەی ١٦٨)**



**(وێنەی ١٦٨) بیرۆی دەستی زێدە قۆچە کاژی**

## لیردەرکردن Urticaria

**بریتییە لە دەرهاتنی ئاوسانێکی کاتی سووربووەوە یان پەنەماوی oedematous بن توێژ زۆر جاریش لەگەڵ خوران.**

**بەڵام:** پەنەمانی بۆری (لیردەرکردنی زەبەلاح) giant urticaria (angio-oedema)، **بریتییە لە ئاوسانی کاتی لە قووڵی بن توێژ، یان ژێر پێست یان ژێر ناوپۆش دا.**

**داڕمانی سیستمی (سەراپایی)** systemic anaphylaxis: **بریتییە لە بارێکی مەترسیدار بۆ ژیان، بەهۆی کاردانەوەی هەستیاری ئەنجام دراو بە IgE و لە کۆمەڵێك سکالا و نیشانە پێك دێت، کە ئەمانەن: سووربوونەوەی بڵاو، خوران، لیردەرکردن، پەنەمانی بۆری، دابەزینی پەستانی خوێن و ناڕێکی لێدانی دڵ.**

**جۆرەکانی**

## ١- ليردەرکردنی ئاسایی Ordinary urticaria

**هۆکانی:**

١) دەرمان drugs: لە هەموو هۆکان باوترە، وەك پەنسلين penicillin، هەندێك جار پەنسلينی ناو خواردەمەنی، ئەسپرين (ڕێژەی ٣٠٪ی باری ليردەرکردنی درێژخايەن بە ئەسپرين دووبارە رووەداتەوە). سيفالۆسپۆرينەکان وەك سيفالێکسين، نسايدس NSAIDs و هی تريش.

٢) خۆراك: وەك چوکلێت، گوێز، بەزاليا، پاقلە، شليك، گۆشتی بەراز، کالەك، برنج، گۆشتی گا، سێو، ليمۆ، هەرمێ – تاد.

٣) تێکەڵکراوەکانی ناو خۆراك food additives، وەك هەوێن yeast، ساليسيلەيتەکان salicylates، سرکە، هێلکە، پرۆتينی (ئەلبۆمينی) ماسی، رەنگی ئازۆکان azo dyes (کە دەکرێتە ناو خواردن و خواردنەوە)، ترشی بەنزۆيك، سەلفايتەکان و پەنسلين.

٤) تووشێنەکان infections: وەك تووشێنی سەرەوەی سيستمی هەناسەدان ،بۆ نموونە بە بەکترياى سترێپتۆکۆکەس streptococcus، يان تووشێنی ئاڵووەکان، ددان کلۆربوون، تووشێنی لۆچەکانی لووت sinuses ، توورەکەی زراو، پرۆستات، ميزەڵدان و گورچيلە. ڤايرۆسەکان وەك سۆی جگەر بە ڤايرۆسی B يان C، تيژە تووشێنی تاکناوکی acute infectious mononucleosis ، کرمی ريخۆڵە وەك کرمی ئەسکارس، ئەنکيليستۆما، فيلاريا، سترۆنگيلۆيديس، شستۆزۆما، تۆکسۆکارا و کرمی جگەر، لە وڵاتی ئێمە دا مەلاريا زۆر دروستی دەکات.

٥) باری دەروونی شێواو.

٦) مێنتۆل menthol: لە جگەرەی کێنت دا، دڵۆپەی کۆکە، سپرای هەڵمژين و لە کرێم دا هەيە.

٧) شێرپەنجە: وەك نەخۆشی هۆدچکن، شێرپەنجەی خوێن و شێرپەنجەی تر.

٨) هەڵمژراوەکان inhalants: وەك هەلاڵەی گوڵ و گيا، تۆزی ناومال، پەڕ، فۆرمالديهايد، تۆزی فوولی سۆدانی، بۆنی نيسکی لێنراو، تۆوی پەمۆ، تووکی ئاژەڵ و بۆنی ماکياج.

٩) مەی: خواردنەوەی ئەلکهول، بۆ نموونە واين سەلفايتی تێدايە.

١٠) نەخۆشی سيستمی وەك پەريزادەی ژەهراوی thyrotoxicosis

## دەردزانی (چۆنیەتی روودانی) لیردەرکرن Pathogenesis

پارۆیی دەزوولەکان capillary permeability لە ئەنجامی پتر دەردانی مـژادی هیستامین لە کۆلکەخانەکان دا (خانەکانی ماست) mast cells ،کە دەوری دەزوولەکانی داوە، دروست دەبێت. بۆیە خانەی سەرەکی لە دروستبوونی لیردەرکردن کۆلکەخانەیە. مژادی تریش جگە لە هیستامین دەبنە هۆی فراوانبوونی بۆری خوێنەکان و دەلاندن (دەرچوونی زەرداوی خوێن serum لە ناوەوە بۆ دەرەوەی دەزوولەکان) و دروستبوونی لیرو پەنەمانی بۆری angio oedema، ئەم مژادانە بریتین لە: سیرۆتۆنین serotonine، لیوکۆترایینەکان leukotrienes، پرۆستاگلاندینەکان prostaglandines، پرۆتیەیسەکان proteases و کایینینەکان kinines. هەروەها ئاستی پرۆتینی بنەڕەتی سەرەکی ئیۆزینۆفیلەکان (لە ناو خوێن دا) لە ٤٠٪ی باری لیردەرکردن دا بەرزدەبێتەوە. لە ٣٠٪ی باری لیردەرکردنی درێژخایەنی هۆنەزالراودا دژە تەنی خۆیی auto antibodies لە ناو خوێن دا هەیە کە جۆری IgG یە و دەبێتە هۆی زێدەڕژانی هیستامین، ئەم IgG یە بە وەرگری IgE یەوە دەلکێت، هەندێك نەخۆش IgGیان هەیە کە بە IgE یەوە نالکێت بەلام راستەوخۆ دەنکۆلەکانی کۆلکەخانە فرێی دەداتە دەرەوە و مژادە لیردروستکەرەکان دێنە دەرێ.

لە لیردەرکردنی درێژخایەن لە مێینە دا دژەتەنی خۆیی بۆ رژێنی ثایرۆید thyroid (ملەقۆرتە گلاند) زۆر باوە بێ ئەوەی نەخۆشی ئەم رژێنە هەبێت. بەلام لەوانەیە ئەم دژەتەنە خۆییانە رۆلیان لە لیر دروستکردن دا هەبێت.

نموونە وەرگرتن: پەنەمانێکی کەمی بن توێژ و نووسانی لیوکۆسایتەکان بە دیواری ناوەوەی خوێنهێنۆچکەکان venules روودەدەن، دواترئەم خرۆکە سپیانە دەڕۆنە دەرەوەی ئەم بۆریچکانە بۆ ناو شانەی نێوانەیی interstitial tissue و ئیۆزینۆفیل و لیمفۆسایتەکانیشی لەگەلدایە.

کۆمەلێك نەخۆش لیرەکانیان لە ٢٤ کاتژمێر پتر دەمێنێتەوە و لە نموونە وەرگرتن دا نیوترۆفیلی زۆر دەوری بۆریچکە خوێنەکان دەدەن و پێی دەلێن لیردرەکردنی نیوترۆفیلی neutrophilic urticara، ئەم جۆرە یان تیژە یان درێژخایەنە یان جۆری فیزیکیە.


(وێنەی ١٦٩) لیری تیژ.

**سکالا و نیشانەکانی لیردەرکردنی ئاسایی:** ٣ جۆری هەیە:

أ) **لیردەرکردنی تیژ** Acute urticaria: (وێنەی ١٦٩) لە شەش حەفتە کەمتر دەخایەنێت و پەلەی بەخورووی سووربووەوە دەردێن و خێرا دەبن بە لیری ( =رووبەری بەرزبووەوەی پەنەماوی پەمەیی کال) دەوردراو بە فلەیر flare ( کە بریتیە لە شەپۆلێکی بەرزبووەوەی رەنگ پێستی). لە هەموو شوێنێکی لەش دا روودەدەن، بچووك وەك تەنۆچکە

یان بڵاوتره، خڕ، بازنەیی، نیوبازنەیی، فرەکەوانەیی یان شێوەی ترن، خورانەکە بریندارکەر نییە بەڵکو شێوەی سڕینی rubbing هەیە، شەوان یان پێش تێکەوتن (پێش خوڵی مانگانە) premenstrually پترە و لیرەکان چەند کاتژمێرێك تا ٢٤ کاتژمێر دەمێننەوە، ڕێژەی ٥٠٪ی بارەکان لیردەرکردنی زەبەلاحی angio oedema لەگەڵدایە کە تێیدا ئاوسانی پەمەیی یان کاڵ پتر لە سەر پێستی دەم وچاو، پێڵووی چاو، لێو و هەندێك جار گوێچکە، مل، دەست، پێ و کۆئەندامە سێکسیەکان یان ئاوسانی ناوپۆشی دەم، زمان، قورگ و گەروو pharynx دروست دەبێت، لەوانەیە لەم جۆرە زەبەلاحەدا لیرەکان چەند ڕۆژێك بمێننەوە.

هەندێك جار لیردەرکردن بە ڕشانەوە دەست پێدەکات، دواتر لەگەڵ لیردەرکردنەکە هەست بە لاوازی، سەرئێشە، ڕشانەوە، سك ئێشە، سکچوون، ئازاری جومگە، گێژبوون و بوورانەوە هەن و لەوانەیە بچێتە قۆناغی دارمانی سیستمی systemic anaphylaxis (کە بە خوران یان زورانەوەی دەم و دەست و پێ و کۆئەندامە سێکسیەکان دەست پێدەکات، دواتر سووربوونەوەی بڵاوبووەوە، لیردەرکردن، پەنەمانی بۆری angio oedema، فرمێسك، لووت گیران و ئاوکردن، هەناسەسواری، پەنەمانی قورگ، دڵ تێکەڵهاتن، ڕشانەوە و سکچوون، دابەزینی پەستانی خوێن، نارێکی لێدانی دڵ و بە دەگمەن مردن ڕوودەدەن).جۆرەکان:

١- لیردەرکردنی هۆنەزالراوی تیژ Idiopathic acute urticaria: ڕێژەی ٥٠٪ی بارەکانە و هۆکەی دیار نییە.

٢- لیردەرکردنی هەستیاری تیژ Acute allergic urticaria: لێرەدا دژە ژیندەر Ag لەگەڵ دژەتەن Abی لکاو بەهۆی IgE لەسەر دیواری کۆلکەخانە (خانەی ماست mast cells یەك دەگرێت ، ئەمەش دەبێتە هۆی فڕێدانی دەنکۆڵەکانی ناو خانەی ماست کە مژادە لیردروستکەرەکانی تێدایە، کەواتا نەخۆش پێشتر ئەم دژە ژیندەرەی چۆتە ناو بەڵام بۆ جاری داهاتوو نەخۆش هەستیار بووە، بۆیە لە چەند خولەکێك یان کاتژمێرێك دا لیرەکان دەست پێدەکەن، ئەمە جۆری یەکەمی سیستمی بەرگری لەش ڕۆڵی تێدادەبینێت ،لەوانەیە دژەژیندەر لە ڕێگای دەم، ماسولکە و خوێن (وەك دەرمان بە دەرزی لێدان) یان هەڵمژین، یان بەرپێست کەوتن بچێتە ناو لەش، دژەیندەرەکان زۆرن، هەندێك نموونە لەماڵەی خوراوەوەن: پێوەدانی هەنگ، زەردەواڵە، مێرووی تر، پەنسلین، سیفالۆسپۆرینەکان، ئینسۆلین، پێکوتەکان vaccins، پێکهاتەکانی خوێن، ڕۆبیان، کوللەی دەریا، قرژاڵ، ماسی، شیر، گوێز، پاقلە، پەتاتە، کەرەوس، مەعدەنوس، گێزەر، بەهارات، برنج، مۆز، سێو و پرتەقاڵ.

٣- نەخۆشی زەرداوی خوێن Serum sickness: ئەم جۆرە بەهۆی وەرگرتنی زەرداوی خوێن sera بە ڕێگەی سمت یان خوێن parenteral، بۆ چارەسەری نەخۆشی تر ،ڕوودەدات ، یان بەهۆی دەرمان drugs بە تایبەتی پەنسلین، یان ڕەنگینەی ئێکسبەرداری radiocontrast media، میکرۆبەکان infections و بە دەگمەن خواردەمەنی. ئاوێتەی بەرگری immun complex دروستبوو بە یەکگرتنی دژەژیندەر و دژەتەن جۆری IgG بە بوونی زیادەی دژە ژیندەر Ag، ئەم ئاوێتە بەرگریە دەنیشێتە سەر شانەکان و پێست. ئەم نەخۆشیە لە ١-٣ حەفتە دا یان زووتریش دەست پێدەکات و (٥-٢٨) ڕۆژ دەمێنێتەوە. نیشانەکانی بریتین لە تا، ئازاری جومگە، ئاوسانی گرێ لیمفەکان، کۆکە، تێکچوونی ئیشی ڕیخۆڵە و سۆی گورچیلە، دەردە لیریەکان بەردەوامن و چەند ڕۆژێك دەمێننەوە، هەندێك جار بە ئازارن و شینکین bruising.

٤- لیرەدەرکردنی ناهەستیاری تیژ Acute non-allergic urticaria: ڕۆڵی سیستمی بەرگری تێدا نییە بەڵکو یەکەمجار کە مژادەکە دەچێتە ناولەش دەبێتە هۆی پڕبوونی هیستامین و لیردەرکردن، بۆ نموونە: دەرمان وەك ئەسپرین، نسایدس NSAIDs، پۆلیمیکسین polymyxin، ڕەنگینەی ئێکسبەرداری، دەرمانی بەنج، خواردن (وەك پەنیر، ماسی، گۆشت، تەماتە، سپێنەی هێلکە و شلیك)، یان میکرۆب وەك ڤایرۆسی جگەرسۆ جۆری B، سترپتۆکۆکەس، ڤایرۆسی ئێپستاین بار Epstein-Barr، - تاد.

ب) **لیردەرکردنی درێژخایەن** Chronic urticaria: لیردەرکردن زۆربەری کاتەکانی ڕۆژ بۆ پتر لە ٦ حەفتە هەیە و هیچ پەیوەندی بە جێگۆڕاوەوە atopy نییە وەك جۆری تیژ ﴿کە لەو نەخۆشانەی جێگۆڕاویان هەیە پترە وەك هەناسەتوندی، تای کاگەنین و بیرۆی جێگۆڕاو﴾، ڕێژەی ٣٧٪ی نەخۆش جۆری تریان هەیە ،وەك لیردەرکردنی پەستان pressure urticaria، - تاد. زۆربەی بارەکان هۆی نەزانراوە.

ج) **داڕمانی سیستمی (سەراپایی)** Systemic anaphylaxis: باسمان کرد، بەڵام هۆکانی بریتین لە: دەرمان بە تایبەتی پەنسلین (دەرمانی تریش)، ڕەنگینەی ئێکسبەرداری، پێوەدانی هەنگ و زەردەواڵە و قرژاڵو ڕۆبیان و کوللەی دەریا، هەروەها وەرزش لە گەڵ خواردنێکی تایبەت پێش وەرزشەکە. زۆربەیان جێگۆڕاویان هەیە.

**هەڵسەنگاندنی لیردەرکردن**

١- دەستنیشانکردنی لیردەرکردن سەرجێی یە clinical.

٢- ئەگەر لیرەکە لە یەك شوێن دا بۆ پتر لە ٢٤ کاتژمێر مایەوە ئەوە بیر لە جۆری تر دەکەینەوە وەك: خوێنبۆریەسۆی لیری urticarial vasculitis، هەڵتۆقیوی بەرگریە بلّق immunobullous eruptions، فرەشێوەسووریٔ erythema multiforme، بازنە گۆشتەزوونەگمۆڵی granuloma annulare، نەخۆشی سارکۆید، یان لیمفۆمای خانەی T.

٣- مێژووی نەخۆشیەکە: پرسیارکردنی تەواو دەربارەی خواردەمەنی، دەرمان، ئەسپرین، هۆکارە فیزیکیەکان و پشکنینێکی تەواوی پێست و ناوپۆشەکان.

٤- ئەگەر لیری نەبوو بەڵام پەنەمانی بۆری هەبوو ئەوە بیر لە پەنەمانی بۆری بۆماوەیی یان نەهێڵی ئەنزیمی ئەنجیۆتێنسین گۆڕێن angiotensine converting enzyme inhibitors (ACEI) دەکەینەوە.

٥- ئەگەر نەخۆشەکە گرفتی لۆچەکانی لووتی sinuses هەبوو ئەوە ئێکسبەرداری (تیشکی Xی) بۆ لۆچەکانی لووتی وەردەگرین بۆ زانینی سۆی لۆچەکان(لۆچەسۆ).sinusitis .

٦- کە نەخۆش لە شوێنێك بوو بێت کە کرمی مشەخۆری زۆر بێت، ئەوە پشکنینی خوێن بۆ رێژەی ئیۆزینۆفیلەکان (چونکە ژمارەیان زۆردەبێت) لەگەڵ پشکنینی پیسایی بۆ مشەخۆرەکان دەکەین.

٧- لە باری درێژخایەن دا پشکنین بۆ نەخۆشی ملەقۆرتەگلاند، نەخۆشی بەستەرەشانەکان connective tissue diseases، گۆڕانکاری لە ئیشی ریخۆڵە و میزەڵدان، دەلاندنی کیلەك و میزەجۆ، تووشێنی جێگەیی localized infections و زەردوویی دەکرێت، ئەگەر یەکێك لەوانەی باسمانکرد گومانمان لێکرد، ئەوە پشکنینی تەواوی بۆ دەکەین، هەندێك جار پشکنین بۆ تەواوکەری ٤ و ئەنزیمی نەهێڵی ئیستەرەیسی CI دەکەین.

٨- پشکنینی RAST {ئەزموونی پێستە بۆ کاردانەوەکانی گوێزراوە بە IgE (IgE mediated reactions)}، تەزیوە پرۆتینەکان cryoproteins، فاکتەری دژە ناوك ANFو تێکرایی نیشتنی خرۆکە سوورەکان ESR.

٩- ئەزموونی هەژێنی ( دووبارە دروستکردنەوەی) لیرەکان provocation tests بۆ لیردەرکردنی فیزیکی.

## ٢- بەرگریە ئاوێتە لیردەرکردن Immun complex urticaria

باسمانکرد، وەك نەخۆشی زەرداوی خوێن serum sickness و هەندێك لیردەرکردنی هەستیاری بە دەرمان. لێرەدا سیستمی بەرگری جۆری ٣ رۆڵی تێدا دەبینێت.

### ٣- خوێنبۆریەسۆی لیری Urticarial vasculitis

ڕێژەی ٥-١٠٪ ی لیردەرکردن ئەم جۆرەیە، لێرەدا: ١) لیرەکان بۆ پتر لە ٢٤ کاتژمێر چەسپاون fixed واتا ماونەتەوە ٢) ئازار و کزانەوە (نەك خوران) هەن، ٣) دوای چاکبوونەوە پەڵەی تۆخ یان خوێناوی purpura جێ دەهێڵن، لە ٣ساڵ دا زۆربەیان چاکدەبنەوە و سیستمی بەرگری جۆری ٣ ڕۆڵی هەیە، لە نموونە وەرگرتن دا سۆی بۆری خوێن و بوونی نیوترۆفیلەکان لە شانە نێوانەییەکان دا interstitial tissues شەلێنەرن. لەوانەیە چەند نەخۆشی تر لە ژێر ئەم جۆرەدا هەبن، وەك تێکچوونی ئیمیونۆگلۆبیولینەکان gammopathies (جۆری IgG و IgM)، گورگەسوورەی سەراپایی SLE، نەخۆشی زەرداوی خوێن serum sickness، تووشێنی ڤایرۆسی جگەر جۆری C و نەمانی تەواوکەری $CI_q$ کە تێیدا جومگەسۆ، پەنەمانی بۆری angiooedema، چاو تێکچوون، هەناسەسواری، نەخۆشی سی و ریخۆڵە و گورچیلە لەوانەیە هەبن و هەر لە مێینەدا ڕوودەدات، بەڵام جگە لە نەمانی $CI_q$ جۆرەکانی تر لە هەردوو ڕەگەزدا هەن.

### ٤- لیردەرکردنی تەنۆچکەیی Papular urticaria

بەهۆی پێوەدانی مێروو وەك مێشوولە یان کێچ بە تایبەتی لە لاقەکانی مناڵ دا ڕوودەدات، چونکە ئەم مێروانە بە پێوەدان پرۆتینی ناولیکیان دەخەنە ناو پێست و جۆری کاردانەوەی بەرگری I بە شێوەی لیر ڕوودەدات کە لەوانەیە ببێت بە بلّق و لە ناوەڕاستی لیرەکەدا ناوك punctum (چاڵی شوێنی پێوەدانەکە) وەك خاڵێك دیارە، لەوانەیە ئەم جۆرە بۆ جۆری چواری سیستمی بەرگری بگۆڕێت و بەمەش تەنۆچکە زۆر بەخوورووەکە ڕەقتر دەبێت و لەوانەیە چەند حەفتەیەك بۆ چەند مانگێك بمێنێتەوە.

### ٥- لیردەرکردنی فیزیکی Physical urticaria

هۆکارەکانی فیزیکین، ئەمانەش جۆرەکانیەتی:

١) لیردەرکردنی نەخشەیی Dermographism: باوترین جۆرە و ٢-٥٪ خەڵکی تووشیان دەبێت، بریتییە لە دروستبوونی لیری هێڵی لەگەڵ شەپۆلی دەوری flare لیرەکە لە ئەنجامی خشاندنی تەنێکی ڕەق (وەك قەڵەم - تاد)، خێرا دەردەچێت و لە ٣٠ خولەك دا نامێنێت. جۆرێکیان کە پێی دەڵێن لیردەرکردنی نەخشەیی درەنگ delayed dermographism) دوای لیری سەرەتایی یان بێ ئەم لیرە، لە ٣-٦ کاتژمێردا لیرە نەخشەییەکە دەردەچێت و لە ٢٤-٤٨ کاتژمێردا نامێنێت).

ئەم لیرە نەخشەییە لە هەموو تەمەنێك دا بە تایبەتی لە ١٠-٣٠ساڵی دا دەردەچێت، پەیوەندی بە جێگۆڕاوەوە atopy نییە. هۆکاری نەزانراوە، بەڵام هەندێك جار بە دەرمان وەك پەنسلین دروست دەبێت، هەندێك جار خورانی زۆری لەگەڵدایە و لەوانەیە هۆیەکی خورانی پێستی گشتی بێت. بە لێخشاندنی جلوبەرگ، نینۆك (دەست) یان زەبر دروست دەبێت. مژادی هیستامینی رێژە زۆربوو دروستی دەکات، چەند ساڵ دەخایەنێت (هەندێك جار ١٠ ساڵ) (وێنەی ١٧٠).



(وێنەی ١٧٠) لیری نەخشەیی

٢) **لیردەرکردنی درەنگی پەستان** Delayed pressure urticaria: بریتییە لە دەرهاتنی ئاوسانی قوولی جێیی سوورباو erythematous deep local swellings دوای پەستانی بەردەوام بۆ سەر پێست، دوای پەستانەکە بە ٢/١ – ٩ ( تێکرایی ٤–٨) کاتژمێر ئەم لیرە دەردەچێت و لە ماوەی ١٢-٧٢ کاتژمێردا نامێنێت. ٢٪ ی خەڵکی هەیانە، بەڵام رێژەی ٣٧٪ی لیردەرکردنی ئاسایی درێژخایەن ئەم جۆرەشیانی لەگەڵ دا هەیە، ماوەیەکی کەم تا چەند ساڵێك دەمێنێتەوە. لیرەکان لە ژێر جلوبەرگی توند (تەسك) وەك ژێر پشتێن و سوخمەی مەمك دەردێن، لە سمت دوای دانیشتن بۆ ماوەیەك لەسەر کورسی رەق، لە دەست دا بە ئیشی قورس، لە پێدا دوای رۆیشتن روودەدەن. لیرەکان پتر بە ئازارن نەك بە خوروو بن بە تایبەتی لە ژێر پێ و پێستی سەردا و لەوانەیە لەگەڵ لیرەکان دا نەخۆش بێ هێز بێت و سکاڵای وەك هەڵامەت و ئازاری جومگە و ماسولکەی هەبێت و پتربوونی رێژەی خرۆکەی سپی leukocytosis و ESR ی بەرزی هەبێت. بۆ **تەزموونی دروستکردنی لیرەکان:** کێشێکی ٥ کگم ی دەخرێتە سەر پێست بۆ ٢٠ خولەك و دوای ٤–٨ کاتژمێر لیر لە شوێنی کێشەکە دەردەچێت.

٣) **لەرینە پەنەمانی بۆری** Vibratory angio oedema: زۆر دەگمەنە، جۆری بۆماوەیی و وەرگیراوی aquired هەیە، دوای لەرینەوە لە چەند خولەکێك دا ئاوسانی سووری جێیی بە خوروو دروست دەبێت و لە چەند کاتژمێرێك دا نامێنێت. پاڵ پێوەنان بە لەراندنەوە، سواربوونی ولاخ، خۆسرینەوەی بە پەلە بە خاولی و ئامێری کۆنکرێت هەڵکەندنەوە دەبنە هۆی دروستبوونی ئەم لیرانە.

٤) **لیردەرکردنی گەرمی Heat urticaria**: دوو جۆری هەیە:

أ- **لیردەرکردنی وزەکۆلین Cholinergic urticaria**: بریتییە لە دەرهاتنی لیری بچووکی (١-٣ ملمی) زۆر بە خورووی دەوردراو بە سووربوونەوە ،بە تایبەتی لەسەر قەد و دەم وچاو، پاش ئارەقکردنەوە بەهۆی جوولان (وەرزش)، گەرما، تا، تێکچوونی دەروونی ( وەك شەرمکردن، تووڕەبوون، هاوارکردن یان پێکەنین)، یان خواردنی توون وەك بیبەری تیژ. هەندێك جار بۆماوەییە، زۆرتر لە گەنج دا هەیە و لە زستان دا باوە. (وێنەی ١٧١)




**(وێنەی ١٧١) لیری وزەکۆلین.**

هەندێك جار لیردەرکردنی ئاسایی ئەم جۆرەشی لەگەڵدایە. لەوانەیە نیشانە و سکاڵای تری لەگەڵدابێت وەك دەم وچاو سوورهەڵگەڕان flushing، بوورانەوە، هەناسەسوواری، دڵ تێکەڵهاتن، ڕشانەوە و سکچوون. هەندێك نەخۆش بە وەرزش ئەم لیرە تووشی خۆیان دەکەن و بۆ ٢٤ کاتژمێری داهاتوو تووشیان نابێتەوە. لیرەکان لە چەند خولەکێك دا دەردەچن و لە ٣٠ – ٩٠ خولەك دا نامێنن. ڕێژەی ٥٪ی باری لیردەرکردن ئەم جۆرەیە.

ب- **لیردەرکردنی گەرمای جێیی Localized heat urticaria**: زۆر دەگمەنە، گەرمکردنەوەی پێست بۆ ٣٨-٥٠ پلەی سەدی بۆ ٢-٥ خولەك دەبێتە هۆی لیردەرکردن لە شوێنە گەرمکراوەکەدا.

٥) **لیردەرکردنی ساردی Cold urticaria**: باسمانکرد.

٦) **لیردەرکردنی خۆری Solar urticaria**: باسمانکرد.

٧) **لیردەرکردنی بەرئاوکەوتن Aquagenic urticaria**: بریتییە لە دەرهاتنی لیری بچووك (وەك جۆری وزەکۆلینی)، بە بەرکەوتنی ئاو بە پلەی گەرمای ئاسایی ،لە چەند خولەکێك دا یان دەستبەجێ و لە ٣٠-٦٠ خولەك دا نامێنێت، بەڵام لەم جۆرەدا خوران بە بەرکەوتنی ئاو "نەك لیردەرکردن" باوترە.

٨) **لیردەرکردنی لێککەوتن Contact urticaria**: باسمانکرد.

٩) پەنەمانی بۆری بۆماوەیی Hereditory angio-oedema: لە ١٠-٤٠ ساڵی دا دەردەکەوێت، پەنەمانی بۆری کتوپڕ دەردێت بۆ ٢-٥ رۆژ هەردوو حەفتە جارێك و بۆ ماوەی ژیان بەردەوامە - ئاوسانەکان ناچوونیەکن asymmetrical و لیرو خورانی لەگەڵ دا نییە، ئەم ئاوساوییە لە ژێر پێستدایە و لە دەم و چاو و دەست و لاق و کۆئەندامە سێکسیەکان و سمت دا دەردەکەون.

هەروەها لە ئەندامەکانی هەناو وەك گەدە، ریخۆڵە، میزەڵدان و لە قورگ دا larynx (کە هەناسەسواری دروست دەکات و لەوانەیە نەخۆش بخنکێت و بمرێت) دەردەچن، سك ئێشە و رشانەوەی لەگەڵدایە و پێستی ئاوساو بە ئازارە و لەوانەیە خوێنرێژی بێت. (وێنە ١٧٢)



(وێنەی ١٧٢ أ) پەنەمانی بۆری بۆماوەیی.



(وێنەی ١٧٢ ب) دوای ئاساییبوونەوە( هەمان نەخۆش).

لە جۆری بۆماوەیی لەشی زاڵە aut. dominant و رێژەی ١٪ی پەنەمانی بۆریە. گرفتەکان ٣ جۆرن:

١- جۆری I، Type I: لزمبوونەوەی پرۆتینی نەهێڵی ئیستەرەیسی تەواوکەری I لە دژە ژیندەریدا و کاریگەری دا (CI-E1)

٢- جۆری II، Type II: بوونی ئاستی ئاسایی یان بەرزبووەی دژە ژیندەری ئەم پرۆتینە فرمان شێواوە dysfunctional.

٣- جۆری III، Type III: بوونی کاریگەری ئاسایی و تەواوکەری ئاسایی (CI-E1) و تەنیا لە ژناندا هەیە.

پشکنین بۆ جۆری I و II بریتییە لە ئاستی C4 – Level کە کەمترە لە ئاسایی، هەروەها CI و $C1_q$ و $C_2$ کەم دەبنەوە.

## چارەسەر

تێبینی: لیردەرکردن بە تایبەتی جۆری درێژخایەن و پەنەمانی بۆری دەبێتە هۆی: شێوانی خەوتن، بێزاربوون، دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵ، تێکچوونی باری دەروونی، کەمبوونی چالاکی لە ئیشکردن لە ماڵ و لە کۆمەڵ دا و چالاکی سێکسیش کەم دەکاتەوە.

١- روونکردنەوەی نەخۆشیەکە بۆ نەخۆش، دوورکەوتنەوە لە گەرما، فشاری دەروونی، ئەلکهول ئەسپرین و نسایدس NSAIDs و ئەو خواردنانەی ئەسپرینیان تێدایە، دەرمانە هۆشبەرەکان، بە

تامکەر و ڕەنگکەرەکانی خواردەمەنی و مژادە پاریزەرەکان preservativ وەك خواردەمەنی پاریزراو لە قوتوو دا.

٢- ئەو هۆیانەی لیرەدرکردن کە باسمانکردن بەپێی جۆری لیرەدرکردنەکە دووربخرێنەوە بۆ نموونە لە لیرەدرکردنی خۆری دا نەخۆش دەبێت لە خۆر دوور کەوێتەوە، کرێمی دژەخۆر وجلوبەرگی لەبار لەبەر بکات – تاد.

٣- دژەهیستامینەکان antihistamines (جۆری HI): دوو جۆری سەرەکی هەن، ئارامێن و نارامێن، بەپێی جۆری لیرەدرکردنەکە بەکاردەهێنرێن (تیژ – درێژخایەن، پەنەمانی بۆری، – تاد). نموونەی ئارامێنەکان sedating antihistamines: کلۆرفێنیرامین ١٢ ملگم × ٢، دایفێنهایدرامین ٢٥ ملگم × ٤، هایدرۆکسی زین ١٠-٢٥ ملگم × ٣، سیپرۆهیپتادین ٤ ملگم × ٤، پرۆمیثازین promethazine ١٠-٢٥ ملگم × (١-٣)، ترایمیپرازین ٢,٥-١٠ ملگم × (١-٢)، دۆکسیپین ٢٥-٥٠ ملگم × (١-٣). نموونەی نارامێنەکان non sedating antihistamines: لۆراتادین ١٠ ملگم ×١، دێسلۆراتادین ٥ ملگم ×١، سیتیریزین ١٠ ملگم × ١، لیڤۆسیتیریزین ٥ ملگم × ١، فێکسۆفینادین (٦٠-١٨٠ ملگم) × ١، میزۆلاستین.

* هەندێك جار هەردوو جۆرەکە بە یەکەوە بەکاردەهێنرێن.

٤- ستیرۆیدی (سەراپایی) سیستمی: وەك پرێدنیزۆلۆن ٢٠-٤٠ ملگم / ڕۆژ،دواتر کەمی دەکەینەوە و ئەوسا دەیبڕین. یان بە سمت و بە خوێن وەك دێکسامیثازۆن ٤ ملگم، هایدرۆکۆرتیزۆن ١٠٠ ملگم، – تاد.

٥- دەتوانین لە کاتی سکپڕی دا کلۆرفێنیرامین، تێرفینادین یان ئەستیمیزۆڵ بەکاربهێنین، هەرچەندە ئەم دوانەی دوایی خەریکە لە بازاڕدا نامێنن.

٦- دژەهیستامینی جۆری $H_2$، وەك سایمیتیدین، ڕانیتیدین، یەکێکیان (بە تایبەتی دووەمیان) لەگەڵ جۆری دژەهیستامینی H1 بەیەکەوە بەکەڵکن.

٧- بۆ باری دارمانی سیستمی (سەراپایی): لە نەخۆشخانە چارەسەری دەکەین: دەبێت چارەسەری سیستمی هەناسەدان وخوێنبۆری و دڵ بکرێن، ئێپینەفرین (ئەدرینالین) ٠,٣ مل بە ژێر پێست یان سمت هەر ١٠-٢٠ خولەك جارێك دەدرێت (١/١٠٠٠ سووك کرابێتەوە)، بەڵام بۆ منداڵ ١/٢٠٠٠ سووك کرابێتەوە و هایدرۆکسی زین ٢٥-٥٠ ملگم بە سمت یان دایفێنهایدرامین هەر ٦ کاتژمێر جارێك لەگەڵ ستیرۆیدی سیستمی وەك ٥٠ ملگم هایدرۆکۆرتیزۆن بە ڕێگای خوێن هەر ٦ کاتژمێر جارێك.

٨- بۆ باری یاخی لە چارەسەر: ئەمـانەی خـوارەوە دەدرێـن (بـۆ بـاری دەرێـژخـایـەن): ۱) نیـفیـدیـپیـن، ۲-زافیرلۆکاسـت یـان مۆنتیلۆکاسـت، ۳) زیلیـوتـۆن zileuton، ٤) سـتانۆزۆلۆل و سەلفاسـالازین، ٥) کۆلـچـیسین، ٦) سایکلۆسـپۆرین، ۷) میثـۆتـرێکسـەیت، ۸) پلازمـا فێرێسـس، ۹) ئیمیونۆگلۆبیـولین، ۱۰) ت س و B، ۱۱) پوڤا، ۱۲) ثایرۆکسین.

٩- بۆ پەنەمانی بۆری بۆماوەیی: بەکارهێنانی چڕکراوەی پلازمای نوێی بەستوو concentrates of fresh frozen plasma، بۆ ئەوانەی کە ددان دەکێشن یان ئەگەری زەبر بەرکەوتنیان دەبێت، یـان نەشـتەرگەرییان بـۆ دەکرێـت، چارەسـەری پێشـوەختیان prophylaxis دەدرێـت وەك سـتانۆزۆلۆل ۲۰۰ ملگـم، یـان دانـازۆل ٤۰۰-٦۰۰ ملگـم بـۆ یـەك رۆژ، ئێپسیلۆنەماینۆکاپرۆیك ئەسید ACA ۱۲-۱۸ گم/رۆژ، یـان ترانێکـزامیـك ئەسید tranexamic acid، بـەڵام ئێسـتا نەهێـڵی ئیسـتەرەیسـی [C1 esterase inhibitor] تەواوکـەری I هەیـە و لـە هـەموویان بـۆ چارەسـەر و خۆپاراسـتن «چارەسـەری پێشـوەخت prophylaxis» باشترە.

۱۰- چارەسەری جێیی لیرەکان، بە ئاوی ئاسایی یان سارد یان کامفور و مێنثۆلی جێیی یان شـلەی کالامین دەکرێت.

**بە کورتی چارەسەر بەپێی جۆری لیرەدەرکردنەکە:**

۱- **لیرەدەرکردنی تیژ:** ئەنتی هیستامین جۆری $H_1$ بـە تایبـەتی جـۆری نـارامێن وەك لۆراتـادین + جـۆری ئـارامێن وەك هایدرۆکسـی زیـن بـە شـەو + هەنـدێك جـار سـتیرۆیدی سیسـتمی وەك هایدرۆکۆرتیزۆن HC بە سمت یان بە خوێن یان بێتامیثازۆن بە سمت - ئەوسا کە باشتربوو دوای چەند رۆژێك تا چەند حەفتەیەك وردە وردە لێی دەبڕینەوە.

۲- **لیرەدەرکردنی درێژخایەن:** ئەنتی هیستامین (ئارامین بە شەو) + نارامێن بە رۆژ بۆ ۲ مانگ یـان پتر و بە دەگمەن ستیرۆیدی سیستمی ناوبەناو.

۳- **لیرەدەرکردنی نەخشەیی:** دوورکەوتنەوە لە زەبر trauma + ئەنتی هیستامین و هەندێك جـار لەگەڵ رانیتیدین، پۆڤا یان سیمیتیدین.

٤- **لیرەدەرکردنی وزەکـوڵێنی:** دوورکەوتنەوە لە خواردنی توون (تیژ) و وەرزش و گەرمی، دژە هیستامین نارامێن و ئارامێن، (هایدرۆکسی زین بەشەو و لۆراتادین بـە رۆژ زۆر بـە کـەڵکن) و دانازۆڵ هەندێك جاربەکاردێت.

٥- لیودەرکردنی ساردی: دوورکەوتنەوە لە سەرما و ساردی، جلوبەرگی گەرم لەبەر بکات و ئەنتی هیستامین یان ستانۆزۆلۆل دانازۆڵ، تێربیوتالین (٥ ملگم × ٣) + ئەمینۆفلین (٥٠ ملگم × ٣)، سیتیریزین (١٠ ملگم × ١) + زافیرلۆکاست (٢٠ ملگم ×٢) بەکاردەهێنرێن.

٦- لیودەرکردنی پەستانی درەنگ: داپسۆن (٥٠ ملگم ×١)، مۆنتیلۆکاست (١٠ ملگم × ١) + لۆراتادین (١٠ ملگم ×١)، سەلفاسالازین (٢-٤ گم/رۆژ).

٧- لیردەرەکردنی خۆری: پلازما فیرێسس، سایکلۆسپۆرین.

٨- لیودەرکردنی وزە ئەدرینالینی adrenergic urticaria بریتییە لە لیردەرکردنی تەنۆچکەیی سوور بەهۆی تێکچوونی باری دەروونی، چارەسەر: پرۆپرانۆلول (ئیندیراڵ).

٩- لیودەرکردنی بەرناوکەوتن: دژەهیستامین وەك سیتیریزین، بیکاربۆناتی سۆدیۆم (٢٥-١٠٠ گم) بخرێتە ناو ئاوی خۆشۆردن (بۆ بانیۆی پڕ لە ئاو) یان ت س و B، پۆڤا، پرۆپرانۆلۆل ستیرۆید بە سمت (کیناکۆرت) یان نالترێکسۆن naltrexone ٥٠ ملگم/رۆژ .

١٠- خورانی وزەکۆڵینی: مەلە لەناو ئاوی گەرم ٤٠-٤١ پلەی سەدی یان وەرزش بۆ خاراندن (راهاتن) tolerance، یان سیتیریزین ١٠ ملگم، فێکسۆفینادین ١٨٠ ملگم، لۆراتادین ١٠ ملگم یان دانازۆڵ.

١١- پەنەمانی بۆوری بۆماوەیی: باری تیژ: چڕکراوەی CI-INH ٥٠٠-١٠٠٠ یەکە unit بە دەرزی لە ٣٠-٦٠ خولەك دا ئەگەر پێویست بوو دووبارەبکرێتەوە، دوای ٤٢ خولەك پەنامەنەکە نامێنێت. یان بۆ باری درێژخایەن: دانازۆڵ ٢٠٠ ملگم × ٣ یان ستانازۆلۆل ٤٠٠-٦٠٠ ملگم/رۆژ. یان ترانێگزامیك ئەسید tranexamic acid، یان ئیپسیلۆن ئەماینۆکەپرۆیك ئەسید EACA (epsilon amino caproeic aid) ١٦ گم/رۆژ

# سوورهەڵگەڕان Flushing

بریتییە لە سووربوونەوەی دەموچاو و گوێچکە و مل و هەندێك جاریش سەرەوەی سنگ، هەندێك جار بێ ئارەقکردنەوەیە و هەندێك جاری تریش ئارەقکردنەوەی لەگەڵدایە، لە ئەنجامی کاریگەری راستەوخۆی خوێنبۆری فراوێن (وەك مژادی هیستامین) یان گۆڕانی کۆنترۆڵی دەماری (واتا خوێنبۆری فراوێنی دەماری خۆبەخۆ autonomic nerve vasodilator) دەردەچێت (وێنەی ١٧٣). چەند جۆرێکی هەیە:


(وێنەی ١٧٣) سوورهەڵگەڕان.

١- **سوورهەڵگەڕانی فیسیۆلۆجی** Physiological flushing: بەهۆی:

أ) **گۆڕانی باری دەروونی**: وەك دڵەڕاوکێ anxiety، تووڕەبوون، شەرمکردن – تاد. ئەم جۆرە پێی دەڵێن سوورهەڵگەڕانی شەرمیblushing و ئارەقکردنەوەی لەگەڵدایە و بەهۆی دەماری رووددەدات. چارەسەر: نادۆلۆل nadolol (٤٠–٨٠ ملگم) بەیانیان. ساردکردنەوەی بە سەهۆڵ بۆ هەموو جۆرەکان بە کەڵکە.

ب) **سوورهەڵگەڕانی (گڕ و گەرمی) لێچوونەوە** Menapausal flushing: رێژەی ٨٠٪ی ژنان دوای لێچوونەوە ئەم جۆرەیان تووش دەبێت و ئارەقکردنەوەی لە گەڵدایە. **چارەسەر**: ئیسترۆجین یان کلۆنیدین clonidine ٠,٠٥ ملگم × ٢.

ج) **سوورهەڵگەڕانی گەرمی** Thermal flushing: وەك وەرزش، مانەوە لە گەرماوی گەرم، یان ساونا.

٢- **سوورهەڵگەڕانی خواردەمەنی**: بۆ نموونە، خواردنەوەی شلەی گەرم وەك چا، قاوە، – تاد، خواردەمەنی توون وەك بیبەری توون، spicy food، ئەلکهول – تاد. **چارەسەر**: ئەسپرین.

٣- **دەرمان** Drugs: وەك خوێنبۆری فراوێن vasodilators( وەك نیفیدیپین، گلیسریل ترایناترەیت glyceryl trinitrate، پرۆستاسایکلین، پرۆستاگلاندین E، فینتۆلامین)، فلاجیل، کلۆرپرۆپەماید، برۆمۆکریپتین و دایسەلفیورام.

٤- **نەخۆشی**: وەك نەخۆشی گوڵی (پەمەیی) rosacea، شێرپەنجەی کارسینۆید carcinoid tumor (لە سی یان گەدە یان ریخۆڵە، نیشانەکانی: هەناسەسواری، سکچوون، نەخۆشی دڵ و

ســووربوونەوە)، فیۆکرۆمۆســایتۆما pheochromocytoma، (کــە تێــدا فشــاری خــوێن بەرزبوونەوە، دڵەکوتێ، ئارەقکردنەوە و سووربوونەوە هەن) و نەخۆشی فرەبوونی خانەی ماست (کۆلکەخانە) mastocytosis.

نەزموونەکان Tests:

١- ئەزموونی میز بۆ ٥-هایدرۆکسی ئیندۆل ئەسیتیك ئەسید 5-hydroxy indol acetic acid (5HIAA).

٢- ئەزموونی میز بۆ هیستامین.

٣- ئەزموونی سیرۆتۆنین لە ناو خوێن و خەپلە خوێنەکان دا.

٤- ئەزموونی هیستامین لە پلازمادا.

چارەسەر

١) هۆکەی لادەبرێت، ٢) ساردکردنەوە بە سەهۆڵ، ٣) ئەسپرین، ٤) هۆرمۆن، ٥) دژەهیســتامین جــۆری $H_1$، $H_2$، ٦) کلۆنیــدین، ٧) لانرێۆتایــد lanreotide یــان ئۆکترێۆتایــد octreotide ، ٨) نەشتەرگەری.

# سووربوونەوەکان Erythemas

بریتییە لە سووربوونەوە کە بەکاتی بە فشار نامێنێت blanchable redness، زۆر جۆری هەیە:

١- سووربوونەوەی بەری دەست Palmar erythema: بە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ئیسترۆجین وەك بە ریشاڵبوونی جگەر hepatic cirrhosis، سکپڕی، – تاد روودەدات.

٢- سووربوونەوەی بڵاو (= گشتی) Generalized erythema: بەهۆی دەرمان، ژەهری بەکتریا bacterial toxins و تووشێنی ڤایرۆسەکان روودەدات، زۆربەی لەش بەتایبەتی دەم و چاو، سنگ و بەشی سەرەوەی پەلەکان سووردەبێتەوە، ئەم جۆرە کاتییە و ئەگەر هۆکەی لاچوو ئەمیش نامێنێت.

٣- سووربوونەوەی کۆرپەی ژەهراوی Erythema toxicum neonatorum: باسمانکرد. لە ٢-٣ رۆژی دوای لەدایکبوون دا دەردەچێت و لە دەیەم رۆژدا نامێنێت، سووربوونەوە و پیزۆکەی بچووك و تەنۆچکەی بچووکی دەوردراو بە سووربوونەوە لە دەم وچاو و قەد و بەشی سەرەوەی پەلەکان دا دەردەچێت.

٤- فرەشێوەسووری Erythema multiforme (E.M.)

دوو جۆری سەرەکی هەن:

أ) گچکە فرەشێوەسووری E.M. mior. (وێنەی ١٧٤)

ب) بریتییە لە کاردانەوەیەکی سووربوونەوەیی سەرهەڵداوەی خۆوەستێن لە پێست دا. زۆربەی جار بەهۆی تامیسك دەردەچێت و تێیدا قوتکەی plaques نیشانەیی target لیری لە پێست و زۆر جار لە ناوپۆشەکان دەردەچێت، لە هەموو تەمەنێك دا بە







(وێنەی ١٧٤)
گچکە فرەشێوە سووری.

**تایبەتی لە گەنج و باڵق دا هەیە و زۆربەی جار لە وەرزی بەهاردا ناوەناوە بۆ چەند ساڵێك سەرهەڵدەداتەوە**

**هۆکارەکانی زۆرن، بۆ نموونە:**

١- ڤایرۆسەکان بە تایبەتی **ڤایرۆسی تامیسك herpes simplex، مایکۆپلازما (نەخۆشیەکی سووکی وەك هەڵامەت وایە)، ئەدینۆڤایرۆسەکان، ئەیدز، ملەخڕێ mumps و ئۆرف orf.**

٢- کەڕوو **وەك هیستۆپلازما histoplasma.**

٣- بەکتریاکان، **وەك دوومەڵ و ئاڵوکەوتن tonsillitis.**

٤- **چارەسەر بە** ئێسکبەرداری قووڵ.

٥- نەخۆشی گورگەسوورە (L.E.) و نەخۆشیەکانی تری بەستەرەشانەکان connective tissue diseases.

٦- شێرپەنجە، لیمفۆما، شێرپەنجەی خوێن.

٧- سکپڕی و پێش تێکەوتنی خولی مانگانە.

٨- دەرمان.

٩- سارکۆیدۆسس.

١٠- کاردانەوەی لێککەوتن contact reactions.

١١- لە ٣٠-٥٠٪ی بارەکان دا هۆکارەکەی نەزانراوە.

**نیشانەکانی: دەردەکان بە شێوەی پەڵەی سووری سنووردار دەردێن ، ئەوسا بەرزدەبنەوە و لە ١-٢ رۆژدا دەئاوسێن و قەبارەیان گەورە دەبێت (لە هەندێکیان دا تا چەند سەنتیمەترێك دەبن)، ئەم تەنۆچکانە پێیان دەووترێت دەردی نیشانەیی یان گلێنەی چاو ( target or iris lesions) و لە سێ بەش پێکهاتوون: لە ناوەڕاست دا پەڵەی خوێنی تاریك کە بە بازنەیەکی ئاوساوی بەرزبووەی کاڵ دەوردراوە ، ئەمیش بە پەڵەی سوور دەوردراوە، بەشی ناوەڕاست لەوانەیە بڵقی بێت. دەردەکان لەسەر بەر و پشتی دەست و پێ، بەشی دەرەوەی پەلەکان، ئانیشك و ئەژنۆ و دەم و چاو دەردێن. لە ١٠٪ی بارەکان دا لەسەر قەد و ران و سمت و هەندێك جار پڕ شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان بەهۆی ت ش و دەیگرن یان دیاردەی کۆبنەری تێدایە (لە شوێنی برین و زەبر دەردێن)، لە ٢٥٪ی بارەکان دا ناوپۆش ( وەك ناودەم) بە شێوەی قوتکەی رەق، دەردی نیشانەیی یان داماڵین erosions دەیگرێت.**

**لە ژنان دا جۆرێکی نائموونەیی atypical بە شێوەی رووبەرێك یان هێڵێك لە یەك لای لەش دا هەیە و دەردەکان گەورەن.**

ئەم نەخۆشیە ١-٤ حەفتە ( زۆربەی جار ٢ حەفتە) دەخایەنێت و زۆربەی جار جیشوێن جێناهێڵێت.
بە گشتی ساڵی ٦ جار سەرهەڵدەداتەوە، (بەڵام لەوانەیە پتر یان کەمتر بێت).
دوای ٢ ساڵ سەرهەڵدانەوە کەمتر دەبێت بەڵام لەوانەیە تا ١٠ ساڵ بەردەوام بێت.
لە ٧٠٪ی بارەکان دا دوای تامیسك (نزیکەی دوای ٨ رۆژ) سەرهەڵدەداتەوە.
ئەگەر ستیرۆیدی سیستمی بەکاربێت لەوانەیە نەخۆشییەکە کاتێکی درێژتر بخایەنێت.

**چارەسەر**

١- شلەی کالامین، ستیرۆیدی جێیی ، دەرمانی دژە ئازار، دژەهیستامین .
٢- بۆ ناو دەم – دەرمانی دژەچاڵەبرینی گەدە antacids، ستیرۆیدی جێیی، سڕکەری جێیی، خواردنی نەرم.
٣- ئەگەر ستیرۆیدی سیستمی بەکارهێنرا، دەبێت لەگەڵ دژە ڤایرۆسی تامیسك بەکاربێت.
٤- بۆ بارە دووبارەبووەکان بەهۆی تامیسکەوە، ئەسایکلۆڤیر acyclovir (٤٠٠-٨٠٠ ملگم/رۆژ)، ڤالاسایکلۆڤیر (٥٠٠ ملگم/رۆژ) یان فامسایکلۆڤیر famciclovir (٢٥٠ ملگم/رۆژ) بۆ ٦ مانگ بەکاردەهێنرێت.
٥- هۆکارەکانی تر چارەسەر دەکرێن یان دووردەخرێنەوە.

ب) **گەورە فرەشێوەسووری** Erythema multiforme major ، گ.ف.س
=**کۆنیشانەی ستیڤنس جۆنسن** SJS (Stevens Johnson syndrome)(**وێنەی ١٧٥**)







**(وێنەی ١٧٥)**
**کۆنیشانەی**
**ستیڤنس جۆنسن**

**نزیکەی ١٠-٣٠٪ی رووی پێست دەگرێتەوە و دوو جۆری هەیە:**

١- گ.ف.س. ی ئاسایی:- **قوتکەی نیشانەیی تێدایە،پتر لە دەست و پێدا. زۆرتر بە ڤایرۆس دروست دەبێت.**

٢- گ.ف.س. ی زۆر بە تەوژم و جیانەکراوەیە لە نەخۆشی **ژەهرەتوێژ داڕزانەشیبوونەوە** (TEN). ( **قوتکەی نیشانەیی نائاسایی تێدایە لەگەڵ**

تووشبوونی پێستی تر جگە لە دەست و پێ، پڕ دارزانی پێست هەیە و بە هۆی دەرمان دروست دەبێت).

ئەم نەخۆشیە کتوپڕ دەست پێدەکات هەرچەندە لەوانەیە (١-١٣) رۆژ پێشتر گەندە تا و لاوازی و چەند نیشانەیەکی هەڵامەتی هەبن. زۆر ئەندام دەگرێتەوە بەم شێوەیە:

- دەم و لێو: هەموو (رێژەی ١٠٠٪یان) نەخۆشەکان بڵقی گەورە ئەوسا دامالێن erosions و پەردەیەکی سپی و خۆڵەمێشی و قەتماغەی خوێناوی لە لێو و ناودەمیان دەردەچێت.
- چاو: رێژەی ٩٠٪ی نەخۆشەکان سۆی پێڵووپۆش و هەندێك جار بڵقیشیان تووش دەبێت، چاڵەبرینی پەرگلێنە، سۆی ناوچاو uveitis، یان سۆی هەموو چاو panopthalmitis هەن. دوای چاکبوونەوەش نووسانی پێڵووپۆش و پێڵوو بەیەکەوە، یان لێڵبوونی پەرگلێنە و کوێربوون لەوانەیە روودەن.
- پێست: رێژەی ٨٠٪ی نەخۆشەکان وەك باسمانکرد پێستیان دەگرێتەوە.
- کۆئەندامە سێکسیەکانی نێرینە: رێژەی ٥٧٪ی نەخۆشەکان تووشیان دەبێت.
- سۆی دەوری کۆم ٥٪ و سۆی بۆری هەوا bronchitis ٦٪ و سۆی سپییەکان ٢٣٪ روودەدەن.

ئەم نەخۆشیە ٣-٤ حەفتە دەخایەنێت.

هەموو جۆرەکانی نەخۆشی فرەشێوەسووری بەتایبەتی ئەوانەی بەهۆی تامیسکەوە دروست دەبن سەرهەڵدەدەنەوە recurring.

جۆری (٢) گ.ف.س لەرز و تا و لاوازی و زارئێشە و چاوئێشە و دەروون تێکچوون و بێزاری تریشی لەگەڵدایە. کەمتر لە رێژەی ١٪ی نەخۆشەکان دەمرن.

**چارەسەر**

١- لە نەخۆشخانە چارەسەردەکرێت.

٢- گرنگیدان بە ئازار و تا و خواردن و هاوسەنگی ئاو و خوێی ناو لەش.

٣- لابردنی هۆکان وەك دەرمان، چارەسەرکردنی تامیسك، دەرمانی دژەبەکتریا، - تاد.

٤- بۆ ناو دەم: شۆردنی ناودەم بە شلەی تێتراسایکلین لەگەڵ نیستاتین یان لەگەڵ ٢٪ گلۆکۆناتی کلۆرهێکسیدین، خواردنی نەرم soft diet، سرکەرە جێیەکان topical anaesthetics وەك جێلی لیدۆکاین، بێنزۆکاین یان ٠,١٥٪ هایدرۆکلۆرایدی بێنزیدامین benzydamine hydrochloride، ستیرۆیدی جێی بۆ ناو دەم وەك هەویری ٠,١٪ ترایئەمسینۆلۆن ئەسیتۆناید triamcinolone acetonide paste، یان بودیسۆناید budesonide، سپرای بێکلۆمیثازۆن

beclomethasone inhalers رۆژی ٣-٤ جار ، هەندێك جار ژەمی بەرزی پرێدنیزۆلۆن.

٥- بۆ چاو: شۆردنی چاو بە سەلاین و لابردنی قەتماغەکان، ئەنتیبایۆتێکی جێی وەك کلۆرامفێنیکۆڵ لەگەڵ یان بێ ستیرۆید و پاککردنەوەی چاو لە پیسی .debridement

٦- بۆ باری توند: داپسۆن ١٠٠-١٥٠ ملگم/رۆژ، ئازاثایۆپرین ١٠٠-١٥٠ ملگم/رۆژ، ثالیدۆماید ١٠٠-٢٠٠ ملگم/رۆژ، پۆتاسیۆم ئایۆداید KI ٣٠٠ ملگم × ٣ بۆ یەك حەفتە.

بۆ ناو دەم: لیڤامیسۆڵ ١٥٠ ملگم/رۆژ ( ٣ رۆژ لە حەفتەیەك دا - بۆ ماوەی ٤-٨ حەفتە).

ئازاثایۆپرین + رۆژنارۆ ١٥-٢٠ ملگم پرێدنیزۆلۆن.

ج) **ژەهرە توێژ داڕزانەشیبوونەوە** Toxic epidermal necrolysis (TEN)

پتر لە ٣٠٪ی رووی پێست دەگرێتەوە و هەر وەك گ.ف.س.جۆری دووەمیانە بەڵام بڵاوترە و زۆر بە کتوپڕی دەست پێدەکات. (وێنەی ١٧٦)

یەکەم جار وەك دەردێکی پەڵەی سوور یان خاڵاوی سوورە لە سەر و مل و قەد دا، ئەوسا بۆ هەموو یان زۆربەی لەش بڵاودەبێتەوە لەگەڵ پێست داماڵین دا و وەك سووتانی پلەی دوو و سێی لێدێت، نیشانەی نیکۆلسکی Nickolsky sign تێدایە (واتا: ئەگەر پەستان بە پەنجە گەورە بخەینە سەر پێستە نەخۆشەکە بە شێوەیکی لار، ئەوە پێستی ژێر پەنجەکە دادەماڵرێت).

(وێنەی ١٧٦)
ژەهرە توێژ داڕزانەشیبوونەوە.

پێست بە ئازارە و دەردی نیشانەیی نائاسایی atypical target lesions تێدایە ، بڵق و بڵقی خوێنڕێژی دروست دەبن، لــە ٤-٥ ڕۆژدا ڕووبــەرێکی زۆری پێـــست بڵقـاوی و دامـاڵراو دەبێت و دادەڕزێت، لەوانەیە نینۆکەکان فڕێ بدرێن، برۆ و برژانگ هەڵوەرین باوە، نـاودەم و چاو و کۆم و کۆئەندامە سێکسیـەکان ئاوساو و سۆکردوو و داڕزاون.

زۆربەی هۆکارەکان دەرمانن وەك: سەلفا (بەکتریم)، فینۆئایازینەکان (فێنیتۆین، کاربامازیپاین، فینۆباربیتاڵ) و نسایدس NSAIDs ( وەك بیوتازۆن و ئۆکسیکامەکان).

هەنــدێك جـــاریش تووشـــێن وەك مایکۆپلازمـــا، تووشـــێنی تاکنـــاوکی infectious mononucleosis، ڤایرۆسی کۆکساکی ب٥ B5، ڤایرۆسی دڕکە و مێکوتـە، گرێێوکـەی شیردۆش milkers nodules، یان ئەندام وەرگرتن (وەك متوربەی مۆخی ئێسك) هۆکارن.

هەروەها پتر بە بوونی شێرپەنجە، لیمفۆما و نەخۆشی بەستەرەشانە connective tissueکـان ڕوودەدات.

**چارەسەر**

١- لە یەکەی سـووتان burn unit چارەســەر دەکرێـت و چارەســەری سـووتاوی بـۆ دەکرێت.

٢- هەموو دەرمانەکانی لــە چـوار حەفتـەی پێشـوودا وەرگـیراون دوور دەخرێنــەوە و هۆکارەکانی تریش ئەگەر هەبوون لادەبرێن.

٣- سایکلۆسپۆرین، ئیمیونۆگلۆبیولین لەڕێی خوێنەوە (٠,٢-٠,٧٥ گم/کگم/ڕۆژ بۆ ٤ ڕۆژ)، پلازما فێرێســس plasmapheresis، سایکلۆفۆسـفئەماید ١٠٠-٣٠٠ ملگـــم/ڕۆژ + پرێــدنیزۆلۆن ٦٠-١٢٠ ملگـــم/ڕۆژ، پێنتۆکســی فـــیلین ١٢ ملگم/کگم/ڕۆژ لەڕێی خوێنەوە I.V.

## سووربوونەوە خولاوەکان ( = سووڕاوەکان ) Gyrate erythemas

بریتییــە لـــە ســـووربوونەوەی بازنـــەیی، موسـتیلەیی، فرەکەوانـەیی یـان خـڕ، چـەند جۆرێکی هەیە:

١- ســـووربوونەوەی بازنـــەیی چـــەقی Erythema annulare centrifugum: لە هەموویان باوترە، (وێنەی ١٧٧)بریتییە لـە سـووربوونەوەی فرەکەوانەیی یان موستیلەیی، وردە وردە



(وێنەی ١٧٧) سووربوونەوەی بازنەیی چەقی.

گەورە دەبێت (٢-٣ ملم/ڕۆژ) و لە ١٠ سم تێناپەڕێت، بەشی ناوەوەی ئەم بازنەیە کاژاوییە، لە قەد و بەشی سەرەوەی پەلەکان دەردەچن، چەند مانگ تا چەند ساڵ سەرهەڵدەداتەوە و لە دوایی دا نامێنێت.

زۆربەیان هۆکارەکانیان نەزانراوە، بەڵام هەندێکیان لە ئەنجامی کەڕووی لەش بە تایبەتی ناو پەنجەی پێ یان خواردنی کەڕوو وەك پەنیری شین یان دەرمان یان شێرپەنجە ڕوودەدەن.

**چارەسەر**

ستیرۆیدی جێیی، کالسیپۆتریۆڵی جێیی.

٢- **سووربوونەوەی خولاوەی خشاو** Erythema gyratum repens: دەگمەنە و بریتییە لە سووربوونەوەی جولاوی شەپۆلیی (١سم/ڕۆژ) و دروستبوونی فرەبازنەی هاوچەق و لێوار کاژاوی و بەرزبووەوەی بەخوروو، وەك برگەی پانی قەدی داری بڕاو وایە. (وێنەی ١٧٨)



(وێنەی ١٧٨) سووربوونەوەی خولاوەی خشاو.

هۆکارەکەی لە ٨٠٪ی بارەکان شێرپەنجەی سی و ئەندامەکانی ترە و بە دەگمەن دەرمان یان سیل دروستی دەکات.

**چارەسەر**

چارەسەری هۆکەی دەکرێت و لەوانەیە سێتیریزین cetirizine خورانەکە کەم بکاتەوە.

٣- **سووربوونەوەی لێواری** Erythema marginatum: لە نەخۆشی تای ڕۆماتیزم (تای باداری) rheumatic fever دا ڕوودەدات و بریتییە لە سووربوونەوەی پەڵەپەڵەی بڵاوبووەوە و شێوەی فرەکەوانەیی وەردەگرێت(وێنەی ١٧٩).



(وێنەی ١٧٩) سووربوونەوەی لێواری.



ئەم جۆرە کاتییە و چەند کاتژمێرێك تا چەند ڕۆژێك لەسەر قەد و بەشی سەرەوەی پەلەکان دەمێنێتەوە، بە گەرما پتر دەردەکەوێت و لە منداڵی خوار تەمەن پێنج ساڵی دا

زۆرتر هەیە، تا چەند حەفتەیەك سەرهەڵدەداتەوە. لە قۆناغی پێشی نەخۆشی تای باداری لەگەڵ سۆی دڵ و پێش جومگەسۆکان دەردەچێت.

٤- **سووربوونەوەی کۆچەری** Erythema migrans (نەخۆشی لایم – lyme disease):
بەکتریای پێچاوپێچی بورێلیا بەرگدۆرفێری Borrelia burgdorferi دروستی دەکات کە بەهۆی قرنوی ئیگزۆدیس Ixodes دەگوازرێتەوە کە بە زۆری بە بەرانەکێویەوەیە. (وێنەی ١٨٠)


(وێنەی ١٨٠)
سووربوونەوەی کۆچەری.

شوێنی پێوەدانی قرنووەکە خاڵێك دروست دەکات و دەبێت بە سووربوونەوەیەکی موستیلەیی و گەورە دەبێت، هەندێك جار جومگەسۆ و نەخۆشی دڵ، یان سۆی پەردەی مێشك و ئیفلیجی کەللە دەمارەکان روودەدەن.

**چارەسەر**

دۆکسی سایکلین یان ئەمۆکسی سلین بۆ ٢١ رۆژ یان پتر.

## سووربوونەوەی گرێیی Erythema nodosum

باوترین جۆری چەوریەسۆی ژێر پێستە بە تایبەتی لە مێینەی گەنج دا. بە شێوەی گرێی (١-١٠سم) شینکی قووڵی بە ئێشی چوونیەکی دوولایی لە بەشی پێشی لاقەکان دا دەردەچێت. یەکەم جار پێستیسەر گرێیەکان لووس و سوورە و کەمێك بەرزبۆتەوە، پێستەکە بە ئازارە و نەخۆش هەست بە لاوازی دەکات و ئاوسانی لاق و جومگەسۆ و ئازاری جومگەش هەن. لە چەند رۆژێك دا دەردەکان نرم دەبنەوە و جێگەکەیان ئەرخەوانی یان سەوز و شین دەنوێنێت. ئەم گرێیانە چەند رۆژ تا چەند حەفتەیەك دەمێننەوە، بە کۆمەڵ دەردەچن و بە لەسەرخۆیی وەپاش دەچنەوە. هەندێك جار ئەم دەردانە لە باسك و سمت و دەم و چاو و مەمك و شوێنی تریش دەردەچن، ٦-٨ حەفتە دەخایەنێت. (وێنەی ١٨١)


(وێنەی ١٨١)
سووربوونەوەی گرێیی.

لەوانەیە گرێیەکان ئەوەندە بە ئازاربن کە نەخۆش نەتوانێت هاتووچۆ بکات.

**هۆکارەکانی:**

١- تووشبینەکان (میکرۆب) infections: وەك:

أ) بەکتریا (سترێپتۆکۆکەس streptococci، بەکتریای سیل، بروسیللا brucellosis، گولی leprosyو یەرسینیا yarsenia).

ب) ڤایرۆسەکان viruses.

ج) مایکۆپلازما mycoplasma.

د) رکیتسیا rickettsia.

ھ) کلامیدیا clamydia. و) کەڕوو fungi.

٢- دەرمان: وەك سەلفۆنەمایدەکان، خەپلەی نەزۆکاندن contraceptive agents.

٣- نەخۆشی سیستمی systemic diseases، وەك سارکۆیدۆسس، ریخۆڵە ئەستوورەسۆی چاڵەبرینی ulcerative colitis، نەخۆشی کرۆن crohn's diseaseو نەخۆشی بەھجەت Behcet's disease.

پشکنین:

١) ئێکسبەرداری سنگ chest X ray.

٢) چاندنی سڕینی گەروو throat swab for culture

٣) ئەزموونی مانتۆکس mantoux.

٤) ئەزموونی ئەنتی سترێپتۆلایسینی O (ASO titre)

چارەسەر

١- لابردنی هۆکارەکەی.

٢- پشوودان

٣- نسایدس NSAIDs وەك ئەسپرین، ئیندۆمیثاسین indomethacin یان ئایبوپرۆفێن ibuprofen.

٤- پۆتاسیۆم ئایۆداید KI ٤٠٠-٩٠٠ ملگم/رۆژ.

٥- ھەندێك جار کۆلچیسین colchicin، ھایدرۆکسی کلۆرۆکوین، داپسۆن، ئیریثرۆمایسین، مایکۆفینۆلەیت مۆفێتیل، ئینفلیکسیماب infliximab.

## سووربوونەوەی سەخت (تۆکمەیی) Erythema induratum (Bazin's disease)

نەخۆشیەکی درێژخایەنە (چەند مانگێك) و بە تایبەتی لە مێینەی بەساڵاچوودا (٨٠٪ی بارەکان) روودەدات و نیشانەکانی بریتین لە گرێی ژێر پێست (١-٢ سم) کە سوورن یان وەنەوشەیین و بە ئازارن و لەدواوەی لاقەکان دەردەچن، ھەندێك جار دەبن بە چاڵەبرین. زۆر لە نەخۆشەکان سووڕی خوێنی ئەم ناوچەیەیان سستە poor circulation و لەوانەیە کاردانەوە بێت بۆ بوونی بەکتریای سیل لە لەش دا.

پشکنین: (وێنەی ١٨٢)

١- ئـەزموونی تیوبــەرکلین tuberculin test جـۆری PPD و ئەگــەر پۆزەتیـف بــوو ئــەوە ئەزموونی

٢- کاردانــەوەی زنجـیرەی پۆلیمەرەیســی بــۆ دەکرێــت polymerase chain reaction،

٣- چاندنی نموونە بۆ میکرۆبی سیل.

چارەسەر

چارەسەری سیلـە.

(وێنەی ١٨٢) سووربوونەوەی تۆکمەیی (نەخۆشی بەیزن).

## سووربوونەوەی لێگرتنەوە (نەخۆشی پێنجەم) (5th disease) Erythema infectiosum

هۆکارەکــەی ڤایرۆســی پارڤۆڤایرۆســی $B_{19}$ یــە، (parvovirus $B_{19}$)، هەندێك جار بە تایەکی کەم دەست پێــدەکات ، نیشــانەی هەڵامــەتی، سەرئێشــە، کۆکــە و سکچوون دوو رۆژ پێش دەرچوونی سووربوونەوەکە هەن و ڕێژەی ١٠٪ی منداڵەکان جومگەسۆیان هەیە (بە تایبەتی جومگــە گــەورەکان)، ئــەم نەخۆشـیە پەتاییــە epidemic و لـە وەرزی زستان و بەهاردا زۆرە، کاتی بەرهاتنەکــەی incubation period ٤- ١٤ (تێکڕایی ٧) رۆژە، پتر منداڵانی تەمەن (٥-١٩ساڵ) دەیگرن و بە هەناسە دەگوازرێتەوە بەڵام لـە گەورەش دا هەر هەیە و پتر جومگەسۆیان تووش دەبێت وێنەی ١٨٣). ٣ قۆناغی هەیە:



(وێنەی ١٨٣) نەخۆشی پێنجەم.

أ) کتوپردروســتبوونی ســـووربوونەوەی بــێ ئــازار و خــوران لــە روومــەت دا، وەك روومــەتی زللــە لێــدراو slapped check وایە، دەوری لێو و پێڵووەکان و چەناگە نایگرێتەوە (سوورنەبوونەوەوە).

ب) دوای ١-٤ رۆژ پەڵەی سووری جیاجیا و تەنۆچکە لـە بەشی سەرەوەی پەڵــەکان دا دەردەچــن، ئەوســا قــەدیش دەیگرێتــەوە، دواتر ئەم شێوەیە بۆ سووربوونەوەی تۆڕی دەگۆڕێت. ئەم دوو قۆناغە ٥-٩ رۆژ دەخایەنێت.

ج) قۆناغی سەرهەڵدانەوە recurrence: دوای کزبوون یان نەمانی دەردەکان دووبارەبوونەوەی ئەم دەردانە بە گەرما، وەرزش، تیشکی خۆر یان بە هاوار وگریان روودەدات. هەندێك جار ئەم نەخۆشیە دەبێتە هۆی سست بوونی مۆخی ئێسك B.M. suppression.

**چارەسەر**

١- دەرمانی تا و ئازار و کۆکە، ٢- هەندێك جار پشوودان.

## سووربوونەوەی بەرزبووەوەی بەردەوام Erythema elivatum diutinum

دەگمەنە و جۆرێکە لە خوێنبۆریەسۆی خرۆکەیی سووك low-grade-leukocytoclastic vasculitis، پتر لە باڵقدا هەیە ، دەردەکان بە شێوەی تەنۆچکە و گرێ لە پشتی دەست و هەندێك جار لە بەشی دەرەوەی ئەژنۆ و ئانیشك و دەوری مەچەك و قولەپێ و سمت لە هەردوولای چەپ و راست وەکیەکی symmetrical دەست پێدەکەن، هەندێك لەمانە یەکدەگرن و قوتکەی تەنینەوەی گەورەی نارێکوپێکی خڕ یان شەپۆلی پێك دەهێنن، دەردەکان نەرمن دواتر رەق دەبن، لە کۆتایی دا بێ شوێن بجێهێشتن جگە لە تۆخبوون ،چاك دەبنەوە، هەندێك جار جومگەسۆ هەیە. (وێنەی ١٨٤)



(وێنەی ١٨٤)
سووربوونەوەی بەرزبووەوەی بەردەوام

**چارەسەر**

داپسۆن، سەلفاپیریدین، نیاسین ئەمایدniacinamide و ستیرۆیدی جێیی و بە تێچزاندن intralesional.

## کۆنیشانەی سویت Sweet syndrome

بریتییە لە گرێ و تەنۆچکەی ئاوساو و سۆکردووی بەئێش و سەرهەڵداوە لەگەڵ تا و زۆربوونی خرۆکە سپیەکانی خوێن و تەنینەوەی خرۆکەی سپی لەبن توێژد. ٣ جۆری هەیە:

١- جۆری دروستبوو بە دەرمان: هەندێك دەرمان دروستی دەکەن وەك ئەنتی بایۆتیك (ماینۆسایکلین، نایترۆفیورانتۆین و کۆترامۆکسازۆل)، هایدرالازین، کاربامازیپاین، سایتۆکاینی GCSF، خەپلەی

١- نەزۆکاندن و ڕێتینۆیدەکان. ئەم جۆرە پتر لە مێینەدا (٣٠-٥٠ساڵی) هەیە.

٢-جۆری دروستبوو بەهۆی شێرپەنجە: وەك شێرپەنجەی خوێن، کۆئەندامی هەرس، کۆئەندامی سێکسی و میزی و مەمك.



(وێنەی ١٨٥) کۆنیشانەی سویت.

٣-جۆری هۆنەزانراو idiopathic: لەوانەیە پێشتر تووشێن لە بەشی سەرەوەی سیستمی هەناسەدان یان سیستمی گەدە و ڕیخۆڵەی هەبووبێت upper respiratory tract or GI infection. ئەم نەخۆشیە لەوانەیە جۆرێك لە کاردانەوەی فرەهەستیاری بێت بۆ دژە ژیندەرەکانی باسمانکردووە و لیمفۆسایتی یاریدەدەر جۆری $Th_1$ ڕۆڵی تێدابینێت.

**سکالا و نیشانەکانی:** تای بەرزە و دەردەکە کتوپڕ بە شێوەی قوتکە و گرێ و تەنۆچکەی نارێك و بە ئازار دەردەچێت، سوور و گۆشتین و بە تایبەتی مل و قۆڵ دەگرێتەوە، لەوانەیە بلّق و بلۆقیشی لەسەر دروست بێت و شێوەی موستیلەیی کەوانەییشی هەیە، لە چەند حەفتەیەك یان مانگێك دا بێ جێ زام چاك دەبنەوە . هەندێك جار دەموچاو و قەد و پەلەکانی خوارەوەش دەگرێتەوە. ESR بەرزە و خرۆکەی سپی خوێن بۆ ١٠,٠٠٠-٢٠,٠٠٠ زۆر دەبن ا (وێنەی ١٨٥).

**چارەسەر**

١) ستیرۆیدی سیستمی: پریدنیزۆلۆن ٣٠-٦٠ ملگم/ڕۆژ و لە ٤-٦ حەفتەدا بۆ ١٠ ملگم/ڕۆژ کەم دەکرێتەوە ، هەندێك جار ١٠-٣٠ ملگم ڕۆژ نارۆژ بۆ ٢-٣ مانگ بەکاردەهێنرێت . ستیرۆیدی جێیی یان بە تێچزاندن بۆ ناو دەردەکان بۆ باری سنووردار بەکەڵکە.

٢) پۆتاسیۆم ئایۆداید KI ٩٠٠ ملگم/ڕۆژ بۆ ٢ حەفتە.

٣) کۆڵچیسین (١,٥ ملگم/ڕۆژ بۆ ٧ ڕۆژ ئەوسا بۆ ٠,٥ ملگم/ڕۆژ کەم بکرێتەوە.

٤) کلۆرامبیوسیل، کلۆفازیمین، سایکلۆفۆسفەمایدە، سایکلۆسپۆرین، داپسۆن، ئیندۆمیثاسین، ئینتەرفیرۆن ئەلفا، ناپرۆکسین و سەلفاپایریدین هەندێك جار بەکاردەهێنرێن.

٥) هۆکارەکەی چارەسەربکرێت.

## کێمپێستی لاڕەشەیی (PG) Pyoderma gangrenosum

دەگمەنە، بریتییە لە پێستەسۆیەکی دارزێن کە تێیدا پیزۆکەی یان گرێی بەئازار دەدرێت و دەبێت بە چاڵەبرینێکی پەرەسێن، هۆکاری نەزانراوە(وێنەی ١٨٦)، بەڵام لەوانەیە کاردانەوەیەکی سۆیی کۆنترۆڵنەکراو یان گۆڕاو یان زێدەڕۆیی بێت بۆ ورووژێنی ناتایبەتمەند، چونکە ئەزموونی پالێرجی pathergy test تێیدا پۆزەتیڤە کە ئەمیش بریتییە لە دەرهاتنی دەردی نوێ یان کلپەسەندنی دەردە کۆنەکان بە زەبرێکی سووك. چەند جۆرێکی هەیە:



(وێنەی ١٨٦) کێمپێستی لاڕەشەیی.

١- دەردێکی کتوپڕ و بەتەوژم و خێرا بڵاوبووەوە بە شێوەی چاڵەبرینێکی لێوار بەرزبووەوە و سۆکردوو و بنکە ئاوساو کە پێستی دارزاوی تێدایە و دەڵاندنی خوێنی و کێمی لەگەڵ ئازار و نیشانەکانی بەژەهربوونی خوێن هەن.

(وێنەی ١٨٧) کێمپێستی لاڕەشەیی.

٢- دەردێکی لەسەرخۆ و گۆشتەزوونەیی لەگەڵ قەتماغە و زێدە قۆچەکاژی لە لێوارەکانی، وردە وردە بڵاودەبێتەوە و بەشێکی زۆر لە پێست بۆ چەند مانگێك دەگرێتەوە، لەلایەك سارێژ دەبێت و لەلایەکی تر هەر پەرەدەسێنێت.

هەردوو جۆرەکە کە چاکبوونەوە جێ زام جێدەهێڵن.

٣- بە دەگمەن PG لە ژێر پێست دەست پێدەکات و دەبێتە هۆی دروستبوونی سۆی چەوری یەکجار بەئازار و کێم و زوخاو دروستکردن، دوایی دەبێت بە چاڵەبرین و بڵاودەبێتەوە.

٤- جۆرێکی جێیی بەرزبووەوە (قارچکی) و رواڵەتێکی بالووکەیی و چاڵەبرینی هەیە.

٥- جۆری دەمەسۆی کێمی پەرەسەندوو pyostomatitis vegetans: کە بریتییە لە دەردی پڕ کێمی بەرزبووەوە لە ناودەم لەگەڵ دەردی سەر پێستی پەرەسەندوو و چاڵەبرینی و نەخۆشی سۆی ڕیخۆڵە(وێنەی ١٨٧). inflammatory bowl ds

٦- جۆری نائاسایی کە لەگەڵ شێرپەنجەی خرۆکەی سپی خوێن دا leukemias هەیە، لێرەدا تەنۆچکەی نەرمی ئەرخەوانی و بڵقی خوێناوی رووکەشی پەرەسەندوو دەردێن.

ڕێژەی ٤٠-٥٠٪ بارەکان هەر لە پێست دا هەن (جۆری هۆنەزانراو). بەڵام هەندێك جار لە شوێنی تری ئەندامەکانی لەش دا وەك پەڕگلێنە دەردەچن و هەندێك جار لەگەڵ نەخۆشی تردا وەك نەخۆشی کرۆن .crohn's ds، ڕیخۆڵەئەستوورەسۆی چاڵەبرینی ulcerative colitis، جومگەسۆ، تێکچوونی ئیمیونۆگلۆبیولەکان (وەك IgA)، شێرپەنجەی خوێن و نەخۆشی بەستەرەشانەکان (CTD)دا هەیە.

## هاودەستنیشانکردنەکان Differential diagnosis

هەندێك نەخۆشی تر لە PG دەچن وەك دارزانی دوای نەشتەرگەری، چاڵەبرینی لاڕەشەیی ecthyma gangrenosum، تووشێنی مایکۆبەکتریای نائاسایی atypical mycobacterial infections، تووشبوون بە کلۆستریدیا و ئەمیبای پێست.

## چارەسەر

١- ئەگەر هەبوو چارەسەری هۆکارەکەی بکرێت.

٢- پاککردنە بە گۆزی gautze بە سەلاین تەڕکراو ئەوسا مەرهەم و بەستن.

٣- ستیرۆیدی جێیی یان تاکرۆلیمۆس، ئۆکسجینی پەستاوتراو hyperbaric oxygen.

٤- کلۆفازیمین ٢٠٠-٤٠٠ ملگم/ڕۆژ، ماینۆسایکلین ١٠٠-٢٠٠ ملگم × ٢، داپسۆن ١٠٠-٤٠٠ ملگم/ڕۆژ، سەلفاسالازین ٤-٦گم/ڕۆژ دواتر بۆ ٠,٥ -١ گم/ڕۆژ کەمبکرێتەوە، سۆدیۆم کرۆمۆگلایکەیت (شلە ١-٤٪ یان سپرای لووت) یان ستیرۆید بە تێچزاندن.

٥- ستیرۆیدی سیستمی ١-٢ ملگم/کگم/ڕۆژ، پریدنیزولون یان سایکلۆسپۆرین A ٥-١٠ ملگم/کگم/ڕۆژ.

٦- سایکلۆفۆسفەمايد ١٥٠ ملگم/ڕۆژ، کلۆرامبیوسیل ٢-٤ ملگم/ڕۆژ، پلازمافیرێسس، ئیمیونۆگلۆبیولین ٤٠٠ ملگم/کگم/ڕۆژ بۆ ٥ ڕۆژ ئەوسا ١ گم/کگم/ڕۆژ بۆ ٢ ڕۆژ، سایکلۆسپۆرین بە تێچزاندن ٣٥ ملگم لەگەڵ نۆرماڵ سەلاین ١:٣ شل بکرێتەوە حەفتەی دوو جار، تاکرۆلیمۆس بە دەم ٠,١ ملگم/کگم/ڕۆژ، ئازاثایۆپرین، کۆلچیسین، مایکۆفینۆلەیت موفیتیل ١-٢,٥ گم/ڕۆژ + پریدنیزۆلۆن، ئینفلیکسیماب ٥ ملگم/کگم بەخوێن بە لەسەرخۆیی infusion.

٧- دوای کۆنترۆڵکردن متوربەکردنی پێست.

# زیپکەی عازەبە Acne vulgaris

بریتییە لە سۆی دریژخایەنی چەورەسەلکەموو pilosebaceous follicles، کە تێیدا سەرە زیپکە comedons و تەنۆچکە و پیزۆکە و گرێ و زۆر جار جێ زام دەردەچن.

چۆنیەتی دروستبوونی (دەردزانی) Pathogenesis: پێنج فاکتەری سەرەکی رۆڵی تێدا دەبینن.

١- فرەقۆچەکاژکردنی سەلکەکان Follicular hyperkeratinization: شێوەی قۆچەکاژکردنی سەلکەکان دەگۆڕێن، لەجیاتی شێوەی نەرمی و تەنکی دەبێت بە شێوەی چڕ و رەقترو زێدەڕۆیی خانەی کاژ دروستبوون و فڕێدان، ترشی چەوری لینۆلێیك linoleic acid لە ئاسایی کەمترە ،لەگەڵ پڕبوونی چەوری دروستبوون و کاریگەری ئەندرۆجین، هەموویان ئەم زێدەقۆچەکاژیە دروست دەکەن.

٢- بەکتریا: بەکتریای پرۆپیۆنبەکتیریەم ئەکنیس propionbacterium acnes (p.a) هاوژینی ئاسایی پێستە normal commensal و لەوانەی زیپکەی عازەبەیان هەیە رۆڵی نەخۆشیهێن دەبینێت، ئەم بەکتریایە لە تەمەنی ١١-٢٠ ساڵی دا لەوکەسانەی عازەبەیان نییە نین، بەڵام ژمارەیان لەوانەی عازەبەیان هەیە زۆرە، دوای تەمەنی ٢٠ ساڵی لە هەموو کەسێك دا هەن. لە بۆری چەورەسەلکەموو دا مۆڵ دەبن و گلیسرایدە سێیەکان شیدەکەنەوە و ترشە چەورە سەربەخۆکان بە ئەنزیمی لایپەیز lipase و ئەنزیمی پرۆتیەیس و هیالورۆنیدەیس دروست دەکەن و بەجۆری چواری سیستمی بەرگری Type IV دەبنە هۆی سۆکردن .

٣- هۆڕمۆن: ئەندرۆجینەکان androgens ( کە لە باتوو و هێلکەدان ورژێنی ئەدرینال دروست دەبن)، چالاککەری چەوری دەرهاوێشتەن، هەرچەندە هۆڕمۆنی ثایرۆکسین و گەشە رۆڵێکی کەمتریان هەیە. لە زیپکەی عازەبەدا:

١) رژێنە چەوری پڕ وەڵامدەرەوەی ئاستی ئاسایی ئەندرۆجینە. (واتا ئەندامە کۆتا نیشانەکە target endorgan بە هۆی چالاکتربوونی ئەنزیمی پێنج ئەلفارێدەکتەیس 5-∝ reductase لە رژێنە چەوری کۆتا نیشانە target sebaceous glands لە ئاسایی هەستیارترە).

٢) ڕێژەی ٥٠٪ی مێینە ئاستی ئەندرۆجینیان بەهۆی کەمبوونی گلۆبیۆلینی لکاو بە ئەندرۆجینەوە کەمێك زۆرترە.

٤- بۆماوەیی: زیپکەی عازەبە لە ٥٠٪ی نەخۆش دا خێزانییە familial.

٥- داخرانی کونی چەوری Poral occlusion: هەردوو هۆکارە جینی و دەرەکیەکان دەبنە هۆی گەشەی رووپۆشەخانەی سەر کونی چەوری و داخستنی، بەمەش چەوری لە ناو سەلکەکان دا

پزدەبێت و چڕی بەکتریا و ترشە چەورە سەربەخۆکان زۆر دەبن ، سەلکەکان دەدڕێن و سۆ دەکەن و شانەکان دادەڕزێن، ئەمەش بەهۆی رەگە سەربەخۆکانی ئۆکسجین oxygen free radicals و ئەنزیمەکان وەك ئیلاستەیز elastase کە خڕۆکەی سپی دروستی دەکەن روودەدات.

ڕێژەی Prevalence: نزیکەی هەموو هەرزەکارەکان کەم یان زۆر زیپکەی عازەبەیان هەیە، ناوەندی تەمەن بۆ نێرینە ١٧–١٩ و بۆ مێینە ١٦–١٧ ساڵە، ڕێژەی ١٢٪ لە مێینەدا و ٣٪ لە نێرینەدا لەوانەی زیپکەی عازەبەیان هەیە زیپکەی عازەبەکەیان تا ٤٤ ساڵی بەردەوامە.

نیشانەکانی: سەرە زیپکە comedones سەرەتای ناساغیەکەیە، ئەمیش بریتییە لە تەنۆچکەی



(وێنەی ١٨٨) زیپکەی عازەبەی باو.

تەخت یان کەم بەرزبووەوە و لە ناوەڕاستی دا کونی ڕژێنە چەوری فراوانبوو و پڕ لە قۆچەکاژی رەش هەیە (سەرە زیپکەی رەش open comedo or black head)، ئەگەر کونەکە داخراوبوو ئەوە سەرە زیپکەی سپیە (white heads). (وێنەی ١٨٨)

تەنۆچکە و پیزۆکەکان ١–٥ ملم دەبن و سووربوونەوە و ئاوسانی لەگەڵدایە، لەوانەیە گەورەتربن و گرێ و قوتکەی چەند سەنتیمەتری پان و رەق یان بڵ ،کە ڕێچکەی لۆچی و دەڵانی کێمی زەرد یان خوێنی زەرداویان تێدایە ،دروست دەبن.



(وێنەی ١٨٩)
زیپکەی عازەبە (جێ زام).

زۆربەی نەخۆش کۆمەڵێکی جۆراوجۆری ئەمانەی سەرەوەیان هەیە، هەندێکیان لە قۆناغی پەرەسەندن و هەندێکی تریش لە قۆناغی سارێژبوون دان. دوای سارێژبوون پەڵەی ئەرخەوانی سووری کاڵی و هەندێك جاریش جێ زام (وێنەی ١٨٩)دەردەکەون کە زۆر جۆری هەیە وەك: جێ زامی قووڵ و تەسك، جێ زامی پێست

پووکاوه، جێ زامی تەنۆچکەی زەرد و سپی، خاڵی قووڵ و جێ زامەستووره و گۆشت پاره. ئەم ناساغیه لە دەم چاو و مل و سەرەوەی قەد و قۆڵ دەردەچێت و هەندێك جار گوێچکەش دەگرێتەوە (سەره زیپکەی گەوره لە دەوری بەشی دەرەوەی کونی گوێچکە، پۆرگ لە پلەکان lobes و پۆرگ و سەره زیپکە لە پێش و پاشی گوێچکە).

که لە ٨-١٢ ساڵی دا دەربچێت، بە تایبەتی لە ناوچەوان و پروومەت دا پتر سەره زیپکەییە و لە ناوەندی هەرزەکاری دا دەبن بە تەنۆچکە و پیزۆکە و گرێ، گەنجی نێرینە چەوری پێست و جۆری بەربلاو و تیژی لە مێینەی گەنج زۆرتره. هەندێك جار لە تەمەنی ٢٠-٣٥ساڵیدا بۆ یەکەم جار زیپکە دروست دەبێت و ئەم جۆرەش تەنۆچکە و پیزۆکە و گرێی قووڵ و بە ئازار لە چەناگە و سەرەوەی مل و هێڵی شەویلاگی تێدایه.

چارەسەر

١- دەستکاری زیپکەکان و هەڵکەندنیان زیانبەخشە.

٢- پارێز (خواردن قەدەغەکردن) رۆڵی نییە، مەگەر نەخۆش خۆی بۆی دەرکەوێت کە جۆرێك خواردن زیپکەکانی توندتر دەکات.

٣- بۆ پێستی چەور با نەخۆش چەند جارێك دەم و چاوی بشوات بە ئاوی گەرم و سابوون، بە تایبەتی سابوون کە گۆگرد یان بێنزۆیڵ پیرۆکساید یان دژەبەکتریای تێدابێت. بەڵام بەکارهێنانی لفکە و پەستان خستنە سەر پێست زیانبەخشن.

٤- چارەسەری جێبیی: بە تەنیا بۆ باری سۆنەکردوو کاریگەره وەك سەره زیپکە، تەنۆچکە و هەندێك جار پیزۆکەش، نموونەکان:

١) ریتینۆیدی جێیی topical retinoids: وەك:

ترێتینۆین tretinoin، ئەداپالین adapalene، تازەرۆتین tazarotene و ئایزۆترێتینۆین isotretinoin، بە شێوەی کرێم، جێڵ یان شلە. بە دوو شەو جارێك، دوای راهاتن هەموو شەوێك.

٢) بێنزۆیڵ پیرۆکساید benzoyl peroxide ٢,٥٪، ٥٪ یان ١٠٪ جێڵ یان کرێم.

٣) کلیندامایسین clindamycin ١٪ جێڵ یان شلە، ئیریثرۆمایسین ١,٥-٢٪ شلە، جێڵ یان مەرهەم.

٤) بە تێکەڵی وەك بینزۆیڵ پیرۆکساید + کلیندامایسین یان بێنزۆیڵ پیرۆکساید + ئیریثرۆمایسین.

٥) ئەزیلایك ئەسید azelaic acid ٢٠٪ کرێم.

٦) سۆدیۆم سەلفئەسیتەماید + گۆگرد sulphur بە یەکەوە بە شێوەی جێڵ یان شلە. یان: سالیسیلیك ئەسید ١-٢ جێڵ، شلە، کرێم یان کەف، ئەم جۆرانە کەمتر بەکاردەهێنرێن.

٥- چارەسەری سەراپایی (سیستمی) systemic treatment: بۆ باری مامناوەندی: وەك جۆری تەنۆچکەیی و پیزۆکەیی، بۆ نموونە:

١) دژەبەکتریا، وەك: {تێتراسایکلین (٢٥٠ ملگم-٥٠٠ملگم) ×(١-٤)، دۆکسیسایکلین (٥٠-١٠٠ ملگم) × (١-٢)، ماینۆسایکلین minocycline (٥٠-١٠٠ ملگم) × (١-٢)، کۆترایمۆکسازۆل (بەکتریم)، ترایمێثۆپریم trimethoprim ٣٠٠ ملگم × ٢، ئیریثرۆمایسین (٢٥٠-٥٠٠ ملگم) × (٢-٤)} + ریتینۆیدی جێیی + بینزۆیل پیرۆکساید.
٢) گۆڕینی دژەبەکتریا بۆ جۆرێکی تر، گۆڕینی جۆری ریتینۆید، گۆڕینی چڕی بێنزۆیل پیرۆکساید.
٣) بۆ مێینە: سپایرۆنۆلاکتۆن spironolactone (٥٠-٢٠٠ ملگم/رۆژ) + خەپلەی نەزۆکاندن contraceptive pills (وەك یاسمین yesmin، ئیسترۆستێپ estrostep، ئەلیس alesse) + ریتینۆیدی جێیی + دژەبەکتریای جێیی یان بێنزۆیل پیرۆکساید.
٤) ئەگەر چاك نەبوو ئایزۆترێتینۆین ٠,٥-١ ملگم/کگم/رۆژ.

بۆ باری توند sever، وەك جۆری گرێیی و دوومەڵی و پۆرگی ئەمانەی خوارەوە بەکاردەهێنرێن:

١) ئایزۆترێتینۆین.
٢) دژەبەکتریا بە دەم + ریتینۆیدی جێیی + بینزۆیڵ پیرۆکساید.
٣) بۆ مێینە سپایرۆنۆلاکتۆن + خەپلەی نەزۆکاندن + ریتینۆیدی جێیی + دژەبەکتریا بە دەم یان بێنزۆیڵ پیرۆکساید.
٤) ژەمی بەرزی دژە بەکتریا بە دەم.
٥) لەیزەر جۆری subpurpuric pulsed dye laser (٥٨٥ نم NLite laser).
٦) تیشکی سوورو شین (چرای لەبار بۆ بەکارهێنان لە ماڵەوە کە تیشکی شین ٤٠٠ نم لەگەڵ تیشکی سوور ٦٦٠ نم دروست دەکات).

٦- چارەسەری فیزیکی و جێ زام physical & scar therapy: وەك:

١) چارەسەری سەرە زیپکە comedones: دوای پتر لە ٢ مانگ چارەسەرکردن کە لانەچوون، بەهۆی سەرەزیپکەدەرهێنەر comedon extractor (کە ئامێرێکی تایبەتیە) رادەکێشرێنە دەرەوە. سەرەزیپکەی سپی گەورە macrocomedones دوای سڕکردن بە ئامێری داخکەر cautery بە لەسەرخۆیی، یان بە تاشینی کیمیکی chemical peels چارەسەردەکرێت.

٢) چارەسەری گرێبۆکەسۆکان inflammatory nodules: بە تێچزاندنی ستیرۆید intralesional corticosteroids (triamcinolone acetonide) 2.5 mg/ml.

٣) چارەسەری جێ زام: بە تاشینی کیمیکی، تاشین بە لەیزەر یان ئامێری میکانیکی، بڕین، یان مژادە پڕکەرەوەکان، وەك کۆلاجین یان چەوری fat یان ئایزۆلاجین isolagen دەخرێنە ژێر جێ زامەکان.

## جۆرەکانی تری زیپکەی عازەبە Variants

١- زیپکەی کۆرپە (تازەبوو) Neonatal acne (واتا لە چوار حەفتەی یەکەمی ژیان دا): باوە، لە چەند رۆژی یەکەمی ژیان دا بە تایبەتی لە نێرینەدا دەردەچێت، تەنۆچکە و پیزۆکەی کاتی بۆ چەند رۆژ یان حەفتە دەمێننەوە و دوایی نامێنن. لەوانەیە ئەم جۆرە هەر گەشەکردنی رژێنە چەوریەکان بێت لە ژیانی کۆرپەلەدا foetal life بەهۆی ئەندرۆجینی خوێنی دایك.



وێنەی ١٩٠) زیپکەی عازەبەی ساوا.

٢- زیپکەی ساوا Infantile acne: لەوانەیە هەر درێژەدانبێت بە زیپکەی کۆرپە، یان دوای ٤ حەفتەی ژیان دەربچێت و هەندێك جار بۆ تەمەنی منالی و بالْقی بەردەوام دەبێت. وێنەی (١٩٠)

چارەسەر: لەباری درێژخایەن دا بێنزۆیل پێرۆکسایدی جێیی یان ئیریثرۆمایسین یان رێتینۆید و هەندێك جار دەرمان بە دەم وەك ئیریثرۆمایسین یان ترایمیثۆپریم ١٠٠ ملگم × ٢ لەگەل چارەسەری جێیی بەکاردەهێنرێت. ئەم جۆرە کە درێژخایەن بوو زۆر جار خێزانییە.

٣- زیپکەی هەلکۆلین Acne excoriate: لە گەنجی مێینەدا باوترە، چالی پێستی هەلکەنراو بە شێوەی هێلی یان خال وەك خوویەکی بەد یان بەهۆی دەروون تێکچوون بە نینۆك دروست دەکرێت و ئاکامەکەی بریتییە لە جێ زام و پەلە و پتر دەروون تێکچوون.

٤- **زیپکەی ستیرۆید** Steroid acne: بەهۆی بەکارهێنانی ستیرۆیدی جێیی یان سەراپایی systemic steroids دروست دەبن، زیپکەکان لە یەك دەچن (تەنۆچکەی سوور و پیزۆکەی بچووك) بە تایبەتی لە پێستی قەد و شان و سەرەوەی قۆڵ دەردەچن (سەرە زیپکە و پۆرگ و جێ زامی تێدا نییە). ئەم جۆرە سەلکەسۆی جێییە local folliculitis.

**چارەسەر**: هۆکارەکەی لادەبرێت و کرێمی ترێتینۆین retin-A ٠,٠٥٪ بۆ ١-٣ مانگ + دژەبەکتریا بە دەم بە کار دەهێنریت.

٥- **هەڵتۆقیوی عازەبەیی** Acneiform eruptions: وەك زیپکەی ستیرۆیدە و هۆکاری تری هەیە وەك: مژادی کیمیکی بۆ نموونە ،کیمیکی پیشەسازی وەك هەڵمی کلۆرین کە عازەبەی کلۆر chloracne دروست دەکات (بە شێوەی تەنۆچکە، پیزۆکە، سەلکەسۆ و سەرە زیپکە)، هایدرۆکاربۆنی فرەهالۆجین وەك دایۆکسین، زەیتی لوسکەر و برەر، قیری خەڵوزی بەردی بەکارهاتوو بۆ نەخۆشی پێست - تاد . لای ئێمە گازۆلین فرۆشەکان ئەم جۆرەیان لە ران و لاق و باسك دا هەیە. دەرمانی ئایۆداید iodides، پۆتاسیۆم ئایۆداید، برۆماید (لە ناو خەپلەی پرۆپانثیلین)، تێستۆستیرۆن، لیثیوم، INH، دایفەنیل هایدانتۆین، - تاد، دروستی دەکەن.

**چارەسەر**: هۆکارەکان لابرێن، ژەمی بەرزی دژەبەکتریا، ستیرۆید بە تێچزاندن یان سەراپایی، پاککردنەوە بە نەشتەرگەری surgical debridement، برین و ئایزۆترێتینۆین بە دەم (١-٢ ملگم/کگم/رۆژ بۆ چەند مانگێك) بەکاردەهێنرێن.

٦- **عازەبەی کەمەرەیی** Tropical acne: سەلکەسۆیەکی تیژە و لە قەد و سمت دا بە شێوەی گرێ سۆی قووڵ و کێم دەلاندن وەك **زیپکەی عازەبەخرە** acne conglobata دەردێن، هەمیشە بەکتریای ستافیلۆکۆکەس جۆری مەیینەر پۆزەتیف coagulative positive تووشی دەبێت و بارەکە ئالۆزتر دەکات.

**چارەسەر**: ئەگەر لە توانادا هەبوو با شوێنەکە بگۆرێت + دژەبەکتریا بە دەم.

٧- **زیپکەی هاوینەهەوار (هاوینەزیپکە)** Acne aestivalis: دەگمەنە، مێینە (٢٥-٤٠ ساڵ) تووشیان دەبێت، لە بەهاردا دەست پێدەکات و لە پایزدا نامێنێت، بە شێوەی تەنۆچکەی رەقی قووچەکەیی سووری کاڵ (٣-٤ ملم) لە روومەت و لای مل و سنگ و شان و سەرەوەی قۆڵ دا دەردەچێت (سەرە زیپکە و پیزۆکەی تێدا نییە).

**چارەسەر**: ترشی رێتینۆیکی جێیی.

٨- **زیپکەی جوانکاری (= ماکیاج)** Acne cosmetica: تەنیا ماکیاجی زۆر چەور، کە کونی پێست دابخات دروستی دەکات و زۆر دەگمەنە.

٩- **زیپکەی مەرهەم** Pomad acne: کە مەرهەم بۆ پێستی سەر یان بۆ چارەسەری نەخۆشی بەکاربهێنرێت و هەندێك لە مەرهەمەکە بەر ناوچەوان یان دەم وچاو بکەوێت ئەوە سەرەزیپکە دروست دەکات.

١٠- **زیپکەی زەبری** Acne mechanica: ئەم جۆرە بەهۆی دووبارەبوونەوەی زەبری سڕین و لەرینەوە بە پەستانەوە روودەدات وەك جل و بەرگ ( ژێر پشتێن و سوخمەی مەمك)، داخستنی پێست بە پلاستەر، چەناگەی کەمانچەژەن، یەخەی کراس و بلوزی بەرز، دەست خستنە ژێر لایەکی چەناگە و خوارەوەی روومەت بۆ کاتی دووورودرێژ، - تاد.

١١- **زیپکەی عازەبەخڕە** Acne conglobata: بریتییە لە جۆری سۆی تیژ، بە شێوەی سەرە زیپکە، گرێ، دوومەڵ و رێچکە لۆچی دەڵێنەر و بە جێهێشتنی جێ زام و گۆشت پارە keloid دوایی دێت. دەگمەنە و لە نێرینەی باڵغ دا لە پشت و سمت و سنگ و کەمتر لە سك و شان و مل و دەم وچاو و ران و سەرەوەی قۆل دا دەردەچێت. (وێنەی ١٩١)

چارەسەر: وەك جۆری پێنج لە سەرەوە.



وێنەی ١٩١) زیپکەی عازەبەخڕە.

١٢- **زیپکەی کتوپری تیژ** Acne fulminans: بریتییە لە دەرهاتنی کتوپڕی زیپکەی گەورەی ئاوساوی بەئازار لە پشت و سنگدا و خێرا دەبێتە چاڵەبرین و بە جێ زام جێهێشتن سارێژ دەبیت، لە نێرینەی هەرزەکاردا روودەدات، نەخۆش تا و جومگەسۆ و ئازاری ماسولکە و لاوازی هەیە و ئاستی خانەی سپی خوێن بەرزدەبێتەوە بۆ ١٠,٠٠٠- ٣٠,٠٠٠ ملم٣ و بە ئێکسبەرداری ئێسکە بەئازارەکان بۆشبوونی ئێسك osteolytic lesions دەبینرێت و ESR بەرز دەبێتەوە.

**چارەسەر:** ژەمی بەرزی دژەبەکتریا + ستیرۆیدی سەراپایی + ئایزۆترێتینۆین + ستیرۆید بە تێچزاندن، دوای چەند حەفتەیەك ستیرۆید کەم دەکرێتەوە.

١٣- **سەلکەسۆی گرام نێگەتیف** Gram negative folliculitis:

ئەو کەسانەی زیپکەی عازەبەی سۆیی مامناوەندیان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ هەیە و چارەسەی دژەبەکتریایان بە تایبەتی تێتراسایکلین دراوەتێ تووشی ئەم جۆرە دەبن، لە کاتێك دا نەخۆش دژەبەکتریا وەردەگرێت پیزۆکەی رووکەشی (٣-٦ ملم) لە لێواری کونی لووت دەردێت و بلاو دەبێتەوە یان گرێی قووڵ و بڵی تووش دەبێت، ئەو بەکتریایانەی ئەم سۆیە دروست دەکەن بریتین لە کلێسیەللا klebciella، ئی. کولای E. coli، ئینتیرۆبەکتیر enterobacter یان پرۆتیەس proteus.

**چارەسەر:** تێتراسایکلین بوەستێنە و لەجیاتی ئەم ئەمۆکسیلین amoxicillin یان بەکتریم یان ئایزۆترێتینۆین بەکاربێنە.


(وێنەی ١٩٢) زیپکەی گۆشتپارەیی

١٤- **زیپکەی گۆشت پارەیی** Acne keloidalis:

(وێنەی١٩٢) بریتییە لە سەلکەسۆیەکی دارزێن لە پشتەسەری نێرینەی باڵق دا بە شێوەی تەنۆچکە و پیزۆکەی سەلکی و بۆ تەنۆچکەی پتەو و یەکگرتوو بەیەکەوە پەرەدەستێنێت ،بۆ دروست بوونی قوتکەی وەك گۆشت پارە، موو لە ناوچوون و هەندێك جار رێچکەلۆچی دەڵێنەر.

**چارەسەر**

١) ستیرۆیدی جێیی بەهێز بە تەنیا یان لەگەڵ جێڵی ترێتینۆین رۆژی ٢ جار بۆ تەنۆچکە سەلکیەکان.

٢) دژەبەکتریای سەراپایی بە تایبەتی تێتراسایکلین.

٣) ستیرۆید تێچزاندن.

٤) برینی کۆنە جێ زام بۆ ژێر سەلکەمووەکان و دروونەوەی.

٥) لەیزەری $CO_2$.

٦) نەشتەرگەری بەستن cryosurgery.

١٥- **زیپکەی دارزانی** Acne necrotica: بریتییە لە تەنۆچکەی سەلکی سووری بە ئازار یان بەخورو و بۆ دارزانی خانە پەرەدەستێنێت و دواتر قەتماغەکردنی ناوەراستەکەی و جێهێشتنی جێزامی ئاوڵەیی varioliform، لەسەر لووت و ناوچەوان و پێشی پێستی سەر و هەندێك جار قەد دا دەردەچێت و درێژخایەنە.

**چارەسەر:** تێتراسیکلین یان ئایزۆترێتینۆین.

## فره پۆرگەچەوری Steatocystoma multiplex

بریتییە لە دەرهاتنی پۆرگی cysts (١ ملم – ٢ سم) رەنگ پێستی یان زەرد لە کۆڵەی سنگ و هەندێك جاریش لە پشت و قۆل و باسك و ران و باتوو لە باڵق دا و لە جۆری بۆماوەیی لەشی زاڵە، پۆرگەکان شلەی چەوری روون یان مژادی سپی پەنیریان تێدایە(وێنەی ١٩٣)

.







**چارەسەر:** پێویست ناکات یان کون کردنی پۆرگەکان و فڕێدانی مژادەکەی ناوی یان برین.

(وێنەی ١٩٣) فره پۆرگەچەوری.

## توێکەرە خانەسۆی پێستی سەر Dissecting cellulitis of the scalp

لە باڵقی رەش پێست دا هەیە و زۆر باو نییە، بە شێوەی تەنۆچکەی سەلکی و دەوری سەلکی دەردەچێت و بەرەو دوومەڵ دروستبوون و زیپکەی خڕەعازبە پەرەدەستێنێت. ئەم دوومەڵ و گرێ سۆیانە پڕ کێم دەبن و بەرەو ژێرەوە دەڕۆن و لۆچی بەیەکەوە بەستراو لە ژێر پێست دا پێکدەهێنن، جێ زام و قژڕووتانەوەی هەمیشەیی، پتر لە ناوەڕاست و پشتی سەردا، جێدەهێڵن(وێنەی١٩٤).



(وێنەی ١٩٤)
توێکەرە خانەسۆی پێستی سەر

**چارەسەر**

١- دژەبەکتریا ،بە تایبەتی کە تووشێنی بەکتریای ستافیلۆکۆکەس جۆری مەیینەر پۆزەتیف coagulasive positive هەبوو، وەك ریفامپیسین و کلێندامایسین لەگەڵ زنك هەندێك جار.

٢- ستیرۆید بە تێچزاندن + ئایزۆتریتینۆین ٠,٥-١,٥ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ٦-١٢ مانگ.

٣- نەشتەرگەری یان لەیزەر بۆ لابردنی مووەکان.

بریتییە لە نەخۆشیەکی درێژخایەن دوای باڵق بوون و لە مێینەدا زۆرتـرە (١:٤)، تووشـی لۆچـەکان folds وەك ژێر باڵ و لا مووسەڵان و سمت و ژێر مەمك دەبێـت، هەنـدێك جـار مەمیلـە و سـك و سـنگ و پێسـتی سـەر و پەلـەکانی خـوارەوە دەگرێتەوە (ئـەو شـوێنانەی گەنـدە ئارەقـە گلانـدیان تێدایە)، زۆرتر لە قەڵـەو دا هەیـە و لەوانەیـە ئـەو نەخۆشـیانەی بـەهۆی داخرانـی کـونی چـەوری دروست دەبن وەك زیپکەی عازەبەخرە، یان توێکەرە خانەسۆی پێستی سەر لە هەمان نەخۆش دا هەبن. (وێنەی ١٩٥)



(وێنەی ١٩٥) کێمێنەئارەقەگرێسۆ.

بە کوانی ژێر پێستی سووری بە ئازار (٠,٥-٢سم) دەست پێدەکات و بۆ دوومەڵ و تەقین و فڕێدانی کێم یان کێم و زەرداو پەرەدەستێنێت.. ئەم پرۆسەیە دووبارە دەبێتـەوە و دەبێتـە هـۆی بـە چـەقبوون fibrosis و پێکەوەنووسانی کۆمەڵێك جێ زام و بوونی کوان و دوومەڵ و کێم دەڵاندن و جووڵەی ناوچەکە بەئازاردەکات و بۆگەن دروست دەکات.

هەندێـك جـار کـۆم و دەوری کـۆم و ڕێگـە دەگرێتـەوە و کـۆم قـرچـۆك دەبـێـت (تەسـك دەبێتەوە) anal stricture، لەوانەیـە ناسـۆری کیلـەك و میزەجـۆ و گرتنـەوەی بەشـی قـوولایی کیلەکیش دروست ببێت. لەوانەیە سووکە جومگەسۆیەك لە باری تیژدا هەبێت.

تووشـێنی بـەکتریا هەیـە وەك سـتافیلۆکۆکەس جـۆری ئۆریـەس aureus و مەیینـەر نێگـەتیف. سترێپتۆکۆکەس، پسودۆمۆنەس، ئی. کۆلای، پێپتۆسترێپتۆکۆکەس و پریڤۆتێلا.

هۆکاری ئەم نەخۆشیە نەزانراوە بەڵام کەمێکیان بۆماوەیین.

**چارەسەر**

٣ قۆناغە: کێش دابەزاندن، وازهێنان لە جگەرەکێشان ، جلوبـەرگی لـەبار، دوورکەوتنـەوە لـە گەرما و بەکارهێنانی دژەئارەق وەك شلـەی ئەلۆمنیۆم کلۆراید هێکساهایدرەیت .

١- شلەی کلیندامایسین ١٪ یان تێتراسایکلین (٥٠٠ ملگم×٢) لەگەڵ ئەزیلایك ئەسید (کرێم) رۆژی یەکجار، کلیندامایسین بە دەم ٣٠٠ ملگم × ٢ یان دایکلۆکساسلین ٥٠٠ ملگم × ٣، بۆ مێینە خەپلەی دایان (سیپرۆتیرۆن ئەسیتەیت ٢ ملگم + ئەثینیل ئیسترادیۆڵ ٣٥ ملگم)، سیپرۆفلۆسکاسین، سیفالۆسپۆرینەکان. ئایزۆترێتینۆین ١ ملگم/کگم/رۆژبۆ ٤-٦ مانگ لە ٢٠-٥٠٪ نەخۆشەکان دا بەکەڵکە.

٢- ستیرۆید بە تێچزاندن + نەشتەرگەری سووك (کردنەوەی دەرەکی exteriorization).

٣- نەشتەرگەری گەورە: لابردنی شانە ناساغەکان یان کردنەوەی دەرەکی هەموو شانە ناساغەکان، یان برین و لابردنی ناوچە ناساغەکە و پێست متوربەکردن (لە سنگەوە) لە شوێنی، یان دەرمانی نەرمکەرەوە palliative وەك ستیرۆیدی سەراپایی (٤٠-٦٠ ملگم پرێدنیزۆلۆن لە ٢-٣ حەفتەدا کەم بکرێتەوە)، سایکلۆسپۆرین، ئینفلیکسیماب infliximb یان فینیستراید finesteride.

بە دەگمەن نەشتەرگەری گەورە بۆ کۆم و مەمك دەکرێت.

## نەخۆشی گوڵی ( پەمەیی ) Rosacea

ئەم نەخۆشیە باوە (٥٪ی خەڵکی هەیانە) و پتر لە ٢٠-٤٠ ساڵی دا و لە مێینەدا (٣:١) هەیە، بەڵام لە بەساڵاچوودا لە نێرینەدا بەتایبەتی لوتەزلە rhinophyma باوترە، هۆکارەکەی نەزانراوە بەڵام لەوانەیە تێکچوونی گچکەسووڕی خوێنهێنەری گۆشەی دەموچاو راستەوخۆ لە ساردکردنەوەی خوێنی مێشك رۆڵ ببینێت، یان زیندەوەری دیمۆدێکس فۆلیکولارەم Demodex folliculärum و هێلیکۆبەکتیر پایلۆری Helicobacter pylori رۆڵی تێدا ببینن.



(وێنەی ١٩٦) نەخۆشی گوڵی.

**نیشانەکانی**: ناوەڕاستی دەم چاو centrofacial وەك لوت، ڕوومەت، چەناگە، ناوچەوان و نێوان برۆکان و هەندێك جار پشت گوێچکە، بەشی V سەرەوەی سنگ، مل، پشت، پێشەوەی سەری رووتاوە و بە دەگمەن پەلەکان دەگرێتەوە. (وێنەی ١٩٦) سووربوونەوە و فرەدەزوولە telangiectasia و ناوە بەناوە سەرهەڵدانی سوورهەڵگەڕان و تەنۆچکە و پیزۆکە لەم شوێنانەی باسمانکرد دەردەچن، لە قۆناغی دواتردا گۆڕانکاری گۆشتەزوونەگمۆڵی و ئاوساوی دەردەکەون، نەخۆش بە بەردەوامی تووشی سوورهەڵگەڕان

flushing و سوورهەڵگەڕانی دەرووونی blushing دەبێت بەهۆی ت س و، خواردنەوەی شلەی گەرم، سەرما، گەرما، وورووژێنی کیمیکی، دەروون تێکچوون (تووڕەبوون، سۆز، – تاد)، خواردنەوەی مەی و تروونی (خواردنی تیژ) spices . لە کۆتایی دا دووبارەبوونەوەی سوورهەڵگەڕانەکە دەبێتە سووربوونەوەی هەمیشەیی.

سێ قۆناغی هەیە:

١- قۆناغی I: سووربوونەوەی ماناوەندی هەمیشەیی + فرەدەزوولە.
٢- قۆناغی II: ئەوانەی قۆناغی I + تەنۆچکە و پیزۆکە.
٣- قۆناغی III: سووربوونەوەی قووڵی هەمیشەیی + فرەدەزوولەی چڕ + تەنۆچکە و پیزۆکە + گرێ و پەنەمان oedema .

## جۆرەکانی نەخۆشی گوڵی

١- **پەنەمانی هەمیشەیی نەخۆشی گوڵی** Persistent oedema of rosacea:
ئەم پەنەمانە بە پەستان ناپووکێتەوە و لە شوێنە تووشبووەکانی سەرەوە دەردەکەوێت.

٢- **نەخۆشی گوڵی چاوی** Ophthalmic rosacea: وەك پێڵووەسۆ، پێڵووپۆشەسۆ، گلێنەسۆ، سۆی ناوچاو، کێمی ئاوی شووشەیی hypopyoniritis و تیشکەهەستیاری چاو photophobia.

٣- **نەخۆشی گوڵی گۆشتەزوونەگمۆڵی** Granulomatous rosacea: بە شێوەی تەنۆچکەی سوور و قاوەیی یان گرێی بچووك لە سەر دۆشەکەیەکی (تەختێکی) پێستی سووربووەوە و ئەستووربوو، بە تایبەتی لەسەر پێڵووەکانی خوارەوە دەردەچێت.

٤- **نەخۆشی گوڵی ستیرۆیدی** Steroid rosacea: بە هۆی بەکارهێنانی ستیرۆیدی جێیی بۆ کاتێکی دوورودرێژ، جگە لە نیشانەکانی باسمانکرد پووکانەوە و پێست تەنك بوون و زۆربوونی فرەدەزوولە و پەیدابوونی تەنۆچکە و پیزۆکەی قووڵ و خڕ و گرێ و هەندێك جار سەرەزیپکەش دەردەچن، دەموچاو سوورێکی گڕگرتوو و کاژاوی و بە تەنۆچکە داپۆشراو دەبێت لەگەڵ ئازار و کزانەوە.


(وێنەی ١٩٧) نەخۆشی خڕە گوڵی.

٥- **نەخۆشی گوڵی گرام نێگەتیفی** Gram negative rosacea: وەك قۆناغی II و III وایە و هەمان بەکتریاکانی نەخۆشی عازەبەی گرام نێگەتیفی دروستی دەکەن.

٦- **نەخۆشی خڕە گوڵی** Rosacea conglobata:
(وێنەی ١٩٧) بەدەگمەن نەخۆشی گوڵی تیژ کاردانەوەیەك

نیشان دەدات بە شێوەی دوومەڵی گرێی خوێناوی و قوتکەی رەق، لەوانەیە بەهۆی وەرگرتنی هالۆجینەکان رووبدات.

٧- **نەخۆشی گوڵی کتوپڕی تیژ** Rosacea fulminans یان **کێمپێستی دەموچاو** : Pyoderma faciale

تەنیا لە مێینەی دوای تەمەنی هەرزەکاری روودەدات و بریتییە لە ئەوپەڕی جۆری(٦)، بەشێوەی گرێی گەورە و لۆچی دەڵێنەری یەکگرتوو هەموو دەموچاو بە تایبەتی چەناگە و روومەت و ناوچەوان دەگرێتەوە، دەموچاو بە بلاوی سووربۆتەوە، چەورە و پڕبووە لە دوومەڵ و پیزۆکەی زۆریش سواری گرێ فرەکوانیەکان بوون، پتر لە سکپڕی و بوونی نەخۆشی کرۆن و ریخۆڵەئەستوورەسۆی چاڵەبرینی و گرفتی دەروونی گەورەدا روودەدات، دوای چارەسەر دووبارە نابێتەوە. (وێنەی ١٩٨)


(وێنەی ١٩٨)
نەخۆشی گوڵی کتوپڕی تیژ.

٨- **زلبوون لە نەخۆشی گوڵی** Phymas in rosacea، دوو جۆرە:

١) **لووتەزلە** Rhinophyma: دەگمەنە و هەر لە پیاوان دا هەیە، لە چەند ساڵێك دا لووت بەهۆی پڕبوونی بەستەرەشانە، گەورەبوونی رژێنەچەوری، فراوانبوونی خوێنهێنەرەکان و سۆی قووڵی درێژخایەن گەورە دەبێت ، ٤ جۆری هەیە: (وێنەی ١٩٩)

أ- جۆری رژێنی (گلاندی) Glandular form.

ب- جۆری ریشاڵی Fibrous form.

ج- جۆری خوێنبۆریریشاڵی Firoangiomatous.

د- جۆری خۆری Actinic form.

٢) **زلبوونی شوێنەکانی تر**: وەك چەناگە زلبوون، ناوچەوان (نێوان برۆ) زلبوون، گوێچکەزلبوون و پێڵوو زلبوون.


(وێنەی ١٩٩)
لووتە زلە لە نەخۆشی گوڵیدا.

**چارەسەر**

١- **وروژێنەکان** (وەك سابوون، پاککەرەوەی ئەلکهولی، وشککەرەوەکان، مژادی زبر و کاژێن) بەکارنەهێنرێن.

٢- **پاراستنی پێست دژی خۆر: به دژەخۆرەکان** sunscreens **به درێژایی ساڵ.**

٣- **چارەسەری جێبیی** topical therapies: **وەك:**

١) مێترۆنیدازۆل metronidazole: **جێڵ ٠,٧٥٪، شلە یان کرێم ١٪، رۆژی ١-٢ جار.**

٢) سۆدیۆم سەلفەسیتئەماید – گۆگرد sodium sulfacetamide-sulphur ١٥٪ **شلە**، پێرمیثرین **کرێم ٥٪**، سەلفەر (گۆگرد) **شلە ٢-٥٪**، ئەزیلایك ئەسید azelaic acid **کرێم ٢٠٪**، بێنزۆیل پێرۆکساید benzoyl peroxide ٢,٥-١٠٪ **جێڵ، کرێم**، بافۆنازۆڵ **١٪ کرێم**، ئیریثرۆمایسین **٢٪**، کلیندامایسین **١٪ شلە**، تاکرۆلیمۆس، ترێتینۆین، کیتۆکۆنازۆڵ **کرێم ١-٢٪.**

٤- **چارەسەری سەراپایی** systemic therapy: **وەك: تێتراسایکلین ١-١,٥ گم/رۆژ، ئۆکسی تێتراسایکلین ١-١,٥ گم/رۆژ، دۆکسی سایکلین ٥٠ ملگم ×٢/رۆژ، ماینۆسایکلین ٥٠ ملگم ×٢/رۆژ، ئیریثرۆمایسین، کلاریثرۆمایسین، ئازیثرۆمایسین، کۆمەڵی تێتراسایکلینەکان بەم ژەمەی سەرەوە بۆ ٢-٣ حەفتە، ئەوسا بەپێی باری نەخۆش بۆ ٢٥٠ ملگم/رۆژ یان رۆژ نا رۆژ کەمبکرێتەوە. ئازیثرۆمایسین** azithromycin **٢٥٠ ملگم حەفتەی ٣ رۆژ (رۆژنارۆژ) بۆ ٤ حەفتە یان ٥٠٠ ملگم ٣ رۆژ لە حەفتەیەك دا (٣ رۆژی دوا بە دوای یەك) بۆ ٤ حەفتە ئەوسا ٢٥٠ ملگم ٣ رۆژ لە حەفتەیەك دا بۆ ٤ حەفتە، ئەوسا ٥٠٠ ملگم/یەك رۆژ لە حەفتەیەك دا بۆ ٤ حەفتە. مێترۆنیدازۆل ٥٠٠ ملگم × ١ بۆ ٢٠-٦٠ رۆژ، ئایزۆترێتینۆین ٠,٢-٠,٥ ملگم/کگم/رۆژ یان ١٠ ملگم/رۆژ یان رۆژنارۆژ، کیتۆکۆنازۆڵ ٤٠٠ ملگم/رۆژ + ٢٪ کرێمەکەی.**

**چارەسەری فرەدەزووله لە نەخۆشی گوڵی:**

١- **ماکیاج،**

٢- **لەیزەر، وەك** coper vapor، argon laser، flash lamp pumped dye laser،

٣- IPL.

**چارەسەری سوورهەڵگەڕانی نەخۆشی گوڵی:**

١- **کلۆنیدین ٠,٥ ملگم × ٢.**

٢- **بێتاوەستێن (بەربەستی بێتا)** β-blockers **وەك نادۆلۆڵ** nadolol **٤٠ ملگم/رۆژ.**

٣- **نالۆکسۆن** naloxon **٠,٨ ملگم بە ژێرپێست.**

٤- **لەیزەری** pulsed dye laser.

٥- **خەواندن** hypnosis.

**چارەسەری نەخۆشی گوڵی کتوپڕی تیژ:**

١- ستیرۆیدی سەراپایی وەك پریدنیزۆلۆن ١-٢ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ١-٢ حەفتە، ئەوسا ئایزۆتریتینۆین ٢,٠-٥,٠ ملگم/کگم/رۆژ، ئەوسا لە ٢-٣ حەفتەدا ستیرۆیدەکە لادەبەین و لە سەر ئایزۆتریتینۆین بۆ ٣-٤ مانگ بەردەوام دەبین.

٢- دژەبەکتریا بە دەم وەك تێتراسایکلین، ئیریترۆمایسین یان ماینۆسایکلین لەگەڵ ستیرۆیدی جێیی.

٣- دایسۆن.

**چارەسەری پەنەمانی نەخۆشی گوڵی:**

ئایزۆتریتینۆین ١,٠-٢,٠ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ٢-٦ مانگ + کیتۆتیفین ketotifen ١-٢ ملگم/رۆژ، یان کلۆفازیمین ١٠٠ ملگم، حەفتەی ٤ جار.

**نەشتەرگەری بۆ لوتەزلە** rhinophyma:

برینی قەبارە زۆربووەکە بە تاشین، ژێر پێست برین و خستنەوەسەری پێستە ئاساییەکە، یان داخکەری ئێلێکتریکی electro-coagulation، نەشتەرگەری بەستن cryosurgery، لەیزەری $CO_2$، Nd:YAG، Er:YAG، پێش نەشتەرگەری دوای ەشتەرگەری ژەمی کەمی ئایزۆتریتینۆین بەکاردەهێنرێت.

## پێستەسۆی دەوری دەم Perioral dermatitis

لە مێینەی تەمەن ٢٠-٣٥ ساڵی دا زۆر باوە و بریتییە لە دەرهاتنی تەنۆچکە و پیزۆکەی بچووکی جیاجیا لەسەر پێستی سووربووەوە و هەندێك جار کاژاوی دەوری دەم و هەندێك جار دەوری چاویش، نزیکەی ٥ ملم دوور لە لێواری لێو دەردێت، یەکەم کەرەت لە دەوری کونی لووت و لکینی هێڵی لووت و لێو دەست پێدەکات و بڵاودەبێتەوە، هەندێك جار کزانەوە هەیە، هۆکارەکەی زۆربەی جار بەکارهێنانی (بەهەڵەی نەخۆش) ستیرۆیدی بەهێزی جێییە. (وێنەی ٢٠٠)



(وێنەی ٢٠٠) پێستەسۆی دەوری دەم.

**چارەسەر**

ستیرۆید وازلێبێنە و لەجیاتی تاکرۆلیمۆسی جێیی یان ئیمۆلیانت لەگەڵ تێتراسایکلین بەدەم (یان ئاوەڵەکانی) بۆ چەند حەفتەیەك بەکاربهێنە. ئەگەر نەخۆش ستیرۆیدی جێیی بەکارنەهێنابوو ئەوە چارەسەری جێیی بە دژەبەکتریا، ئەداپالین، ئەزیلاێك ئەسید یان فلاجیل دەکەین.

## Lupus miliaris disseminatus faciei تەنۆچکەسیلی دەموچاوی بڵاو

بریتییە لە دەرهاتنی تەنۆچکەی هاوشێوەیی (١-٣ ملمی) سوور یان قاوەیی و زەردی پتەو و لووس لەسەر پێستی دەموچاو و ژێر چەناگە و دەوری چاو و دەم و گوێچکە و پێڵوو، درێژخایەنە و بە جێ زام چاك دەبێتەوە.



. (وێنەی ٢٠١) تەنۆچکەسیلی دەموچاوی بڵاو

**چارەسەر**

ماینۆسایکلین یان کلۆفازیمین یان ئایزۆترێتینۆین بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ.
(وێنەی ٢٠١)

## Diseases of the sweat glands نەخۆشی ڕژێنە ئارەقەکان

**دوو جۆرن**

### أ) فرەئارەقکردنەوە Hyperhidrosis

**ئەمیش دوو جۆرە:**

**١- فرەئارەقکردنەوەی جێیی Localized hyperhidrosis وەك:**

١) فرەئارەقکردنەوەی بەری دەست و پێ ( واتا جۆری سۆزی)
Emotional hyperhidrosis (Palmoplantar hyperhidrosis)

ئەم جۆرە لە بەری دەستوپێ دا ڕوودەدات و لە منداڵییەوە لە بەری دەستداو لە هەرزەکاریەوە لە بەری پێدا دەست پێدەکات و لەگەڵ تەمەن دا کەم دەبێتەوە و لەکاتی خەوتن دا نامێنێت، دڵەڕاوکێ و ترس و ماندووبوون و دەروون تێکچوون زۆرتری دەکات، ڕێژەی ٢٥٪ی ئەوانەی فرە ئارەقکردنەوەی ژێر باڵیان هەیە، ئەم جۆرەشیان هەیە. دەست سارد و تەڕ و خووساوە و کاردانەوەی دەروونی بەدی بۆ سەر نەخۆش هەیە، چونکە کاردەکاتە سەر نووسین ( لە خوێندکارەکان دا) و پیشەی کارکەر. هەندێك جار لە جۆری بۆماوەیی لەشی زاڵە.

٢) فرەئارەقکردنەوەی چێژی (تامی) Gustatory hyperhidrosis

هەندێك کەس دوای خواردنی بەهارات و خواردنی توون (تیژ)، ساس، چوکلێت، قاوە، کاکاو، چا یان شۆربای گەرم بە کاتێکی کەم ،فرەئارەقکردنەوەی ناوچەوان و لێوی سەرەوە و ناوچەی دەوری دەم و کۆڵەی سینگیان تووش دەبێت، ئەم جۆرە یان هۆی

نــەزانراوە یــان ئــەنجامی نەخۆشــی تــرە وەك: فرەچــالاكبوونی دەمــارە وزەوالاْكــان sympathetic nerves (وەك دوای نەشــتەرگەری)، دەردەدەمــار neuropathy (وەك لــە نەخۆشــی شــەكرە دا یــان دوای نەخۆشــی تامیســكی دەمــار H. zoster)، لاجانگەگلاندەسۆ parotitis و دوومەڵی لاجانگەگلاند و زەبر یان نەشــتەرگەری ئــەم گلاندە.

٣) جــۆری تر

وەك فرەئارەقكــردنەوە لەســـەر خـاڵی (نیشـــانەی) شـینەجیرە بلّـق blue rubber bleb naevus، لــووی گلّۆمــەس glomus tumor، خوێنبۆریــە گمــۆڵ haemangioma و لووی پەتكە دەمار كە فرەئارەقكردنەوەی بەری دەست لە یەك لا دروست دەكات.

٢) فرەئارەقكردنەوەی گشتی Generalized hyperhidrosis

لە ئەنجامی هۆی تر روودەدات وەك: نەخۆشــی بــە تــاوە، وەرزش، ژینگــەی شــێدار و گــەرم وەك ناوچەی كەمەرەیی، پەریزادەی ژەهراوی hyperthyroidism، زەبەلاحی acromegaly، نەخۆشی شەكرە، رەنگەخانەگمۆڵی ئاسـایی pheocromocytoma، كەمشــەكری خــوێن hypoglycemia، بــەژەهربوون بــە سالیســیلیك salicylism، لیمفۆمــا (شــێرپەنجەی لیمفی)، سكپڕی، لێچوونەوە menopause، رووداوی شلەقێن concussion، نەخۆشــی پاركنسـۆن، لە ناوچوونی پەتكەدەمار بە شێرپەنجەی بلاوبووەوە، – تاد.

پشكنین: ئەگەر گومانی بوونی نەخۆشی تر هەبوو ئەوە هەندێك پشكنین دەكــەین وەك كــاری ملەقۆرتە گلاند ( $T_3$، $T_4$، – تاد)، میتانیفرینەكان لە میزدا، پێــنج هایدرۆكســی ئینــدول ئەسیتیك ئەسید 5-HIAA و رێژەی شەكر لە خوێن دا.

چارەسەر

بۆ جۆری هۆ زانراو هۆكارەكەی چارەسەردەكرێت بەلاّم بۆ جۆری هۆ نەزانراو بەم شــیوەیەی خوارەوە چارەسەر دەكرێت.

* ئەلۆمنیۆم كلۆراید هێكساهایدرەیت ACH لە ناو ئیثانـۆڵدا (٢٠–٢٥٪): شــەوی جارێـك (ژێر باڵ نەتاشرێت)، باش وایە تا چەند رۆژێك خەپلەی دژە وزەكولّینی بدرێتێ (وەك ١ملگم سۆدیۆم گلایكۆپایرۆڵەیت) ٤٥ خولــەك پــێش لێـدانی ACH بــۆ ئــەوەی ئارەقكردنەوەكــە كەمبكاتەوە و شلــەی ACH بە پێستەوە بمێنێتــەوە، لــەوانەیــە دوای ٢–٣ حەفتــە ،حەفتــەی شەوێك بەس بێت. بەیانیان بشۆردرێتەوە، ئەگــەر كزانــەوە هــەبوو ستیرۆیدی جێیــی لــەگــەڵ

بەکاردەهێنرێت. فۆرماڵدیهاید و گلوتار ئەڵدیهاید جاران بەکاردەهێنران بەڵام فرەهەستیاری دروست دەکەن و پێست قاوەیی دەکەن.

* دژەوزەکولَینی جێیی topical anticholinergics: وەك شلەی گلایکۆپایرۆلەیت ٠,٥٪ glycopyrrolate aqueous solution.
* دژە وزەکۆلینی بە دەم oral anticholinergics: وەك پرۆپانثیلین برۆماید propanthelin bromide ١٥ ملگم × (١-٣).
* یان گلایکۆپایرۆلەیت بە دەم ٢ ملگم × (١-٣).
* دیلتیازیم diltiazem، کلۆنازیپام clonazepam، کلۆنیدین clonidine.
* ژەهری بۆتولینەم botulinum: جۆری A و B بەکەڵکن و ١٠ جۆری تریشی هەیە. جۆری A (dysport =botox) بۆ ژێر باڵ بە دەرزی ٢ سم لە یەك دوور، رووبەری ٢٠٠ سم٢ لێی دەدرێت و بۆ بەری دەست دەماری تەلزمە و ناوەڕاست ( radial & median nerves ) سڕ دەکرێت، دوای ٢٤-٧٢ کاتژمێر ئارەقکردنەوە نامێنێت و ٣-٦ مانگ بەردەوام دەبێت. لەوانەیە بۆ ژێر پێ بە دیژمۆجێت بەکەڵك بێت. جۆری (neurobloc B) بۆ ژێر باڵ، هەندێك جار بە پرۆسەی ئایۆنخستنەناو iontophoresis نەك بە دەرزی دەدرێت.
* بۆ ژێر باڵ هەڵمژینی چەوری ژێر پێست و برین بە نەشتەرگەری.
* برینی دەماری وزەواڵا sympathectomy بە ئامێری ناوسنگبین thoracic endoscopy.
* ئایۆنخستنەناو پێست iontophoresis: ئامێرێکی ئیلیکتریکییە بە پاتریش ئیش دەکات، حەفتەی ٣ جار دواتر ١-٢ جار لە مانگێك دا، بۆ بەری دەست و پێ و ژێر باڵ. لە سکپڕی و نەخۆشی دڵ دا بەکار ناهێنرێت.

## ب) کەمئارەقکردنەوە Hypohidrosis و ئارەقنەکردنەوە Anhidrosis

**بریتییە لە ئارەقنەکردنەوە بەهۆی تێکچوونی رژێنە ئارەقەکان، لەم بارانەی خوارەوەدا روودەدات:**

١- لێدانی گەرما heat stroke: **بەهۆی فرەماندووبوونی رژێنە درشتە ئارەقەکان روودەدات ، باسمانکردووە.**

٢- بەدشێوای توێژەشانەی کەمئارەقدەردان hypohidrotic ectodermal dysplasia، **(باسمانکردووە).**

٣- کۆرپەی پێنەگەیشتوو (نابەکام) prematurity.

٤- نەخۆشی پێست: جێ زامی نەخۆشی وەك سیلی پێست، رەقبوونی پێست morphea، کۆنیشانەی جۆگرین sjogren's syndrome، نەخۆشی ماسی، سەدەف و گەرمەژنەی قوول.

نەخۆش لە کەمئارەقکردنەوەی گشتی دا لە کاتی گەرما دا هەست بە بێزاری دەکات و تووشی دڵ تێکەڵهاتن و گێژی و دڵەکوتێ و تا دەبێت.

## ج- بۆگەنە ئارەق Bromidrosis (Osmidrosis)

بریتییە لە زێدە یان نائاسایی بۆنی لەش، دوو جۆرە:

١- **بۆنی گەندەئارەقە گلاند**: ئەم جۆرە باوترە، دوای باڵقبوون دەردەکەوێت، لە هاوین دا بەهۆی فرەئارەقدەردانی درشتە ئارەقەگلاند پترە و ئەمیش دەبێتە هۆی پتر گەندەئارەقدەردان. زۆر جار خێزانییە، بۆگەنەئارەقی ژێر پێ لە گەنجی نێرینە و ناوەڕاستی تەمەنی نێرینە و مێینەدا هەیە، گەندە ئارەق تا دەگاتە سەر پێست بێ بۆنە، بەلام بەکتریا وەك (دیفثیرۆیدە هەواییەکان aerobic diphtheroids) بە کارتێکردنە سەر پێکهاتەی ئەم رژێنە و دروستکردنی (ترشی ئیتا٣-مەثیل-٢هێکسۆنیك 3-methyl-2-hexonic acid-)، لەگەڵ ترشە چەوریە کورتە زنجیرەکان short chain fatty acids و ئەمۆنیا ammonia بۆگەنەکە دروست دەکات. جگە لەوەش ژمارە و قەبارەی ئەم گەندەرژێنانە لە ئاسایی زۆرترن و ئاستی ئەنزیمی پێنج ئەلفا ریدەکتەیس 5∝ reductase لەم گەندەرژێنانە دا لە ئاسایی بەرزترە و بەمەش ئاستی دایهایدرۆتێستۆستیرۆن پتر دەبێت.

٢- **بۆنی درشتەئارەقە گلاند**: باو نییە، هۆکانی بریتین لە:

١) بەهۆی کارتێکردنی بەکتریا لەسەر لۆچەکاژی خوساو (بەهۆی فرەدرشتەئارەقدەردان) دروست دەبێت، پتر لە ژێر پێدا و لۆچەکانی تری لەش.

٢) هۆی زیندەچالاکی metabolic وەك کۆنیشانەی بۆن ماسی fish odor syndrome، کە تێیدا مژادی ترایمەثیل-ئەمین trimethylamine (بۆنی وەك ماسی بۆگەن وایە)، لەگەڵ درشتە ئارەق و میز و لیك و چڵم دەردەهاوێژرێت excreted، چونکە هەندێك خواردەمەنی وەك ماسی، هێلکە، جگەر و گورچیلە کە مژادی لیسیثین وکۆلینیان تێدایە ،بەهۆی بەکتریای ناو ریخۆڵە، ترایمەثیل ئەمین لەم مژادانە دروست دەبێت و بەهۆی نەبوونی

ئەنزیمی ترایمەثیل ئەمین ئۆکسیدەیس (وەك لە نەخۆشی جگەردا) ئەم مژادە هەرس نابێت و ئەم بۆنە دروست دەکات.

٣) دەرهاویشتنی خواردەمەنی وەك سیر، دەرمان وەك مەرگەمووش arsenic و دەرمانی تریش، ئەمانەش بۆن دروست دەکەن.

٣- بۆنی چەوری sebaceous secretion پێست ، کەمێك بۆن دروست دەکات.

٤- دەروونی: وەك لەخشتەچوون delusion، خۆبەزلزانین paranoia و نەخۆشی کۆئەندامی دەماری مەڵبەندی C.N.S، لە راستی دا بۆگەن نییە بەڵام نەخۆش خۆی دەڵێت بۆنم هەیە.

**چارەسەر**

١- سابوونی دژەبەکتریا، بۆنبرە deoderants، تاشینی ژێرباڵ، خۆشۆردنی زوو زوو، گۆڕینی جلی ژێرەوە، بەکارهێنانی ئارەقکەمکەرەوەی جێیی ( وەك ئەلەمنیۆم کلۆراید).

٢- نەشتەرگەری (بڕینی شانەی ژێر پێست و هێشتنەوەی پێستەکەی داپۆشیوە) ، بەکارهێنانی سۆنەر و هەڵمژینی نەشتەرگەری گەندە ئارەقەگلاندەکان، چونکە وزەی سۆنەر چەوری و ئارەقەگلاندەکان بە بۆشکردن cavitation دەتوێنێتەوە یان لەیزەر Nd:YAG.

٣- بۆ جۆری بۆگەنی درەشتەئارەق، ئایۆنخستنەناو پێست iontophoresis (بەئاوی ئاسایی tap-water) حەفتەی ٢-٣ جار، بەڵام دواتر ٣-٤ حەفتە جارێك.



(وێنەی ٢٠٢ ) ئارەقی رەنگدار ( رەش ).

## د- ئارەقی رەنگدار Chromhidrosis

زۆر دەگمەنە، گەندە ئارەق بەتایبەتی لە دەموچاو و ژێرباڵ دروستی دەکات، رەنگی زەرد باوترە، ئەوسا شین، سەوز یان ئارەقی رەش، لە کاتی سۆز و دەروون تێکچوون دا وەك تووڕەبوون و ترس – تاد دەردەکەوێت، لایپۆفوسین lipofuscin مژادە رەنگیەکەیە. (وێنەی ٢٠٢)

بەڵام درشتەئارەقی رەنگدار هۆکارەکەی دەرەکیە وەك رەنگەکان و کانزاکان لەسەر پێست دا. بۆ نموونە ئارەقی سەوز و شین لە کرێکاری مس copper workers، ئارەقی سوور لە جلی تایبەتی فرۆکەوانی وەرزشی، ئارەقی قاوەیی لە نەخۆشی ئۆکرۆنۆسس یان زەرداو لە ئارەق دا لە نەخۆشی زەردوویی دا.

## گەرمەژنەی گەندە ئارەقەگلاند Fox-fordyce disease (Apocrine miliaria)

دەگمەنە، ڕێژەی ٩٠٪ یان مێینەی تەمەن ١٥-٣٥ ساڵن، تێیدا کونی گەندەگلاندەکان دادەخرێن، هۆکارەکەی نەزانراوە، بەڵام لە کاتی سکپڕی دا سووکتر دەبێت.



(وێنەی ٢٠٣)
گەرمەژنەی گەندە ئارەقەگلاند.

**نیشانەکانی:** بریتین لە دەرهاتنی تەنۆچکەی دەوری کونی مووەکان، جیاجیا و ڕەنگ پێستی، قوچەکەیی و زۆر بەخوروون. لە ژێر باڵ و بەر و لێو و دەفەری کۆم (ناوگەڵی) perinium و مەمیلە و کۆڵەی سنگ و ناوك و بەشی ناوەوەی ران دەردێن. لە هاوین دا و دوای وروژانی دەروونی و فیزیکی بە خورووتر دەبن، درێژخایەنە. (وێنەی ٢٠٣)

**چارەسەر**

١- خەپڵەی نەزۆکاندن (بۆ مێینە).
٢- شلەی کلیندامایسین، ڕۆژی ٢ جار (٣) ترێتینۆین ٠,١٪ کرێم.
٣- ستیرۆیدی جێیی و بە تێچزاندن.
٤- سووتاندن بە دەرزی مووسووتاندن electrolysis (شیکەرەوەی ئێلێکتریکی).
٥- ت س و B، ئایزۆترێتینۆین بە دەم.

چارەسەرەکان کاتین.

# Diseases of the hair نەخۆشیەکانی موو

دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکان:

١- **هەڵسەنگاندنی نائاسایی سووڕی موو** Assessing cycling abnormalities

بۆ دیاریکردنی لادانی سووڕی موو، چەند ڕێگایەك هەن، وەك:

أ) **موو ڕاکێشان** Hair pull: بۆ هەموو نەخۆشەکان کە سکاڵای موو رووتانەوەیان هەیە ئەنجام دەدرێت، لەم ڕێگا سانایەدا کۆمەڵێك موو (٥٠-١٠٠ موو) بە دەست بە ئەسپایی لە ژێرەوە بۆ سەرەوە لە ٦-٨ شوێنی جیادا لە سەر رادەکێشرێن، لەباری ئاسایی دا لە هەر راکێشانێك دا ٣-٥ موو بە دەستەوە دێنە دەرێ. ئەگەر پتر هاتنەدەرێ ئەوە نائاساییە و ئەم موانە لەژێر وردبین دا سەیر دەکرێن بۆ زانینی باری مووی ئاسایی و نائاسایی ( واتا پیازەی موو، قەدی موو، بەدگەشەیی - تاد).

ب) **موو هەڵکەندن** Hair pluck : بۆ زانینی ڕێژەی مووی گەشەکەر و پشوودەر بە سەیرکردنی پیازەی موو . بە ئازارە و کەم بەکاردەهێنرێت.

ج) **وێنەگرتنی موو** Phototrichogram: پارچەیەك لە مووی سەر دەتاشرێت یان زۆرکورت دەکرێتەوە و وێنەی دەگیرێت و دوای ٢-٣ رۆژ وێنەیەکی تر، ئەو موانەی گەشەیان کردووە لەگەڵ ئەوانەی وەستاون بەراورد دەکرێن و چەند جار بەدواداچوونی بۆ دەکرێت بۆ زانینی: ١) ڕێژەی مووی گەشەکەر بۆ مووی پشوودەر، ٢) تێکرایی گەشەی موو.

د) **پەنجەرەی موو** Hair window: وەك خاڵی (ج) وایە، بەڵام نەخۆش لە ٣-٣٠ رۆژدا دێتەوە و هەر بە چاو (سەیرکردن)بارەکە هەڵدەسەنگێنرێت.

٢- **نموونەوەرگرتن** Biopsy

هەندێك جار نموونە وەرگرتن زالیاریمان دەداتێ بۆ نموونە:

أ) ڕێژەی مووی گەشەکەر بۆ مووی پشوودەر anagen to telogen ratio.

ب) دەستنیشانکردنی نەخۆشی و توانای گەشەکردنەوەی مووە ناساغەکە.

ج) بەتایبەتی بۆ هەڵسەنگاندنی رووتانەوەی کۆنێتی (کۆنینە <u>cicatricial</u> <u>alopecia</u> بەکەڵکە.

٣- **هەڵسەنگاندنی قەدی موو** Hair shaft evaluation

١) ئەو موانەی بە موورِا کێشان دەرهێنراون لەسەر سلایدێك دادەنرێن و دڵۆپەیەك لە مژادی سیانۆئەکریلیك cyanoacrylic glue ی لەسەر رۆدەکرێت و داپۆشەری cover slip لەسەر دادەنرێت و بە وردبین دەپشکنرێت بۆ زانینی: أ) مووی گەشەکەر و پشوودەر، ب)نەخۆشیەکانی قەدی موو ج) کەرووی پێستی سەر و موو.

٢) پشکنین بە ئەلەکترۆنە وردبین scanning E.M. و پشکنینی بینینی جەمسەری polariscopic examination چەند نەخۆشیەك دیار دەکرێت.

٣) شیکردنەوەی ترشە ئەمینەکان و ئێلێکترۆفۆرێسسelectrophoresis.

## موو هەڵوەرین( رووتانەوەی موو ) Hair loss

ئەمانەی خوارەوەن:

**رووتانەوەی مووی بڵاو (گشتی)** Diffuse (global) hair loss

١) **وەستانی سەلک دروستبوون** Failure of follicle production: وەك:

١- نەبوونی زگماکی مووی گشتی Congenital universal atrichia.

٢- نەبوونی موو لەگەڵ بوونی تەنۆچکە Atrichia with papular lesions.

٣- ئێسکە نەرمەی بۆماوەیی بۆ ڤیتامین D بێ وەڵام.Hereditory vitamin D-resistent rickets.

٢) **ناناسایی قەدی موو** Hair shaft abnormalities: سێ جۆرن:

I- **مووشکان** Hair breakage: وەك:

١) **گرێیە مووشکان** (.Trichorrhexis nodosa (T.N:

باوترین جۆری شکانی مووە . لە مووی ئاسایی دا روودەدات کە لاواز کرابێت بە زەبری میکانیکی (وەك زێدە دەستکاریکردن و شانەکردن و لوولکردن و راستکردنەوە و ئوتوکردن و – تاد) یان زەبری کیمیکی (رەنگکردن و مێشکردن و – تاد). (وێنەی ٢٠٤)



(وێنەی ٢٠٤ ) گرێیە مووشکان.

بەڵام پتر لــە مـووی لاوازی بۆمـاوەیی دا روودەدات، لــە ژێـر وردبـین دا پێسـتۆکە cuticle دەشکێت و بەمەش ریشاڵەکانی توێکڵ cortex جیادەبنەوە و ئاوسـانێکی گرێیی دروست دەبێت، پاشان ریشاڵەکان دەشکێن و قەدی موو بە شێوەی فڵچـەی بۆیە یان پەڕەی پانکە دەردەکەوێت، ٢ جۆر هەیە:

أ) زگماکی Congenital T.N.: لە کـاتی لــەدایکبوون دا یـان چـەند مـانگی یەکـەمی ژیـان دا دەردەکـەوێت، ناسـاغیەکە بـە تـەنیا یـان لەگـەڵ شـێواوی زیندەچالاکی تردا هەیە، بۆ نموونـە نەخۆشـی ئەرجینۆسەکسـینیك ئەسـید یۆریـا argino succinic aciduria - تاد.

ب) وەرگیراو (دەسـتکەوت) Acquired: گرێیـەکان لــە خـوارەوە یـان سـەرەوەی (کۆتایی) مووەکان دەردەکـەون. ئـەم گرێیانـە لەسـەر مووەکـە لــە یـەك تـا چـەند دانەیەکن، پتر لـە مووی سەر بەڵام لەوانەیە لە مووی ژێـر بـاڵ و بـەر و سـنگ دا هەبن.

٢) پانیە مووشکان Trichoschisis: بە پانی موو دەشکێت (قەدی مـوو شـکاوە) لــەو شـوێنە دا کـە پێسـتۆکەی تێـدا نـەماوە بـەهۆی کـەمی گـۆگردی مـوو لــە نەخۆشـی گۆگردەبەدگەشـــەموو trichothiodystrophy دا و لێـرە دا مـووی سـەر و بـرۆ و برژانگ کورت و ناسکن، ترشـی ئـەمینی سسـتین cytstine لـــە مووەکان دا نیوەی ئاستی ئاسـاییە و بە پشکنینی بینینـی جەمسـەری polariscopic examination مـووە نائاسـاییەکان پـەتی bands روون و تـاریکی دوایـەدوای تێدایـە. هەندێك لـەم نەخۆشانە بە خۆر هەستیارن لـە بەر ئـەوە ئامۆژگاری دەکرێن خۆیان لـە خـۆر بپـارێزن. (وێنـەی ٢٠٥)





(وێنەی ٢٠٥)
پانیە مووشکان (گۆگردە بەدگەشەموو)



(وێنەی ٢٠٦) پێچخواردووە موو.

٣) پێچخواردووە موو Pili torti: مووەکان کورت و ناسکن، بە وردبین قەدی موو پانبووەوە و پێچـخواردووی نارێـك و پێکـە (٩٠-٣٦٠ پلە پێچی خواردووە)، لە مووی سەری ئاسایی رەش پێست و مـووی ژێـر بـاڵ و بـەر دا

پێچخواردنی موو ڕێك و پێكه. نەخۆش موو ڕووتانەوەی پارچەیی لەگەڵ بوونی مووی زبر و شکاو دا هەیە، دوای باڵقبوون بەرەو باشی دەچێت. (وێنەی ٢٠٦)

٤) بەناوداچوونە مووشکان Trichorrhexis invaginata (bamboo hair):
ئەم ناساغیە بە تەنیا یان لەگەڵ جۆرەکانی تری موو شکان دا هەیە، بەشی سەرەوەی قەدی موو کە ڕەق و پتەوە دەچێتە ناو بەشی خوارەوەی کە نەرمە چونکە ئەم بەشەی خوارەوە باش قژچەکاژی تێدا دروست نەبووە، مووەکە وەك تۆپ لە ناو چاڵ دا وایە ball and socket و ئەگەر مووەکە شکا وەك گۆچانی گۆڵف وایە. (وێنەی ٢٠٧)


(وێنەی ٢٠٧) بەناوداچوونە مووشکان.

کۆنیشانەی نیزەرتۆن Netherton's syndrome بریتییە لە مووی کورت و ناسك لە پێستی سەر بە هۆی مووی گۆچانی + بوونی جێگۆڕاو atopic diathesis + نەخۆشی ماسی.




(وێنەی ٢٠٨) گرێیاویە موو.

٥) گرێیاویەموو Monilithrix: بۆماوەیی لەشی زاڵە، بازدانی جینی بۆ کیراتینی II لەسەر کرۆمۆسۆمی $12q_{13}$ یە، لەوانەیە لە منالی دا تا تەمەنی هەرزەکاری بەشێوەی ڕووتانەوەی جێگەیی (= جێیی) local یان بڵاو diffuse دەربکەوێت، مووەکان زۆر کورت و ناسکن و کە لە پێست دێنەدەر بە تەنۆچکە قژچەکاژی دەوردراون، ڕووتانەوەی موو پتر لە پشتی سەردایە و لەگەڵ تەمەن دا باشتر دەبێت. (وێنەی ٢٠٨)
چارەسەر: ڕێتینۆیدەکان یان شلەی مینۆکسیدیل.


(وێنەی ٢٠٩) مووی ناڕێسایی.

II– مووی ناڕێسایی (هەڵوەشاوەموو) Unruly hair: واتا مووی بە ئەرك و یاخی بۆ چاککردن، ئەمانەن: (وێنەی ٢٠٩)

١) كۆنیشانەی مووی شانە-نەکەر (یاخیبیەموو) Uncombable hair syndrome

بۆماوەیی لەشی زاڵ و بەزیوە، هەندێك جار جیاجیایە sporadic، لەوانەیە لە ساوایەوە تا باڵقبوون دەربکەوێت، لە ژێر وردبین دا قلیشی درێژی longitudinal groove تێدایە و لە بڕگەی پانی دا سێگۆشەیە. مووەکان گەشەسست و کاڵ و زیوی و ناسکن (وەك شووشەی تێکشکاون) و بە هێڵێکی راست لە پێستی سەر بەرزبوونەتەوە و بە شانە دانایەن (زۆر رەقن).

٢) خوریە موو Wooly hair

بۆماوەیی لەشی زاڵ و بەزیوە یان بەشێکە لە کۆنیشانەی تر یان لەسەر نیشانە (نیشانەی خوریەموو) wooly hair nevus دەردەچێت، لە ژێر وردبین دا قەد هێلکەیی و بچووك و پێچخواردووە بە دەوری باری درێژیدا و گرێیاویە و پەتی کاڵ و تاریکی دوابەدوای تێدایە (وێنەی ٢١٠).


(وێنەی ٢١٠) خوریەموو.

لە تەمەنی ساوایی تا منداڵی دا دەردەکەوێت، مووەکان باریکن و قژ بە شانە دانایەت و لە ١٢ سم درێژتر نابێت، بە گوورزەیی (چەپکەیی) یەك دەگرێت. لە تەمەنی پێگەیشتوودا باشتر دەبێت. گەرچی قژی رەشپێستئاسا خوریە، بەڵام ئەم نەخۆشیە لە سپی پێست دایە.

III- نائاسایی تری قەدی موو: وەك:

١- بازنەموو (مووی دەوری) Pili annulati: بۆماوەیی لەشی زاڵە، بە تێروانین و لە ژێر وردبین دا مووەکان پارچەی (پەتی) دوابەدوای یەك دای روون و تاریکی تێدایە چونکە توێکڵی



(وێنەی ٢١١) بازنەموو.

موو cortex بۆشایی پڕ لـه هـەوای air filled spaces تێدایـه. مـوو نارووتێـتەوە. (وێنەی ٢١١)

٢- گەندە بازنە مـوو Pseudo pili annulati: وەك یەكـەم وایـە، بـەڵام لێـرەدا رووی مووەكان پێچدەخۆن و پان دەبنەوە و دەبنە هۆی تیشك دانـەوە، ئەمـەش پارچـە روونەكـە دروست دەكات و جۆرێكە لە مووی ئاسایی.

٣) ناناسایی سووڕی موو (مووفڕێدان) Abnormality of cycling (shedding)

ئەمانەی خوارەوەن:

١- بەلێشاو پشوو Telogen effluvium

واتا رووتانەوەی مووی پشوودەر بە لێشاو [effluviumn = a flowing out] و بریتییە لە پتربوونی رێژەی مووی پشوودەر بە كتوپڕی و كاتی و كەم جار بە درێژخایەنی، واتا رێژەی مووی گەشەكەر بۆ مووی پشوودەر كەم دەبێتەوە. (وێنەی ٢١٢)


(وێنەی ٢١٢) بەلێشاو پشوو.

بە ئەزموونی مـوو ڕاكێشـان hair pull test كە لە باری ئاسـایی دا ٣-٥ مـووە، ژمارەی مووی بەدەستەوەهاتوو لە ٥ مـوو پـترە. رۆژی ٥٠-١٥٠ مـوو لـە بـاری ئاسایی دا "لە قژی سـەر" فـڕێ دەدرێـت، بەڵام لەم نەخۆشیەدا لەوانەیە سەدان مـوو لە یـەك رۆژدا فـڕێ بـدرێن، مـاوەی ئـەم رووتانەوەیە چەند رۆژ یان چەند حەفتە یان چـەند مانگێكـە و كـەم جـار (بـەپێی هۆكارەكان) زۆر درێژخایەنە.

لە سەرەتادا كۆمەڵێك مووی گەشەكەر پێش وەخت دەچنە قۆناغی پشـوودان كـە ٣-٤ مانگ دەخایەنێت، پاشان دەچنەوە قۆناغی گەشەكردن، كە هۆكارەكەی لاچوو دوای ئەم چەند مانگە ژمارەی مووی پشوودەر ئاسایی دەبێتەوە و رووتانـەوە نائاسـاییەكە نامێنێـت، بەڵام دوای ٦-١٢ مانگ چڕی قژ ئاسایی دەبێتەوە. هەندێك جار هۆكارەكە دیار نییـە و پشوودانی مووی بە لێشاوی درێژخایەن روودەدات. پتر لە رێژەی ٥٠٪ی قژی سەر لەم نەخۆشیەدا نارووتێتەوە.

مووی پشوودەری رووتاوە لە رەگەوە دەردێت و سەلكی مووەكە بێ رەنگ و بەرگە.

**هۆکارەکان:**

١- نەخۆشی کاژی و تەنۆچکەیی پێستی سەر papulo-squamous diseases. **پشوودانی بەلێشاوی بڵاو یان پارچەیی دروست دەکات.**

٢- قژ رووتانەوەی شێوازی pattern alopecia – (androgenic alopecia) **قۆناغی گەشەکردن کورت دەبێتەوە بەمەش ژمارەی مووی پشوودەر بە درێژخایەنی پتر دەبێت.**

٣- تێکچوونی هۆرمۆنی: **وەك فرەچالاکی و کەم چالاکی ملەقۆرتەگلاند، دوای منالبوون، کاتی وە دوای لێچوونەوە.**

٤- بەدخۆراکی: **وەك کەمی بایۆتین، بەدخۆراکی، کێش دابەزاندن، کەمی ترشە چەوری‌بنەڕەتیەکان، کەمی ئاسن لە خوێن دا و کەمی پرۆتین و زنك.**

٥- دەرمان: **وەك دژەخوێن مەیینەکان، دژە شێرپەنجە، بەربەستی B (بێتاوەستێن)، ئینتەرفیرۆن، لیثیوم، خەپلەی نەزۆکاندن، ریتینۆیدەکان، زێدەڤیتامین A، برۆمۆکریپتین، کاربامازیپاین، سیمیتیدین، ئەمفیتامین، دانازۆڵ، کاپتۆپریل، لیڤۆدۆپا، پایریدۆستیگمین، ترایمیثادۆن‌و هی تریش.**

٦- فشاری فیزیکی: **وەك کەم خوێنی، نەشتەرگەری، ناساغی کۆئەندامی وەك گرانەتا، تای ماڵتا، تای تر (مەلاریا، پەتا – تاد)، سستی گورچیلە و جگەر، شێرپەنجە – تاد.**

٧- دەروونی.

**هەندێك نەخۆش لەگەڵ قژرووتانەوەدا پێستی سەریان دەکزێتەوە یان دێشێت. پشکنینی تاقیگە بە پێی باری نەخۆشیەکە و نیشانەکانی ئەنجام دەدرێت.**

**چارەسەر**

**هۆکارەکەی لادەبرێت و لە ٣-٥ مانگ دا قژ دیسان بۆ دۆخی جاران دەگەڕێتەوە، دەرمانی شلەی مینۆکسیدیل بۆ چەند مانگێك بەکەڵکە.**



**(وێنەی ٢١٣) کۆنیشانەی خاوەگەشە.**

٢- **بەلێشاو گەشە** Anagen effluvium

**واتا رووتانەوەی مووی گەشەکەر بەلێشاو، لە ئەنجامی شکانی قەدی موو روودەدات، چونکە سووڕی موو لە قۆناغی گەشەکردن دا سست بووە یان تێکچووە،** هۆکارەکان:

١) **چارەسەر بە ئێکسبەرداری قووڵ (بۆ سەر)، چارەسەری کیمیکی بە دەرمان وەك: دۆکسۆرۆبیسین، نایترۆز یوریاکان، سایکلۆفۆسفئەماید – تاد.**

٢) ژەهراوی بوون: بۆ نموونە جیوە، ترشی یۆریك، ثالیۆم، کۆلچیسین، هەندێك درەخت، 1NHو بۆرۆن.

٣) بەدخۆراکی پرۆتینی توند. ٤- سفلس (فەرەنگی) و دەردە ڕێوی.

٥- کۆنیشانەی خاوەگەشە loose anagen syndrome: (وێنەی ٢١٣) کە تێیدا مووی سەر بە ئاسانی بە هەڵکێشان دەردێن و پتر لە کچی سپی پێست دا هەیە و لەگەڵ تەمەن دا باشتر دەبن، مووەکان لە ڕەگەوە (نەك بە شکاوی لە رووی پێست) دەردەهێنرێن.

چارەسەر: بە ئەسپایی مامەڵە لەگەڵ قژی سەر بکرێت.

٣- دەردە ڕێوی (= تولەك) [A.A.] alopecia areata

بریتییە لە رووتانەوەی مووی کتوپڕ و تەواو لە یەك یان پتر پارچەی خڕ یان هێلکەیی قژی سەر یان مووی ریش، سمێڵ، برۆ، برژانگ، یان (کەمتر) مووی لەش. زۆربەی پارچە رووتاوەکان ١-٥ سەنتیمەترن و لەوانەیە چەند موویەکی تێدا مابێتەوە، مووی خۆڵەمێشی درەنگتر دەرووتێتەوە، بەڵام مووی سپی بە دەگمەن دەرووتێتەوە. کتوپڕ سپی بوونی مووی هەموو لەش، لەوانەیە دەردەڕێوی سەرجەمی (هەموو لەش) بێت لە یەکێکدا کە مووی ماش و برنج بووە (مووە رەشەکان رووتاونەتەوە و سپیەکان جێماون). (وێنەی ٢١٤)





(وێنەی ٢١٤) تولەك.

لە ١٠٪ی نەخۆشەکان دا (بە تایبەتی لە باری درێژخایەن دا کە زۆربەی لەشی گرتبێتەوە) نینۆکەکان چاڵی هاوشێوەیی و ڕێك وپێکی تێدا دەردەکەون و کەم جاریش پلێت زبربوون، نینۆك فرێدان و مانگیلەی سوور یان خاڵاوی دەبینرێن.

٠,٢٪ی خەڵکی لەیەك کات دا ئەم نەخۆشیەیان هەیە و ١,٧٪ی خەڵکی لە ژیان دا تووشی دەبن.

جۆرەکانی دەردە ڕێوی: چوار جۆرە:

١- دەردە ڕێوی جێیی A.A. localis: بریتییە لە بوونی یەك یان چەند پارچەیەك (پەڵەیەك).

٢- دەردە ڕێوی سەرتاپایی (هەموویی) A.A. totalis: مووی هەموو سەر رووتاوەتەوە.

٣- دەردە ڕێوی سەرجەمی A.A. universalis: مووی هەموو لەش رووتاوەتەوە.

٤-دەردەڕێوی چێوەی سەر Ophiasis: مووی چواردەوری خوارەوەی پێستی سەر رووتاوەتەوە. پێستی سەر لە دەردەڕێویدا ئاساییە، لە پارچە رووتاوەکەدا مووی گەشەکەر بە کتوپڕی پێش وەخت دەچێتە قۆناغی پشوودان و هەڵدەوەرێت، لە لێواری پارچەی رووتاوەدا چەند موویەك وەك نیشانەی سەرسوڕمان (علامە التعجب) exclamation point hairs دەبینرێن کە کورتن و بەشی سەرەوەیان رەش و ئەستوورە و بەشی خوارەوەیان (نزیك پێست) باریك و بێ رەنگە. ئەم نیشانەیە چالاکی نەخۆشیەکە دەنوێنێت. (وێنەی ٢١٥)



(وێنەی ٢١٥) تولەکی چێوەی سەر

هۆکارەکان: نەزانراون، بەڵام لەوە دەچێت کە جۆرێك بێت لە ناساغی بەرگری دژە خۆیی autoimmune disease و هەندێك جار نەخۆشی تری بەرگری دژە خۆیی لەگەڵدایە وەك بەڵەکی، نەخۆشی ملەقۆرتە گلاند، بیرۆی جێگۆڕاو، کۆنیشانەی داون، گورگەسوورەی کۆئەندامی .S.L.E، نەخۆشی شەکرە – تاد.

هەندێك جار بۆماوەییە و رێژەی ٢٥٪ی نەخۆشەکان خێزانین و لە باری تەمەنی منالی و دەردەڕێوی بەربلاو خێزانی دا HLA جۆری DR4 و DQ7 لە نەخۆشەکان دا باوترە.

زۆربەی نەخۆشەکان لە چەند مانگێك دا لەخۆوە چاکدەبنەوە ، بەڵام دووبارەبوونەوەش زۆر باوە، نیشانەکانی توندی نەخۆشیەکە بریتین لە بوونی بیرۆی جێگۆڕاو، منالی، باری بڵاوبووەوە، جۆری چێوەی سەر، مانەوەی نەخۆشیەکە پتر لە پێنج ساڵ و نینۆك گرتنەوە.

**چارەسەر**

١- لەخۆوە چاکبوونەوە زۆر باوە، لەبەر ئەوە دەکرێت بێ چارەسەر جێبهێڵرێت.

٢- روونکردنەوەی نەخۆشیەکە و رەچاوکردنی باری دەروونی گرنگن.

٣- بۆ پارچەی بچووك یان شوێنی زۆر بەرچاو ستیرۆید بە تێچزاندن intralesional steroids وەك ترایئەمسینۆلۆن ئەسیتۆناید ٢,٥-١٠ ملگم/میللیلیتر بە بڕی ٠,٠٥-٠,١ مل بۆ ١سم٢ بۆ ناو پێست یان نێوان بن توێژ و ژێر پێست مانگی یەك جار بۆ چەند جارێك چارەسەرێکی خێرایە.

٤- بەرگریەچارەی جێیی topical immunotherapy: بۆ دروستکردنی هەستیاری لێککەوتن. لێککەوتە هەستیارکەرەکان ئەمانەن:

أ) داینایترۆکلۆرۆبەنزین DNCB (زۆر کەم بەکاردەهێنرێت، چونکە لەوانەیە شێرپەنجە دروست بکات)

ب) سکواریك ئەسید دایبیوتایل ئیستەر SADBE، کەم بەکاردەهێنرێت.

ج) سەلفاتی نیکل ١,٠-١٪ لە ناو ڤازیلین دا.

د) دایفێنسیپرۆن diphencyprone - زۆر بەکاردەهێنرێت و باشترینیانە: ٢٪ شلە لەسەرەتادا بەکاردەهێنرێت (بۆ ٢-٤ سم٢) تا سووردەبێتەوە، پاشان چڕی کەمتر ٠,٠٠١-٠,١٪ حەفتەی یەك جار.

٥- ستیرۆیدی جێیی بەهێز وەك کلۆبێتازۆل، هەندێك جار لە ژێر بەستن دا under occlusion.

٦- شلەی مینۆکسیدیل minoxidil ١-٥٪ بە تەنیا یان لەگەڵ ستیرۆیدی جێیی.

٧- پۆڤا، سیستمی یان جێیی (شلەی میثۆکسالین لەگەڵ UVA).

٨- ئەنثرالین، ڕێتینۆیك ئەسید یان فینۆڵ بۆ دروستکردنی پێستەسۆی ورووژێن.

٩- ستیرۆیدی سیستمی بۆ کاتێکی کورت (چەند مانگێك بۆ باری درێژخایەن و بڵاوبووەوە).

١٠- سایکلۆسپۆرین بە دەم و بە شلە( جێیی).

١١- نایترۆجین موستارد nitrogen mustard ٠,٢ ملگم/مل ڕۆژی یەك جار بۆ ٤-٨ حەفتە.

١٢- تەزینەچارە بە نایترۆجینی شل ١٣-لەیزەری ئێگزایمەر excimer.

١٣- ئاوی پیاز onion juice.

## مۆڵگە رووتانەوەی موو Focal hair loss

I- جۆری بێ جێزام Non-scarring: ئەمانەی خوارەوەن:

١) کەمی موو دروستبوون Production decline: ئەمەش دوو جۆرە:

أ- رووتانەوەی سێگۆشەیی (لاجانگی Triangular alopecia (temporal alopecia:

لە منالی دا دەردەکەوێت (کەمتر زگماکییە)، بە شێوەی مۆڵگەیی بەتایبەتی لە هەردوو لاجانگەکان دا روودەدات و هەمیشەییە، لەوانەیە چەند گەندە موویە هەبێت.(وێنەی ٢١٦)



(وێنەی ٢١٦) رووتانەوەی لاجانگی.

ب- موو رووتانەوەی شێوازی Pattern hair loss: جاران پێی دەوترا مووڕووتانەوەی شێوازی نێرینە Male

androgenic alopecia یان مووڕوتانەوەی ئەنـدرۆجینی pattern hair loos.
ئەم جۆرە (ئەسڵەعی) لە هەر کاتێك دوای باڵقبوون دەست پێدەکات (لە هـەرزەکاری یان بیسـت و سـییەکان). لـە سـەرەتادا لـە تەوقەسـەر vertex و ناوچـەوانولاجانی frontoparietal و سەرووی ناوچـەوان " واتـا هەڵکشـانی هێڵـی مـووی پێشـەوە" دەردەکەوێت و ناوچەوان بەرزتر دەبێت و گۆشـەی پرۆفیسـۆر professor angles دیار دەکەوێت و پاشان هەموو تەوقەسەر بێ موو دەبێت، ئەم شـێوازە بـۆ حـەوت پلـە (۱-۷) بە پێی رووبەر و شێوەی رووتانەوەکە دابەشکراوە. موەکـان باریـك و زەرد و کورت دەبنەوە و لەگەڵ کات دا بەرەو نەمان دەڕۆن و پێستی سـەر لـە بـاری ئاسـایی چەورترە. بەشی پشتی سەر occipt و دیواری parietal ناگرێتەوە. سێ هۆکار رۆڵی تێدا دەبینن:

١- بۆماوەیی (بۆماوەیی لەشی زاڵ)
٢- هۆرمۆنی نێرینە androgen بە تایبەتی دایهایدرۆتێستۆستیرۆن.
٣- شوێنی سەر.

لە مێینەدا ئەم جۆرە،بە شێوەی بڵاو، لە ناوەڕاستی سەر دواتر بـۆ پێشـەوە روودەدات، هێڵـی پێشـی قـژی سـەر ناگرێتـەوە، بـە شێوەی هێڵی ناوەڕاسـت لـە پێشـەوە بـۆ تـەوقی سـەر زۆر بـاوە، هـەروەك نێرینـە کەمبوونەوەی چڕی موو، باریکبوونـەوەی قەدی موو و کەمبوونەوەی رێژەی مـووی گەشەکەر و پتر بـوونی مـووی پشـوودەر روودەدات. (وێنەی ٢١٧)



(وێنەی ٢١٧) مووڕووتـانەوەی شێوازی (مێینە).

لە مێینەدا ئاستی ئەنزیمی پێنج ئەلفا ریدەکتەیس 5∝ reductase لە ئاسایی بەرزترە و وەرگری ئەندرۆجینیشیان لە سەلکەمووەکانی پێشی سەر بـە بـەراورد لەگـەڵ سـەلکی پشتی سەر پترە.

**چارەسەر**

١-شلەی مینۆکسیدیل (٥٪ بۆ نێرینە و ٢٪ بۆ مێینە) رۆژی ٢ جـار بـۆ سـاڵێك یـان چـەند سـاڵ پرۆسـەکە دەوەسـتێنێت و رێـژەی ٢٠-٢٥٪یـان مـووی نوێـیان لێ دەڕوێتەوە، دوای ٤-٦ مانگ کاریگەریەکەی دەردەکەوێت.

٢-فینەسـترايد finasteride ١ ملگـم/رۆژ بـۆ نێرینـە (دژی ئـەنزیمی پێـنج ئەلفاریدەکتەیسە) بۆ ١-٢ ساڵ. ٥٠-٦٦٪یان مووی نوێیـان لێ دەڕوێتـەوە. بـۆ مێینە کە نابێت سکپڕ بێت بەکاردێت.

٣- بۆ مێینە سپایرۆنۆلاکتۆن ١٠٠ ملگـم/رۆژ، فلوتەمایـد flutamide (٢٥٠-٥٠٠ ملگم) × (٢-٣) یان سـیپرۆتیرۆن ئەسـیتەیت cyproterone acetate (CPA) ١٠٠ ملگم لە رۆژی ٥-١٥ لەگەڵ ئـەثینیـل ئیسـترادیۆل ethinyl oestradiol ٥٠ مایکرۆگرام لـە رۆژی ٥-٢٥ ی سووڕی مانگانەدا یـان ٢ ملگـم CPA + ٣٥ مایکرۆگم ئەثینیل ئیسترادیۆل ethinyl oestradiol بە خەپلەی نەزۆکانـدن لـە رۆژی ٥-٢٥ی خولی مانگانەدا.

٤-نەشـتەرگەری مووڕوواندنـەوە، بەتایبـەتی متوربـەی بچـووك minigraft و گچـکە micrograft بە تێکەڵی زۆر بە کەڵکە و سەرکەوتووە.

٢) شکانی موو Hair breakage: ئەمانەن:

أ- خـووی موودەرهێنـان = شـێتی مووهەڵکێشـان Trichotillomania: بریتییـە لـە هەڵکێشانی موو لـە قژی سەر، برۆ یان برژانگ و پارچەی نارێك و پێکی رووتـاوە کـە مـووی کورت و درێژی تێدایە . پێستی سەر بـە هـۆی شکاندنی هەندێك لە مووەکان" لەسـەر رووی پێست" زبرە، پتر لـە کچی تەمەن ژێر ١٠ ساڵی دا هەیە، هەرچەندە هەموو تەمەنێك لە نێرینە و مێینـە ئـەم دیاردەیـەی تێـدا بـەدی دەکرێـت. (وێنەی ٢١٨)


(وێنەی ٢١٨) خووی موودەرهێنان.

چارەسەر: ١) چارەسەری دەروونی. ٢) کلۆمیپرامین.

ب- مووڕووتانەوەی راکێشان Traction alopecia: لە ئەنجامی فشاری درێژخایەن لەسەر مـوو روودەدات وەك توندبەسـتنی قـژ بـە راکێشانەوە، راکێشانی موو بۆ راستکردنەوەی لە شەپۆل لوولدانی موو (نیگرۆکـردن) یـان خووی چەماندنەوەی موو بە پەنجە، پتر لێواری قـژی سـەر بەتایبـەتی لاجـانگ و سـەرووی گوێچکە دەگرێتەوە، ئەگەر درێژخایـەن بـوو مووەکان نارڕوێنەوە. (وێنەی ٢١٩)


(وێنەی ٢١٩) مووڕووتانەوەی راکێشان.

ج- **کەڕووی سەر** Tinea capitis: بەتایبەتی لە منداڵ دا زۆر باوە، مووڕووتانەوە یان مووشکان ڕوودەدات و پێستی سەر وەك چەورە بیرۆ یان خاڵی ڕەش black dot یان کەچەڵی kerion دەردەکەوێت (دواتر باسی لێدەکەین). (وێنەی ٢٢٠)



**(وێنەی ٢٢٠) کەڕووی سەر.**

د- **ناساغی قەدی مووی جێگەیی سەرەتایی یان دەستکەوتە:**
Primary or acquired localized hair shaft abnormalities
وەك شکالی مووی گرێی جێگەیی دەستکەوت بەهۆی دووبارەبوونەوەی سڕینی پێستی سەر یان خوراندن لە L.S.C یان خووی موو هەڵکێشان یان بە هۆی زەبری کیمیکی یان گەرمی (ئوتووکردن) بۆ لوولکردنی قژ.

٣) **مووی نارێسایی** Unruly hair: وەك:

أ- **نیشانەی خوریەموو** Wooly hair nevus: پتر لە ٢ ساڵی یەکەمی ژیان دا دەردەوکەوێت بەڵام لەوانەیە تا کۆتایی تەمەنی هەرزەکاریش دەربچێت، بۆماوەیی نییە، رێژەی ٥٠٪ی بارەکان نیشانەی تۆخ، بالوکەیی یان توێژی لەگەڵدایە، لەوانەیە ناساغی چاویش هەبێت، لەگەڵ تەمەن دا باشتر دەبێت. پارچەیەکی سنووردار لە پێستی سەر مووەکانی وەك خوری وان (مووی کاڵتر و لوولتر).



**(وێنەی ٢٢١) مووڕووتانەوەی مۆرانەخواردووی فەرەنگی.**

ب- **چەمینەوەی پەرەسێنی دەستکەوتە** Acquired progressive kinking: پتر لە مووڕووتانەوەی شێوازی دا هەیە، چەمینەوە و تاریکتربوونی مووی پێش و لاجان و سەرووی گوێچکە و هەندێك جار تەوقی سەر ڕوودەدات.

٤) ناناسایی سووڕی موو: وەك:

أ) دەردە ڕێوی.

ب) سفلس (فەرەنگی) Syphilis: بە شێوەی تەنکبوونی گشتی قژ یان ڕووتانەوەی مۆرانە خواردوو moth-eaten دەردەکەوێت. (وێنەی ٢٢١)



**(وێنەی ٢٢٢) مووڕووتانەوەی جێ زامی (نەخۆشی گورگەسوورەی پێستی درێژخایەن)**

٥) ناساغی پێستی سەر و مۆڵکە ڕووتانەوە: وەك نەخۆشی شێرپەنجەی پێستی سەر، سەدەفی تیژ - تاد.

II- **جۆری جێ زامی Scarring alopecia**: بریتییە لە رووتانەوەی هەمیشەیی مۆڵگەیی یان جێگەیی بەهۆی لەناوچوونی بەردەوامی سەلکەمووەکان و بەچەقبوونیان. کونی سەلکەکان نامێنن. ٢ جۆرە:

أ) **جۆری سەرەتایی Primary S.A.**: بەپێی جۆری خانەی باو لە نموونە وەرگرتن دا بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١- **باوی لیمفەخانە Lymphocytic**: وەك :

١) گورگەسوورەی پێستی درێژخایەن **(وێنەی ٢٢٢)**.Chronic cutaneous L.E،

٢) پانەپێستەستوورێی سەلکی موو Lichen planopilaris. **(وێنەی ٢٢٣)**



**(وێنەی ٢٢٣) پانە پێستەستوورێی سەلکی**

٣) گەندەکەچەڵی Pseudopelade: **ئەم گەندەکەچەڵیە بریتییە لە رووتانەوەی موو کە پێستەکەی پەمەیی یان رەنگ گۆشتیە و نارێك و پێکە، چەند پارچەیەك لەمانە دەکشێن و پارچەی گەورەتر دروست دەکەن، هۆکاری نەزانراوە. (وێنەی ٢٢٤)**



**(وێنەی ٢٢٤) گەندەکەچەڵی.**

٤) رووتانەوەی شانەی گەرم Hot comb alopecia: **لە تەوقی سەر بە بەکارهێنانی شانەی گەرم (ئوتوکردن) دەست پێدەکات و بۆ دەوری تەوقی سەر بڵاودەبێتەوە. (وێنەی ٢٢٥)**



**(وێنەی ٢٢٥) رووتانەوەی شانەی گەرم (رووتانەوەی جێ زامی ناوەندی).**

٥) چڵەمینە رووتانەوە Alopecia mucinosa: **بە گشتی بە شێوەی قوتکەی سوور یان پارچەی پانبووەوەی بێ موو لە پێستی سەر و دەم وچاو دەردەچێت، بە نموونە وەرگرتن کۆبوونەوەی چلم mucin لە سەلك و رژێنە چەوری و رووپۆشەخانەدا دیارە.**

٦) قۆچەکاژی سەلکی مووڕووتێن Keratosis follicularis decalvans: **بۆماوەیی سێکسییە، پتر لە مێینەدا هەیە، نیشانەکانی بریتین لە زێدە قۆچەکاژی سەلکی، مووڕووتانەوەی جێ زامی، نەمانی برۆ و برژانگ، تیشکەهەستیاری چاو و تێکچوونی پەرگلێنە، لە منداڵیەوە دەست پێدەکات و دواتر باشتر دەبێت.**

**٢- باوی خانەی هاوتاخواز** Neutrophilic:

١) سەلکەسۆی مووڕووتێن Folliculitis decalvans: **بریتییە لە رووتانەوەی سۆیی و دەبێتە هۆی ئاوسانی کێمی و رەقبوونی پێستی سەر لەگەڵ پیزۆکە و داماڵین و قەتماغە و کاژ، بەکتریای ستافیلۆکۆکەسی تێدایە. (وێنەی ٢٢٦)**

**چارەسەر: دژە بەکتریا و ستیرۆیدی سەراپایی و جێیی و ریتینۆدی سەراپایی.**



**(وێنەی ٢٢٦) سەلکەسۆی مووڕووتێن.**

٢) تویکەرە خانەسوی پێستی سەر Dissecting cellulites of the scalp: **باسمانکرد.**



**(وێنەی ٢٢٧) پیزۆکە پێستەسۆی داماڵێن.**

**٣- خانەی تێکەڵ** Mixed:

١) هەزەبیەی گۆشت پارەیی Acne keloidalis: **باسمانکرد.**

٢) هەزەبیەی دارزانیی Acne necrotica: **باسمانکرد.**

٣) پیزۆکە پێستەسوی دامالین Erosive pustolar dermatosis: **بریتییە لە پیزۆکە و داماڵین و قەتماغەکردن لە پێستی سەری مێینەدا و هەر پەرەدەستێنێت. (وێنەی ٢٢٧)**

**چارەسەر: ستیرۆیدی جێیی بەهێز، سەلفای زنك یان ئایزۆترێتینۆین.**

ب) جۆری دووەمی .Secondary S.A: بەشێکە لە کۆنیشانەی تر وەك دەلاندنی رەنگی incontinentia pigmenti یان بە تەنیایە و زگماکییە یان نەبوونی پێستی زگماکییە aplasia cutis congenita کە تێیدا توێژ و هەندێك جار بن توێژ بە شێوەی مۆلگەیی نین (دروست نەبوون) و دوای لە دایکبوون بە شێوەی چاڵەبرین، قەتماغە، جێ زام یان پەردەیەکی تەنك دەردەکەوێت، زۆربەی جار هەر پێستی سەر ئەم ناساغییەی تێدایە، زۆر جار پارچەیەکی خڕی بچووکە بەلام لەوانەیە زۆر گەورەبێت و قووڵ بێت و مووی لێ ناڕوێت. (وێنەی ٢٢٨)



(وێنەی ٢٢٨) نەبوونی پێستی زگماکی.

## تووکنی – موو زۆربوون (فرەموویی) Excess hair

دوو جۆرە:

١- تووکنی سێکسی Hirsutism

بریتییە لە فرە گەشەکردنی مووی زبر [coarse = terminal hair] لە مێینەدا بە شێوازی نێرینە لە سمێڵ، روومەت، چەناگە، ناوەڕاستی سنگ، مەمك، خوارەوەی سك و لاموسەلان groin دا یان لە هەندێك لەم شوێنانەدا. ئەم فرەموویییە هەندێك جار نیشانەی تری لەگەڵدایە وەك مووڕووتانەوەی لاجانی temporal balding، ماسولکە زلبوون، دەنگ گڕی، میتکە زلبوون و بێ خوێنی amenorrhoea و هەندێك جار زیپکەی عازەبە، ئەمانەش نیشانەی فرەهۆرمۆنی نێرینەن hyperandrogenism.

چۆنیەتی دروستبوونی و هۆکارەکانی:

سەرچاوەی ئەندرۆجین لە مێینەدا رژێنی ئەدرینال (سەر گورچیلە گلاند) و هێلکەدانە، ٢-٣ ساڵ پێش تەمەنی تێکەوتن menarche یەکەمین نیشانەی دروستبوونی ئەندرۆجین (هۆرمۆنی

نێرینە) دەردەکەوێت، هەژێنی ئەم زوودروستبوونە لە سەر گورچیلەگلاند نەزانراوە. ئەندرۆجینە سەرەکییەکان کە رژێنی ئەدرینال دروستیان دەکات بریتین لە:

١) ئەندرۆستینیدیون androstenedione ، ٢) دیهایدرۆئیپیئەندرۆستیرۆن DHA (dehydroepiandrosterone) و ٣) سەلفایتی DHA (DHAS). کۆنترۆڵکردنیان دوای باڵقبوون نەزانراوە هەرچەندە یەکەم و دووەمیان لەوانەیە بەهۆی ACTH (هۆرمۆنی هەژێنی کۆرتیزۆڵ) کۆنترۆڵ بکرێن. ئەم هۆرمۆنانە کاریگەریان سست و لاوازە بەڵام گرنگیان لەوەدایە کە بەهۆی ئەنزیمی ١٧ – هایدرۆکسی ستیرۆید دیهایدرۆجینەیز 17-OH steroid-dehydrogenase هەردوو (ئەندرۆستینیدیۆن و DHA ) لە ئەندام کۆتانیشانە (شوێنی کۆتایی سەر ئەندام) end organ site کە سەلکی مووە بۆ ئەندرۆجینی بەهێزتر (وەك تێستۆستیرۆن) دەگۆڕێن.

هێلکەدان دوای باڵقبوون لە، ژێر کۆنترۆڵی هۆرمۆنی هێلکاندن (luteinizing Hormon) L.H.، ئەندرۆجین لە خانەکانی ثیکا theca cells دەردەدات، ئەم هۆرمۆنانە بریتین لە ١) ئەندرۆستینیدیون لە تەمەنی بێ نوێژی دا menstrual life و ٢) هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن دوای لێچوونەوە manapause. دەردانی ئەم دوو هۆرمۆنە بە درێژایی سووری مانگانە بەردەوامە، بەڵام لە ناوەڕاستی سوورەکەدا پترە. لە باری ئاسایی دا رێژەی ٥٠-٧٠٪ی تێستۆستیرۆن سەرچاوەکەی ئەندرۆستینیدیۆنی گۆڕاوە بۆ تێستۆستیرۆن لە پێست و جگەردا، بە شەکەی تری راستەوخۆ لە ڕژێنی ئەدرینال (سەر گورچیلەگلاند) و هێلکەدان دروست دەکرێت (٥-٢٠٪ لە هێلکەدان و ٠-٣٠٪ لە رژێنی ئەدرینال).

DHA سەرچاوەی کەمتر لە رێژەی ١٠٪ی ئەندرۆستینیدیۆن و ١٪ تێستۆستیرۆنە. زۆربەی ئەندرۆجین بە پرۆتین (گلۆبیولینی لکاو بە هۆرمۆنی سێکسی sex hormon binding globulin) SHBG لکاوە ٩٩٪ و تەنیا رێژەی ١٪ی سەربەستە free.

ئەم پرۆتینە گرنگە چونکە کە زۆر بوو (وەك لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی ئیسترۆجین) ئەوە ئەندرۆجینی سەربەست کەمتر دەبێتەوە بەڵام کە ئەندرۆجین پتربوو ئەوە پرۆتینەکە کەمتر دەبێتەوە و ئەندرۆجینی سەربەست پتر دەبێت . ئەم ئەندرۆجینە سەربەستەیە کە بۆ تووکی کاریگەرە.

تێستۆستیرۆن بەهۆی ئەنزیمی پێنج ئەلفارێدەکتەیز 5-∝ reductase بۆ هۆرمۆنی دایهایدرۆتێستۆستیرۆن دەگۆڕێت کە زۆر بەهێزتر و کاریگەرترە بۆ وەرگری ئەندرۆجین androgen receptor. ئەم ئەنزیمە دوو ئاوەڵی ISO هەیە جۆری یەك و جۆری دوو، جۆری (١) لە پێست دا بە تایبەتی لە رژێنە چەوریەکان دا هەیە بەڵام جۆری (٢) لە پەردەی رەگی

مووی دەرەوە outer root sheath و گۆی بن تویـژ dermal papillae دا هەیـە. ئەم جۆرە دووە بۆ ڕووتانەوەی شێوازی و تووکنی سێکسی گرنگە.

**هۆکارەکانی:**

١- ڕەچەڵەك race: **بۆ هەڵسەنگاندنی تووکنی سێکسی ڕەچەڵەك گرنگە ،چونکە زۆر جار، لە باری ئاسایی دا، تووکنیەکی کەم وەك مووی دەموچاو و سك و ران لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، خواروو و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و ئاسیای خوارووی ڕۆژئاوا و لە کوردستانیش دا ئاساییە، ئەمەش پەیوەندی بە کێتییەوە هەیە.**

٢- دەروونی: **ئایا تێکچوونی باری دەروونی دەبێتە هۆی تووکنی سێکسی یان بە پێچەوانەوە، لەوە دەچێت هەردووکیان ڕاست بن.**

٣- هۆ نەزانراو (نەدیار) idiopathic: **ڕێژەیەکی زۆر لە بارەکان هیچ هۆکاری دیاری نییە، لەوانەیە ئەم بارە هۆکەی، پتر لە ئاسایی فرەهەستیاری ئەندام کۆتا نیشانە end organ hypersensitivity بێت( واتا وەرگری ئەندرۆجینی سەلکەموو بۆ ئاستی ئاسایی ئەندرۆجین زۆر هەستیارە) و ئەمەش دەبێتە هۆی فرەگەشەی مووە سێکسیەکان.**

٤- هۆکاری هێلکەدانی ovarian causes: **وەك:**

**١) کۆنیشانەی فرەپۆرگی هێلکەدان** (PCOS) polycystic ovary syndrome: **زۆر باوە، مەرج نییە پۆرگ بۆ تووکنی سێکسی بدۆزرێتەوە بەڵام زۆرجار پۆرگ هە یە و دەبێتە هۆی زۆر نیشانە وەك تووکنی سێکسی، زیپکەی عازەبە، مووڕووتانەوە، قەڵەوی، زۆر بێ نوێژی menorrhagia، کەم بێ نوێژی oligomenorrhoea، بێ خوێنی amenorrhoea، نەزۆکی و دڕکە ڕەشبوون acanthosis nigricans.**

**پشکنین: بەرزبوونەوەی .L.H، ڕێژەی .FS.H.\L.H، تێستۆستیرۆن، ئەندرۆستینیدیۆن و زۆر جار ئیسترادیۆل oestradiol. بە سۆنار زۆر جار فرەپۆرگەکان دەبینرێن.**

**٢) لووی هێلکەدان** ovarian tumors: **نیشانەکان کتوپڕ دەردەکەون ( وەك تووکنی سێکسی) و بەربڵاون، نیشانەی کوڕانی virilization وەك دەنگ گڕبوون – تاد هەن و ئاستی تێستۆستیرۆن بەرزە و پتر لە تەمەنی ٢٠-٤٠ ساڵی دا دەردەکەون.**

٥- هۆکاری ڕژێنی ئەدرینالی adrenal causes: **وەك:**

**١) فرەگەشەی ئەدرینالی زگماکی** "CAH" congenital adrenal hyperplasia **بۆماوەیی لەشی زاڵە، لەئەنجامی کەمبوونی ئەم ئەنزیمانە (٢١-هایدرۆکسیلەیز** 21-hydroxylase**، ١١ب-هایدرۆکسیلەیز** 11B-hydroxylase**و ٣ب-هایدرۆکسی ستیرۆید دیهایدرۆجینەیز** (3B-OH steroid dehydrogenase **ڕوودەدات،**

نیشانەکانی بریتین لـە: دەرکـەوتنی نیشـانەکان لـە منالّیـەوە ، کۆئەنـدامی سێکسـی گەورە، گەشەی لـەشی پێش وەخـت، کـوڕانی virilism. لـەوانەیـە جـۆری تەمـەنی پێگەیشتوو adult onset تووکنی سێکسی لـەگەڵدابێت.

**پشکنین:** ئەم ئەنزیمانەی سـەرەوە دەپشـکنرێن و بـە سـۆنار رێـژەی ٨٠٪ی جـۆری تەمەنی پێگەیشتوو PCOS یان هەیە . ٣-٦٪ی تووکنی سێکسی ئەم جۆرەیان هەیە.

٢) لووی رژێنی ئەدرینال (سەرگورچیلە گلاند) adrenal tumors: وەك پۆشەگمۆڵ adenoma و شێرپەنجە. بوونی کوڕانی لـەگەڵ کۆنیشانەی کوشـینگ cushing's syndrome ئەگەری بوونی شێرپەنجەیە و ئاستی تێستۆستیرۆنی زۆر بەرزە.

٣) کۆنیشانەی کوشینگ cushings syndrome: تووکنی لـەشی و سێکسی تێدایە و ئاستی ئەندرۆجین و کۆرتیزۆڵ بەرزە.

٦- هۆکارەکانی ژێر مێشەگلاند pituitary causes: ئەمانەن:

١) نەخۆشی کوشینگ cushing's disease، ٢) زەبەلاحی acromegaly،

٣) پۆشەگمۆڵی پرۆلاکتین دەردەر prolactin secreting adenomas (P.S.A.).

**تێبینـی:** بەرزبوونـەوەی ئاسـتی پـرۆلاکتین لـەم بارانـە دا روودەدات: PCOS، سسـتی ملەقۆرتەگلاند Hypothyroidism، بەکارهێنانی فینـۆثـایازینـەکان ، سسـتی جگـەر و گورچیلە و P.S.A. (پۆشـەگمۆڵی پـرۆلاکتین دەردەر) prolacting secreting adnomas .

٧- بەکارهێنانی ئەندرۆجینەکان ( واتا هۆکاری دەرمانی ):

**تێبینی:** بەرزبوونەوەی ئاستی پـرۆلاکتین دەبێتـە هـۆی بەرزبوونـەوەی ئاسـتی ئەنـدرۆجینی سەربەست لە ئەدرینال گلاند و کەمبوونەوەی SHBG بەهۆی کەمبوونی ئیسترۆجین دەردان لـە هێلکەدانـەوە. بەرزبوونـەوەی ئاسـتی ئینسـۆلین hyperinsulinaemia دەبێتـە هـۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ئەندرۆجین و کەمبوونەوەی ئیسترۆجین و ناهێلکاندن anovulation و کەم دروستبوونی SHBG لە جگەردا.

٨- قەڵەوی obesity.

**پشکنین:**

١- ئاستی تێستۆستیرۆن.

٢- سۆناری ئەستێلك pelvis بۆ دۆزینەوەی PCOS.

٣- هەندێك جار کۆرتیزۆلی سەربەست free cortisol لە میزدا.

٤- پشکنینی سستکردنی دێکسامیثازۆن dexamethasone suppression test.

٥- ١٧-هایدرۆکسی پرۆجێستیرۆن 17-OH-progesterone.

٦- هەندێك جار .L.H، پرۆلاکتین، – تاد.

چارەسەر

١- ئەگەر هەبوو هۆکارەکەی چارەسەربکە.

٢- لە قەڵەودا کێش دابەزاندن. موو مێشکردن bleaching.

٣- شیکردنەوەی ئەلەتریکی electrolysis، بەڵام کارێکی بە ئەرك و ئازار و وردە و چاڵ دروستکردنی لێ دەکەوێتەوە.

٤- لەیزەر نوێترین شێوازی چارەسەرە و ٢٠-٣٠ رۆژ جارێك بۆ پتر یان کەمتر لە ٦ جار، زیانی گرنگی نییە.

٥- کرێمی ئیفلۆرنیثین eflornithine ١٥٪ رۆژی ٢ جار بۆ چەند مانگێك، رێژەی ٣٠٪ زۆر کەڵك وەردەگرن و ٧٠٪ یان هەندێك کەڵك وەردەگرن، دوای بەکارنەهێنان مووەکان بەهێز دەبنەوە. ئەم کرێمە ئەنزیمی ئۆرنیثین دیکاربۆکسیلەیز ornithin decarboxylase لەکار دەخات و تێکڕایی گەشەی قەدی موو کەمدەکاتەوە.

٦- حەپلەی نەزۆکاندن oral contraceptive pills: وەك"Organon" = ( ١٥٠ ملگم دیسۆجێستریل Desogestrel + ٣٠ مایکرۆگم ئەثینیل ئیستڕادیۆل (ethinyl oestradiol یاسمین Yasmin (درۆسپێرینۆن Drosperinone + ئەثینیل ئیستڕادۆل)

٧- سپایرۆنۆلاکتۆن spironolactone (٥٠-٢٠٠ ملگم/رۆژ بۆ ٦-١٢ مانگ)، فلوتەماید flutamide ٢٥٠ ملگم/رۆژ دواتر ١٢٥ ملگم/رۆژ بۆ ماوەیەکی زۆر، سیپرۆتیرۆن ئەسیتەیت "cyproterone acetate "CPA ١٢,٥-١٠٠ ملگم لە ١٠ رۆژی یەکەمی سووڕی مانگانەدا. ئەمانەی سەرەوە دژی ئەندرۆجینن و SHBG پتر دەکەن.. بەڵام *CPA لەگەڵ ئیستڕۆجین باشترە (حەپلەی دایان Dian) [= CPA* ٢ ملگم + ٣٥ مایکرۆگرام ئەثینیل ئیستڕادیۆل] بۆ ٢١ رۆژ لە سووڕی مانگانەدا.

٨- فینەستراید finasteride ٢,٥-٥ ملگم/رۆژ بەتایبەتی لەگەڵ سپایرۆنۆلاکتۆن ١٠٠ ملگم/رۆژ.

٩- هاوتاکانی analogues هۆرمۆنی گۆنادۆترۆفین دەردەر gonadotrophin realeasing hormone analogues وەك لیوپرۆلاید leuprolide و نافارێلین nafarelin بەکەڵکن، بەڵام هێشتا هەر لە ژێر تاقیکردنەوەدان (ئاستی ئیستڕۆجین و ئەندرۆجین زۆر کەم دەکەنەوە).

١٠- سیمیتیدین cimetidine دژی ئەندرۆجینە و زۆر لاوازە بۆ چارەسەرکردن

١١- بـۆ بەرزبـوونـەوەی ئاسـتی پرۆلاکتیـن: ١) برۆمۆکریپتیـن bromocriptine، ٢) نەشتەرگەری بۆ لابردنی لـووی پـرۆلاکتین فـرەدەردەر hyperprolactinoma، ٣) دژە ئەندرۆجینەکان.

١٢- هەستێنەری ئینسۆلین insulin sensitizers بە تایـەتی بـۆ PCOS وەك مێتفـۆرمین metformin ٢٠٠ ملگم/رۆژ کۆنترۆڵی سووڕی مانگانە دەکات و پیتاندن fertility باش دەکات و ئاستی ئینسۆلین و ئەندرۆجین لە PCOS دا کەم دەکاتەوە بە تایبەتی بـۆ ئەو کەسانەی کەم خوێن دەبـن oligomenorrhoeic و پتربـوونی رێـژەی L.H بـۆ F.S.H. یان هەیە و ئاستی تێستۆستیرۆنیان بەرز نییە.

١٣- بۆ CAH ستیرۆید دێکساميثازۆن بە خەپلە + دژە ئەندرۆجین.

## ٢-تووکنی لەشی Hypertrichosis

بریتییە لە فرەبوونی موو لەو شوێنانەی لەش کە پشت بە ئەندرۆجین نابەستێت. ئەمانەی خوارەوەن:

١) **تووکنی لەشی جێیی وەرگیراو** Localized acquired hypertrichosis: وەك:



(وێنەی ٢٢٩) تووکنی لەشی جێیی.



(وێنەی ٢٣٠) نیشانەی بێکەر.

- لووی بن توێـژ: بـۆ نمونـە ، نیشـانەی خانـەی تـۆخ، پـەردەگمۆڵی مێشـك meningioma(وێنـەی ٢٢٩)، نیشـانەی بێکەر Becker nevus (وێنـەی ٢٣٠)- تاد.
- زەبر، بەستن ( ژێـر گـەچ بـۆ ئیسـکی شکاو) occlusion، بیرۆ، سـتیرۆیدی جێیـی، رەقبـوونی پێسـت، scleroderma، ئاوسـانی لیمفـی lymphoedema و بڵە ئاوسانی پـێش ئێسـکە قامیش pretibial myxoedema.
- پۆرفیریا porphyria.
- شـوێنی کوتـان vaccination، سـۆی ئێسـکی درێژخایـەن، گەسـتن biting، دەرمـان وەك ئینتەرفیرۆن، مینۆکسیدیل و لاتانۆپرۆستی جێیی.

٢) **تووكنی لەشی جێیی زگماكی .L. congenital H**: وەك بڕبڕەی دووفاق spina bifida، تووكنی ملی خێزانی .familial cervical H، ئانیشكی تووكن، گوێچكەی تووكن، زەبەلاحەموو trichomegaly، تووكنی نیشانەیی .naevoid H ، نیشانەی تۆخی زگماكی congenital pigmented nevus، - تاد.

٣) **تووكنی لەشی گشتی زگماكی .Generalied congenital H**: زۆر دەگمەنە، بۆماوەیی سێكسی زاڵە، هەندێك جار وەرگرتنی دەرمان لە لایەن دایكی سكپڕ ئەم جۆرە دروست دەكات وەك ئەلكهول، فێنیتۆین، ڤالپرۆوەیت. هەموو لەش تووكنە. (وێنەی ٢٣١)



**(وێنەی ٢٣١) تووكنی لەشی گشتی زگماكی.**

٤) **تووكنی لەشی گشتی دەستكەوتە : Acquired G.H.**:

شێرپەنجە، دەرمان (مینۆكسیدیل، دایازۆكساید diazoxide، فێنیتۆین، سایكلۆسپۆرین A(وێنەی ٢٣٢)، PUVA، ستیرۆیدی جێیی، ستڕێپتۆمایسین - تاد)، پۆرفیریاكان porphyrias، پێستە ماسولكەسۆی منداڵی juvenile dermatomyoscitis، سستی ملەقۆرتەگلاند، بەد هەڵمژین malabsorption، مێشكەسۆ، شێتی، زەبری سەر و نەخۆری دەروونی anorexia nervosa.



**(وێنەی ٢٣٢) تووكنی لەشی دەستكەوتە (بە سایكلۆسپۆرین).**

**چارەسەر:**

١- مێشكردن، تاشین، هەڵكێشان، شیلە، موولابەری كیمیكی، موولابردنی ئەلەتریكی.

٢- لەیزەر: Long wave-Nd:YAG، دایۆد Diode، رووبی Ruby، Alexandrite و IPL.

٣- لابردنی هۆكارەكە.

## گەندەسەلکەسۆی ریش Pseudofolliculitis barbae

بریتییە لە دووبارە مووچوونە ناوەوەی پێست دوای دەرچوونیان، ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی تەنۆچکە و پیزۆکەی سۆکردوو و لەوانەیە جێ زام و لە باری زۆر تیژدا گۆشتپارەش جێبهێڵێت. پتر لە رێژەی ٥٠٪ی رەش پێستەکان ئەم دیاردەیان لە ریش دا هەیە، لە کوردیش دا هەر باوە. مووی بەر زۆرجار ئەم ناساغیەی هەیە. (وێنەی ٢٣٣)



(وێنەی ٢٣٣) گەندە سەلکەسۆی ریش.

چارەسەر: ستیرۆیدی جێیی ئازار کەم دەکاتەوە.

گلایکۆلیك ئەسید + دژە بەکتریا.

بێنزۆیل پیرۆکساید ٥٪ یان شلەی کلیندامایسین ١٪ یان جێڵ.

لەیزەر (هەندێك جار) بۆ لابردنی مووەکان (Diode, ND:YAG).

## مەنگەمووی درکی Trichostasis spinulosa

بریتییە لە ناساغیەکی باوی سەلکەموو کە بە رواڵەت لە سەرەزیپکەی رەش دەچێت، بەلام لە راستی دا سەلکەکان پڕبوون لە پەستاوتراوی قۆچەکازی دالانی funnel shaped و چەپکی گەندەمووی تێدایە، لە لووت و ناوچەوان و هەندێك جار لە قەد دا دەردەکەون و لەوانەیە بەخورووبن. ئەم ناساغیە بەهۆی مانەوەی چەند موویێکی پشوودەر کە لە یەك ناواخنی موو سەرچاوە دەردێنن و بەهۆی زێدە قۆچەکازی دالانی سەلك ،کە رێگا نادات بە فرێدانی ئەم مووە پشوودەرە بچووکانە، دروست دەبێت. (وێنەی ٢٣٤)



(وێنەی ٢٣٤) مەنگە مووی درکی.

چارەسەر:

١) پلاستەر ٢) شیکەرەوەکانی قۆچەکازی keratolytics و مێو wax.

٣) ترێتینۆین ٠,٠٥٪ (شلە) رۆژی یەك جار بۆ ٢-٣ مانگ، ٤) لەیزەری دایۆد.

## دارێژگەی موو Hair casts

زۆر باوە و بریتییە لە پاشماوەی پەردەی ناوەوەی رەگی موو، بە ژمارەیەکی زۆر دەردەکەون و لە رشکی سەر دەچن، بەڵام رشك بە مژادێکی چیمەنتۆیی بە مووەوە چەسپاوە ، بەڵام دارێژگەی موو بە ئاسانی بۆ سەرەوە و خوارەوەی موو دەجولێنرێت.

لە کچی ۲-۸ ساڵیدا باوە و هەندێك جار لە نەخۆشی سەدەف و چەورەبیرۆ و پانەپێستەستووریێ دا هەن.

چارەسەر: شلەی ترێتینۆین ۰,۰۲۵٪ شەوانە.

**دالانەسەلکەسۆی بلاو و سەرهەلداوە Disseminate & recurrent infundibulo- folliculitis:**

زۆر دەگمەنە، بەڵام لە کوردا هەیە و بریتییە لە تەنۆچکەی شێوە نارێك و مووی لە ناودایە، هەندێك جار بەخورووە و درێژخایەنە، تەنۆچکەکان ۱-۲ ملم دەبن و هەموو سەلکەمووەکانی شوێنە توشبووەکە وەك سەرەوەی قەد و مل و هەندێك جار هەموو قەد و سەرەوەی پەلەکانیش دەگرێتەوە. (وێنەی ۲۳۵)



(وێنەی ۲۳۵) دالانە سەلکەسۆی بلاو و سەرهەلداوە.

چارەسەر: ئایزۆترێتینۆین یان پوڤا.

# نەخۆشیەکانی نینـــۆک Nails

**ناساغیەکانی نینۆك بەپێی شوێنی سەرەتایی یان دووەمی تێکچوونەکەیە**

I- **گۆڕانکاریەکانی شێوەی نینۆك** Variations in general contour

١) **کووڕبوون** Clubbing: بریتییە لە فرەکەوانەبوونی (کووڕبوونی) باری درێژی و پانی نینۆك، بـــەهۆی زلبـــوونی hypertrophy شانەی نەرمی کرۆکی قامـك digital pulp و فرەگەشەی شانەی بۆری خوێن و ریشاڵی بنکەی نینۆك و بزوتنی پلێتـی نینـۆك و شـینبوونەوەی جێیـی. (وێنـەی ٢٣٦)



(وێنەی ٢٣٦) **کووڕبوونی نینۆك.**

**هۆکارەکان:**

١- ناساغیەکانی سیەکان (٨٠٪)

٢- ناساغی دڵ و بۆری خوێن.

٣- ناساغیەکانی گەدە و ریخۆڵە.

٤- ناساغی جگەر ٥- هۆی تریش.

٢) **نینۆکی قوپاو ( نینۆکی کەوچکی = ئەسـکوێلەنینۆك)** Koilonychia (spoon nails): نینۆك چـاڵییە و لێوارەکانی بەرزبوونەوە. (وێنەی ٢٣٧)





(وێنەی ٢٣٧) **ئەسکوێلە نینۆك.**

**هۆکارەکان:**

١- لـە ساوادا ئاساییە.

٢- پیشەیی، بەهۆی زەبری درێژخایەن.

٣- کەم خوێنی کەم ئاسنی.

٣) **نینۆکی رەکتـەیی** Racquet nail: پـانی پلێـت و دۆشەکەی نینۆك لـە درێژییەکـەی پـترە، بۆمـاوەیی لـەشی زاڵە. (وێنەی ٢٣٨)

٤) **نەبوونی نینۆك** Anonychia: بریتییە لـە نـەبوونی هەموو یان هەندێك لە نینۆکـەکان یـان بەشـێك لـە نینـۆك، زگماکییـە یـان وەرگـیراوە، بـۆ نموونـە لـە نەخۆشی پانەپێستەستووری L. planus دا.



(وێنەی ٢٣٨) **نینۆکی رەکتەیی.**

## II- گۆرانکاریەکانی رووی نینۆک Variations in nail surface

۱- زبربوون (Rough nails =Trachonychia): نینۆك تاریك و تەنك و زبر دەبیت ،لە دواییش دا هێڵی بەرزبووەوەی درێژی کە کۆتاییەکەی ئەوپەڕی کەلێنییە ،دروست دەبێت، یەك، هەندێك یان هەموو نینۆکەکان دەگرێتەوە.

هۆکارەکان:

۱) هۆنەزانراو، لە ۱,٥ ساڵی دا تا ناوەڕاستی تەمەن دەرکەوێت.

۲) دەردە رێوی، سەدەف، پانەپێستەستووریٚ ، جێگۆڕاو، نەخۆشی ماسی یان نەخۆشی تر.

۳) خێزانی.

٤) نەخۆشیەکانی بەرگری خۆیی وەك بەڵەکی.

لە باری منالی دا لە ۲۰–۲٥ ساڵی دا چاکدەبنەوە.

ئەم ناساغیە پێشی دەوورترێت بەدگەشەیی بیست نینۆکی twenty nail dystrophy.

۲- هێڵی چاڵی (قلێشی نینۆك) Nail grooving: یان لە:



(وێنەی ۲۳۹) هێڵی چاڵی پانی نینۆك.

۱) برگەی پانی دا دەردەچێت، وەك: (وێنەی ۲۳۹)

۱- بەدخۆراکی Neutritional (هێڵی بیو Beau's line) : لە ئەنجامی وەستانی کاتی کاری ناواخن وەك منالبوون، سورێژە، تای توند، ماکی دەرمان، تووشێنی بەکتریا و کەرووی نینۆك و زەبری کۆئەندامی وەك شکانی ئێسك – تاد دروست دەبێت، لەگەڵ کات دا ئەم قلێشە بەرەو پێشەوەی نینۆك دەڕوات و لە دوایی دا نامێنێت.

۲- سەدەف (کاژۆکی).

یان لە:



(وێنەی ۲٤۰)
هێلی چاڵی درێژی نینۆك.

۲) برگەی درێژی دا: وەك:

۱- بەدگەشەیی ناوەکی کەناڵی (وێنەی ۲٤۰ Median canaliform dystrophy(
لە ناوەڕاست دا نینۆك درزدەبات و هێڵی تری

وەك درەختی سنەوبەری هەڵگەڕاوەی لێ دەردەچن، پتر لە نینۆكی پەنجەگەورەدا بەهۆی فشاری دووبارەبووەوە لەسەر بنكەی نینۆك روودەدات.

٢- بەهۆی پۆرگی چلمەگمۆلی Myxoid cyst لە ژێر نینۆك دا ،قلیشی پان دروست دەبێت، چونكە ئەم پۆرگە فشار دەخاتە سەر ناواخنی نینۆك. (وێنەی ٢٤١)



(وێنەی ٢٤١)
پۆرگی چلمەگمۆل (هێلی درێژی دروست كردووە).

٣- **هێڵی لوتكەیی** Nail ridges: هێڵی بەرزبووەوەیە لە رووی نینۆك بە درێژی و هەندێگ جار گرێیاوییە beaded، لە پیری دا و بەهۆی جومگەسۆ و دەرمان ( وەك ئیتراكۆنازۆل) روودەدات.

٤- **خاڵی چاڵی (پنتۆكەچاڵ)** Pits: چاڵی بچووكی رێك یان نارێك لە سەدەف و بیرۆ و دەردەڕێوی ناساغی تریش روودەدات. (وێنەی ٢٤٢)



(وێنەی ٢٤٢) **پنتۆكە چاڵی نینۆك.**

## III- گۆرانكاریەكانی رەنگی نینۆك Variations in nail colour

نینۆكی رەنگگرتوو chromonychia بریتییە لە رەنگی نائاسایی مژادی یان رووی پلێتی نینۆك یان شانەی ژێر نینۆك. بۆ دەستنیشانكردنی جۆرەكەی پێویستە نینۆك خاوبووبێتەوە relaxed و بەرەلآبێت . لێواری ئەوپەڕی نینۆك پەستانی دەخرێتە سەر ،ئەگەر بەمە رەنگەكە سپیتربوو blanched ئەوە ناساغیەكە لە بۆری خوێندایە، ئەگەر وەك خۆی مایەوە ئەوسا لایتی پاندان دەپەستێنرێتە سەر كرۆك (ئەو دیوی نینۆك) ئەگەر رەنگەكە دیار نەما،ئەوە بوونی رەنگگۆڕان لە دۆشەكەی نینۆك دەگەیەنێت. (وێنەی ٢٤٣)



(وێنەی ٢٤٣) **نینۆكی رەنگگرتوو (هۆكاری ناوەوە).**

لە نەخۆشی کۆئەندامی دا هەموو نینۆکەکان ڕەنگیان دەگۆڕێت، ئەگەر هۆکاری ناوەوە بوو ئەوە ڕەنگگۆڕانەکە شێوەی مانگیلە وەردەگرێت.



(وێنەی ٢٤٤)
نینۆکی ڕەنگگرتوو (بەهۆی لێککەوتەی دەرەکی)

ئەگەر هۆکارەکەی مژادی لێککەوتووی دەرەکی بوو (وێنەی٢٤٤)ئەوە شێوەی نوشتاوەی نینۆکی نزیك (ناوەوە) proximal nail fold وەردەگرێت و لەم بارەدا ئەم دوو تاقیکردنەوانەی سەرەوە نێگەتیڤن. دوو جۆری سەرەکی ڕەنگگۆڕان هەن:

١- **سپیەنینۆك** Leukonychia:

أ) **سپیە نینۆکی ڕاستی** .True L: بەهۆی کارتێکچوونی ناواخنی نینۆك ڕوودەدات و پێنج شێوازی هەیە:



(وێنەی٢٤٥) سپیە نینۆکی ڕاستی.

١) سپیە نینۆکی گشتی .Total L: بۆماوەیی لەشی زاڵە،یان بەهۆی گرانەتا، گولی، بەریشاڵ بوونی جگەر، کۆلۆنەسۆی چاڵەبرینی ulcerative-colitis، نینۆك گەستن، دەرمانی خانەوەستێن – تاد ڕوودەدات. (وێنەی ٢٤٥)

٢) سپیەنینۆکی ژێر گشتی .Subtotal L: لێواری ئەوپەڕی نینۆك هەر پەمەییە و بەشە زۆرەکەی سپیە، ئەم جۆرە لە سیل، گورچیلەسۆ nephritis و نەخۆشی هۆدچکن – تاد، ڕوودەدات.



(وێنەی ٢٤٦) سپییەنینۆك (پەتی پانی).

٣) سپیەنینۆکی پەتی پانی Transverse-L: لێرەدا هێڵی پەتی کەوانەیی ١-٢ ملمی سپی لە بڕگەی پانی دا هەن، بۆماوەییە یان بە زەبر یان ناساغی کۆئەندامی دروست دەبێت. (وێنەی ٢٤٦)

٤) سپیەنینۆکی خاڵی .Punctate L: خاڵی سپی بچووکی لەسەرە، یان ئاساییە یان بە زەبر دروست دەبێت.

٥) سپیە نینۆکی هێڵی درێژی Longitudinal-L: لە نەخۆشی داریەردا هەیە.

ب) **گەندە سپیەنینۆك** Pseudo-leukonychia: سپی بوونی پلێتی نینۆك هۆکارەکەی دەرەکییە، وەك کەڕووی نینۆك.

ج) سپیە نینۆکی ڕواڵەتی .Apparent L: هۆکارەکەی گۆڕانکاری شانەی ژێر نینۆکە وەك:


(وێنەی ٢٤٧) نینۆکی تێری.

١- نینۆکی تێری Terry's nails: سپی بوونی پلێت، پێش لێواری دەرەوەی نینۆك بە ٠,٥-٣ ملم، بۆ ڕەنگی قاوەیی و پەمەیی دەگۆڕێت. لە نەخۆشی دڵ، بەریشاڵبوونی جگەر و نەخۆشی شەکرەدا ڕوودەدات. (وێنەی ٢٤٧)

٢- نینۆکی نیوبەنیو Half-and-half nails: بەشی نزیکی نینۆك proximal area سپی کە بەشی ئەوپەڕی distal area قاوەییە، لە نەخۆشی بەرزی یۆریای خوێندا uremia هەیە.


(وێنەی ٢٤٨)
جووتە سپی پەتی باریك.

٣-جووتە سپی پەتی باریك Paired narrow white bands: هاوتەریبە لەگەڵ مانگیلەدا، لە کەمی ئەلبومینی خوێن و چارەسەری کیمیکی دا هەیە. (وێنەی ٢٤٨)

٢- خوێنرێژی ژێر پلێت Splinter hemorrhage: خوێنرێژی درێژی لە کۆتایی دۆشەکەی نینۆك هۆکارەکەی بۆ بۆری خوێنی ژێر نینۆك دەگەڕێتەوە، لە بەشی نزیك دا ئەم خوێنڕێژییە هۆکارەکەی ناوپۆشەسۆی دڵی بەکتریاییە یان زەبرە.

IV- گۆڕانکاریەکانی ئاڕاستەی گەشەی نینۆک Variations in direction of nail growth

١- نینۆکی قۆچی Onychogryphosis


(وێنەی ٢٤٩) نینۆکی قۆچی.

نینۆك بە تەواوی تێکچووە، ئەستوور و قاوەیی تاریك و پێچخواردووە و لە دۆشەکەی نینۆك جیابۆتەوە، نینۆکی پەنجە گەورە پتر ئەم بارەی هەیە و دەڵێی قۆچی بەرانە، لایەکی نینۆك لە لایەکەیتر پتر گەشە دەکات و بەلای کەم گەشەکەدا بایداوەتەوە. بەهۆی پەستانی پێڵاوی نالەبار، پتر لە پیردا ،ڕوودەدات، بە دەگمەن هۆکەی زەبرە یان بۆماوەییە یان بەهۆی ناساغی بۆری خوێنی پەڕی (پەلەکان) ڕوودەدات. (وێنەی ٢٤٩)

چارەسەر: لابردنی نینۆك و لەناوبردنی ناواخن بە فینۆڵ یان لەیزەری $CO_2$.

٢- بەد دانیشتنی پلێت Malalignment of the nail plate: باوە، ئاراستەی گەشەی درێژی نینۆك بە لایەك دا لارە. زگماكییە یان بە زەبری توند روودەدات. (وێنەی ٢٥٠)



(وێنەی ٢٥٠) بەد دانیشتنی پلێت.

٣- نینۆكی چەنگاڵی (قولابی) Hook nail: بەهۆی كورتی ئێسكی پلی پەنجە، نینۆك دەچەمێتەوە.

٤- باڵە نینۆك = نینۆكی باڵی Pterygium unguum دوو جۆرە:

أ) جۆری پشتی نینۆك Dorsal type: بریتییە لە وردە وردە كورتبوونەوەی چاڵە هێڵی نزیكی نینۆك proximal nail groove و تەنكبوونەوەی پلێتی پەرەسەندوو و درزبوونی دووەمی بەهۆی پێوەنووسانی نوشتاوەی نزیك بە ناواخن و دۆشەكەی نینۆك، دوای چەند ساڵێك نینۆك نامێنێت و جێ زام و پووكانەوەی دۆشەكەی نینۆك روودەدەن. (وێنەی ٢٥١)



(وێنەی ٢٥١)
نینۆكی باڵی (جۆری پشتی نینۆك).

ئەم جۆرە بە تایبەتی لە نەخۆشی پانەپێستەستووریَ دا روودەدات، بەڵام هەندێك جار بەهۆی نەخۆشی بڵقی تیژ، چارەسەر بە تیشك، زەبرو كەمخوێنداری ischaemia روودەدات، بە دەگمەن زگماكیە.



(وێنەی ٢٥٢)
نینۆكی باڵی (جۆری بەری نینۆك).

ب) جۆری بەری نینۆك Ventral type: بەهۆی بەرەو دەرەوەكشانی ژێر نینۆك و یەكگرتنی لەگەڵ رووی ژێرەوەی پلێت روودەدات، بەمەش چاڵە هێڵی ئەوپەڕ كوێر دەبێتەوە. (وێنەی ٢٥٢)

هۆكارەكان بریتین لە رەقبوونی پێست، دیاردەی راینۆد، زەبر، مژادی جوانكاری نینۆك (فۆرماڵدیهاید) و زگماكی.

**٥- بەدلکانی پلێت و شانەی نەرمی ژێری: ئەمانەن"**

Faulty attachment of nail plate and soft tissue

أ) نینۆك فڕێدان (كەوتن) Onychomadesis: **(وێنەی ٢٥٣) بریتییە لە نینۆك كەوتنی ناوبەناو بەهۆی لەكاركەوتنی كاتی ناواخنی نینۆك. هۆكارەكانیان یان نەزانراون یان بەهۆی ناساغی دەماری، خوێن پاڵاوتن dialysis، لیمفۆمای خانەی T پێست، نەخۆشی كاواساكی .Kawasaki's ds، نەخۆشی بڵقی ئاسایی (بڵقە پیسە) pemphigus vulgaris، هەستیاری بە دەرمان، یاریكەری پێشبڕكێ، ڕێتینۆیدەكان و دەرمانی دژی شێرپەنجە و دەردە ڕێوی ڕوودەدات.**



**(وێنەی ٢٥٣)**
**نینۆك كەوتن (شاراوە).**

ب) نینۆك شیبوونەوە Onycholysis: **بریتییە لە جیابوونەوەی پلێت لە دۆشەكەی نینۆك لە بەشی ئەوپەڕی distal یان تەنیشت lateral، ئەم جیابوونەوەیە بەرەو بەشی نزیك بە شێوەی كووڕی دەكشێت، بەمەش بۆشایی ژێر نینۆك دروست دەبێت كە چڵك و پاشماوەی قوچەكاژی تێدا كۆدەبێتەوە ، ڕەنگی سپی و خۆڵەمێشی لە بەشە جیابووەكەدا هۆكەی بوونی هەوایە لە ژێر نینۆك دا. (وێنەی ٢٥٤)**



**(وێنەی ٢٥٤) نینۆك شیبوونەوە.**

**هۆكارەكان: زەبر، بیرۆی دەست (بە تایبەتی لە ژنان دا)، ناساغی ملەقۆرتە گلاند (فرە یان كەم چالاكی)، سكپڕی، پۆرفیریا، نەخۆشی گەنمەشامی pellagra، سفلس، بیرۆی جێگۆڕاو، پانەپێستەستووری، زگماكی، كەڕوو، تووشێنی بەكتریا و ڤایرۆس (تامیسك) و مزادی كیمیكی. چارەسەر بە "تێتراسایكلین و پسۆرالین و كلۆرامفێنیكۆڵ" تیشكەشیبوونەوەی نینۆك photoonycholysis دروست دەكات، ڕێتینۆیدەكان و دژە شێرپەنجەش دروستی دەكات، لەوانەیە هەندێك جار بۆ ماوەیی بێت.**

V- گۆڕانكاریەكانی پێكهاتەیی Variation in consistency

**١- ڕەقەنینۆك = نینۆكی ڕەق** Hard nails: **لە نەخۆشی زگماكە نینۆكەستوورە** Pachyonychia congenita **دا هەیە.**

٢- نەرمەنینۆك = نینۆكی نەرم Soft nails: زگماكییە یان دەستكەوتە، وەك فرەتەڕكردن بە ئاو و مژادی كیمیكی.

٣- ناسكەنینۆك = نینۆكی ناسك Brittle nails: ئەمانەن:

١) نینۆك درزدان Splitting: بەهۆی فرە بەكارهێنانی ئاو و سابوون، لابەری بۆیەی نینۆك، كەم چالاكی ملەقۆرتەگلاند، بەدخۆراكی و دەرمانی ڕێتینۆید روودەدات.(وینە٢٥٥)

چارەسەر: ڤیتامین B، بایۆتین، ڤازیلین.



(وێنەی ٢٥٥) نینۆك درزدان.

٢) نینۆك درزدانی توێكڵەپیازی Lamellar splitting (onychoschisia): بەشی ئەوپەڕی نینۆك ،بەهۆی فرە دەست خستنە ناو ئاو، دەگرێتەوە یان بەشی نزیك، لە نەخۆشی پانەپێستەئەستووریێ دا و بە ڕێتینۆیدەكان دەگرێتەوە[نینۆك چینی تەنكی (وەك پاقلاوە) لێ دەبێتەوە].

چارەسەر: ڤازلین، بایۆتین، پاراستن لە ئاو.

٣) درزی پانی Transverse splitting: بە زەبر درووست دەبێت.

**ناساغی نینۆك لە نەخۆشیەكانی پێست و نەخۆشیە ناوەكیەكان دا**

Nail abnormalities in dermatological & medical disorders

وەك نەخۆشی سەدەف، سەدەفی كێمی، پانەپێستەستووریێ، دەردە یوی، نەخۆشی داریەر، پێستەسۆی لیككەوتن، تووشێنی نوشتاوەی نینۆك بە بەكتریا و كەڕوو و ڤایرۆس، نەخۆشی كۆلاجین، دەرمان، شێرپەنجە، نەخۆشی دەماری و بۆری خوێن، نەخۆشی شەكرە، رەقبوونی كۆئەندامی systemic sclerosis و كۆنیشانەی زەردەنینۆك yellow nail syndrome كە بریتییە لە ((وەستانی گەشەی نینۆك، نینۆكەكانی دەست و پێ رەق و لە لاوە بۆ لا چەماوەن و رەنگی نینۆك زەردی كاڵ یان سەوز و زەردی تۆخە، پێستۆكە نەماوە، شیبوونەوەی دووەمی نینۆك باوە، ئەم نەخۆشیە یان ئاوسانی لیمفی lymphoedema و ناساغی كۆئەندامی هەناسەدانی لەگەڵدایە یان شێرپەنجە.



(وێنەی ٢٥٦) كۆنیشانەی زەردە نینۆك.

چارەسەری بە ژەمی زۆری ڤیتامین B12 + ئیتراكۆنازۆڵ یان فلوكۆنازۆڵ بە دەم دەكرێت )).

(وێنەی ٢٥٦).

**ناساغیەکانی نینۆکی زگماکی و بۆماویی** Hereditory & congenital nail disorders

وەك گەشە شێواوی توێژە شانەی بۆماوەیی hereditory ectodermal dysplasia، توێژشیبوونەوەی بلّقی epidermolysis bullosa، زگماکەنینۆکەستوورە Pachyonychia (وێنەی ٢٥٨) وکۆنیشانەی کلاوەی ئەژنۆ و نینۆك nail patella syndrome (وێنەی٢٥٧) کە تێیدا ((کلاوەی ئەژنۆ پووکاوەیە یان نییە، قۆچی ئێسکە کلّۆت iliac horns و نەخۆشی گورچیلە هەن، نینۆکەکان گۆڕاون و مانگیلە سێگۆشەیە لەگەلّ نەمانی بەشێك لە نینۆکەکان بە تایبەتی هی قامگە گەورە)) .



(وێنەی ٢٥٧)
کۆنیشانەی کلاوەی ئەژنۆ و نینۆك.



(وێنەی ٢٥٨)
زگماکە نینۆکەستوورە.

**لووی ناوچەی نینۆك** Tumors involving nail area

وەك بالووکەی ژێر و دەوری نینۆك، پۆرگی چێنراوی کیراتین keratin implantation cysts (وێنەی ٢٥٩) ((ئەم پۆرگانە هەندێك جار لە ژێر نینۆکن و بەرزی دەکەنەوە، بەهۆی زەبر روودەدات

ریشالّە کیراتینە گمۆلّ fibrokeratoma، لووی کۆنین Koenen's tumor، بن توێژە ریشالّە گمۆلّی ریشالّی fibrous dermatofibroma (وێنەی ٢٦٠ و ٢٦١) (( کە تێیدا ریشالّە گمۆلّ وەك لووی گرێی بێ ئازار و لەسەرخۆ پەرەسەندووی خڕ یان هێلکەیی، پتەو یان جیڕی، لە دۆشەکەی نینۆك دا دەردەچێت و پلێتەکە بەرز دەکاتەوە و چالّی درێژی دروست دەکات)) وە هەندێك جار شێرپەنجە.



(وێنەی ٢٥٩) پۆرگی چێنراوی کیراتین (دوای نەشتەرگەری دروست بووە).



(وێنەی ٢٦٠) ریشالّە کیراتینە گمۆلّ

کێمینەگۆشتەزوونەگمۆلّ Pyogenic granuloma ((خوێن بۆریە گمۆلّی Haemangioma دەرهاتووە بەهۆی زەبر، گرێیەکی بچووکی سوورو شینە بە کتوپڕی لە دەوری نینۆك دەردێتو دواتر داڕزانی necrosis شانەو دەلاّندنو خووسانی



(وێنەی ٢٦١) ریشالّە گمۆلّی ژێر نینۆکی سەرپەڕ

شالەو لەوانەیە نینۆك شیبوونەوە رووبدات)) (وێنەی٢٦٢).

چارەسەر: برین بە نەشتەرگەری یان بە ئامێری کیورێت (کرێنەر) curette و سووتاندنی بنکەکەی بە TCA.





(وێنەی ٢٦٢) کیمێنە گۆشتەزوونەگمۆڵ (لە دۆشەکەی نینۆك دا).

(وێنەی ٢٦٣) لووی گلۆمەس (بەشێوەی پەڵەی سووری درێژی لەژێر نینۆکدا).

**نیشانەی خانەی تۆخ** Melanocytic naevi: بە شێوەی تۆخبوونی درێژی یان پانی دەردەچێت و لەوانەیە کەم جار میلانۆما بێت، بۆیە کە رەنگەکە تۆختر یان پانتر بوو، بەتایبەتی لە پەنجەکانی ١، ٢، ٣ ، و کە لێوارەکانی نارێك بوو و نینۆك تێکچوون و رەنگ تێکچوونی دەوری نینۆکی هەبوو، لەم بارەدا بیر لە میلانۆما دەکەینەوە و نموونەی بۆ وەردەگرین.

**لووی گلۆمەس** Glomus tumor: . (وێنەی ٢٦٣)نیشانەکانی بریتین لە: ١) ئازار، ٢) ئازار بە دەست لێدان، ٣) دەردەکە لە ئاسایی پتر گەرمە. پەڵەیەکی سوورە لە دۆشەکەی نینۆك دا، پشکنینی MRI بۆ دەکرێت و بە نەشتەرگەری لادەبرێت

**هەندێك ناساغی تری نینۆك**

١- **نینۆك گەستن** Onychophagia: باوە، دۆشەکەی نینۆك کورت دەبێتەوە و لەوانەیە ناواخن تێکبچێت و نینۆکی باڵی دروست بێت، خوویەکی بەدە و وازلێهێنانی زۆر گرانە. (وێنەی ٢٦٤)



(وێنەی ٢٦٤) نینۆك گەستن.

چارەسەر: ١) چارەسەری دەروونی، ٢) دەرمان وەك فلۆکسێتین، ٣) خەوانـدنی موگناتیسی hypnosis.

٢- **خووی نینۆك دەرهێنان = شێتی نینۆك هەڵکێشان** Onychotillomania: نەخۆش بە بەردەوامی دەستکاری نینۆك دەکات و دەیەوێت بیاندرێنێت و بەرزیان بکاتەوە.

چارەسەر: وەك ئەوەی سەرەوە.

٣- چوونە ناوەوەی نینۆک (نینۆک چەقینەپەنجە) Ingrowing-nail (Onychocryptosis)
باوە، لە نینۆکی پەنجە گەورەی پێ پتر روودەدات. تەنیشتی نینۆك بۆ ناو نوشتاوەی نینۆك (نوشتاوەی لایی lateral fold) گەشە دەكات. سۆو ئاوسان و تووشێنی بەكتریایی روودەدات، لێواری نینۆكی لایی وەك تەنێكی نامۆ رۆڵ دەبینێت و گۆشتەزوونەگمۆڵ بە قەبارەی گەورە دێنێتەكایەوە.

هۆكارەكەی: پێڵاوی نالەبار و رەق و تەسك و نینۆك كردنی بەد لە لێوارەكەی دا، بەم جۆرە بەشی پێشەوەی لای نینۆك ،كە نینۆك گەشەدەكات بەرەو پێشەوە،دەچەقێتە ناو گۆشتی دەوری، هەندێك جار هۆكارەكە دەرمانە، وەك ئایزۆترێتینۆین، لامیڤودین و ئیندیناڤیر.

چارەسەر: زۆربەی نەخۆش بەبێ نەشتەرگەری بە لابردنی هۆكارەكان چاك دەبنەوە لەگەڵ بەكارهێنانی دژە بەكتریا و پشوودان. بەڵام هەندێك جار نەشتەرگەری پێویستە.

٥- تۆخبوونی نینۆک melanonychia: (وێنەی ٢٦٥) بریتییە لە تۆخبوونی نینۆكی ئاسایی بۆ قاوەیی یان رەش، لە رەش پێست دا باوە، بەهۆی زەبر، نەخۆشی كۆئەندامی، دەرمان، یان نەخۆشی پێست وەك پانەپێستەستووری .L.P، - تاد روودەدات.



(وێنەی ٢٦٥)
تۆخبوونی نینۆك.

# شێوانی ڕەنگی پێست Disturbances of skin color

لە ئەنجامی چەند هۆکارێك ڕەنگی پێست دروست دەبێت:

١- بڕ و جۆری میلانین (ئیۆمیلانین یان فیۆمیلانین)

٢- زۆری و کەمی بۆری خوێن

٣- بوونی کارۆتین.

٤- ئەستووری چینی کاژ.

**دروستبوونی میلانین** Melanogenesis: لە جگەردا بە هایدرۆکسیل کردنی hydroxylation ترشی ئەمینی بنەڕەتی essential amino acid فەنیل ئەلانین phenyl alanine (P.A) بۆ دروستبوونی دۆپا dopa ،بە هۆی ئەنزیمی فەنیل ئەلانین هایدرۆکسیلەیس P.A. hydroxylase، ڕوودەدات، دواتر بەهۆی ئەنزیمی تایرۆسینەیس tyrosinase ((کە مسی copper پێویستە بۆ کارەکەی)) دۆپا بۆ دۆپاکوینۆن dopaquinone دەگۆڕێت، ئەوسا بە پۆلیمەراندن polymerization (کۆبوونەوە و یەکگرتنی چەند گەردێکی دۆپاکوینۆن) ئیۆمیلانین (میلانینی قاوەیی یان ڕەش) دروست دەبێت، بەڵام ئەگەر ترشی ئەمینی بنەڕەتی سیستاین cysteine لەگەڵ دۆپاکوینۆن کاریان لێککرد reaction ئەوسا پۆلیمەراندن ڕوویدا ئەوە فیۆمیلانین phaeomelanine (میلانینی سوور یان زەرد) دروست دەبێت. جۆری سێیەمی میلانین نیوڕۆمیلانینە neuromelanin کە لە پێست و موودا نییە بەڵکو لە مژادە ڕەشە substancia nigra و خانەکانی کۆئەندامی کرۆمافین chromaffin system وەك کرۆکی ئەدرینال و دەمارەگرێی وزەواڵا sympathetic ganglia دا هەیە.

میلانین لە ناو میلانۆسۆمەکان melanosomes دا هەیە کە بریتین لە تەنۆچکەی بچووکی ٠,١- ٠,٧ مایکرۆنی، بە شێوەی تۆپی پێی ئەمەریکی (ئیومیلانۆسۆمەکان) یان تۆپی پێی ئاسایی (فیومیلانۆسۆمەکان)، پاشان میلانۆسۆمە تۆخبووەکان fully melanized بۆ ناو لقەکانی خانەی تۆخ (میلانۆسایت) دەڕۆن بۆ ئەوەی بچنە ناو خانەی کاژ و لە ناو سایتۆپلازمی خانەی کاژدا بەستە (پێچراو) package دروست دەکەن و بڵاودەبنەوە.

**کۆنترۆڵکردنی دروستبوونی میلانین**

١- تیشکی سەروو وەنەوشەیی (ت س و): ئەم تیشکە پرۆسەی میلانین دروستبوون چالاك دەکات.

٢- هۆرمۆنی هەژێنی خانەی تۆخ α-melanocyte stimulating hormon (α-MSH):

ئەم هۆرمۆنە لە ژێر مێشکەگلاند pituitary gland دەردێت secreted و کاریگەریەکی کەمی بۆ پرۆسەی دروستبوونی میلانین هەیە، جگە لەوەش ئەم هۆرمۆنە لە خانەی تۆخ و کاژیش

دا دروست دەبێت و لەوە دەچێت ئەم ڕژێنە جێیە یان خۆیە autocrine کاریگەرتربێت لەوەی ژێرمێشکەگلاند.

٣- [illegible]: لە هەندێك باردا پرۆسەکە چالاك دەکەن.

٤- [illegible]: پلەی تۆخبوونی پێست لە ڕەگەزە جیاکان دا دیاری دەکات.

## فرەتۆخبوونی پێست Hypermelanosis

١- **تۆخبوونی گشتی** Melanisim: بۆماوەیی لەشی زاڵە، پێست پتر لە ئاسایی تۆخە و لە کاتی لەدایکبوونەوە هەیە و تا ٥-٦ ساڵی تۆخبوونەکە هەر پتر دەبێت، بەڵام دەموچاو و لۆچەکان پتر تۆخن، قژ هەمیشە ڕەشە.

٢- **تۆخبوونی دەوری چاڵی چاو** Periorbital melanosis: بۆ ماوەیی لەشی زاڵە، هەندێك تۆخبوون ئاساییە، بەڵام کە زۆر تۆخبوو ئەوسا بۆماوەییە.

٣- **شڵی** Lentiginosis: پەڵەی شڵ بریتییە لە پەڵەی تۆخ کە ژمارەی خانەی تۆخی تێدا لە ئاسایی پترە، ئەگەر ژمارەی ئەم پەڵانە زۆربوو ئەوە پێی دەڵێین شڵ بوون یان شڵی، جۆرەکانی:

١) **شڵی گشتی** Generalized L.: بە تاك تاك یان بە کۆمەڵ لە ساواییەوە بەرەو زۆربوون دەچن، هۆکاری نەزانراوە.

٢) **شڵی یەکلایی** Unilateral L.: لە لایەکی لەش یان بە شێوەی ئاستەدەماری zosteriform، لە پارچەیەکی لەش دەردەچن.

٣) **شڵی هەڵتۆقیوی** Eruptive L.: لەگەڵ تەمەن دا شڵی پتر دەبێت، لەوانەیە لە ماوەی یەك حەفتەدا ژمارەیەکی یەکجار زۆر بە تایبەتی لە باڵق دا دەربچن.

٤) **کۆنیشانەی لیۆپارد** Leopard syndrome: بۆماوەیی لەشی زاڵە، شڵی لە کاتی لەدایکبوون یان منداڵی دا هەیە و ژمارەیان تا کاتی باڵقبوون بە تایبەتی لە مل و سەرەوەی قەد دا هەر زۆر دەبێت، بەڵام لەوانەیە زۆربەی یان هەموو لەش شڵ دەبێت، لەگەڵ شڵی دا ناساغی تر وەك ناساغی دڵ، چاو ، سی، کۆئەندامی سێکسی ناتەواو، کەڕی و کەم گەشەیی هەبن.

٥) **شڵی ناوەندی دەم وچاو** Centrofacial L.: ناوەڕاستی دەم وچاو بەشێوەی پەتێکی ئاسۆیی شڵاوییە و ناساغی دەماری و ئێسکی و دان و مەڵاشووی لە گەڵدایە، زۆر دەگمەنە.

٦) **کۆنیشانەی پیوتز-جەگهەرس** Peutz-Jeghers syndrome: بۆماوەیی لەشی زاڵە، پەڵەی شڵ بە ژمارەیەکی زۆر لەسەر و دەوری لێو و ناودەم و مەڵاشوو و دەست و پێدا و

هەندێك جار لە سەر دەم وچاو و ناوك و كۆم دا هەن، هەندێك لە پەڵە شڵەكان گەورەن، گرنگی ئەم كۆنیشانەیە لەوەدایە كە خرەزێدەگۆشتی polyps لە گەدە و ریخۆڵە دا هەن و لەوانەیە پێكداچوونی ریخۆڵە intussusception یان خوێنرێزی بكەن (لە ١٠-٣٠ ساڵی دا ئەمانە روودەدەن). شێرپەنجەی ریخۆڵە بە دەگمەن روودەدات. (وێنەی ٢٦٦)





(وێنەی ٢٦٦)
كۆنیشانەی پیوتز –جەگهەرس.

٧) كۆنیشانەی كرۆنكست كەنەدا Cronkhite-Canada syndrome: بۆماوەیی نییە، دوای ٥٠ ساڵی روودەدات، لە پێست دا تەنیا شڵی هەیە لەگەڵ خرەزێدەگۆشت لە گەدە و ریخۆڵە و مووڕووتانەوە و نینۆك تێكچوون.

٨) كونجە Ephilides (Freckles): هەر وەك شڵ بوونە بەڵام بۆماوەیی لەشی زاڵە و ژمارەی خانەی تۆخ لە ئاسایی پتر نییە ،بەڵام میلانۆسۆمەكان درێژو شێوەی قەدی داریان، وەك هی رەش پێستەكان،هەیە (باسمانكردووە).

٤- تۆخبوونی پێستی كۆئەندامی سێكس: تۆخبوونی نارێكی قاوەیی یان قاوەیی خۆڵەمێشی لە پۆپكە و قەدی چووك و كیلەك و زێ vagina دا هەیە، دەستكەوتەیە و تەنیا رەنگی (بۆیەی) میلانین "نەك خانەی تۆخ" پتربووە.

٥- دەڵاندنی رەنگی Incontinentia pigmenti: باسمانكرد.

٦- كۆنیشانەی فانكۆنی Fanconi syndrome: بۆماوەیی لەشی بەزیوە، لە نێرینەدا پترە لە ٤-١٠ ساڵی دا دەردەكەوێت، لە ٨٥٪ ی بارەكان دا تۆخبوونی قاوەیی و زەیتوونی گشتی روودەدات و لە خوارەوەی قەد و لۆچەكان و مل دا تۆخترە، لەسەر ئەم تۆخبوونە گشتیە، پەڵەی سپی و زۆر تاریك و تۆختر، وەك دڵۆپەی باران، هەن و كەمبوونی خەپلە و خانەی سپی و كەمخوێنی و خوێنبەربوون روودەدەن، لەوانەیە هەندێك جار شێرپەنجەی خوێن و شوێنی تر و ناتەواوی تریش هەبن وەك دواكەوتنی ژیری و سەربچووكی، ناتەواوی كۆئەندامی سێكسی و ئێسك – تاد.

چارەسەر: هۆرمۆنی زیندەپاڵكەر anabolic و گواستنەوە و چاندنی مۆخی ئێسك B.M.



**(وێنەی ٢٦٧) کۆنیشانەی ئەلبرایت.**

٧- **کۆنیشـــانەی ئـــەلبرایت** Albright's syndrome: هـــۆی نـــەزانراوە، ٣ ناســـاغی تێدایە:

١) ناسـاغی ئێسـك (**بەدگەشـەی فرەئێسـکی ریشـالی** polyostotic fibrous dysplasia).

٢) فرەچـالاکی کۆئەنـدامی کوێرەگلانـدی. **(وێنەی ٢٦٧)**

٣) تۆخبوونی قاوەیی لە ساوایی دا **لـە سـەر و قـەد و برِبـڕەی سمـت sacrum و سمـت دەست پێدەکات، ئـەم پەڵـە تۆخانـە یـەك لایـەکین unilateral و گـەورەن و لـە هێڵـی ناوەڕاستی لەش ناپەڕنەوە و لێوارەکانیان نارێکە و مشارین.**

٨- **زگماکە بەدقۆچەکاژی** Dyskeratosis congenita: **تۆخبوونی تۆڕی بەتایبەتی لە مـل و سنگ و ڕان دا لە ٥-١٣ساڵی دا دەردەکەوێت، پێشتر نینۆك تێکچوون و دواتـر یـان لەگـەڵ تۆخبوونەکە قوتکەسپیکە leukoplakiaی ناوپۆشـی چـاو و دەم و کـۆم ڕوودەدات، ڕەنـگ گۆڕانەکـــە فـــرە دەزوولـــە و پووکانـــەوەی لەگەڵدایـــە، زۆر جـــار ناســـاغی خـــوێنیش haematological abnormalities هەیە، ئەم نەخۆشیە بۆماوەیی سێکسی بەزیوە.**

٩- **دەمارەریشاڵەگمۆڵی** Neurofibromatosis: **باسمانکرد.**

١٠- **نەخۆشی گۆشەر** Gaucher's disease: **بۆمـاوەیی لەشـی بـەزیوە، ئـەنزیمی شـیکەرەوەی چەوری کەمە بۆیە مژادی چەوری لە خانـەی قـەپگر macrophage دا لـە جگـەر و سـپڵ و ئێسك دا کۆدەبێتەوە (دەبێت بە خانەی گۆشەر)، لە منداڵدا لە ٢ ساڵ دا دەیکوژێت، بـەڵام لـە باڵق adult type دا وردە وردە بۆ لاوازبوون و کەمخوێنی و تۆخبوونی گشتی و ئازاری ئێسـك و کەمبوونی خانەی سپی و خەپلە، - تاد پەرەدەستێنێت.**

١١- **پێستەوشکەی ڕەنگی** Xeroderma pigmentosum: **باسمانکرد.**

١٢- **فرەتۆخبـوونی ناسـاغی کوێرەگلانـدەکان** Hypermelanosis in endocrine disorders، **ئەمانەی خوارەوەن:**

١) **نەخۆشی ئەدیسۆن** Addison's disease : **تێکچـوونی زیندەچـالاکیە بـەهۆی کـەمبوونی هۆرمۆنەکانی ڕژێنی ئەدرینال ، بە تایبەتی کۆرتیزۆڵ و مینیرالۆکۆرتیکۆیدەکان، ئەم تێکچوونە**

لە ئەدرینال گلاند دا سەرەتاییە primary insuficiency یان دوومییە بەهۆی سستی ژێر مێشکەگلاند hypopituitarism. لە جۆری سەرەتایی دا تووشێن وەك سیل .T.B، ڤایرۆس و کەڕووی هیستۆپلازما، یان بەرگری دژەخۆیی autoimmunity یان شێرپەنجەی تەشەنەکردوو metastatic tumor هۆکارەکانن، بەڵام هەندێك جار بڕینی(وەستاندنی) کتوپڕی ستیرۆیدی سیستمی ئەم بارە دروست دەکات. جۆری دووەمی بەشێکە لە سستی گشتی ژێر مێشکەگلاند.

نیشانەکان بریتین لە: کێش دابەزین و لاوازبوون، ماندوو بوون، نزمی پەستانی خوێن ، گێژی، نەخۆری anorexia، سك ئێشە و بێ خوێنی amenorrhoea.

لە پێست دا: تۆخبوونی ئەدیسۆنی کە بریتییە لە تۆخبوونی پێست بەتایبەتی لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان، لە دەوری جێ زام، کۆئەندامی سێکسی، ناوپۆشەشانە و لە ژێر نینۆك دا روودەدات، تۆخبوونی هێڵی بەری دەست و پەنجە تایبەتمەندە، نیشانەکانی پێست naevi و موو تۆخ دەبن، مووی بەر و ژێر باڵی مێینە نامێنێت و زیپکەی عازەبە باشتر دەبێت.

چارەسەر: هۆرمۆنە کەمبووەکەی بدرێتێ.

٢) **زلبوون** Acromegtaly: تۆخبوونی وەك نەخۆشی ئەدیسۆنی هەیە.

٣) **کۆنیشانەی کوشینگ** Cushings syndrome: لە ١٠٪ی بارەکان دا تۆخبوونی ئەدیسۆنی هەیە.

٤) **فرەچالاکی ملەقۆرتەگلاند (پەریزادەی ژەهراوی)** Hyperthyroidism: لە ١٠٪ی نەخۆشەکان دا تۆخبوون هەیە، زۆربەی جار بە شێوەی بڵاو یان جۆری ئەدیسۆنیە، هەندێك جاریش وەك ماڵەی سکپڕە.

٥) **سکپڕی و پێش تێکەوتن**: بە شێوەی تۆخبوونی دەموچاو (کولمە، ناوچەوان، چەناگە) هەروەها تۆخبوونی مل، گۆی مەمك، هێڵی ناوەڕاستی سك (هێڵە رەشە linea nigra) و پێستی کۆم و کۆئەندامی سێکسی روودەدات، دوای منداڵبوون وردە وردە نامێنێت، بەڵام لەوانەیە چەند مانگ بۆ چەند ساڵێك بەردەوام بێت، هەندێك مێینە پێش تێکەوتن ئەم جۆرەیان تووش دەبێت.

٦) **حەپلەی نەزۆکاندن** Contraceptive pills: وەك جۆری سکپڕی وایە و بە خۆر تۆختر دەبێت و چەند مانگ تا چەند ساڵ دەمێنێتەوە و لەوانەیە کەم جار هەمیشەیی بێت.

٧) **فیۆکرۆمۆسایتۆما (رەنگەخانەگمۆڵی ئاسایی)** Pheocromocytoma: تۆخبوون لە هەندێك لەم نەخۆشانەدا ئەدیسۆنیە، لەگەڵیدا بەرزی پەستانی خوێن، سەرئێشە، فرەئارەقکردنەوە، دڵەکوتێ و شپرزەیی و بەرزی رێژەی کاتیکۆلەمینەکان لە خوێن دا هەن.

۱۳- **تۆخبوون لە ناساغیە سەراپاییەکان دا** Hypermelanosis in other systemic disorders:

۱) **تووشێنی درێژخایەن** Chronic infections: **تۆخبوونی پێست جێیە یان بڵاوە لە مەلاریا، کالائازار kalazar، شستۆززۆما، سیل - تاد.**

۲) **شێرپەنجە: تۆخبوونی ئەدیسۆینی لە زۆر جۆری شێرپەنجەدا روودەدات وەك شێرپەنجەی بۆری هەوا، یان ئەدینۆکارسینۆما adenocarcinoma ی گەدە، میلانۆما، لیمفۆما و نەخۆشی هۆدجکن.**

۳) **نەخۆشی کۆئەندامی دەماری** Nervous system: **تۆخبوونی ئەدیسۆنی لە نەخۆشی ولسن** Wilson's disease **، ئێپێندیدمۆما** ependymomas **، شیزۆفرینیای درێژخایەن، نەخۆشی پارکنسۆن و فشاری دەروونی درێژخایەن دا هەیە.**

٤) **ئەسکەرپووت** Scurvy، بەدمژین Malabsorption ، نەخۆشی ڤاگابۆندز Vagabonds disease(= بەدخۆراکی + پیسوپۆخڵی)، کواشیارکۆر Kwashiorkor و پێڵاگرا pellagra **تۆخبوونی لەگەڵدایە.**

۱٤- **تۆخبوون بە دەرمان** Hypermelanosis of drugs: **وەك فینۆثایازینەکان (وەك کلۆرپرۆمازین) هایدانتۆین، مەرگەمووش، دژەمەلاریا، دژە شێرپەنجە، هەڵتۆقیوی چەسپاوی دەرمان** fixed drug eruptions **- تاد.**



**(وێنەی ۲٦۸) فرەتۆخبوونی دواسۆیی.**

**١٥-فرەتۆخبوونی دواسۆیی** Post-inflammatory hyperpigmentation: **زۆر نەخۆشی پێست (دوای نەمانی نەخۆشیەکە) توخبوون جێدەهێڵێت وەك نەخۆشی گورگەسوورە، پانەپێستەسووری، برینداربوون، سەدەف، نەخۆشی دەهرینگ (ئەیوب)، تامیسکی دەمار - تاد.** (وێنەی ۲٦۸)

۱٦- **تیشك: وەك:**

۱) **پێستەسۆی بێرلۆك** Berloque dermatitis: **بەهۆی رۆنی بێرگاموت (بێرگاپتین) کە بریتییە لە پێنج میثوکسی سورالین لە ناو بۆن دا (قۆلۆنیا Eau de cologne)، لە مل و سەرەوەی سنگدا روودەدات. دڵۆپەی بۆنەکە کە تیشکی خۆری بەرکەوت ئەم تۆخبوونە قاوەییە تاریکە دروست دەکات و تا چەند حەفتە بۆ چەند مانگ لاناچێت.** (وێنەی ۲٦۹)

٢) **تیشکەپێستەسۆی رووەکی** Phytophoto- dermatitis: وەك جۆری بۆن وایە، (بەڵام بەهۆی گیا و درەخت کە بە ناویدا بڕۆین بە لاق و پێی رووت و ئەوسا بەر خۆربکەوێت روودەدات) ، پەڵەی تۆخ و قاوەیی ژمارەیی figurate و دڵۆپەیی و نارێك دروست دەبن لە سەر پێ و لاق و هەر شوێنێك بەرگیاکە یان درەختەکە کەوتبێت و هەندێك جار بڵق دروست دەبن.



(وێنەی ٢٦٩) پێستەسۆی بێرلۆك.

١٧- **تۆخبوونە پێستەستووری** Lichen pigmentosus:

لەوانەیە پەیوەندی هەبێت بە پانەپێستەستووری و هەندێك جار بە یەکەوە هەن، لەوانەیە لە منالیەوە تا پیری لە هەردوو رەگەزدا دەربچێت. پەڵەی چەند رەنگی سوور و خۆڵەمێشی بەرزبووەوە و لێوار تەنراوە infiltrated دەردەکەون، پەڵەکان لەسەر زۆربەی قەد و پەلەکان و دەموچاو یەك دەگرن ، لەسەر ئەم رەنگە بڵاوە پەڵەی بچووکی تۆختر یان کاڵتر هەن، ئەم نەخۆشیە بەردەوامە و هیچ زیانی نییە.

١٨-**تۆخبوونی دەموچاو** Facial melanosis: ئەمانەن:

١-**ماڵە** Melasma(Cloasma): زۆرباوە، دەتوانین بڵێین پتر لە ٣٠٪ی مێینە تووشی دەبێت، بەتایبەتی پێستی گەنم رەنگ ﴿پێستی جۆری ٣، ٤، ٥﴾ هەیانە، ٥ جۆری هەیە:

أ) ناوەندی دەموچاو centrofacial (جۆری پەچەیی). (**وێنەی ٢٧٠**)

ب) بازنەیی: **هێڵی یان پەتی تۆخی شێوەی چێوەی بازنە لە لایەکانی دەم وچاو بازنەیەکی تۆخ دروست دەکات.**

ج) هەموو دەم وچاو، جگە لە پەتێکی رەنگ ناسایی، لێواری پەری دەوری دەم وچاو.

د) چەند پەڵەیەك لە سەر ناوچەوان، جێ سمێڵ، ناوەراستی کولمە و چەناگە.



(**وێنەی ٢٧٠**) **ماڵە**.

هـ) یەك یان دوو پەڵە لە ناوچەوان، یان جێ سمێڵ یان چەناگە.

بە پشکنین بە تیشکی ود woods light باشتر دەردەکەوێت.

هۆکاری بنەڕەتی نەزانراوە، بەڵام هەندێك هۆکار گرنگن، وەك:

١- تێکچوونی هۆرمۆنی یان هۆی هۆرمۆنی: بۆ نموونە سکپڕی pregnancy، ئەگەر ژنێك ماڵەی تووشبوو لە کاتی سکپڕی دا ئەوە لە سکپڕی داهاتووش دا هەر تووشی دەبێت. زۆربەی ژنان دوای منداڵبوون ماڵەکەیان لە چەند مانگێك دا نامێنێت، بەڵام هەندێکیان هەر دەیانمێنێت، هەندێکیان بە چارەسەر باش دەبن و لە هەندێکی تریان دا سەرهەڵدەداتەوە.

٢- خەپڵەی نەزۆکاندن: خراپترین ئاکامی بۆ پەڵە هەیە و زۆر جار بە چارەسەریش سەرهەڵدەداتەوە.

٣- چارەسەری هۆرمۆنی، بۆ نموونە دوای لێچوونەوە.

٤- دەرمان وەك هایدانتۆین، دایلانتین.

٥- ماکیاج.

٦- خۆر و تیشکی سەروو وەنەوشەیی، هۆکاری زۆر باون.

٧- فشاری دەروونی.

٨- رەگەزی، پێستی گەنمەنگ و رەگەزی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ئیسپانیەکان زۆرتر دەیگرن.

٩- بەکارهێنانی لفکە و پەڕۆ بۆ دەم وچاو شۆردن.

١٠- تێکچوونی کوێرەگلاندەکان وەك نەخۆشی کوشینگ (کەم جار).

- لەوە دەچێت زۆربوونی ∝-MSH لە خانەی کاژی( پەڵەی ماڵە) کاریگەری هەبێت.

رێژەی ١٠٪ی بارەکان نێرینەن.

جگە لە زۆربوونی میلانین خانەی تۆخیش ژمارەیان لە ئاسایی "لە پەڵەکاندا" زۆرترە.

چارەسەر:

١- لابردنی هۆکارەکان.

٢- دوورکەوتنەوە لە خۆر.

٣- بەکارهێنانی دژەخۆر بە بەردەوامی (جۆری دژی UVB و UVA).

٤- هایدرۆکیونۆن ١-٥٪ + رێتینۆیك ئەسید + ستیرۆیدی جێیی مامناوەندی.

٥- هایدرۆکیونۆن بە تەنیا.

٦- کۆجیك ئەسید، گلایکۆلیك ئەسید، ئەزیلایك ئەسید azelaic acid ٢٠٪، ئاربیوتین arbutin، پوختەی لایکۆڕایس licorice extract.

٧- دەرمانی نوێ (ن-ئەسیتایڵ-٤-س-سیستئەمینیل فینۆڵ n-acetyl-4-s-cysteaminylphenol کە ثایۆئیثەری فینۆڵە) ڕۆژی یەك جار بۆ ٤ حەفتە و کەمتر لە هایدرۆکینۆن ورووژێنە.

٨- تاشینی کیمیکی chemical peel بە ٧٠٪ گلایکۆلیك ئەسید یان شلەی جیسنەر jessner's solution.

٩- لەیزەر - ئاکامی روون نییە.

چارەسەر بۆ ماوەی ١,٥-٦ مانگە.

٢- تۆخبوونی ریل Riehl's melanosis بریتییە لە تۆخبوونی رەش بۆ قاوەیی و وەنەوشەیی تۆڕئاسای دەم وچاو و هەندێك جار مل و پشتی دەست و باسك، لەوانەیە هۆکارەکەی فرەهەستیاری لێککەوتن یان تیشکەپێستەسۆی لێککەوتنی بۆ مژادی کیمیکی، بە تایبەتی بۆنی fragrance مکیاج ،بێت، هەر بۆیە لە مێینەدا هەیە. (وێنەی ٢٧١)



(وێنەی ٢٧١) تۆخبوونی ریل.

٣- ڕەنگگۆڕاوی سیڤات Poikiloderma of civatte: لە مێینەی باڵق دا هەیە، تیشك و مژادی ماکیاج ،کە هەستێنی تیشکی تێدابێت ،گرنگن، بەڵام لەوانەیە تێکچوونی هۆرمۆنی یان گۆڕانکاری لە ئەنجامی تەمەن دا پارمەتی دروستبوونی بدەن. تۆخبوونی قاوەیی و سووری تۆڕی لەگەڵ فرەدەزوولە و پووکانەوەی پێست atrophy بە شێوەیەکی نارێك بەڵام چونیەکی symmetrical لە دواوەی روومەت و لاکانی مل (جگە لە ژێر چەناگە)دا دەردەچێت.

٤- سوورو تۆخبوونی دەم و چاو Erythrosis pigmentata faciei: لە مێینەی باڵق دا هەیە (لە نێرینەدا زۆر دەگمەنە)، مژادی تیشکەهەستێن لە ماکیاج دا هۆکارەکەیە. سووربوون و تۆخبوونی بڵاوی چونیەکی لە دەوری دەم (بەڵام بازنەیەکی باریکی پێستی ئاسایی دەوری دەم بێ ڕەنگ تێکچوون دەمێنێتەوە) دەردەچێت و هەندێك جار بۆ سەرەوە بە ناوەڕاستی دەم وچاودا دەگاتە ناوچەوان. ئەگەر هۆکارەکەی لابرا ئەمیش نامێنێت.

٥- تۆخبوونی پیشەیی Occupational melanosis: لە کرێکاری بەرهەمەکانی قیری خەڵووزی بەردی دا وەك ئەسفەڵت و کریۆسۆت یان ڕۆنی کانزایی mineral oils

بەهۆی مژادی تیشکەهەستێنەکەی ناوی وەك ئەنتراسین، فینانثرین – تاد روودەدات.
تۆخبوونی گشتی پەرەسەندوو لەگەڵ قۆچەکاژی سەلکی، فرەدەزوولە، پووکانەوە و تەنۆچکەی پێستەستووری دەردەچن و لەوانەیە قۆچەکاژی و شێرپەنجەش دروست بن.

### فرەبوونی خانەی تۆخی بنتوێژ Dermal melanocytosis

بریتییە لە تۆخبوونی خۆڵەمێشی، شین یان قاوەیی خۆڵەمیشی، بە هۆی بوونی خانەی تۆخی چالاك لە بن توێژدا، چونکە ئەم میلانۆسایتانە نەیانتوانیوە لە ژیانی کۆرپەلەیی دا لە پۆپنەی دەمارەوە neurald crest "کە دروست دەبن" بگەنە شوێنی ئاسایی خۆیان کە چینی بنکەیی توێژە. ئەمانەی خوارەوەن:

(وێنەی ٢٧٢) پەڵەی مەنگۆلی.

١ – پەڵەی مەنگۆلی Mongolian spot: لە ساوادا زۆر باوە، لە منالی رەش پێست دا کەمترە. پارچەی قاوەیی خۆڵەمێشی یان رەش و شین، سنوور نائاشکرا و هەندێك جار زۆر گەورە لە بڕبڕەی کەمەرە و سمت lumbosacral areaدا دەردەچێت، دوای چەند ساڵێك نامێنێت.
(وێنەی ٢٧٢)

٢ – نیشانەی نۆتا Naevus of Ota: زگماکیە، بەڵام لەوانەیە لە تەمەنێکی درەنگتر دەرکەوێت، لە یابانیەکان دا زۆر باوە بەڵام لە رەگەزی تردا وەك ئێمە کەمترە. (وێنەی ٢٧٣)
تۆخبوونی قاوەیی و خۆڵەمێشی یان شین لە یەك لای دەموچاو کە دەماری ترایجێمینالی (کەللە دەماری پێنجەم – لقی یەك و دوو) تێدایە دەردەچێت، سپێنەی چاو، پەرگلێنە، گلێنەی چاو iris، تۆڕەی چاو retina، ماسولکەی چاڵی چاو و چاڵی چاویش لەوانەیە بگرێتەوە و هەندێك جار مەلاشووش. لەوانەیە میلانۆمای پێست و چاو و مێشکی تێدا دروست بێت.

(وێنەی ٢٧٣) نیشانەی نۆتا.

٣- نیشانەی نیتۆ Naevus of Ito: لە یابانیەکان دا باوە، تۆخبوونی شین لە شان و سەروی قۆڵ و پێستی سەر ئێسکی چەڵەمەدا دروست دەبێت.

٤- تۆخبوونی لیوی Urticaria pigmentosa: لە منالّی دا پەڵەی "گەورەتر لە ٢سم" قاوەیی کاڵ و هەندێك جار گرێیی nodular بەلاّم لە بالّق دا پەڵەی بچووکتر و زۆرتری ئەرخەوانی و قاوەیی بلاّوبووەوە لەسەر قەد و پەلەکان دەردەچن.

### تۆخبوونی زەرد Yellow pigmentation

لە ئەنجامی ئەمانەی خوارەوە روودەدات: زەردوویی jaundice، زۆری کارۆتین لە خوێن دا carotenemia، دەرمانی میپاکرین – تاد.

### تۆخبوون بە خوێنئاسن نیشتن Haemosiderosis

خوێن تێچوونی پێست دەبێتە هۆی تۆخبوونی سووری تاریك یان قاوەیی تاریك لەگەڵ تۆخبوونی ئاسایی وەك: خوێنهێنەگمۆڵ و داسە بێ خوێنی sickle cell anemia و نەخۆشی شامبەرگ Shamberg's disease لە لاقەکان دا، دەرمان، جلوبەرگ ( لە لۆچەکان دا)، رەنگبوونی خوێنی (خوێن رەنگاڵە) haemochromatosis.

### تۆخبوونی کانزایی Metalic pigmentation

وەك:

١-زیو (ئەرجیریا argyria): تۆخبوونی شین و خۆڵەمێشی لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان و هەندێك جار هەموو پێست.

٢-ئاڵتوون: خۆڵەمێشی شین و کەمێك ئەرخەوانی لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان.

٣-بسمۆث bismuth: وەك هی زیوە بەلاّم لە پووك دا زۆر زەقە.

٤-جیوە: قاوەیی خۆڵەمێشی لە شوێنە بەرکەوتووەکان (مەرهەم).

٥-قورقوشم lead: زەردباو و شینە و لە سەر پووکیش دروست دەبێت.

### رەنگبوونی خوێنی ( خوێن رەنگاڵە ) Hemochromatosis (Bronz ds.)

لە سیانەی (بەریشاڵبوونی جگەر + نەخۆشی شەکرە + تۆخبوونی پێست) پێك دێت.

هۆکارەکەی:

١- جۆری سەرەتایی (هۆنەزانراو).

٢- بۆماوەیی لەشی بەزیوو.

٣- بە ئاسن ژەهراوی بوونی درێژخایەن.

٤- نەخۆشی جگەری درێژخایەن.

٥- زێدەئاسنی iron overload (بەژەهربوونی ئەلکهولی درێژخایەن) لە پێست دا:

لەوانەیە پێست تۆخبوون چەند ساڵ پێش نیشانەکانی تر یان درەنگتر دەرکەوێت. تۆخبوونی قاوەیی خۆڵەمێشی بە تایبەتی لە دەم وچاو و لۆچەکان و شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان و هەندێك جار ناوپۆشی ناودەم دەردەچێت، هەندێك جار مووڕووتانەوە ٧٥٪، نینۆکی کەوچکی ٥٠٪ و ڕێژەی ٤٥٪ پێست وشکی" وەك نەخۆشی ماسی" لەگەڵدایە، کەمتر لەوانەی سەرەوە سووربوونەوەی بەری دەست، هێڵبوونی نینۆك، سپی بوونی نینۆك و بۆریە گمۆڵ angioma هەن.

گەورەبوونی جگەر، نەخۆشی شەکرە، پووکانەوەی گون، نەخۆشی دڵ، کێشدابەزین و جومگەسۆ نیشانەکانی ترن.

**چارەسەر**: خوێن لێگرتن (یەکالاکردنەوەی خوێنهێنەر venesection) تا ئاستی ئاسنی جگەر بۆ ١٠٠ مایکرۆمۆڵ/گم دادەبەزێت.

## کەمڕەنگی پێست (سپیڕەنگی پێست) Hypomelanosis

١- **کەوری** Albinism: لە پێست دا بۆماوەیی لەشی بەزیوە ، دوو جۆری سەرەکی هەن:



(وێنەی ٢٧٤) کەورێی پێست و چاو.

أ) **کەورێی پێست و چاو** Ocutocutaneous A.: ئەمیش چوار جۆرە:

١- جۆری I: بەهۆی بازدانی جینی تایرۆسینەیس tyrosinase ڕوودەدات و ڕێژەی ٤٠٪ ی نەخۆشەکانە، ئەمیش دوو جۆرە، جۆری I أ Type IA کە زۆر توندە severe و بۆیەی میلانین بەهۆی ناچالاکی تەواوی ئەنزیمەکە بە تەواوی نەماوە و دەبێتە هۆی کەورێی تەواوی پێست . بینینی چاو visual acuity بۆ ٢٠/٤٠٠ کەمدەبێتەوە بەلام لە جۆری اب type IB، چالاکی ئەنزیمەکە زۆر کەمە و نەخۆشەکان لەگەڵ کات دا هەندێك تۆخبوونی پێست و موو و چاویان دەبێت و بە خۆر کەمێك گەنمڕەنگ دەبن. (وێنەی ٢٧٤)

٢ – جۆری ٢: ڕێژەی ٥٠٪ی نەخۆشەکانە، بەهۆی بـازدانی جینـی P ڕوودەدات، لەوانەیـە نەخۆشەکان بە تەواوی سپی بن یان پێستیان ئاسایی بێت یـان لـە نێـوان ئـەم دوو بەشـە دابن، کە سپی بن لەگەڵ کات دا تۆختر دەبن و بینینی چاویش باشتر دەبێت.

٣ – جۆری ٣: بەهۆی بازدانی جینی ٩ ڕوودەدات، لە ئەفریکا دا هەیە، مـوو قـاوەیی کاڵـە، پێـستیش هـەروەها، گلێنـەی چـاو قـاوەیی شـینە، چـاوەفڕێ nystagmus لەگـەڵ کەمبوونی بینینی چاو هەن.

٤ – جۆری ٤: بازدانی جینی لە کرۆمۆسۆمی ٦ ڕوودەدات، وەك جۆری ٢ وایە، لە یابـان دا باوە.

ب) کەوڕیی چاو Ocular albinism: زۆر جۆری هەیە بەڵام ڕەنگی پێست ئاساییە.

نیشانەکانی کەوڕێ: هەموو پێست بە تەواوی سپی بووە، بەڵام وەك وتمـان لەگـەڵ کـات دا هەندێك تۆخبوون لـە بەشێك لـە نەخۆشەکان دا بەپێی جۆرەکـەی ڕوودەدات، بـە خـۆر زوو دەسووتێن و شڵی باوە و لەوانەیە ئاکامی بەدیش، بەهۆی خۆر، درووست بن وەك قۆچەکاژی خۆری solar keratosis و شێرپەنجە.

چارەسەر: خۆپاراستن لـە خـۆر، بـەکارهێنانی دژەخـۆر، زوو دەستنیشـانکردنی شـێرپەنجە و سازدانی نەشتەرگەری بۆی.



(وێنەی ٢٧٥) نیمچە کەوڕێ.

٢ – نیمچـەکەوڕێ Piebaldism (وێنـەی ٢٧٥): بۆماوەیی لەشی زاڵە و زۆر باو نییە، بازدانی جینـی لـە کرۆمۆسـۆمی $4q_{12}$ ڕوودەدات، ناساغیەکە لە کـاتی لـەدایکبوون دا هەیـە و بریتییە لـە سـپی بـوونی مـووی پێشـی سـەر white forelock و پێسـت سـپیبوونی پەڵاوی، پەڵە سپیەکان چەسپاون و لە پێش و دواوەی قەد دان، ناوەڕاستی قۆڵ تا مەچـەك، ناوەڕاستی ڕان تا ناوەڕاستی لاق و لـە پێشـی لاق. دیاردەیـەکی تـر ئەوەیـە کـە پەڵـەی تـۆخ hyperpigmented macules لە سەر پەڵە سپیە گەورەکان و لەسەر پێستی ئاسـایی دا هەن، پەڵەی سپی سێگۆشەیی لە ناوەڕاستی پێشی سەر یان ناوچەوان دا هەن و لەوانەیـە بەشـی ناوەوەی برۆ و برژانگیش سپی بن، خانەی تۆخ لە پەڵە سپیەکان دا نەماون.

چارەسەر: چاندنی خانەی تۆخ لە پەڵە سپیە یەکان یان لابردنی رەنگی ئاسایی بە بینۆکوین بۆ چەند ساڵێك.

٣- **کۆنیشانەی واردن بەرگ** Waardenburg's syndrome: بۆماوەیی لەشی زاڵە و دەگمەنە، ٤ جۆری هەیە، تێیدا نیمچەکەوڕی piebaldism (٢٠٪ی نەخۆشەکان)، دوورتربوونی نێوان هەردوو چاو hypertelorism، چڕبوونی سێیەکی ناوەوەی برۆکان،جیاوازی رەنگی گلێنەی چاوەکان irides و کەڕی deafness هەن. لەگەڵ کات دا پێست کەمێك گەغرەنگ دەبێت. (وێنەی ٢٧٦)


**(وێنەی ٢٧٦) کۆنیشانەی واردن بەرگ.**

٤- **کەمرەنگی ئیتۆ** Hypomelanosis of Ito

هۆکاری نەزانراوە، سپی بوونی پێچاوپێچ و سووڕاوە یەك یان دوو لایەکی uni-or bilateral هاوتەریبی بۆ پەراسووەکان هەیە، لە پێست دا وەك درەختی سنەوبەری هەڵگەڕاوە وایە، لەوانەیە لە هەموو شوێنێکی پێستدا دەربچێت، لە کاتی لەدایکبوونەوە هەیە، لەوانەیە لەگەڵ کات دا تۆخ بن، ناساغی تری لەگەڵدایە وەك ناساغی کۆئەندامی ماسولکە و ئێسك و ددان و چاو و کۆئەندامی دەماری ناوەندی. (وێنەی ٢٧٧أ)


**(وێنەی ٢٧٧ ب)**
**کەمرەنگی دڵۆپەیی هۆ نەزانراو.**


**(وێنەی ٢٧٧ أ)**
**کەمرەنگی ئیتۆ.**

٥- **کۆنیشانەی ڤۆگت – کۆیاناگی – هارادا** Vogt-Koyanagi-Harada syndrome: لە رەش پێست دا پترە و جۆرێکە لە ناساغی بەرگری دژەخۆیی خانەیی (جۆری ٤) کە تێیدا دژە ژیندەرە خۆییە دەرکەوتووەکان تەنیا لە خانەی تۆخ دان. ئەم نەخۆشیە تووشی

چاو و پێست و کۆئەندامی دەرماری ناوەندی دەبێت، لە پێست دا مووڕووتانەوە، بەڵەکی و سپی بوونی مووی سەر و برۆ و برژانگ و ژێرباڵ روودەدەن.

٦- **کەمڕەنگی وەرگیراو** Acquired hypomelanosis: ئەمانەی خوارەوەن:

١) هۆکاری کوێرەگلاندەکان وەك: کەم چالاکی ژێر مێشکەگلاند hypopituitarism (کەمڕەنگی بلاو دروست دەکات)، نەخۆشی ئەدیسۆن Addison's disease (پەڵەی سپی ،وەك بەڵەکی، درووست دەکات)، نەخۆشی ملەقۆرتەگلاند (پەڵەی، وەك بەڵەکی، درووست دەکات).

٢) هۆکاری کیمیکی (پیشەیی یان چارەسەری): وەك مۆنۆبێنزایل ئیثەری هایدرۆکینۆن واتا مۆنۆبێنزۆن (پەڵەی سپی،وەك بەڵەکی ،دروست دەکات)، کلۆرۆکوین و هایدرۆکسی کلۆرۆکوین (کەمڕەنگی پەلاوی دروست دەکەن).

٣) هۆکاری خۆراکی nutritional factors: کەمی پرۆتینی درێژخایەن وکەمخوینی توند (pernicious anemia) نەمانی ڕەنگی (بۆیەی )موو واتا قژسپیبوون دروست دەکەن .

٤) دواسۆیی post inflammatory: وەك لە دوای، بیرۆ (کرێژە سپیە pityriasis alba) و سەدەف و کەرووی کاژە فرەڕەنگی pityriasis versicolor و سارکۆید و گورگەسوورە و پانەپێستەستووری .

٥) توورشێن infections: وەك لە دوای،سفلس (فەرەنگی)، پینتا pinta و یاوس yaws و گولی leprosy.

٦) لوو: میلانۆما ( پەڵەی وەك بەڵەکی درووست دەکات).

٧) أ- کۆنیشانەی ڤۆکت – کۆیاناگی – هارادا. **باسمانکرد.**

ب- کەمڕەنگی دلۆپەیی هۆنەزانراو Idiopathic guttate hypomelanosis: بە تایبەتی لە مێینەدا زۆر باوە، دوای تەمەنی ٤٠ ساڵی ١٠-٣٠ پەڵەی ( بە قەبارەی ٢-٦ ملم) کاڵ ( سپی شیری) لە پێستی لاق shins و باسك forearms دەردەکەون، بەلام هەندێك جار پترن، لە قەد و دەم وچاو دا نین، شێوەیان نارێکە و سنووردارە sharply defidned، تەمەن و خۆر هۆکارن و زۆر لە بەڵەکی دەچێت. چارەسەر: تەزینەچارە cryotherapy رواڵەتی پەڵەکان جوانتر دەکات.(وێنەی٢٧٧ب )

## ٧- بەڵەکی vitiligo

نەخۆشیەکی باوە، ١-٢٪ خەڵکی لە هەردوو رەگەزدا تووشی دەبن، زۆر بە دەگمەن زگماکییە، بەڵام لە کاتی لەدایکبوونەوە تا تەمەنی ٨١ساڵی تۆمارکراوە، هەرچەندە زۆربەیان لە ١٠-٣٠ ساڵی لێیان دەردەکەوێت(وێنەی ٢٧٨).

هۆکارەکان:





(وێنەی ٢٧٨) بەڵەکی.

١) بۆماوەیی (فرەجینی یە polygenic).

٢) بەرگری دژەخۆیی autoimmunity. ئەم بۆچوونە لە هەموویان باوترە و زۆر نەخۆشی بەهۆی بەرگری دژەخۆیی لەگەڵ بەڵەکی دا رێژەیان لە ئاسایی پترە وەك کەمخوێنی توند، نەخۆشی ئەدیسۆن، نەخۆشی شەکرە، نەخۆشی ملەقۆرتەگلاند، دەردەرێوی - تاد).

٣) خۆلەناوبردن self-destruction: واتا خانە تۆخەکان خۆیان لەناودەبەن بەهۆی نەبوونی کاری خانە پاراستنی ئاسایی کە لەباری ئاسایی دا مژادی ژەهراوی میلانین لادەبات.

٤) بیردۆزی دەماری neurogenic theory.

کەواتا بەڵەکی لە ٤٠٪ بارەکان دا بۆماوەییە و زۆر جار بۆ دروستبوونی هۆکاری چالاکێنی پێویستە، بۆ نموونە زەبر trauma، چونکە لە سێیەکی نەخۆشەکان دا دیاردەی کۆبنەر ،کە هەندێك جار تیشکی خۆرە ،هەیە.

نیشانەکانی:

پەڵەی نموونەیی بەڵەکی رەنگی سپی شیرییە، خڕ یان بازنەییە، لێواری پەڵەکان فلچەیی یان رێکە، قەبارەکەی لە چەند"ملم" بۆ چەند" سم" دەبێت و جگە لە رەنگ سپیبوون گۆڕانکاری تری تویژی تێدا نییە. بەڵام چەند جۆرێکی تر لە رەنگی پەڵەکە هەیە، وەك بەڵەکی سێ رەنگی trichrom V. کە بریتییە لە رەنگی ناوەندی، واتا رەنگی نێوانی شیری سپی و رەنگی ئاسایی پێست، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ئەم رەنگە مامناوەندیە بۆ رەنگی سپی دەگۆڕێت. رەنگی چوارەم

(بەڵەکی چوار ڕەنگی .quadrichrom V)،جگە لە سێ ڕەنگەکە تۆخبوونی دەوری سەلکی perifollicular یان لێواری margin پەڵە سپی یەکە هەیە ( ئەمە لە قۆناغی چاکبوونەوە دا دەردەچێت).

بەڵەکی پێنج ڕەنگی .pentachrom V: بریتییە لـە ڕەنگـی سـپی + ڕەنگـی مامناوەنـدی (گەغرەنگبوون tan) + تۆخبوونی قاوەیی + شین و خۆڵەمێشی + ڕەنگی ئاسایی پێست.

بەڵەکی شین .blue V: بریتییە لە دروستبوونی بەڵەکی لە شوێنی تۆخبوونی دواسۆیی دا.

بەڵەکی سوێیی .inflammatory V: لێواری پەڵە سپی یە کە بـەرزبووەوە و سـوورە و لـە کەڕووی کاژە فرەڕەنگی pityriasis versicolor دەچێت.

سووربوونەوەی پەڵەی بەڵەکی دوای بەرخۆرکەوتن ڕوودەدات.

ژمارەی پەڵەی بەڵەکی لە یەك پەڵە تا چەند پەڵەیەك تا سەدەها پەڵەیە، بچـووك یـان گـەورەن. لەگەڵ کات دا پەڵـەکان گـەورەتردەبن و یـەك دەگـرن، کـە زۆربـەی لـەشـی گرتـەوە پەڵـە ئاساییەکان ناوچاڵن concave.

**جۆرەکانی بەڵەکی:**

١- جۆری مۆڵگـەیی .Focal V: یەك شوێن "وەك پۆپکەی چووك" یان بە شێوەی ناچوونیەکی asymmetrically یـەك ئاسـتەدەمار a single dermatome یـان پـەتێك band دەگرێتەوە. ئەم جـۆرە لـە تەمـەنێکی زووتـردا دەردەکـەوێت و کـەمتر ناسـاغی بـەرگری دژەخۆیی تـری لەگەڵدایـە و زۆر بەرهەڵـستی چارەسـەر دەکـات، ڕێـژەی ٥٪ی بـاڵق و ٢٠٪ی منداڵ ئەم جۆرە بەڵەکیەیان هەیە.

٢- جۆری گشتی .Generalized V (= چوونیەکی بلاو Common symmetric): لە هەموو جۆرەکان باوترە، بە شێوەیەکی چوونیەکی symmetrical دەم وچـاو، سـەرەوەی سنگ، پشتی دەست، ژێرباڵ و پەناڕان و پێستی دەوری کونەکانی لەش وەك دەوری چاو و لووت و دەم و گوێچکە و گۆی مەمك و نـاوك و چـووك و کیلـەك و کـۆم دەگرێتـەوە، چونکە بەڵەکی لە شوێنی زەبر دەردەچێت بۆیە ئالیشك و ئەژنۆش زۆر تووشی دەبن.

٣- جۆری سەرجەمی (سـەراپایی) .Universal V: هەموو پێست یان زۆربەی لـەش بەڵـەك دەبێت.

٤- جۆری پەل و دەموچاو .Acrofacial V: پەنجە سەرپەڕەکان و کونەکانی دەم وچاو وەك لێو و سەری لـووت – تاد بەڵەك دەبن.

بەڵەکبوونی پێست لـە دەوری نیشانە naevi و شێرپەنجەی میلانۆمـا هەنـدێك جـار ڕوودەدات (جۆری خەرمانە Halo vitiligo) و لە نەخۆشی بەڵەکی دا نیشانەی خەرمانـە بـاوە. پەڵـەی

بەڵەکی بە ت س و و خۆر هەستیارە و سووتان زووتر ڕوودەدات، ناساغی چاو لەگەڵ نەخۆشی بەڵەکی دا پترە، وەك گلێنەسۆ iritis و تێکچوونی ڕەنگی تۆڕەی چاو، ئەم نەخۆشیە باری دەروونی نەخۆش تێك دەدات.

## بەڵەکی پیشەیی .Occupational V

مۆادە کیمیکەکان وەك ثایۆلەکان thiols، ئاوێتە فینۆلەکان، کاتیکۆڵەکان، مێرکەپتۆئەمینەکان و کوینینەکان quinines (وەك کلۆرۆکوین) لەو شوێنانەی کە بەر پێست دەکەون بەڵەکی دروست دەکەن، بۆ نموونە کرێکاری جلی لاستیکی یان دەستکێشی لاستیکی (کە مۆنۆبێنزایل ئیثەری هایدرۆکوینۆن)ی تێدایە، فینۆڵەکان وەك بیوتایڵ فینۆڵ، ئەملیفینۆڵ، بیوتایڵ کاتیکۆڵ و سەلفیدرپلەکان، سەرچاوەیەکی ئەمانە بریتییە لە پاکژکەری دژە بەکتریا لە نەخۆشخانە، پلاستەر و کەتیرەی پێڵاو و بازنەی مەچەك، پلاستەر، مۆادی جیری سوخمەی مەمك، کۆندۆم، سەرجەمی ئامێری تەواری دڵ – تاد. (وێنەی ٢٧٩)



(وێنەی ٢٧٩) بەڵەکی پیشەیی: أ) بەهۆی پاکژکەری کیمیکی.
ب) بەهۆی کرێمی هایدرۆکوینۆن.
جـ) بەهۆی کرێمی MBEH لەکارگەی وەبەرهێنانیدا.

نەخۆشی بەڵەکی لەگەڵ موو سپی بوون لە پەڵەکان دا یان سپی بوونی مووی لەشی پێش وەخت (نابەکام) premature greying یان دەردە ڕێوی بەیەکەوە باون، هەندێك جار بەبێ بوونی پەڵەی بەڵەکی موو سپی دەبێت، موو سپی بوونی بڵاو بۆ داهاتووی نەخۆشی بەڵەکی نیشانەیەکی بەدە.

کە بەڵەکی لە دەوری نیشانە دروست بوو ئەوە بەڵەکیەکە پەرەدەستێنێت و لە ئاکام دا نیشانەکە نامێنێت. ڕێژەی ١٦٪ی نەخۆشی بەڵەکی دەردە ڕێوی لەگەڵ دایە.

ڕێژەی ١٠–٢٠٪ی نەخۆشەکان بێ چارەسەر چاك دەبنەوە، ئەم نەخۆشیە درێژخایەنە و ناوبەناو پەرەدەستێنێت و ناو بەناو دەوەستێت. بە چارەسەر ٥٠–٦٠٪یان کەڵك وەردەگرن.

## چارەسەر

١- **پاراستن لە خۆر**: بەکارهێنانی دژەخۆر جۆری پەرچدەرەوە reflectant type کە ZnO یان $TiO_2$ یان تێدایە. چونکە بە خۆر پەڵەی بەڵەکی دەسووتێت لەوانەیە هۆکاریش بێت بۆ دەرچوونی پەڵەی نوێ بە دیاردەی کۆبنەر، جگە لەوەش خۆر رەنگی ئاسایی پێست تۆختر دەکات بەمەش پەڵە سپیەکان زەقتر دەردەکەون.

٢- **چارەسەری دەروونی**: بە کەڵکە،چونکە ئەم نەخۆشیە درێژخایەنە و رێژەی چاکبوونەوە بە چارەسەر نیو بە نیوە.

٣- **ماکیاج**: ماکیاجی ئاسایی بۆ داپۆشینی پەڵە سپیەکان لەبارەی کۆمەڵایەتیەوە زۆر بەکەڵکە، بەڵام بە ئاو لادەچێت، لەبەر ئەوە بۆیەی بە ئاولانەچوو باشترە،وەك ٥٪ دایهایدرۆکسی ئەسیتۆن لە ناو شلەی رۆن لەناو ئاو.

٤- **تاتو (خاڵ کوتان)ی جوانکاری** cosmetic tattooing: بۆ بەڵەکی چەسپاوی جێیی بە تایبەتی ناوپۆشەکان. (ئۆکسیدی ئاسن دەخرێتە ناو بن توێژ).

٥- **بەڵەککردنی پەڵەی ئاسایی پێست**: ئەگەر زۆربەی لەش بەڵەك بوو (پتر لە ٥٠-٨٠٪ی لەش) ،لەم بارەدا رەنگی ئاسایی پێست، کە بەڵەك نەبووە ،بە هەمیشەیی بە کرێمی مۆنۆبێنزایڵ ئیثەری هایدرۆکوینۆن ٢٠٪ monobenzyether of hydroquinone (MBEH) 20% بەڵەکی دەکەین ،رۆژی ٢ جار بۆ ٩-١٢ مانگ (٩٠-٩٥٪ سەرکەوتووە) و لە ٢-٣ مانگ دا کارتێکردنەکەی دەردەکەوێت، بەڵام پێستەسۆی لێککەوتن لە ١٥٪ی نەخۆش دا دەردەچێت، بە دەگمەن دوای بەرخۆرکەوتن چەند پەڵەیەکی تۆخ دروست دەبنەوە بۆ ئەمەش مانگێك یان پتر کرێمەکە بەکاردەهێنینەوە.

لە بەکارهێنانی کرێمی MBEHدا جگە لەو شوێنەی کرێمەکەی لێدەدەین بەڵەککردنی چەند پەڵەیەکی دوور ،کە کرێمەکەی بەر نەکەوتووە،روودەدات. بۆ ئەوەی سپی بوونی پێست کەمتر دیاربێت ئەوە بێتاکارۆتین B-carotene ٣٠-٦٠ ملگم/رۆژ بەکاردەهێنرێت.

**هەر بۆ ئەم مەبەستە**: کرێمی ٤- میثۆکسی فینۆل ٢٠٪ 4-methoxyphenol یان لەیزەری Q-switched Ruby laser بۆ بەڵەککردن بەکاردەهێنرێت .لەیزەر و کرێم بەیەکەوە کاریگەرترن.

٦- **تۆخکردنەوە** repigmentation:

أ) **لە منداڵ دا**: ١) کرێمی دژەخۆر، ٢) ماکیاج ٣) ستیرۆیدی جێیی سووك و مامناوەندی، ٤) بۆ بەڵەکی کەم پسۆراڵینی جێیی topical psoralens، ٥) ت س ر تەسك narrow band UVB بۆ منداڵی بەتەمەنتر لە ٦ ساڵ باشترین چارەسەرە، ٦) دوای تەمەنی ١٠ ساڵی پسۆراڵین بەدەم + خۆر یان UVA.

ب) **له باڵق دا:**

١- **ستیرۆیدی جێیی ماماوەندی و بەهێز وەك فلوسینۆلۆن**، کلۆبێتازۆل، بەڵام بۆ دەم وچاو و ژێربالّ یان لـه منال دا هایدرۆکۆرتیزۆن بەکاردەهێنرێت، رۆژی یەك جار بۆ ٣ حەفتە و یەك حەفتە پشوودان ئەوسا دووبارەدەکرێتەوە، ئەگەر لـە ماوەی ٢ مانگ دا تۆخبوونەوە دەرنەکەوت ئەوە دەیوەستێنین. لـەوانەیە ئەم چارەسەرە پێست بپوکێنێتەوە.

٢- **ستیرۆیدی سیستمی** systemic steroids: هەرچەندە کاریگەریەکی ماماوەندی هەیە، بەڵام لـەبەر ماکەکانی بە دەگمەن و بۆ کاتێکی سنووردار بەکاردەهێنرێت.

٣- **تاکرۆلیمۆس یان پیمیکرۆلیمۆسی جێیی** topical tacrolimus or pimecrolimus: بۆ منالّ زۆر لـەبارە، شەوی یەك جار بەتایبەتی بۆ دەم وچاو و مل بۆ پتر لـە ٣ مانگ. ئەم کرێمە پووکانەوەی پێست دروست ناکات و ڕێژەی٧٥٪-٩٠٪ی نـەخۆش پێـی چـاك دەبن ، بەڵام بۆ قەد تەنیا ٢٥٪ کاریگەرە. بەیەکەوە لـەگەڵ سـتیرۆیدی جێـیی ئاکـامی باشترە.

٤- **ت س و تەسك** narrow band UVB 311nm: باشـترین چارەسـەرە، حەفتـەی ٢ جار، نزیکەی ٥٠٪ی نەخۆشەکان پتر لـە ٥٠٪ی بەڵەکیەکەیان چاکدەبێتەوە بە تایبەتی بۆ دەم وچاو و قەد و قۆڵ و لاق، بەڵام لە بەڵەکی دەست و پێ دا کـەمتر لـە ٢٥٪ی نەخۆشەکان کەڵکی لێوەردەگرن. بۆ چەند مانگ یان پتر بەکاردەهێنرێت.

٥- **گچکەتیشکەچارەی ت س و تەسك** narrow band UVB microphototherapy: ت س و B (٢٨٠-٣١٥ نم) بە ئامێری تایبەتی ،ئاڕاستەی پەڵە سپیەکان دەکرێت، ئـەم جۆرە گرانە و کارمەندی تایبەتی پێویستە، بۆ ١٢ مانگ بەکاردەهێنرێت . ڕێـژەی ٧٠٪ ی نەخۆشەکان ٧٥٪ی بەڵەکیەکەیان چاکدەبێتەوە.

٦- **کیمیکەتیشکەچـارەی جێـیی** topical photochemotherapy: بـە بـەکارهێنانی شلـەی ٨- میثۆکسي پسوڕالین 8-methoxy psoralen (٠,٠٥-٠,١٪) لـەگەڵ ت س و A (دوای چەند خولـەکێك تا یەك کاتژمێر) بۆ جۆری سنووردار یـان مۆڵگـەیی ،بەڵام لـەوانەیە سووتان و بڵق دروست بکات.

٧- **کیمیکەتیشکەچارەی سیستمی** systemic photochemotherapy (= پوڤا Puva). خەپلـەی ٨- میثۆکسي پسـوڕاڵین (8-MOP) یـان ٤، ٥، ٨ ترایمـەثیـل پسـۆڕالین (TMP) یان ٥- میثۆکسي پسۆڕاڵین (5-MOP) بە ژەمی ٠,٦ ملگم/ کگم،دوو کاتژمێر دواتر خۆر یان UVA بەکاردەهێنرێت، بـەڵام ژەمـی تیشـکەکە جـار بـە جـار زۆرتر دەکرێت،بۆ ئەوەی پێست رابێت و سووتان دروست نەبێت،بۆ ٦ مانگ تـا چـەند

ساڵ، بەڵام کە لە ٣-٦ مانگ دا تۆخبوون دەرنەکەوت ئەوە وازی لێدێنین (٥٠ جار بەکارهێنان) ،نزیکەی ١٠٠-٢٠٠ جار بەکارهێنان پێویستە.
بەکارهێنانی کالسیپۆتریۆل calcipotriol (جێیی) بە تەنیا بێسوودە، بەڵام لەگەڵ پوڤا یان ت س و تەسك دا بەکەڵکە.

٨- **لەیزەری ئێگزایمەر ٣٠٨ نم** 308nm excimer laser: نوێترین و کاریگەرترین چارەسەرە ،بە تەنیا یان لەگەڵ تاکرۆلیمۆس یان پیمیکرۆلیمۆس، حەفتەی ٣ جار بۆ ٢١ جار (٧ حەفتە) یان پتر.

٩- **تیشکی تاکەڕەنگی ئێگزایمەر ٣٠٨نم** monochromatic eximer light 308nm: هەروەك لەیزەری ئێگزایمەر ئەنجامی هەیە، بەڵام بەکاتێکی کەمتر رووبەرێکی زۆرتر چارەسەر دەکرێت.

١٠- **ل-فەنیل ئەلانین + ت س و** A، L-phenylalanine + UVA: وەك پوڤا ئەنجامی هەیە.

١١- **کێللین + ت س و** A Khellin + UVA وەك پوڤایە.

١٢- **کرێمی پسودۆکەتەلەیز و کالسیۆم + ت س و** B، pseudocatalase cream + UVB + $CaCl_2$ ئەم کرێمە ،لەگەڵ کلۆریدی کالیسیۆم، رۆژی ٢ جار لە پەڵە سپیەکان دەدرێت و دوای یەك کاتژمێر هەموو لەش ت س و B لێدەدرێت، حەفتەی ٢ جار.

١٣- **کرێمی** 5FU (٥- فلۆرۆیۆراسیل) رۆژی ١ جار لە ژێر بەستن دا بەکەڵکە.

١٤- **لیڤامیسۆڵ** levamesole (بەرگری گۆڕ immunomodulator) ١٥٠ ملگم/رۆژ، دوو رۆژی بەدوای یەك دا لە حەفتەیەك دا بۆ ٤-٤٨ مانگ بەکەڵکە.

١٥- **نەشتەرگەری** surgery: کە هەموو چارەسەرەکانی تر بێسوودبوون، بەکاردەهێنرێت، بە تایبەتی بۆ بەڵەکی پارچەیی segmental V. یان جێیی و جێگیر stable بێت (بۆ پتر لە ٢ ساڵ). پێش نەشتەرگەریەکە پوڤا بۆ دیاریکردنی ئەو پەڵانەی کە تۆخ نابنەوە بەکاردەهێنرێت و دوای نەشتەرگەریەکەش هەر بەکاردەهێنرێت، ئەمانەی خوارەوەن:

١- **چاندنی توێژ** epidermal grafting: دوای تاشین dermabrasion چاندنی توێژی تەنکی بۆ دەکرێت و پتر لە ٨٠-٩٠٪ی چاندنەکە سەرکەوتووە و ٦-٧ مانگی بۆ تۆخبوون پێویستە.

٢- چاندنی متوربەی بچووك minigrafting: چاندنی نقورچەمتوربەی ١٢ ملم "punch graft" بۆ پەڵەی بەڵەکی بچووك. (دانانی ٤ متوربەی ١,٥ ملمی بۆ ١ سم٢).

٣- چاندنی بڵقی توێژ epidermal blisters:

٤- چاندنی خانەی تۆخی چێنراو cultured melanocytes.

٥- تێکەڵەی (هەڵواسینی) توێژی نەچێنراو non cultured epidermal suspension.

٦- چاندنی تاکەموو single hair grafting: بەتایبەتی بۆ برۆ و برژانگ و پەڵەی بەڵەکی بچووك.

چاندن کارێکی بەئەرکە، بەڵام ئەنجامی زۆر باشی هەیە.

تێبینی: لە نموونە وەرگرتن دا خانەی تۆخ لە پەڵە سپیەکان دا نین.

## گێزەرێنی خوێن Carotenaemia

کارۆتین (گێزەرێن) چەورەڕەنگە lipochrome و زەردباوی پێستی ئاسایی دروست دەکات، ئەگەر ڕێژەی لە خوێن دا بەرزبۆوە زەردباویەکە بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە چینی کاژ تێیدا ئەستوورە پتر دەبێت وەك بەری دەست و پێ،چونکە چەوری ژێر پێست لەم شوێنانەدا زۆرە. سپێنەی چاو وەك لە زەردوویی دا jaundice زەردنابێت.

کارۆتین لە گێزەر و پرتەقاڵ دا زۆرە (سەوزە و میوەی تریش) . ئەو کەسانەی کێشی خۆیان بە زۆرخواردنی سەوزە و میوە دادەبەزێنن پێستیان زەردتر دەبێت، بەڵام هەندێك ناساغی تریش کەمێك کارۆتین پتر دەکەن و پێست زەردتر دەبێت،وەك فرەچەوری خوێن، نەخۆشی شەکرە، گورچیلەسۆ، پەریزادەستە و کەم گۆڕانی کارۆتین بۆ ڤیتامین A بەهۆی نەخۆشی زیندەچالاکی یان ناساغی جگەر.

## (D.R.) Drug Reactions کاردانەوەکانی دەرمان

**دەرمان** Drug: بریتییە لە مژادێکی کیمیکی یان ئاوێتەی چەند مژادێك کە بۆ پشکنین، پاراستن یان چارەسەری ناساغی یان سکاڵای راستی یان چاوەڕوان کراو بەکاردەهێنرێت.

جیاکردنەوەی دەرمان لە کیمیکی تر ئاسان نی یە چونکە زۆر مژادی کیمیکی تر دەخرێنە ناو خواردەمەنی و خواردنەوە بۆ رەنگ، تام یان پاراستن ، لەوانەیە ماکی زیانبەخش دروستبکەن، جگە لەوەش لەوانەیە مژادی کیمیکی بەکارهاتوو بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەر خواردەمەنی بکەوێت و ماك دروست بکات. مژادی جوانکاریش وەك مینۆکسیدیل بۆ قژبەهێزکردن یان ترێتینۆین بۆ پێست نوێکردنەوە ماك دروست دەکەن.

**ماکی دەرمان** adverse drug reaction: بریتییە لە نیشانە و سکاڵای نەخوازراوی دەرمانی وەرگیراو بەهۆی کاردانەوە لە ئەنجامی زێدەژەمی دەرمانەکە، ماکی دەرمانەکە یان سکاڵا و نیشانەی چاوەڕوان نەکراو.

لە ۲۰۰۰ مردن دا نزیکەی یەك مردن هۆی دەرمانە و رێژەی ۲۰٪ی ئەوانە بە هەڵە دەرمانەکەیان بەکارهێناوە یان بە هەڵە پێیان دراوە، لەو هەڵانە نووسینی نالەباری دەرمانەکەیە یان پیتی هەڵەیە لە نووسینەکە دا. گرفتێکی تر لەوەدایە کە هەموو ماکەکانی دەرمان تۆمارنەکراون یان نەزانراون و دوای بەکارهێنانی دەرمان لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە نەخۆش یان دوای کاتێکی دوور و درێژ هەندێك لەو ماکانە دەردەکەون و لەوانەیە نەگەیەنرێنە کۆمپانیای بەرپرس بۆ تۆمارکردنی.

ئەگەری (چەندێتی) incidence ماکی دەرمان ٦-٣٠٪ی دەرمان بەکارهێنانە و زۆربەیان بەهۆی دژەبەکتریا و دژەشێرپەنجە و دژەخوێن مەیینەکان روودەدەن. رێژەی ١٨٪ی ماکی دەرمان بەهۆی فەرامۆشکردن روودەدەن و رێژەی ١٤٪ی لە پێست دەردەکەون. رێژەی ٠,١-٠,٣٪ی مردن لە ناو نەخۆشخانە دا هۆکارەکەی ماکی دەرمانە.

ئەو فاکتەرانەی ماکی دەرمان پتر دەکەن بریتین لە:

١- رەگەز: مێینە پتر ماکی دەرمانی تێدا دەردەکەوێت.

٢- ژمارەی دەرمان: ئەگەر پتر لە یەك دەرمان بەکارهات مەترسی ماکی دەرمان زۆر دەبێت.

٣- تەمەن: لە بەساڵاچوودا (پیری) ماکەکان پترن یان توندتر دەبن.

٤- کۆنیشانەی جۆگرین Sjögren's syndrome: هەستیاری بە دەرمان تێیدا، لە نەخۆشی تر، پترە.

٥- ئەیدز: ماکی دەرمانی تێدا لە ئاسایی باوترە، بەتایبەتی بۆ دەرمانی سەلفۆنەمایدەکان و دژەسیل و کلیندامایسین – تاد. نەخۆشی فرەشێوەسووری .E.M و ژەهرە توێژدارڕزانە شیبوونەوە TEN زۆر روودەدەن.

ئەو دەرمانانەی کە ماکی توند و بەدئاکام دروست دەکەن سێ کۆمەڵن: نسایدس NSAIDS ٧٤٪، نەهێڵی ئەنزیمی ئەنجیۆتێنسین گۆڕێن ACE وەك ئینالاپریل و کاپتۆپریل ١٩٪ و دەرمانی کۆترایمۆکسازۆل ٧٪.

لە پێست دا ١/٣ی ماکەکان کاردانەوەی چەسپاوی دەرمانن F.D.R و ١/٣ی تریش سووربوونەوەین (سووریژەین) exanthematous و ١/٥ یان لیر و پەنەمانی بۆرین urticaria & angio-oedema. **ژمارەیەکی کەم لە دەرمان هۆی زۆربەی ماکی دەرمانە، لەوانەیە ماکی دەرمان لە پێست دا ببێتە هۆی مردن وەك پێستەسۆی کاژەوەری exfoliative dermatitis، فرەشێوەسووری E.M یان T.E.N.، ئەگەری T.E.N. لە ساڵێك دا لە ملیۆنێك کەسدا ١,٢ کەسن.**

## جۆر و چۆنێتی کاردانەوەکانی دەرمان Classification & mechanisms of drug reactions

I- **جۆری ناهەستیاری** Non-allergic D.R.: دوو بابەتن:

أ) **کاردانەوەی چاوەڕوانکراو** Predictable R.: واتا کاردانەوەکان (ماکەکان) چاوەڕوانکراون و نامۆ نین، ئەمانەی خوارەوەن:

**١- ژەمی زۆر** Overdosage: **ماکەکان بریتین لە زێدەڕۆیی کاری ئاسایی** pharmacological actions **چاوەڕوانکراوی دەرمانەکە و پەیوەندی راستەوخۆی لەگەڵ بری دەرمانەکە لە لەش دا هەیە. هۆکارەکانی ژەمی زۆر ئەمانەن:**

١. **وەرگرتنی ژەمی زۆر بۆ چارەسەر بەهەڵەی پزیشك یان نەخۆش.**

٢. **ژەمی ئاسایی دراوە بە نەخۆش بەلام هەڵەی مژین (بۆ نموونە لە ریخۆڵە)، هەڵەی زیندەچالاکی** metabolic **یان هەڵەی فرێدانی دەرمان** error of excretion **یان کارلێککردنی** drug interaction **دوو دەرمان یان پتر ئەم بارە دروست دەکەن.**

**٢- ناکامی لاوەکی** Side effects: **بریتین لە کاری ژەهراوی یان نەویستووی دەرمان کە بەشێکن لە کاری دەرمانەکە وەك خەواڵوویی بە دژەهیستامین یان مووڕووتانەوە بە دژەشێرپەنجە - تاد.**

**٣- کەڵەکەبوون** Cumulation: **بە بەرکەوتنی دەرمان بۆ کاتێکی زۆر، بۆ نموونە کەڵەکەبوونی نیشتنی ئاڵتوون، زیو، جیوە - تاد لەناو خانەی قوتدەر** phagocytes **یان لە ناو ناوپۆشەکاندا یان یەکگرتنی دەرمان یان پاشماوەی زیندەچالاکی دەرمانەکە بە بەشێکی پێست، بۆ نموونە کلۆرپرۆمازین ،روودەدات.**

٤- ژەهراوی بوونی (ماکی) درەنگ Delayed toxicity: وەك دروستبوونی شێرپەنجە و قۆچەکاژی چەند ساڵ دوای بەکارهێنانی مەرگەمووش inorganic arsenic یان بەریشاڵبوونی جگەر بەهۆی میثۆترێکسەیت.

٥- کاریگەری وەلانان = جێپێشێلکردن Facultative effects: بەهۆی لەناوبردنی زیندەوەری ئاسایی (خۆرەنیشتەنیەکان normal flora) لە ناوپۆش و پێست دا بۆ نموونە، دژەبەکتریای گرام پۆزەتیف دەبێتە هۆی زۆربوونی بەکتریای گرام نێگەتیف (تێتڕاسایکلین بۆ چارەسەری زیپکەی عازەبە دەبێتە هۆی سەلکەسۆی گرام نێگەتیفی) و ستیرۆیدی سیستمی یان ئەنتی بایۆتیك یان بەرگری کپێنەکان دەبنە هۆی زۆربوونی کاندیدا – تاد.

٦- کارلێککردنی دەرمان Drug interactions: کارلێککردنی دوو دەرمان یان پتر کە لەیەك کات دا بدرێن بە نەخۆش لەوانەیە پێش چوونە ناو لەش لە ناو دڵۆپەی سەلاینی دراو (خوێیاو) یان ریخۆڵە یان خوێن یان وەرگرەکان روودات، بەڵام لەوانەشە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەهۆی خێراترکردنی acceleration یان سستکردنی slowing زیندەچالاکی یان فڕێدانی دەرمانەکە ،روودات. هەندێك جاری تر کە دوو دەرمان بەیەکەوە دراون بە نەخۆش و دەرمانێکیان لادەبرێت ماکەکە روودەدات، چونکە دەرمانی لابراو خێراترکردنی کاری دەرمانی دووەمی کردووە کە بەیەکەوەبوون، لەبەر ئەوە دەرمانی دووەم کەڵەکە دەبێت.

**نموونەکان**: لە ریخۆڵەدا فینۆباربیتۆن هەڵمژینی گریزیوفولڤین کەم دەکاتەوە، دژە ترشی گەدە هەڵمژینی تێتڕاسایکلین کەم دەکاتەوە.

- لابردنی (پاڵپێوەنانی) دەرمانێك لە ئەلبۆمینی خوێن دا بۆ دەرمانێکی تر ماکی دەرمان پتر دەکات وەك سەلفۆن ئەماید + کاومارینەکان، بەڵام پاڵپێوەنان لە وەرگر receptor دا ماکەکە کەمتر دەکات.
- چالاککردنی یان نەهێشتنی کاری ئەنزیمی لە جگەر دا بەهۆی سیستمی سایتۆکرۆم پ-٤٥٠ گرنگن،بۆ نموونە گریزیۆفولڤین زیندەچالاکی کاومارین پتر دەکات و ریفامپیسین و فێنیتۆین کاربامازیپاین زیندەچالاکی سایکلۆسپۆرین پتر دەکات، ئەلۆپیورینۆڵ زیندەچالاکی ئازاثایۆپرین کەم دەکاتەوە. گۆڕانکاری لە فڕێدانی دەرمان excretion وەك: پرۆبێنیسید فڕێدانی پەنسلین لە گورچیلەدا کەمدەکاتەوە و ئاستی پەنسلین لە خوێن دا بەرزدەکاتەوە.

٧- گۆڕانکاری زیندەچالاکی Metabolic changes: هەندێك دەرمان گۆڕانکاری لە پێست دا (بەهۆی کاری زیندەچالاکی یان گۆڕینی باری خۆراکی nutritional) دروست

دەکات، بۆ نموونە ئایزۆترێتینۆین زەردەگمۆڵ xanthoma "بەهۆی بەرزکردنەوەی ئاستی پرۆتینەچەوریە کەمچڕەکان low-density-lipoproteins" دروست دەکات.

٨- کۆرپەشێوێنی Teratogenicity: بەدترین ئاکام لە کاتی دروستبوونی ئەندامەکاندا organogenesis (٣-١٠ حەفتەی یەکەمی سکپڕی) روودەدات ، دەرمانەکان زۆرن بەڵام گرنگەکان ئەمانەن: ثالیدۆماید، رێتینۆیدەکان، خانەکوژەکان cytotoxics، خواردنەوەی ئەلکهولی زۆر، جگەرەکێشان، دژەفێ (فێنیتۆین و ترایمیثادیۆن)، وارفارین، دژەخەپلە، سرکەری (بەنجی) هەڵمژراو inhalational anaesthetics، لیثیۆم، کینین، نەهێڵی ACE، ترایمیثۆپریم، ئەمینۆگلایکۆسایدەکان، ٤-کوینۆلۆن، ئیتراکۆنازۆڵ، کۆکاین، ژەمی زۆری ستیرۆید، هۆرمۆنی سێکسی، دژەشێتی، بێنزۆدایازیپانەکان، تێتراسایکلین، ریفامپیسین، پێنیسیللامین و پایریمیثامین.

٩- کاریگەری لەسەر تۆو دروستبوون Effects on spermatogenesis: ئەو دەرمانانەی بۆ تۆوی پیاو زیانبەخشن ئەمانەن: چارەسەری کیمیکی، گریزیۆفولڤین (تا ٣ مانگ دوای لابردنی دەرمانەکە)، ئیستڕۆجین، ئەندرۆجین، سیپرۆتیرۆن ئەسیتەیت، خانەکوژەکان (وەك میثۆترێکسەیت)، کۆڵچیسین، نەهێڵی مۆنۆئەمین ئۆکسیدەیس MAOI، کیتۆکۆنازۆڵ و سەلفاسالازین.

١٠- کاردانەوەی دارمانی Anaphylactoid reactions: باسمانکردووە.

١١- زیتبوونەوەی نەخۆشی Exacerbation of disease: وەك توندتربوونی زیپکەی عازەبە و سەدەف بە لیثیۆم، بێتاوەستێن β-blockers پێستەسۆی سەدەفی دروست دەکات، لابردنی ستیرۆید سەدەف دەورووژێنێت، سیمیتیدین و پەنسلین و سەلفۆنئەماید گورگەسوورە توندتر دەکەن، خوێنبۆری فراوانکەرەکان نەخۆشی گوڵی دەورووژێنن - تاد.

ب) **کاردانەوەی چاوەڕوان نەکراو** Unpredictable R.: واتا کاردانەوەی نامۆ و چاوەڕوان نەکراو روودەدەن وەك:

١- بەرگەنەگیری Intolerance: بە بەکارهێنانی ژەمی کەمی دەرمان کارە ئاساییەکانی دەرمانەکە بە شێوەیەکی زێدەکارکردن دەردەکەوێت، ئەمەش لەوانەیە بەهۆی جیاوازی تاکەکەسی individual variation ئەوپەڕی کاری فیسیۆلۆجی بێت، یان بەهۆی دواکەوتنی زیندەچالاکی یان فڕێدانی دەرمانەکە لە باری تێکچوونی کاری جگەر یان گورچیلە یان بەهۆی جیاوازی جینی لە تێکرایی زیندەچالاکی دەرمانەکە، بۆ نموونە: خوێن شیبوونەوەی hemolysis تیژ بەهۆی سەلفۆنئەمایدەکان، دژەمەلاریا، داپسۆن، ئەسپرین، نایترۆفیۆرانتۆین، فیناسێتین و کلۆرامفێنیکۆڵ.

٢- **ناكامی لادەری** Idiosyncrasy: بریتییە لە کاردانەوەی نابەجێی چاوەڕوان نەکراو، لەوانەیە بەهۆی جیاوازی جینی زیندەچالاکی بێت، وەك نەبوونی هایدرۆجین لابەری گلوکۆز ٦-فۆسفەیت "G6PDD"، پۆرفیریا- تاد، ئەمانە بە دەرمان روودەدەن.

II- **جۆری هەستیاری** Allergic D.R.: کاردانەوەکان چاوەڕوان نەکراون، ئەمانەی خوارەوەن:

١- **کاردانەوەکانی دەرمان بەهۆی کاردانەوەی فرەهەستیاری دەستبەجێ (جۆری I)**: خوران، لیردەرکردن یان پەنامانی بۆری و هەندێك جار دارمانی سیستمی بەتایبەتی بە پەنسلین ،روودەدات.

٢- **بەهۆی کارلێکی دژە تەنی خانەکوژی (جۆری II)**: وەك پەڵەخوێنی کەم خەپلەیی thrombocytopenic purpura بەهۆی کوینیدین quinidine.

٣- **بەهۆی کاردانەوەی ئاوێتە بەرگریەکان (جۆری III)**: وەك لیردەرکردن و دارمانی سیستمی، دەردی زەرداوی خوێن، خوێنبۆریەسۆ vasculitis و کاردانەوەی ئارثەس arthus reaction.

٤- **بەهۆی کارلێکی بەرگری خانەیی (جۆری IV)**: وەك فرەهەستیاری لێککەوتنی پەنسلین.

## جۆری کاردانەوە سەرجێیەکان Types of clinical reactions

١- **کاردانەوەی سورێژەیی (سووربوونەوەیی)** Exanthematic reactions (وێنەی ٢٨٠)

لەوانەیە هەموو دەرمانێك،لە کاتی وەرگرتنی دەرمانەکە تا ٣ حەفتە،ئەم جۆرە دروستبکات و هەر کاتێکی دواتر دەرمانەکە وەرگیرایەوە ماکەکە دووبارە دەبنەوە. زۆربەی جار بە شێوەی چوونیەکی قەد و پەلەکان و بەری دەست و پێ سووردەبنەوە و تەنۆچکەی سووری بچووکی لەگەڵدایە، بەڵام هەندێك جار پەڵەی سووری گەورە یان هەر تەنۆچکە هەن و لەوانەیە بۆ پێستەسۆی کاژەوەرێ exfoliative dermatitis بگۆرێت. جیاکردنەوەی ئەم جۆرە ماکە لە ڤایرۆسە تووشێنەکان بەوەیە کە سووربوونەوەی ڤایرۆسەکان لە دەم وچاوەوە دەست پێدەکات و ئەوسا بەرەو خوار پەرەدەسێنێت و تا و چاوسووربوونەوە و نیشانەی هەڵامەتی و لیمفەگرێسۆی



**(وێنەی ٢٨٠)**
**کاردانەوەی سورێژەیی دەرمان.**

لەگەڵدایە. دەرمانە باوەکان کە جۆری سوریژەیی دروست دەکەن ئەمانەن: ئەمپیسلین، پەنسلین، فەنیل بیوتازۆن، سەلفۆن ئەمایدەکان، فینیتۆین، کاربامازیپاین، ئاڵتون و جێنتامایسین– تاد.

٢- **پەڵەخوێن** Purpura: وەك ئەسپرین، دژەخوێن مەیینەکان، سیفالۆسپۆرینەکان، ستیرۆیدەکان، خانەکوژەکان، کوینیدین، کلۆرۆثایەزاید، بۆنی پیرو balsam of peru، کاربرۆماڵ، ثایامین، میپرۆبامەیت، کاربامازیپاین، فیناسیتین، کلۆرۆدایەزیپۆکساید، نسایدس – تاد.

٣- **سووربوونەوەی بازنەیی** Annular erythemas: سووربوونەوەی بازنەیی چەقی E.A.C بەهۆی کلۆرۆکوین، هایدرۆکسی کلۆرۆکوین، ئیسترۆجین، سیمیتیدین، پەنسلین – تاد دروست دەبێت.

٤- **کاردانەوەی کاژەگوڵیئاسا** Pityriasis rosea-like reactions: وەك مەرگەمووش، ئاڵتوون، بسموث bismuth، باربیتورەیتەکان، بێتاوەستێن، کلۆنیدین، کاپتۆپریل، گریزیۆفولڤین، ئایزۆترێتینۆین، مێترۆنیدازۆڵ – تاد.

٥- **کاردانەوەی سەدەفی** Psoriasiform.R: وەك دژەمەلاریا، بێتاوەستێن، لیثیۆم، نسایدس NSAIDs، کاپتۆپریل، سیمیتیدین، کلۆنیدین، جێمفیبرۆزیل، ئینتەرفیرۆن، مەثیل دۆپا، پێنیسیلامین، پەنسلین، تێرفینادین – تاد.

٦- **پێستەسوی کاژەوەری** Exfoliative dermatitis: وەك ئەلۆپیورینۆل، ئەمپیسلین، پارائەماینۆسالسیلیك ئەسید، کاپتۆپریل، کاربامازیپاین، سیفۆگزیتین، کلۆرۆکوین، کلۆرپرۆمازین، سیمیتیدین، دیلتیازیم، ئاڵتون، گریزیۆفولڤین، هایدانتۆین، 1NH، نایترۆفیورانتۆین، پێنیسیلامین، پەنسلین، کوینیدین، سترێپتۆمایسین، سەلفۆنئەمایدەکان و سەلفۆنیل یوریاکان – تاد. (وێنەی ٢٨١)



(وێنەی ٢٨١) پێستەسوی کاژەوەری.

٧- **دارمانی سیستمی** Anaphylaxis: وەك دژەبەکتریا بە تایبەتی پەنسلین، رەنگینەی ئێکسبەرداری radiocontrast media، زەرداوی خوێنی ئاژەڵ animal sera، پێکوتە vaccins، دژەکەڕوو و بەرهەمی خوێن blood products، نسایدس، دەرمانی هۆشبەر narcotics، مژادی بەنج، ماسولکەخاوکەرەوە muscle relaxants وەك کیورار curare، دێکستران، مانیتۆڵ، ئەنزیمەکان وەك تریپسین، ستیرۆید وەك هایدرۆکۆرتیزۆن و پرۆجێستیرۆن، ئینسۆلین، ڤازۆپریسین، بێنزۆوەیت، سەلفایت و تارترازین – تاد.

٨- **لیردەرکردن Urticaria و پەنەمانی بۆری Angio-oedema**: لیردەرکردن(دوای وەرگرتنی دەرمان) لە ٣٦ کاتژمێردا روودەدات، بەڵام بۆ جارانی داهاتوو لە چەند خولەکێك دا روودەدات. هۆکارەکان وەك جۆری حەوت (لە سەرەوە)ن.

٩- **دەردی زەرداوی خوێن Serum sickness**: هۆکارەکان بریتین لە: زەرداوی خوێن serum، گلۆبیولین، ئەسپرین، دژەبەکتریا، ثایۆیوراسیل، سترێپتۆکاینەیس - تاد.

١٠- **فرەشێوەسووری E.M. یان کۆنیشانەی ستیڤنس جۆنسن Steven's Johnson syndrome**: وەك دژە بەکتریا، دژەکەڕوو، نسایدس، کانزاکان (مەرگەمووش، برۆماید، جیوە، ئایۆداید)، دژەفێ و دژەپەستانی (فشاری) بەرزی خوێن.



(وێنەی ٢٨٢) ژەهرە توێژداڕزانە شیبوونەوە (بەهۆی دەرمانی فینۆباربیتاڵ).

١١- **ژەهرە توێژداڕزانە شیبوونەوە T.E.N.**: وەك دژەبەکتریا، نسایدس، دژەفێ، دژەکەڕوو، دەرمانی گەدە وەك فامۆتیدین و ئۆمیپرازۆڵ - تاد. (وێنەی ٢٨٢)

١٢- **کاردانەوەی چەسپاوی دەرمان Fixed drug reactions**: (وێنەی ٢٨٣) ئەم جۆرە ماکە هەموو جارێك کە دەرمانەکە وەرگیرا لە هەمان شوێنی پێشوو هەڵدەداتەوە، بەڵام لەوانەیە جاربەجار شوێنی تریش بگرێتەوە، زۆربەی جار یەك دەرمان ئەم ماکە دروست دەکات. بەڵام هەستیاری پەڕینەوە cross sensitivity بۆ دەرمانی تری هاوپەیوەند related drugs روودەدات وەك لە



(وێنەی ٢٨٣) کاردانەوەی چەسپاوی دەرمان.

نێوان تێتراسایکلین و ئۆکسی تێتراسایکلین - تاد. لەوانەیە کاتی بێ وەڵام refractory period ،دوای روودانی ماکەکە، هەبێت. ماکی تیژ، لە ماوەی ١/٢-٨ کاتژمێر دوای وەرگرتنی دەرمانەکە روودەدات بەشێوەی قوتکەی سنووررداری خڕ یان هێلکەیی بەخورووی سوور و ئاوساو و دەبێتە رەنگ قاوەیی یان بنەوشەیی و هەندێك جار بلۆقییە یان بڵقییە و هەندێك جار بەشێکی زۆری پێست دەگرێتەوەو وەك T.E.N وایە. ماکەکان پتر لە پەلەکان و دەست و پێ و کۆئەندامە سێکسیەکان و دەوری کۆم و چاو و دەم و ناوپۆشی دەم دەردەچن،



(وێنەی ٢٨٤) ماکی پێستەستووریی دەرمان.

هەندێك جار تەنیا پۆپنەی گۆ دەگرێتەوە، دوای چاکبوونەوە تۆخبوون جێدەهێڵێت ،کە زۆرجار، بەردەوامە. دەرمانەکانی دروستی دەکەن زۆرن و هەندێکیان ئەمانەن: دژەبەکتریا وەك سەلفۆنئەمایدەکان (کۆترایمۆکسازۆڵ)، تیتراسایکلینەکان، پەنسلین، ئەمپیسیلین، ئەمۆکسیسیلین، ئیریثرۆمایسین، ترایمیثۆپریم، نیستاتین، گریزیۆفولڤین، داپسۆن، مەرگەمووش، جیوە، ثایاسیتازۆن،، کوینین، میترۆنیدازۆڵ، کلایۆکوینۆڵ ، باربیتورەیتەکان وەك (هایدانتۆین، فینیتۆین، کلۆراڵ هایدرەیت، کۆداین، کلۆردایەزیپۆکساید، دژەفێ )، نسایدس وەك (ئەسپرین، ئۆکسی فێنبیوتازۆن، ئەنتی پایرین، مێتیمازۆڵ، پاراسیتامۆڵ، ئایبۆپرۆفین)، فینۆلفثەلاین، هایدرالازین، تامخۆشکەری خواردەمەنی، برۆماید، ئایۆداید – تاد.

١٣- ماکی پێستەستووربێیی Lichenoid eruptions: باسمانکرد. (وێنەی ٢٨٤)

١٤- تیشکەهەستیاری Photosensitivity: باسمانکرد.

١٥- پۆرفیریا Porphyria.

١٦- فرەتۆخبوون Hyperpigmentation: وەك خەپلەی نەزۆکاندن، ماینۆسایکلین (وێنەی ٢٨٥)، دژە مەلاریا، کلۆرپرۆمازین، ئیمیپرامین، ئالتوون، زیو، قورقوشم، دژەشێرپەنجە، کارۆتین، کلۆفازیمین، پیفلۆکساسین و سەلفاسالازین.

(وێنەی ٢٨٥) فرەتۆخبوون بە ماینۆسایکلین.

١٧- کاڵبوون (کەمرەنگبوونی پێست) Hypopigmentation: بینۆکوین، فینۆلەکان، هایدرۆکوینۆن – تاد.

١٨- ماکی عازەبەیی Acniform eruptions: باسمانکرد.

١٩- ماکی بیبرۆیی Eczematous eruptions: بە کرێم یان بە دەم و ماسولکە و خوێن، بۆ نموونە خەپلەی نایترۆگلیسرین، جێنتامایسین، کانامایسین، ستریپتۆمایسین، کلۆراڵ هایدرەیت، کلۆرۆثایەزاید، پرۆکاین، رەنگی ئازۆ لە خواردەمەنی دا، کرێم وەك بۆنی پیرو، ئایۆدین، نیۆمایسین سەلفەیت – تاد.

٢٠- ماکی بلقی Bullous eruptions: وەك باربیتورەیتەکان، میپرۆبامەیت، ئیمیپرامین، نایترازیپام – تاد.

٢١- گەندە پۆرفیریا pseudo-porphyria: بلقی وەك پۆرفیریا لە سەر پەلەکان دەردەچن بەهۆی ژەمی زۆری فروسیماید، ناپرۆکسین، نسایدس، ناڵیدیکسیك ئەسید، تێتراسایکلین و سەلفۆنیل یوریاکان.

٢٢- ماكى بلقە گمۆڵ Drug-induced bullous pemphigoid: وەك فروسیماید، پێنیسیلامین، پەنسلین، سەلفاسالازین، فیناسێتین، ئینالاپریل، پوڤا – تاد.

٢٣- ماكى نەخۆشى بلقى Drug-induced pemphigus: وەك پێنیسیلامین، كاپتۆپریل، ئالتون، ئایامازۆڵ، ئایۆپرۆنین، میركەپتۆپرۆپیۆنیل گلایسین، پەنسیلین، سیفالێكسین – تاد.

٢٤- خوێنبۆریەسۆ Vasculitis: ئەم جۆرە ماكە لە پێست و هەندێك جاریش لە ئەندامەكانى ناو لەشیش دەدات، وەك دڵ، جگەر و گورچیلە و لەوانەیە ئاكامەكەى مردن بێت، دەرمانەكان ئەمانەن: ئەمپیسیلین، سەلفۆن ئەمایدەكان، فروسیماید، ثایەزایدەكان، فەنیل بیوتازۆن، نسایدس، كوینیدین، ئەمیۆدارۆن، هایدرالازین، ئینالاپریل، پرۆپیل ثایۆیوراسیل، سیمیتیدین، كاومادین، فێنیتۆین، ئیثاكرینیك ئەسید، فلۆكسێتین، گریزیۆفولڤین، گوانیثیدین، ئایۆدایدەكان، لیڤامیسۆڵ، پەنسیلین، پێكوتەى BCG، زیدۆڤودین، رەنگى ئازۆ، تارترازین، ڤیتامین B6 – تاد.

٢٥- كۆنیشانەى گورگەسوورەئاسا L.E-like syndrome: وەك پرۆكاین ئەماید، هایدرالازین، كاپتۆپریل، بێتاوەستێن، PASA، كاربامازیپاین، كلۆنیدین، ئالتوون، ئایبۆپرۆفێن، هایدانتۆینەكان، مەثیل دۆپا، مێثیسێرجاید، كۆترایمۆكسازۆڵ، پەنسیلین، خەپلەى نەزۆكاندن، نایترۆفیورانتۆین، سەلفۆنئەمایدەكان، تێتراسایكلین، ثایۆیوراسیل، فینۆثیازین، فەنیل بیوتازۆن، ڤالپرۆوەیت – تاد.

٢٦- پێستەماسولكەسۆ Dermatomyoscitis: وەك پێنیسیلامین، نسایدس (وەك دایكلۆفیناك، نیفلومیك ئەسید)، كاربامازیپاین، BCG و هایدرۆكسی یۆریا.

٢٧- پێست رەقبوون Scleroderma: وەك پێنیسیلامین، بلیۆمایسین، برۆمۆكریپتین، ڤیتامین K، سۆدیۆم ڤالپرۆوەیت، فێنیتۆین، ڤاینیل كلۆراید، ئیپۆكسی رێسین، پێركلۆرئەثیلین و ترایكلۆرئەثیلین، سیلیكا.

٢٨- سووربوونەوەى گرێیى Erythema nodossum: باسمانكرد.

٢٩- مووروەتانەوە و تووكنى و گۆڕانكاریەكانى نینۆك: باسمانكرد.


(وێنەى ٢٨٦) ناودەمەسۆ بەدژە شێرپەنجە.

٣٠- ناودەم وشكى Xerostomia: دژە وزەكۆڵینەكان (وەك ئەترۆپین)، دژەخەمۆكیەكان، ئارامكەرەوەكان، دژەشەپلە، دژەفشارى خوێن.

٣١- ناودەمەسۆ Stomatitis: دژەشێرپەنجە،دژەبادارى، دژەخەمۆكى، دژە فشارى خوێن، كلۆرپرۆمازین و ڤالپرۆیك ئەسید(وێنەى٢٨٦).

٣٢- پووك زلبوون Gingival hyperplasia: فێنیتۆین، دیلتیازیم، فیلۆدیپین، ڤێراپامیل و سایكلۆسپۆرین.

# تووشێنەکان = تووشبوونی میکرۆب (سۆی میکرۆبی) Infections

## تووشێنی بەکتریاکان Bacterial Infections

### بەکتریای نیشتەنی پێست The resident flora of the skin

رووی پێست جێنشینی کۆمەڵێك بەکتریایە بە تایبەتی لە شوێنە تەڕە (شێدارە) تووکنە چەورەکان، وەك ژێر باڵ و ناوپەنجەی پێ و دەموچاو – تاد، ئەم زیندەوەرانە بە شێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ لە چینی کاژ و سەلکەمووەکان دان و بریتین لە ستافیلۆکۆکەسی بێ زیان، مایکرۆکۆکەس و دیفثیرۆیدەکان. ستافیلۆکۆکەس ئێپیدێرمیدیس S. epidermidis و دیفثیرۆیدە هەواییەکان aerobic diphtheroids پتر لەسەر رووی پێست هەن، بەلاّم دیفثیرۆیدە ناهەواییەکان anaerobic diphtheroids واتا پرۆپیۆن بەکتیریەم propionbacterium لە قووڵایی سەلکەمووەکان دا هەن و چەند جۆرێك لە کەڕووی هەوێنی چەوریخواز lipophilic yeasts لە سەر پێست دا هەن. میکرۆبی نیشتەجێ لە کەسێك بۆ کەسێکی تر جیاوازە بەلاّم لە یەك کەس دا چەسپاوە. ئەم جۆرە بەکتریایانە بەرگری لە لەش دەکەن بەهۆی:

١- بەرهەڵستیکردن دژی بەکتریای تری زیانبەخش bacterial interference.

٢- دروستکردنی ئەنتیبایۆتیك،.

بەلاّم پتر گەشەکردنی ئەم بەکتریا نیشتەنیانە هەندێك جار نەخۆشی دروست دەکەن.

### تووشێنەکانی ستافیلۆکۆکەس لە پێست دا Cutaneous staphylococcal infections

لە باری ئاسایی دا رێژەی ٣٥٪ ی خەڵکی ئەم بەکتریایەیان وەك نیشتەنی لە کونی لووت، ٢٠٪ لە ناوگەڵی perineum و ٥–١٠٪ لە ژێر باڵ و نێوان پەنجەی پێدا هەیە. لە پێستی تری وشك دا نیە، ئەم نەخۆشیانەی خوارەوە دروست دەکەن:

١) **ئاگرە**: Impetigo: دوو جۆری هەیە:

أ) **ئاگرەی ئاسایی**: پتر لە رێژەی ٧٠٪ی بارەکان ئەم جۆرەن، لە هەموو تەمەنێك دا هەیە، بەلاّم لە منالاّن دا زۆرترە و هۆکارەکەی زۆربەی جار بەکتریای ستافیلۆکۆکەسە S. aureus، بەلاّم هەندێك جار بەکتریای سترێپتۆکۆکەس Streptococus (کۆمەڵی A) یان هەردوو کیان بەیەکەوە دروستی دەکەن(وێنەی ٢٨٧). لە وەرزی گەرما دا (کۆتایی بەهار و هاوین) پتر روودەدات. سەرچاوەی تووشێن هەندێك جار کونی لووتە و دەردەکان لە ناو لووت و دەوری لووت و دەم روودەدەن، یان لە ئاژەڵ و باڵندەی ماڵی، نینۆکی پیس، منالّی تری تووشبوو، نەخۆشخانە، شوێنی



(وێنەی ٢٨٧) ئاگرەی ئاسایی.

جەنجاڵ – تاد، دەگیرێتەوە. بریندار‌بوونی پێست بە پێوەدانی مێروو، تامیسـك، دڕكـە و مێكوتـە، پێست رووشان و درزدان یان سووتان یارمەتیدەری تووشبوونن.

نەخۆشیەكە بە پەڵەی سووری ۲ ملمی ،كە خێرا دەبێت بە بلۆق و بڵق، دەست پێدەكات، دواتر ئەمانە دەتەقن و زەرداو و كێم دەدەڵێنن، ئەوسا وشك دەبنـەوە و قەتماغـەی چـەند چـینی زەرد و هەنگوینی دێتەكایەوە، قەتماغەكە بە ئاسانی لادەبرێت و پێستی ژێری سوور و تـەڕە، وردە وردە بۆ شوێنی دەورپشتی و شوێنی دوور بڵاودەبێتەوە.

نەخۆشی پێستی تر وەك ئەسپێی سەر، گەڕی، بیرۆ، پێستەسۆ – تاد، زۆر جار ئاگرەیان لـە سەر دروست دەبێت. بێ چارەسەر تا چـەند حەفتەیـەك پەرەدەسـتێنێت و چـاك دەبێتـەوە، بـەڵام هەندێك جار قووڵتر بۆ بن توێژ دەڕوات و دەبێتـە هـۆی چـاڵەبرینی قەتماغـەیی، لیمفەبۆریەسـۆ، بەكتریازانەخوێن bacteraemia و هەندێك جار كۆنیشانەی پێستەسـۆوتاوی ستافیلۆكۆكەسـی SSSS.

زۆربەی جار تای لەگەڵدا نییە، بەڵام هەندێك كزانەوە و خورانێكی كەم هەیە و لیمفەگرێ سۆ زۆرباوە، ئەو شوێنانەی پڕ ئاگرەی لێدەردەچێت بریتین لە دەموچاو و پەلەكان و مل و سەر.

ب) **ئاگرەی بڵقی** Bullous impetigo: پڕ لە كۆرپە و ساوادا بە تایبەتی لـە ٦-١٠ رۆژی سەرەتای ژیان دا هەیە، بڵق لە سەر پێست و بەتایبەتی لە دەموچاو و دەست دا دروسـت دەبـن، لـە سەرەتاوە تای لەگەڵدا نییە، بەڵام لەوانەیە دواتر ئەم ماكانە رووبـدەن: تـا یـان پلـەی گـەرما دابـەزین بـۆ ژێـر بـاری ئاسـایی، سكچـوون و پیسـایی سـەوز، بەكتریازانـەخوێن و سییەسـۆ و مێشكەپەردەسۆ و مردن. لە شوێنی گەرم باڵقیش پڕ لە ژێر باڵ و لاڕان و دەست تووشی دەبێت، ئەوسـا بڵقـەكان دەتەقـن و شـێوەی بازنـەیی وەردەگرن. زۆربەی بارەكان بەكتریای س. ئۆریـەس S. aureus جۆری فەیج ٧١ یان ٥٥ كۆمەڵی ٢ دروستی دەكات. (وێنەی ٢٨٨)



(وێنەی ٢٨٨) ئاگرەی بڵقی.

**چارەسەر**

١- بۆ باری سووك، چارەسەری جێیی بە مەرهەمی میوپایرۆسـین mupirocin و لابردنـی قەتماغەكان و پاك وخاوێنی.

٢- باری مامناوەندی بڵاو: مەرهەمی میوپایرۆسین یان فیوسـیدیك ئەسـید fucidic Acid + ئەنتی بایۆتیك بە دەم وەك دایكلۆكساسلین ٢٥٠-٥٠٠ ملگم × ٤، سیفالێكسـین ٤٠- ٥٠ ملگم/كگم/رۆژ، سیفاكلۆر cefaclor ٢٠ ملگم/كگم/رۆژ بـە ٣ ژەم، سـێفپرۆزیل

cefprozil ۲۰ ملگم/کگم/رۆژ × ۱ بە یەك ژەم، کلیندامایسین clindamycin ۱۵ ملگم/کگم/رۆژ بە ۳ ژەم یان ئیریثرۆمایسین ۲۵۰ ملگم - ۵۰۰ ملگم × ٤ یان ئازیثرۆمایسین azithromycin (۵۰۰ ملگم یەکەم رۆژ ،۲۵۰ ملگم بۆ هەر رۆژێك بۆ ٤ رۆژی تر) ، یان ئۆگمێنتین augmentin ( = ئەمۆکسی سیلین + کلاڤولانیك ئەسید) ۲۵ ملگم/کگم/رۆژ بە ۳ ژەم. هەموویان بۆ ۷-۱۰ رۆژ. ئەگەر ئاگرە زۆر دووبارە بۆوە ئەوە فیوسیدیك ئەسید یان میوپایرۆسین (مەرهەم) رۆژی ۲ جار لە کونی لووت دەدرێت یان ریفامپیسین rifampicin ۶۰۰ ملگم/رۆژ + دایکلۆکساسلین بۆ ۱۰ رۆژ.

تێبینی: ئەگەر بە چاندن culture دەرکەوت کە هۆکاری ئاگرەکە بەکتریای سترێپتۆکۆکەسە لەوانەیە گورچیلۆکەسۆی تیژ acute glomerulonephritis (لە۲-۵٪ی بارەکان دا) بەتایبەتی لە منالان دا بە بەکتریای زەرداوەجۆری( serotype)٤٩، ٥٥، ٥٧، ٦٠ و M-type 2 ،دروست بکات.

۲) **قەتماغە چاڵەبرینی** Ecthyma: هۆکارەکەی وەك ئاگرەیە، بەڵام برینەکە قووڵترە و لە رەقەڵەی لاق shins و پشتی پێ دەردەچێت، بە بلۆقەپیزۆکە vesico-pustule دەست پێدەکات و لە چەند رۆژێك دا گەورە دەبێت و قەتماغەی ئەستوور دروست دەکات، ئەگەر قەتماغەکە لابرێت چاڵەبرینێکی ژێرپیاڵەیی لێوار بەرزبووەوە دەردەکەوێت، لە چەند حەفتەیەك دا چاك دەبێتەوە و جێزام جێدەهێڵێت، بەڵام بە دەگمەن دەبێتە لارِەشە، لیمفەگرێ سۆی جێیی لەوانەیە هەبێت، بەدخۆراکی و فەرامۆشکردن و پیس وپۆخڵی و زەبر و نەخۆشی شەکرە و لاوازی یاریدەدەری دروستبوونی. (وێنەی ۲۸۹)



(وێنەی ۲۸۹)
قەتماغە چاڵەبرینی.

**چارەسەر**

وەك ئاگرەیە.

۳) **سەلکەسۆ** Folliculitis: تووشێنی سەلکەموو بە بەکتریا بە پێی قووڵی سۆکە ئەمانەن:

أ) **ئـاگرەی بۆکـارت** Impetigo of bockart (کێمەسەلکەسۆی رووکەشی Superficial pustular folliculitis)

**بریتییە لە سەلکەسۆی رووکەشی (کونی سەلکی مووی سەر رووی پێست) بە شێوەی پیزۆکەی دیوارتەنك و بچووك، بەتایبەتی لە پێستی سەر و پەلەکان و هەندێك جار دەموچاو (دەوری دەم)، ئەم پیزۆکە زەرد و سپی و قووچەکەییە، بە کۆمەڵ دروست دەبن و لە چەند رۆژێك دا چاك دەبنەوە، هەندێك جار تووشێنی دووەمییە لە شوێنی خوراندن و پێوەدانی مێروو و زەبری تر.(وێنەی ٢٩٠)**



**(وێنەی ٢٩٠) ئاگرەی بۆکارت.**

ب) **سەلکەسۆی ریش** Sycosis barbae:

**بریتییە لە تووشێنی دەوری سەلکی مووی ریش، بە بەکتریای ستافیلۆکۆکەس، بە شێوەیەکی درێژخایەن و سەرهەڵداوە و تێیدا تەنۆچکە و پیزۆکەی سۆیی دەوری مووەکان، کە دەتەقن بە شۆردن و ریش تاشین لەگەڵ کەمێك کزانەوە و خوران هەن، لە باری قووڵتردا جێزام جێدەهێڵێت و لەوانەیە پێڵوپۆشەسۆ و لێوارە پێڵووەسۆی لەگەڵدابێت. (وێنەی ٢٩١)**



**(وێنەی ٢٩١) سەلکەسۆی ریش.**

ج) **سەلکەسۆی شوێنی تر: وەك سەلکی برژانگ و ژێرباڵ و بەر و ران، لەوانەیە لە بەردا بە جووتبوون بگوازرێتەوە. (وێنەی ٢٩٢)**

**چارەسەری ئەمانەی سەرەوە: شۆردن بە ئاو و سابوونی دژەبەکتریا رۆژی ٣ جار، پیزۆکەی قووڵ دەتەقێنرێت، میوپایرۆسین رۆژی ٢ جار. هەندێك جار، وەك ئاگرە، دەرمان بە رێگای دەم دەدرێت.**





**(وێنەی ٢٩٢) سەلکەسۆی لێو وسمت.**

د) **کــوان** Boil (Furuncle): بریتییــه لــه گرێۆکــەی ســۆکردووی قــووڵ لــه دەوری سەلکەموو، سوور و رەق و بەئازارە، دواتر نەرم دەبێتەوە و کێم فڕێ دەدات و لە چەند رۆژێك بۆ چەند حەفتەیەك دا چاك دەبێتەوە و جێـزام جێـدەهێڵێت لـەو شـوێنانەی مـووی هەیـە، بـە تایبەتی،کە داخستن occlusion و شێداری (ئارەقکردنەوە) و لێخشـاندنی friction ببێـت وەك مل و ژێر باڵ و سمت. زۆربەیان لە مرۆڤی ئاسایی دا روودەدەن، بەڵام پتر بەهۆی هۆکـاری جێیی وەك بیرۆی جێگۆڕاو، روشانی پێست، زەبر، گەڕی، ئەسپێ یان هۆکـاری سیـستمی (وەك قەڵەوی، نەخۆشیەکانی خوێن، بەدی کاری نیوترۆفیلەکان، وەرگرتنی ستیرۆید و خانەکوژەکان و کـەمی ئیمیونۆگلۆبیـولین، ئەیـدز، نەخۆشـی شـەکرە، چارەسـەر بـە ئـایزۆترێتینۆین ولــە نەخۆشخانەدا پتر بەهۆی بەکتریای بێ وەڵامی بۆ ئەنتیبایۆتیك) روودەدەن.

هـ) **کۆکوان** Carbuncle: بریتییە لە دوو یان پتر کوان بە یەکەوە بەڵام سەری جیاجیایان هەیە و لە کوان مەترسیدارتر و قووڵترە، زۆر بە ئـازارە و تای لەگەڵدایە و نەخۆش لاواز و بێ هێزە، پـتر لە پشتی مل و پشت و ران دەردەچێت. (وێنـەی ٢٩٣)


(وێنەی ٢٩٣) کۆکوان.

لە کوان و کۆکوانی لێـو و لـووت (سێگۆشـەی هەردوو چاو بۆ دەم) مەترسـی بەکتریاچـوونە نـاو پــەردەی مێشــکی لێ دەکرێــت،بۆیــە نابــێ هەڵبگوشرێن. هەندێك کەس بۆماویـەکی دوور و درێژ کوانیان تێدا دووبارە دەبێتەوە.

**چارەسەر**

١- چارەسەری جێیی بە گوشاری پەڕۆی تەڕ wet compresses و کە کوانەکە گەیشـت دەردەدرێت (دەکرێتەوە) drained، لەگەڵ مەرهەمی میوپایرۆسین ٢٪ یان فیوسـیدیك ئەســـــید و ئـــــەنتیبایۆتیکی سیســــــتمی وەك دایکلۆکساســـلین، سیفالۆســـپۆرینەکان یـــان ڤانکۆمایسین بۆ ٧-١٠ رۆژ.


(وێنەی ٢٩٤) دوومەڵ.

٢- بـۆ بـاری ســەرهەڵداوە، هۆکارەکـان لابـبرێن و مەرهەمی میوپایرۆسین بۆ کونی لووت تـا ٥ رۆژ بەکار دەهێنرێت.

و) دوومەڵ Abscess: پۆرگی پڕ کێمە و لە ئەنجامی سەلکەسۆ (ئەمانەی سەرەوە) یان زەبر، تەنی بێگانە foreign body، سووتان یان جێ دەرزیلێدان – تاد، پەیدا دەبێت و چارەسەری کردنەوەیە لە گەڵ ئەنتیبایۆتیك وەك سەرەوە. (وێنەی ٢٩٤)

٤) نوشتاوەنینۆکەسۆی ستافیلۆکۆکەسی Staphylococcal paronychia: بریتییە لە سۆکردنی نوشتاوەی نزیك و لای نینۆك بە شێوەی ئاوسانی بەئازار و سووربوونەوە و گەرمبوون و کە چارەسەرنەکرێت دوومەڵ دروستبوون. لە باری درێژخایەن دا هێڵی پانی لە نینۆك دا دروست دەبێت، هۆکارەکەی ستافیلۆکۆکەسە بە پلەی یەکەم، بەڵام بەکتریای ستریپتۆکۆکەس پایۆجینیس، سودۆمۆناس، پرۆتیەس یان بەکتریای ناهەوایی و کەرووی کاندیداش تووشی دەبن، هۆکاری یارمەتیدەر بۆ دروستبوونی بریتییە لە رووشان، زەبر، تەڕکردن، نینۆك گەستن، دەستکاریکردن (توێکڵی نینۆك لێکردنەوە) – تاد. (وێنەی ٢٩٥)



(وێنەی ٢٩٥) نوشتاوە نینۆکەسۆی ستافیلۆکۆکەسی توند.



(وێنەی ٢٩٦) کۆنیشانەی پێستەسووتاوی ستافیلۆکۆکەسی.

**چارەسەر**

١- دوورخستنەوەی هۆکارەکان و کەم تەڕکردن و بەکارهێنانی دەستکێش بۆ ئیشی تەڕ.

٢- دوومەڵ کردنەوە.

٣- دژەبەکتریا وەك دایکلۆکساسیلین، سیفالێکسین.

٤- دژەکەڕوو کە کاندیدا هەبوو وەك مایکۆنازۆڵ کرێم و سترۆیدی سووکی جێیی بۆ کەمکردنەوەی ئاوسان و سۆکە.

## کۆنیشانەکانی دەرەژەهری ستافیلۆکۆکەس

## Syndromes caused by staphylococcal-exotoxins

### ١) کۆنیشانەی پێستەسووتاوی ستافیلۆکۆکەسی:

### Staphylococcal scalded skin syndrome “SSSS”

ئەم کۆنیشانەیە پتر لە منداڵی تەمەن ژێر ٥ ساڵی بە تایبەتی کۆرپەدا و بە دەگمەن لە باڵق دا کە سستی گورچیلە یان بەرگری کپ بوونیان هەبێت روودەدات (وێنەی ٢٩٦). هۆکارەکەی دەرەژەهری

exotoxin جۆری A و B یە کە لە لایەن بەکتریای ستافیلۆکۆکەس (کۆمەڵی ۲ جۆری قووتەدەر ۷۱ یان ٥٥ "Group2, phage type 71 or 55" فرێ دەدرێت. ئەم بەکتریایە لەسەر پێستە ناساغەکە نییە،بەڵکو لە شوێنی ترە وەك گەروو، لووت، گوێچکە، پێڵووپۆش، یان پێستی تووشبووی دوورە یان پیسەزانەخوێن septicemia هەیە.

لە سەرەتادا سووربوونەوەی سووریژەیی exanthem کاڵی پێست لەگەڵ کێمە پێڵووپۆشەسۆ یان گوێچکەسۆی ناوەڕاست یان تووشێنی infection لووت و گەرووی نادیار (شاراوە hidden) روودەدات و پێستەکە بە ئازارە و منداڵەکە ناتوانێت لەبەر ئازاری پێست پاڵبکەوێت. نیشانەی نیکۆلسکی پۆزەتیفە و لە ۱-۲ رۆژدا بلق و پێست داماڵان روو دەدەن، تای لەگەڵدایە و پێست چرچی وەك دەسری کاغەزی تێدا دەردەکەوێت و بڵقی گەورە و نەرم لە ژێر باڵ و لاڕان و مل و دەوری کونەکانی لەش دەردەچن و هەموو لەش، جگە لە بەری دەست و پێ و ناوپۆشەکان، دەگرێتەوە. ڕواڵەتەکە وەك سووتانی گشتی وایە، ئەوسا کاژفرێدانی گشتی روودەدات و لە ۷-۱۰ رۆژدا چاك دەبێتەوە (۲-۳٪ی نەخۆشەکان دەمرن، بەڵام لە باڵق دا لەوانەیە تا رێژەی ٦٠٪ یان بمرن). ماکەکان بریتین لە خانەسۆ، پیسبوون sepsis، سیەسۆ و ئێسکەسۆ.

پێست شیبوونەوەکە لەژێر چینی دەنکۆڵەیی دا ،بەهۆی ژەهری دەرەکی S و B، روودەدات کە دێسمۆگلاین ۱ (desmoglein I) درز پێدەبات و ئەمیش دژەژیندەرە بۆ دژەتەنی خۆیی لە نەخۆشی بڵقی کاژی pemphigus foliacious دا، هەر بۆیە SSSS و بڵقی کاژی لە نموونە وەرگرتن دا وەك یەکن.



**چارەسەر**

دایکلۆکساسلین + چارەسەری سووتان (ئاو وخوێ لەبرخستنەوە) - تاد.

## ۲) کۆنیشانەی ژەهرەلێدان Toxic shock syndrome (TSS): دوو جۆرە: (وێنەی ۲۹۷)

أ) **جۆری تێکەوتن (بێ نوێژی)** Menstrual: جاران باوبوو بەڵام ئێستا دەگمەنە، زۆربەیان بە هۆی بەکارهێنانی سانتی جۆری فرەهەڵمژ super absorbent tampons ،کە ئێستا لابراوە، روودەدات.

ب) **جۆری تر** Non-menstrual type: بە هۆی تووشێنی infection پێست، شانەی نەرم، ئێسك و سی بە



(وێنەی ۲۹۷)
کۆنیشانەی ژەهرەلێدان.

بەكتریای ستافیلۆكۆكەس، یان تووشێن بە هۆی تاڵ بۆری catheter، پاكی لووت nasal pack، ئامێری نەزۆكاندن contraceptive device و برینی پێست روودەدات.
ژەهری یەكی TSS (TSST-1) لەلایەن بەكتریاكە، كە بەرگرە بۆ پەنسلین، دروست دەبێت و ناساغیەكە دروست دەكات.

تا بەرزتر لە ٣٨,٩ پلەی سەدی، سووربوونەوەی سوریژەیی، كاژفرێدانی بەری دەست و پێ ١-٢ حەفتە دوای دەست پێكردن، دابەزینی پەستانی خوێن، گرفتی ٣ یان پتر لە ئەندامەكان ﴿گەدە و ریخۆڵە (وەك رشانەوە و سكچوون)، ئازاری ماسولكە، بەرزبوونەوەی ئاستی CPK، ناوپۆش سووربوونەوە، گورچیلە "میزەكێم pyuria یان بەرزبوونەوەی ئاستی یۆریا یان كریاتینین"، تێكچوونی جگەر یان CNS – تاد﴾ روودەدەن.

هەندێك باری ئەم نەخۆشیە، بەهۆی بەكتریای سترێپتۆكۆكەس كۆمەڵی A جۆری $M_1$ و $M_3$ كە دەرەژەهری A دروست دەكات، روودەدات و ٣٠٪ی نەخۆشەكان دەكوژێت. بەلام بەكتریای ستافیلۆكۆكەس رێژەی ٥-١٢٪ یان دەكوژێت.

چارەسەر

١- لەبرخستنەوەی دەستبەجێی ئاو وخوێ.
٢- لابردنی هۆكار (سانتنی، دوومەڵ كردنەوە).
٣- نافسیلین nafcillin ١-١,٥ گم بە خوێن (I.V.)، هەر ٤ كاتژمێر جارێك.
٤- گاماگلۆبیولین بە خوێن و پلازمای بەستووی نوێ FFP.

## تووشێنەكانی سترێپتۆكۆكەس لە پێست دا، Streptococcal skin infections

سترپتۆكۆكەس بەكتریایەكی خڕی گرام پۆزەتیفە، بەلام كەتالەیس نێگەتیفە و هەوایی و ناهەوایییە. كۆمەڵی ئەم بەكتریایە ١٨ جۆرن (A تا R)، كۆمەڵی A بەتایبەتی تووشی پێست دەبێت و پێی دەڵێن سترپتۆكۆكەس پایۆجینیس (س. پایۆجینیس) S. pyogenes، ئەمیش بەپێی پرۆتینی سەر دیواری خانە دوو جۆرە M و T. پرۆتینی M بەكتریاكە لە قووتدان دەپارێزێت و یارمەتی پێوەنووسانی بەكتریاكە بە رووی رووپۆشەخانە دەدات و بەشداری لە دڕی virulence دەكات. تەنیا ٦٠٪ی خەڵكی لە گەروو و رێژەیەكی كەمتر لە كونی لووت دا هەڵگری ئەم بەكتریایەن ، تووشێنی پێست بەم بەكتریایە پێویستی بە بریندار بوونی پێست هەیە.

نەخۆشیەكانی پێست بەم بەكتریایە ئەمانەن:

**١) قەتماغەچاڵە برینی. ٢) ئاگرە.**

٣) **خانەسۆ** Cellulitis: سۆی کێمی ژێر پێستە بەهۆی س. پایۆجینیس یان س. ئۆریەس s. aureus، بە شێوەی سووربوونەوەیەکی کەم و ئازار و لەرز و تا دەست پێدەکات، سووربوونەوەکە پڕ دەبێت لەگەڵ ئاوسان و تەنینەوە، هەندێك جار بەشی ناوەڕاست دەبێت بە گرێیی و بە بلۆق دەوردەدرێت کە دەقەقێت و کێم و مژادی دارزاو فڕێ دەدات، لیمفە بۆریەسۆ و بڵاوبوونەوە بۆ لیمفەگرێ جێیەکان روودەدەن،



(وێنەی ٢٩٨) خانەسۆ.

لەوانەیە لاڕەشە و دوومەڵی تەشەنەکردوو (بڵاوبووەوە) metastatic abscesses و پیسبوونی بەد grave sepsis لە منداڵ و بەرگری سست لە باڵق دا رووبدەن، برینداربوونی پێست پێویستە بۆ ئەم ناساغیە، تا رووبدات وەك کەڕووی ناو پەنجە، شێرپەنجەی خوێن، نەخۆشی شەکرە، بەکارهێنانی مژادە هۆشبەرەکان، نەخۆشی بۆری خوێن و دڵ – تاد. (وێنەی ٢٩٨)

خانەسۆی درێژخایەن و سەرهەڵداوە بەهۆی فرە مەی خواردنەوە alcoholism، نەخۆشی شەکرە، سستی بەرگری، کەڕووی نێو پەنجەی پێ، خوێن داوەستان (خوێنهێنەمەنگی) venous stasis، لیمفە ئاوسان lymphoedema – تاد روودەدات.

**چارەسەر**

پەنسیلینی پێنیسیلینەیس نەستێن penicillinase-resistant-penicillin بە خوێن، وەك نافسیلین nafcillin یان ئۆکساسیلین oxacillin بۆ ١٠ رۆژ، یان سیفالێکسین بۆ ئەوەی لەناوبردنی هەردوو بەکتریاکە (سترێپتۆکۆکەس پایۆجینیس + ستافیلۆکۆکەس ئۆریەس) مسۆگەر بێت.



(وێنەی ٢٩٩) رووکەشە خانەسۆ.

٤) **رووکەشەخانەسۆ** Erysipelas: هۆکارەکەی س. پایۆجینیسە ،بەڵام هەندێك جار کۆمەڵی (C، G، B سترێپتۆکۆکەس) یان س. ئۆریەس و بەکتریای تر دروستی دەکەن. لە دەموچاو یان پەلی خوارەوە بە شێوەی سووربوونەوە و ئاوسان کە لێوارەکەی بەرزبووەوە و دیارە ،روودەدات. ئەم سۆیە تیژە و بنتوێژ و لیمفە بۆریەکانی بنتوێژ دەگرێتەوە، تا و لەرز و سەرئێشە و رشانەوە و ئازاری جومگەی لەگەڵدایە و ژمارەی خانەی سپی بۆ ٢٠,٠٠٠/ملم٣ بەرزدەبێتەوە. هەندێك جار بلۆق لەسەر قوتکە ئاوساو و سوورەکە دەردەچێت، هەندێك جار لەرز و تا – تاد لەگەڵیدا نییە.

ئەم رووکەشەخانەسۆیە لەوانەیە پەرەبستێنێت پیسەزانەخوێن septicemia، خانەسۆی قـوولٚ و دارزینە پۆشەرەسۆ necrotizing fascitis دروست بکات. (وێنەی ٢٩٩)

هۆکاری یاریدەدەری دروستبوونی بریتین لە روشان (برین)، درز لە (کـونی لـووت، گوێچـکە، پشتی گوێچکە، کۆم، چووك، نێوان و ژێـر پەنجـەی پـێ)، پـیس گرێـدانی پـەتی نـاوك (لـە کۆرپـەی لەدایکبوو)، کەموکووڕی خوێنهێن، قەڵەوی، لیمفەئاوسان و چاڵەبرینی درێژخایەنی لاق.

**چارەسەر**

١) پەنسلین بۆ ١٠ رۆژ، ئیریثرۆمایسین.

٢) چارەسەری جێیی، ساردکردنەوە بە سەهۆڵ و پاکی (گۆزی) سارد.

٥) **دارزێنە پۆشەرەسۆ** Necrotizing fascitis: بریتییە لە تووشێنی دارزێنی تیژی پۆشەر، دوای نەشتەرگەری و زەبری پێستکونکەر، یان سەربەخۆ، بـەهۆی چـەندەها جـۆری بـەکتریا وەك سترێپتۆکۆکەسی کـەم هـەوایی تێکشـکانی بێتـا micro-aerophilic-beta-hemolytic streptococci، ستافیلۆکۆکەسی تێکشـکانی، کۆلیفۆرمـەکان coliforms، ئینتیرۆکۆکـەس، پسودۆمۆناس و بەکتیرۆیدەکان روودەدات.



(وێنەی ٣٠٠) دارزێنە پۆشەرەسۆ.

**نیشانەکانی**: سووربوونەوە و ئاوسان و ئازار لە ١–٢ رۆژدا دەگۆرێت بۆ پەیدابوونی رەنگ شینی لـە ناوەڕاست دا بە بوونی یان نەبوونی بڵقی زەرداو خوێنی دەڵاو، پارچە تووشبووەکە سڕدەبێت و لە ٤– ٥ رۆژدا لارەشـە دەبێـت و رێـژەی ٢٠٪ی نەخۆشەکان ئەگەرچی زۆر بـاش چارەسـەربکرێن هەر دەمرن، لە کۆرپە دا پـتر لـە پێسـتی سـك دا روودادات و رێژەی مردنیش پترە. (وێنەی ٣٠٠)

**چارەسەر**

پاککردنـەوە بـە نەشـتەرگەری surgical debridement زۆر گرنگـە + ئـەنتیبایۆتیك ،بەپێی ئەنجامی چـاندن و ئـەزموونی هەسـتیاری ،+ چارەسەری گشتی supportive treatment.



(وێنەی ٣٠١) بلقە پەنجەسۆی سەرپەڕ.

٦) **بلقە پەنجەسۆی سەرپەڕ** Blistering distal dactylitis: بریتییە لە بلّقی رووکەشی پتەو لەسەر پێستی سووربووەوەی بە ئازار لە بەری پلی سەرپەڕی پەنجە لە دەست یان پێ دا، زۆربەیان ۲-۱٦ ساڵن، س. پایۆجینیس یان س. ئۆریەس هۆکاری سەرەکین(وێنەی ۳۰۱).

٧) **پێستەسۆی ناوگەڵی** Perineal dermatitis: بریتییە لە سووربوونەوەی سنووردیاری رووکەشی دەوری کۆم و لە ۱-۸ ساڵی دا روودەدات، هەندێك جار درز و ئازار، بەتایبەتی کاتی پیسایی کردن، هەیە و لەوانەیە ببێتە هۆی گیرانی پیسایی و هەندێك جار کیلەك و چووك دەگرێتەوە، هۆکارەکەی س. پایۆجینیسە بەڵام بە دەگمەن س. ئۆریەسە. (وێنەی ۳۰۲)



(وێنەی ۳۰۲) **پێستەسۆی ناوگەڵی.**

**چارەسەر**

پەنسیلین یان ئیریثرۆمایسین + پاکژکەری یان ئەنتیبایۆتیکی جێیی بۆ ۲-۳ حەفتە.

٨) **لۆچەسۆی سترێپتۆکۆکەسی** Streptococcal intertrigo: بریتییە لە سووربوونەوەی گڕی (ئاگری) fiery-red خووساوی مل، ژێرباڵ یان لاڕان لە ساوا و مناڵان دا، هەندێك جار بە ئازارە و بۆگەناوییە، هۆکارەکەی س. پایۆجینیسە و چارەسەری پەنسلین و پاکژکەری جێیی و ستیرۆیدی جێییە.

٩) **سووربوونەوەی لێواری** Erythema marginatum: باسمانکرد.

١٠) **سوورە تا** Scarlet fever: هۆکارەکەی دەرەژەهری سوورێنە erythrogenic exotoxin کە لەلایەن کۆمەڵی A سترێپتۆکۆکەس دروستبووە، ئەم ناساغیە لە مناڵان دا (۲-۱۰ ساڵی) روودەدات، دوای کاتی بەرهاتن کە ۲-٤ رۆژە گەرووسۆ pharyngitis و تا بۆ پلەی ۳۸,۹-٤۰ سەدی و هێڵنج و رشانەوە و سەرئێشە و لاوازی و سکئێشە و هەڵلەرزین روودەدەن، تا لە دووەم رۆژدا لە لوتکەی بەرزیدایە و لە ٥-٦ رۆژ دا نامێنێت، گرتنەوەی پێست (سووربوونەوە) ۱-۲ رۆژ دوای گەرووسۆ دەردەکەوێت(وێنەی ۳۰۳).



(وێنەی ۳۰۳) **سوورە تا.**

[illegible] Enanthem: گەروو سووری گۆشتیە ( واتا وەك رەنگی گۆشتە) beefy red و ئاڵوەکان ئاوساون، مەڵاشوو و گەلالوچ uvula سووربوونەتەوە، لیمفەگرێسۆی بە ئازاری ژێر کاکیلەی دوولایی هەیە،لە چەند رۆژی یەکەمدا زمان سپی وکوڵکنە furred بەڵام لێوار و پێشەوەی زمان سوورن، گۆکان papillae درێژ و گەورەتر دەبن و زمان دەبێتە زمانی سپیە تووی white strawberry tongue و ٤–٥ رۆژ دواتر کوڵکنی فڕێ دەدرێت و زمان سووری رۆشن و گۆکانی سەری زۆر زەق دەردەکەون (زمانی سوورە تووی red strawberry tongue).

[illegible] سووربوونەوە لە سەر و دەموچاو دەست پێدەکات و بۆ قەد و پەلەکان جگە لە بەری دەست و پێ لە ٣٦ کاتژمێردا بڵاودەبێتەوە، سووربوونەوەیەکی بڵاوە و تەنۆچکەی خاڵی (١–٢ ملمی) لە ناو دایە، دەموچاو جگە لە دەوری دەم سوورهەڵگەڕاوە flushing، لە لەش دا سووربوونەوەکە لە لۆچەکان و سك و سمت و برپڕەی سمت زەقترە و لە بەشی ناوەوەی ئانیشك و ئەژنۆ شێوەی هێڵی خاڵی خوێنی وەردەگرێت (هێڵی پاستیا pastia's lines)، ئەم سووبوونەوەیە لە ٤–٥ رۆژدا نامێنێت و کاژ فڕێدان لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەست پێدەکات و دواترین شوێن لە کاژفڕێدان دا (٢–٣ حەفتەی نەخۆشیەکە) دەست و پێیە. کاژی لەش بچووکە بەڵام هی دەست و پێ توێکڵی (پوولەکەی) گەورەترن.

چارەسەر

پەنسیلین، ئیریثرۆمایسین یان دایکلۆکساسلین، ئاکامەکەی زۆر باشە.

## تووشێنی بەکتریای تر

١) رووکەشەخانەسۆئاسا Erysipeloid: (وێنەی ٣٠٤)

بەهۆی بەکتریای گرام پۆزەتیفی کەم هەوایی دیوار رەق ئیریسیپیلۆثریکس رۆسیۆپاثیا Erysipelothrix rhusiopathia لە پێستیی برینداربوو لە ماسی گر و گۆشت فرۆش و ژنی ماڵ کە ماسی کاڵ و بەرهەمی ئاژەڵ بەر دەستی بکەوێت روودەدات . لە ئاژەڵ (بەراز) و باڵندە (قەل)دا باوە، کاتی بەرهێنان ٢–٧ رۆژە، پارچەیەکی بەرزبووەوەی وەنەوشەیی بەئازار و گەرم و لێواردیار، دروست دەبێت، لەگەڵ لیمفەبۆریە سۆی جێیی و لیمفەگرێسۆ هەندێك جار. ئەوسا بۆ دەورووبەری دەکشێت و ناوەڕاستەکەی



(وێنەی ٣٠٤) رووکەشە خانەسۆئاسا.

ئاسایی دەبێتەوە، بە دەگمەن جومگەسۆ و لە شوێنی دوور دەردی تر دێنە کایەوە، دوای ۳ حەفتە چاك دەبێتەوە.

**چارەسەر**

پەنسلین ۱ گم/رۆژ بۆ ٥-١٠ رۆژ، سیپرۆفلۆکساسین، کلیندامایسین.

۲) **پیسەهەو (پیسەپۆلو)** Anthrax: هۆکارەکەی بریتییە لە بەسیللەس ئەنثراکس Bacillus anthracis ،ئەم بەکتریایە شێوەی داری جەمسەر چوار گۆشەیی هەیە، گرام پۆزەتیفە، یەك یەك یان بە جووتە یان بە شێوەی ریزی ماسی ،دەردەکەون، سێ فاکتەری هێزی virulence factors هەیە: ١) قاوغ کە دژی قوتدانە، ٢) ژەهری ئاوسین oedema toxin، ٣) ژەهری کوشندە lethal toxin.



نەخۆشی پیسەهەو تووشی ئاژەڵ دەبێت و لە ئاژەڵیشەوە مرۆڤ دەیگرێتەوە، هەر بۆیە نەخۆشیەکە پتر تووشی شوان و گاوان و گۆشت فرۆش و کرێکاری خوری و پێستە (وێنەی ۳۰٥) **پیسەهەو.** خۆشکەر و کرێکاری کارگەی مووی بزن و سەروویێ چاککەر و پزیشکی ئاژەڵ – تاد دەبێت. لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ بەهۆی جلی بەر پیسەهەو کەوتوو کەم جار دەگوازرێتەوە (وێنەی ۳۰٥).

سێ جۆری هەیە:

١- جۆری سییەکان Pulmonary A **بەهۆی هەڵمژینی سپۆری بەکتریاکە روودەدات و دەبێتە هۆی ناوەندە سینگەسۆی خوێنڕیزی haemorrhagic-mediastinitis ئەوسا بەکتریازانە خوێن bacteraemia و مێشکەپەردەسۆی خوێنڕیزی haemorrhagic meningitis و مردن (بە چارەسەری چالاکیش ٤٠-٥٠٪ یان هەر دەمرن).**

٢- جۆری گەدە و ریخۆڵەیی Gastrointestinal A: **بەهۆی خواردنی سپۆرەکان کە دابەش دەبن لە ژێر ناوپۆشی ریخۆڵە و دەبێتە هۆی چاڵەبرینی داڕزێنی کۆتایی ریخۆڵە باریکە و پانەریخۆڵە caecum و خوێن بەربوون.**

٣- جۆری پێستی Cutaneous A: **بە تەنۆچکەیەکی سوورکردوو( ۳-٥ رۆژ دوای رووان inoculation) لە شوێنە رووتەکان (دەست و دەموچاو – تاد) دەست پێدەکات، لە ۲٤-۳٦ کاتژمێردا سۆ پتر دەبێت، لەگەڵ ئاوسان و بڵق و تەنینەوە، ئەوسا دەتەقێت و سوتکەی eschar قاوەیی و رەشی دەوردراو بە بلۆق لەسەر پێستی ئاوساو و سوور و پتەو دەردەچێت. ئازاری نییە، لیفەگرێ جێیەکان گەورەدەبن و بەئازارن و لەوانەیە بکرێنەوە و کێم بدەڵێنن، هەندێك جار ئەم پرۆسەیە زۆر تیژە و تا و ئارەق دەردانی لە گەڵدایە و لەوانەیە لە چەند رۆژ بۆ چەند حەفتەیەك نەخۆشەکە بمرێت (لە ۲۰٪ی بارەکان دا)، لە باری سووك دا بی چارەسەر چاك دەبێتەوە.**

دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکە:

١) سڕین smear و چاندن culture، بۆ جیاکردنەوەی لە بەکتریای هاوشێوە ئەلفابەکتیریۆفەیج ∝-bacteriophage بەکاردەهێنرێت.

٢) ئەزموونی ئیلایزا eliza.

٣) نموونە وەرگرتن.

٤) کاردانەوەی زنجیرەی پۆلیمەرەیس polymerase chain reaction (PCR).

چارەسەر

زوو چارەسەرکردن زۆر گرنگە.

١. سیپرۆفلۆکساسین ٥٠٠ ملگم یان دۆکسی سایکلین ١٠٠ ملگم رۆژی ٢ جار بۆ ٦٠ رۆژ.

٢. پەنسلین (کریستەلاین پەنسلین) بەخوێن ٢ ملیۆن یەکە ٦ کاتژمێر جارێك بۆ ٧-١٤ رۆژ.

٣. بۆ جۆری یەك و دوو کریستەلاین پەنسلین ٢ ملیۆن یەکە ٢ کاتژمێر جارێك.

٤. بۆ خۆپاراستن ﴿مرۆڤی لێککەوتوو بە ئاژەڵی تووشبوو بێ بوونی نەخۆشیەکە﴾ دۆکسی سایکلین یان سیپرۆفلۆکساسین، بۆ ٦ حەفتە.

پێکوتە: ٢ جۆر هەیە و لە پێشکەوتن دایە.

تێبینی: ئەم بەکتریایە بە شێوەی یاخی لە ئەنتیبایۆتیك پەرەی پێدراوە و لە تیرۆردا لە USA ساڵی ٢٠٠١ بەکارهاتووە.

٣) **سووربوونۆکە** Erythrasma: هۆکارەکەی بریتییە لە بەکتریای کۆرانیبەکتریەم - مینوتیسیمەم Corynebacterium minutissimum.



(وێنەی ٣٠٦) سووربوونۆکە.

نیشانەکانی: پارچەی کەم کاژی قاوەیی وشك و سنوور دیار لە لۆچەکان (ژێر باڵ، لاران، نێوان پەنجە پێی ٤و ٥) و هەندێك جار نێوان هەر دوو سمت، دەوری کۆم و ژێر مەمك دەردەکەوێت لەگەڵ کزانەوە و هەندێك جار خورانی کەم، بە تیشکی ود Wood light تیشکدانەوەی سووری شیلانی coral red florescence. دەردەکەوێت. (وێنەی ٣٠٦)

چارەسەر

شلەی ئیریثرۆمایسین، کلیندامایسین یان بە دەم ئیریثرۆمایسین ٢٥٠ ملگم × ٤ بۆ حەفتەیەك یان مایکۆنازۆڵ کرێم یان یەك ژەمی کلاریثرۆمایسین ١ گم.

٤) **مووکەڕووی ژێر باڵ** Trichomycosis axillaris: بەکتریای کۆڕانیبەکتریەم دروستی دەکات، گرێی ١-٢ ملمی جیاجیای نووساو بە پتەوی بە قەدی مووی ژێر باڵ یان بەر دیارن و ڕەنگیان زەرد، سوور یان ڕەشە، فرەئارەقکردنەوە باوە، هەندێك جار پێستی ژێر باڵ زەردە، گرێکان لە بەکتریاکە پێکهاتوون. (وێنەی ٣٠٧)



(وێنەی ٣٠٧) مووکەڕووی ژێرباڵ.

**چارەسەر**: موو تاشین، کلیندامایسین یان ئیریثرۆمایسین (جێیی) لەگەڵ ئارەق کەمکەرەوەکان (دریکلۆر).

٥) **قۆچەکاژشیبوونەوەی چاڵی** Pitted keratolysis: لەوانەیە هۆکارەکەی بەکتریای کیتۆکۆکەس – سیدینتاریۆس Kytococcus-sedentarius بێت. لە بەری پێدا و بە دەگمەن لە بەری دەست کە فرەئارەق کردنەوە هەبێت، بە شێوەی چاڵی جیاجیای خڕی ١-٣ ملمی رووکەشی و هەندێك جار بە کۆمەڵ لە وەرزی گەرمای شێداردا روودەدات، بێ ئازار و خورانە، بەڵام بۆگەن دروست دەکات(وێنەی ٣٠٨).



(وێنەی ٣٠٨) قۆچە کاژشیبوونەوەی چاڵی.

**چارەسەر**

ئارەق کەمکەرەوە، ئیریثرۆمایسین یان کلیندامایسین (جێیی)، مایکۆنازۆڵ و کلۆترایمازۆڵ کرێم.

٦) **لاڕەشە** Gangrene

باسی ئەم جۆرانە دەکەین کە بە تووشێنی بەکتریا روودەدەن:

أ) **داڕزێنە پۆشەرەسۆ**: باسمانکرد.

ب) **داڕزێنە خانەسۆی هاوکاری (گەلەکۆمی)** Synergistic-necrotizing-cellulitis: ئەم لاڕەشەیە بەهۆی کۆمەڵێك بەکتریا (بەکتریای ناهەوایی وەك سترێپتۆکۆکەسەکان و بەکتیرۆیدەکان، بەکتریای کەم هەوایی وەك ئی. کۆڵای E. coli، پرۆتیەس proteus، کلێبسیەللا klebsiella – تاد) روودەدات، شوێنە تووشبووەکان بریتین لە ناوگەڵ (بەهۆی دوومەڵی دەوری ڕێکە peri-rectal abscess و دوومەڵی سمتی ڕێکەیی

ischiorectal abscess) (٥٠٪ی بارەکان)، سمت و ران و لاق (٤٠٪) و ١٠٪ی بارەکان لە سك و خوارەوەی لاقن. هەموو شانە نەرمەکان و ماسولکەکان دەگرێتەوە بە شێوەی بڵقی سووری قاوەیی و دارزان و لارەشە و چەندین لۆچی دەڵێنەر بۆ مژادی زەرد و چەوری دارزاو و بۆگەن، ژێری لارەشەکە زۆر قووڵ و پانترە لە رواڵەتی دەرەوەی، ئازاری زۆرە (وێنەی ٣٠٩).

زۆربەی نەخۆش لاواز و پیرن، یان زۆر قەڵەون و نەخۆشی تریشیان هەیە وەك نەخۆشی گورچیلە و بۆری خوێن و دڵ و نەخۆشی شەکرە، رێژەی مردن بە چارەسەریش لە ٤٠-٥٠٪ پترە.


(وێنەی ٣٠٩) دارزینە خانەسۆی گەلەکۆمی.

چارەسەر

drainage کردنەوە، پاککردنەوە، دەرکردن و هەندێك جار برینەوە amputation + دژەبەکتریا بە خوێن بە پێی ئەنجامی چاندن و ئەزمونی هەستیاری.

ج) لارەشەی فۆرنیەر Fournier's gangrene: تووشێنی بەکتریایی پیسی لارەشەیی پێستی باتوو، چووك یان ناوگەڵ جۆرێکە لە دارزینە پۆشەرەسۆ لە ٢٠-٥٠ساڵی دا بەهۆی س. پایۆجینیس یان تێکەڵی چیلکەریخۆڵەییەکان enteric bacilli و بێ هەواییەکان anaerobes، زۆربەیان نەخۆشی تریان هەیە وەك نەخۆشی شەکرە، دوومەڵی سمتی رێکەیی، ناسۆری ناوگەڵ، نەخۆشی ریخۆڵە وەك شێرپەنجە - تاد، زەبری گون یان چووك ، نەشتەرگەری، چاڵەبرینی پەستان - تاد.

نیشانەکان: سووربوونەوە، ئاوسان، دارزان، کرتەکرت crepitus، دەڵاندنی کێمی بۆگەن ئەوسا لارەشە.


(وێنەی ٣١٠) لارەشەی گازی
(بە بەکتریای کلۆستریدیەم).

چارەسەر

پاککردنەوەی سەراپایی، دژەبەکتریا و پاڵپشتی گشتی general support.

د) لارەشەی گازی Gas gangrene: (وێنەی ٣١٠)
تیژترین جۆری لارەشەی بەکتریاییە، لە قووڵایی ماسولکە دڕاوەکاندایە (برینداربووەکان)، کاتی بەرهێنان چەند کاتژمێرێکە، بە تا و هەڵلەرزین دەست پێدەکات، فرە ئارەقکردنەوە و ئازاری جێیی هەن و بڵقی گازی (هایدرۆجین) کرتەکرت بە پەستان دروست دەکات (بە

بەردەستەکردن palpation) و بۆگەنی هەیە، هۆکارەکەی بریتییە لە بەکتریای کلۆستریدیەم – پێرفرینجینس Clostridium-perfringens، ك. ئۆدیماتیانس Cl. oedematiens، ك. سێپتیکەم Cl. septicum، ك. دیفیسیل Cl. difficile و ك. هیمۆلیتیکەم Cl. haemolyticum. جۆرێکی ژێر تیژ بەهۆی ستریپتۆکۆکەسی ناهەوایی، بەکتیرۆیدەکان و پریڤۆتێلا prevotella دروست دەبێت.

چارەسەر

پاککردنەوەی سەراپایی، دژەبەکتریای بەهێز و بە ژەمی بەرز ( وەك پەنسیلین V بەخوێن + کلیندامایسین)، ئۆکسجینی پەستراو.

ج) قەتماغە چاڵەبرینی لارەشەیی Ecthyma gangrenosum: لەو کەسانەی کە نەخۆشی مەترسیداریان هەیە وەك: شێرپەنجەی خوێن، سووتانی بلاو، کەم خانەی سەراپایی خوێن pancytopenia ، شێرپەنجە – تاد، یان لە ساوادا ،روودەدات. بلۆقی پتەو یان پیزۆکەی دەوردراو بە خەرمانەی باریکی سوور یان وەنەوشەیی خێرا دەبێت بە چاڵەبرینی خڕی خوێنڕێژی لەگەڵ لارەشە لە ناوەڕاستی دا، زۆربەیان لە سمت و پەلەکانن و لەوانەیە بە کۆمەڵ بن. هۆکارەکەی بەکتریای سودۆمۆناس ئەیرۆجینۆسایە Pseudomonas-aeruginosa. (وێنەی ٣١١)


(وێنەی ٣١١) قەتماغە چاڵە برینی لارەشەیی.

چارەسەر

دژە سودۆمۆناس بە خوێن وەك: ١) سیفتازیدیم ceftazidime + تۆبرامایسین tobramycin یان ٢) تیکارسیلین ticarcillin، مێزلۆسیلین mezlocillin یان میرۆپینیم meropenem + تۆبرامایسین، یان ٣) ئیمپینیم imipenem یان میرۆپینیم meropenem + تۆبرامایسین، یان ٤) سیپرۆفلۆکساسین، ئەزترێۆنام aztreonam + تۆبرامایسین.


(وێنەی ٣١٢) تیشکە کەڕوو.

٧) **تیشکەکەڕوو** Actinomycosis (Ray-fungus): بەکتریای ئەکتینۆمایسیس – ئیزرائیلی Actinomyces-israelii و جۆرەکانی تری (بەکتریای ناهەوایی، گرام پۆزەتیف و چیلکەیی) ئەم نەخۆشیە دروست دەکەن. پتر لە ناوەڕاستی تەمەن لە نێرینەدا ڕوودەدات، لە مل و دەموچاو cervicofacial، سك، سنگ و ئەستێلك pelvis بە شێوەی گرێ و قوتکە و ناسۆری دەڵێنەر دەردەچن، لەوانەیە دەنك grains یان دەنکۆڵەی granules گۆگردی sulphur لە دەلاوەکەدا هەبن، کە پێکهاتوون لە دەزووی لقداری باریك و کۆتایی دەزووەکان سوور و خڕن. لەوانەیە ئەم نەخۆشیە تووشی ئێسکی کاکیلە، یان ڕیخۆڵە یان ئالوو یان سی بێت. (وێنەی ٣١٢)

**چارەسەر**

١- پەنسلین G ١٠-٢٠ میگا یەکە بۆ ١ مانگ ئەوسا ٤-٦ گم پەنسلبین بە دەم بۆ ٢ مانگ. یان:

٢- ئەمپیسلین، ئیریثرۆمایسین، تێتراسایکلین، سیفتریاکسۆن یان کلیندامایسین.

٣- کردنەوە بە نەشتەرگەری و دەردان و بڕین گرنگن.



(وێنەی ٣١٣)
کۆنیشانەی سەوزە نینۆك.

**کۆنیشانەی سەوزە نینۆك** Green nail syndrome: بریتییە لە جیابوونەوەی کۆتایی نینۆك و سەوزبوونی بەشە جیابووەکە، زۆربەیان سۆی دەوری نینۆکیان ،بەهۆی زۆر دەست تەڕکردن، هەیە. بەکتریای سودۆمۆناس هۆی ڕەنگە سەوزەکەیە. (وێنەی ٣١٣)

**چارەسەر**

پەنجە تووشبووەکە بخرێتە ناو شلەی ئەسیتیك ئەسید ١٪ ڕۆژی ٢ جار، وشك ڕاگرتنی دەست، شلەی سیلڤەر نایترەیت ٠,٥٪ ڕۆژی ٢ جار.



(وێنەی ٣١٤) تووشێنی نێوپە نجەی پێ.

**تووشێنی نێوپە نجەکانی پێ** Toe web infection: زۆربەی جار کەڕووی لەگەڵدایە، بەلام بەهۆی خووسان و تەڕکردن، بەکتریای گرام نێگەتیف،وەك سودۆمۆناس و هی تریش دەڕوێن. چارەسەری وەك نینۆکی سەوزە. (وێنەی ٣١٤)

# نەخۆشیەکانی مایکۆبەکتریا Mycobacterial diseases

## سیلی پێست Tuberculosis of the skin

سیلی پێست بە هۆی بەکتریای مایکۆبەکتیریەم تیوبەرکیولۆسس (م.ت.) -Mycobacterium tuberculosis یان م. بۆڤیس M. bovis و کەم جار بەهۆی بەسیللەس – کالمێتی – جویرین (BCG) دروست دەبێت.

**ئەزموونەکان**

١) ئەزموونی تیوبەرکولین Tuberculin testing: بەرگری جۆری چوار بۆ بەکتریای سیل دەردەخات و باشترین ڕێگایە بۆ دیارکردنی تووشێن بە بەکتریاکە، دوای ٢–١٠ حەفتە لە تووشێن پۆزەتیف دەبێت و بۆ چەند ساڵێك دەمێنێتەوە. جۆری لێوەرگیراوی پرۆتینی پاککراو -purified-protein derivative (PPD)بەکاردەهێنرێت بە ژەمی ٥ یەکەی تاد (5TU) و ئەم ئەزموونە بە دەرزی بۆ ناو بن توێژ intradermal لێ دەدرێت (ئەزموونی مانتۆکس mantoux test) و لە ٤٨–٧٢ کاتژمێردا دەخوێنرێتەوە، تۆکمە induration بوون لە ١٠ ملم پتر بە پۆزەتیف وەردەگیرێت کە نیشانەی تووشێنی رابوردوو یان ئێستایە.

٢) نموونە Histopathology: گۆشتەزوونەگمۆلی سیل tuberculoid granuloma بریتییە لە کۆبوونەوەی خانەی شانەیی رووپۆشەخانەگمۆلی epithelioid-histiocytes لەگەڵ خانەی زەبەلاحی لانگانس Langan's giant cells و دارزانی پەنیرئاسایی caseation-necrosis لە ناوەڕاست دا، ئەمانە دەوردراون بە لێوارێکی خانەیی لە خانەی لیمف lymphocytes و تاکناوك خانە monocytes.

٣) کاردانەوەی زنجیرەی پۆلیمەرەیس Polymerase-chain-reaction: بۆ جیاکردنەوەی سیلی فرەچیلکەیی multibacillary لە تووشێن بە مایکۆبەکتریای نائاسایی -atypical mycobacteria بەکەڵکە.

٤) چاندن Culture: باشترین ڕێگایە بۆ زانینی مایکۆبەکتریای زیندوو و هەستیاری بە دژەمایکۆبەکتریا و بۆ بەدواداچوونی کاریگەری چارەسەر.

**پێکوتەی BCG:** بریتییە لە چیلکەی م. بۆڤیس کە لاوازکراوە attenuated بۆ پترکردنی بەرگری دژی سیل، تەنیا بەوانەی ئەزموونی تیوبەرکیولین تیایان دا نێگەتیفە دەدرێت، کە بە کۆرپە بدرێت بەکارترە لەوەی کە بە باڵق بدرێت. ماکەکانی ئەم پێکوتە دەگمەنن (٢٧ لە ٢٠٠,٠٠٠ کەس دا) و ئەمانەن: لیمفەگرێسۆی جێیی بەردەوام، سیلی پێست، هەندێك جار لیردەرکردن یان فرەشێوەسووری .E.M، سووربوونەوەی گرێیی .E.N و گۆشتەزونەگمۆلی بازنەیی granuloma-annulare.

## جۆرەکانی سیلی پێست

١) **سیلی ڕواو** Innoculation T.B: واتا ڕوانی بەکتریاکە لە سەر پێست لە سەرچاوەی دەرەکی، دوو جۆرە:

أ) **هەوی سیلی** Tuberculous chancre: بە شێوەیەکی سەرەکی تووشی منالآن دەبێت کە پێشتر ئەم بەکتریایە نەچۆتە ناو لەشیان. بەکتریاکە لەسەر پێست دەڕوێت، بۆیە لە شوێنە ڕووتەکان دا وەك دەست و دەموچاو ڕوودەدات بەشێوەی تەنۆچکە، قەتماغە یان برین، دواتر دەبێت بە چاڵەبرین (ڕەنگی تەنۆچکەکە سوور و قاوەییە و بێ ئازارە). لیمفەگرێ جێیەکان دەئاوسێن (ئاوێتەی سەرەتایی primary complexs)، ئەم برینە ٢-٤ حەفتە دوای ڕوان دەردەچێت و لە ساڵێك دا نامێنێت، لیمفەگرێکان ٣-٨ حەفتەی دوای ڕوان دەردەچن و



**(وێنەی ٣١٥) هەوی سیلی.**

درەنگتر چاکدەبنەوە و کە چاکیشبوونەوە بە گەورەیی و ڕەقی (بەهۆی نیشتنی کالسیۆم) دەمێننەوە. ئەم جۆرە سیلە پڕ لە شوێن برین و ڕووشان و چاڵی ددانی هەڵکێشراو - تاد دروست دەبێت. (وێنەی ٣١٥)

ماکەکان: بە کێمبوونی لیمفەگرێی تووشبوو، گورگە ئاسایی lupus vulgaris و بڵاوبوونەوە بۆ شوێنی تر.

ب) **سیلی باڵووکەیی پێست** :Tuberculosis-verrucosa-cutis لەوانە دا کە بەرگری باشیان بۆ بەکتریاکە هەبێت ڕوودەدات و ئەزموونی تیوبەرکولین بە بەهێزی پۆزەتیفە واتا پێشتر بەکتریاکەی چۆتە ناو لەش و لەش بەرگری هەیە (وێنەی ٣١٦).



**(وێنەی ٣١٦) سیلی باڵووکەیی**

**نیشانەکان:** تەنۆچکەکە بەهۆی فرەقۆچەکاژی دەبێت بە باڵووکەیی، هەر دەکشێت( تا چەند سەنتیمەترێك) و لەوانەیە ناوەڕاستەکەی لە کەمبوون دا بێت ،درز لەسەر ڕووی دەردەکە و کێم فرێدان ڕوودەدەن، ئەم جۆرە تاقانەیە (یەك دەردە) و گرێ لیمفەکان تەنیا بە بەکتریای تر گەورە دەبن، پشتی دەست و پەنجە لە باڵق دا و سمت و قولەپێ لە مندالّ دا ئەم ناساغیەیان تووش دەبێت، دەردەکە بەردەوامە بەڵام لەوانەیە خۆی سارێژبێت.

٢) **سیلی دووەمی (سەرچاوەی ناوەکی)** Secondary T.B. (Endogenous source):

أ) **پیسەپێستە** Scrofuloderma: بە بڵاوبوونـەوەی هاوسـێتی contiguous spread لە لیمفەگرێ سۆی سیلی ژێر پێستەکە، یـان ئێسکەسـۆ و جومگەسۆی سیلی روودەدات، واتـا کشـانی راسـتەوخۆی سیل لەم لیمفەگرێ و ئیسك و جومگە تووشبوانە بـۆ ژێـر پێست و پێست. نیشانەکانی برینێن لە بارستەی ژێر پێسـت کە گەورە دەبێت بۆ گرێ و لە ناوەڕاستدا کێم دەدەڵێنێت و ناسـوور یـان چـاڵەبرین دروسـت دەبێـت لەگـەڵ گۆشتەزوونەگمۆڵ. دوای سارێژبوون جێزامی پەتکەیی جێ دەهێڵێـت. پـتر لـە پێسـتی سـەر لیمفـەگرێکانی مـل دا روودەدات. (وێنەی ٣١٧)



(وێنەی ٣١٧) **پیسە پێستە.**

ب) **سیلی دەرچەیی** Orificial T.B.: بریتییە لە سیلی لێواری لکینـی پێسـت و ناوپۆشـی لووت، دەم، کۆم، کیلەك، دەرچەی میز (دەرەکون) و لـە ناوپۆشـی دەم یـان زمـان. بـەهۆی روانـی خـۆیی auto-innoculation لـە سـیلی چـالاکی ژێـرەوە روودەدات وەك سـیلی قورگ، سی، ریخۆڵە و ریچکەی زاوزێ و میزڵـدانی. دەردەکان لەسەرەتاوە چاڵەبرینین و خێـرا دەکشـێن و چـاك نابنــەوە، چــاڵە برینــەکان نــەرم و لێــوار بــەرزبووەوەن. ئــەم جــۆرە نــەبوونی بــەرگری دژی بەکتریاکـە نیشـان دەدات و ئـەزموونی تیوبـەرکولین گۆڕاوە (چەسپاو نییە) بەڵام پۆزەتیفە و لـە کۆتـایی دا نێگەتیف دەبێت.(وێنەی٣١٨)



(وێنەی ٣١٨) **سیلی دەرچەیی.**

٣) **سیلی رێخوێنی** Haematogenous T.B:

أ) **گورگە باو (ئاسایی)** Lupus vulgaris: جۆرێکی پەرەسێنی سیلی پێسـتە لەوانـەی بەرگری مامناوەندی یـان بـەرزیان بـۆ بەکتریاکـە هەیـە. زۆربـەیان ئـەزموونی تیوبـەرکولینیان پۆزەتیفە. ئەم جۆرە لە شوێنی روانی بەکتریاکە، جێزامی پیسەپێستە، شوێنی پێکوتەی BCG یان پتر لە پێستی ئاسایی دوور لە سەرچاوەی سیلەکە دەردەچێت. نزیکەی نیوەیان نیشانەی سیلیان لە شوێنی تر هەیە.

**نیشانەکانی**: قوتکەیەکی تاکی پێکهاتوو لە کۆمەڵێك تەنۆچکەی قاوەیی سوور کە پەستانی بخرێتە سەر بە سلایدێکی شووشە (diascopy) رەنگی جێلی سێو (زەرد و قاوەیی کاڵ) دەنوێنێت. ئەم تەنۆچکانە بە سستی لە لایەك چاك دەبنەوە و لە لایەکی تر پەرەدەستێنن و بچووك و روونن و تەنراون بە قووڵی و بڵاوی لە ناو بن توێژی پێستەوەدا. دەردەکە پەرەدەستێنێت و بڵاوتر دەبێت، قوتکەکە کەم کاژاویە و هەندێك بەرزبۆتەوە و لە پەرەسەندنی دا دەبێتە هۆی تێکدان و چاڵەبرین و جێ زام. (وێنەی ۳۱۹أ ، ب)

چەند جۆرێکی هەیە وەك: جۆری قوتکەیی، جۆری چاڵەبرینی نابووتکەر، قاوجکی، لووی، تەنۆچکەدار و گرێیی و نازبۆشی.





(وێنەی ۳۱۹ أ ) گورگەباو (ئاسایی) (وێنەی ۳۱۹ ب) گورگەنائاسایی.

رێژەی ۹۰٪ لە دەموچاو و سەر و مل روودەدەن، هەندێك جار لیمفەبۆریەسۆ و لیمفەگرێسۆی لەگەڵدایە، لە لووت و گوێچکە و پێڵووی چاو تێکدان و نابووتی جێ دەهێڵێت. زۆر درێژخایەنە و دەیان ساڵ دەمێنێتەوە.

ب) **سیلی بڵاوبووەوە (تەشەنەیی) Miliary (disseminated) T.B.**: لە ئەنجامی دابەزینی بەرگری دژی بەکتریاکە روودەدات، بۆیە ئەزموونی تیوبەرکولین نێگەتیفە. سەرچاوەی ئەم جۆرە سیلی زۆرچالاکی سی و پەردەی مێشکە و بەکتریاکان بە رێگەی خوێن بۆ هەموو پێست بڵاودەبنەوە، پتر لە ساوا و منداڵ دا بەهۆی سووریژە و نەخۆشی تر یان لە نەخۆشی ئەیدزدا روودەدات بە شێوەی پەڵە، تەنۆچکە، پیزۆکە، گرێیۆکەی ژێر پێست یان خاڵەخوێنی بڵاو . هەندێك جار چاڵەبرین و ئازاری زۆری لەگەڵدایە و بارەکە زۆر ترسناکە.

ج) **بنێشتەلووی سیلی Tuberculous gumma**: پتر لە منداڵی کەم بەرگری دا بەهۆی بەدخۆراکی بە شێوەی گرێیۆکەی پتەوی بێ ئازار روودەدات. دواتر نەرم دەبێت و چاڵەبرین و ناسۆری دەڵێنەر بە تایبەتی لە پەلەکانی خوارەوە دەردەچن و وەك پیسەپێستەی لێ دێت. (وێنەی ۳۲۰)



(وێنەی ۳۲۰ ) بنێشتەلووی سیلی.

:) **هەڵتۆقیوی سیلی** Tuberculids = Eruptive T.B.: بریتین لە کۆمەڵێك دەردی هەڵتۆقیوی eruptive lesions پێست وەك کاردانەوەیەکی هەستیاری بۆ سیلی مۆڵگەیی focal T.B. و بە چارەسەری دژە سیل نامێنن و چونیەکی و بلاون. نەخۆش بەرگری مامناوەندی یان بەرزی دژی بەکتریاکە هەیە و ئەزموونی تیوبەرکولین پۆزەتیڤە. ئەم دەردانە بە ڕێچکەی خوێن بڵاوبوونەتەوە، بەڵام بە هۆی بەرگری باشی نەخۆشەکە بەکتریاکان لە پێست دا لەناوچوون، بەڵام مۆڵگەی سیلەکە هەر ماوە بۆیە دووبارە دروست دەبنەوە.

دیارکردنی ئەم جۆرە بە نیشانەکانی، نموونە، تیوبەرکولینی پۆزەتیف و هەندێك جار مۆڵگەی سیلە سەرەتاییەکە دەدۆزرێتەوە و بە چارەسەری دژەسیل نامێنن، بە PCR هەندێك جار DNA بەکتریاکە دەدۆزرێتەوە، جۆرەکانی:

أ) **هەڵتۆقیوی سیلی تەنۆچکە داڕزاو** Papulo-necrotic-tuberculides لە تەمەنی ژێر ٣٠ ساڵی و پتر لە مێینەدا (١:٣) دەردەچن و ڕێژەی ٣٠-٧٠٪ یان سیلی چالاکیان،بە تایبەتی لە لیمفەگرێکان دا، هەیە و هەندێك جار پیسەپێستە و سووربوونەوەی ڕەقبوون erythema induratum هەن. (وێنەی ٣٢١)


(وێنەی ٣٢١ هەڵتۆقیوی سیلی تەنۆچکە داڕزاو.

بە شێوەیەکی چوونیەکی لە بەشی ڕاستێنی extensor پەلەکان بە تایبەتی ئەژنۆ و ئانیشك و پشتی دەست و پێ، سمت، دەموچاو و گوێچکە و گۆی چووك دەردەچن. لە زستان دا توندتر دەبن، دەردەکان (٢-٨ ملم) تەنۆچکەی پتەون و دەبن بە پیزۆکە یان دادەڕزێن، بە سستی لە چەند حەفتەیەك دا نامێنن و جێ زامی مێکوتەیی جێ دەهێڵن و بۆ چەند مانگ یان ساڵ سەرهەڵداوەیە.

ب) **پیسەپێستە سنووری** Lichen-scrofulosorum: ئەزموونی تیوبەرکولین پۆزەتیفە و سیلی ئێسك یان لیمفەگرێکان هەیە. بە شێوەی تەنۆچکەی جیاجیای قۆچەکاژی بچووکی درێژخایەنی بە کۆمەڵی (٢-٤ ملمی) پەمەیی زەرد یان قاوەیی سوور دەردەچن، ئەم تەنۆچکانە پتەو و پانبووەوەن یان کاژێکی بچووك یان پیزۆکەیەکی بچووك بەسەریانەوە هەیە و کۆمەڵی خڕ یان بازنەیی دروست دەکەن و بۆ چەند مانگ بێ سکاڵا دەمێننەوە. هەندێك جار نامێنن و سەرهەڵدەدەنەوە. پتر لە سەر قەدن.

ج) **سووربوونەوەی ڕەقبوون**: باسمانکرد.

### چارەسەر

وەك سیلی ئەندامەکانی تری لەش بە دوو قۆناغ چارەسەر دەکریت:

١-قۆناغی دەست پێکردن Initial phase: بۆ ٨ حەفتە چوار دەرمان بەیەکەوە: ئایزۆنایازید isoniazid ٥ ملگم/کگم/رۆژ (لەگەڵ ڤیتامین B6) + ریفامپیسین rifampicin ٦٠٠ ملگم/رۆژ + پایرازین ئەماید pyrazidnamide ١٥-٣٠ ملگم/کگم/رۆژ + ئیثامبیتۆڵ ethambutol ١٥-٢٥ ملگم/کگم/رۆژ.

٢-قۆناغی بەردەوامبوون Continuation-phase: بۆ ١٨ حەفتە، دوو دەرمان بەیەکەوە: ئایزۆنایازید + ریفامپیسین یان ئایزونایازید + ریفاپێنتین rifapentine.

### ناساغیەکانی بەکتریای سیلی نانموونەیی Atypical-mycobacteriosis

بۆ نموونە:

**گۆشتەزوونەگمۆڵی مەلەوانگە** Swimming-pool-granuloma: مایکۆبەکتیریەم- مارینەم M. marinum هۆکارەکەیەتی. لە شوێنی برین، رووشان یان زەبر لە مەلەوانگە و هەڵسووکەوتکردن لەگەڵ ئاوی دەریا - تاد روودەدات. بە شێوەی تەنۆچکەی بنەوشەیی ،٢-٣ حەفتە دوای بەرکەوتن، دەردەکەوێت و دەبێت بە گرێۆکە یان قوتکەی بالووکەیی یان کاژی لەسەر دەست و پێ و ئانیشك و ئەژنۆ بە شێوەی تاکی یان ریزی sporotrichoid و لە ١-٢ ساڵدا چاکدەبێتەوە. (وێنەی ٣٢٢)





(وێنەی ٣٢٢)
گۆشتەزوونەگمۆڵی مەلەوانگە.

#### چارەسەر

ماینۆسایکلین ٢٠٠ ملگم/رۆژ بۆ ١-٢ مانگ یان دۆکسی سایکلین ٢٠٠ ملگم/رۆژ بۆ ١-٢ مانگ یان ریفامپیسین ٦٠٠ ملگم/رۆژ + ئیثامبیتۆڵ ١٥ ملگم/کگم/رۆژ . هەندێك جار نەشتەرگەری.

## گولی (نەخۆشی هانسن) Hansen's disease = Leprosy

نەخۆشـــیەکی گۆشـــتەزوونەگمۆڵی درێژخایەنـــە، هۆیەکـــەی مایکۆبەکتیریـــەم-لیـــپری Mycobacterium-leprae یە و بە شێوەیەکی بنەڕەتی دەمارەپەڕیەکان و پێست دەگرێتەوە.

گولی لە جیهان دا بڵاوە و زۆربەی بارەکان لە هیندن، لە کوردستان دا لە سنوورەکانی نێوان ئێراق و ئێراندا لە ناوەڕاستی سەدەی بیست دا چەند بارێك هەبووە و من خۆم لـە ٢٥ سـاڵی رابـووردووا نزیکـەی دە-دوانزە نەخۆشم هەبووە و زۆربـەیان پیربـوون و جـۆری گـولی گـولاوی Lepromatous leprosy بوون، بە چارەسەر زۆر باش بوون.

کاتی بەرهاتن .I.P زۆر درێـژە (٥-٢٠ سـاڵ) و زۆربـەی بارەکـان پـێش ٣٥ سـاڵی دیـاردەکرێن. گواستنەوە لە ئەندامانی خێزان دا باوترە و لەوانەیە بە هەڵمژین، یان لـە ئاژەڵێکـەوە پـێی دەڵـێن زرێـپۆش (المدرّع) armadillo (ئاژەڵێکی زرێپوشە لە ئێسکی بچووك و لە ئەمریکای سەروو زۆرە) تووشـی مرۆڤـ بێت. بەکتریای گولی M. Leprae ناچێنرێت uncultivable، چیلکەی ناو خانەی گرام پۆزەتیفی تـرش نەگرە acid-fast بەهۆی دیواری مۆمی خانەکەی. ساڵی ٦٠٠,٠٠٠ باری نوێ لەم نەخۆشیە لە جیهان دا هەن.

**نیشانەکانی: دوو جۆرن:**

أ) پشتێنی گۆشتەزوونەگمۆڵی Granulomatous spectrum.

ب) باری کاردانەوەیی Reactional states.

### أ) پشتێنی گۆشتەزوونەگمۆڵی

ریدلی Ridley و هاوەڵەکانی شەش جۆر گولییان ،بەپێی باری بەرگری نەخۆشەکە، دەستنیشان کردووە:

١) **گولی جەمسەر سیلی** (TT) Polar-tuberculoid-leprosy:بـەرگری نـەخۆش بەهێزە، ئەزموونی لیـپرۆمین lepromin test پۆزەتیفـە +++، یـەك دەردی lesion پێـست هەیە(وێنەی ٣٢٣)، بەڵام کە جۆری دوو گۆڕابێت بۆ جۆری یەك (ئەم جۆرە) تا ٣ دەرد لەوانەیـە هەبن، زۆربەیان خۆیان چاکدەبنەوە. سـڕین نێگەتیفـە (بەکتریاکە نادۆزرێتەوە).


٣٢٣- گولی جەمسەر سیلی.

دەردەکـــە قوتکەیـــەکی بازنەییـــە، لێوارەکـــەی سنووورداری پتەوی ڕەقە و بەرزبۆتەوە، سوور و وشك و کاژی و بێ موو و تۆخە، لەوانەیە دەماری هەستی نزیکی دەردەکە گەورە بووبێت،هەرچەندە دەردەکـە خۆی سر و بێ ئارەقە و لـە ١٠ سم تێناپەڕێت.

٢) **گولی سنوور سیلی** .Borderline-tuberculoid-L (BT): بەرگری توانای ڕاگرتنی نەك چاكبوونەوەی نەخۆشیەكەی هەیە، ئەم جۆرە ناچەسپاوە و لەوانەیە بۆ جۆری یەك یان سێ بگۆڕێت. دەردەكە قوتكەیی یان تەنۆچكەین، شێوەی بازنەیی باوە، لێوارەكانی سنووردیارن بەڵام لەوانەیە تەنۆچكەیان لە دەور هەبێت، كاڵبوون باوە و كەمتر كاژ یان سووربوونەوە یان پتەوی یان بەرزیان هەیە بە بەراوردكردن لەگەڵ جۆری یەكەم، لەوانەیە قەبارەیان بۆ پتر لە ١٠ سم گەورەبێت، چەند دەردێكی ناچوونیەكی هەن، نەمانی هەست و گرتنەوەی ڕەگی دەمارەكان و گەورەبوونیان یان ئیفلیچی لە یەك یان دوو دەمار بە شێوەیەكی ناچوونیەكی ڕوودەدەن، ژمارەیان لە جۆری یەك پترە. ئەزموونی لیپرۆمین پۆزەتیفە ++، سرین smear كەم پۆزەتیفە.

٣) **گولی سنووری** Borderline-Leprosy (BB): زۆر ناچەسپاوە (كاتییە) و بە دەگمەن دەبینرێت، چونكە خێرا بۆ جۆری دوو یان چوار دەگۆڕێت، دەردەكان كەمن یان زۆرن، ناچوونیەكن، ئەزموونی لیپرۆمین كەمێك پۆزەتیفە +، چیلكە بەكتریاكان لە سرین دا دەبینرێن (+2) (وێنەی ٣٢٤).


(وێنەی ٣٢٤) گولی سنووری.

**نیشانەكانی**: دەردەكان بازنەیی و سنووردیارن یان قوتكەی گەورەن لەگەڵ بوونی پێستی ئاسایی لە ناوی دا و لەسەر پێست بڵاوبوونەوە و سوورن، لەوانەیە دەمارەكان ئەستوور و بە ئازاربن، بەڵام سڕبوون مامناوەندییە.

٤) **گولی سنوور گولاوی** -Borderline (BL) .Lepromatous L: دەردەكان زۆر و بڵاون، بەرگری كەمە ،بۆیە سرین پۆزەتیفە +3، بەڵام ئەزموونی لیپرۆمین كەم پۆزەتیفە +، بەدترین جۆری گولییە،چونكە كەمێك بەرگری دەبێتە هۆی زێدەسۆ و تێكدانی ئەندامەكان، لەوانەیە بۆ جۆری سێ یان پێنج بگۆڕێت.




(وێنەی ٣٢٥) گولی سنوور گولاوی.

**نیشانەكان**: دەردی دوو شێوەیی (دوو ڕوویی) dimorphic نموونەییە و بازنەییە (وێنەی٣٢٥). بەڵام لێواری لە بەشی دەرەوە

کەم دیارە و لە بەشی ناوەوەی لێوارەکە باش دیارە، یان قوتکەی سنووردیار یان نادیارە لەگەڵ بوونی پارچەی ئاسایی دیار لە ناو قوتکەکەدا .

دەردەکان چوونیەکین، زۆرن و بڵاوبوونەتەوە و لە ژمارە نایەن و لەوانەیە پەڵە، تەنۆچکە، قوتکە و گرێۆکەیی بن، دواتر دەمارەکان تووش دەبن و گەورەدەبن یان بەئازارن، هەست و ئارەقکردنەوە لەسەر دەردەکان ئاسایین.

٥) **گولی گولاوی** Lepromatous-leprosy (LL): دەردەکان زۆر و چوونیەکین، سڕین زۆر پۆزەتیڤە +4، ئەزموونی لیپرۆمین نێگەتیفە –، بەرگری نەماوە و بەکتریاکە بڵاوبۆتەوە، دەردی رەنگ پێستی سنوور نادیار نموونەین (تیرەکەیان تا ٢ سم دەبێت)، جۆری پەڵەیی macular type زۆر بڵاو و بچووکن، هەست لەسەر پەڵەکان ئاساییە و ئەستووربوونی دەمار نییە، سێیەکی دەرەوەی مووی برۆ نامێنێت، ئەوسا برژانگ و دواتریش مووی لەش نامێنێت، بەڵام قژی سەر ناگرێتەوە. جۆری تەنینەوەیی infiltrative گرێۆکەیین یان قوتکەیین یان بەربڵاون. جۆری گرێۆکەیی nodular type پێی دەڵێن گولیەگمۆڵ lepromas، وەك لووی کەم دیاربوو لە گوێچکە و برۆ و لووت و چەناگە و ئانیشك و دەست و سمت و ئەژنۆ دەردەچن، دەمارەکان بە سستی تووش دەبن و بە چوونیەکی پەرەدەستێنێت بە شێوەی دەستکێشی و گۆرەوەی. ئەم جۆرەیان سەربەخۆ دێتەکایەوە یان لە جۆری چوار یان جۆری نەناسراو indeteminate L. پەیدا دەبێت، بەڵام لەوانەیە چارەسەر بیگۆڕێت بۆ جۆری چوار. (وێنەی ٣٢٦)



(وێنەی ٣٢٦) **گولی گولاوی.**

٦) **گولی نەناسراو** indeterminate L.: سەرەتای پەیدابوونی گولییە، گولی لەسەرخۆ دروست دەبێت و لە ٩٠٪ی نەخۆشەکان دا سڕبوون numbness (چەند ساڵ پێش نیشانەکانی تر) بەهۆی نەمانی هەستی ساردی cold و بەرکەوتنی سووك light-touch بە

تایبەتی لە دەست و پێدا، دروست دەبێت. دەردی پێست بە شێوەی پەڵەیەکی کاڵبووی hypopigmented سنوور نادیار یان پەڵەی سوور بە زۆری لەسەر کوڵم و باسك و ران و سمت دەردەچێت، دەمارەکان گەورەنەبوون و گرێ و قوتکەش نین. چیلکەی گولی لە نموونە وەرگرتن دا نابینرێن یان زۆر دەگمەنن، هەندێك لەم نەخۆشانە لەم بارەدا دەمێننەوە یان چاك دەبنەوە یان بۆ جۆرێك لەم پێنج جورانەی سەرەوە دەگۆڕێن.

## گۆڕانکاری دەمارە پەڕیەکان لە گولی دا Peripheral nerve changes

٤ جۆر گۆڕانکارین:

١) **دەمار زلبوون**: بە شێوەی ناچوونیەکی بەتایبەتی دەمارە نزیکەکان لە پێست وەك دەماق radial nerve، دەماری تەڵەزمەیی .peroneal N، دەماری پوز .sural N، دەماری قامیشی دواوەی لاق posterior-tibial N. یان دەماری تەڵەزمەی باسك .ulnar N.

٢) **نەمانی هەست لەسەر دەردە پێستیەکان.**

٣) **ئیفلیجی رەگی دەمارەکان** Nerve trunck palsies: لەگەڵ یان بەبێ بوونی سکالا و نیشانەی سۆکردن (واتا دەردە دەماری کپ silent neuropathy)، ئەنجامی سۆی دەماری هەستی و جووڵەیین (واتا لاوازبوون یان پووکانەوە) و لە باری درێژخایەن دا قرچۆکی contracture دروست دەبێت.

٤) **سڕبوونی چونیەکی پەڕی پەلەکان** Acral distal symmetric anaesthesia: لە سەرەتادا نەمانی جیاکردنەوەی گەرمی و ساردی، دواتر نەمانی هەستی ئازار و بەرکەوتنی سووك light touch لە پەلەکان دەست پێدەکات و بەرەو سەرووتر دەڕوات جگە لە بەری دەست، هەندێك جار دوومەڵی دەمار و کۆنیشانەی تونێلی مەچەك یان ئارەقنەکردنەوە بەهۆی گرتنەوەی دەماری وزەوالا روودەدەن.

## پەیوەندی سیستمی Systemic associations

بەهۆی تووشبوونی کەللە دەماری پێنجەم (V) ،گۆڕانکاری لە پەرگلێنە و ژووری پێشەوە anterior-chamber روودەدەن، نەمانی هەست لە پەرگلێنەدا باوە. گرتنەوەی سەری لووت و دەنگەژێ vocal cords و هەلامەت و کوونبوونی بەربەستی لووت و nasal septum داتەپینی لووت nasal collapse و پووکانەوەی باتوو و شلوشۆڵی impotence و نەزۆکی لەوانەیە دروست بین.

لە سکپڕی دا ١٠–٢٥٪ی ژنان نەخۆشیەکەی بەهۆی گۆڕانی بەرگری دەورووژێت.

لەکارکەوتنی دەست و پێ بەهۆی تووشبوونی دەمارەکان روودەدات( بەهۆی لەکارکەوتنی دەماری جوڵە یان نەمانی هەست و ئازار)کە دەبێتە هۆی کاریگەری زەبر لەم بارە نائاساییەدا.

ب) **باری کاردانەوەیی** Reactional states

**بریتین لە پرۆسەی سۆی تێکدەری شانەکان.**

**جۆرەکان:**

**١) کاردانەوەی هەستیاری درەنگ (جۆری جۆپلینگ I)**

Jopling type I (delayed hypersensitivity reaction)



**(وێنەی ٣٢٧) کاردانەوەی هەستیاری درەنگ (گولی گولاوی).**

**١-بەهۆی پتربوونی بەرگری خانەیی دژی چیلکەی گولی دوای چارەسەر (کاردانەوەی پێچەوانەیی reversal reaction) روودەدات یان:**

**٢-دوای گۆڕانی گولی سنووری بۆ گولی گولاوی (کاردانەوەی نزمبوونەوەی قۆناغی .downgrading R) روودەدات، هەردوو جۆر نیشانەکانیان وەك یەك وان: فرەسۆی دەردی پێستی، (وێنەی٣٢٧) بێ سکاڵای سیستمی وەك لەرز و تا – تاد، دەردەکان دەئاوسێن و سوورتر دەبنەوە و بەئازاردەبن وەك خانەسۆ و هەندێك جار دەبن بە چاڵەبرینی، ماکە توندەکە لەناوچوونی دەمارەکانە، بۆ نموونە ئیفلیجی دەمار گەورەبوون و بەئازار بوونیان.**

**٢) سووربوونەوەی گرێیی گولاوی (جۆری جۆپلینگ ٢):** Erythema nodosum leprosum **(وێنەی ٣٢٨)**





**(وێنەی ٣٢٨)**
**سووربوونەوەی گرێیی گولاوی.**

**ئەم جۆرە بەهۆی کاردانەوەی ئاوێتەی بەرگری** immun complex **دوای چەند ساڵ لە چارەسەر بۆ گولی سنوور گولاوی یان گولی گولاوی یان لە کاتی سکپڕی دا روودەدات.**

**نیشانەکان:** **سکاڵای سیستمی (وەك تا، ئازاری ماسولکە و جومگە و نەخۆری anorexia) و چەندین ئەندام گرتنەوە لەخۆ دەگرێت وەك پێڵووپۆشەسۆ، دەمارەسۆ، پەرگلێنەسۆ، لینجەپەردەسۆ synovitis، گورچیلەسۆ، باتووەسۆ orchitis و گەورەبوونی سپڵ و جگەر و لیمفەگرێکان، چەند رۆژ تا چەند ساڵ دەخایەنێت. دەردی پێست بریتین لە گرێۆکەی ژێر پێستی سووری بڵاوبووەوە کە سەربەخۆ دەردەچن (واتا دەردی کۆن**

نین) و لەوانەیە بێن بە چاڵەبرین و لە بەشی دەرەوەی قۆڵ و ناوەوەی ران پتر دەردەچن.

## دەستنیشانکردنی گولی Diagnosis

١- **سەرچێیی** Clinical: بوونی: أ) سڕی دەردی پێست یان سڕی لە دابەشکردنی دەمارێکی پەڕی یان لە پشتی دەست و پێ، ب) دەمار ئەستووربوون، ج) دەردی پێستی غوونەیی، د) گومانی گولی لە بوونی هۆکاری مەترسی دار وەك بوونی گومانلێکراوەکە لە شوێنی نیشتەنی endemic area ، خزمی خوێنی نزیکی تووشبوو یان بەرکەوتنی ئاژەڵی زرێپۆش armadillo، هـ) بەیەکەوەڕوودانی دەردی پێستی و دەماری پەڕی یان دەردە دەماری بێ هۆ لە شوێنی نیشتەنی یان بە یەکەوە ئیفلیجبوونی دەماری پێنج و حەوتی کەللەیی.

٢- **تاقیگەیی** Laboratory: دۆزینەوەی خۆرەی چیلکەی گولی M. leprae لە شانەدا، ئەم بەکتریایە لەناو خانەدا نەبێت ناڕوێنرێت (ناچێنرێت)، بەکتریایەکی ترش نەگرە acid fast بە پشکنینی گۆڕڕاوی زیل-نیلسۆن modified-Ziehl-Neelson-method ،بۆیە سڕینی پێست skin-smear وەردەگیرێت لە ناوچەوان، پلی گوێچکە، چەناگە، رووی راستکەری extensor surface باسك forearm، سمت یان قەد ، چڕی بەکتریاکە بە بڕی score لۆگاریتمی ٦ خاڵ ژمێریار دەکرێت (ژمارەی بەکتریا لە کیلگەی نقومبوونی زەیت لە ژێر وردبین دا (ك.ن.ز) oil immersion field (واتا پێکەری چیلکەیی bacillary index "B.I." بەم رێژەیە .B.Iی شەش ١٠٠٠ یان پتر چیلکە/ ك.ن.ز.، .B.Iی پێنج ١٠٠ – ١٠٠٠ چیلکە/ك.ن.ز.، .B.Iی چوار ١٠-١٠٠ چیلکە/ ك.ن.ز. ، .B.Iی سێ ١-١٠ چیلکە/ك.ن.ز.، .B.Iی دوو ١ چیلکە/١-١٠ ك.ن.ز.، .B.Iی یەك ١ چیلکە/١٠-١٠٠ ك.ن.ز. و .B.Iی سفر نەبوونی چیلکە/١٠٠ ك.ن.ز.

٣- **ئەزموونی لیپرۆمین** Lepromin test: تەنیا بۆ جیاکردنەوەی جۆرەکانی گولی یان لە کاتی چارەسەرکردن دا بۆ چاودێری (بەدواداچوونی) بارەکە بەکەڵکە دوای خستنەناو بن توێژ (٠,١ مل لە خۆرەی چیلکەیی بە گەرمی کوژراو کە لە لیفمەگرێی تووشبوو یان جگەری ئاژەڵی زرێپۆش وەرگیراوە) بە ٤٨ کاتژمێر (کاردانەوەی فێرنانەدز Fernandez reaction) یان ٣-٤ حەفتە (کاردانەوەی میتسوودە .Mitsuda R) دەخوێنرێتەوە.

٤- **نموونەوەرگرتن** Biopsy: لە پێست یان دەماری گومان لێکراو وەردەگیرێت، جۆری سیلەگمۆڵی tuberculoid کە جۆری کەم چیلکەییە pauci-bacillary یان جۆری گۆشتەزوونەگمۆڵییە granulomatous type کە جۆری فرەچیلکەییە multi-bacillary یان بەپێی قۆناغی نەخۆشیەکە لە نێوانیان دایە.

٥- **کاردانەوەی زنجیرەی پۆلیمەرەیس** PCR: ئەگەر پۆزەتیف بوو بەکەڵکە بەڵام ئەنجامی نێگەتیف ئەگەری بوونی نەخۆشیەکە لانابات، بۆیە زۆر پشتی پێ نابەسترێت.

## چارەسەر

١- جۆری کەم چیلکەیی (.B.T یان .T.T) داپسون ١٠٠ ملگم/رۆژ + ریفامپیسین ٦٠٠ ملگم/مانگانە و چاودێرکراوبێت تا ١٢ مانگ لەگەڵ بەدواداچوون بۆ ١-٢ ساڵ لە وەستانی چارەسەر.

٢- جۆری فرەچیلکەیی (.L.L ،.B.L ،.B.B) یان سەرهەڵدانەوەی جۆری I، دوای چارەسەر: داپسۆن ١٠٠ ملگم/رۆژ + کلۆفازیمین clofazimine ٥٠ملگم/رۆژ + ٦٠٠ ملگم ریفامپیسین/رۆژ بۆ دوو ساڵ. لەجیاتی کلۆفازیمین ماینۆسایکلین ١٠٠ملگم/رۆژ یان ئۆفلۆکساسین ofloxacin ٤٠٠ ملگم/رۆژ یان کلاریثرۆمایسین clarithromycin ٥٠٠ ملگم/رۆژ بەکاردەهێنرێت.

٣- کاردانەوەی پێچەوانەیی .Reversal R: بۆ باری سووك تەنیا پشوودان و NSAIDs یان ئەسپرین بەسە، بەڵام بۆ باری توندتر: ستیرۆید (پریدنیزۆلۆن ٤٠-٦٠ ملگم/رۆژ) تا نیشانەکان نامێنن بەردەوام بەکاردەهێنرێت،ئەوسا کەم دەکرێتەوە و دواتر دەبیڕین، هەندێك جار کلۆفازیمین ٥٠-٣٠٠ملگم/رۆژ ،کە بارەکە تیژبوو لەگەڵ ستیرۆید بەکاردەهێنرێت، ئەگەر ئەمەش سەرکەوتوو نەبوو سایکلۆسپۆرین ٥-١٠ملگم/کگم/رۆژ بەکاردەهێنرێت، ئەگەر ئیفلیجی باش نەبوو دەرکردنی (کردنەوەی) دوومەڵی دەمار پێویستە.

٤- سووربوونەوەی گرێیی گولی .E.N.L: ثالیدۆمايد thalidomide ١٠٠-٤٠٠ ملگم/رۆژ و هەندێك جار لەگەڵ پریدنیزۆلۆن یان سایکلۆسپۆرین، ئەگەر سەرکەوتوو نەبوو کلۆفازیمین ٣٠٠ ملگم/رۆژ + پێنتۆکسی فیلین pentoxyfylline ٤٠٠-٨٠٠ ملگم، رۆژی ٢ جار.

### خۆپاراستن Prevention

١- پێکوتەی BCG (چونکە گولی پتر بەهۆی کەم وکووڕی بەرگری خانەیی بۆماوەیی روودەدات) بەکاردەهێنرێت، ئەگەر لەگەڵ خۆرەی چیلکەی گولی بە گەرمی کوژراو بەکاربهێنرێت ٦٤٪ پارێزگاری دژی تووشبوون دەکات.

٢- یان ساڵی جارێك بە یەك ژەمی ریفامپیسین + ماینۆسایکلین + کلۆفازیمین).

# نەخۆشیە ڤایرۆسیەکان Viral diseases

**ڤایرۆس** Virus: مشەخۆری ناو خانەی ناچارە obligatory،چونکە زیندەوەری خانەیی نیە و زۆربەی ئامێرەکانی فرەبوونی نیە و هەر لە ناو خانەکانی خانەخوێ دا host بە بەکارهێنانی، ئامێری دروستکەری خانە تووشبووەکە، زۆر دەبێت.

**سووڕی ژیانی ڤایرۆس دوو بەشە:**

١) ڤایریۆن virion: واتا پارچۆکەی دەرەوەی خانە، زانیاری کۆجینی ڤایرۆسەکە (نەخشەی جینی ڤایرۆسەکە) virus genome بە بەرگی پرۆتینی تایبەتمەند دەوردراوە، ئەم ڤایریۆنە هەڵدەستێت بە گواستنەوەی زانیاری جینی ڤایرۆسەکە بۆ خانەی خانەخوێی ئامادە susceptible host.

٢) شێوەی ناپارچۆکەیی non-particulate form: بوونی زانیاری جینی ڤایرۆسەکە لە ناو خانەدا و کاتەکەی لە چەند کاتژمێرێك بۆ چەند ساڵێکە.

**ڤایرۆس لە سێ بەش پێکهاتووە:**

١- بەشی چەقی لە ترشی ناوکی nucleic acid پێکهاتووە (DNA یان RNA).

٢- بەرگی پرۆتینی پارێزەر واتا کاپسید capsid.

٣- پەردەی دەرەوە لە هەندێك ڤایرۆس دا وەك ڤایرۆسی تامیسك herpes viruses و پشتە ڤایرۆس (ریترۆڤایرۆس) retro viruses دا هەیە کە لە پرۆتین و شەکر و چەوری پێکهاتووە و بۆ تووشێنی infectivity پێویستن ، لەباری وشك دا dry situation ئەم پەردەیە کارتێکردنی نامێنێت.

ئەو ڤایرۆسانەی پەردەکەیان نیە وەك ڤایرۆسی گۆگمۆڵ papilloma viruses بە کاپسیدەکەیان دەوترێت رووت naked (بەرگی رووت) و لەباری وشك دا کارتێکردنی دەمێنێت و تووشێنیەکەی درێژخایەنە.

ڤایرۆس لە ناو خانەدا لەبەرخۆی دەگرێتەوە replication بە: ١) جیاجیا دروستکردنی بەشە پێکهێنەرەکانی خۆی لە مژادی خانەی خانەخوێ، ٢) دواتر کۆکردنەوەی assembly ئەم بەشانە بۆ چەندین ڤایریۆن. واتا ڤایرۆس وەك خانە دابەش نابێت.

**چۆنیەتی تووشبوونی خانە بە ڤایرۆس:** ئەم قۆناغانەن:

١- پێوەنووسان (مشتن) adsorption: لە نێوان بەرگی یان پەردەی ڤایرۆسەکە و وەرگری رووی خانە روودەدات، هەر بۆیە کە وەرگری لەبار لەسەر رووی خانە بۆ ڤایرۆسە تایبەتمەندەکە نەبێت ئەوە تووشبوون بەم ڤایرۆسە روونادات.

٢- چوونە ناو خانە penetration: دوای پێوەنووسان روودەدات.

٣- بێ بەرگبوون uncoating: ئەنزیمی خانە تووشبووەکە بەرگەکە یان پەردە و بەرگی ڤایرۆسەکە هەڵدەوەشێنێتەوە و ڤایرۆسەکە دەبێت بە ناپارچۆکەیی non-particulate.

٤- زیندەکی دروستکردن biosynthesis: واتا زانیاریدان لە ڤایرۆسەکە بۆ خانەی تووشبوو ،بۆ دروستکردنی پرۆتینی نەخشەی جینی ڤایرۆسەکە.

٥- دروستکردنی ڤایریۆن virion assembly: زۆربەی ڤایرۆسەکان ئەم قۆناغە لە ناو خانەدا ئەنجام دەدەن و خانەکە دەکوژن و قۆناغی شەشەم (٦) کە بریتییە لە قۆناغی سەربەخۆبوون release،روودەدات، بەڵام هەندێك ڤایرۆس کە پەردەی هەیە لەسەر رووی خانە قۆناغی ٥ تێیان دا بەهۆی چرۆکردن budding روودەدات لەسەر رووی خانە و خانەکە نامرێت (وەك پشتە ڤایرۆس و نیمچە بڵەڤایرۆسەکان paramyxo viruses ). ڤایرۆس لە ناو ناوك دا ڤایریۆن دروست دەکات (وەك ڤایرۆسی تامیسك) یان لە ناو سایتۆپلازم دا (وەك ڤایرۆسی پۆکس "ئاوڵە"). سەدان و هەزاران ڤایریۆن لە یەك خانەی توشبوو دروست دەبن.

دوای توشێنی خانە بە ڤایرۆس یەکێك لەمانەی خوارەوە روودەدات:

١- مردنی خانە.
٢- تووشێنی درێژخایەن بێ مردنی خانە.
٣- گۆڕانی خانەی تووشبوو بۆ شێرپەنجە بێ مردنی خانە.
٤- مانەوەی متی ڤایرۆسەکە latency.

بە سێ رێگە پێست ڤایرۆسی تووش دەبێت:

١- رووانی راستەوخۆ.
٢- تووشێنی سیستمی.
٣- بڵاوبوونەوەی جێیی (لە ناوەوە بۆ پێست دەگوێزرێتەوە)

دەردی پێست بە کارتێکردنی راستەوخۆی ڤایرۆسەکە لەسەر خانەی پێست،یان کاردانەوەی خانەخوێ بۆ ڤایرۆسەکە، یان کارلێککردنی لەبەرگرتنەوەی ڤایرۆسەکە و کاردانەوەی خانەخوێ، دروست دەبێت.

**دەستنیشانکردنی تووشێن:**

١- جیاکردنەوەی ڤایرۆس isolation.
٢- نموونە وەرگرتن، بۆ بینینی گۆڕانکاری لە شانە دا وەك ئەزموونی تزانك Tzanc smear.
٣- چاندنی ڤایرۆسەکە.
٤- وردبینی ئەلیکترۆنی.
٥- دۆزینەوەی ترشی ناوکی ڤایرۆس.٦- زانیاری زەرداوی خوێن serology.

**چارەسەر و خۆپاراستن**

١) پێکوتە vaccins، ٢) دەرمان وەك ئەسایکلۆڤیر، ٣)ئینتەرفیرۆن.

## کۆمەڵی ڤایرۆسی تامیسك Herpes virus group

**ئەم کۆمەڵە ڤایرۆسە قەبارەیان مامناوەندیە(١٢٠-٢٠٠ نم) و DNA ی دوو تاڵیان double-strand هەیە و لە ناو ناوکی خانە دا خۆلەبەرگرتنەوە replication دەکەن. توانای تووشێنی شاراوە و درێژخایەنیان بۆ ماوەی ژیانی نەخۆش هەیە ( لە ناو دەمار و خانەی بەرگری تووشێن). زۆربەی تووشبووەکان بێ سکاڵان و جۆرەکانی ئەمانەن:**

## تامیسك Herpes simplex (HSV)

**دووجۆرە H. simplex type 1 & 2، جۆری یەك هۆکاری تامیسکی لێو و دەمە و جۆری دووەم هۆکاری تامیسکی سێکسیە. جۆری I زۆر باوە و پتر لە ٣٠-٩٥٪ی بالق سیرۆپۆزەتیڤن ( واتا ئەزموونی زەرداوی خوێن پۆزەتیڤە) بەڵام رێژەی ٢٠-٤٠٪ی خەڵکی سەرهەڵدانی تامیسکی دەم و لێویان هەیە. جۆری دووەم دوای باڵقبوون puberty دەردەکەوێت (٢٢٪ی خەلکی دوای ١٢ ساڵی بۆ جۆری ٢ سیرۆپۆزەتیڤن و لەوانەی سیرۆپۆزەتیڤن ٢٠٪یان بێ سکاڵان واتا شاراوەیە، ٢٠٪ی تریان تامیسکی سێکسی سەرهەڵداوەیان هەیە و ٦٠٪ی تریشیان دەردەکانیان بێ نیشانەن واتا ژێر سەرجێیە subclinical یان پێی نازانرێت ). ئەگەر یەك لە ژن یان مێرد تامیسکی سێکسیان هەبێت و لەکاتی سەرهەڵدانەوەیدا جوت نەبن ئەوە رێژەی تووشکردنی بەرامبەرەکەی تەنیا لەسەدا دەیە (١٠٪). تووشبووبێت (شاراوە یان بێ نیشانەبێت) یان بە سکاڵابێت لەوانەیە بەرامبەرکەی تووش بکات.**

تامیسك دوو قۆناغە:

١) سەرهەڵدانی یەکەم first episode: **یەکەم تووشبوون دەرد و نیشانەی لە زۆربەی بارەکان دا نییە، لەبەر ئەوە دیار ناکرێت هەرچەندە یەکەم تووشبوون لەوانەیە هەندێك جار سکاڵا و نیشانەی هەبێت.**

٢) سەرهەڵداوە recurrent

**دەستنیشانکردنی تامیسک:**

١) **سڕینی تزانك Tzanc smears: ناتایبەتمەندە چونکە ڤایرۆسی تامیسك HSVو مێکوتە VZV خانەی زەبەلاحی چەند ناوکی دروست دەکەن ( تەنیا لە٦٠-٩٠٪ ی بارەکان دا وردە accurate).**

٢) **ئەزموونی دژەتەنە درەوشێی راستەوخۆ direct-flourescence antibody test (DFA) ڤایرۆسەکە دیاردەکات و لە نیو کاتژمێردا ئەنجام بەدەستەوە دەدات.**

٣) چاندنی ڤایرۆس virus culture: زۆر ورد و خێرایە و لە ٤٨-٧٢ کاتژمێردا ئەنجامی دەردەچێت.

٤) کاردانەوەی زنجیرەی پۆلیمەرەیس PCR،وەك چاندن وردە.

٥) ئەزموونی ئیمیونۆپیرۆکسیدەیس immuno-peroxidase،زۆر وردە.

٦) نموونە وەرگرتن و وردبینی ئەلیکترۆنی.

٧) ئەزموونی زەرداوی خوێن (سیرۆلۆجی serology)، تەنیا ئەگەری تووشێنی ئێستا یان رابوردوو نیشان دەدات، وەك ئیلایزا Eliza یان G-protein western blotting test (G-p W.B.).

## جۆرەکانی تامیسک بەپێی شوێن

١- **تامیسکی دەم‌ولێو** Orolabial herpes: هۆکارەکەی زۆربەی جار ڤایرۆسی تامیسکە جۆری I و لە کەمتر لە ١٪ی تووشبووەکان سکالاَ و نیشانەی ناوپۆشی ناودەم و پووکەسۆی تامیسکی herpetic gingivostomatitis روودەدات ،بە شێوەی تا و لاوازی و ئازاری ماسولکە و گران قوتدان و لیکدەردان و گەورەبوونی بەئازاری گرێ لیمفەکانی مل، بۆگەنی ناودەم و گەروو سۆ و لە منالاَن دا وشکبوونەوە. دەردی تامیسکی سێ قۆناغە: ١) قۆناغی دروستبوون: سووربوونەوە و تەنۆچکەی ناودەم و لێو، ٢) قۆناغی ناساغیەکە: بلۆق و چالەبرین و قەتماغەی رەق، ٣) قۆناغی ساریژبوون: فڕێدانی قەتماغەی وشکبووەوە و نەمانی ئاوسان. (وێنەی ٣٢٩)

ئەم ٣ قۆناغە ٥-١٥ رۆژ دەخایەنێت. زۆربەی بارەکان ١-٥ سالێن و کاتی بەرهێنان .I.P نزیکەی ٥ رۆژە. لەوانەیە ڤایرۆسی تامیسك جۆری ٢ لە بالَق دا دوای لێککەوتنی دەم و کۆئەندامی سێکسی orogenital contact تامیسکی دەم و لێو دروست بکات،بەلاَم ١٢٠ کەڕەت کەمتر لە جۆری I لە دەم و لێودا سەرهەلَدەداتەوە. نزیکەی ٥٠-١٠٠٪ی خەلَکی دژەتەنیان دژی ڤایرۆسی تامیسك جۆری I هەیە ( واتا پیشتر تووش بوون).


(وێنەی ٣٣٠) تامیسکی پەنجە.


(وێنەی ٣٢٩) ناوپۆشی ناودەم و پووکەسۆی تامیسکی.

٢- ئەم ڤایرۆسە بە ڕووان Innoculation تووشی هەموو شوێنێکی پێست و ناوپۆش دەبێت ئەگەرچیش پێشتر تووشێن هەبوویێت یان نا، لەوانەیە سەرچاوەی تووشێن ١) دەرەکی بێت وەك دەست بەرکەوتنی کارمەندی نەخۆشخانە بە تامیسکی نەخۆش یان تووشێنی مەمکی دایك بەهۆی ناودەمی تووشبووی کۆرپە و ساوا، بە شیردان، یان لە سەرچاوەی ٢) ناوەوەبێت (ڕوانی خۆیی auto innoculation)، وەك تووشێنی پەنجە بە پەنجەمژین یان نینۆك گەستن لە ناو دەمەوە(وێنەی ٣٣٠).

٣- **تامیسکی کۆئەندامی سێکسی** Herpes genitalis: دوای باڵقبوون بەهۆی ڤایرۆسی تامیسك جۆری ٢ و جۆری I (لە ١٠-٤٠٪ی بارەکان دا) بە تایبەتی لەوانەی سێکسی دەمی کۆئەندامی سێکسی ئەنجامدەدەن ڕوودەدات. سەرهەڵدانەوە پتر لە جۆری ٢ نەك جۆری ١ دا هەیە. تووشێن بە جۆری ٢ بە دەگمەن ڕێ دەدات جۆری I تووشی کۆئەندامی سێکسی بێت، بەڵام بە پێچەوانەوە دوای تووشێن بە جۆری I جۆری دووش بە ئاسانی تووشی نەخۆش دەبێت.

نیشانەکان بریتین لە بلۆق و پیزۆکە و چاڵەبرینی سوور و ٢-٣ حەفتەی دەوێت بۆ سارێژبوون، لە نێرینەدا پتر گۆی چووك و قەد و لە مێینەدا کیلەك و ناوگەڵ و سمت و زێ vagina و ملی مناڵدان دەگرێتەوە لەگەڵ ئازار و خوران و میزەچوڕکێ و دەڵاندنی زێ و میزەجۆ و گەورەبوونی بەئازاری لیمفەگرێکانی لاڕان، تا و سەرئێشە و لاوازی و ئازاری ماسولکەی لەگەڵدایە.

لە مێینەدا ملەسۆی منالدان لە ٨٠٪ی بارەکان دا ڕوودەدات و دەبێتەهۆی دەڵاندنی خوێن و کێم و چاڵەبرین. (وێنەی ٣٣١)

سەرهەڵدانەوە لە جۆری ٢دا ١٦ کەڕەت لە جۆری ١ باوترە (تێکڕایی ٣-٤ جار لە ساڵێکدا)، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا کەمتر دەبێتەوە.

تامیسکی دەوری کۆم لە نێربازەکاندا باوە و لەوانەیە کۆم و دەوری کۆم و ڕێکە بگرێتەوە و ببێتە هۆی ئازار لە کاتی پیسایی کردن دا.



(وێنەی ٣٣١) تامیسکی کۆئەندامی سێکسی سەرەتایی.

٤- **تامیسکی (تووشـێنی) چـاو** Ocular infections: دەبێـتەهۆی پێڵووپـۆش و پەرگلێنەسۆی سـەرهەڵداوە و لەگـەڵ دروسـتبوونی پەڵـە opacifications و کوێربـوون، زۆربەیان بە جۆری ١ بەڵام لە کۆرپەدا بـە جـۆری ٢ دروسـت دەبێـت، بـە دەگمـەن ژووری پێشەوە و تۆڕی چاو دەگرێتەوە و کوێربوون دروست دەکات.

٥- **تامیسکی کۆرپە (نۆبوو)** Neoborn herpes.: ڕێـژەی ٧٠٪ی کۆرپـەی تووشـبوو بـە تامیسك بە جۆری ٢ ڕوودەدات و ئەوانی تـر بـە جـۆری ١ (جـۆری I لـە کۆئەنـدامی سێکسـی دایك) یان بە بەرکەوتنی خەڵکی تـری تووشـبوو بە جۆری I. ئەگەر دایك تووشێنی سـەرەتایی لـە کاتی منالبوون دا هەبێت ئەوە ڕێژەی ٣٣-٥٠٪ کۆرپـە تـووش دەکـات، بـەڵام ئەگـەر جـۆری سەرهەڵداوەی هەبێت مەترسی تووشکردن کەمـە (کەمتر لە ٣٪). بە سێ جۆر نیشانەکان دەبینرێن:



(وێنەی ٣٣٢) تامیسکی کۆرپە.

١) پێست و ناودەم و چاو، ٢) مێشکەسۆ، ٣) بڵاوبووەوە. بەبێ چارەسەر ڕێـژەی مـردن لـە ٦٥٪ پترە ، بەڵام بە چارەسەر کەمترە. (وێنەی ٣٣٢)

٦- **تامیسـکی سـەرهەڵداوە** Recurrent herpes: هـەموو جۆرەکـانی تامیسـك لەوانەیـە سەرهەڵبدەنەوە، چونکە هەردوو جۆرەکە ١ و ٢ بەردەوام لە دەمارەگرێ هەستیەکان sensory nerve gangliaدا بـۆ مـاوەی ژیـان دەمێننـەوە، ئـەم ڤایرۆسە پرۆتینی ڤایرۆس لە باری شـاراوەی دا (مـێ دا) latency دروسـت ناکـات و بەمـەش بـەرگری لـەش ناینانسـێت بـۆ ئـەوەی لـە نـاوی ببـات، بۆیـە ناوبـەناو ڤایرۆسەکە ئەگەر زەمینەی لەباری هەبوو بـە دەمارەکـان دا بۆ پێست و ناوپۆش دەکشێت بۆ سـەرهەڵدانەوە وەك لە کاتی تا، زەبر، تیشك، سـکپڕی، فشـاری دەروونـی، سستی بەرگری – تاد. زۆر لە تووشبووان ڤایرۆسەکە لە لیك و دەڵانی کۆئەندامی سێکسی فڕێ دەدەن و دەبێتە هۆی تووشبوونی بەرامبەرەکەی بێ ئـەوەی نەخۆش نیشانە و سکاڵای هەبێت هەرچەندە کە نەخۆش نیشـانە و سـکاڵای هـەبێت ئـەوە ١٠٠- ١٠٠٠ کەرەت فرێدانی ڤایرۆسەکە پتر دەبێت. (وێنەی ٣٣٣)



(وێنەی ٣٣٣) تامیسکی سەرهەڵداوە.

جۆری لێو و ناودەم لە کاتی سەرهەڵدانەوەی دا لێو و دەوری دەگرێتەوە و ناودەم کەم تووشی دەبێت هەر هەستی پێ ناکرێت، لە سەرهەڵدانەوەدا نەخۆشیەکە سووکترە و کاتێکی کەمتر دەخایەنێت (٥-٧ رۆژ) و لە هەمان شوێن یان نزیکی هەمان شوێنی پێشتر دروست دەبێتەوە و پەڵە بۆ ماوەیك جێدەهێڵێت.

٧- **تامیسکی بیرۆیی (بە بیرۆبوونی تامیسك)** Eczema herpeticum: **باسمانکرد.**

٨- **فرەشێوەسووری** Erythema multiforme و تامیسك: **باسمانکرد.**

٩- **تامیسك و سستی بەرگری** Immuno-deficiency & herpes: لەو کەسانەی سستی یان دابەزینی بەرگری خانەیان هەیە ،وەك چارەسەر بە دەرمانی خانەکوژ، ستیرۆید، کەمی بەرگری زگماکی و وەرگیراو - تاد، تامیسکی سەرەتایی و سەرهەڵداوە توندتر و بەردەوامترە و بە سکالاترە، بەڵام تووشبوونی سیستمی دەگمەنە. (وێنەی ٣٣٤)



(وێنەی ٣٣٤)
تامیسکی درێژخایەن لە نەخۆشی ئەیدزدا.

**چارەسەر**

أ) لەباری سووك دا تەنیا پاك و وشك راگرتنی دەردەکان (بێ دەرمان) بەسە.

ب) لەباری توند دا یان بوونی ماك دا چارەسەری تایەتی پێویستە و چارەسەر لە سەرەتای تووشبوون دا نەك لە دوایی دا ،بەکەڵکە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ئەسایکلۆڤیر acyclovir بە دەم بۆ باڵق ٢٠٠ ملگم × ٥ یان ٤٠٠ ملگم × ٣، بۆ ساوا ١٥ ملگم/کگم × ٥، بە خوێن بۆ باری زۆر توند ٥-١٥ ملگم/کگم × ٣ بە لەسەرخۆیی (لە ١ کاتژمێردا لە ناو سەلاین) ، لە باری سستی گورچیلە دا ژەمی کەمتر دەدرێت. هەموویان بۆ ٧-١٠ رۆژ بۆ جۆری سەرەتایی و ٤-٥ رۆژ لە جۆری سەرهەڵداوەدا.

٢- ڤالاسایکلۆڤیر valacyclovir: لە ناو لەش دا بۆ ئەسایکلۆڤیر دەگۆڕێت و باشتر لە ریخۆڵە دا هەڵدەمژرێت و لەبارترە، بە ژەمی ١٠٠٠ ملگم × ٢ دەدرێت.

٣- فامسایکلۆڤیر famciclovir، باشتر هەڵدەمژرێت و لە ناو لەش دا بۆ پێنسایکلۆڤیر penciclovir دەگۆڕێت، بە ژەمی ٢٥٠ ملگم ×٣.

٤- کرێم: ئەسایکلۆڤیر کرێم ٥٪ × ٣، دۆکۆسانۆڵ کرێم ١٠٪ docosanol cream، ئایدۆکسوریدین ١٥٪ شلە idoxuridine solution 15% × ٦، پێنسایکلۆڤیر ١٪ کرێم. بۆ باری سووك یان لەگەڵ چارەسەری سیستمی بەکاردەهێنرێن.

٥- بۆ چاو: ئەسایكلۆڤیر بە دەم ٤٠٠ ملگم × ٥ + ترایفلوریدین ١٪ trifluridine دڵۆپە، یەك دڵۆپە هەر ٢ كاتژمێر جارێك بە ڕۆژ و هەر ٤ كاتژمێر جارێك بە شەو (لە ٢٤ كاتژمێردا ٩ دڵۆپە پتر نەبێت)، یان ئایدۆكسوریدین ٠,١٪ دڵۆپە drops و ٠,٥٪ مەرهەم، ١ دڵۆپە/١كاتژمێر بە ڕۆژ و ٢ دڵۆپە/١كاتژمێر بە شەو یان ڤیدئەرابین vidarabine 3% مەرهەم بە ڕۆژ، هەر ٣ كاتژمێر جارێك.

٦- بۆ تامیسكی سەرهەڵداوی سێكسی: ئامۆژگاریەكان ئەمانەن:

أ) لەكاتی سەهەڵدانی تامیسك دا لەگەڵ بەرامبەركەی تا ١-٢ ڕۆژ،دوای نەمانی نیشانەكان، جووت نەبێت.

ب) بەكارهێنانی كۆندۆم لەكاتی جووت بوون دا.

ج) بەكارهێنانی چارەسەری كپكەر suppressive therapy: ئەسایكلۆڤیر ٤٠٠ ملگم × ٢، یان ٨٠٠ ملگم/ڕۆژ، ڤالاسایكلۆڤیر ٥٠٠-١٠٠٠ ملگم یەكجار لە ڕۆژێ دا یان ٢٥٠ ملگم × ٢، فامسایكلۆڤیر ٢٥٠ ملگم × ٢ ،هەموویان بۆ ماوەی چەند مانگ بۆ چەند ساڵ.

٧- چارەسەری سكپڕ pregnant: دوای حەفتەی ٣٦ ی سكپڕی (ئەگەر لە سكپڕی پێشوودا تامیسكی هەبوبێت) وا باشە چارەسەری كپكەری پێ بدرێت، ئەسایكلۆڤیر ٢٠٠ ملگم × ٤ تا دوای منالبوون، بەلام ئەگەر تووشبوونی سەرهەڵدانی یەكەم لە سێ ینەی دوای سكپڕی دا $3^{rd}$ trimester ڕوویدا، ئەوە ئەسایكلۆڤیر ٤٠٠ ملگم × ٢ بۆ ١٠ ڕۆژ دەدرێت – و ئەگەر نزیك كاتی منالبوون نەخۆشیەكە سەری هەڵدا ئەوە بە نەشتەرگەری منالەكەی لێ دەكرێتەوە.

٨- لەباری كپبوونی بەرگری دا ئەگەر بە ژەمی زۆر نەخۆشیەكە لانەچوو ئەوە نیشانەی بوونی بێ وەلامیە بۆ دەرمانەكە و بۆ هەر ٣ جۆری دەرمانەكەیە، بۆیە فۆسكارنێت foscarnet (فۆسفۆنۆفۆرمات fosphonoformat) ٤٠ ملگم/كگم × ٣ (بە خوێن بە لەسەرخۆیی) بۆ ٢ حەفتە – ١٠ حەفتە یان سیدۆفۆڤیر cidofovir (بەلەسەرخۆیی بە خوێن) حەفتەی ٤ جار بەكاردەهێنرێن (بۆ نموونە لە كاتی ئەیدزدا).

## ڤـايرۆسي دڕكەومێكوتـە و تـاميسكی دەمار ( تـە پخـاڵ ) (Varicella zoster virus = VZV)

### أ) دڕكەومێكوتە Chicken pox = varicella

بریتییە لـە تووشێنی سەرەتایی بە ڤایرۆسی VZV، زۆربەی بارەكان منالّن (پتر لـە ٩٠٪ یـان لـە ١٠ ساڵ بچووكترن)، كاتی بەرهێنان ١٠-٢١ رۆژە (تێكڕایی ١٤-١٥ رۆژ)، گواستنەوەی ڤایرۆسەكە بە بەركەوتنی راستەوخۆ بە دەردەكـان یـان بـە رێگەی هەناسەیە، لـە سەرەتا دا ڤایرۆسەكە لـە گـــەروو و لـــــووت و پێلووپـــــۆش دا لەبەرخۆیدەگرێتـەوە replication و ئەوسـا دەچـێتە نـاوخوێن (ڤـایرۆس زانـە نـاوخوێن viremia) و زۆربەی ئەندامەكانی نـاو لـەش تووش دەكات،وەك جگەر و سپڵ و سی - تاد. دواتر دەچێتە ناو پێست و ناوپۆشەكان و دەرد دروست دەكات، ڤایرۆسەكە ٤ رۆژ پێش و ٥ رۆژ پاش دەركەوتنی دەردەكان بۆ خـەڵكی تـر تووشـێنیە infectious. تونـدی severity ناساغیەكە بەپێی تەمەنە (لە منالّدا سـووكترە)، لـە منالّ دا سكالای پێش دەركەوتنی دەردەكـان دەگمەنە، بەلام لـە بالّق دا باوە، بەشێوەی لەرز و تا و لاوازی و سەرئێشە و نەخۆری و پشت ئێشە و گەرووسۆ و كۆكـە بـۆ ٢-٣ رۆژ. (وێنـەی ٣٣٥)





(وێنەی ٣٣٥) دڕكەو مێكوتە.

دەردەكان لە سەر و دەموچاو دەردەكەون و خێـرا بـۆ قـەد بلاودەبنـەوە،بـەلام كـەمتر پەلـەكان دەگرنەوە (شێوەی چەقی یان ناوەندی central وەردەگرن)، دەردی نوێ بە كۆمەڵ دەردەكەون، پەڵەی پەمەیی خێرا دەبێت بە تەنۆچكە، بلۆق، پیزۆكە ئەوسا قەتماغـەكردن، بلۆقەكـە ٢-٣ ملـم دەبێت و هێلكەییە و هاوتەریبە لـەگەڵ هێڵی لۆچەكانی پێست، هەموو جۆرەكانی شێوەی دەردەكە لە یەك كات دا هەن، لە ١-٣ حەفتەدا قەتماغەكە فڕێ دەدرێت و پەڵە، بێ جێـزام،بۆ چەند حەفتە یان مانگ جێدەهێڵێت. شێوەی دەردی نموونەیی وەك ناوكە (ناوچاڵە) umbilicated. بلۆقەكان لە ناوپۆشەكانی دەم و لووت و گەروو و قوڕگ و بۆری هەناسە و رێچـكەی گـەدە و ریخۆڵـە و میزو كیلەك دەردەچن.

ژمارەی دەردەکان لە منالان دا ٢٥٠-٥٠٠ دەبن، بەلام لە بالق دا پژن، خوران و تا (تا ٤٠,٥ پلەی سەدی) هەن، بەلام هەندێك جار بارەکە سووکە و بێ سکالایە.
جگە لە باری کپی بەرگری لەش دا،دڕکەومێکوتە بەرگری هەمیشەیی بە نەخۆش( بۆ ماوەی ژیان) دەدات.

**ماکەکان:**

١) تووشێنی بەکتریایی دووەمی: بە ستافیلۆکۆکەس یان ستریپتۆکۆکەس بە شێوەی ئاگرە، کوان، خانەسۆ - تاد.

٢) بە دەگمەن پیسبوونی خوێن septicemia، سیەسۆ، مێشکەپەردەسۆ، مێشکەسۆ، ئێسکەسۆ، مێشکۆکە لارەلارەیی cerebellar ataxia، جگەرسۆ و دڵەسۆ myocarditis و خەپلەی خوێن کەمبوون ،روودەدات. ماکێکی تر بریتییە لە کۆنیشانەی رای Reye syndrome، ئەم کۆنیشانەیە لەوانە دا کە دڕکەومێکوتەکەیان بە ئەسپرین چارەسەر دەکرێت، روودەدات و تێیدا مێشکەسۆی تیژ و جگەرسۆ، دوای ٢-٧ رۆژ لە دەرکەوتنی دەردەکان، روودەدات و رێژەی ٤٠٪ یان دەمرن.

**دڕکەومێکوتە لە سکپڕدا:** ئەگەر لە ٢٠ حەفتەی یەکەم دا دایك تووشی بوو، لەوانەیە کۆنیشانەی دڕکەومێکوتەی زگماکی congenital varicella syndrome دروست بکات (بچووکی پەلەکانی کۆرپەلە، جێ زام لە پێست دا، ناساغی چاو و کۆئەندامی دەرماری ناوەندی - تاد) بەتایبەتی لە ١٣-٢٠ حەفتەی سکپڕیدا . رێژەی ئەم کۆنیشانەیە ١-٢٪ی کۆرپەلەکان دەگرێتەوە و کۆرپەلەی تووشبوو دوای لەدایکبوون لەوانەیە تامیسکی دەماری لە ٢ ساڵی یەکەمی ژیان دا تووش بێت، لەوانەیە منالّ لەبەرچوون و مردنی کۆرپەلەش رووبدەن.
دایکەکەش ناساغیەکە بە توندی دەگرێت و لەوانەیە سیەسۆ و تووشێنی ئەندامی تری هەبێت.
ئەگەر دایك دڕکەومێکوتەی ٥ رۆژ پێش یان ٢ رۆژ دوای منالبوون تووش ببێت، لەوانەیە دڕکە و مێکوتە لە کۆرپەکەدا زۆر بە توندی ٥-١٠ رۆژ دوای لە دایکبوون روو بدات.
دڕکە و مێکوتە لەو کەسانەی کە سستی بەرگرییان هەیە زۆر توندە و لەوانەیە کوشندەبێت.

## چارەسەر

١-پێکوتە Vaccination: پێکوتەی زیندوی سووککراو live attenuated vaccin) ، هەرچەندە لە وڵاتی ئێمە تا ئێستا نەدراوە، بەکەڵکە بە تایبەتی بۆ کارمەندی تەندروستی و بۆ بەرکەوتووی نەخۆشی تووشبوو، لە ماوەی ٣ رۆژدا لە دەرکەوتنی دەردی پێست دەدرێت و بۆ بەرگری سست وەك باری شێرپەنجەی خوێن - تاد، یان بۆ هەموو

**هاوڵاتیان. یەك ژەم بۆ ١-١٢ مانگی، دوو ژەم بۆ گەورەتر لە ١٣ مانگی ، ٤-٨ حەفتە نێوانیان هەبێت، دژەتەن تا ١٥-٢٠ ساڵ دوای کوتان لە خوێن دا بەدی دەکرێت.**

٢- باری سووك( **ژێر ١٢ ساڵی): چارەسەری سکالایی symptomatic treatment بەسە ،وەك پاراسیتۆڵ و پشوودان و دژەخوران، بەڵام بە هیچ جۆرێك ئەسپرین و نسایدس NSAIDs نابێت بەکاربهێنرێن لە ترسی کۆنیشانەی رای. ئەگەر لە ناو خێزانێك دا منالی دووەم تووشی بوو، دەبێت ئەسایکلۆڤیر بەکاربهێنرێت چونکە توندتر دەیگرێت و لە ٢٤ کاتژمێری یەکەم دا دەبێت بیدرێتێ ٨٠٠ ملگم × ٥ (بۆ منال ٢٠ ملگم/کگم چوارجار).**

٣- لە بوونی ماڵك یان لە بەرگری سست دا **(وەك بەکارهێنانی ستیرۆیدی سیستمی بۆ پتر لە ٣ حەفتە لە ٣ مانگی پێشوودا یان بەکارهێنانی ستیرۆید لە کاتی تووشبوون دا) لە نەخۆشخانە بە ئەسایکلۆڤیر،بە ڕێگەی خوێن،چارەسەر دەکرێت.**

٤- سکپڕ Pregnant women: **پێش ٢٠ حەفتە لە سکپڕی دا ئیمیونۆگلۆبیولینی (تامیسکی دەمار) و دڕکە و مێکوتە varicella-zoster immun-globulin (VSIG) بۆ دایك بەکەڵکە، بەکارهێنانی ئەسایکلۆڤیر گومانی بەکەڵکی یان بێ کەڵکی هەیە، بەڵام دوای ٢٠ حەفتە بەکار دەهێنرێت ئەگەر لە ٢٤ کاتژمێر دوای دەرد دەرکەوتن بە دەم بۆ ١٠ ڕۆژ بیدرێتێ. ئەگەر دایك لە ماوەی ٥ ڕۆژدا دوای تووشبوون منالەکەی بوو یان دوو ڕۆژی دوای منالبوون تووشی بوو، ئەوە کۆرپە لە مەترسیدایە و دەبێ VSIG + ئەسایکلۆڤیر بە خوێن لە نەخۆشخانە بۆ کۆرپە بەکاربهێنرێت.**

٥- ئەگەر یاخی بوو بۆ ئەسایکلۆڤیر **(بەرزترین ژەم کاری نەکرد) ئەوە فۆسکارنێت ٤٠ ملگم/کگم × ٣ بە ئەسپایی بە خوێن لە ١ کاتژمێردا بۆ ١٠ ڕۆژ یان ڤالاسایکلۆڤیر ٦٠-٨٠ ملگم/کگم/ڕۆژ بۆ ١٠ ڕۆژ دەدرێت.**

٦- بۆ پاراستن prophylaxis: **أ) پێکوتە ب) VZIG ج) ئیمیونۆگلۆبیولین بە خوێن intravenous immunoglobulin ٢٠٠ ملگم/کگم لە ماوەی ٣ ڕۆژدا لە بەرکەوتن بە یەك ژەم، د) ئەسایکلۆڤیر**

## ب-تامیسکی دەمار (تەپخاڵ) Herpes zoster (= پشتێنی ئاگرین = هێشووە ئاوێتەیی):

**بەهۆی دووبارە چالاکبوونەوەی ڤایرۆسی VZV دوای تووشێنی سەرەتایی ( واتا دوای دڕکەومێکوتە) یان پێکوتە، ڕوودەدات چونکە ڤایرۆسەکە، بە شاراوەیی (متی) latent، لە خانەکانی دەمارەگرێی ڕەگی پشتەکی هەستی دا دەمێنێتەوە، دواتر خۆڵەبەردەگرێتەوە و بەرەوخوار بە ناو دەماری هەستی دا دەکشێت بۆ ناو پێست لە ئەنجامی بەساڵاچووندا یان دابەزینی بەرگریدا. لەگەڵ تەمەن دا ڕێژەی تووشێن ،بەتایبەتی**

لە سیی پێست دا، پتر دەبێت، لە ژێر تەمەنی ٤٥ ساڵیدا ساڵانە کەمتر لە یەك کەس لە ١٠٠٠ کەس دا دەیگرێت، بەڵام دوای تەمەنی ٧٥ساڵی چوار ئەوەندە پترە. پێش دەرچوونی دەردی پێست (رۆژێك تا چەند رۆژێك پێشتر) ئازار و سڕبوون، خوران، کزانەوە یان ئازاری قووڵ و بێزارکەر،بە شێوەی بەردەوام یان ناوبەناو، لەگەڵ ئازاری شوێنەکە بە پەستان و فرەهەستی hyperaesthesia لە زۆربەی بارەکان دا روودەدات کە لە ئازاری سیپۆشەسۆ، لە دڵ دان، چاڵەبرینی دوانزەگری، ریخۆڵەکوێرە، پۆرگەسۆی زراو cholecystitis، ژانەسکی زراوی یان گورچیلەیی، یان داپەرینی خەپلەی نێوان بڕبڕە دەچێت. بەڵام لەوانەیە ئازارەکە لەگەڵ دەردی پێست دەست پێبکات یان هەر ئازار نەبێت و هەندێك جاری تر ئەم ئازارە دەردی پێستی بەدوادا دروست نابێت.



(وێنەی ٣٣٦) تامیسکی دەماری سێ لقی

ئاستەدەماریەکانی dermatomes لەش بەم رێژانە دەگرێتەوە: ئاستە دەماری سنگ ٥٣٪، مل ٢٠٪، کەللەیی cranial ١٥٪ (زۆربەی دەماری سێ لقی trigeminal N. (وێنەی ٣٣٦)، بەتایبەتی لقی چاو ophthalmic)، کەمەری (پشتی) lumbar و بڕبڕەی سمت ١١٪ sacral. لە سەرەتادا دەردەکە بە سووربوونەوە و تەنۆچکە لە ئاستە دەماریە تووشبووەکە دەست پێدەکات، لە چەند کاتژمێرێك دا دەبن بە بلۆق و تا چەند رۆژێك هەر دەردەچن، لەوانەیە دەردەکان چەند دانەیەك بن یان هەموو ئاستە دەماریەکە پڕکەنەوە، هەندێك جار بلۆقی خوێن رێزی یان دارزاو necrotic یان بڵقی گەورە دەردەچن، ئاستی ئازار لە گرتنەوەی توند و ،بڵاو بە تایبەتی لە پیردا، پترە، لەوانەیە چەند دەردێك (کەمتر لە ٢٠) لە دەوروبەری ئاستە دەماریەکە دەربچن، زۆربەی جار بۆ ١–٥ رۆژ،دەرد هەر دەردەچن و دواتر دەبن بە پیزۆکە و قەتماغە دەکەن و چاك دەبنەوە. ماوەی نەخۆشیەکە پشت دەبەستێت بە تەمەن، توندی دەرچوونی دەردەکان و باری بەرگری لەش، لە گەنج دا ٢–٣ حەفتە و لە پیردا ٦ حەفتە یان پتر دەخایەنێت، جێ زام جێهێشتن لە پیر و بەرگری سست دا باوە، ناوپۆشی دەم لە تووشێنی دەماری روو facial nerve (لقی شەویلاگ و چەناگە) و زێ vagina لە دەماری بڕبڕەی سمتی ٢ و ٣ دەیگرنەوە.

یەك لا دەگرێتەوە، بەڵام لەوانەیە لە بەرگری سستی توندا ٢ یان پتر ئاستە دەمار یان دوولای لەش بگرێتەوە.



(وێنەی ٣٣٧) تامیسکی دەماری کەللەیی (دەماری روو) لەگەڵ کۆنیشانەی رامسەی -هەنت.

**ماکەکان:**

١- لەسەر پێستدا: تووشێنی دوومی بە بەکتریا، جێ زام، لارەشە لە دەردەکان دا و بڵاوبوونەوە بۆ شوێنی تری پێست (پتر لە ٢٠ دەرد و وەك درکەومێکوتە دەردەکەوێت، بەتایبەتی لە پیر و بەرگری سست و نەخۆشی لاوازکەر یان لەگەڵ شێرپەنجە و ئەیدز دا).

٢- گرتنەوەی هەناوی Visceral involvement وەك سیەسۆ pneumonitis، جگەرسۆ، سورێنچکەسۆ، گەدەسۆ gastritis، پەردەسۆی دڵ pericarditis، میزڵدانەسۆ و جومگەسۆ، ئەمانە لەوانەیە لە بەرگری سست دا یان پیردا روودەن.

٣- ئاڵۆزی دەماری Neurologic complications وەك مێشك و مێشکەپەردەسۆ meningoencephalitis، پەتکە دەمارەسۆی پانی transverse myelitis، ئیفلیجی دەماری پەڕی، ئیفلیجی دەماری کەللەیی، نەمانی هەست، کەڕی، ماکی چاو، خوێن بۆریەسۆی گۆشتەزوونەگمۆڵی granulomatous angitis و دەمارەژانی دوای تامیسك post-herpetic neuralgia

- تامیسکی دەماری چاوی Herpes zoster opthalmicus: لقی چاو لە دەماری پێنج (دەماری سێ لقی) تووشی تامیسك دەبێت (بەهۆی تووشێنی لقۆکەی دەرەوەی external division لقی کوڵکی لووتی nasocillary branch کە ئەمیش گچکە لقێکە لە لقی چاو)، نیشانەکانی بریتین لە بلۆق دەرچوون لە سەری لووت و لای لووت . گرتنەوەی لێواری پێڵووی چاو نیشانەی بنەڕەتییە بۆ تووشبوونی چاو.
- کۆنیشانەی رامسەی-هەنت Ramsay Hunt syndrome: بەهۆی تووشێنی دەماری روو facial N. لەگەڵ دەماری بیستن auditory N. روودەدات، دەمارەگرێی جێنیکولەیت geniculate ganglion سۆدەکات و تامیسك (دەرد) لە گوێچکە و پەردەی گوێچکە دەردەچێت و ئیفلیجی هەمان لای دەماری روو روودەدات لەگەڵ گوێ زرنگانەوە tinnitus، کەڕی، سەرەخولێ vertigo، هێلنج و رشانەوە و ژێروژووری چاو nystagmus(وێنەی ٣٣٧).
- دەمارەژانی دوای تامیسك Post herpetic neuralgia: بریتییە لە بەردەوامبوونی یان سەرهەڵدانەوەی ئازار لە یەك مانگ زۆرتر، دوای دەرچوونی دەردی تامیسك، لە ٣٠٪ی

نەخۆشەکان دا دوای تەمەنی ٤٠ ساڵی و بە تایبەتی دوای تامیسکی دەماری پێنج (سێ لقی) ،روودەدات، ئازارەکە ئازارێکی سووتانی بەردەوام و فرەهەستی پێستە یان ئازارێکی برەری کتوپری یان سربوونی مێروولەیی خورانیە و هەندێك جار فرەئازارە هەستییە hyperalgesia (واتا ئازاری توند بەهۆی هەژێنی ئاسایی)، ئەم ئازارە چەند مانگ تا ساڵێك و بە دەگمەن کاتێکی درێژتریش دەمێنێتەوە.

**چارەسەر**

١- باری ئاسایی خوار تەمەنی ٥٠ ساڵی: تەنیا چارەسەری سکالایی symptomatic treatment بەسە ،وەك دەرمانی دژە ئازار، بەکارهێنانی نەرمکەرەوەکانو وشککەرەوەکان وەك پەرۆی تەڕ، شلەی کالاماین، نشاستەی گەنمەشامی – تاد، دژە بەکتریا ئەگەر تووشێنی دووەمی بە بەکتریا هەبوو، دژە خوران ئەگەر خوران هەبوو و هەندێك جار ئەسایکلۆڤیر ٨٠٠ ملگم× ٥ بۆ ٧ رۆژ.

٢- باری توند یان دوای ٥٠ ساڵی: ئەسایکلۆڤیر ٨٠٠ ملگم × ٥ بۆ ٧ رۆژ (١٥-٢٠٪ لە ریخۆڵەدا هەڵدەمژرێت)، ڤالاسایکلۆڤیر ١گم بە دەم × ٣ بۆ ٧ رۆژ، فامسایکلۆڤیر ٥٠٠ ملگم بە دەم × ٣ بۆ ٧ رۆژ.

٣- لە بەرگری سست دا، ئەگەر سووك بوو، وەك خاڵی ٢ لەسەرەوە چارەسەر دەکرێت. ئەگەر سستی بەرگری توندبوو ئەوە ئەسایکلۆڤیر ١٠ ملگم/کگم × ٣ بۆ ٧-١٠ رۆژ بە خوێن،ئەگەر یاخی بوون بۆ دەرمانەکە هەبوو ئەوە فۆسکارنێت ٤٠ ملگم/کگم × ٣ تا چاکبوونەوە. بۆ ئازاری زۆر: ترامادۆڵ tramadol یان ئۆکسیکۆدۆن oxycodone (٢٠-٦٠ ملگم یەك ژەمی درێژخایەن)، گاباپێنتین gabapentin ٣٠٠ ملگم × ٣، ئەمیترپتیلین amitriptyline یان نۆرترپتیلین nortriptyline ١٠-٢٠ ملگم/رۆژ وردە وردە پتر بکرێت بۆ ١٥٠ ملگم/رۆژ.

٤- سڕکەری (بەنجی) جێیی وەك لیدۆکاین (جێیی).

٥- بەربەستکردنی دەماری ورزەولا sympathetic nerve block،بە بوپیڤاکاین bupivacaine ٠,٢٥٪، یان هەژێنکردنی دەماری عەلەتریکی ڕێگاپێستی transcutaneous electrical nerve stimulation یان کەپسایسین capsaicin جێیی.

٦- ستیرۆیدی سیستمی لەگەڵ ئەسایکلۆڤیر: بۆ ئیفلیجی دەماری وەك کۆنیشانەی رامسەی-هەنت بەکاردەهێنرێت.

٧- بیڤودین bivudin ،لەم سێ دەرمانەی دژی ڤایرۆسکە بەهێزترە بەڵام هێشتا لای ئێمە نییە.

**خۆپاراستن:**

١- بۆ پیر و باری مەترسیدار پێکوتەی ڤایرۆسەکە.

٢- بەکارهێنانی ژەمی کەمی بەردەوام لە ئەسایکلۆڤیر وەك لە باری چاندنی مۆخی ئێسك B.M یان نەخۆشی ئەیدز – تاد.

## ڤایرۆسی ئێپستاین-بار Epstein-Barr virus

ڤایرۆسی تووشێنی خانەی ناوپۆش و لیمفەخانەی ب B-lymphocyteیە و بۆ ماوەی ژیان دەمێنێتەوە، لە منالّیەوە تا بیستەکان ٩٥٪ی خەلّکی تووش بووون، لە لیك دا فرێ دەدرێت بۆیە لیك هۆی گواستنەوەیەتی، تووشێنی سەرەتایی لە منالّ دا بێ سکالاّیە ،بەلاّم لە گەورەتردا لە ٥٠٪ی بارەکان دا نەخۆشی تاکناوکی تووشێنی infectious mononucleosis دوای کاتی بەرهاتن (٣-٧ حەفتە) دروست دەکات ،کە تێیدا تا (٤٠°س) و سەرئێشە و لیمفەگرێ سۆ و سپلّ گەورەبوون و گەرووەسۆ روودەدەن و لە ١٠٪ی بارەکان دا دەردی پێست و ناوپۆش بەم شێوەیەی خوارەوە هەیە:



(وێنەی٣٣٨ ) تاکناوکی تووشێنی دوای وەرگرتنی ئەمپیسیلین.

لە رۆژی ٤-٦، پەلّە یان پەلّە و تەنۆچکە لە قەد و باسك و هەندێك جار لە دەم وچاو و قۆلّ دەردێن، دەردی سورێژەیی و سوورەتا scarlet fever یان لیردەرکردن هەندێك جاری تر، دەردەکان دوای چەند رۆژێك نامێنن، پەلّە خوێنی کەمخەپلەیی thrombocytopenic purpura باوە، قوتکەسپیەی تووکنی ناودەم oral hairy leukoplakia، بەشێوەی قوتکەی سپی بەرز و نزمی سنوور نادیار لەلای زمان یان شوێنی تری ناودەم لە بەرگری سست دا، وەك ئەیدز، دەردەچێت. ئەگەر ئەمپیسلین بدرێت بە نەخۆشی تاك ناوکی تووشێنی، دەردی پێستی بە شێوەی پەلّە و تەنۆچکە یان سوورێژەیی زۆر بلاّو لەماوەی ٧-١٠ رۆژدا دوای دەرمانەکە لە ٩٠٪ی نەخۆشەکان دا ،روودەدات(وێنەی ٣٣٨ ).

## ڤايرۆسی تـاميسكی ٦ و ٧ Human herpes virus 6 & 7

هۆكاری نەخۆشی گولێزكەی ساواییە (وێنەی ٣٣٩) roseola infantum . كاتی بەرهێنان ١٠-١٥ رۆژە، تا (٣٩,٥-٤٠°س) بە كتوپری دەست پێدەكات و لە ٣-٥ رۆژ دا نامێنێت. لەگەڵ تا دا لەوانەیە گەشكە و لیمفەگرێسۆ هەبن، دوای نەمانی تا دەردی پێست بە شێوەی پەڵە و تەنۆچكەی پەمەیی جیاجیا لە مل و قەدو هەندێك جار لە قۆڵ و لاق و دەم و چاو دەردەچێت و لە ١-٢ رۆژدا نامێنێت. لە باری توند دا گانسایكلۆڤیر یان فۆسكارنێت بەكاردەهێنرێن. ئەم نەخۆشیە لە ٦-٣٦ مانگی دا دەردەچێت، بەڵام لە باڵق دا وەك نەخۆشی تاكناوكی تووشێنییە. ئەم دوو ڤایرۆسە لەوانەیە هۆكاری نەخۆشی كاژە گوڵی P. Rosea بن.



(وێنەی ٣٣٩) گوڵۆكەی ساوایی.

## كۆنیشانەی جیانۆتی-كرۆستی Gianotti-crosti syndrome

هۆكاری زۆرە ،وەك ڤایرۆسی جگەرسۆ جۆری B، ڤایرۆسی گەورەخانە cytomegalo virus، ڤایرۆسی رژێنی adeno virus، ڤایرۆسی ئێپستاین بار، ڤایرۆسی ریخۆڵە entero virus، ڤایرۆسی پێكوتەیی vaccinia .. تاد. (وێنەی ٣٤٠)

**نیشانەكان**: لە ½ -١٤ساڵی (تێكڕایی ٢ ساڵی) دا دەردەچێت بە شێوەی تەنۆچكەی یان تەنۆچكە و بلۆقی هاوشێوەیی (١-١٠ ملمی) پان و قاوەیی پەمەیی لە دەموچاو و سمت و باسك و پێشەوەی لاق ( بە شێوەی چونیەكی) بۆ پتر لە ١٠ رۆژ (٢-٤ حەفتە)، خوران كەم یان زۆرە، لەوانەیە لیمفەگرێكان بۆ ٢-٣ مانگ گەورەبن، گەورەبوونی سپڵ بە كەمی هەیە، زەردوویی دەگمەنە و جگەر بە مامناوەندی گەورە دەبێت، چارەسەر كاریگەر نییەو بۆ خۆی نامێنێت.



(وێنەی ٣٤٠)
كۆنیشانەی جیانۆتی -كرۆستی.

## گرێیۆکەی شیردۆش و ئۆرف Milker's nodules & Orf

گرێۆکەی شیردۆش لە مانگا و ئورف orf لە بزن و مەڕ،بۆ مرۆڤ دەگوازرێنەوە، تووشی دەست و باسك و دەموچاو دەبێت، کاتی بەرهاتن ۱ حەفتەیە، زۆربەی جار یەك دەرد بەڵام لەوانەیە چەند دەردێك دروست ببن. لە سەرەتادا تەنۆچکەکە دەبێت بە دەردی نیشانەیی target lesion، ئەوسا بە گرێۆکە ئەوسا وشك دەبێتەوە و خاڵی ڕەش لەسەر دەردەکە دەردەکەون، دواتر دەبێت بە بالووکەیی، ئەوسا دەردەکە پان دەبێتەوە و دەبێتە قەتماغەیی و سارێژ دەبێت، قەبارەی دەردەکە نزیکەی ۱ سم یان پتر دەبێت و ٦ حەفتە دەخایەنێت و جێ زامێکی کەم جێدەهێڵێت، ئاوسان و تا و لیمفەگرێسۆی جێیی ،کەم جار ،هەن، لە ئۆرف دا دەرهاتنی دەردی فرەشێوەسووری E.M لە ٥٪ی بارەکان دا ڕوودەدات، چارەسەر پاڵپشتییە. (وێنەی ۳٤۱)



(وێنەی ۳٤۱) ئۆرف

## دڕەتامیسکی Herpangina

هۆکارەکەی ڤایرۆسی کۆکساکی cocksackie virus (جۆری $A_8$ ، $A_{10}$ ، $A_{16}$ )، ڤایرۆسی ئیکۆ echo virus یان ڤایرۆسی ڕیخۆڵە entero virus یە، پتر لە منداڵان دا (۱–۷ساڵی) ڕوودەدات.

**نیشانەکان:** بە تا و سەرئێشەو گەرووسۆ و گران قووتدان و نەخۆری و مل ڕەقبوون دەست پێدەکات. دەردی نموونەیی لە ناو دەم دا بریتییە لە بلۆقی (۲ملم) سپی زەردباو کە دەوردراوە بە سووربوونەوەی توند لەسەر ئالوو گەلالۆچ uvula ، نەرمەمەلاشوو، چەپەری ئالوی پێشەوە anterior و گەروو. تەنیا ۱–۲ بلۆق هەن، یان گەروو پڕدەبێت لەم بلۆقانە و دواتر دەبن بە چاڵەبرین و بە پەردەی زەرد (قەتماغە) دادەپۆشرێن و لە ٥–۱۰ ڕۆژدا سارێژ دەبن. چارەسەر پاڵپشتییە. (وێنەی ۳٤۲)



(وێنەی ۳٤۲) دڕەتامیسکی.

## ناساغی دەست و پێ و دەم Hand foot and mouth disease

هۆکارەکەی ڤایرۆسی کۆکساکی (پێز $A_{16}$) یان ڕیخۆڵە (جۆری VI)یە، ناساغیەکی سووکە، کاتی بەرهاتن ٥-٧ ڕۆژە و ٧ ڕۆژیش دەخایەنێت، زۆربەیان منالَن (٢-١٥ سالّ) ،بەلاّم بالّقیش دەیگرێت، بە تا و گەرووسۆ دەست پێدەکات و لە ٩٠٪ یان دا دەردی ناودەم دروست دەبن بە شێوەی بلۆق (٤-٨ملم) کە خێرا دەبن بە چالّەبرینی دەوردراو بە بازنەیەکی سوور لە ناوپۆشی دەم، زمان، نەرمەمەلاّشوو و پووك. لە دەست و پێدا دەردەکان بێ سکالاّن و لە بەری دەست و پێدا پترن نەك لە پشتی پێ و دەست و پەنجەکان، لێرەدا دەردەکان تەنۆچکەی سوورن و خێرا دەبن بە بلۆقی (٣-٧ ملمی) دەوردراو بە بازنەی سوور، شێوەیان هێلّی یان هێلکەیی یان مانگییە و لەگەلّ هێلّی پێست هاوتەریبن، لە ساوادا شوێنی دایبی (سمت) تووشی دەبێت، چارەسەر: پالّپشتییە (وێنەی ٣٤٣).



(وێنەی ٣٤٣) ناساغی دەست و پێ و دەم.

## سوورێژە Measles

هۆکارەکەی ڤایرۆسی موربیلیڤایرۆسە morbilivirus ،کە ئەمیش بەشێکە لە میکسۆڤایرۆسەکان myxo viruses، ئەم ڤایرۆسە RNA یە و بە هەناسە دەگوازرێتەوە (وێنەی ٣٤٤). لە سەرەتادا تووشی ناوپۆشی



(وێنەی ٣٤٤) سوورێژە: أ خالّی کۆپلیك. ب و جـ لەش و دەموچاو.

لووت و گەروو دەبێت و ئەوسا بۆ هەموو لەش بلاودەبێتەوە، کاتی بەرهاتن نزیکەی ١٠ رۆژە، سکالای پێش دەردەکان بریتین لە تا، لاوازی، پێلوو پۆشەسۆ و سکالای هەلامەتی، لە رۆژی دووەمەوە خالی کۆپلیك kopliks-spots، لەسەر ناوپۆشی ناودەم لە بەرامبەری دانی خرێی دووەمی سەرەوە، بەشێوەی خالی سپی دەوردراو بە بازنەی سوور دەردەچێت.

تا و سکالای هەلامەتی و کۆکە بۆ ٣-٥ رۆژ پەرەدەسێنێت، لە رۆژی چوارەم دا سووربوونەوە لەسەر ناوچەوان و پشتی گوێچکە دەردەچێت و لە ٢٤ کاتژمێردا بۆ هەموو دەموچاو و قەد و پەلەکان بلاودەبێتەوە، لە سەرەتادا دەردەکە پەڵەییە macular ،دواتر تەنۆچکەی سووری کپن dull red و بە کۆمەڵ دەردەچن، لە رۆژی ٦-١٠ دەردەکان نامێنن و رەنگی قاوەیی و کاژ جێ دەهێڵن، لە باری توند دا دەردەکان ،خوێنرێزین یان بلقین، وەك کۆنیشانەی ستیڤنس جۆنسن.

ماددەکان، لە باری بەدخۆراکی یان تووشێن بە نەخۆشی تری درێژخایەن ،پتر روودەدەن، وەك سییەسۆ. ریخۆڵەسۆ، گوێچکەسۆی ناوەڕاست یان مێشکەسۆ کە زۆر دەگمەنە.

**چارەسەر**

چارەسەری پالپشتی و پشوودان.

١- دژەبەکتریا بۆ بەرگری دژی تووشێنی دووەمی بە بەکتریا.

٢- ئیمیونۆگلۆبیولینی مرۆڤ human immunoglobulin ،لە ماوەی ٥ رۆژدا لە بەرکەوتن. بۆ منالی جێی مەترسی وەك بەدخۆراکی، لاوازی ..تاد بەکەڵکە.

٣- پێکوتەی دژە سوورێژە بە هەموو منداڵێك (پێکوتەی زیندووی سووککراو life attenuated vaccin ،دەدرێت بۆیە دوای کوتان کەسەکە سوورێژە ناگرێت یان زۆر بە سووکی دەیگرێت.

## سوورێژەی ئەڵمانی German measles (Rubella)

هۆکارەکەی ڤایرۆسی تۆگایە toga virus (جۆری روبی rubi virus)، لە هەموو جیهان دا هەیە و نیشتەنی شارە گەورەکانە، ناوبەناو بە تایبەتی لە وەرزی بەهاردا پەتاییە epidemic، بە هەناسە دەگوازرێتەوە، توانای تووشێنی infectivity لە کۆتایی کاتی بەرهاتن، پترە و دوای ٤ رۆژ لە دەرکەوتنی دەردەکان نامێنێت.

کاتی بەرهاتن ١٤-٢١ رۆژە (تێکڕایی ١٨ رۆژ)، سکالای پێش دەردی پێستی لە منال دا نییە، بەلام لە گەورەدا تا و سەرئێشە و لاوازی و گەروسۆ و سکالای هەلامەتی و پێلووپۆشەسۆ هەن و دوای دەرچوونی دەردەکان لە پێست دا نامێنن.

**نیشانەکان**: (وێنەی ٣٤٥) نیشانەی فۆرشهایمەر Forsch-heimer's sign لە ٢٠٪ی نەخۆشەکان دا ،لە پێش دەردی پێستی یان لە یەکەم ڕۆژی دەرچوونی دەردی پێستی دا، بەشێوەی پەڵەی سووری تۆخ یان خاڵەخوێن petechiae لە نەرمەمەلاشوو دەردەچێت، گەورەبوونی لیمفەگرێکان ٥-٧ ڕۆژ پێش دەرچوونی دەردی پێستی ڕوودەدات و گەورەبوونەکە تا ١-٢ ڕۆژ دوای دەرچوونی دەردی پێستی پەرەدەستێنێت، گەورەبوونی لیمفەگرێکان بەربلاوە،بەلام لە ژێر پشتەسەر suboccipital، پشت گوێچکە post auricular و مل cervical دا پترە، ئازاری لیمفەگرێکان دوای ١-٢ ڕۆژ نامێنێت بەلام قەبارەیان تا چەند حەفتەیەك هەر بە گەورەیی دەمێنێتەوە. دەردی پێستی لە دەمو چاودا دەردەچێت و خێرا بۆ قەد و پەلەکان، بەشێوەی پەڵەی پەمەیی جیاجیا، بلاودەبێتەوە، بەلام لە دەموچاودا وەك سووربوونەوەی دەموچاو یەك دەگرن، لە ڕۆژی دووەم دا دەموچاو پاك دەبێتەوە ،بەلام لە قەد دا پەڵەکان کەمێك یەك دەگرن coalescence، بەلام هی پەلەکان هەر جیاجیان، لە ڕۆژی سێیەم دا قەد پاك دەبێتەوە و لە ڕۆژی چوارەم دا پەلەکانیش پاك دەبنەوە.



(وێنەی ٣٤٥) سوورێژەی ئەڵمانی.

**ماکەکان**: لە منالی دا کەمن، بەلام لە گەورەتردا هەن، وەك جومگەسۆ، پەڵەخوێن purpura و زۆر بە دەگمەن مێشکەسۆ.

**لە سکپڕی دا**: تووشبوونی دایکی سکپڕ دەبێتە هۆی ماکی بەد لە کۆرپەلەدا، بەتایبەتی ئەگەر تووشێنی دایك لە حەفتەکانی سەرەتای سکپڕی دا ڕووبدات، وەك لە ناوچوونی یان بەد دروستبوونی دڵ، چاو، کەڕی، کەمژیری، سەربچووکی، کەم خەپلەیی، زەردوویی و ئێسك تێکچوون.

**خۆپاراستن** بریتییە لە پێکوتە (پێکوتەی MMR)، دوای پێکوتە تا ٤ حەفتە نابێت دایك سکپڕبێت.

**چارەسەر**: پاڵپشتییە.



(وێنەی ٣٤٦) گوازەرەملێ.

## گوازەرەملێ Molluscum contagiosum (M.C.)

ڤایرۆسی گوازەرەملێ (MCV) جۆرێکە لە کۆمەڵی ڤایرۆسی پۆکس(وێنەی ٣٤٦) ، بەلام لە شێوە و دژەتەنی و گۆڕانکاری نموونە وەرگرتن،لە جۆرەکانی تر جیایە. قەبارەی گەورەیە (٢٠٠-٣٠٠ نم)، DNA

یەو لە ناو سایتۆپلازم دا خۆلەبەردەگرێتەوە replication، لە ناو خانەکانی چینی درکەیی و دەنکۆلەیی تویژ دا زۆر دەبێت و تەنی مۆمی hyaline گەورە دروست دەکات و پێی دەڵێن تەنی ملّی molluscum bodies. گوازەرەملێ زۆر باوە (نزیکەی ٥٪ی منالان دەیگرن)، نزیکەی ٤ جۆری ئەم ڤایرۆسە دەردەکە دروست دەکەن، بەلام جۆری $MCV_I$ زۆرترینیانە، سێ کۆمەڵ تووش دەبن: ١) منالّ: لە سەر و مل و قەد ، لە ناوچەی کەمەرەیی زەوی tropical پەلەکان پتر تووشی دەبن، بەلام لەوانەیە بێ لێککەوتنی سێکسی منالان کۆئەندامە سێکسیەکانیان بیگرنەوە، ٢) پێگەیشتوو واتا بالّق بوو: بەهۆی گواستنەوەی لێککەوتنی سێکسی لە کۆئەندامە سێکسییەکان دا پتر دەیگرن، ٣) بەرگری سست: وەك ئەیدز یان بەهۆی هۆکاری تر،بۆ نموونە بەکارهێنانی دژە شێرپەنجە یان ستیرۆید، بە بلاوی و بە قەبارەی گەورەتر تووشیان دەبێت. دەردەکان زۆربەی جار لە ٢٠ دانە کەمترن، بەلام لەوانەیە یەك دوو دانە یان سەدان دەربچن. هەر دانەیەك ٢-٤ مانگ پتر ناخایەنێت و نامێنێت، بەلام نەخۆشیەکە نزیکەی ٦-٩ مانگ و هەندێك جار ٢-٣ سالّ دەخایەنێت و بێ چارەسەر نامێنێت.

کاتی بەرهێنان ½ -٦ مانگە. دەردەکە بریتییە لە تەنۆچکەی ناوکی (ناوچالّی) umbilicated نیوگۆیی hemispherical سپی لووس و لە ٦-١٢ حەفتەدا دەگاتە قەبارەی ½ -١ سم، بە دەگمەن گەورەتریشە، لەوانەیە دوای زەبر،یان هەر بۆخۆی ،کێم دروست بکات و نەمێنێت.
لەوانەیە نزیك چاو دەردەکە پێڵوپۆشەسۆ و پەرگلێنەسۆ دروست بکات و لە نەخۆشی جێگۆڕاودا atopic بیرۆ لە دەوروبەری دروست بکات.

چارەسەر

١- بێ چارەسەر نامێنێت، تەنیا چاوەڕوانکردن بەسە.
٢- چونکە ڤایرۆسەکە بە لێککەوتن یان بە سێکس یان بە کەلوپەلی تووشبوو بە تایبەتی لە مەلەوانگە و شوێنی جل گۆڕینی یاریگاکان دەگوێزرێتەوە، تووشبوو دەبێت چارەسەر بکرێت و هەنگاوی لەبار بۆ نەهێشتنی تووشکردنی خەڵکی تر بنرێت.
٣- دوای لە دەست کردنی دەستکێش ،گوشینی دەردەکە لە نێوان نینۆکی هەردوو پەنجە گەورە و فرێدانی ناوەرۆکی دەردەکە یان بە بەکارهێنانی گیرە forceps.
٤- بەکارهێنانی ئامێری کرێنەر curette زۆر بەکەڵکە.
٥- ترێتینۆینی جێیی topical tretinoin.
٦- دوای شۆردن،پلاستەر شەو تا بەیانی بۆ ٨ حەفتە، بەیانی بە توندی پلاستەرەکە لێ بکرێتەوە.
٧- تەزینەچارە cryotherapy.
٨- کانثاریدین (جێیی) بۆ ٤-٦ کاتژمێر.
٩- ترشی سالیسیلیك ٥٠٪ جێیی.

١٠- TCA (٣٥-١٠٠٪) جێی ٥، ڕۆژ جارێك.

١١- لەبەرگری سست دا (بوونی دەردی گەورە و یاخی لە چارەسەر): ئینتەرفیرۆن ئەلفا لە ژێر پێست (تێچزاندنی ژێر پێست) یان پێنج فلۆرۆیوراسیل 5FU، چەمکی ئیلیکترۆنی electron beam، سیدۆفۆڤیر (جێیی) ١-٣٪.

## بالووکە (Verruca) Warts

ڤایرۆسی پاپیللۆما papilloma virus ( کە جۆرێکە لە ڤایرۆسی پاپۆڤا papova virus) ڤایرۆسی DNAی دوو تاڵین double strand و بە سستی گەشە دەکەن و بێ پەردەن (زەرفیان نییە non-enveloped)، بۆیە لە وشکبوونەوە و بەستن و توێنەرەوەکان solvents بەرگریکەرن، لە ناو ناوکی خانە دا خۆ لەبەر دەگرنەوە، قەبارەیان ٥٠-٥٥ نم دەبێت و تووشی ڕووپۆشەخانەی کاژی squamous-epithelia دەبن و دەبنەهۆی خانە زۆربوون cell proliferation و بالووکە دروست بوون، ڤایرۆسەکە تووشی چینی بنکەیی توێژ (دایکەخانە stem cells) دەبێت، بەڵام خۆلەبەرگرتنەوەی ڤایرۆسەکە لە بەشی سەرەوەی چینی دڕکی و چینی دەنکۆڵەیی دا ڕوودەدات.

ڤایرۆسی پاپیللۆمای مرۆڤ human papilloma virus (HPV) کۆمەڵێکی زۆرن، بەپێی DNA ی ڤایرۆسەکە جیادەکرێنەوە بە ئەزموونی کاردانەوەی زنجیرەی پۆلیمەرەیس PCR و ڕیزبەندی DNA "DNA-sequencing" و نزیکەی ٨٠ جۆر لە HPV تا ئێستا ڕیزبەندکراون بەڵام ژمارەی جۆرەکان دەگاتە ١٠٠-١٥٠ جۆر.

ئەم ڤایرۆسە بە سێ شێوە لە پێست دا هەیە:

١- سەرجێی clinical-infection: بە سەیرکردن بالووکەکە دیارە.

٢- ژێرسەرجێی sub-clinical-infection: بە سەیرکردن دیار نییە، بەڵام دوای سڕینی پێستەکە بە ترشی ئەسیتیك acetic acid دەردەکەوێت.

٣- متی latent infection: بریتییە لە بوونی ڤایرۆسی HPV یان جینۆمی (کۆی جینی) ڤایرۆسەکە لە پێستی ئاسایی دا و بەتایبەتی لە پێستی کۆئەندامە سێکسییەکان دا باوە، بۆیە هەندێك جار، دوای چاکبوونەوەی بالووکەکان بە چارەسەر، هەر سەرهەڵدەدەنەوە.

**دەستنیشان کردن** زۆربەی جار سەرجێییە، بەڵام لە باری نائموونەیی atypical یان بێ نیشانەیی دا subclinical یان دەردی بەد گەشەکردوو dysplastic دا، پشکنینی بەم شێوەیەی خوارەوە بۆ دەکرێت:

١- نموونەوەرگرتن.

٢- دۆزینەوەی ڤایرۆسەکە بە وردبینی ئیلیکترۆنی.

٣- بەکارهێنانی دژەتەن لە پشکنینی بەرگریەنموونەکیمیکی immunohistochemistry یان بەرگریەخانەکیمیکی immunocytochemistry.

٤- کاردانەوەی زنجیرەی پۆلیمەرەیس PCR.

٥- دووڕەگکردنی DNA (DNA hybridization).

زۆربەی بارەکان بێوەیین benign بەڵام لە هەندێك باردا بۆ شێرپەنجە دەگۆڕێن.

**ڕێگەی گواستنەوە** Mode of transmission

١- لێککەوتنی راستەوخۆ بە تایبەتی لە باری رووشانی یان برینداربوونی پێست، لە مەلەوانگە و گەرماو دا، نینۆك گەستن و پەنجەمژین، تاشین (ریش تاشین)، پیشەی گۆشت فرۆش و ماسی فرۆش، جووتبوون – تاد.

٢- کەلوپەلی تووشبوو وەك جل و بەرگ، خاولی، شانە – تاد.

٣- سێکس.

**کاتی بەرهێنان**: چەند حەفتەیەك تا ١ ساڵ (تێکرایی ٢,٨ مانگ) دەخایەنێت.

**نیشانەکان**:

١- **بالووکەی باو (ئاسایی)** Common warts (Verrucae vulgaris)

بریتییە لە تەنۆچکەی روو زبری قۆچەکاژی، ڤایرۆسی پاپیللۆما جۆری ١، ٢، ٤، ٢٧، ٥٧ و ٦٣ دروستی دەکەن، زۆربەیان لە ٥-٢٠ ساڵی دا و تەنیا ١٥٪ یان دوای ٣٥ ساڵی روودەدەن، لە گۆشت فرۆشەکان دا، جگە لە جۆری ٢ و ٤ جۆری ٧یش دروستی دەکات، جۆری ٥٧ کەم جار هەر ١٠ نینۆکی دەست تووشی بەدگەشەیی nail dystrophy دەکات و پلێتی نینۆك لە ناو دەبات. (وێنەی ٣٤٧)



(وێنەی ٣٤٧) بالووکەی باو.

ئاکامی ئەم جۆرە بالووکەیە بێ چارەسەر چاکبوونەوەیە (لە منالّ دا چەند مانگ تا ٥ ساڵ)، زۆربەیان لە پێستی دەست دەردەچن (پەنجە و بەری دەست پتر دەیگرن)، بالووکەی دەوری نینۆك لەوانەدا کە نینۆك دەگەزن زۆرە ،درزبوونی رووی بالووکە ئازار و خوێن رێژی دروست دەکات، قەبارەیان لە خاڵێکی بچووك تا ١ سم یان گەورەترە،بەڵام زۆربەیان ٥ میللیمەترن، بۆ چەند حەفتە تا چەند مانگ هەر گەورەتر دەبن، بالووکەی نوێ لە شوێنی زەبر پەیدا دەبێت و رێژەی بالووکەی ئاسایی لە کۆئەندامە سێکسیەکان دا

١-٢٪ى بارەكانە (لە قەدى چووك)، لەوانەيە بالووكە لە سەر پێلووى چاو پێلووپۆشەسۆ و پەرگلێنەسۆ دروست بكات، زمان و ناوپۆشى ناودەم پڕ لە بارى نينۆك گەستن ،كە دەورى نينۆك،يان پەنجەمژ كە پەنجە تووش بووبێت، روودەدات.

## ٢- بالووكەى ژێرپێ Plantar warts

ڤايرۆسى پاپيللۆما جۆرى ١، ٢، ٤، ٥٧ (بەڵام جۆرى مۆزاييكى mosaic warts جۆرى ٢) دروستى دەكات و بريتييە لە دەردێكى خڕى سنوور ديار و رووەكەى زبرى قۆچەكاژيە و لێوارێكى لووسى قۆچەكاژى ئەستوور، دەورى داوە، ئەگەر رووى ئەم بالووكەيە بكرێنين،خاڵى خوێنى دەردەكەون ،كە بريتين لە كۆتايى گۆيى بن توێژى دێژبوو، بە مەش لە مێخەكە و رەقبوون callosity جيادەكرێتەوە كە رووەكانيان لەگەڵ پێستى دەورووپشتى دا بەردەوامە، بە پێچەوانەى بالووكە. (وێنەى ٣٤٨)



(وێنەى ٣٤٨) بالوكەى ژێر پێ.

لەوانەيە بالووكەى بەرى دەست و پێ بێ سكالآبن، يان زۆر بە ئازار بن و نەخۆش نەتوانێت لە سەر پێ بە ئاسايى بڕوات، زۆربەيان لە خاڵى فشار pressure points دا دروست دەبن (پاژنەپێ و سەرى پاژنەئێسك يان لە ژێر پەنجەى پێ و پێشى پێ)، لە ٦ مانگ – ١ ساڵ دا نامێنن، بەڵام لەوانەيە چەند ساڵ بمێننەوە، بالووكەى مۆزاييكى mosaic warts، بريتييە لە بەكۆمەڵ بەيەكەوە نووسانى بالووكەى بەرى دەست و پێ و زۆر درێژخايەنە، لەوانەيە ژمارەى بالووكەى بەرى پێ لە يەك تا ژماريەكى زۆر هەبن.

## ٣- پانەبالووكە (تەختەبالووكە) Plane warts (Verruca plana = Flat warts)

ڤايرۆسى پاپيللۆما جۆرى ٣، ١٠، ٢٨ و ٤١ هۆكارەكانن، مناڵ و گەنج پتر دەيگرن، نيشانەكانى بريتين لە تەنۆچكەى (٢-٤ ملم) رووتەختى سوورى كاڵ، يان قاوەيى يان رەنگ پێستى (يان تۆخ لە پێستى تۆخ دا)، لە يەك تا سەدان بالووكە لە دەموچاو و مل و پشتى دەست و مەچەك و ئانيشك و ئەژنۆو لاق و پشتى پێ دا دەردەكەون، ديارەدەى كۆبنەر باوە، لە هەموو جۆرەكانى ترى بالووكە ئاسانتر بێ چارەسەر وەپاش دەچنەوە. هەندێك جار بالووكەى ئاسايى، بە تايبەتى لە پشتى دەست دا، هەن. (وێنەى ٣٤٩)



(وێنەى ٣٤٩) پانەبالووكە.

### ٤- بالووکەی پەنجەیی و دەزوویی Filiform & digitate warts

لە نێرینەدا لە دەم و چاو و مل و لە هەردوو رەگەزدا لەسەر پێستی سەر ،دەردەچن.

### ٥- بالووکەی کۆئەندامی سێکسی و کۆم Anogenital warts

زۆربەیان بە ڤایرۆسی پاپیللۆما جۆری ٦و ١١ پەیدا دەبن، لە منالّ دا جۆری ٦ و ١١ یان جۆرەکانی ،کە بالووکەی ئاسایی دروست دەکەن، هۆکارن، ئەم جۆرە بالووکەیە پێی دەڵێن قۆچەنەرمۆکە condylomata acuminatum و بریتین لە تەنۆچکە و گرێۆکەی توێژی و بن توێژی لە ناوگەلّ، کۆئەندامی سێکسی، لاڕان یان کۆم و دەوری کۆم، قەبارەیان جیاوازە (بچووك تا گەورە) و لەوانەیە تەنی قارچکی لە شوێنە خوساوەکانی ناوگەلّ دا دروست بکەن، بەلاّم تەنۆچکەی پانی بچووکی (١-٣ ملمی) لەسەر قەدی چووك دا دەگمەن نییە، یان بالووکەی ئاسایی هەندێك جار هەن، لەوانەیە بۆ ناو زێ، میزەجۆ یان رێکە rectum بکشێن و ئازار و دەلاّندن و خوێن رێژی دروست بکەن، لە کاتی سکپڕی دا گەورەتر دەبن، هەندێك جار بۆگەن لە دەوری کۆم و کیلەك پەیدا دەبێت. (وێنەی ٣٥٠)




(وێنەی ٣٥٠) بالووکەی کۆئەندامی سێکسی.

چەند حەفتە تا چەند ساڵ دەمێننەوە، دوای چاکبوونەوەش رێژەی ٢٥٪ یان سەرهەڵدەدەنەوە، ئەم نەخۆشانە زۆر جار نەخۆشی سێکسی تریشیان هەیە،وەك تامیسکی سێکسی، سووزەنەك، کاندیدا – تاد. لە کاتی دەرکەوتنی تەنی گەورەی بەرزبووەوە، پەتەوبوون یان دەلاّندنی زەرداو و خوێن ،گومانی دروستبوونی شێرپەنجە هەیە و برین بە نەشتەرگەری یان نموونە وەرگرتن پێویستە.

## ٦- باونە تەنۆچکەیی Bowenoid papulosis

باونەتەنۆچکەیی،بریتییە لە تەنۆچکەی بچووکی (چەند میللیمەتری) تۆخی تەخت بە جیاجیا یان بە کۆمەڵ، لەسەر چووك، نزیك کیلەك یان لە دەوری کۆم دا، هەندێك جار چەند سەنتیمەترێکن، لەوانەیە چەند تەنۆچکەیەکی بچووك لە شوێنی تر وەك مل و دەموچاو هەبن، بەڵام لە کۆئەندامی سێکسی دا نەبن، هۆکارەکەی پتر ڤایرۆسی پاپیللۆما جۆری ١٦یە و بە دەگمەن (٥٪یان) دەبن بە شێرپەنجە (شێرپەنجەی خانەی کاژی S.C.C).



(وێنەی ٣٥١) باونە تەنۆچکەیی.

لەوانەیە لە سەر پێستی رووت،وەك گۆی چووك لە خەتەنە نەکراودا، یان لە زێ دا vagina، یان ملی منداڵدان دا، یان رێکە دا ببێ بە شێرپەنجەی خانەی کاژی پەڵاوێژ invasive S.C.C. (وێنەی ٣٥١)

## ٧- قۆچەنەرمۆکەی زەبەلاح (لووی بوشکی - لاوێنشتاین)

Giant-condylomata-acuminatum = (Buschke-lawenstein tumor)

هۆکارەکەی ڤایرۆسی پاپیللۆما، جۆری ٦ یان ١١ یە، دەگمەنە و لە سەرەتا دا بالووکەی کۆئەندامی سێکسی یان کۆمە و گەشە دەکات، پتر لە گۆ و پێستی خەتەنەدا و کەمتر لە دەوری کۆم و کیلەك دا دەردەچێت. لەوانەیە قووڵ پەل بهاوێژێت و کەم جار بۆ لیمفەگرێ جێیەکان تەشەنە بکات metastasize.

**چارەسەر**: نەشتەرگەری.

## ٨- گۆگمۆڵی قورگی سەرهەڵداوە Recurrent laryngeal papillomatosis

لە منداڵ دا (ژێر پێنج ساڵی) بەهۆی قۆچەنەرمۆکەی کۆئەندامی سێکسی دایك و دوای ١٥ ساڵی لەوانەیە لە منالّی دا جۆری شاراوە (مت) بوو بێت و لە باڵقی دا سەرهەڵدەداتەوە، ڤایرۆسی پاپیللۆما جۆری ٦ و ١١ هۆکارەکانن، دەنگگری hoarshess دروست دەکات و لە ١٤٪ یان دا دەبێتە شێرپەنجە -

**چارەسەر**: لەیزەر $CO_2$ + ئینتەرفیرۆن IFN.

## ٩- تویێژەبەدگەشە بالووکەیی Epidermodysplasia-verruciformis

لە زۆربەیان دا بۆماوەیی لەشی بەزیوە A.R، بەرگری خانەیی CMI دابەزیوە (کپبووە) بە تایبەتی خانەی یاریدەدەر Th لە کار و ژمارە دا ،لە ئاسایی، کەمترە. لە منداڵی دا دەردەکەوێت و ڤایرۆسی پاپیللۆما بە بەربڵاوی تووشی پێست دەبێت (پتر لە ٢٠ جۆر ئەم بارە دروست دەکەن، وەك جۆری ٥، ٨، ٩، ١٢، ١٤، ١٥، ١٧، ١٩-٢٥، ٢٨، ٢٩، ٣٦، ٣٧، ٣٨، ٤٧، ٤٧، وە ٥٠ و جۆری ٣ و ١٠)، ئەم نەخۆشیە بۆ ماوەی ژیان دەمێنێتەوە. (وێنەی ٣٥٢)



(وێنەی ٣٥٢) تویێژە بەدگەشە بالووکەیی.

**نیشانەکان**: وەك تەختەبالووکەیە بەڵام پانترن، لە پشتی دەست و پەلەکان و دەموچاو و مل دەردەکەون، بەڵام لە قەد و پەلەکان دا گەورەترن و دوو بابەتن (پەڵەی کاژاوی وەك نەخۆشی کەرووی فرەڕەنگی pityriasis versicolor واتا ڕەنگی سپی یان قاوەیی، یان قوتکەی ئەستوورترن و ڕەنگی پەمەیی بۆ بنەوشەیین). شێرپەنجەی خانەی کاژی .S.C.C لە ٣٠-٦٠٪ی بارەکان دا بە تایبەتی لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان دا ڕوودەدات،بەڵام لەوانەیە لە شوێنی تریش دەربچێت.

### چارەسەر

١- نەشتەرگەری بۆ شێرپەنجە و ئەگەر متوربەی پێست پێویست بوو دەبێت لە شوێنە داپۆشراوەکان وەربگیرێت.

٢- خۆپاراستن لە ت.س.و ( واتا خۆر) بە هەموو ڕێگایەك کە لە تواناداببێت.

## ١٠-بالووکە لە بەرگری سستدا

وەك ئەیدز، شێرپەنجە، ئەندام چاندن، دەرمانی خانەکوژ، ستیرۆیدی سیستمی و بەرگری سستی زگماکی، لەم بارانەدا بالووکە بە بەربڵاوی بە شێوەی نائموونەیی و قەبارەی گەورە و لەوانەیە لە شوێنی نائاسایی دروست بێت و چارەسەری زۆر گرانە.

تێبینیەکان:

١- زۆر جار بالووکە پێویستی بە چارەسەر نییە و چاوەڕوانکردن،تا خۆی نامێنێت، بەسە.

٢- ئەوانەی بالووکەیان هەیە،با لە مەلەوانگە و یاریگا و گەرماوە گشتیەکان دا کەلوپەلیان بەکارنەهێنرێت و پێلاوی تایبەت بۆ بالووکەی ژێر پێ لەپێ بکەن و خووی نینۆک گەستن و پەنجەمژین لەوانەی بالووکەیان هەیە نەهێڵرێت. ئەوانەی بالووکەی کۆئەندامی سێکسیان هەیە، با بزانن کە دوای چاکبوونەوەش لەوانەیە ڤایرۆسەکە بە شاراوەیی تێیاندا بمێنێتەوە و بۆ بەرامبەرەکانیان هەر سەرچاوەی تووشکردن بن، لە کاتی جووتبوونی سێکسی دا، با کۆندۆم بەکاربهێنن و چارەسی خۆیان بکەن، هەروەها لە ژنان دا، بۆ باری درێژخایەن، هەندێك جار ئەگەری گۆڕان بۆ شێرپەنجەی ملی منداڵدان هەیە و باشتر وایە ناوە بە ناوە پشکنین بۆ ئەم مەبەستە بکرێت، منداڵ کە بالووکەی کۆم یان کۆئەندامی سێکسی هەبێت،باشتر وایە بەدواچوونی بۆ بکرێت، بۆ ئەوەی بزانین سەرچاوەکەی بەدبەکارهێنانی سێکسییە یان نا.

٣- لەوانەیە دوای چارەسەرکردن بالووکە سەرهەڵداتەوە و چارەسەریش تەنیا ڕێژەیەك لە چەند مانگێك دا چاك دەکاتەوە و لەوانەیە پێویست بکات جۆری چارەسەرەکە بگۆڕین.

چارەسەر

١-ترشی سالیسیلیك salicylic Acid (S.A.) (١٠-٥٠٪) بە تەنیا،یان S.A. ١٧٪ + ترشی لاکتیك ١٧٪ lactic acid و ٤ بەش لە کۆلۆدیۆنی نەرم flexible collodion بۆ ٣ مانگ، (٧٨٪)ی نەخۆش چاکدەکاتەوە.

٢- S.A. ٦٠٪ + MCA (مۆنۆکلۆرۆئەسیتیك ئەسید) بۆ بالووکەی ژێرپێ، یەك جار لە حەفتەیەك دا، دوای ٦ حەفتە ٦٦٪ی بارەکان چاکدەبنەوە.

٣-پێنووسی نەتراتی زیو $AgNO_3$ pencil ٣ ڕۆژ یەك جار بۆ سێ کەڕەت، یەك مانگ دواتر ٤٣٪ یان چاکدەبنەوە.

٤-نایترۆچینی شل liquid nitrogen (بەستنەچارە cryotherapy): بە ئامێر بە شێوەی سپرای cryospray یان بە دارچەی سەربەلۆکە cotton wool applicator (بۆ ٥ – ٣٠ چرکە) ،لەگەڵ هەندێك پەستان لەسەر دارچەکە، ٢-٣ حەفتە جارێك یەك یان چەند جار (بۆ ٣ مانگ) ڕێژەی ٧٥-٨٠٪ سەرکەوتووە،بە تایبەتی بۆ بالووکەی دەست و ژێر پێ وکۆئەندامی سێکسی.

٥- گلوتارئەڵدیهاید glutaraldehyde ١٥٪ لە ناو ئیثانۆڵدا یان جێڵ بۆ بالووکەی پێ (ڕەنگی قاوەیی لە پێست دروست دەکات).

٦-پۆدۆفیلین podophyllin ٢٥٪ لە ناو تێهەڵسووی بێنزۆین tincture of benzoin ،لە لایەن پزیشك لە بالووکەی کۆئەندامی سێکسی دەدرێت بۆ ٤-٨ کاتژمێر، ئەوسا دەشۆرێتەوە، حەفتەی

یەك جار بۆ ٣ مانگ. پۆدۆفیلۆتۆکسین podophyllotoxin شلە ٠,٥٪ یان جێڵ لەلایەن نەخۆشەوە رۆژی ٢ جار بۆ ٣ رۆژ لە حەفتەیەك دا بەکاردەهێنرێت (٣ رۆژی دوا بە دوای یەك) بۆ ٤-٦ حەفتە، رێژەی ٦٠٪ یان چاکدەبنەوە ( بۆ بالووکەی کۆئەندامی سێکسی).

٧-فۆرمالین formalin ٢-٣٪ شلە، پێی دەخرێتە ناو بۆ ١٥-٢٠ خولەك رۆژی یەك جار بۆ ٢ مانگ بۆ بالووکەی پێ.

٨-پێنج فلۆرۆیوراسیل جێیی 5FU ٥٪ شلە ،یان 5FU ٥٪ + ١٠٪ S. A. بۆیە paint، شەوی جارێك بۆ ١٠ حەفتە،یان مەرهەمی 5FU ٥٪، یان 5-FU مەرهەم لە ژێر بەستن دا شەوانە بۆ ١ مانگ (٦٠٪ یان چاکدەبنەوە).

٩-سووتێنەرەکان caustics وەك TCA، MCA. ٣-٥ رۆژ جارێك بە دارچەی سەربەلۆکە.

١٠- ترێتینۆین (جێیی) topical tretinoin، بە تایبەتی بۆ تەختەبالووکە،رۆژی ١-٢ جار بۆ چەند مانگێك یان تازەرۆتین tazarotene کرێم یان جێڵ.

١١- ئامێری کرێنەر currete ،زۆر بەکەڵکە.

١٢- سووتێنەری ئەلێکتریکی electrocautery،لەوانەیە جێ زام دروست بکات و بەئازارە.

١٣- نەشتەرگەری: جێ زام جێ دەهێڵێت و کەم جار بەکار دەهێنرێت.

١٤- لەیزەر PDL،مانگی یەك جار لە ٦٠-٧٠٪ی بارەکان دا سەرکەوتووە، لەیزەری $CO_2$ یان Er:YAG زۆر بەکەڵکن.

١٥- ئیمیکوێمۆد imiquimod جێیی، رۆژی ٢ جار بۆ ٥ مانگ بۆ بالووکەی یاخی لە چارەسەر، لە ٥٠-٦٠٪ ی بارەکان دا سەرکەوتووە.

١٦- گەرمە چارە heat therapy جێیی، ئامێری بەدەست بەکارهاتوو کە گەرمی بەرهەم دێنێت لە خێرایی رادیۆیی radiofrequency heat generator، ١-٤ جار جاری بۆ ٣٠ چرکە کە گەرمی ٥٠°س دەگەیەنێتە بالووکەکە (٨٠٪ی بارەکان سەرکەوتووە).

١٧- ترشی فۆرمیك (جێیی) topical formic acid، ٨٥٪ شلەی ترشی فۆرمیك لەسەر بالووکەکە دادەنرێت و دەرزی بەناو شلەکەدا دەخرێتە ناو بالووکەکە لە چەند شوێنێك دا ،رۆژ نا رۆژ،بۆ ١٢ جار (٩٠٪ بارەکان سەرکەوتووە).

١٨- ئەلفا-لاکتەلبومین - ئولێیك ئەسید (جێیی) topical α-lactalbumin-oleic acid لە ژێر بەستن دا، بۆ ٣ حەفتە.

١٩- بلیۆمایسین bleomycin بە تێچزاندن بۆ ناو بالووکە (١ یەکە/مل 1 Iu/ml) دوو جار لە مانگێك دا، بۆ بالووکەی مۆزاییکی یان دەوری نینۆك بەکەڵکە،هەرچەندە زۆر بەئازارە.

٢٠- بەرگریەچارە immunotheraphy:

أ) دایفێنسیپرۆن diphencyprone، بە چڕی ۰,۰۱-٦٪ دوای هەستیارکردنی سەرەتایی (یەکەم جار) هەر ١-٤ حەفتە یەك جار، لە بالووکەکە دەدرێت، لە دوای ٥ کەڕەت ٨٥-٩٠٪ یان چاکدەبنەوە ، بۆ بالووکەی یاخی لە چارەسەر، بەکاردەهێنرێت.

ب) سکواریك ئەسید squaric acid ۰,٢٪ دوای هەستیارکردنی سەرەتایی، حەفتەی ٢ جار بۆ ٣ مانگ (٥٠-٧٠٪ بەکەڵکە).

ج) دژەژینەدەری ملەخرێ mumps + کاندیدا candida + ترایکۆفایتۆن trichophyton، بە تەنیا یان بەیەکەوە، بە تێچزاندن بە ٣ حەفتە جارێك بۆ ٣-٤ جار (٥٠-٧٠٪ سەرکەوتووە).

٢١- لە بەرگری سست دا و بالووکەی یاخی لە چارەسەر: 5FU + ئیمیکویمۆد، یان سیدۆفۆڤیر جێیی topical cidofovir بە چڕی ۰,٤-٣٪ یان بە تێچزاندن ٢,٥ ملگم/مل یان سیدۆفۆڤیری سیستمی بۆ ٥-١٤ رۆژ و ١-٤ حەفتە پشوودان، یان سیدۆفۆڤیر + چارەسەری تێکدەری جێی local destructive methods.

٢٢- چارەسەری سیستمی Systemic treatment:

أ) سایمیتیدین cimetidine ٣٠-٤٠ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ٣ مانگ (لە ٣٠٪ بارەکان دا بەکەڵکە).

ب) لیڤامیسۆڵ levamisole ١٥٠ ملگم/رۆژ بۆ ٢ رۆژی بەدوای یەك دا لە حەفتەیەك دا ،بە تەنیا،یان لەگەڵ سایمیتیدین.

ج) زنك بە دەم (زنك سەلفەیت) ١٠ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ٢ مانگ بەکەڵکە، ئەگەر ئاستی زنگ لە خوێن دا لە کەمترین ئاستی ئاسایی دا بێت،٦٢,٥ مایکرۆگم/١٠٠ مل (باری ئاسایی ٨٧,٨ مایکروگم/١٠٠مل).

د) ئێترێتینەیت etretinate: ١ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ٣ مانگ یان ئەسیت رێتین – بەکەڵکن.

٢٣- خەواندنی موگناتیسی hypnosis: واتا چارەسەری دەروونی، هەندێك جار بەکەڵکە.

٢٤- پێکوتە vaccin: کاری لەسەر دەکرێت.

# نەخۆشییەکانی کەڕوو و هەوێن

## Diseases resulting from Fungi & yeasts

**پێستەکەڕوو ( پێستەڕووەکی )** Dermatophytes: بریتییە لە کۆمەڵێك کەڕووی (قارچکی) fungi بە توانا بۆ لکانی گەردی بەکیراتین (قۆچەکاژ) و بەکارهێنانی کیراتینەکە وەك سەرچاوەی خۆراك و مۆڵگەبوون لە ناوی دا وەك چینی کاژی توێژ، موو، نینۆك و شانەی قۆچی ئاژەڵەکان. ئەگەر تووشبوونەکە رووکەشی بوو پێی دەڵێین ناساغی پێستەکەڕوو dermatophytosis ،بەلام کە قووڵ بوو پێی دەڵێین ناساغی پێستەقارچکی dermatomycosis.

لەوە دەچێت سەرچاوەی ئەم زیندەوەرە زیندەوەری دێرین بێت پێش جیابوونەوەی بۆ ئاژەڵ و رووەك.

**دەستنیشانکردن:**

١- پشکنین بە وردبین:

أ) **مـــوو:** موو هەڵدەکێشرێت (نەك بقرتێنرێت) و بە وردبین (هاوێنەی کەم هێز دوای رۆکردنی شلەی KOH لە سەری) یەك لە سێ شێوە یان پتر،دەبینرێت:

١) دەرەوەی موو ectothrix: لقی سپۆڕەکان لە دەرەوەی قەدی موو دان.

٢) ناو موو endothrix: لقی سپۆڕەکان لە ناو قەدی موو دان.

٣) شانەی هەنگی favic: لقی سپۆڕەکان، بە تەریبی، لە ناو قەدی موو و دەرەوەی قەد دا هەن.

ب) **پێســت:** چەند کاژێك (تویکلێك) لەناوەوە بۆ دەرەوەی لێواری دەردەکە دەکرێنرێت و لەسەر سلاید دادەنرێت و شلەی هایدرۆکسیدی پۆتاسیۆم KOH ١٠-٢٠٪ + DMSO (یەك دڵۆپە)ی لەسەر رۆدەکرێت و خزاوی داپۆشەری cover slip لەسەر دادەنرێت و لە ژێر وردبین دا،دوای ١٠ خولەك، سەیردەکرێت.

ج) **نینـــۆك:** بەشە تێکچووەکەی سەر پەڕی نینۆك،بە ئامێری کرێنەر، لێدەکرێتەوە و دوای رۆکردنی شلەی KOH بۆ ٢ کاتژمێر، ئەوسا سەیردەکرێت.

هەندێك جار کێمی ناو پیزۆکە بۆ بینینی کاندیدا وەردەگیرێت.

٢- چاندنی کەڕوو: لەتاقیگە دا دەکرێت، مژادی (ناوەندی medium) سەبۆڕۆد sabouraud بەکاردەهێنرێت و لە ١-٤ حەفتەدا مۆڵگەی کەڕووی رواو سەیر دەکرێت.

٣- ریزبەندی گەردی molecular sequencing: لە چاندن خێراترە.

٤- تیشکی وُد Wood's light: بەتایبەتی بۆ کەڕووی سەر بەکاردەهێنرێت بۆ بینینی تیشکدانەوەی مووی یان پێستی تووشبوو بە کەڕوو (تیشکدانەوەی سەوز لە کەڕووی سەر).

تا ئێستا پتر لە ۲۵۰۰۰۰ جۆری کەڕوو دۆزراوەتەوە و ژمارەیەکی کەمیان بە سێ جۆر تووشی مرۆڤ دەبن:

۱- کەڕووی خاکی Geophilic fungi: لە ناو خۆڵ دا دەژین، بە دەگمەن تووشی مرۆڤ دەبن وەك M. gypseum.

۲- کەڕووی ئاژەڵ Zoophilic fungi: تووشی ئاژەڵ دەبێت و لە ئاژەڵەوە بۆمرۆڤ دەگوازرێتەوە وەك M. canis.

۳- کەڕووی مرۆڤ Anthropophilic-fungi: تووشی مرۆڤ دەبێت و لە مرۆڤەوە بۆمرۆڤ دەگوازرێتەوە وەك E. floccosum.

سێ رەگەز لە کەڕوو تووشی مرۆڤ دەبێت:

۱- رووەکەمووی Trichophyton: تووشی پێست و موو و نینۆك دەبێت.

۲- سپۆرەگچکە Microsporum: تووشی پێست و موو دەبێت.

۳- رووەکە توێژی Epidermophyton: تووشی پێست و موو دەبێت.

کەڕوو تەنیا تووشی چینی کیراتین دەبێت و ناساغیەکە دروست دەکات بەهۆی:

۱) بەرهەمی زیندەچالاکی کەڕووەکە، ۲) ئاکامی کاردانەوەی بەرگری لەش (جۆری چوار).

## پێستە کەڕوویی Dermatophytosis

### ۱- کەڕووی سەر Tinea capitis

بریتییە لە کەڕووی پێست و مووی سەر، لەوانەیە هەر سێ رەگەزەکەی کەڕوو (جگە لە E.floccosum و T.concentricum) دروستی بکەن، زۆربەی بارەکان منالی ۳-۱٤ سالین، گواستنەوە بە هەژاری و جەنجاڵی و پیسوپۆخڵی پتر دەبێت، بەشانە و کڵاو و کاسکێت و کەلوپەلی سەر و خاولی و نوێن و دەست بەرکەوتنی سەر و قژی تووشبوو لە منالەوە بۆ منال دەگوازرێتەوە، یان لە ئاژەڵەوە وەك گا و مانگا و بزن و مەڕ و پشیلە و سەگ - تاد بۆ مرۆڤی بەرکەوتوو دەگوازرێتەوە، مووی تووشبووی فڕێدراو بۆ پتر لە ساڵێك کەڕووەکەی تێدا دەمێنێتەوە، هەروەها هەڵگری بێ سکاڵا باوە و سەرچاوەیەکی بێ دەنگە بۆ بڵاوبوونەوەی.

نیشانەکان بە پێی هۆکارەکەیە و ئەم جۆرانەی خوارەوەن:

أ) جۆری سۆنەکردوو = جۆری مرۆڤی = جۆری پەتایی

Non-inflammatory=human=epidemic-type

لە وڵاتی ئێمەدا بە تایبەتی لە لادێکان دا، لەوانەی مەڕوماڵات بەخێو دەکەن زۆر باوە . ئەم جۆرە تووشی منال دەبێت و لە منالێکەوە بۆ منالێکی تر بە تایبەتی لە چینی هەژار و

کەمدەرامەت دا دەگوێزرێتەوە، کەمتر لە سەگ و پشیلەوە،بە پێچەوانەی وڵاتانی رۆژئـاوا، بـۆ مرۆڤـ دەگوازرێتەوە، لای ئێمە لـە مەڕو بزنەوە پتر دەگوازرێتەوە . (وێنەی ٣٥٣)

هەندێك جار، لـە منالآنی قوتابخانە دا، پەتا دروست دەکات (زۆربەی منالآنی پۆلـەکە لـە یـەکتری دەیگرنەوە)، بە شێوەی پەڵـەیەکی (پارچەیەکی) کاژاوی و موو تێکشکاو لـە پێستی سەر، لـەگەڵ هەندێك خوران، دەردەچێت.مووەکان ناسك و بێ نموون، لـەوانەیە چەند پارچەیەك هـەبێت یـان کەم جار هەموو پێستی سەر بگرێتەوە.

ب) **جۆری سۆکردوو** Inflammatory type

ئەم جۆرە کەڕووەکانی ئاژەڵ و خاك پـتر دروسـتی دەکـەن و بـە شـێوەی سەلکەسـۆی کێمـی یـان کەچەڵـی دەردەکەوێت،واتا لـوویەکی بڵـی بەرزبووەی دەڵـێنەری کێمی و موو تێکشکاو و دوای چاکبوونەوە جێ زام و موو رووتانەوەی هەمیشەیی جێ دەهێڵێت. بۆگەناویە و تووشێنی دووەمی بە بەکتریاش زۆر باوە لـەگەڵ گەورەبوونی بە ئازاری لیمفەگرێ جێیەکان و لـەرز و تا و ئـازار. (وێنەی ٣٥٤)



(وێنەی ٣٥٤) کەڕووی سەر (جۆری سۆکردوو = کەچەڵی).



(وێنەی ٣٥٣) کەڕووی سەر (جۆری سۆنەکردوو).



(وێنەی ٣٥٥) کەڕووی سەر (جۆری پنتی رەش).

ج) **جـۆری خـاڵـی (پنتـی رەش)** Black dot type

هۆکـارەکـەی کـەڕووی مرۆڤـە جـۆری T. tonsurans یـان T. violaceum ، مووڕووتانەوە هەندێك جـار هەیـە و ئەگـەر هـەبوو مووەکان لـە ئاستی پێست شکاون بۆیە پنتی (خاڵی) رەش لـەسەر پێستەکە کە کۆتـایی سـەرەوەی بەشـە نەشکاوەکەیە (ئەو بەشەی لـە نـاو پێسـت دا مـاوە)

دەردەکەون، کاژیش هەیە بەڵام لەوانەیە سۆ کەم یان زۆر وەك جۆری ب هەبێت. (وێنەی ٣٥٥)

د) جۆری شانەی هەنگ Favus

زۆر دەگمەنە و لەوانەیە لە عێراق دا هەر نەمابێت،بەڵام پێش ساڵانی ١٩٦٠-١٩٧٠ هەبووە. تووشی سەر و کەمتر پێستی لەش و نینۆك دەبێت. (وێنەی ٣٥٦)



(وێنەی ٣٥٦) کەڕووی سەر (جۆری شانەی هەنگ).

لە پێستی سەردا پەڵەی ناوچاڵی concave زەردی گۆگردی قەتماغەیی لە دەوری مووی ناچەسپاوی لوولخواردوو دەردەکەون، جێ زامی پووکاوەیی جێ دەهێڵێت بە شێوەی پارچەی سپی تەنکی روونی لووس، ئەگەر تووشی پێستی لەش بوو ئەوە پەڵەی (٢ ملم – ٢سم) کوپی cup-shaped قەتماغەیی دروست دەکات کە بۆنێکی مشکی تایبەتمەندی هەیە. ئەم پەڵە کووپیە پێی دەڵێن زرێیۆکە scutula، هۆکارەکەی کەڕووی T. schoenleinii یە.

چارەسەر

١- گریزیۆفولڤین griseofulvin ١٠-٢٠ ملگم/کگم/ رۆژ بۆ منداڵ، ٥٠٠ ملگم – ١٠٠٠ ملگم بۆ باڵغ دوای خواردنی چەور بۆ باشتر هەڵمژینی، بۆ هەندێك باری بێ وەڵام بۆ چارەسەر ژەمەکە پتر دەدرێت بۆ٢٠-٢٥ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ٢-٤ مانگ یان تا ٢ حەفتە دوای نەمانی کەڕووەکە بە پشکنینی تاقیگە.

٢- فلوکۆنازۆڵ fluconazole ٦ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ٣ حەفتە یان ٨ ملگم/کگم/حەفتە بۆ٨-١٦ حەفتە.

٣- تێربینافین terbinafine ٣-٦ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ٢-٤ حەفتە، بۆ تووشبوون بە micro sporum ٤-٨ حەفتەی دەوێت.

٤- ئیتراکۆنازۆڵ itraconazole ٣-٥ ملگم/کگم/رۆژ بۆ٢-٣ حەفتە، هەندێك جار بۆ ٤-٦ حەفتە.

٥- بەکارهێنانی شامپۆی سیلینیەم-سەلفاید selenium-sulphide یان کیتۆکۆنازۆڵ ketoconazole ، بۆ ٥ خولەك حەفتەی ٣ جار، بۆ لابردنی کرێژ و کاژ و پیسی سەر.

شانه و فلّچه وکاسکێتی سەر وکلاّو بکولێنرێت. ئەگەر تووشێنی دووەمی بە بەکتریا هەبوو چارەسەری دەکەین، لە باری فرەسۆکردوو دا وەك کەچەڵی kerion بۆ کەمکردنەوەی سۆکە ژەمێکی کەم لە ستیرۆیدی سیستمی بە یەك ژەم بەکاردەهێنرێت.

### ٢- کەرووی ریش Tinea barbae

تەنیا لە نێرینەدا دوای باڵقبوون هەیە چونکە تووشی ریش دەبێت. لە لادێکان بەهۆی بەخێوکردنی مەروماڵات و وڵاخ پتر تووشی جووتیار و شوان و گاوان دەبێت، بەلاّم لە سەرتاشخانەکان، بەهۆی بەکارهێنانی گوێزان و ئامێری سەر و ریش تاشین،لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوازرێتەوە هەرچەندە ئەم بابەتە زۆر باو نییە. سێ جۆری هەیە:

أ) **جۆری سۆکردوو (کەچەڵی)** Inflammatory type: لە لایەکی ریش یان مل هەروەك کەچەڵی (kerion) سەر وایە بە شێوەی گرێیی و هەڵئاوسان و دەلاّندنی کێم و زەرداو و قەتماغە، مووەکان بێ غوو و ناسکن و بە ئاسانی دەردەهێنرێن یان هەڵوەریون. (وێنەی ٣٥٧)



(وێنەی ٣٥٧) کەرووی ریش (جۆری سۆکردوو).

ب) **جۆری رووکەشی** Superficial type: لە سەلکەسۆی بەکتریایی دەچێت، بە شێوەی سووربوونەوەی بلاّو و تەنۆچکە و پیزۆکەی دەوری مووەکان، مووەکان کپ dull و ناسکن. (وێنەی ٣٥٨)



(وێنەی ٣٥٨) کەرووی ریش (جۆری رووکەشی).

ج) **جۆری بازنەیی** Circinate type: لە کەرووی بازنەیی پێستی رووت (بێ موو) دەچێت. بە شێوەی بازنەی لێوار پەرەسەندوو بەرەو دەرەوە کە تەنۆچکەیی و پیزۆکەییە بەلاّم ناوەراستی بازنەکە کاژاویە و مووەکانی پەڕاندووە (مووەکانی نەگرتۆتەوە).

**چارەسەر**

١- گریزیۆفولڤین griseofulvin ١ گم/رۆژ بۆ ٢-٤ حەفتە یان پتر.

٢- تاشینی مووەکان، دژەکەڕووی جێیی، دژەبەکتریا هەندێك جار ئەگەرگومانی تووشێنی دووەمی بە بەکتریا هەبوو.

٣- ستیرۆیدی سەراپایی بۆ باری کەچەڵی توند بە یەك ژەم بە سمت وەك ترایئەمسینۆلۆن-ئەسیتۆناید ٤٠ ملگم لەگەڵ دژەکەڕوو.

## ٣- کەڕووی روومەت Tinea faciei

بریتییە لە کەڕووی بازنەیی ( واتا لەش) لە دەموچاو دا بەڵام چەند خاڵێکی گرنگ هەن کە ئەمانەن:

١- تووشی منالْ و "مێینە دوای باڵقبوون" دەبێت یان ئەو بەشەی رووومەت کە ریشی لێ ناڕوێت لە نێرینەی باڵق دا وەك لووت، ناوچەوان و کوڵمە.

٢- زۆربەی جار بە تیشك هەستیارە بۆیە بە هەڵە وەك نەخۆشی گورگەسوورە .L.E دەستنیشان دەکرێت.

٣- زۆر بار، بە هەڵە، بە ستیرۆیدی جێیی چارەسەرکراوە و وێنە بنەڕەتیەکەی نەخۆشیەکە دەگۆڕێت، لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوە وا باشە پشکنینی سڕینی بۆ بکرێت یان بۆ هەندێك بار نموونەی لێ وەربگیرێت.

**چارەسەر**

وەك کەڕووی لەش (بازنەیی) وایە.

## ٤- کەڕووی لەش (بازنەیی) Tinea corporis (circinata)

لای ئیمە زۆرباوە، بریتییە لە کەڕووی پێستی رووت (جگە لە سەر و ریش و دەمو چاو و دەست و پێ و لاڕان) و بە لێککەوتنی راستەوخۆ لە ئاژەڵ یان مرۆڤەوە، بەهۆی کەلوپەل یان رواندنی خۆیی auto inoculation بۆ نموونە لە کەڕووی پێ بۆ پێستی تر ،دەگوازرێتەوە. منالان لە ئاژەڵەوە (مەڕومالاّت و سەگ و پشیلە) پتر دەیگرن. جل و بەرگی داخراو، لێککەوتنی پێست بە بەشێکی تری پێست و زەبری سووك،پتر بۆ تووشبوون رێگا خۆشکەرن. (وێنەی ٣٥٩)





**(وێنەی ٣٥٩ ) کەڕووی بازنەیی.**

ئەم جۆرە کەڕووە پارچەی بازنەیی (یەك پارچە یان پتر) وشکی کاژاوی سووری کاڵی سنووردار و هەندێك جار کاڵتر لە پێست، دروست دەکات. ناوەندی پارچەکە

دەسڕێتەوە و لێوارەکەی پەرەدەستێنێت و هەندێك جار فرەکەوانەیيە یان چەند بازنەیەکی هاوچەق پێکدەهێنێت، لەوانەیە لێوارەکە تەنۆچکەیی کاژاوی یان بلۆقی بێت.

**تێبینی:** من خۆم ئەم جۆرە کەڕووەم لە نەخۆش دا بینیوە کە پتر لە ١٥ ساڵ بە نەخۆشەکەوە ماوەتەوە و ڕێژەی ٤/٥ی پێستی ڕووتی لەشی گرتۆتەوە و پێشتر دەستنیشان نەکراوە و چارەسەری هەڵەی بۆ کراوە، بەڵام بە چارەسەر بە گریزیۆفۆڵڤین بە یەك مانگ بە یەکجاری چاك بۆتەوە.

**چارەسەر**

أ) پارچەیەك یان چەند پارچەیەکی کەم و سنووردار **چارەسەری جێیی ڕۆژی ١-٢ جار بۆ٢-٤ حەفتە دەدرێتێ وەك:** سەلکۆنازۆڵ sulconazole، ئۆکسی کۆنازۆڵ oxiconazole، مایکۆنازۆڵ miconazole، کلۆترایمازۆڵ clotrimazole، ئیکۆنازۆڵ econazole، نافتیفین naftifine، کیتۆکۆنازۆڵ ketoconazole، سایکلۆپایرۆکس ئۆلامین cyclopirox olamine، تێربینافین terbinafine، بیوتینافین butenafine و تۆلنەفتەیت tolnaftate. لەوانەیە تێربینافین ڕۆژی یەك جار بۆ یەك حەفتە، چاکی بکاتەوە.

ب) بۆ باری فرە پارچەیی یان زۆر بڵاو یان سەختگەسۆیی کەرووی یان فرەسۆیی، **چارەسەری سەراپایی systemic بۆ ٢-٦ حەفتە ،دەدرێت وەك:**

١- گریزیۆفولڤین (جۆری پتر وردکراو) ultra-micronized griseofulvin ٥٠٠-١٠٠٠ ملگم/ڕۆژ، لەگەڵخواردەمەنی چەور (شیر یان ئایسکرێم) یان١٠-٢٠ ملگم/کگم/ڕۆژ بۆ مناڵ بۆ ٢-٦ حەفتە.

٢- تێربینافین ٢٥٠ ملگم/ڕۆژ یان٣-٦ ملگم/کگم/ڕۆژ بۆ منداڵ، بۆ٢حەفتە.

٣- ئیتراکۆنازۆڵ itraconazole ٢٠٠ ملگم/ڕۆژ یان ٥ملگم/کگم/ڕۆژ بۆ منداڵ، بۆ١٥ ڕۆژ.

٤- فلوکۆنازۆڵ ١٥٠ ملگم/حەفتە بۆ٤حەفتە.

**جۆرەکانی تری کەڕووی لەش**

١- **گۆشتەزوونەگمۆڵی ماجۆکی** Majocchi's granuloma: بریتییە لە سەلکۆسۆی کەڕوویی لە پێستی ڕووت بە تایبەتی لە مەچەك و لاق دا، بە شێوەی گۆشتەزوونەگمۆڵی سنووورداری خڕی بەرزبووەی قەتماغەکردووی هەڵئاوساو، هەروەك کەچەڵی سەر kerion یان کۆکوانە لەو شوێنانەی کە بە گوێزان تاشراون یان بە جلوبەرگ داخراون یان چارەسەری هەڵەی بە ستیرۆیدی جێیی بۆکراوە. چارەسەری سەراپایی پێویستە.

٢- **کەڕووی گۆڕاو** Tinea incognito: بریتییە لە دەردی کەڕووی ناڵموونەیی بەهۆی چارەسەرکردنی هەڵە، بە ستیرۆیدیی جێیی یان تاکرۆلیمۆس، دەردەکان زۆر بڵاون و بە ئاسانی دەستنیشان ناکرێن و چارەسەری سەراپایی پێویستە.

٣- جۆری تریش کە زۆر دەگمەنن،هەن.

## ٥- **کەڕووی لاڕان** Tinea cruris

بریتییە لە کەڕووی لاڕان، کۆئەندامی سێکسی، پێستی بەر، ناوگەڵ perineum و دەوری کۆم، هەر وەك کەڕووی لەش بەهۆی لێککەوتنی راستەوخۆ یان کەلوپەل دەگوازرێتەوە. بە داخستن و گەرماو وەرزی شێدار پەرەدەستێنێت و بە رواندنی خۆیی لە کەڕووی پێ بۆ لاڕان دەگوازرێتەوە، پتر لە نێرینەدا هەیە (لە باڵق دا). (وێنەی ٣٦٠)

نیشانەکانی بریتین لە: پارچەی سنووردیاری سووری کاژاوی یان بلۆقی و قەتماغەیی کە پەرەدەستێنێت و کەمێك شوێنی سەرەتایەکەی(ناوەندەکەی) دەسرێتەوە، بەم جۆرە شێوەی چەماوە لە لێوارەکەی وەردەگرێت کە تەنۆچکەیی، بلۆقی یان پیزۆکەییە و لەوانەیە لە لاڕانەوە بەرەو بەر، ناوگەڵ، کۆم یان خوارەوەی ران پەرە بستێنێت، بەلام بە دەگمەن کۆئەندامی سێکسی دەگرێتەوە.



(وێنەی ٣٦٠) کەڕووی لاڕان.

گۆڕانکارییە دووەمیەکان بریتین لە پێستەئەستوورەیی lichenification، بەهۆی زۆر خوراندن، ئاو و زلزڵە دەردان، خووسانی پێست، تووشێنی کاندیدا یان بەکتریا یان پێستەسۆی هەستیاری و وروژێن بەهۆی کرێم و مەرهەم.

دەستنیشانکردنی جیاکردنەوە differential diagnosis بریتییە لە:

١) نەخۆشی کاژۆکی(سەدەف)، ٢) چەورەبیرۆ، ٣) کاندیدا، ٤) سووربوونۆکە erythrasma، ٥) پێستەستووریێ سانای کۆنینە L.S.Ch.، ٦) نەخۆشی بلّقی خێزانی بێوەی familial benign pemphigus، ٧) نەخۆشی داریەر.

**چارەسەر**

کەمکردنەوەی تەڕی و شێ (ئارەقکردنەوە) لە لاڕان و بەکارهێنانی ژێر شەڕواڵی تەنك و نەرم و بۆدرە و بۆدرەی دژەکەڕوو بەکەڵکن.

١- چارەسەری جێی و سەراپایی وەك کەڕووی لەش بەکاردەهێنرێت.

## ٦- کەڕووی دەست و پێ Tinea of hands& feet (Tinea pedis& T.mannum)

أ) کەڕووی پێ Tinea pedis : زۆر باوە، بەهۆی پێڵاوی داخراو و گواستنەوەی بەهۆی خەڵکی گەڕۆك لە شارێکەوە بۆ شارێك یان شوێنێکی تر. لە مەلەوانگە و گەرماو و یاریگاکان پتر خەڵکی دەیگرن، لە باری فرە ئارەقکردنەوە و ناوچە گەرمەکان و هاویندا بە تایبەتی لەباری بوونی توێکاری نائاسایی anatomical abnormalities پترە. چوار جۆری هەیە:

١- جۆری نێوان پەنجەی درێژخایەن Chronic intertriginous type: لە هەموو جۆرەکان باوترە، بە شێوەی کاژکردن، سووربوونەوە یان دامالینی پێستی نێوان یان ژێر پەنجەکانی پێ بەتایبەتی سێ پەنجەکانی سەرپەڕ،دەست پێدەکات. هەندێك جار بۆ پێستی ژێر پێ بلاودەبێتەوە بەلام بەدەگمەن بۆ پشتی پێ پەرەدەستێنێت. (وێنەی ٣٦١)

داخستن و تووشێنی بەکتریایی دەبنە هۆی خووساندنی پێستەکە و خوران و بۆگەن دروستبوون (پێی وەرزشەوان athlet's foot).

٢- جۆری زێدەقۆچەکاژی درێژخایەن Chronic hyperkeratotic type: زۆربەی جار هەردوو پێ دەگرێتەوە. نیشانەکانی بریتین لە کاژی پارچەیی یان بلاو لە پێستەئەستوورەکەی ژێر پێ، لەوانەیە کەمێك سووربوونەوە و بلۆق هەبن. (وێنەی ٣٦٢)

٣- جۆری بلۆقی وبلقی Vesico-bullous type: بلۆقی پتەوی گەورەتر لە ٣ ملم یان بلۆق و بلق یان بلق لەسەر پێستە تەنکەکەی ژێر پێ و تەنیشتەکانی ژێر پێ دەردەچن، لەگەڵکەمبوون و پتربوونی گەرما و شێ چاکبوونەوە و سەرهەڵدانەوە باوە. (وێنەی ٣٦٣)



(وێنەی ٣٦١ ) کەڕووی پێ
(جۆری نێوان پەنجەی درێژخایەن).



(وێنەی ٣٦٢ ) کەڕووی پێ
(جۆری زێدە قۆچەکاژی درێژخایەن.

٤- جۆری چاڵە برینی تیژ Acute ulcerative type: ئەم جۆرە میکرۆبی کـەڕوو لـەگەڵ بەکتریا دروستی دەکـەن و بـە شێوەی پیزۆکە و بلۆق یان چاڵە برینی کێمی لـە ژێـر پـێ دا دەردەکـەوێت. خانەســـــۆ و، بۆریەلیمفەســـــۆ وگــــەورەبوونی لیمفـــەگرێکان و لەوانەیە تای لـەگەڵ دا ڕووبدات.


(وێنەی ٣٦٣) کەڕووی پێ (جۆری بلۆق و بڵقی).

لەوانەیـــە جـــۆری ســـێ و چـــوار کاردانەوەی بلۆقی Id reaction لە دەست و لاکانی پێ و پەنجەی پێدا دروست بکات.

ب) کــەڕووی دەســـت T.mannum: شـــێوەی زێـــدە قۆچـــەکاژی وەردەگرێـــت، هەرچـــەندە لـەوانەیـــە جـــۆری مانگیلـــــەیی crescentic type و کـــــاژەوەری exfoliative و بلـــــۆقی vesicular و ســــەلکە تەنۆچـکەیی و سـووربوونەوەی پشـتی دەسـت dorsal erythematous دروست بن. (وێنەی ٣٦٤)


(وێنەی ٣٦٤) کەڕووی دەست.

### چارەسەر

١- کەمکردنەوەی تەڕی و شێ بۆکەم تووشبوون گرنگە، بـەهۆی بـەکارهێنانی بـۆدرەی ئاســایی talcum یـان بـۆدرەی دژەکـەڕوو، وەك تۆلنەفتـەیت یـان ترشـی ئەندیسـیلینیك undecylenic acid. کەمکردنەوەی ئارەقی پێ بەهۆی بەکارهێنانی بـۆدرەی ئـەلۆمنیۆم کلۆرایـد هێکسـاهایدرەیت 20-25% aluminum chloride hexahydrate زۆر بەکەڵکە. بـەکارهێنانی گـۆرەوی ئارەق هەڵمژ و پێڵاوی کوناوی، زۆرباشە.

٢- چارەسەری جێیی، بۆ باری سووك وەك کەڕووی لـەش.

٣- دژەکەڕووی سەراپایی بۆ ٢-٤ حەفتە ،بۆ باری توند و بڵاو.

٤- ئەگەر تووشێنی بەکتریایی هەبوو ،دژە بەکتریا بـەکاردەهێنرێت (جێـی وەك جینتامایســین یـان سەراپایی بۆجۆری چاڵەبرینی).

تێبینی: زۆرجار هەردوو پێ و یەك دەست بە یەکەوە کەڕوویان تووش دەبێت.

## ٧- کەڕووی نینۆك Tinea unguium (Onychomycosis)

بریتییە لە تووشبوونی پلێتی نینۆك بە کەڕوو (پێستەکەڕوو) dermatophytes، ناپێستەکەڕوو nondermatophytes (وەك ئەکریمۆنیۆم acremonium ، ئەسپێرجیلەس aspergillus – تاد) یان بە کاندیدا candida، چوار جۆری هەیە:

١) کەڕووی ژێر نینۆکی سەرپەڕ Distal subungual onychomycosis (DSO):

بەتایبەتی دۆشەکەی نینۆکی سەرپەڕ و ژێر نینۆك hyponychium دەگرێتەوە و بۆ بەشی خوارەوەی پلێت دەکشێت لە پەنجەی دەست و پێ دا، گۆشەی سەرپەڕی پلێت ڕەنگی زەرد دەبێت و بۆ بەشی نزیکی پلێت ،وەك هێڵێك، پەرە دەستێنێت و ئەوسا زێدەقۆچەکاژی ژێر نینۆك دروست دەبێت و بڵاو دەبێتەوە هەتا هەموو نینۆکەکە دەگرێتەوە. نینۆك ناسك دەبێت و لە دۆشەکە جیادەبێتەوە، لەوانەیە کەڕووی پێستی ژێر پێ بە شێوەی سووربوونەوە و کاژکردن هەبێت(وێنەی ٣٦٥).



(وێنەی ٣٦٦)
کەڕووی ژێر نینۆکی نزیك.



(وێنەی ٣٦٥)
کەڕووی ژێر نینۆکی سەرپەڕ.

٢) کەڕووی ژێر نینۆکی نزیك Proximal subungual onychomycosis (PSD): پلێتی نینۆك لە نوشتاوەی نینۆکی نزیکەوە proximal nail fold تووش دەبێت و بەشێوەی لێڵبوونی پلێتی نینۆك بە ڕەنگی شیری یان سپی لە بەشی نزیکیدا دەردەچێت و بەرەو بەشی سەرپەڕ پەرەدەستێنێت تا هەموو نینۆکەکە دەگرێتەوە(وێنەی ٣٦٦).

٣) کەڕووی نینۆکی ڕووکەشی سپی White superficial onychomycosis:

بریتییە لە تووشبوونی پلێتی نینۆکی پەنجەی پێ کە تێیدا خاڵی تەباشیری سپی لە سەر یان ناو پلێتی نینۆك دەردەچێت، خاڵەکان ناسك و زبرن و لەوانەیە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات دا یەکبگرن. (وێنەی ٣٦٧)



(وێنەی ٣٦٧)
کەڕووی نینۆکی ڕووکەشی سپی.

٤) کەڕووی کاندیدا Candida onychomycosis: زۆر دەدگمەنە و بەشێکە لە

کاندیدای پێست و ناوپۆشی درێژخایەن chronic mucocutaneous candidiasis و دەبێتە هۆی تێکشکانی نینۆك و زیدەقۆچەکاژی دۆشەکەی نینۆك.

تێبینی: ئەم جۆرە کەڕووەی نینۆك باوە و ٢-١٨٪ی خەڵکی دەیگرن،بەتایبەتی لەباری گەرم و شێداردا، جگەرەکێشان و نەخۆشی بۆری خوێن بۆ تووشێن هۆکاری یاریدەدەرن.

چارەسەر

١- زۆر نەخۆش سکالایان نییە و چارەسەری ناوێت.

٢- ئەگەر نەخۆشی شەکرە و دەردە دەماری سەرپەڕی peripheral neuropathy هەبوو، باشتر وایە چارەسەری کەڕووەکەش بکرێت.

٣- چارەسەری جێیی زۆر لاوازە و ئەگەر نەتوانرا چارەسەری سەراپایی بەکاربهێنرێت یان نەخۆش خۆی چارەسەری جێیی ویست ئەوە بۆیەی lacquer ئەمۆرۆلفین amorolfine ٢-٥٪ لە نینۆك دەدرێت حەفتەی ١-٢ جار بۆ ٦ مانگ و ٤٥-٥٠٪ی بارەکان چاك دەبنەوە یان سایکلۆپایرۆکس ٨٪، بە شێوەی بۆیەی نینۆك رۆژی یەکجار بۆ ٦ مانگ و پترلە ٥٠٪ی نەخۆش کەڵك وەردەگرن. یان تایۆکۆنازۆڵ tioconazole (جێیی).

٤- چارەسەری سەراپایی Systemic therapy:

- تێربینافین terbinafine ٢٥٠ملگم/رۆژ بۆ ٦ حەفتە بۆ نینۆکی پەنجەی دەست یان ١٢ حەفتە بۆ نینۆکی پەنجەی پێ.
- ئیتراکۆنازۆڵ itraconazole ٤٠٠ ملگم بە یەك ژەم/رۆژ بۆ یەك حەفتە لە مانگێك دا ،بۆ ٢ مانگ ،بۆ نینۆکی دەست یان ٣ مانگ بۆ نینۆکی پێ. بۆ منداڵ ٥ ملگم/کگم/رۆژ.
- فلوکۆنازۆڵ fluconazole ١٥٠-٣٠٠ ملگم/حەفتە بۆ٣-١٢ مانگ.
- گریزیۆفولفین ٥٠٠-١٠٠٠ ملگم/رۆژ بۆ ٦-١٨ مانگ ،تەنیا رێژەی ٣٠٪ بەکەڵکە.
- ئیتراکۆنازۆڵ بە دەم + ئەمۆرۆلفین (بۆیە) بەکەڵکترە لە ئیتراکۆنازۆڵ بە تەنیا.

## ٨- کەڕووی کاندیدا Candidiasis

ئەم کەڕووە پتر لە ١٥٠ جۆری species هەیە ،بەلام ٧٠-٨٠٪ی بارەکان کە تووشی مرۆڤ دەبن جۆری ئەلبیکانس C. albicans دروستی دەکات کە کەڕووێکی دوو شێوەییە dimorphic ، واتا بە شێوەی چیلکەیی mycelialو چرۆیی budding هەیە. جگە لەوەش ئەم کەڕووە نە هەوێنی ناتەواوە imperfect yeast و نە کەڕووی تەواوە وەك پێستەکەڕوو، چونکە ئەسکۆسپۆڕ و تیلۆسپۆڕ ascospores & telospores دروست ناکات. کاندیدا نیشتەجێی رێگەی ریخۆڵە و گەدە، میز و زاوزێ genito urinary و پێستە، بەلام لە ژێر هەندێك باردا رۆڵی نەخۆشیهێن

pathogen لە پێست و ناوپۆش و نینۆك دا بەتایبەتی لە لۆچەکان دا بەهۆی تەڕی و گەرما و خووسان دەبینێت، ئەم بارانە بریتین لە:

١- هۆکاری میکانیکی: وەك زەبر، داخستن occlusion، تاقمی ددان، پێچانی پێست و قەڵەوی.

٢- هۆکاری خۆراکی: وەك کەمی ڤیتامینەکان، کەمخوێنی کەمئاسنی و بەدخۆراکی گشتی.

٣- گۆڕانکاری فیسیۆلۆجی: وەك ئەوپەڕی تەمەن (ساوایی و پیری)، سکپڕی و تێکەوتن.

٤- ناساغی سەراپایی: وەك کۆنیشانەی داون (مۆنگۆلی)، ناساغی کوێرەگلاند وەك نەخۆشی شەکرە، نەخۆشی کوشینگ، کەمچالاکی گلاندی ئەدرینال، کەمچالاکی ملەقۆرتەگلاند و پاراثایرۆید، بەرزی یۆریای خوێن uremia و شێرپەنجە و کەمبوونی بەرگری لەش و ئەیدز و - تاد.

٥- هۆکاری چارەکردە iatrogenic: وەك تاڵبۆری catheterization، تیشکی X، ستیرۆید، بەرگری دابەزێن وەك دەرمانی دژە شێرپەنجە و خانەکوژ، دژەبەکتریا وەك تێتراسایکلین یان فلاجیل، هێورکەرەوەکان tranquilizers، حەپلەی نەزۆکاندن، کۆڵچیسین و فەنیل بیوتازۆن.

## نەخۆشیەکانی کاندیدا

**١- تووشبوونی ناودەم** Oral candidiasis: جۆرەکانی:

١) **جۆری گەندەپەردەیی تیژ** (Thrush) Acute pseudomembranous C.: یان جۆری بۆقژە، لە هەموو جۆرەکان باوترە، هۆکارەکان بریتین لە نەخۆشی شەکرە، ستیرۆیدی سەراپایی، دژەبەکتریا، کەمخوێنی توند، شێرپەنجە و نەبوونی بەرگری خانەیی وەك ئەیدز. نیشانەکان بریتین لە پارچەی جیای سپی و لەوانەیە یەك بگرن لەسەر ناوپۆشی دەم و زمان و مەڵاشوو و پووك ،بە شێوەی گەندەپەردەیەکی ناسك ،کە لە کلۆی شیر دەچێت و ناوپۆشی ژێر پەردەکە سووری بریقەدارە. (وێنەی ٣٦٨)


وێنەی ٣٦٨) کاندیدای ناودەم (جۆری گەندە پەردەیی تیژ).

٢) **جۆری پووکاوەی تیژ** Acute atrophic C.: پتر لە دوای لاچوونی گەندەپەردەی جۆری یەکی سەرەوە لە سەر زمان دا روودەدات و گۆکانی زمان نەماون و کەمێك گەندە پەردەی لەسەرە.

٣) **جۆری پووکاوەی درێژخایەن** Chronic atrophic C.: یان جۆری ژێرتاقمی ددان(وێنەی ٣٦٩)، باوە و پتر لە


(وێنەی ٣٦٩) کاندیدای ناودەم (جۆری پووکاوەی درێژخایەن).

مێنەدا هەیە و بە شێوەی سووربوونەوەی درێژخایەن و ئاوسان لە ناوپۆشی مەلاشوو (ژێر تاقمەکە) دەردەچێت و زۆر جار گۆشە لێوەسۆی angular cheilitis لەگەڵدایە.

٤) **جۆری گۆشەلێوەسۆ** Angular cheilitis: بریتییە لە سووربوونەوە و درز و خووسان و ئازار لە گۆشەی لێوەکان دا و پتر لە لێولێسەرەوە lip lickers و پیرو بێ ددان و تاقمی ددانی نارێك و دەم کەرەوە و malocclusion کەمی ڤیتامین Bدا دەبینرێت و زۆرجار لەگەڵ جۆری سێ سەرەوە دا بە یەکەوە هەن. (وێنەی ٣٧٠)

٥) **جۆری فرەئەستوورێی درێژخایەن** Chronic hyperplastic C. یان جۆری قوتکە سپیە Candidal leukoplakia: کە بریتییە لە قوتکەی plaques پتەوی روون یان سپی کە بە ناوپۆشی دەم و زمانەوە نووساوە و بە سووربوونەوە دەوردراوە و چارەسەری ئاسان نییە، ئەم بارە لەگەڵ قوتکە سپیە و سوورەی ناو دەم و جگەرەکێشان و تاقمی ددان، پتر روودەدات. (وێنەی ٣٧١)



(وێنەی ٣٧٠) کاندیدای ناودەم
(جۆری گۆشە لێوەسۆ).



(وێنەی ٣٧١) کاندیدای ناودەم
(جۆری فرە ئەستوورێی درێژخایەن).

٦) **زمانەسۆی لەبزینەیی لەتکەر** Median rhomboid glossitis: لێرەدا گۆکانی سەر زمان لەبەشی ناوەندی دا پووکاونەوە بەڵام هەندێك جار دەردەکان بە شێوەی بەرزبوونەوە یان پلۆکە lobules لە هێڵی ناوەندی زمان دەردەچن. (وێنەی ٣٧٢)



(وێنەی ٣٧٢) کاندیدای ناودەم
(جۆری زمانەسۆی لەبزینەیی لەتکەر).

٧) **زمانی تووکنی رەش** Black hairy tongue: ئەم جۆرە بەهۆی گۆڕانی میکرۆبە نیشتەجێکان کە دەبنە هۆی پڕبوونی کەڕوو و بەکتریا روودەدات، گۆ دەزوولەییەکانی filiform papillae زمان زل دەبن و رووی ناوپۆشی زمان ناتوانێت بە شێوەی ئاسایی کاژ فڕێ بدات، هۆکارەکان بریتین لە پیس و پۆخڵی ناودەم، چارەسەر بە تیشك و بەکارهێنانی دژە ترشەکان antacids، دەردەکان لە هەمان شوێنی ،جۆری شەشی سەرەوە ،روودەدات بەڵام لەوانەیە

پشتی زمان بەگشتی بگرێتەوە، نەخۆش سکاڵای ختووکەی ناودەمی هەیە بەهۆی درێژبوونی گۆکانی زمان، چارەسەری بریتییە لەکڕاندنی ئەم بەشە ڕەشە بە فلچەی ددان و پاکوخاوێنی ناودەم. (وێنەی ٣٧٣)



(وێنەی ٣٧٣) کاندیدای ناودەم (جۆری زمانی تووکنی ڕەش).

چارەسەر

١- دژەکاندیدای جێیی: وەك دڵۆپەی نیستاتین nystatin suspension ٤٠٠,٠٠٠-٦٠٠,٠٠٠ یەکە، ڕۆژی چوار جار، لە ناودەم دا بهێڵرێتەوە تا ماوەیەك ئەوسا قووت بدرێت، یان کلۆترایمازۆڵ (کیس) clotrimazole troches (١٠ ملگم لە ناودەم دا بتوێنرێتەوە) ڕۆژی پێنج جار، یان ١-٢٪ دەرمانەمۆرە %1-2 gention violet.

٢- ئەگەر سەرهەڵدانەوە ڕوویدا چارەسەری سەراپایی systemic therapy بەکاردەهێنرێت وەك: فلوکۆنازۆڵ ٢٠٠ ملگم بە یەك ژەم یان ١٠٠ ملگم/ڕۆژ بۆ ٥-١٤ ڕۆژ. یان ئیتراکۆنازۆڵ ١٠٠-٢٠٠ ملگم/ ڕۆژ بۆ ١٤ ڕۆژ.

٣- ئەگەر هۆکاری تاقمی ددان هەبوو با شەو تاقمەکە بەکارنەهێنرێت بەڵکو بخرێتە ناو شلەی هایپۆکلۆرایت ٠,١٪ 0.1% hypochlorite solution بۆ لەناوبردنی کاندیدا.

## ٢- تووشبوونی کیلەك و زێ Candidal vulvovaginitis

کاندیدا نیشتەجێی ڕێگەی زێ یە بە بێ سکاڵا لە زۆرباردا، بەڵام پتر گەشەکردنی دەبێتە هۆی خوران و سووتانەوە و دەڵاندنێکی کەم کە ئاوی یە یان خەست و سپی و کلۆشیری یە، لێوی کیلەك ئاوساو و سوور و تەڕ و خووساوە، ملی منداڵدان سووردەبێتەوە و ئاوسان و داماڵین و بلۆقی بچووکی تێدایە، ئەم تووشێنە دوای سکپڕی و نەخۆشی شەکرە و بەکارهێنانی ئەنتی بایۆتیکی سنووڕپان broad spectrum antibiotics ڕوودەدات. (وێنەی ٣٧٤)



(وێنەی ٣٧٤) کاندیدای کیلەك و زێ.

چارەسەر

- فلوکۆنازۆڵ ١٥٠ ملگم بە یەك ژەم، ئیتراکۆنازۆڵ ٢٠٠ ملگم/ڕۆژ بۆ ٥-١٠ ڕۆژ
- چارەسەری جێیی وەك: مایکۆنازۆڵ، نیستاتین، کلۆترایمازۆڵ و تێرکۆنازۆڵ terconazole بە حەپلە یان جێڵی هەڵگرتن.

٣- **تووشبوونی لۆچەکان** Candidal intertrigo: وەك لاڕان، ناوگەڵ، ژێرباڵ، نێوان سمت، ژێر مەمك، ژێر لۆچی پێستی سکی شل، ناوك، ملی منداڵو پشتی گوێچکە. نیشانەکان بریتین لە پارچەی تەڕی سوور یان پەمەیی دەوردراو بە کاژی هەڵواسراوی خووساو، هەندێك جار پیزۆکەی بچووکی رووکەشی سپی ،نزیك پارچەکان دەردەکەون. (وێنەی ٣٧٥)





(وێنەی ٣٧٥) **کاندیدای لۆچەکان.**

٤- **کاندیدای داییبی** Diaper candidiasis: لۆچەکانی ناوچەی داییبی دەگرێتەوە و پەڵە گەورەکان بە پەڵەی بچووکتر،دەوردراون کە سووروکاژاوین.

چارەسەر جێیە.

٥- **کاندیدای نوشتاوەی نینۆك** Candidal paronychia: سۆی نوشتاوەی نینۆك، بە تایبەتی نوشتاوەی نزیك proximal nail fold لە ژنان دا زۆر باوە و دەبێتە هۆی سووربوونەوە و ئاوسان و ئازاری نوشتاوەی نینۆك و ئەستووربوون و قاوەیی بوونی پلێتەکەی، زۆربەیان بیرۆی جێگۆڕاویان هەیە، هۆکارەکان بریتین لە زۆر تەڕکردن، نەخۆشی شەکرە و بەرکەوتنی درێژخایەنی مژادە ورووژێنەکان. (وێنەی ٣٧٦)



(وێنەی ٣٧٦ ) **کاندیدای نینۆك.**



(وێنەی ٣٧٦ ) **کاندیدای نووشتاوەی نینۆك.**

چارەسەر

کەم تەڕکردن (بەکارهێنانی دەستکێش بۆ ئیشی ناوماڵ کە ئاوی تێدا بەکاردەهێنرێت) و لابردنی وورووژێن و دەستکاری کردن و کۆنتڕۆلکردنی نەخۆشی شەکرە.

١- دژە کاندیدای جێیی + ستیرۆیدی جێیی.

٢- بۆ باری توند فلوکۆنازۆل یان ئیتراکۆنازۆل.

(وێنەی ٣٧٧) کاندیدای نێوان پەنجە.

٦- **کاندیدای نێوان پەنجەکان** Erosio interdigitalis blastomycetica: بە شێوەی پارچەی هێلکەیی خووساوی سپی لە نێوان پەنجەی دەست دەردەکەوێت و دەکشێت بۆ پێستی لاکانی پەنجە ، لە چەقی دەردەکە درز و سووربوونەوە دیارە و لە دوایش دا پێستە خووساوەکە دەبێت بە کاژ و فڕێ دەدرێت، پێستە رووتاوە سوورەکە بە ئازارە. پتر لە نەخۆشی شەکرە و فرەتەڕکردن دا روودەدات، نێوان پەنجەی ٣و ٤ لە دەست دا و نێوان پەنجەی پێی ٤ و ٥ پتر دەیگرێت، بەڵام لەوانەیە نێوان پەنجەکانی تریش بیگرن، لە پێ دا پێستە خووساوە سپیەکە لە پێستی دەست ئەستوورترە و کاژە ئەستوورەکە فڕێ نادرێت و زۆر لە کەڕووی ناو پەنجەی پێ دەچێت. (وێنەی ٣٧٧)

چارەسەر

دژە کاندیدای جێیی و لابردنی هۆکارەکان وەك زۆر تەڕکردن.

٧- **کاندیدای پێست و ناوپۆشی درێژخایەن** Chronic mucocutaneous candidiasis: ئەم بارە درێژخایەنە و تووشی ناوپۆشەکان (وەك ناودەم) و نینۆك و پێست دەبێت، زۆربەیان تێکچوونی سیستمی بەرگریان هەیە یان بۆماوەیین و هەندێکیان دەردی یان ناتەواوی کوێرە گلاندەکانیان هەیە و چارەسەری دژە کەندیدای سەراپایی درێژخایەنی پێویستە(وێنەی ٣٧٨).



(وێنەی ٣٧٨) کاندیدای پێستی درێژخایەن.

٨- **کاندیدای سەراپایی** Systemic candidiasis: بەهۆی تێکچوونی بەرگری لەش کاندیدا بۆ ئەندامەکانی لەش بڵاودەبێتەوە، وەك لە باری بوونی شێرپەنجە، ئەیدز، لاوازی، ئەندام متوربەکردن و بەکارهێنانی دەرمانی بەرگری سستکەر.

## کەڕووی فرەڕەنگی Tinea versicolor

ئەم نەخۆشیە هەوێنی چەوری خواز lipophilic yeast مالاسیزیا فەرفەر Malassezia furfur دروستی دەکات، بەڵام لەوانەیە کەڕووی مالاسیزیا گلۆباسا M. globasa بەشداری لەگەڵ بکات بۆ دروست بوونی نەخۆشیەکە.

کەڕووی M. furfur بەشێکە لە نیشتەجێ ئاساییەکانی پێست، بە تایبەتی لەو شوێنانەی چەوری زۆرە وەك پشت و سنگ و دەم وچاو، - تاد، دوو شێوەییە dimorphic ،واتا شێوەی سپۆری (هەوێن) کە بێ سکاڵایە و شێوەی چیلکەیی mycelial کە مشەخۆرە و دەبێتە هۆی سکاڵا و نیشانەکانی کەڕووی فرەڕەنگی، ئەم هۆکارانەی دەبنە هۆی گۆڕانی هەوێنەکە بۆ شێوەی چیلکەیی نەخۆشیهێن بریتین لە:





(وێنەی ٣٧٩) کەڕووی فرەڕەنگی (جۆری کاژی و تەنۆچکە کاژی).

١- گەرما و شێ (هاوین و کاتی ئارەقکردنەوەی زۆر).

٢- بۆماوەیی.

٣- نەخۆشی کۆشینگ.

٤- داهێزینی بەرگری immunosuppression.

٥- بەدخۆراکی، سکپڕی و پێستی چەور.

ڕێژەی ٩٠-١٠٠٪ی خەڵکی ئەم هەوێنەی لەسەر پێست دا هەیە، بۆیە کە باری لەباری بۆ دروست بوو سەرهەڵدەداتەوە، ڕێژەی ٦٠٪ لە ساڵێك دا و ٨٠٪ لە ٢ساڵ دا سەرهەڵدەداتەوە کە هۆکارەکان (ئەوانەی سەرەوە) بێنەکایەوە.

**نیشانەکان**: سێ شێوە وەردەگرن:

١- **شێوەی تەنۆچکەکاژی** Papulosquamous (وێنەی٣٧٩) : لە هەموویان باوترە، بە تایبەتی پەڵەی کاڵ یان تۆخی کاژاوی. لە سنگ و پشت و سك و بەشی سەرەوەی پەلەکان، هەندێك جار دەموچاو و پێستی سەر و کۆئەندامی سێکسی دەگرێتەوە. کاژەکە خۆڵییە یان کەپەکییە، ڕەنگی پەڵەکان سپی، سوور، قاوەیی، پەمەیی یان ڕەش باوە، یان تێکەڵەی ئەم ڕەنگانەیە، خوران نییە یان زۆرکەمە. ئەم کەڕووە تیشکی خۆر دەپاڵێوێت و ناهێڵێت پێست بە خۆر گەنمڕەنگ بێت و بەرهەمی زیندەچالاکی metabolitis کەڕووەکە، وەك ئەزەلایك ئەسید و دایکاربۆکسیلیك ئەسید، خانەی تۆخ بریندار دەکەن و دەبنەهۆی سپی ڕەنگی پێست، بۆیە زۆر جار لە نەخۆشی بەڵەکی دەچێت و

دوای قەڵاچۆکردنی کەڕووەکەش چەند حەفتە تا چەند مانگ یان ساڵ ڕەنگە سپیەکە هەر دەمێنێتەوە.

٢- **سەلکەسۆی مالاسیزی** Malassezial folliculitis: دەردەکان لە پشت و سنگ هەندێك جار لە پەلەکان دەردەچن، خوران لە جۆری یەك باوترە و تەنۆچکەی سووری ٢-٣ ملمی یان پیزۆکە لە دەوری کونی سەلکەمووەکان دەردەچن و زۆر لە سەلکەسۆی بەکتریایی دەچێت، نەخۆشی شەکرە و بەکارهێنانی ستیرۆید ئەم جۆرە پتر دروست دەکەن . (وێنەی ٣٨٠)


(وێنەی ٣٨٠) سەلکەسۆی مالاسیزی

٣- **جۆری هەڵگەڕاوە** Inverse tinea versicolor: لە لۆچەکان دا دروست دەبێت. هەندێك جار دەموچاو و بەری دەست و پێ و پێستی سەر تووش دەبن. پتر گەنج تووشی دەبێت، هەرچەندە لەوانەیە لە مناڵیەوە تا دوای تەمەنی ناوەڕاست لە نێر و مێدا بیگرن.

**چارەسەر**

١- چونکە نەخۆشیەکی سەرهەڵداوە و درێژخایەنە، پاکوخاوێنی و خۆشۆردن بەکەڵکە.

٢- چارەسەری جێیی: وەك:

أ) شامپۆی سیلینیۆم سەلفاید ٢,٥٪ ڕۆژی یەك جار بۆ ١٠ خولەك بۆ ١-٢ حەفتە، یان شەو تا بەیانی ئەوسا بشۆرێتەوە یەك جار، مانگی یەك جار دووبارەبکرێتەوە بۆ بەرهەڵستی سەرهەڵدانەوە. مانگی یەك جار سەر بەم شامپۆیە بشۆرێت بۆ نەهێشتنی کەڕووەکە لە پێستی سەردا.

ب) سابوون یان شامپۆی زینك پایریثیون zinc pyrithione، وەك سەرەوە.

ج) شامپۆی کیتۆکۆنازۆڵ ٢٪، ڕۆژی ٥خولەك بۆ ٣ ڕۆژی دوای یەك.

د) شلەی تێربینافین ١٪ ،ڕۆژی ٢جار بۆ ٧ ڕۆژ.

هـ) شلەی تایۆکۆنازۆڵ ١٪ tioconazole یان کلۆترایمازۆڵ ١٪ clotrimazole، ڕۆژی ٢ جار بۆ ٢٨ ڕۆژ.

و) شامپۆی بیفۆنازۆڵ ١٪ bifonazole ،ڕۆژی یەك جار بۆ ٣ حەفتە.

ز) مەرهەمی وایتفیلد .whitefield's oint، ڕۆژی ٢ جار بۆ ٤ حەفتە، پرۆپیلین گلایکۆل ٥٠٪ propylene glycol لە ناو ئاودا، ڕۆژی ٢ جار بۆ٢ حەفتە، سایکلۆپایرۆکس ئۆلامین ٠,١٪ ciclopirox olamine ،ڕۆژی یەك جار بۆ ٤ حەفتە، تیکەڵەی هەنگوین + ڕۆنی زەیتون + مێوی هەنگ (١:١:١) ڕۆژی ٣جار بۆ ٤ حەفتە.

٣- چارەسەری سەراپایی: بۆ باری زۆر بلاو یان سەرهەڵداوەی زۆر یان لە بەرگری سستدا، وەك:

١- ئیتراكۆنازۆڵ ٢٠٠-٤٠٠ ملگم/رۆژ بۆ ٣-٧ رۆژ.
٢- كیتۆكۆنازۆڵ ٢٠٠ ملگم/رۆژ بۆ ٧ رۆژ یان ٤٠٠ ملگم یەك ژەم.
٣- فلوكۆنازۆڵ ٤٠٠ ملگم یەك ژەم.

**تێبینی:** مانگی یەك ژەم لەم ٣ دەرمانە دووبارە بكرێتەوە بۆ بەرهەڵستی سەرهەڵدانەوە.

## داگیركردنەكانی موشە (مشە) خۆرەكان Parasitic infestations

### نەخۆشی لیشمانیا (كوانی بەغا =زیپكەی بەغدا) حَبّة بغداد Leishmaniasis

نەخۆشی لیشمانیا مشەخۆری تاك خانە protozoaی ناو خانە intracellular لیشمانیا ترۆپیكە Leishmania tropica دروستی دەكات. رەگەزی لیشمانیا، چوار جۆر نەخۆشی دروست دەكات:

١- لیشمانیای پێست Cutaneous leishmaniasis (CL).
٢- لیشمانیای پێستی بڵاو Diffuse cutaneous leishmaniasis (DCL)
٣- لیشمانیای پێستو ناوپۆش Mucocutaneous leishmaniasis (MCL).
٤- لیشمانیای هەناوی Visceral leishmaniasis (VL).

ئەم مشەخۆرە دووشێوەی لە سووڕی ژیانی دا هەیە، لە ناو لەشی مرۆڤ دا لەناو خانەی ماكرۆفەیج دا بە شێوەی خڕ یان هێلكەیی بێقامچی amastigotes (٢-٣ مایكرۆن) هەیە، بەڵام لە ناو گەدەی مێرووی میكرۆب گوێزەر vector كە مێشی لم "فلێبوتۆماسە Phlebotomas" بە شێوەی درێژی قامچی دار promastigotes (١٠-١٥ مایكرۆن × ٢-٣ مایكرۆن) هەیە، هەر دوو شێوەكان ناوك nucleus و كاینیتۆپلاست kinetoplast یان تێدایە.

مێشی لم، فلێبۆتۆماس، كە مێرووی بچووكی وەك مێشوولەیە (درێژی ١,٥-٤ ملم) بە هۆی قەبارە بچووكەكەیەوە دەتوانێت بە ناو تەلی هێڵەكی پەنجەرە و دەرگا دا بۆ ژوورەوە تێپەڕ بێت، هەر مێینەكانیان خوێنمژن.

لە ئێراق دا هەڵگری مشەخۆرەكە ،جۆرە جرجێكە (وەك سمۆرەیە) gerbils، دوای مژینی خوێنی ئەم هەڵگرە reservoir لە لایەن مێشی لمەوە، لەگەدەی مێشەكەدا پڕ دەبێت و بەگەستنی مێشەكە بەمرۆڤ مشەخۆرەكە دەچێتە ناو لەشی مرۆڤ (پێست) و نەخۆشی لیشمانیا دروست دەبێت بە تایبەتی لەو جێگایانەی رووتن وەك دەموچاو و دەست و پێ.

**دیاركردنی نەخۆشی لیشمانیا:**

١- سەرجێیی clinical : بە تایبەتی كە نەخۆش لە ناوچەی نیشتەنی endemic area بێت.

٢- دەرهاوردەی دەرد lesional aspirate.

٣- سڕینی شانە slit tissue smear: واتا قاشکردنی بچووك بە چەقۆ لە لێواری دەردەکە و ڕەنگکردنی سڕینەکە بە ڕەنگی جیمسا Giemsa stain ،بۆ بینینی مشەخۆری بێقامچی.

٤- ڕواندنی culture مشەخۆرەکە لە ئاوی شانەی تووشبوو لەسەر مژادی(ناوەندی) NNN (NNN medium)، دوای چەند ڕۆژێك مشەخۆری قامچیدار دەڕوێت.

٥- نموونە وەرگرتن biopsy.

٦- پشکنینی لیشمانین leishmanine skin test.

٧- زانیاری زەرداوی خوێن serology، وەك ئیلایزا ELISA و IFA.

٨- کارداندەوەی زنجیرەی پۆلیمەرەیس PCR ،کە زۆر هەستیارە.

**نیشانەکان: چەند جۆرێك لە ئێراق دا هەن وەك:**

**١- جۆری تەڕ Moist type: لە دەرەوەی شارەکان دا پتر هەیە، بۆیە پێی دەوترێت جۆری شارۆچکەیی rural type، کاتی بەرهێنان دوای گەستنی مێشی لم بە مرۆڤەکە ١-٤ حەفتەیە و لە ٦ مانگ دا ساڕێژ دەبێت. بە شێوەی تەنۆچکەیەکی لەسەرخۆ پەرەسەندوو دەردەچێت و لە چەند مانگێك دا دەبێت بە گرێیۆکە nodule و لەوانەیە ببێت بە چاڵەبرین ulcer (تا ٥ سم) و بە جێی چاك دەبێتەوە، هۆکارەکەی لیشمانیا مەیجەرە L. major. (وێنەی ٣٨١)**

**٢- جۆری وشك Dry type: یان جۆری شاری urban type، کاتی بەرهێنان ٢-٨ مانگ یان پترە و ١-٢ساڵی دەوێت بۆ ساڕێژبوون. کەمتر دەبێت بە چاڵە برین و هۆکارەکەی لیشمانیا ماینەر L.minor. (وێنەی ٣٨٢)**



**(وێنەی ٣٨٢) لیشمانیا (جۆری وشك).** **(وێنەی ٣٨١) لیشمانیا (جۆری تەڕ).**

٣- جۆری سەرهەڵداوە Recidivans (Lupoid) type: بە دەگمەن دوای سارێژبوونی دەردی دایك mother lesion، لە لێواری شوێنە سارێژبووەکە چەند تەنۆچکەیەکی نەرمی سوور کە داپۆشراون بە کاژ دەردەچن و جوداگانەی characteristics جێڵی سێوی apple jelly وەك سیلی پێست (گۆشتەزوونەگمۆڵی سیلی) هەیە، ئەم تەنۆچکانە بۆ سەرپەڕ پەرەدەستێنن و بنکەکەیان سووربۆتە و و پتر لە باری جۆری شاری urban type دا روودەدات و لەوانەیە بێ چارەسەر ٢٠ – ٤٠ ساڵ بمێنێتەوە. (وێنەی ٣٨٢)

٤- جۆری هێڵی Sporotrichoid (Linear) type: واتا دەرچوونی گرێۆکەی ژێرپێست بە درێژی لیمفەبۆریەڕۆی جێی.

٥- جۆری درێژخایەنی سارێژنەبوو .Nonhealing chronic cutaneous L: هەندێك جار دەردە سەرەتاییەکە بە چاڵاکی دەمێنێتەوە و سڕین بۆ ٢٤ مانگ یان پتر پۆزەتیفە positive smears.

٦- جۆری بڵاوبووەوە Disseminated type: ئەم بارە بەهۆی بێ وزەیی لەش anergy ،واتا نەبوونی بەرگری دژی مشەخۆرەکە،روودەدات. دوای دەرچوونی دەردی سەرەتایی کە لەوانەیە گرێۆکەیی یان قوتکەیی بێت و لێیەوە دەردی هەسارەیی satellite دەردەچن و بۆ سەر هەموو رووی پێست بڵاودەبنەوە و چارەسەری زۆر گرانە و ٢٠-٤٠ ساڵ دەمێنێتەوە. (وێنەی ٣٨٤)

تێبینی: لەوانەیە لە جۆری یەك یان دوو ١-١٠٠ یان پتر دەرد دەربچن. لە شارۆچکەی کەلار و خانەقین و دەربەندیخان زۆر نەخۆشمان بۆ دێت کە تووشی لیشمانیا بوون.



(وێنەی ٣٨٣) لیشمانیا (جۆری سەرهەڵداوە).





(وێنەی ٣٨٤) لیشمانیا (جۆری بڵاوبووەوە).

چارەسەر

١- قەڵاچۆكردنی مێشی لم و لەناوبردنی ئاژەڵی هەڵگر(جرج و مشك - تاد) رێژەی تووشبوون كەمدەكاتەوە.

٢- لە شوێنی داپۆشراو یان كەم گرنگ وەك لاق و پێ،دەتوانین چارەسەری نەكەین چونكە خۆی سارێژدەبێت.

٣- بۆ یەك یان چەند دەردێكی كەم: سۆدیۆم ستیبۆگلوكۆنەیت sodium stibogluconate شلە، بە دەرزی بۆ ناودەردەكە intralesional ١-٢ مل حەفتەی یەك جار، یان بە ماسولكە، یان بۆناو خوێن ١٠ ملگم/كگم/رۆژ بۆ٢ حەفتە، یان میگلومین ئەنتیمۆنەیت meglumine antimonate بەو ژەمەی سەرەوە.

٤- ریفامپیسین rifampicin ٦٠٠ ملگم × ٢ بۆ٤ حەفتە، رێژەی ٧٤٪ چاك دەكاتەوە.

٥- پێنتەئەمیدین ئایزیثایۆنەیت pentamidine isethionate ٤ ملگم/كگم/ رۆژ نا رۆژ بە ماسولكە l.m. رێژەی ٧٣٪ چاك دەكاتەوە بە تایبەتی بۆ جۆری بڵاو.

٦- ئەلۆپیورینۆڵ allopurinol ٢٠ ملگم/كگم/رۆژ + میگلومین ئەنتیمۆنەیت ٣٠ ملگم/كگم/رۆژ بۆ٢٠ رۆژ، رێژەی ٨٠٪ چاك دەكاتەوە.

٧- فلوكۆنازۆڵ fluconazole ٢٠٠ ملگم/رۆژ بۆ ٦ حەفتە، رێژەی ٧٩٪ چاك دەكاتەوە.

٨- ئیتراكۆنازۆڵ itraconazole ٧ ملگم/كگم/رۆژ بۆ ٣ حەفتە، رێژەی ٦٠٪ چاك دەكاتەوە.

٩- نایترۆجینی شل liquid nitrogen، بەكەڵكە.

١٠- ئاوی خوێی خەست hypertonic soldium chloride بە دەرزی بۆ ناو دەردەكان intra lesional ٧-١٠ رۆژ جارێك بۆ ٢-٦ حەفتە، رێژەی ٩٦٪ چاك دەكاتەوە.

١١- گامائینتەرفیرۆن gamma interferon بە ژێر پێست (١٠٠ مایكرۆگرام/م٢ رووبەری پێست/رۆژ) بۆ ٢٨ رۆژ بۆ باری توند بەكەڵكە. یان بە دەرزی بۆ ناو دەردەكە.perilesional inj.

١٢- كرێمی ئیمیكویمۆد imiquimod ٥٪ + میگلومین ئەنتیمۆنەیت.

١٣- پارۆمۆمایسین paromomycin مەرهەم رۆژی ٢ جار بۆ٤ حەفتە.

١٤- چارەسەری ئیلێكتریكی بە تەزووی راستەوخۆ direct current electrotherapy: حەفتەی یەك جار (٥-١٥ میللیئەمپێر بۆ ١٠ خولەك) بۆ ٤-٦ حەفتە ٩٥٪ یان چاك دەكاتەوە.

١٥- لەیزەری $CO_2$ زۆر بەكەڵكە.

١٦- كرێمی كیتۆكۆنازۆڵ لە ژێر بەستن دا، گەرمكردنی جێیی، داپسۆن dapson، بەكتریم، فلاجیل.

١٧- ئەمفۆتێریسین ب amphotericin B جێیی یان سەراپایی بۆ باری توندو بڵاو.

# زەروو Leeches

لە ئاوی دەریا و رووبار و کانی و بیردا هەیە، دوای نووسانی بە پێست دژەمەیینی خوێن (هیرودین hirudin) دەرێژێت، ئەوسا خۆی بە خوێن پڕدەکات و دەئاوسێت. لەوانەیە جێگەی نووسانەکە بە پێست یان ناوپۆشی دەم بلّق، خوێنڕێژی، خوران، لیر، داڕزان یان چاڵەبرینی لێ دەرچێت و هەندێك جار دارمان anaphylaxis روودەدات. من خۆم زەرووم بینیوە لە شارۆچکەی مەرگە بە بەشی پشتەوەی گەروو pharynx نووساوە.

**چارەسەر:**

١- لابردنی زەروو بە لێدانی خوێ، ئەلکوهول، سرکە.

٢- گڕی شخارتە.

٣- کانزای گەرمکراو.

٤- دواتر بە پەستان یان قەڵەمی نەتراتی زیو $AgNO_3$ خوێن بەربوونەکە دەوەستێنرێت.

## هەڵتۆقیوە (دەردە) خشۆکی Creeping eruption (Larva migrans)

لەو کەسانەی بە پێخاوسی (پاپەتی) لە لێواری رووبار و دەریا دەڕۆن ، منالآن کە لە سەر لم یاری بکەن ، دارتاش کە لە ژێرزەمینی خانوودا کاربکات و لە باخەوانەکاندا روودەدات.

مێتۆلکەی larvae مشەخۆر ئەنکیلۆستۆما برازیلیانسی Ancylostoma braziliense یان ئەنکیلۆستۆما کەنایەنم A. caninum کە قولاپەکرمی hookworm سەگ و پشیلەن و لە پیساییەکەیان دا، لەم شوێنانەی باسمان کرد، بڵاودەبێتەوە و هێلکەکەیان دەبێت بە مێتۆلکە و دەچێتە ناو پێست وەك پێستی پێ، سمت، کۆئەندامی سێکسی و دەست. (وێنەی ٣٨٥)





**(وێنەی ٣٨٥) هەڵتۆقیوە خشۆکی.**

لە سەرەتادا خوران و تەنۆچکە لە جێگەی چوونە ناو پێست روودەدات، ناوبەناو هەستی پێوەدان و ئەوسا هێڵی باریکی پێچاوپێچ دروست دەبێت، دوای روان innoculation بە ٤ رۆژ ئەم نیشانانە دەردەکەون و هێڵەکە رۆژی ٢ سم دەکشێت، لە چەند خاڵێکی سەر هێڵەکە تەنۆچکە دەبینرێن کە جێگەی وەستانی ناوبەناوی مێتۆلکەکەیە، دوای درێژبوونی هێڵەکە سەرەتاکەی دەسڕێتەوە،

هەندێك جار تووشێنی دووەمی بە بەكتریا كێم دروست دەكات یان شوێنی خوراندن رووشان و داماڵینی تێدا دەردەكەوێت، بێ چارەسەر ۲-۸ حەفتە دەخایەنێت بەڵام هەندێك جار تا ۱ ساڵ دەمێنێتەوە.

چارەسەر

ئایڤێرمێكتین ivermectin (۲۰۰ مایكرۆگرام/كگم) یان ۱۲ ملگم بۆ دوو رۆژ.

۱- ئەلبێندازۆل albendazole ٤٠٠ ملگم/رۆژ بۆ ٤ رۆژ.

۲- مێترۆنیدازۆڵ (فلاجیل) metronidazole كرێم.

## پێوەدانی مێروو = گەستنی مێروو (پێستەسۆی تەنۆچكەیی)

## Insect bites (Papular dermatitis)

سكاڵا و نیشانەكان، لە بارێكەوە بۆبارێكی تری گەستنی مێروو جیاوازن،لەبەر بوونی ژمارەیەكی یەكجار زۆر لە جۆری مێرووەكان و جیاوازی نەریتی گەستنیان و كاردانەوەی نەخۆش بۆ جۆرەها هەستیاركەر و وروژێن لەم گەستنەدا. جۆری دەردەكان و دابەشبوونیان لە مێروویەكەوە بۆ یەكێكی تر هەر جیاوازە.

**ئامادەیی susceptibility بۆ تووشبوون چەند هۆكارێكن وەك:**

۱- جل وبەرگ: لە شوێنە گەرمەكان دا، زۆر كەس جلی وا لەبەر دەكات كە پەلەكانیان رووتن، ئەمەش بۆگەستنی مێروو كارئاسانییە، هەروەها ئەسپێ پێویستی بە جل هەیە بۆ ئەوەی لە بەشی ناوەوەی جێ دروومانەكان دا بژی و ئەوسا بچێتە سەر پێست.

۲- پیشە: كرێكاری دارستان پتر تووكی هەندێك مێرووی بەردەكەوێت و لیر دروست دەكات.

۳- بوونی ئاژەڵی ماڵی، لەوانەیە مێرووی ئاژەڵەكە خاوەنەكەی بگەزێت.

٤- جەنجاڵی لەماڵ دا بۆگواستنەوەی گەڕی و ئەسپێ هۆكارە، خانوو و ناوماڵی كۆن بۆ بوونی مێشوولەی سەرجێ bedbugs هۆكارن، جاڵجاڵۆكە و دووپشك نیشتەجێی گاراج و دەری ماڵ و تەختەی كۆمەڵكراون.

٥- باری خۆراكی و هۆرمۆن و بەرگری كەسەكە، رۆڵیان هەیە.

٦- هۆكارەكان كە مێروو بەرەو پێست رادەكێشن بریتین لەگەرمی پێست، دووەم ئۆكسیدی كاربۆن لە هەناسەدانەوەدا، هەواجووڵان (با) و لەرینەوەی لەش (راكێشە بۆ كێچ). ئارەق مژادی مێشوولە راكێشی تێدایە، بەكتریای نیشتەجێی سەر پێست مژادی مێشوولەراكێش بەرهەم دێنێت، هەروەها بۆنی پێست كە لە كەسێك بۆكەسێكی تر جیاوزە راكێشەری مێرووە.

## ڕێگاکانی دەرد دروستبوون بە مێروو

- زەبری میکانیکی Mechanical trauma: **دووجۆرن:**

أ) کونکردنی پێست بەهۆی خۆرەی خوێن blood feeders، **واتا بەشـەکانی دەم دەخرێنـە نـاو پێست بۆ ناو دەزوولە، بۆ خوێن مژین،وەك ئەسپێ و مێشوولە.**

ب) دڕاندنی پێست lacerations، **بەهۆی خۆرەی خـوێنی بـەربوو، دوای دڕانـدنی پێسـت، وەك هەندێك جۆری مێش (تسی تسی).**

٢- مژادی ورووژێن و خانەکوژ خستنە ناو پێست: **هەندێك جار لیکی مێرووەکـە مـژادی چـالاکی کیمیکی تێدایە ،کە کاردانەوەی جێیی یان سەراپایی دەهێنێتـە کایـەوە، وەك هیالۆریدینـەیز، پرۆتیـەز، پیپتایدەیز، فۆسفۆلایپەیز، کینین، دەردەری هیستامین، پێنج هایدرۆکسی تریپتامین و ئەسیتایڵ کۆڵین.**

٣- مژادی هەستیارکەر خستنە ناو پێست: **واتا دژە ژیندەری تێدایە و دژەتەن دژی دروست دەبێـت و کاردانەوەی بەرگری روودەدات.**

**دوای دووبارەبوونەوەی گەستنی مێروو بۆماوەیەك، ئەم بارە روودەدات:**

**دوای گەسـتن لـیری کتـوپڕ، دوای ماویـەکی تـر گەسـتنەکە کاردانـەوەی درەنـگ (دوای ٢٤کاتـژمێر) بـە شـێوەی تەنۆچـکە دروسـت دەکـات، دوای ماوەیـەکی تـر گەسـتنەکە کاردانـەوە درەنگەکەی نامێنێت و نەخۆشەکە بەرگریکەرە (خاراوە) immun.**

**هەندێك نەخۆش کاردانەوەی سـەراپایی تونـد لـە گەسـتنی هـەنگ و زەردەواڵـە و زەردەزیـرە دروست دەکات. باری بەرگری نەخۆش گرنگە، بۆ نموونـە دابـەزینی بـەرگری دەبێتـە هـۆی گـەڕی قەتماغەیی crusted scabies.**

٤- تووشێنی بەکتریایی دووەمی: **لە سەرەتاوە یان بەهۆی خوراندن و بریندارکردنی پێست.**

٥- چوونە ناو شانە: **بۆ نموونە نەخۆشی شانەمێتۆلکەیی myiasis،واتا مێتۆلکە چوون بۆناو شانە.**

٦- کاردانەوەی لێککەوتن: **لێککەوتنی پێست بۆ دەردانی secretion مێروو یان لەشی زیندوو یان مردووی مێروو>لەوانەیە کاردانەوەی لێککەوتنی ورووژێن یان هەستیاری، دروست بکات.**

٧- کاردانەوە بۆ بەشەکانی دەمی مێرووی بـەجێماو: **تەنۆچـکە وگرێیۆکـەی گۆشـتەزوونەگمۆڵەیی بەردەوام ،بەهۆی مانەوەی ئەم بەشانەی دەم mouth parts لە ناو پێست دا روودەدەن، بۆنموونە هی قرنوو.**

٩- گواستنەوەی نەخۆشی: **بۆ نموونە مەلاریا، لیشمانیا و تایفەس بەهۆی مێروو دەگوازرێنەوە.**

## نیشانەکان

باوترینیان لیری تەنۆچکەییە papular urticaria: لە سەرەتادا تەنۆچکەی لیری بەخوروو لە شوێنی گەستنەکە bite دا دەردەچێت و دواتر دەبێت بە تەنۆچکەیەکی پتەوی بەخوروو (کە چەند رۆژ دەمێنێتەوە) ، لیر یان تەنۆچکە کە لەوانەیە ناوکێکی خوێنڕێژی ناوەندی هەبێت و هەندێك جار بلۆقێکی بچووك لەسەر تەنۆچکەکەیە. دەردەکان زۆر جار بە کۆمەڵن و ناو بەناو کۆمەڵی نوێ دەردەچن.



(وێنەی ٣٨٦) پێستەسۆی تەنۆچکەیی.

ژمارە و دابەشبوونی دەردەکان بەپێی جۆری بەرکەوتنەکە و نەریتی (خووی) مێروویی بەرپرس دەگۆڕێن، گەستنی نوێ لە لایەن هەمان مێروو دەبێتە هۆی دووبارە سەرهەڵدانەوەی گەستنە کۆنەکانیش کە نەسڕاونەتەوە. (وێنەی ٣٨٦)

لە لاقەکان دا دەردی بلّقی و هەندێك جار شوێنی تری لەشیش بەتایبەتی لە منداڵ دا باوە. خوران و درووژان هەن و خوراندن سۆکە پتر دەکات و لەوانەیە گۆڕانکاری بیرۆیی دروست بکات. ئەگەر ژمارەی گەستنەکان زۆر بن یان کاردانەوە جێیەکە توند بێت ئەوە تا و لاوازی روودەدات.

تووشێنی دوومی بە بەکتریا ماکێکی باوە ،وەك ئاگرە، سەلکەسۆ، خانەسۆ یان لیمفەبۆریەسۆ. دارمانی سەراپایی anaphylactic shock دەگمەنە جگە لە باری پێوەدانی زەردەواڵە و هەنگ.

لەوانەیە کاردانەوەی گەستنەکە بۆچەند مانگێك بەردەوام بێت بەتایبەتی لە باری مانەوەی بەشەکانی دەمی قرنوو لە پێست دا.

سەرچاوەی گەستن هەندێك جار مێرووی باخە لە ماڵ دا یان لە دەشت و سەیرانگاکان دا، یان ئەو خانوانەی کە لە کۆنکرێت دروست نەکراون، هەندێك جاری تریش لە ئاژەل و باڵندەی ماڵی دا بۆ مرۆڤ دێت، کێچ لە ماڵ دا زۆر کەم بۆتەوە، هەندێك جاری تریش سەرچاوەکە نادۆزرێتەوە. زۆربەی جار لە ساوایییەوە ئەم دەردانە دەردەچن و لە چەند ساڵێك دا بەرگری دروست دەبێت و گەستنەکان گرنگیان نامێنێت، لەوانەیە یەك منداڵ لە خێزانێك دا بۆ گەستنی مێروو هەستیار بێت و ئەندامانی تری خێزانەکە بێ سکالا بن.

زۆربەی دەردەکان لە پەلەکان و ناوقەد و دەم وچاو دەردەچن (ئەوشوێنانەی مێروو دەیگاتێ)، ئەگەر نەخۆشەکە بۆ ژینکەیەکی تر بچێت زۆر جار دەردەکان نامێنن.

**چارەسەر**

١- چارەسەری جێیی وەك شلەی کالامین، مەرهەمی هایدرۆکۆرتیزۆن، دژەخوران و چارەسەری ماکەکان ئەگەر هەبوون.

٢- داپۆشینی زۆربەی لەش بە جل و بەرگی لەبار بۆکەمکردنەوەی ئەگەری گەستن.

٣- ئەو شوێنانەی گومانی سەرچاوەی مێرووی هەیە با نەخۆش جێ گۆڕکێی تێدابکات.

٤- بەکارهێنانی مێروو دوورخەرەوە insect repellents، وەك دیت DEET بە تایبەتی بۆ مێرووی مێشوولە، کێچ، مێش و قرنوو، بۆ منالّ چری ١٠٪ و بۆ بالّغ ١٠-٣٠٪ زۆر بەکەڵکە، یان سیترۆنێلّا citronella کە رووەکییە و بۆ ماوەیەکی کەمتر چالاکە.

٥- سپرای پێرمیثرین permethrin spray ،کە مێرووکوژی لێککەوتنە بۆ جلوبەرگ و رایەخ و چادر و - تاد بەکەڵکە.

٦- بەکارهێنانی پەردە و تەلی هێڵەك، بەکەڵکن.

٧- مێرووکوژ، بەکاردەهێنرێت بۆ لەناوبردنی سەرچاوەی مێرووەکان.

## مێشوولەی سەرجێ Bed bugs

ئەم مێشوولەیە ٤-٥ ملم درێژە و لەشی پان و هێلکەییە، باڵی نییە، بەشەکانی دەمی دەرزیلەییە بۆ خوێنمژین، مێیەکەی هێلکە سپییەکانی لە درزی زەوی و دیواردا یان رایەخ و سیسەم و کانتۆری ماڵدا دادەنێت، هەر مێینەیەك لە ژیانی دا ٣٠٠ هێلکە دادەنێت کە دوای ١٠ رۆژ دەبن بە مێتۆلکە و لە ٦ حەفتەی تریش دا دەبن بە مێشوولەی سەرجێی تەواو، شەوانە پێش بەرەبەیان خوێن دەمژێت بەڵام هەندێك جار بە رۆژیش. (وێنەی ٣٨٧)



(وێنەی ٣٨٧) مێشوولەی سەرجێ.

پتر مشەخۆری باڵندە و شیردەرەکانە وەك شەمشەمە کوێرە، بەڵام لە مرۆڤیشدا مشەخۆرە. بۆ (٣-١٢) خولەك خوێندەمژێت و بێ خۆراك تا ١ساڵ دەتوانێت بژێت.

گەستنی ئەم مێشوولەیە بێئازارە، دوای کاردانەوە (٢٤-٤٨ کاتژمێر) یان گەستنی جارانی داهاتوو و پتر لە دەم وچاو و پەلەکان بە شێوەی تەنۆچکەی خوێنرێژی یان تەنۆچکە و لیر،کە ناوەڕاستەکەی ناوکێکی خوێنرێژییە haemorhagic puncta، دەردەکان دروست دەکات، بە دەگمەن بلّق دروست دەبێت.

## شانەمێتۆلکەیی Myiasis

بریتییە لە داگیرکردنی infestation شانەی لەشی مرۆڤ و ئاژەڵ بە مێتۆلکەی larvae مێرووی جووت باڵی dipteria.

نموونەی مێرووەکان وەك: مێشی ناوماڵ، مێشی بچووکی ناوماڵ، مێشی ئەسپ و مێشی کونەلووتی مەر و بزن، - تاد.

**نیشانەکان دوو شێوەن:**

١- شێوەی کوانی Furuncular form: دەردی وەك کوان boil لە چەند ڕۆژێك دا دەردەچێت و ناوکی ناوەندی central punctum هەیە(وێنەی ٣٨٨).

کوانەکە زەرداو و خوێن دەدەڵێنێت. بەشی دواوەی مێتۆلکەکە لە ناوکەکە دا دیارە و نەخۆش زۆر جار هەست بە جووڵەی دەکات، دەردەکە زۆر بە ئازارە و کاردانەوە سۆییەکەی دەوری ،لیمفە بۆریە سۆ و لیمفەگرێ سۆی جێیی، لەگەڵدایە، دوای دەرهێنانی مێتۆلکەکە دەردەکە خێرا سارێژدەبێت. (وێنەی ٣٨٩)

٢- هەڵتۆقیوە خشۆکی Creeping Eruption: باسمانکرد.

نەخۆشی شانە مێتۆلکەیی لە برینی لەش دا ڕوودەدات، چ برینی زەبری یان برینی فەرامۆشکراو بێت بە تایبەتی لە شوێنە ڕووتەکان وەك سەر و دەموچاو و دەست و پێ - تاد .



أ) دوومەڵ کە مێتۆلکەی مێرووی تێدایە.



ب) مێتۆلکەی لابراو.

(وێنەی ٣٨٩) شانەمێتۆلکەیی













(وێنەی ٣٨٨) شانە مێتۆلکەیی.

**چارەسەر**

١- بەکارهێنانی فشاری پتەو لە دەوری دەردەکە و هەندێك جار ناوکەکە بە نەشتەرگەری گەورەتر دەکرێت و مێتۆلکەکە فڕێ دەدرێت.

٢- بەکارهێنانی زەیتی کانزایی mineral oil، ڤازیلین یان کەرە بۆ بەربەستکردنی کونی لووتی هەناسەدانی مێتۆلکەکە و فڕێدانی بۆ دەرەوەی شانەکە (بە گرتنی ناوکە ناوەندیەکەی دەردەکە).

٣- دەرهێنانی مێتۆلکەکە بە ئامێری گیرە forceps ،دوای گەورەکردنی ناوکەکە.

٤- سڕکردنی دەردەکە بە زایلۆکاین بۆ ژێر کوانەکە، زۆرجار دەبێتە هۆی فڕێدانی مێتۆلکەکە.

٥- بۆ هەڵتۆقیوە خشۆکی، بە دەرزی مێتۆلکەکە فڕێ دەدرێت.

## ئەسپێ Pediculosis

سێ جۆر ئەسپێ تووشی مرۆڤ دەبن:

١- **ئەسپێی سەر** Head Louse (Pediculosis capitis): بریتییە لە مێروویەکی (١-٤ ملمی) درێژبووەوەی نەرمی پانبووەوەی خوێنمژی بێ باڵ کە شەش قاچی چنگداری هەیە بۆ گرتنی قەدی موو یان دەزووی جلوبەرگ. ئەسپێ خۆراك و زاوزێ کردنی لەسەر لەشی مرۆڤە و هێلکەکانی بە مژادی چیمەنتۆیی بە قەدی مووەوە دەنووسێنێت. ماوەی ژیانی ٤٠ رۆژە، مێیەی ئەسپێ نزیکەی ٣٠٠ هێلکە دادەنێت (رۆژی ٧-١٠ هێلکە)، هێلکەکان لە نزیك پێستی سەر بە قەدی مووەوە دەنووسێنێت، هێلکەکان رەنگی گۆشتییان هەیە و شێوەیان هێلکەییە، لە ٨ رۆژدا مێتۆلکە لە هێلکەکە دێتە دەرێ و قاوغی هێلکەکە"واتا رشکەکە" سپی دەنوێنێت و ئاشکراتر لە قەدی مووەکان دا دیاردەبێت(وێنەی ٣٩٠ أ)، دوای ١٠ رۆژی تر مێتۆلکەکان دەبن بە ئەسپێی تەواو(وێنەی ٣٩٠ب).


(وێنەی ٣٩٠ أ ) رشك و ئەسپێی سەر


(وێنەی ٣٩٠ ب) ئەسپێی سەر.

ئەسپێی سەر زۆر باوە،بە تایبەتی لە کۆمەڵگای هەژار و پیسوپۆخڵ دا یان لەو شوێنانەی کە جەنجاڵی تێدایە وەك قوتابخانەی سەرەتایی - تاد.

زۆربەی باری ئەسپێی سەر بەهۆی لێککەوتنی راستەوخۆی سەر بۆ سەر، کەلوپەلی سەر وەك کڵاو و سەرپۆش و تۆقە و قردێلە و شانە - تاد دەگوازرێتەوە، زۆرجار چەند ئەندامێکی خێزانەکە تووشیان دەبێت، قژی درێژ مەرج نییە بۆ پتر تووشبوونی بە ئەسپێ.

نیشانەکان: گەستنی ئەسپێ بێ ئازارە، بەڵام بەهۆی فرەهەستیاری بۆ لیکی ئەسپێ، یان بەهۆی مـژادی دژی خوێن مەینی لیکی ئەسپێکە لەکاتی خوێن مژیندا، پێست دەردی سۆیی بە شێوەی لیر یان پەڵە یان تەنۆچکە، چەند کاتژمێرێك تا چەند رۆژێك دوای گەستنەکە، تووش دەبێت. پێستی سەر دەخورێـت و جێخوران و تووشێنی دووەمی بە بەکتریا و لیمفەگرێسۆ و کەم خەوی و پێڵووپۆشەسـۆ روودەدەن، تەنۆچکەی بەخوروو لە پێستی پشتی مل و هەندێك جار هـەڵتۆقیوی تەنۆچـکەیی بـەخورووی گشـتی روودەدەن.

رشکەکان (قاوغی هێلکەی زیندوو یان بۆش) پتر لـە مووی پێستی سـەری سـەروی گوێچـکە و پشتی سەر دەبینرێن، بەڵام لـە تووشبوونی توندا ئەسپێی پێگەیشتووی زیندوو و رشکەکان بە ئاشـکرایی دیارن.

رشك بە توندی بە قەدی مووەکانەوە نووساوە و بە ئاسـانی ناجوڵێنرێـت، بـەڵام کرێشـی سـەر بەئاسانی دەجوڵێنرێت.

چارەسەر

١- پێرمیثرین ١٪ کرێم permethrin 1% (Nix): لە سەرەتادا سەر دەشۆرێت بە شامپۆو باش وشك دەکرێتەوە ،ئەوسا کرێمی پێرمیثـریـن لـە قـژی سـەر دەدرێـت بـۆ ١٠-٢٠ خولـەك و دەشـۆرێتەوە و بەشـانەی ددان ورد رشـکەکان دەردەهێـنرێن، دوای ٧-١٠ رۆژ دووبـارە دەکرێتەوە.

٢- پـایریثـریـن pyrethrin + پیپرۆنـیڵ بیوتۆکسـاید piperonyl butoxide (RID) وەك سەرەوە بەکاردەهێنرێت.

٣- شلەی مالاثیون ٠,٥٪ malathion 0.5% lotion بـۆ ٨-١٢ کاتـژمێر، رێـژەی ١٠٠٪ چالاکە و دوای ٧-١٠ رۆژ دووبارە بکرێتەوە.

٤- لیندەین (گاما بەنزین هێکساکلۆراید) ١٪ شـامپۆ (lindane (℘ benzene hexachloride 1% کەڵکی کەمە و هەندێك جار ژەهراویە.

٥- کارباریل carbaryl + مالاثایۆن، زۆر بەکەڵکە.

٦- ئایڤێرمێکتین ivermectin ،بە دەم بە ژەمی ٢٠٠ مایکرۆگرام/کگم یەك جار.

٧- کۆترایمۆکسـازۆڵ cotrimoxazole رۆژی ٢ خەپلـە (١×٢) بـۆ ٣ رۆژ، دوای ١٠ رۆژ دووبارە بکرێتەوە.

٨- شلەی کرۆتامیتۆن ١٠٪ crotamiton lotion 10% جێیی.

٩- ڤازیلین (جێیی) شەو تا بەیانی، بۆ ٧ رۆژ.

١٠- مالاثیون + کۆترایمۆکسازۆڵ.

٢- **ئەسپێی لەش** (Body louse) Pediculosis corporis شێوەی وەك ئەسپێی سەرە بەڵام ٣٠٪ گەورەترە، لەگەڵ ئەسپێی سەر دەتوانێت زاوزێ بکات. پتر لە ١ مانگ بێ خوێن مژین دەژێت، بەڵام ئەسپێی سەر لە دەرەوەی سەردا تەنیا ١-٢ رۆژ دەژێت. (وێنەی ٣٩١ أ)



**(وێنەی ٣٩١) ئەسپێی لەش: ا) ئەسپێی لەش. (ب) نیشانەکان لە پشتدا. وێنەی ٣٩١) ئەسپێی لەش:**

ئەسپێی لەش نەخۆشی هەژار و تەنیاکان و بێ ماڵ و شوێنە جەنجاڵەکانی کەم کارگوزارییە و بەهۆی رایەخ و نوێن و جلوبەرگی بەرکەوتوو دەگوازرێتەوە.

**نیشانەکان**: چونکە ئەسپێکە و هێلکەکان لە ناو جل و بەرگ دان (بە تایبەتی لۆچی جل و شوێنی تەقەڵی دروومانەکان)، ئەسپێ لەسەر پێست دا نابینرێت.

پتر بە شەو لە جلەکان بۆ سەر پێست دادەبەزێت وخوێن دەمژێت، ئەمەش دەبێتە هۆی خورانی گشتی پێست لەگەڵ لیر و پەڵە و پێستەستووری و سووربوونەوە. ئاگرە و کوان بەهۆی تووشێنی دووەمی بە بەکتریا باون (وێنەی ٣٩١ ب).

ئەسپێی لەش گوێزەری vectors میکرۆبی تای سەرهەڵداوە relapsing fever، تای سەنگەر trench fever و تایفەسی پەتایی epidemic typhus یە.

**چارەسەر**

١- فڕێدانی جل وبەرگی نەخۆش یان ئوتووکردنی جل وبەرگ و رایەخ و نوێنەکان یان کوڵاندن یان.

٢- سپرای پێرمیثرین یان ١٪ مالاثیون (بۆدرە) بۆ جلەکان.

٣- کرێمی پێرمیثرین ٥٪، لە ملەوە تا پەنجەپێ بۆ ٨-١٠ کاتژمێر، لە لەش بدرێت ئەوسا بشۆرێتەوە.

٣- **ئەسپێی بەر** (Crub louse) Pediculosis pubis: لەشی ئەم جۆرە لە دوو جۆرەکەی تر خڕترە، چنگی دوو قاچی پێشەوەی بچووکن(وێنەی ٣٩٢ ب) ، بەڵام لە چوارقاچی دواوەدا گەورەترن بۆ گرتنی قەدی مووە بڵاوەکانی بەر و برۆ و برژانگ و شوێنەکانی تر کە موەکانی کورت و بڵاون. رۆژی تا ١٠ سم دەتوانێت بڕوات، بەڵام ئەسپێی لەش دەتوانێت ٢٣ سم/ لە١خولەك دا بڕوات.

هێلکەکانی قاوەیی کاڵن و بە قەدی مووەکان "بە مژادی چیمەنتۆیی" دەلکێنرێن، مووی سەر زۆر چڕە و ناتوانێت تێیدا بێت "جگە لە لێوارەکانی"، بەڵام لە مووەکانی ژێرباڵ و برژانگ و برۆ و بەر و ریش و قەد و پەلەکان دەمۆڵگێت. بە رۆژ بێ جووڵەیە ،بەڵام بە شەو کاتی خەوتن چالاك دەبێت و بە بەشەکانی دەمی لە بۆریەخوێنەکان، خوێن دەمژێت و نەخۆشی دروست دەکات.

زۆربەی بارەکان بە لێککەوتنی سێکسی دەگوازرێنەوە، بەڵام هەندێك جار بە تایبەتی لە منداڵ دا، لە باوك و دایکەوە بە لێککەوتنی نزیك بۆ منالەکە دەگوازرێنەوە.


(وێنەی ۳۹۳) ئەسپێی بەر لە برژانگ دا.


(وێنەی ۳۹۲) ئەسپێی بەر:
ب) ئەسپێی بەر.


(وێنەی ۳۹۲) ئەسپێی بەر:
أ) رشك و ئەسپێی بەر.

**نیشانەکان**: خوران،بە تایبەتی ئێواران و شەو،سکاڵای سەرەکی یە، بە تێڕوانینی ورد ئەسپێکان کە خۆیان، لە نزیك پێستەوە، بە مووەکانی بەر و هەندێك جار قەد و ران و – تاد هەڵواسیوە و هێلکەکانیان بە قەدی مووەکانەوە دەبینرێن، هەندێك جار پیسایی ئەسپێکان وەك خاڵی گۆشتی لەسەر پێست و مووەکان دیارن و دەرپێی نەخۆش خاڵی خوێنی گۆڕاوی، پێوە دیارە(وێنەی ۳۹۲ أ).

لەوانەیە مووی قەد و برۆ و برژانگ(وێنەی ۳۹۳) و سمێڵ و ریش و ران و لێواری قژی سەر داگیرکرابن. پەڵەی شینی خۆڵەمێشی maculae caeruleae لە پێست دا و تووشێنی دووەمی بە بەکتریا و خوراندن و تا و لیمفەگرێ‌سۆ هەندێك جار، هەن.

**چارەسەر**

١–نەخۆش و برادەرەکەی کە پەیوەندی سێکسیان هەیە، دەبێت چارەسەر بکرێن بەڵام ئەندامانی تری خێزان پێویست ناکات.

٢–جلوبەرگ پاکژ بکرێت بە ئوتووی گەرم یان کوڵان و جلی نوێ بەکاربهێنرێت.

٣–لە ملەوە تا پێ چارەسەر دەکرێت ئەگەرچیش هەر پێستی بەر تووش بوو بێت.

٤–رید RID (وەك ئەسپێی سەر) بێ کاڵکردنەوە undiluted، لە ملەوە تا پەنجەی پێ بۆ ١٠–٢٠ خولەك لە لەش دەدرێت و ئەوسا دەشۆرێتەوە و دوای ٧–١٠ رۆژ دووبارە دەکرێتەوە.

٥- شامپۆی لیندەین lindane بۆ ٥ خولەك، دوای ٧-١٠ رۆژ دووبارە بکرێتەوە.

٦- کارباریل، پێرمیثرین، مالاثیون وەك ئەسپێی سەر.

٧- چارەسەری برژانگ:

١) ڤازیلین رۆژی ٢ جار بۆ ٨ رۆژ، ئەوسا رشکەکان بە گیرە دەربهێنرێن.

٢) ١٪ مەرهەمی مالاثیۆن، ١٪ مەرهەمی لیندەین یان ٠,٢٥٪ مەرهەمی فایزۆستیگمین physostigmine 0.25%.

## گەڕی Scabies

مشەخۆری گەڕی سارکوپتیس سکێبی Sarcoptes scabiei، لەشی هێلکەیی پانبووەوەی هەیە، قەبارەی مێینەی پێگەیشتوو adult female ٠,٤ ملم ×٠,٣ ملم و نێرینەکە ٠,٢ ملم ×٠,١٥ ملم دەبێت. لەش سپی کرێمییە و هێڵی چاڵی پانی تێدایە و پشتی مشەخۆرەکە دڕکییە، چوار جووت قاچی کورتی هەیە. جووتبوونی نێر و مێ لە ناو تونێڵێکی بچووکی پێست ،کە مێینە دروستی کردووە، روودەدات. دوای جووتبوون مێینە تونێڵەکە گەورەتر و قوڵتر دەکات و هێلکەکان و پیساییەکەی دوای خۆی فڕێ دەداتە ناو تونێڵەکە، رۆژی ٢-٣ ملم تونێڵەکە درێژتر دەکات، مێینە ٤-٦ حەفتە دەژێت و ٤٠-٥٠ هێلکە دادەنێت و لە ناو تونێڵەکەدا دەمرێت. دوای ٣-٤ رۆژ مێتۆلکەی شەش قاچی لە هێلکەکان دێنە دەرێ و بنمیچی سەرووی خۆی دەبڕێت بۆ سەر پێست و گیرفانی بچووك لە بەشی سەرەوەی پێست دووبارە دروست دەکات و تێیدا پێدەگات، ئەوسا نێر و مێ جووت دەبن و سوورێکی تر دەست پێدەکاتەوە.





(وێنەی ٣٩٤) مشەخۆری گەڕی (بە وردبینی ئەلیکترۆنی).

نەخۆشی گەڕی لە هەمووجیهان دا هەیە و لەکاتی جەنگ دا پەتاییە و لە شوێنی جەنجاڵ و قوتابخانە و بەشی ناوخۆیی قوتابیان و میوانخانە و بەندیخانەکان دا زۆرە و لە ئەندامی خێزان بۆ ئەندامەکانی تر و برادەری نزیك و کارمەندی نزیك دەگوازرێتەوە، لە کوردستان دا زۆر باوە و زۆر بار بەرهەڵستی لە چارەسەر دەکات (وێنەی ٣٩٤).

کاتی بەرهاتن ٢-٤ حەفتەیە، نیشانەکان بەپێی تەمەن و باری تەندروستی و بوونی نەخۆشی تر و باری بەرگری لەش و باری کۆمەڵایەتی و پێشتر تووشبوون دەگۆڕێن.

گواستنەوە بەهۆی نزیك بەیەکەوە ژیان و لێککەتنی نزیك و درێژخایەن و جل وبەرگ و کەل وپەلی ناوماڵ وەك نوێن و رایەخ و جووتبوونی سێکسی، روودەدات. منداڵ لە دایکەوە دەیگرێتەوە، بۆ نموونە لە تەوقەکردن و دەست لەناو دەستی درێژخایەن دەگوێزرێتەوە.

**نیشـــانەکان**: خورانی لەش گرنگترین ســکاڵای نەخۆشــە،بە تایبەتی لە شەو و کاتی پشــوودانداا، دوای ٣-٤ حەفتە لە تووشبوون ئەم خورانە روودەدات و لەگەڵی دا تەنۆچکەی سـۆرکردووی بـڵاو دەردەچـن، تووشبوونەوە بە گەڕی دوای چاکبوونەوە دەبێتە هۆی خورانی کتوپر هەر لە سەرەتادا.

دەردی نموونەیی pathognomonic-lesion بریتییە لە قـۆرت (کەنـدەك) burrows ،کـە بـە شێوەی دەردی کەم بەرزبووەوە و قاوەیی و پێچاوپێچ دەردەچێت و سەرەتاکەی کەم کاژییە و کۆتاییەکـەی بلۆقی بچووکە (نزیك مێینەکەیە)، لەوانەیە کەم یان زۆر لەم قۆرتانە هەبن لـە مەچـەك و لێـواری دەسـت، لێواری پەنجەکان، نێوان پەنجەکان(وێنەی ٣٩٥)، پێ بە تایبەتی پشتی پێ، لە نێرینەدا کۆئەندامی سێکسی (باتوو و چووك) (وێنەی ٣٩٦)، لە منال دا لە دەم وچاو و سەر و مل و بەری دەست و پێ، لە پیر و ساوادا لە قـەد دا ، لە مێینەدا لە بەری دەست دا و لە پیر و منالٚ دا لە بەری دەست و پێدا هەن.

تەنۆچکە بەخورووەکان کە کاردانەوەی فرەهەستیارین بۆ مشەخۆرەکان، لـە ژێربـاڵ و دەوری گـۆی مەمك و سك، بە تایبەتی دەوری ناوك و سمت و ران دا دەردەچن، هەندێك جار گرێیۆکەی سۆیی پتـەو لـە ژێرباڵ و لاڕان و باتوو و چووك دەردەچن و زۆر بەخوروون و دوای چارەسەرکردنیش چەند حەفتە تا چەند مانگێك دەمێننەوە، تەنۆچکە وگرێیۆکەی سۆیی،هەندێك جار لەگەڵ بوونی قۆرت لە سەریان، لە کۆئەندامی سێکسی نێرینەدا باون و تایبەتمەندە بە گەڕی.



(وێنەی ٣٩٥) گەڕی





(وێنەی ٣٩٦) گەڕی.

تووشێنی دووەمی بە بەکتریا و گۆڕانکاری بیرۆیی لە ئەنجامی خوران و هەڵکڕاندنی بەردەوام، باون. بە هەڵە بەکارهێنانی ستیرۆیدی جێیی نیشانەکان دەگۆڕێت و ئاسان نییە نەخۆشیەکە دیاربکرێت.

لە ساوادا قۆرتەکان پترن و دەردی بلۆقی و کێمی لە دەست و پێ دا باون و گۆڕانکاری بیرۆیی بڵاو و چەندەها گرێیۆکەی قەتماغەیی لەسەر قەد و پەلەکان دەردەچن.

جۆرێك لە گەڕی پێـی دەڵـێن گـەڕی قەتماغـەیی (گـەڕی نـەرویجی) Crusted (Norwegian) scabies ،کە دەگمەنە و لەجیاتی چەند مشەخۆرێك (کـەمتر لـە ٥٠) لـە بـاری ئاسـایی دا، بـە ملیـۆن مشەخۆر پێستی داگیرکردووە و دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی گەڕی بـۆ کەسـانێکی زۆر، ئـەم جـۆرە بـەهۆی

دابەزینی بەرگری لەش (وەك ئەیدز) یان هەست نەکردن بە خوران (وەك پیر وگێل و شێت و ئیفلیج) یان مەنگۆلەکان، یان بەهۆی بەکارهێنانی بەرگری سستکەر وەك ستیرۆید و خانەکوژەکان، روودەدات و نیشانەکانی بریتین لە: قەتماغەی بالووکەیی گەورە لە دەست و پێدا و بەری دەست و پێ درزاوی ئەستوور دەبن و مژادی قۆچی گەورە لە ژێر نینۆکەئەستووربوو و رەنگگۆڕاوەکان دا کۆ دەبێتەوە، سووربوونەوە و کاژکردن لەسەر و مل و قەد و لەش دەردەچێت، خوران کەمە یان نییە بەلام هەندێك جار زۆرە، لیمفەگرێسۆی سەراپایی و فرەبوونی ئیۆزینۆفیلەکان لە خوێن دا باون.

مشەخۆری گەڕی تەنیا نزیکەی ٣-٧ رۆژ لە دەرەوەی پێست دا دەتوانێت بژێت.

**دەستنیشانکردن:**

١- سەرجێیی clinical.

٢- پشکنینی ڕاستەوخۆ direct examination: ١-٢ دلۆپە لە رۆنی کانزایی mineral oil، لەسەر دەردەکە رۆدەکرێت ئەوسا دەکرێنرێت یان دەتاشرێت بە چەقۆ،بۆ لابردنی سەری قۆرتەکە یان تەنۆچکەکە، ئەوسا سڕینەکە لەسەر سلاید دادەنرێت و داپۆشەری خزاوی cover slip لەسەر دادەنرێت و لەژێر وردبین دا دەپشکنرێت بۆبینینی مشەخۆری پێگەیشتوو، مێتۆلکە یان هێلکە یان پیسایی مشەخۆرەکە scyballa. بە کرێنەر curette دەتوانین نموونەکە وەرگرین یان بەدەرزی کول یان دەنبووس دەردەهێنرێت.

٣- تۆپینی dermoscopy کەم بەکاردێت.

٤- کاردانەوەی زنجیرەی پۆلیمەرەیس PCR.

## چارەسەر

١- هەموو ئەندامانی خێزان دەبێت چارەسەر وەرگرن، سەرچاوەی تووشبوون دیاربکرێت و چارەسەربکرێت.

٢- جل وبەگ وکەلوپەلی بەکارهاتوو ئوتووی گەرم بکرێت یان بکولێنرێت.

٣- هۆی سەرنەکەوتنی چارەسەر:

أ) بەکارنەهێنانی چارەسەرەکە بە شێوەیەکی تێروتەسەل.

ب) پاکژنەکردنی جل وبەرگ و رایەخی بەرکەوتوو.

ج) ناچالاکی چارەسەرەکە.

د) دووبارە تووشبوونەوە.

هـ) پشتگوێ خستنی چارەسەر بۆ بەرکەوتووی بێ سکالا.

و) بوونی خوران دوای چارەسەر نیشانەی سەرنەکەوتنی چارەسەرەکە نییە، چونکە لەوانەیە چەند حەفتە یان پتر دوای لەناوبردنی مشەخۆرەکە خوران بمێنێت و ئەوسا چارەسەری سکالایی دەدرێتێ.

٤- دەرمان:

أ) پێرمیثرین ٥٪ کرێم بۆ ٨-١٢ کاتژمێر، لە پشتی گوێچکە و ملەوە تا بنی پێ لە لەش دەدرێت و گرنگی دەدرێت بە تێهەڵسوونی تەواو بەتایبەتی بۆ ناوك و لۆچەکان و بن نینۆك و دەوری کۆم و کۆئەندامی سێکسی، لە منداڵ دا سەر و دەم وچاو و هەموو لەش کرێمی لێ دەدرێت، یان لە پیر و بەرگری سست دا یان لە نەخۆشی ئەیدز و - تاد هەموو لەش چەوردەکرێت.

ب) شلەی مالاثیۆن ٠,٥٪، بێنزایڵ بێنزۆوەیت ٢٥٪ یان لیندەین ١٪ بۆ ٨-١٢ کاتژمێر. هەندێك جار دوای یەك حەفتە دووبارە دەکرێتەوە، ئەگەر گومانی چاك نەبوونەوە هەبوو (بۆ هەموو چارەسەرەکان).

ج) گۆگرد ١٠٪ sulphur 10% بۆ باڵق، بۆ منداڵ و ساوا ٢,٥-٥٪، بۆ ٣ شەوی دوای یەك، گۆگرد بۆ سکپڕ و منداڵ ماکی گرنگی نییە و بەکاردەهێنرێت.

د) کرۆتامیتۆن (ئیوراکس eurax) کرێم.

ه) ئایڤێرمێکتین ivermectin ٢٠٠ مایکرۆگرام/کگم، بە یەك یان دوو ژەم بە دەم.

٥- ئەگەر تووشێنی دووەمی بەکتریایی هەبوو، دژەبەکتریا بەکاردەهێنرێت.

٦- دژەهیستامین بۆ خوران و هەندێك جار ستیرۆیدی جێیی و سەراپایی بۆ باری زۆر بەخورووی بیرۆیی بەکاردەهێنرێن.

٧- هەندێك چارەسەر زۆر کزن،وەك شلەی ثایابێندازۆڵ ١٠٪ یان سابوونی مونۆسەلفیرام ٢٠٪ monosulfiram 20% خۆی پێ بشۆرێت بۆ ٦ رۆژ.

٨-بۆ جۆری گۆشتەزوونەگمۆڵی، کە دوای چارەسەر گرێێۆکەکان هەر مانەوە، ستیرۆید بۆ ناو گرێێۆکەکان یان برین بە نەشتەرگەری، چارەسەرەکەیەتی.

# نەخۆشی بەستەرەشانەکان Connectiv tissue diseases

بریتین لە کۆمەڵێك ناساغی ،کە تێیدا بەرگری خۆیی دژی کۆلاجین و مژادی زەمینی ground substance و سۆی بەستەرەشانەکان، دروست دەبێت کە دەبێتە هۆی پووکانەوە و رەقبوون و جومگەسۆ و تێکچوونی ئەندامی تری لەش و دژە تەن دژی شانەی ئاسایی و پێکهاتەخانەییەکان دروست دەبێت، ئەمانەی خوارەوە ناساغیەکانن:

## نەخۆشی گورگەسوورە Lupus erythematosus (L.E.)

هۆکارەکان نەزانراون، بەڵام:



(وێنەی ٣٩٧) گورگەسوورەی خرپان.

١- بۆماوەیی (ئامادەیی فرەجینی polygenic susceptibility) ، وەك نەبوونی تەواوکەر complement deficiency و هەندێك جۆری HLA رەخسێنەری تووشبوونن.

٢- تەنۆچکەی لە ڤایرۆس چوو، لە ناو پۆشەرەشانە و شانەی تر بینراون ،بەڵام رۆڵیان ئاشکرا نییە.

٣- دژەتەن بۆ DNA، پرۆتینی ناوك و بۆ دژەژیندەری ئاسایی دروست دەبێت، بۆیە ئەم ناساغیە بە دژەخۆیی دەناسرێت.

٤- لەوانەیە بەرکەوتنی خۆر و تیشک، سگپڕی و تووشبوون بە میکرۆب infection. نەخۆشییەکە دەربخەن.

٥- هەندێك دەرمان، وەك پرۆکاین ئەمايد و هایدرالازین ناساغیەکە بە پێی ژەمەکان دەردەخەن، هەندێك دەرمانی تر وەك خەپلەی نەزۆکاندن، دژەفێ، ماینۆسایکلین و کاپتۆپریل هەندێك جار ناساغیەکە دەردەخەن. (وێنەی ٣٩٧)

٦- لەوانەیە جگەرەکێشان هۆکاربێت.



(وێنەی ٣٩٨) گورگە سوورەی خرپان
(دەردی چەندانەکی و مووڕووتانەوەی جێژامی)

جۆرەکان: دوو جۆری سەرەکی هەن:

أ) گورگە سوورەی پێست Cutaneous LE: بە شێوەیەکی سەرەکی پێست دەگرێتەوە،بەڵام هەندێك جار سکاڵا و نیشانەی سەراپایی لەگەڵدایە، ٣ جۆرە:

١- جۆری درێژخایەن Chronic cutaneous L.E.: باوترینیان گورگەسوورەی خرپانە Discoid L.E. (وێنەی ٣٩٨) ،کە بە پەڵەی پەمەیی و تەنۆچکە یان قوتکەی بچووك دەست پێدەکات و خێرا رووکەشەکەی دەبێتە

قۆچەکاژ و دواتر بە شێوەی دراوی کانزای خڕ coin-shaped و بە کاژی نوساوی کشاو بۆ ناو کونە فراوانبووەکانی سەلکەمووەکان داپۆشراوە، دەردەکان دەکشێن و لێوارەکانیان سوور و تۆخن و ناوەندەکانیان بۆ پێستی پووکاوە و فرەدەزوولە و کەمڕەنگی hypopigmentation دەگۆڕێن، هەندێکیان یەك دەگرن و قوتکەی شێوێنی گەورە دروست دەکەن. پەستاوتراوی قۆچی لە کونی سەلکەمووەکان دا کۆدەبێتەوە و مووەکان هەڵدەوەرن، ئەگەر کاژەکەی سەر دەردە کۆنەکان هەڵبدەینەوە درکی قۆچی دەردەکەون. دەردەکان لە دەم وچاو، پێستی سەر، گوێچکە، بەشی Vی مل و بەشی دەرەوەی باسك دەردەچن، بەڵام لۆچی نێوان لووت و لێو ناگرێتەوە، هەندێك جار کولمە و لووت بە شێوەی، باڵی پەپوولە، دەگرێتەوە. گوێچکەی دەرەوە زۆر تووشی دەبێت و لە ڕێژەی ٦٠٪ یان مووڕووتانەوەی کۆنینەی هەمیشەیی permanent scarring alopecia ڕوودەدات.

هەندێك جار بەشی دەرەوەی باسك و قۆڵ و دەست وشوێنی تر تووشی دەبێت، لە بەری دەست و پێ دا شێوەی داماڵینی بەئازار بە دەگمەن دروست دەکات و هەندێك جاری تریش نینۆکەکان تووش دەبن، تیشکی خۆر و ت س و بارەکە توندتر دەکەن بەڵام کەمتر لە جۆرەکانی تر، لەوانەیە زەبریش نەخۆشیەکە دەربخات (دیاردەی کۆبنەر). (وێنەی ٣٩٩)





(وێنەی ٣٩٩) گورگە سوورەی خڕپان (جێزام دروستبوون).

- جۆری زل Hypertrophic type بریتییە لە شێوەی زێدەقۆچەکاژی یان باڵوکەیی و بەشی دەرەوەی قۆڵ و سەرەوەی پشت و دەم وچاو پتر دەگرێتەوە و دەگمەنە. (وێنەی ٤٠٠)
- هەندێك جار نیشانەکانی پانەپێستەستوری L.P. و گورگەسوورەی زل بە ،یەکەوە هەن (پانە گورگە سوورە Rubric lupus planus). (وێنەی ٤٠١)



(وێنەی ٤٠٠) گورگەسوورە (جۆری زل).

- جۆرێکی تر بریتییە لە گورگە چەوریەسۆ Lupus panniculitis، کە بە شێوەی گرێیۆکەی ژێر پێستی پتەوی سنووردیاری بێ ئازار، پتر لە قوڵ دا دەردەچێت، پێستەکەی سەر گرێیۆکەکان ئاساییە،بەڵام لەوانەیە جۆری زل یان خرپانی ئاسایی لەسەری دەربچێت، زۆر درێژخایەنە و پتر لە مێینەی ٢٠-٤٥ساڵی دا هەیە و زۆریان جۆری ئاساییان لەشوێنی تری لەش دا هەیە. (وێنەی ٤٠٢)


(وێنەی ٤٠١) گورگە سوورە ( پانە گورگە سوورە )

- جۆری ناوپۆش Mucosal D.L.E لە ٢٥ی٪ بارەکان دا روودەدات، پتر ناودەم بەڵام لەوانەیە ناوپۆشی لووت و پێڵووپۆش و کۆئەندامی سێکسی بگرێتەوە. (وێنەی ٤٠٣)

ناوپۆشی ناو دەم و پووك و مەڵاشوو و زمان دەردەکانیان لێ دەردەکەوێت بە شێوەی قوتکەی سنووردیاری لێوار خواروخێچی سپی لەگەڵهێڵی سپی تیشکاوەری و فرەدەزوولە، لە مەڵاشوودا شێوەی شانەی هەنگ وەردەگرێت، هەندێك جار بۆ شێرپەنجەی کاژی Sq.C.C. دەگۆڕێت.


(وێنەی ٤٠٢)
گورگە سوورە (گورگە چەوریە سۆ).


(وێنەی ٤٠٣) گورگە سوورە (ناودەم).

- جۆرێکی تر بریتییە لە جۆری تەنۆچکە ساردی ( بلقی ساردی ) Chilblain L.E. کە پتر لە مێینەدا دەردەچێت بە شێوەی پارچەی پەمەیی یان تەنۆچکە و قوتکە، لەسەر پەنجەی پێ و

دەست و دەموچاو و بەسەرما و شێ پتر دەردەکەون و لە دوایی دا قوتکەی پووکاوە دروست دەکەن و زۆر درێژخایەنە.

- جۆری دەگمەنی تریش هەن.

ڕێژەی ٥٪ ی بارەکان لە داهاتوودا ،دەگۆڕێن بۆ جۆری سارایایی .S.L.E، ڕێژەی مێینە بۆ نێرینە ٢:١ .

٢- جۆری ژێرتیژ .Subacute-cutaneous L.E: یان جۆری ژێرتیژی بڵاوبووەوە Subacute disseminated L.E. زووربەیان مێینەی سپی پێستی تەمەن ١٥-٤٠ ساڵن و نزیکەی ١٠-١٥٪ی بارەکانی گورگەسوورە پێکدەهێنن و ٢٠٪یان گورگەسوورەی خڕپانی لەگەڵدایە و سێیەکیان هەلومەرجی جۆری سەراپایان تێدایە. دەردەکان کاژی فرەکەوانەیی یان کاژۆکین و ڕەنگیان پەمەیی، سوور یان بنەوشەییە، کاژەکان تەنکن و بە ئاسانی لادەبرێن، فرەدەزوولە و ڕەنگگۆڕان باون، سەلکەمووەکان ناگرێتەوە و زۆر لە دەردەکان کاتی و جێگۆڕن migratory و نابن بە جێ زام scar tissue. پتر لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان دەردێن وەك دەموچاو و شێوەی Vی مل و سنگ و پشتی باسك. هەستیاری بەخۆر لە نزیکەی نیوەی بارەکان دا هەیە. ڕێژەی ٧٥٪ یان ئازاری جومگە و جومگەسۆیان هەیە و ٢٠٪ یان کەمی خڕۆکەسوورەکانیان هەیە ،٨٠٪یان بۆ ANA پۆزەتیڤن و زۆربەیان دژەتەنیان بۆ دژە ژیندەری Ro/SSA هەیە و زۆربەشیان بۆ HLA-DR3 پۆزەتیڤن. (وێنەی ٤٠٤)

ئەم جۆرە سووکە و گورچیلە و سیستمی دەماری ناوەندی و بۆریەخوێنەکان وەك جۆری سەراپایی ناگرێتەوە، زۆربەیان بە پاراستن لە خۆر و بەکارهێنانی دژەمەلاریا کۆنترۆڵ دەکرێن.




(وێنەی ٤٠٤) گورگە سوورە (جۆری ژێر تیژ).

٣- جۆری تیژ .Acute cutaneous L.E: ئەم جۆرە بریتییە لە گرتنەوەی پێست لە گورگەسوورەی سەراپایی دا و سنووردارە یان بڵاوە.

ب) گورگە سوورەی سەراپایی Systemic L.E.: (وێنەی ٤٠٥) زۆربەیان مێینەی گەنجن (١:٨) یان ناوەڕاستی تەمەنن ،ڕێژەی ٨٠٪ یان پێست دەگرێتەوە، ئەم نەخۆشیە سەراپاییە و بۆ دیارکردنی دەبێت چوار یان پتر لە هەلومەرجەکانی کۆلێجی ئەمریکی بۆ باداری ACR لە یەك كات دا یان دوابەدوای یەك دا لە نەخۆش دا هەبن کە ئەمانەن:

١- دەردی پێستی کوڵمە malar rash: سووربوونەوەی چەسپاوی پانبووەوە یان بەرزبووەوەی کوڵمەکان.

٢- دەردی پێستی خڕپان discoid rash: وەك باسمانكرد لە جۆری خڕپان دا.

٣- هەستیاری بە تیشك photosensitivity: دەرچوونی دەردی پێست ،بە کاردانەوە بۆ تیشك،لە ڕابوردوودا یان لە کاتی پشکنین دا.

٤- چاڵەبرینی ناو دەم oral ulcers: چاڵەبرینی ناوپۆشی ناو دەم یان لووت و گەروو، بە پشکنین دیاردەکرێت.

٥- جومگەسۆ arthritis: جومگەسۆی دوو یان پتر لە جومگەپەڕیەکان peripheral کە ئاوساو و بەئازاربن.

٦- پەردەسۆ serositis: وەك سپێۆشەسۆ pleuritis یان پەردەسۆی دڵ pericarditis.

٧- تێکچوونی گورچیلە renal disorder: وەك پرۆتین لە ناو میز پتر لە ½ گم/ڕۆژ، بە بەردەوامی یان بوونی لوولەکی خانەیی cellular casts ،لە میزدا.

٨- تێکچوونی دەماری neurological disorder: وەك فێ seizures یان دەروون تێکچوون psychosis.

٩- تێکچوونی خوێنی haematological disorder: وەك کەمخوێنی تێکشکانی haemolytic anaemia لەگەڵ فرەبوونی تۆڕەخانە reticulocytosis یان کەمبوونی خانەی سپی leukopenia (کەمتر لە ٤٠٠٠/مایکرۆلیتر) یان کەمبوونی لیمفەخانە lymphopenia (کەمتر لە ١٥٠٠/مایکرۆلیتر) یان کەمبوونی خوێنەخەپلە thrombocytopenia (کەمتر لە ١٠٠,٠٠٠/مایکرۆلیتر).



(وێنەی ٤٠٥) گورگە سوورەی سەرا پایی بڵاو.

١٠- تێکچوونی بەرگری immunological disorder وەك بوونی دژەتەنی دژی DNA یان دژی Sm یان دژەتەنی دژی

فۆسفۆلیپید وەك: أ) بەرزبوونەوەی IgM یان IgG، ب) دژە مـەیینی گـورگی lupus anti-coagulant، ج) VDRL پۆزەتیف بێت.

١١ - دژەیی دژەناوك antinuclear ab. (ANA) پۆزەتیف بێت.

**نیشـانەكان لـە پێست دا:** جـۆری سـنووردار localized form بـاوترە بـە شـێوەی دەردی پەپوولـەیی butterfly rash یان كوڵمەیی دەردەچێت و سـووربوونەوە و ئاوسـان لـە كوڵمـەكان و پـردی لـووت ئاشكران، ناوچەوان و چەناگە و شێوەی Vی مل هەنـدێك جار تووش دەبن(وێنەی ٤٠٦)، لەوانەیە دەموچاو زۆر ئاوساو بێت. جۆری بڵاو بەشێوەی سوورێژەیی، بە تایبەتی لـە بەشی دەرەوەی باسـك و دەسـت دەردەچـێت. لەوانەیـە فـرە دەزوولـە و سووربوونەوەی نوشتاوەی نینۆك هەبن، هەندێك جار جۆری بڵقی بڵاوی تیژ دەردەچێت. تیشكی سـەرووی وەنەوشەیی و خۆر زۆر جار نەخۆشیەكە توند دەكـەن یـان دەری دەخەن، جێ زام دروسـت نابێـت. هـەردوو جـۆری سنووردار و بڵاو بەپێی چـالاكی نەخۆشـیەكە كـەم و زۆر دەبێت، مووڕووتانەوەی بڵاو بە تایبەتی لە پێشی سـەر كـە پێی دەڵێن مووی گورگی lupus hairباوە و كاتییە.



(وێنەی ٤٠٦) گورگە سوورەی سەرا پایی (جۆری سنووردار توند لە پێست دا).

دەردی ناوپۆشەكان لـە ٢٠-٣٠٪ی بارەكان دا هەیە.

دایك دەتوانێت سكپڕی هەبێت هەرچەندە منالّ لەبەرچوون لە ئاسایی پترە.

## گورگە سوورەی ساوا Neonatal L.E.

زۆربەیان مێینەن و دایكەكانیان دژەتەنی دژی Ro/SSA یان هەیە، دەردەكان لە كاتی لەدایكبوون دا نین، بەڵام لە چەند حەفتەی سەرەتای ژیان دا دەردەچن بە شێوەی دەردی سووری بازنـەیی و قوتكـە لـەسـەر و پەلـەكان دا، دەوری چاڵی چاو بە زەقی تووشبووە، لەگەڵ تێپەڕبوونی كاتدا دەردەكان نـامێنن و پووكانـەوە جـێدەهێڵن، لەوانەیـە پەڵـەی دەزوولـەیی و تەنۆچـكەی بۆریـەگمۆڵی angiomatous لـە شـوێنە بەرخۆرنەكـەوتووەكان دا هـەبن و درێژخایەنـە، لـە ٦ مـانگ دا دەردەكـان نـامێنن بـەڵام فرەدەزوولـە و رەنگگۆڕان پتر دەمێننەوە. نیوەی دایكەكان لە كاتی منالّبوون دا بێ سـكاڵان، نیـوەی سـاواكان دڵگیرانـی زگماكی congenital heart block یان هەیە و بەردەوام دەبێت، نەساغی جگەر و كەمبوونی خەپەلە خـوێنیش لـە نیوەیـان دا هەیـە و دژەتـەنی خـۆیی Ro/SSA زۆر بـاوە، منـاڵی دووەم ئەگـەری ٢٥٪ی تووشبوونی هەیە.

نموونە وەرگرتن

گۆڕانکاریەکان ئاشکران وەك تەنکبوونی توێژ، شلبوونە پووکانەوەی liquifaction degeneration خانەی بنکەیی و تەنینەوەی خانەی تاکناوکی لە دەوری بۆریە خوێنەکان، بە دژە تەنە درەوشێی راستەوخۆ DIF دژە تەنی lgG، lgM، lgA و C3 بە تاك یان بەیەکەوە لە لکینی توێژ و بن توێژی ناساغ و ئاسایی دا هەن.

پشکنینی تاقیگە: کەمخوێنی anemia، بەرزبوونەوەی ESR، کەمی خەپلە خوێنەکان thrombocytopenia، کەمبوونی خڕۆکەی سپی leukopenia.

- ANA پۆزەتیڤە، double-stranded anti-DNA پۆزەتیڤە، VDRL پۆزەتیڤە، نەبوونی تەواوکەری C و lupus anti-coagulant factor پۆزەتیڤە.

پشکنینی میز: پرۆتین یان خوێن لە ناو میزدا لەگەڵ لوولەك casts هەن.

کاری ئەندامەکانی تر: وەك پشکنین بۆ کاری جگەر و گورچیلە.

چارەسەر

١- خۆپاراستن لە خۆر بە هەموو رێگایەك و بەکارهێنانی دژەخۆر.
٢- پالاوتەی بەربەست بۆ تیشکی سەروو وەنەوشەیی و خۆر بۆ پەنجەرەی ماڵ و ئۆتۆمۆبیل و بەرپەرچی گڵۆپی شیری (نیۆن)و بەکارنەهێنانی دەرمانی تیشکەهەستێن.
٣- ستیرۆیدی جێیی بەهێز (جگە لە پێستی دەموچاو)و هەندێك جار لە ژێر بەستن دا یان بە دەرزی بۆ ناو دەردەکان intralesional وەك ترایئەمسینۆلون چوار حەفتە جارێك.
٤- تاکرۆلیمۆس یان پیمیکرۆلیمۆس(جێیی) بەکەڵکن بەڵام کەمتر لە ستیرۆیدی جێیی بەهێز.
٥- دژەمەلاریا، وەك هایدرۆکسی کلۆرۆکوین یان کلۆرۆکوین، بەڵام ناوە بەناوە پشکنین بۆ چاو دەبێت ئەنجام بدرێت،چونکە لەوانەیە تۆڕی چاو تێك بدەن.
٦- ئایزۆتریتینۆین isotretinoin یان ئەسیترێتین acitretin.
٧- داپسۆن، بۆ جۆری بلقی.
٨- خانەکوژەکان cytotoxics، وەك ئازائایۆپرین، سایکلۆفۆسفئەماید و میثۆترێکسەیت.
٩- ثالیدۆماید (لە سکپردا نابێت بەکاربهێنرێت).
١٠- کلۆفازیمین clofazimine.
١١- لەیزەری ئارگۆن.
١٢- ستیرۆیدی سەراپایی.
١٣- ئینتەرفیرۆن ئەلفا٢، ئالتون (بە دەم)، گاماگلۆبیولین بە ژەمی بەرز بە خوێن، ریتوکسیماب rituximab.

## نەخۆشی پێستەماسولکەسۆ Dermatomyositis

نەخۆشیەکی دەگمەنە، مێینە پتر تووشی دەبێت (١:٢)، رەش پێستەکان چوار کەرەت پتر لە سپی پێستەکان دەیگرن، جۆری منالّی و پێگەیشتوو (٤٠–٦٥ سالّی)ی هەیە.

هۆکارەکان نەزانراون بەلاّم وا دیارە کە نەخۆشی بەرگری دژەخۆیی بێت، لەوانەیە لە پێگەیشتوودا هێمای شێرپەنجەی هەناوی بێت (٣٠٪ بارەکان).

**نیشانەکان**: دەردی نموونەیی بریتیە لە رەنگی ئەرخەوانی کالّی دەوری چاو (heliotrope) و لەگەلّ سووربوونەوە و ئاوسانی دەم وچاو و پێلّووەکان، لەوانەیە پێلّووەکان بە دەست لێدان بە ئازاربن. سووربوونەوە و کاژکردن و ئاوسانی بەشی سەرەوەی دەموچاو و هێلّی پێشەوەی قژی سەر و برۆکان باون. بەشی دەرەوەی پەلەکان زۆر جار پەمەیی، سوور یان وەنەوشەیی پووکاوەیی دەنوێنن و لەوانەیە کاژاوی بن و لە نەخۆشی سەدەف (کاژۆکی) دەچێت، هەستیاری بە خۆر باوە، لەوانەیە پەنەمانی پتەو لە شان و قۆلّ و مل دا هەبێت، سووربوونەوە و کاژکردن لە پێستی شان دا پێی دەلّێن نیشانەی شاولّ Shawl sign. هەندێك جار خورانی توند هەیە.

دوای ماوەیەك گۆڕانکاریەکان لە پێستی مل و سنگ و شان و قۆل دا پتر دیاردەبن بە تایبەتی لە پشتی مل و شێوەی Vی مل و سەرەوەی پشت و شان.

لە دەست دا فرەدەزوولە لە نوشتاوەی نزیکی نینۆك دا بە شێوەی قولایی فراوانبوو و گەشەکردنی پێستۆکەی نینۆك cuticle بە شێوەی لێوار دڕاو و نارێك و لەوانەیە دەردی کاژاوی پەمەیی یان سووری پووکاوەیی لە پێستی پشتی نێوان پەنجەکان و ئانیشك و ئەژنۆ (نیشانەی گۆترۆن Gottron’s sign) دەربچن.

هەندێك جار زێدە قۆچەکاژی، کاژکردن، درزدان و تۆخبوون لە کۆتایی پەنجەکان، لێوارەکانی قامکە گەورە و پەنجەکانی تر و کەم جار بەری دەست دەردەچن. لە دوایی دا پێستەگۆڕاو poikiloderma لە زۆر نەخۆش دا ئەنجامی نەخۆشیەکەیە، نیشتنی کالسیۆم calcinosis cutis لە پێست و ماسولکەکان دا، بەلاّم پتر لە جۆری منالّ دا، بە تایبەتی لە باری توند و درێژخایەن دا و پتر لە بەشی سەرەوەی لەش دا وەك شان و ئانیشك و دەستدا روودەدات.

لە باری توند دا هەر لە سەرەتادا بە توندی لاوازی ماسولکەکان و ئازار و ئاوسان بە شێوەیەکی چوونیەکی بە زۆری لە ماسولکەی شان و هەندێك جار ئەستێلك pelvis و دەست دا دێنە کایەوە. نەخۆش ناتوانێت شت بەرزبکاتەوە یان قژی شانە بکات یان لەسەر کورسی بەبێ یارمەتی دەستی هەستێت ، یان لە پلیکانە سەرکەوێت، قووتدان بە ئەرك دەبێت، قسەکردن و هەناسەدانیش ئاسان نین. تووشبوونی پێست زووتر لە تووشبوونی ماسولکە روودەدات، بەلاّم هەندێك جار ماسولکە تووشبوون بێ سکالاّیە(وێنەی ٤٠٧).










(وێنەی ٤٠٧) پێستە ماسولکەسۆ:
أ) دەست ب) نیشانەی گۆترۆن. جـ) دەموچاو و قەد.
د) ڕەنگی ئەرخەوانی کاڵی دەوری چاو لەگەڵ سووربوونەوە.

لە جۆری منالّی دا نیشتنی کالسیۆم لە پێست و ماسولکەدا، بێوەیی نەساغیەکە و نەبوونی شێرپەنجەی ناوەوە ، بە بەراورد لەگەڵ جۆری پێگەیشتوودا، باوترە.

لەوانەیە دیاردەی راینۆد، ئازاری جومگە، گران قووتدان و نیشتنی کالسیۆم و نیشانە و سکاڵای نەخۆشی بەستەرەشانەی تێکەڵ ڕووبدەن.

## پشکنینی تاقیگە

١- بەرزبوونەوەی ئاستی ئەنزیمی کریاتینین کاینەیز creatinine kinase (CK).

٢- بەرزبوونەوەی ئاستی ئەڵدۆلەیز Aldolase، لاکتیك دیهایدرۆجینەیز lactic dehydrogenase و ترانزئەمینەیزەکان (SGOT و SGPT) نیشانەی چالاکی نەخۆشیەکەیە لە ماسولکەکان دا.

٣- فرەبوونی خڕۆکە سپیەکان leukocytosis، کەمخوێنی anaemia ،کەم ئاستی low S. iron و بەرزبوونەوەی ESR هەندێك جار هەن.

٤- ANA لە ٦٠-٨٠٪ی نەخۆشەکان دا پۆزەتیڤە.

٥- لە پێست دا دژەتەنە درەوشێی راستەوخۆ DIF لە پتر لە سێیەکی بارەکان دا (دوای ٣-٦ مانگ) پۆزەتیڤە.

٦- قووتدانی باریۆم barium swallow و تیشکی X، MRI، EMG.

هۆکارەکانی مردن برتین لە شێرپەنجە، نەخۆشی دڵی کەمخوێنداری ischaemic heart ds. و نەخۆشی سییەکان.

## چارەسەر

ستیرۆیدی سەراپایی بە ژەمی بەرز (١ ملگم/١کگم/رۆژ) تا نەخۆشیەکە دادەمرکێتەوە (سەرجێیی) و ئاستی (CK) ئاسایی دەبێتەوە ، ئەوسا کەم دەکرێتەوە، لەوانەیە چەند ساڵ پێویست بکات.

١- ئازاثایۆپرین، سایکلۆسپۆرین، میثۆترێکسەیت، کلۆرامبیوسیل و مایکۆفینۆلەیت مۆفیتیل.

٢- گاماگلۆبیولین بە خوێن.

٣- بۆ پێست، دژەخۆر، ستیرۆیدی جێیی، دژە مەلاریا (کلۆروکوین، هایدرۆکسی کلۆرۆکوین)، تاکرۆلیمۆس.

٤- داپسۆن (بۆ پێست)، دیلتیازیم (بۆ نیشتنی کالسیۆم)، ئیتانێرسێپت، ئینفلیکسیماب و چارەسەری تیشك هاویشتن بۆ هەموو لەش total body irradiation.

## پێست رەقبوون (رەقەپێست) Scleroderma

بریتییە لە دروستبوونی پارچەی سنووورداری یان بلاّوی لووسی رەقی سپی (وەك ددانی فیل وایە) چەسپاوی (نەجوڵی) پێست، هۆکاری نەزانراوە بەلاّم تێکچوونی بۆریە خوێنەکان و میکانیزمی بەرگری دژەخۆیی روودەدەن. دوو جۆری سەرەکی هەن:

أ) **جۆری پێست** Cutaneous type: ئەمانەن:

١- **رەقبوونی پێستی سنووردار** Localized morphea: رێژەی مێینە بۆ نێرینە دوو بۆ یەکە (١:٢)و لە منداڵ و پێگەیشتوودا روودەدات، قوتکەی سنووورداری رەقی ناوەند سپی (ددانی فیلی) لێوار وەنەوشەیی (لە کاتی چالاکی نەخۆشیەکەدا) دەردەکەون، لە سەرەتادا دەردەکان سوور یان ئەرخەوانی کاڵن لەگەڵ پەنەمان oedema، دواتر ناوەندەکانیان سپی یان زەرد دەبێت و لەوانەیە مووی سەردەردەکان نەمێنن و ئارەقکردنەوەش تیایاندا نەمێنێت، قوتکەکان کەمێك لە ئاستی پێست بەرزبوونەوە یان نزمترن و پتەون،بەلاّم بە پێکهاتە قوولەکانی ژێریان نەبەستراونەتەوە، زۆربەی جار یەك یان چەند دەردێك هەن یان زۆرن و قەبارەیان لە یەك سم بۆ ٣٠ سم دەبێت، لە قەد و هەندێك جار پەلەکان دەردەچن. (وێنەی ٤٠٨)




(وێنەی ٤٠٨) رەقبوونی پێستی سنووردار.

٢- ڕەقبوونی پێستی گشتی Generalized morphea: جۆرێکی توندی بڵاوی جۆری سنووردارە، چەندەها قوتکەی پتەو و تۆخ لە بەشی سەرەوەی قەد و سك و سمت و لاقەکان دروست دەبن، لەوانەیە پووکانەوەی ماسولکە هەبێت بەڵام ئەندامی هەناوی ناگرێتەوە.

٣- ڕەقبوونی دڵۆپەیی Guttate morphea: بە شێوەی دەردی سپی تەباشیری بچووکی چەندانەکی لە مل و سەرەوەی قەد دەردەچێت، پتەوی نییە.

٤- ڕەقبوونی گرێیۆکەیی Nodular morphea: دەگمەنە، وەك گۆشتپارە وایە.

٥- ڕەقبوونی ژێر پێست Subcutaneous morphea: قوتکەی ڕەقی قووڵی بەستراو بە پێکهاتەکانی ژێرەوەی دەردەچێت، بەڵام ڕەنگتێکچوونی ڕەقبوونی ئاسایی تێدا نییە.

٦- ڕەقبوونی قووڵ Pansclerotic morphea: تێیدا ڕەقبوونی بن توێژ و چەوری ژێر پێست و پۆشەرfascia و ماسولکە و هەندێك جار ئێسك ڕوودەدات،جووڵەی جومگەکان کەم دەبێتەوە.


(وێنەی ٤٠٩) ڕەقبوونی هێڵی.

٧- ڕەقبوونی هێڵی Linear morphea: لەوانەیە بەشێوەی هێڵی، پەلێك (لاق یان باسك) بگرێتەوە، لە ١٠ ساڵی یەکەمی ژیاندا دەست پێدەکات. (وێنەی ٤٠٩)

لەوانەیە هێڵی چاڵی لە بەشی پێشەوەی پێستی کەللەی سەر و ناوچەوان و پێڵووی چاو و ڕوومەت و مل دروست بێت (لە لاوە نەك لە ناوەڕاستدا).

کۆنیشانەی پاری ڕۆمبێرگ Parry-romberg syndrome،بریتییە لە پووکانەوەی نیوەی دەم وچاو، فێ، چاو دەرپەڕین و مووڕووتانەوە.

ب) **جۆری سەراپایی** Systemic types: دووجۆرە:

١- کۆنیشانەی کرێست CREST syndrome: ئاکامی لە جۆری پەرەسەندوو باشترە چونکە گورچیلە و سییەکان بە سووکی دەیگرن یان هەر نایگرن و دژەتەنی دژە سێنترۆمیر anti-centromere ab. لە ٥٠-٩٠٪ی بارەکاندا هەیە، بەڵام لە ٢-١٠٪ی جۆری پەرەسەندوودا هەیە. کرێست CREST بە مانای نیشتنی کالسیۆم calcinosis cutis، دیاردەی ڕاینۆد raynaud's phenomenon، تێکچوونی جووڵەی سووڕێنچك esophageal dysmobility، ڕەقبوونی پەنجەکان sclerodactyly و فرەدەزوولە telangiectasia.

٢ – ڕەقبوونی پەرەسەندووی سەراپایی Progressive systemic sclerosis

بریتییە لە تێکچوونی سەراپایی بەستەرەشانەکان کە تێیدا چەمکەکۆلاجینەکانی بن توێژ ئەستوور دەبن



(وێنەی ٤١٠) ڕەقبوونی پەرەسەندووی سەراپایی.

fibrosis و نائاسایبوونی بۆریەخوێنەکانی ئەندامەکانی ناوەوە. دیاردەی راینۆد لە پتر لە نیوەی نەخۆشەکان لە سەرەتادا دەردەچێت بەڵام هەندێك بار بە پەنەمانی تەختەیی دەست پێدەکات. دڵ و سی و ڕێچکەی ڕیخۆڵە و گەدە وگورچیلە و زۆرجار ئەندامەکانی تریش دەگرێتەوە. مێینە سێ ئەوەندەی نێرینە تووشیان دەبێت و پتر لە ٣٠–٥٠ ساڵیدا دەردەچێت. (وێنەی ٤١٠)

گۆڕانکارییەکانی پێست: دوای ماوەیەك لە سووربوونەوە و ئاوسان، پێست بۆ ڕەقبوون و زەردباوی و پتەوبوون و چوونەوەیەك (قرچۆکی) shrinkage دەگۆڕێت ، پێست بە پێکهاتەکانی ژێریەوە دەنووسێت و وا دەردەکەوێت کە رووبەری پێستەکە لە ئاسایی بچووکتر بۆتەوە، دەموچاو و دەست لە سەرەتادا، ئەوسا مل و هەندێك جار پێ و پەلەکان و قەد دەگرێتەوە.

دەموچاو دەڵێی ڕووپۆشە mask-like و پێستەکەی لووس و پتەو و ڕەق بووە و هێڵە ئاساییەکانی نەماوە، لێوەکان باریکن و دەم بچووك بۆتەوە، هێڵی تیشکاوەری لە دەوری دەم دا دیارن، بە دەگمەن

ناوپۆشی دەم دەگرێتەوە بە شێوەی رەقبوونی پووك و زمان، لووت بچووكتر و تیژتر دیارە، كە مل بۆسەرەوە راستكرێتەوە هێڵی چاڵی و تەسكبوونەوەی پێستەكەی دەردەكەون، فرەدەزوولەی حەسیری لە دەموچاو و سەرەوەی قەددا باوە، لەوانەیە تۆخبوونی گشتی دەركەوێت.

پەنجەكان باریك دەبنەوە لەگەڵ فرەدەزوولەی نوشتاوەی نینۆك بە شێوەی قولایی، چاڵەبرینی بەئازار لە كۆتایی پەنجەكان و كورتبوونەوە یان رەقبوونیان لەباری چەمینەوەدا وەك چنگی باڵندە، دێنەكایەوە، لەوانەیە نیشتنی كالسیۆم لە پێستدا روودات.

گرتنەوەی ئەندامەكانی ناوەوە بریتییە لە تووشبوونی سورێنچك لە ٩٠٪ی بارەكاندا بە شێوەی گران قووتدان و سورێنچكەسۆ، كەم جووڵەیی ریخۆڵەكان دەبێتە هۆی قەبزی، رەوانی یان بەدهەڵمژین. چەقبوونی سییەكان و هەناسەتوندی و كۆكە باون لەگەڵ بەرزی پەستانی سی و سستی دڵی لای راست. جومگەسۆ بە تایبەتی جومگەكانی دەست، باون. باوترین هۆكاری مردن رەقبوونی سییەكانە.

پشكنینی تاقیگە:

١- دژەتەنی دژەناوكANA لە پتر لە ٩٠٪ی بارەكاندا پۆزەتیڤە.

٢- تیشكی X (ئێكسبەرداری) بۆ جومگە و ئێسكەكان.

٣- قووتدانی باریۆم barium swallow.

٤- پێوانی ئەنزیمی ماسولكەكان.

٥- ئاستی ئیمیونۆگلۆبیولینەكان.

٦- پشكنینی خوێن و ESR.

٧- دژەتەن بۆ Scl-70.

٨- دژەتەنی دژی ssDNA.

## چارەسەر

[illegible]

- ستیرۆیدی جێیی بەهێز وەك كلوبێتازۆڵ یان ستیرۆید بە دەرزی بۆ ناو دەردەكان ٤ حەفتە جارێك بۆ ٣ مانگ.
- كالسیپۆترێۆڵ (جێیی) مەرهەم رۆژی ٢ جار لە ژێر بەستندا بۆ ٣ مانگ.
- تاكرۆلیمۆس جێیی.
- پوڤا PUVA یان UVA + پسۆرالین جێیی PUVA-bath photochemotherapy بۆ جۆری بڵاو یان هێڵی (حەوزی پڕ ئاوی گەرم كە ١ ملگم/لتر میثۆكسالینی methoxalen تێدابێت بۆ ٢٠ خولەك ئەوسا تیشكی UVA ٠,٢-٠,٥ جول/م٢ لێ دەدرێت).
- UVA بە ژەمی كەم بە تەنیا (٢٠ جول/سم٢).
- $UVA_I$ بە ژەمی بەرز.

- میثـۆترێکسـەیت بۆ باری بلاو بە ژەمی کەم ١٥ ملـگم/حەفتە بۆ ٢٤ حەفتە.
- میثـۆترێکسـەیت + پرێدنیزۆلۆن.
- کالسیترایۆل calcitriol بە دەم بۆ منالّ.
- سایکلۆسپۆرین.
- نەشتەرگەری بۆ لـەبارکردنەوەی شێوان deformities.

[illegible]

١- خۆپاراسـتن لـە سـەرما، جگەرەنەکێشـان و چارەسـەری فیزیکـی (سروشـتی) بـۆ جوولـەی جومگەکان.



(وێنەی ٤١١)
پۆشەرەسۆی ئیۆزینۆفیلی.

٢- بۆریەخوێن فراوانکەرەکان vasodilators وەك نیفیدیپین.
٣- چارەسـەری ئەندامـە تووشـبووەکانی نـاوەوە وەك سـی، گورچیلە، جومگە و بەرزی پەستانی خوێن.
٤- بەرگری کپکـەرەکان وەك ئـازاثـایـۆپرین، کلۆرامبیوسـیل، میثـۆترێکسـەیت و سایکلۆفۆسفئەماید.
٥- ستیرۆیدی سەراپایی.
٦- د-پێنیسیللامین D-penicillamine ٢٥٠ ملـگـم/رۆژ ،دواتر ژەمەکە پتر بکرێت بۆ ٧٥٠-١٥٠٠ ملـگم/رۆژ بۆ ١٨-٣٠ مانگ.
٧- ریلاکسین relaxin (دژی رەقبوونە anti-fibrotic).
٨- ئینتەرفیرۆن گاما δ-interferon ( IFN-δ).
٩- ئیمیونۆگلۆبیولین"Ig" بە خوێن.
١٠- چاندنی مۆخی ئێسك B.M. transplant.

## پۆشەرەسۆی ئیۆزینۆفیلی Eosinophilic fascitis

هەندێك جار دوای تووشبێنی رێچکەی سەرەوەی هەناسەدان بە ڤایرۆس یان بەکتریا یان دوای وەرزش و ماندووبوونی درێژخایەنی توند، پارەچەی سنووردار لە پێستدا رەق دەبێت. پێست ئاوساو و سوورە بە تایبەتی بەشی ناوەوەی قۆڵ و ران و ناوقەد (دەم وچاو و دەست ناگرێتەوە)، کە قۆڵ بۆ سەرەوە یان تەنیشت بەرزبکرێتەوە هێڵی چاڵی لە پێستە ئەستووربووەکەدا دەردەکـەون، پەلـەکان بـە ئاسـانی نـاجوولێنرێن و لەوانەیە قرچۆکیان contractures تووش بێت و نەخۆش ناتوانێت بە ئەستوونی بووەستێت. هەندێك جـار ئەندامەکانی ناوەوە تووشی کێشە دەبن. لە ١-٣ ساڵدا چاك دەبنەوە. (وێنەی ٤١١)

پڕبوونی گاماگلۆبیولین hyper-gammaglobulinaemia و ئیۆزینۆفیل هەن و لە نموونە وەرگرتندا پۆشەری ماسولکەکان ئەستوورن.

**چارەسەر**

ستیرۆیدی سەراپایی.

- دژە هیستامین، وەك هایدرۆکسی زین و سیمیتیدین.
- سایکلۆسپۆرین، PUVA، IFN-δ.
-

## نەخۆشی بەستەرەشانەی تێکەڵ Mixed connective tissue ds.

بریتییە لە پێکەوەبوونی نەخۆشی گورگەسوورەی سەراپایی S.L.E. + پێست ڕەقبوون Scleroderma یان چەندانە ماسولکەسۆ Polymyositis. پتر لە مێینەدا هەیە و درێژخایەنە و لە کۆتاییدا دەبێت بە گورگەسوورەی سەراپایی S.L.E یان ڕەقبوونی سەراپایی S.S.

## کۆنیشانەی جۆگرین Sjögren syndrome

پتر لە مێینە (٩٠٪)ی ٥٠ساڵی یان بە تەمەنتردا هەیە، ناساغیەکی بەرگری دژەخویی درێژخایەنە کە تێیدا تەنینەوەی لیمفەخانە لە دەرەگلاندەکان exocrine glands دا بەتایبەتی لیکەگلاندەکان و فرمێسکە گلاندەکان ڕوودەدات.

وشکبوونەوەی ناودەم و لێو و ناوپۆشی لووت و پێلووپۆش و ناوپۆشەکانی تر روو دەدەن.

بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکە دوو نیشانە لەمانەی خوارەوەدا دەبێت هەبن:

١- وشکبوونەوەی چاو xeropthalmia.

٢- وشکبوونەوەی دەم xerostomia.

٣- بوونی ناساغی بەرگری دژەخۆیی یان باداری (جومگەسۆیی) یان ناساغی پڕبوونی لیمفەخانەیی.

**چارەسەر**

بەپێی سکاڵا و نیشانەکانە.

# نەخۆشیە بڵقیەکان Bullous diseases

## توێژشیبوونەوەی بڵقی Epidermolysis bullosa (E.B.)

بریتین لە کۆمەڵێك شێواوی بۆماوەیی دەگمەن کە تێیاندا بڵق دروست بوون دوای زەبری زۆر سووك روودەدات و دیارترین نیشانەکانی بڵق و بلۆقن لە ناو پێست و ناوپۆشەکاندا و هەندێك جاریش ئەندامەکانی ناوەوەش دەگرێتەوە. جۆری بۆماوەیی و وەرگیراوی هەیە، بۆماوەییەکان ئەمانەن

١ - **جۆری ناوتوێژی** Intraepidermal forms

ئاستی جیابوونەوە توێژ دەگرێتەوە و بڵقەکان دەردەچن، وەك:

أ) **توێژشیبوونەوەی بڵقی سانا (کۆبنەر)** (Koebner) Epidermolysis bullosa simplex: بۆماوەیی لەشی زاڵە ، تێیدا بازدانی جینی کیراتین دەبێتە هۆی دروستبوونی دەزووی مامناوەندی ناتەواو defective intermediate filaments، ئەمیش دەبێتە هۆی ناسکبوونی خانە بنکەییەکان و ئەوسا بڵق دروستبوون. کیراتینی ٥ و ١٤ لە خانەی بنکەیی شێواون. جیابوونەوەکە لە خانەی بنکەییدا روودەدات. (وێنەی ٤١٢)



**(وێنەی ٤١٢) توێژشیبوونەوەی بڵقی سانا (جۆری بڵاو).**

لە نیو ملیۆن لەدایکبوودا یەك کەس تووشی دەبێت، نیشانەکان لە کاتی لەدایکبوون یان دوای کاتێکی کەم بە شێوەی بڵق و بلۆق و میلیا milia (گچکەپۆرگی زەردباوی ناوتوێژ) لەسەر جومگەکانی دەست و ئانیشك و ئەژنۆ و پێ و شوێنەکانی تری لەش کە زۆر بەر لێخشاندن و زەبر بکەون دەردەچن، لە هاویندا توندتر دەبێت. هەرچەندە بڵق دروستبوون بە درێژایی ژیان بەردەوامە بەڵام دوای باڵقبوون سوکترە.

ب) **توێژشیبوونەوەی بڵقی سنووورداری جێیی سانا** Localized E.B. simplex: باوترین جۆرە و بۆماوەیی لەشی زاڵە، لە ساواییدا یان درەنگتر دەردەکەوێت، لە وەرزی گەرم و هاتووچۆی درێژخایەندا وەك کاتی جەنگ پتر خۆی دەردەخات، بە شێوەی بڵق دروستبوونی سەرهەڵداوە لە دەست و پێدا دەردەچێت، فرەئارەقکردنەوە زۆرجار لەگەڵیدا هەیە، بڵقەکان لە ناو بنتوێژدا لە سەرووی چینی بنکەییدا دروست دەبن.

ج) **توێژ شیبوونەوەی بڵقی تامیسکی** E.B. herpetiformis: بۆماوەیی لەشی زاڵە، لە ساواییدا بڵقی چالاك بە شێوەی بازنەیی روودەدەن، هەندێك جار میلیا هەیە، نینۆك فڕێدان کە

لەوانەیە گەشەبکاتەوە روودەدات، لەوانەیە زیدەقۆچەکاژی بەری دەست و پێ هەبێت، ناساغیەکە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا سووکتر دەبێت، جیابوونەوە لە چینی بنکەیدا روودەدات. (وێنەی ٤١٣)

د) **جۆری ئۆگنا** Ogna: بۆماوەیی لەشی زاڵە و بڵقی خوێنڕێژی و شینکی bruising سەراپایی روودەدات

.





(وێنەی ٤١٣)
تویژشیبوونەوەی بلقی تامیسکی.

**تێبینی:** جۆری زۆر دەگمەنی تریش هەن.

## ٢- جۆری لکێنی (پێکەنی) Junctional forms

بۆماوەیی لەشی بەزیوە، بڵق لە ناو بەرینەی (پەڕەی) روون lamina lucida دا دەردەچن ، جۆرەکانی:

أ) **توێژشیبوونەوەی بڵقی لکێنی** Junctional E.B: دەگمەنە، بڵق دروستبوونی توندی سەراپایی لە کاتی لەدایکبووندا هەیە و پێست بێ توێژە و رووت بۆتەوە(وێنەی ٤١٤) و لەوانەیە لە چەند مانگێکدا کوشندەبێت. کەمتر دەست دەگرێتەوە ،بەڵام دەوری دەم و لووت گۆشتەزوونەگمۆڵی ئەستووری لێ دێت، بڵقەکان لە دوایدا بێ جێ زام یان میلیا سارێژ دەبن بەڵام لەوانەیە داماڵان erosions چەند ساڵ بەردەوام بێت. ددانی بەد و شێواون و لەوانەیە دەردی قوڕگ و بۆری هەناسە منداڵەکە بخنکێنن، لەوانەیە ماکی سەراپایی وەك کیلەك، پەڕگلێنە و کیسی زراو هەبن، ئەو ساوایانەی کە دەژین بەدگەشەیی و کەمخوێنی بێ وەڵام refractory anaemia یان هەیە. بازدانی جینی $LAMA_3$، $LAMB_3$ یان $LAMC_2$ روودەدات.





(وێنەی ٤١٤) توێژشیبوونەوەی بلقی لکێنی.

ب) **تویژشیبوونەوەی بڵقی لکێنی لەگەڵ کوێربوونەوەی پاشۆڵی گەدە** Junctional E.B. with pyloric atresia: لە کاتی لەدایکبووندا بڵق دروستبوونی سەراپایی و ناسکبوونی ناوپۆش و پێست و داخرانی پاشۆڵی گەدە، روودەدەن.



(وێنەی ٤١٥)
تویژشیبوونەوەی بڵقی لکێنی
(جۆری پووکاوەی سەرا پایی بێوەی)

ج) **تویژشیبوونەوەی بڵقی پووکاوەی سەراپایی بێوەی** :Generalized atrophic benign E.B
لە کاتی لەدایکبووندا بڵق دروستبوونی سەراپایی و پووکانەوە و گرتنەوەی ناوپۆشەکان و تێکچوونی نینۆکەکان و ددان شێوان و مووڕووتانەوەی پووکانەوە atrophic alopecia هەن، زۆربەی نەخۆشەکان تا کاتی پێگەیشتوویی adulthood دەژین، بازدانی جینی $Col_{17}A_{I}$ کە بەرپرسیاری کۆلاجینی ١٧ یە روودەدات. (وێنەی ٤١٥)

د) **تویژشیبوونەوەی لکێنی جێ زامی** Cicatricial junctional EB: بڵقەکان بە جێ زام سارێژ دەبن و قرچۆکی contractures و پەنجە پێکەوەنووسان و تەسکبوونەوەی کونی لووت روودەدەن.

٣- **جۆری بنتویژشیبوونەوە یان بەدگەشەیی Dermolytic or dystrophic forms**
بازدانی جینی $Col_{7}A_{I}$ کە بەرپرسیارە بۆ کۆلاجینی ٧ روودەدات و وردەریشاڵی توندکەر anchoring fibris شێواون یان کەمن. دوو جۆری سەرەکین:

أ) **جۆری بۆماوەیی زاڵ** Dominant types: بڵق دروستبوون بە شێوەیەکی سەرەکی پەلەکان دەگرێتەوە و لە ساوایی یان منالیدا دەردەکەوێت، سارێژبوونی بڵقەکان جێ زام و میلیا جێ دەهێڵێت، لەوانەیە جێ زامەکان جۆری ئەستوور بێت hypertrophic scars، دەردی ناو دەم دەگمەنە و ددانەکان ئاسایین. (وێنەی ٤١٦)
جۆرێکیان لەکاتی لەدایکبووندا دەردەکەوێت و بڵق دروستبوون



(وێنەی ٤١٦) بنتویژشیبوونەوەی بۆماوەیی زاڵ.

بلاوتره و جێ زامی پووکاوەیی و میلیا جێ دەهێڵێت. تەنۆچکەی لە جێ زام چوو کە رەنگیان گۆشتییە بێ زەبر لە قەد دەردەچن، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بڵق تەنیا لە پەلەکان دەردەچن، نینۆك تێکچوون باوە، زۆربەی جار ناوپۆشەکان دەگرێتەوە بە شێوەی بڵق و بلۆق و داماڵان لە ناوپۆشی ناودەم و زمان و مەلاشوو و قوڕگدا.

ب) **جۆری بۆماوەیی بەزیوو** Recessive types

- جۆرێکی سووکی سنووردارە ، لە کاتی لەدایکبوودا دەردەکەوێت و پەلەکان دەگرێتەوە و جێ زامی پووکاوەیی لە پێستی سەر جومگەکان جێ دەهێڵێت و نینۆکەکانیش تێکدەچن، بەڵام بە کەمی ناوپۆشەکان دەگرێتەوە. (وێنەی ٤١٧ و ٤١٨)
- جۆری توند لە کاتی لەدایکبووندا بە شێوەی بڵق دروستبوونی سەراپایی و توندتربوونی، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، دەردەچێت و دوای سارێژبوون جێ زامی زەق جێ دەهێڵێت، پێکەوەنووسانی پەنجەکان مشتی دەست و پێی شێواو و لەکارکەوتوو دروست دەکات و لەوانەیە پرۆسەی جێ زام دروستبوونەکە درێژایی پەلەکان بگرێتەوە و شێوانی چەماوەیی هەمیشەیی پەلەکان دروست بکات.





(وێنەی ٤١٧)
بنتوێژشیبوونەوەی بۆماوەیی بەزیوو.

میلیا باوە، نینۆك و ددان و پێستی سەر دەگرێتەوە، زۆربەی ناوپۆشەکان تووشی بڵق و داماڵان دەبن و دەبێتە هۆی تەسکی سورێنچك و پەردە دروستبوونی نێوان بەشەکانی ناودەم و پێکەوەنووسانیان و کۆم و میزەجۆ تەسکبوونەوە و جێ زامی رووی چاو، بەدخۆراکی و بەدگەشەیی و کەمخوێنی درێژخایەن باون. شێرپەنجەی خانەی کاژی توند لە جێ زامی درێژخایەندا باوە و تەشەنە دەکات.



(وێنەی ٤١٨)
بنتوێژشیبوونەوەی بۆماوەیی بەزیوو لەگەڵ دروستبوونی ژمارەیەکی زۆر لە میلیا.

پشکنین:

١- نموونەوەرگرتن biopsy : بۆ زانینی ئاستی جیابوونەوە (بلّق دروستبوون).

٢- نەخشەی جینی genetic mapping و وردبینی ئێلیکترۆنی E.M.

٣- نەخشەی بەرگریە درەوشێ immunofluorescent mapping.

٤- چاندنی خانە cell culture.

## چارەسەر

چارەسەری بنەڕەتی نییە بۆیە، بەم شێوەیەی خوارەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێت:

١- چارەسەری پاڵپشتی supportive therapy: وەك دوورخستنەوەی زەبر، دابینکردنی ژینگەی فێنك، بەکارهێنانی پێڵاوی نەرمی تۆڕی (کون کونی) چەرمی، بلّقەکان بە سەلاین پاك بکرێنەوە و دژەبەکتریای جێیی وەك میوپایرۆسین یان ترشی فیوسیدیکی لێ بدرێت. بۆ دەردی سۆیی ستیرۆیدی جێیی بە کەمی بەکەڵکە، بۆ جۆری لکێنی و بەدگەشەیی توند بەکارهێنانی پێچانی نەنووساو nonadhering dressings وەك omniderm دوای لێدانی مەرهەمی ڤازلین یان ئەکوافۆر بەکەڵکن، دوای خۆشۆردنی لەسەرخۆ و پاکژکردنی پێستەکە ئیمۆڵیانت و پێچان سازدەدرێت.

بەکارهێنانی متوربەی خۆیی autograft بۆ شانەی گۆشتەزوونەگمۆڵی ئەستووری دەوری کونەکانی دەم وچاو لە جۆری لکێندا بەکەڵکە.

بۆ جۆری بەدگەشەیی، بەکارهێنانی پاڵپشتی شکاوی splints بۆ پەنجەکان و دوورخستنەوەی زەبر پێویستن. هەندێك جار بەکارهێنانی دژە بەکتریای سەراپایی پێویستە.

نەشتەرگەری بۆ پێکەوەنووسانی پەنجەکان و چەند جار دووبارەکردنەوەی پێویستە، راستکردنەوەی پەلە نوشتاوەکان، قرچۆکی دەوری دەم و کۆم و لابردنی شێرپەنجە.

بەکارهێنانی دژە ئارەقکردنەوە لە وەرزی گەرمادا وەك شلەی دریکلۆر $(Al\text{-}Cl_36H_2O)$.

بەکارهێنانی خانەی کاژی چێنراو کە لە پێستە ئاساییەکە وەرگیراوە و لە فشۆڵی کۆلاجین چێنراوە ،بۆ داماڵانی دەم وچاوی درێژخایەن بەکاردەهێنرێت.

پاڵپشتی خۆراکی بە دەم و بە خوێن وەك ئاسن بە دەم یان بە خوێن، پرۆتین، فراوانکردنی سورێنچکی نووساو – تاد.

٢- گرنگیدان بە ئەندامەکانی تر، جگە لە پێست.

٣- دەرمان وەك فێنیتۆین phenytoin، تێتڕاسایکلین و سیپرۆهیپتادین، بەڵام گومانی کاریگەرییان هەیە.

٤- چارەسەری جینی : دەرخستنی جینی لەبار بۆ پێستی تووشبوو یان لابردنی کاریگەری پرۆتینی بازدەر mutant proteins. ٥- هۆشیارکردنی نەخۆشییەکە لە کۆرپەلەی دروستبووشا و لەبەربردنی، بۆ جۆری لکێنی یان بەدگەشەیی توند

# نەخۆشی بڵقی Pemphigus

بریتییە لە کۆمەڵێك ناساغی بڵقی بەرگری دژە خۆیی لە پێست و ناوپۆشەکان کە تێیاندا بڵق دروستبوونی ناو توێژ بەهۆی جیابوونەوەی خانەکانی توێژ لە یەکتری (acantholysis) و لکینی ئیمیونۆگلۆبیۆلین G بە رووی خانەی کاژ و سووڕانەوەی لە خوێندا، روودەدات، چوار جۆری سەرەکی هەن:

١- **نەخۆشی بڵقی باو** P. vulgaris: لە نێرینە و مێینەدا،وەك یەك، لە ٤٠-٦٠ ساڵیدا روودەدات و لە گەنجدا دەگمەنە، لە جوولەکە و ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا باوترە، بە گشتی نەخۆشیەکی باو نییە، بەڵام مەترسیدارە و بێ چارەسەر زۆربەیان لە نزیکەی ١ ساڵدا دەمرن. هۆکارەکان نەزانراون، بەڵام نەخۆشیەکی بەرگری دژەخۆییە autoimmune disease. ئیمیونۆگلۆبیۆلینی G نەخۆشیهێن pathogenic لەگەڵ دژە ژیندەری دێسمۆگلاین ٣ desmoglein 3 لە توێژدا کە لە ناو دێسمۆسۆمەکاندایە یەك دەگرێت و خانە کاژەکان لە یەك جیادەبنەوە acantholysis و بڵق لە ناو توێژدا دروست دەبن.

لەوانەیە فاکتەری جینی گرنگ بێت، چونکە HLA جۆری DR4 و DR6 لە نەخۆشەکاندا لە ئاسایی پترە. (وێنەی ٤١٩)





(وێنەی ٤١٩) نەخۆشی بڵقی باو.

**نیشانەکان**: داماڵانی ناوپۆشەکان و شلە بڵقی flaccid bullae دیوار تەنك ،کە بە ئاسانی دەتەقێت، لە سەر پێستی ئاسایی یان سووربووەوە دەردەچێت، شلەی ناو بڵقەکان لە سەرەتادا روونە بەڵام دواتر دەبێت بە بڵقی خوێنڕێژی haemorrhagic یان کێمی و زەرداوی، بڵقەکان دەتەقن و داماڵان erosions جێ دەهێڵن و دەبن بە قەتماغەیی کە بە ئاسانی سارێژ نابن بەڵام کە سارێژبوون تۆخبوون جێ دەهێڵن، خورانیان نییە بەڵام بە ئازارن.

لە ٦٠٪ی بارەکاندا لە ناوپۆشی ناودەم دەردەچن یان لە جێگەی سووتان یان زەبر.لاران و پێستی سەر و دەموچاو و ژێرباڵ و کۆئەندامە سێکسیەکان پتر بڵقیان لێ دەردەچێت.

دیاردەی نیکۆلسکی Nikolsky sign پۆزەتیڤە (پەستان بە پەنجەگەورە لەسەر بڵقەکان بۆلایەك بڵقەکان بەرەو ئەم لایە دەکشێنێت) بەڵام پەستاینی ئەستوونی بۆ سەر بڵقەکان شلەی ناو بڵقەکان بۆ ژێر پێستی دەوری بڵاودەکاتەوە (نیشانەی ئەسبۆ-هانسن Asboe-Hansen sign).



(وێنەی ٤٢٠)
نەخۆشی بلقی باو (جۆری بلقی گەشەیی).

بڵقی ناوپۆشەکان تەمەنیان کورتە و خێرا دەتەقن و زۆربەی ناوپۆشەکە بە داماڵانی بەئازار دەگرنەوە، لێوەکان قەتماغەی ئەستووری درزاوی لێ دەردەچێت، بۆنی ناو دەم ناخۆشە، سورێنچك لەگەڵ پێڵووپۆش و ناوپۆشی لووت و کیلەك و چووك و کۆم دەگرێتەوە، دەردی درێژخایەنی لۆچەکان و دەم وچاو و پێستی سەر باون.

گرتنەوەی زۆربەی پێست دەبێتە هۆی پیسبوون sepsis یان ناهاوسەنگی شلە و خوێی لەش و لەوانەیە ببێتە هۆی مردن

- جۆرێکی ئەم نەساغیە بریتییە لە نەخۆشی بڵقی گەشەیی P. vegetans . (وێنەی ٤٢٠)، واتا دروستبوونی گەشەی قارچکی یان گۆگمۆلی لە شوێنی داماڵانی بڵقەکان لە لۆچەکان و پێستی سەردا، لەوانەیە ئەم جۆرە لە جۆری باودا دەربچێت یان هەر لەم شوێنانەی باسمانکرد بمێنێتەوە بێ ئەوەی جۆری باو لە شوێنی تردا هەبێت.





(وێنەی ٤٢١) نەخۆشی بلقی کاژی.

**٢- نەخۆشی بلقی کاژی P. foliaceous:**

ناوپۆشەکان ناگرێتەوە، داماڵانی قەتماغەیی کاژی لەسەر پێستی سووربووەوە لە شوێنی(رووبەرەکانی) چەورەبرۆ seborrhoeic areas دەردەچێت، وەك پێستی سەر، دەموچاو و سەرەوەی قەد. دەردی سەرەتایی بریتییە لە شلە بڵقی بچووك کە بە ئاسانی نابینرێن، لەوانەیە ناساغیەکە بۆ چەند ساڵێك بە سنووورداری بمێنێتەوە یان بە کتوپڕی بڵاوبێتەوە بە شێوەی سەراپایی و پێستەسوورێی کاژەوەری exfoliative erythroderma دروست بێت.

بەرکەوتنی خۆر وگەرما نەخۆشیەکە دەورووژێنێت، ئازار و سووتانەوە و هەندێك جارخوران، هەن. باری نەخۆش لە جۆری باو باشترە(وێنەی ٤٢١).

٣- **نەخۆشی بلّقی سووریٚ** P. erythematosus: جۆرێکی سنوورداری بلّقی کاژێیە ، واتا دەردی نموونەیی جۆری کاژێ وەك قەتماغە و کاژ و هەندێك جار زێدەقۆچەکاژی لە کولّم و پردی لـووت و هەندێك جار پێستی سـەر و بەشـی سـەرووی قـەددا دەردەچـێت، هەنـدێك جـار بـە هـەموو لـەشـدا بلاّودەبێتەوە. لە نموونە وەرگرتندا لە ٨٠٪ی بارەکاندا نیشانەکانی نەخۆشی گورگەسـوورەی (واتـا lupus Band یان دژەتەنی دژەناوکی ANA) تێدایە.

٤- **نەخۆشی بلّقی کۆرپەیی ( تازەبوو )** Neonatal P.: ئەو کۆرپانەی (تازەبووانەی) دایکـەکانیان نەخۆشی بلّقی باویان هەیـە، ئـەم جـۆرە باوەیـان تێـدا دەردەکـەوێت و ئەگـەر نـەمردن کاتێـك کـە دژەتەنەکانیان لە خوێندا دارمان (لەناوچوون) catabolized چاك دەبنەوە.

٥- **نەخۆشی بلّقی دەرمـانی( چـارەکردە )** Drug induced P.: پێنیسـیللامین و کاپتۆپریـل پـتر نەخۆشی بلّقی کاژێ دروست دەکەن، بەلاّم دەرمانی تریش وەك ئینالاپریل، پێنیسـیللین، ثـایـۆپرۆنین، ئینتەرلیوکین II، نیفیدیپین و ریفامپیسین نەخۆشی بلّقی باو دروسـت دەکـەن، دوای دوورخسـتنەوەی دەرمانەکان نەخۆشیەکە نامێنێت بەلاّم لـەوانەیە دوای چەند مانگێك بێت.

- لـەوانەیە فرەبێهێزی ماسولکە myasthenia gravis یـان ژێرکۆلّەگلانـدەگمۆلّ thymoma لـەگەلّ نەخۆشی بلّقی باو بە یەکەوە هەبن.

٦- **نەخۆشی بلّقی شێرپەنجەیی** ParaneoplasticP : واتا دەرچوونی نەخۆشی بلّقی لـەگەلّ شـێواویەکانی پەرەسـەندنی لیمفـی lymphoproliferative disorders وەك لیمفۆمـای نـاهۆجکنی، شـێرپەنجەی خانـەی لیمفـی درێژخایـەن، ژێرکۆلّەگلانـدەگمۆلّ thymoma و سـارکۆمای ژێـر هـەناو پـۆش retroperitoneal S.. نیشـانەکان بـریتین لـە ناوپۆشەسۆی توند و داماڵانی پانەپێستەسـتووریی lichenoid erosions و سووربوونەوەی فرەشێوەیی و نەخۆشی بلّقـی بـاو – تـاد. (وێنەی ٤٢٢)










(وێنەی ٤٢٢)
**نەخۆشی بلّقی شێرپەنجەیی بەهۆی لیمفۆما.**

## چارەسەر

أ) چارەسەری ناوچەیی

- لابردنی قەتماغە ئەستوورەكان لەباری بلاودا بە شۆردنی درێژخایەن و بەكارهێنانی سیلڤەر سەلفادایازین silver sulfadiazine ١٪. بۆ لێو تێكەڵەی مالۆكس maalox + بینادریل benadryl. پاكژكەرە جێیەكان و ستیرۆید و تاكرۆلیمۆسی جێیی بۆ باری سووك.
- دژەبەكتریا بۆ تووشێنی دووەمی بە بەكتریا، دژەئازار، دژەكاندیدا ئەگەر ناودەم تووشێنی كاندیدای هەبوو.

ب) چارەسەری سەراپایی

**تێبینی:** تا چارەسەری سەراپایی زووتر و بە ژەمی تەواو بدرێت ئاكامی نەخۆشیەكە باشترە و لەوانەیە هەندێك بار بە هەمیشەیی چاك ببنەوە.

**هەنگاوی یەكەم:** ستیرۆیدی سەراپایی بە تەنیا وەك پریدنیزۆلۆن ١ ملگم/١كگم/رۆژ بۆ ٢–٣ مانگ یان تا سكالاو نیشانەكان بەرەو نەمان دەچن، ئەوسا بۆ ٤٠ ملگم/رۆژ كەم بكرێتەوە، ئەوسا لە ٦–٩ مانگدا بە لەسەرخۆیی بۆ ٥ ملگم/ بە دوو رۆژجارێك كەم بكرێتەوە.

- زۆر نزیكە فشۆڵی ئێسك osteoporosis بەم ژەمە بەرزە دروست بێت، بۆیە كالسیۆم١٥٠٠ ملگم/رۆژ لەگەڵ ڤیتامین D ٤٠٠–٨٠٠ یەكە/رۆژ پێویستە بدرێت.

**هەنگاوی دووەم:** لەگەڵ ستیرۆیدی سەراپایی، مایكۆفینۆلەیت مۆفیتیل mycophenolate-mofetil ١,٥ گرام×٢/رۆژ، دوای ٢–١٢ مانگ كاریگەریەكەی دەردەكەوێت و بۆ ٢–٣ ساڵ دەدرێت. یان ستیرۆیدی سەراپایی + ئازاثایۆپرین azathioprin ٣–٥ ملگم/كگم/رۆژ، دوای ٦–٨ حەفتە كاریگەری دەردەكەوێت و بۆ٢–٣ ساڵ دەدرێت.

**تێبینی:** دەبێت چاودێری ماكەكانی ئەم دەرمانانە بكرێت بە پشكنینی تاقیگە بە رێك وپێكی، وەك باری بەشەكانی خوێن، كاری جگەر و گورچیلە – تاد.

**هەنگاوی سێیەم:** ژەمی بەرزی ئیمیونۆگلۆبیولین بە خوێن IVIG ٢ گرام/كگم بە ژەمی جیاجیا بە خوێن لە ماوەی ٢–٥ رۆژدا مانگی جارێك + ستیرۆیدی سەراپایی + ئازاثایۆپرین یان مایكۆفینۆلەیت مۆفێتیل. چاودێری خوێنمەیین پێویستە.

**هەنگاوی چوارەم:** بەكارهێنانی ریتوكسیماب rituximab [(بۆ كەمكردنەوەی خانەی لیمفی B ($CD_{20}^{+}$)]، كاریگەریەكەی ٦–١٠ مانگە، هەنگاوی چوارەم لەگەڵ ئەوانەی سەرەوە بە یەكەوە بۆ باری توند و بێ وەڵام refractory cases ،بەكاردەهێنرێت.

**هەنگاوی پێنجەم:** سایكلۆفۆسفەمایدcyclophosphamide بۆ باری بێ وەڵام بەم جۆرە:

١–بە دەم ٢,٥ ملگم/كگم/رۆژ بەیانیان بە یەك ژەم و لە ١٨–٢٤ مانگدا نەخۆشیەكە كۆنترۆڵ دەكات، بەڵام ماكی بەدی هەیە وەك شێرپەنجەی خوێن و میزەڵدان و خانەی لیمفی، لەوانەیە ئەم ماكانە دوای ٢٠–٣٠ ساڵ لە بەكارهێنانی دەركەون.

٢-مانگانه به خوێن به ژەمی ٧٥٠ ملگم/مەتر دووجا.

٣-مانگانه یەك ژەم به خوێن + ژەمی کەمتر به دەم رۆژانه.

٤-ژەمی زۆر بەرز ٢٠٠ ملگم/کگم لە ٤ رۆژدا یەك جار.

**هەنگاوی شەشەم:** گۆڕینی زەرداوی خوێن plasmapheresis: بۆ لابردنی دژەتەنە خۆییەکان auto-antibodies. بۆ باری بڵاو و توند به لابردنی ٣-٣,٥ لیتر بۆ هەر جارێك حەفتەی ٣ جار بۆ ٢ حەفتەی دوای یەك + ستیرۆیدی سەراپایی + سایکلۆفۆسفئەماید.

**تێبینی:**. بۆجۆری سنووردار، ستیرۆیدی جێیی هەندێك جار بەسە و پاراستن لە خۆر بۆ جۆری بڵقی سووری پێویستە. بۆ جۆری بڵقی کاژی ژەمی کەمتر بەسە.

# نەخۆشی بڵقەگمۆڵ Pemphigoid

نەخۆشیەکی بڵقی ژێرتوێژە sub-epidermal blistering، پتر لە پیری سەرووی ٦٠ ساڵیدا هەیە و دەگمەنە (٧ کەس/١ ملیۆن/ساڵ) . تێیدا بڵقی بەتینی (پتەوی) tense گەورە و نیشتنی تەواوکەری ٣ "C3"و IgG لە ناوچەی پەردەی بنکەیی توێژدا روودەدات.

نەخۆشی بەرگری دژەخۆییە . زەرداوی خوێن لە ٧٠٪ بارەکاندا دژەتەنی تێدایە ،کە لەگەڵ پێستی ئاساییدا لە ناوچەی پەردەی بنکەیی توێژدا یەك دەگرێت، بەڵام ئاستی دژەتەنەکان لەگەڵ چالاکی ناساغیەکەدا نایەتەوە.

IgG لەگەڵ دوو دژەژێندەری سەرەکی یەك دەگرێت، یەکەمیان بە شێوەیەکی سەرەکی (کە بریتییە لە $BP_{230}$ کە لە ناو بەشی خانەیی نیوە دیسمۆسۆمەکانە) و کەمتر لەگەڵ دووەمیان(کە بریتییە لە $BP_{180}$ کە گەردی لکێنی نیوە دیسمۆسۆم و بەرینەی روونە) ئەوسا تەواوکەر چالاك دەبێت و سۆ روودەدات و خانەی ماست دەنکۆڵەکان فرێ دەدات و گوێزەرەوەی سۆ فرێ دەدرێن.





(وێنەی ٤٢٣) نەخۆشی بڵقەگمۆڵ.

- لە نموونە وەرگرتندا بڵقی ژێر توێژ هەیە ،کە پڕە لە خانەی ئیۆزینۆفیل. دژەتەنە درەوشێی راستەوخۆ "DIF" پەتێکی هێڵی لە IgG و C3 لە بەشی پەردەی بنکەیی توێژ نیشان دەدات، بەڵام بە دژەتەنە درەوشێی ناڕاستەوخۆ "IIF" بە بەکارهێنانی زەرداوی خوێنی نەخۆش دەبینین کە IgG لە ٧٠٪ بارەکاندا پۆزەتیڤە.

**نیشانەکان**: بڵقی پتەوی گەورە پتر لە لاڕانوژێرباڵ و قەد و ڕان و بەشی ناوەوەی باسکەکان دەردەچێت. دوای تەقینی بڵقەکان پارچەی رووتبووەوەی گەورە دێنە کایەوە بەڵام گەورەتر نابن وەك نەخۆشی بڵقی و ئاسانتر جێگاکانیان ساڕێژ دەبن، لەوانەیە جگە لە بڵق پارچەی سوور و قوتکەی لیری هەبن کە لە ناوەندەکانیان ساڕێژ دەبن و لەوانەیە لە سەرەتادا بێ بڵق دەربچن ،بەڵام دواتر بڵق لەسەریان دروست بێت، هەندێك جار دەردی نیشانەیی targetoid هەن. (وێنەی ٤٢٣)

هەندێك جار بڵقەگمۆڵ لە پەڵەکانی خوارەوەدا دەست پێدەکات و لەوانەیە هەر بە سنوورداری، تا چەند ساڵ، بمێنێتەوە یان ببێت بە جۆری بڵاوبووەوە.

هەندێك جار جۆری دەگمەنی تر وەك جۆری منالێ یان جۆری کیلەکی یان بلۆقی یان بڵقی گەشەیی vegetans یان پێستەسوورێیی erythrodermic یان جۆری لەگەڵ پانە پێستەستوورێ، هەن.

لە ٢٠-٣٠٪ی بارەکاندا ناودەم بە سووکی دەگرێتەوە، نیشانەی نیکۆلسکی نێگەتیڤە.

لە ٥-٦ ساڵدا بە هەمیشەیی سارێژ دەبێت، بەڵام لە منداڵدا لە ساڵێك كەمتر دەمێنێتەوە.

**چارەسەر**

١- بۆ باری سنووردار، ستیرۆیدی جێیی یان بە دەرزی بۆ ناو دەردەكان كاریگەرە.

٢- ستیرۆیدی سەراپایی ٤٠—٨٠ ملگم/رۆژ، دوای كۆنترۆڵكردنی نەخۆشییەكە ژەمەكە كەم دەكرێتەوە و هەندێك جار لە باری سووك دا دەبڕین.

٣- ئازاثایۆپرین یان مایكۆفینۆلەیت مۆفێتیل لەگەڵ ستیرۆیدی سەراپایی.

٤- تێتراسایكلین ٥٠٠ ملگم × ٤/رۆژ بە تەنیا یان لەگەڵ نیكۆتین ئەمایدی ٥٠٠ ملگم × ٣/رۆژ ،كاریگەرن.

٥- میثۆتریكسەیت، سایكلۆفۆسفەمماید، سایكلۆسپۆرین، گۆڕینی زەرداوی خوێن، IVIG، كلۆرامبیوسیل، ئیریثرۆمایسین،ماینۆسایكلین، داپسۆن هەندێك جار بەكار دەهێنرێن.

## بڵقەگمۆڵی سكپڕی (تامیسكی سكپڕی)

## Pemphigoid gestationis (Herpes-gestationis)

بریتییە لە نەخۆشییەكی بڵقی قڕاشیۆوەیی زۆرتوێژی سۆتی بەخووڕووی ژنی سكپڕ و دوای منداڵبوون، ئەگەری ١:١٧٠٠-١٠٠٠٠ منداڵبوونە و پتر لە ناوەڕاستی سكپڕیدا و دوای منداڵبوون تا ٣ مانگ روودەدات. لەوانەیە لە سكپڕی داهاتوودا یان دوای وەرگرتنی حەپلەی نەزۆكاندن یان كاتی تێكەوتن دووبارەبێتەوە ، هەندێك جار لەگەڵ بوونی شێرپەنجەی وێڵاش choriocarcinoma یان هێشووییەگمۆڵ hydatiform mole روودەدات.



(وێنەی ٤٢٤) تامیسكی سكپڕی.

ئەم نەخۆشییە بەرگری دژەخۆییە ، بە گوێزەری دژەتەنی (IgG) لە خوێندا و لە بەرینەی رووندا دەنیشێت، هەردوو $IgG_1$ و $IgG_2$ رۆڵ دەبینن، تەواوكەری C3 لە ناوچەی پەردەی بنكەی توێژ لە پێستی ئاسایی و ناساغدا دەنیشێت و سۆ دروست دەبێت. (وێنەی ٤٢٤)

**نیشانەكان:** بە تەنۆچكە و قوتكەی لیری لە دەوری ناوك و پەلەكان دەست پێدەكات، هەندێك جار دەردی نیشانەیی هەن، ئەوسا بۆ سك و پشت و سنگ و پەلەكان و بەری دەست و پێ بڵاودەبنەوە، بەڵام پێستی سەر و دەم وچاو و ناودەم ناگرێتەوە. لەسەر قوتكەسوورە تەنراوەكاندا بلۆق و

بلّق پڕ بە شێوەی بازنەیی و فرەکەوانەیی دەردەچن، خوران زۆرە، دوای منداڵبوون توند دەبێت و لە ٣ مانگدا نامێنێت، کۆرپە لەبەرچوون روونادات.

چارەسەر:

١- پریدنیزۆلون ٢٠-٤٠ ملگم/رۆژ.
٢- دژەهیستامین + ستیرۆیدی جێیی بۆ باری سووك.
٣- دوای منالبوون ژەمی پریدنیزۆلون پڕ دەکرێت. دواتر کەم دەکرێتەوە و ئەوسا دەوەستێنرێت.
٤- دوای منالبوون ئازاثایۆپرین، سایکلۆفۆسفئەماید، داپسۆن، میثۆترێکسەیت، IVIG و گۆڕینی زەرداوی خوێن plasmapheresis یان تێتراسایکلین + نیکۆتینئەماید هەندێك جار بەکاردەهێنرێن.

## بلقەگمۆڵی جێزامێن Cicatricial pemphigoid

وەك بلقەگمۆڵە، بەڵام تووشی ناوپۆشەکان دەبێت وەك پێڵووپۆش، ناودەم و ڕێگەی کۆئەندامی سێکسی genital tract و هەندێك جار پێست.
(وێنەی ٤٢٥)

دەردەکان بە جێ زام سارێژ دەبن و لە چاودا لەوانەیە کوێری دروست بکات، لەوانەیە ئەم ناساغیە بەردەوام بێت و زۆر جار بۆ چارەسەر بێ وەڵامە . چارەسەر: بریتییە لە ستیرۆیدی جێیی بەهێز و سەراپایی و بەرگری کپکەرەکان.




(وێنەی ٤٢٥) بلقە گمۆڵی جێزامێن.

## توێژشیبوونەوەی بلّقی وەرگیراو (دەستکەوتە) Epidermolysis bullosa acquisita

بریتییە لە ناساغیەکی بلّقی ژێر توێژی درێژخایەن لە پێگەیشتوودا adulthood کە تێیدا بەرگری دژە خۆیی بۆ کۆلاجینی ٧ (VII) لە ناو وردەڕیشاڵی توندکەر anchoring fibrils لە لکینی بن توێژ و توێژدا روودەدات.

هەل ومەرجی دەستنیشانکردن ئەمانەن:

١- دەردەکان وەك توێژشیبوونەوەی بەدگەشەیین dystrophic E.B. واتا پێست ناسکبوون، بڵق و داماڵان بە زەبر، جێ زامی پووکاوە و میلیا و نینۆك تێکچوون.

٢- لە پێگەیشتوودا دەردەچێت.

٣- مێژووی خێزانی بۆماوەیی نییە.

٤- لابردنی ئەگەری نەخۆشیە بڵقیەکانی تر پێویستە.

٥- بوونی IgG لە ناوچەی پەردەی بنکەی توێژدا بە دژەتەنە درەوشێی راستەوخۆ DIF (لە ژێر بەرینەی خەستدا).

٦- بڵقەکان لە ژێر بەرینەی خەست lamina densa.

هەندێك جار نەخۆشی سەراپایی تر لەگەڵیدا هەن، وەك مۆخەگمۆڵ myeloma، ریخۆڵە ئەستوورەسۆی گۆشتەزوونەگمۆڵی granulomatous colitis، نەخۆشی شەکرە، لیمفۆما، شێرپەنجەی خوێن leukemia، نەخۆشی ئەمیلۆید amyloidosis و شێرپەنجەی تر(وێنەی ٤٢٦).


(أ)


(ب)


(جـ)


(د)

(وێنەی ٤٢٦)

ا توێژشیبوونەوەی بلقی وەرگیراو لەگەڵ میلیا.
ب) بلقە گمۆڵ ئاسا. جـ) بلقە گمۆلی جێزامێن ئاسا.
د) بلقە گمۆلی جێزامێن ئاسا.

چارەسەر: ١- لابردنی هۆکار، ئەگەر هەبوو.

٢-ستیرۆیدیی سەراپایی، بە تەنیا یان لەگەڵ ئازاثایۆپرین یان داپسۆن یان مایکۆفینۆلەیت موفێتیل.

١- سایکلۆسپۆرین، IVIG ،کۆلچیسین، گۆرینی زەرداوی خوێن و داکلیزوماب daclizumab.

## پێستەسۆی تـامیسکی ( نەخۆشی دەهرینگ = نەخۆشی ئەییوب )

Dermatitis herpetiformis (Duhring's Disease)

بریتییە لە ناساغیەکی زۆر بەخورووی درێژخایەن و سەرهەڵداوە کە تێیدا دەردی بلـۆقی تەنۆچـکەیی چونیەکی بە کۆمەڵ ،لەسەر بەشی دەرەوەی پەلەکان و پێستی سەر و پشتی مل و سمت و ئانیشك و ئەژنۆ و شان و بڕبڕەی سمت sacral area و دەم وچاو و هێڵی دەم وچاو دەردەچن، لەوانەیە لەبـەری دەسـت و پەنجەکان دەردی هێڵی خوێنڕێژی هەبێت، ناوپۆشـەکان بـە دەگمـەن دەگرێتـەوە. چـونکە ناسـاغیەکە زۆر بەخورووە جێ خوران و رووشان و تۆخبوون و کاڵبوونی رەنگی پێست زۆرباون. دەردەکـان پـتر لـە سـەر پێستی سووربووەوە دەردەچن و لەوانەیە تەنۆچـکەیی، تەنۆچـکەیی بلۆقی، بلۆقی بلّقی، بلّقی یان لیری بن. (وێنەی ٤٢٧)



(وێنەی ٤٢٧) نەخۆشی ئەییوب.

خوران و سووتانەوە بـە تـەوژمن و دەبنـە هـۆی رووشـان و خـوێنڕێژی و هەنـدێك جـار جـێ زام دروسـت بـوون، لـەخۆوە کپبوونەوە بۆ نزیکەی یەك حەفتە و دوابەدوایدا لەپڕ سەرهەڵدانەوە زۆر باوە. زۆر درێژخایەنە و لـە هـەموو تەمەنێکـدا دەردەچـێت ، بەڵام پتر لە ٢٠-٤٠ ساڵیدا و لە منداڵیشدا هەیە و نێر و مـێ وەك یەك تووشیان دەبێت. ئەگەری نەخۆشیەکە ١٠-٤٠ کەسە لە هەر ١٠٠,٠٠٠ کەسـدا و لەوانـەی $HLA\text{-}B_8$، $DR_3$و DQw2 یان هەیە پترە.

مژادی گلوتین gluten کە لە دانەوێڵـەدا هەیـە (جگـە لـە برنج و گەنمەشـامی) ناسـاغیەکە تونـدتر دەکـات و رێـژەی ٧٠-١٠٠٪ی نەخۆشەکان ریخۆڵە باریکەیان نائاساییە بەڵام بێ سکالایە (رەوانی و قەبزی و بەدهەڵمژین وەك لە نەخۆشی سکی .coeliac ds دا نین).

هۆکاری ئەم ناساغیە مژادی گلوتینە لە دانەوێڵەدا و دوای هەڵمژینیی بۆ ناو خوێن رۆڵـی دژەژێنـدەر دەبینێت و ئاوێتەی بەرگری دروست دەبێت و لە پێستدا جێگیر دەبێت، نیشتنی دەنکۆڵەیی IgA و C3 لە بەشی سەرەوەی توێژ لە ژێر پـەردەی بنکەییـدا هەیـە و سۆ دروسـت دەکـات و توێـژ و بـن توێـژ لەیـەك جیادەکاتەوە (بلّق یان بلۆق دروستبوون)، دوای بەکارهێنانی خۆراکی بێ گلوتین ئەم گۆڕانکاریانـە نـامێنن. تەنیا ١٠-٢٠٪ یان لـەخۆوە چاك دەبنەوە.

لە نموونە وەرگرتندا بلۆق لە لکینی توێژ و بن توێژدا و تەنینەوەی نیوترۆفیل لە لوتکەی گۆی توێـژدا دەبینرێن. بە دژەتەنە درەوشێی راستەوخۆ "DIF" نیشتنی دەنکۆڵەیی IgA لـە لوتکـەی گـۆی توێـژدا لـە پێستی دەوری دەردەکان دیارن. بەڵام لە ریخۆڵەدا تەنیا ٢/٣ی نەخۆشەکان پووکانـەوەی گـۆی ریخۆڵـەیان villous atrophy هەیە. ئەم نەخۆشیە دەیان ساڵ دەمێنێتەوە.

چارەسەر

١- داپسۆن dapson، بە ژەمی ٢٥ ملگم/ ڕۆژ ئەوسا بۆ ٥٠-٣٠٠ ملگم/ڕۆژ پتر بکرێت دواتر بۆ ١ ملگم/کگم/ڕۆژ کەم بکرێتەوە، بۆ منداڵ ژەمی کەمتر دەدرێت. ماکەکانی ئەم دەرمانە بریتین لە دەردی پێستی skin rashes، کەمخوێنی تێکشکانی، کەمبوونی خانەی سپی leukopenia کەمبوونی خەپلەخوێنە، مێتهیمۆگلۆبیولینیمیا methaemoglobulinaemia (هیمۆگلۆبینی ئۆکسێندراو لە خوێندا) و دەردی دەماری پەڕی periphral neuropathy.

٢- سەلفاپایریدین sulfapyridine، لە سەرەتادا ژەمی ٥٠٠ ملگم × ٣/ڕۆژ دەدرێت دواتر ژەمەکە بۆ ١,٥ گم × ٣/ڕۆژ پتردەکرێت.

٣- نیکۆتینئەماید + تێتراسایکلین، هیپارین، سایکلۆسپۆرین، کۆلچیسین و ستیرۆیدی سەراپایی.

٤- هەندێك جار ستیرۆیدی جێیی لەگەڵ داپسۆن.

٥- دەرمانی ئارامکەرەوە و دژەهیستامین.

٦- خۆراکی بێ گلوتین لە لایەن پسپۆری خۆراك dietician. گەنم و جۆ و بیرە لە خواردنە دووربخرێنەوە، بەڕوو بە مامناوەندی مەترسی نییە، برنج و گەنمەشامی بۆخواردن بەکاردەهێنرێن ئەگەر گلوتین لە خواردەمەنیدا نەدرێت ئەوە ژەمی داپسۆن بە کەمتر لەوەی سەرەوە بۆ کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشیەکە بەسە و کەم جار بێ داپسۆن کۆنترۆڵی دەکات، دوای ماوەیەکی درێژ دەتوانین لە هەندێك باردا بە کەمی گلوتین بدەینەوە بە نەخۆش بێ ئەوەی زیانی هەبێت.

## هێڵە پێستەسوی IgA   Linear IgA dermatosis

بریتییە لە پێستەسوی بڵقی بەرگری دەگمەن کە تێیدا نیشتنی ڕێکی IgA لە پەردەی بنکەیی توێژ هەیە و نیشانەکانی وەك پێستەسوی تامیسکی، بڵقەگمۆڵ یان توێژشیبوونەوەی وەرگیراوە،بەڵام خوران لە پێستەسوی تامیسکی کەمترە . زۆرجار دەرمان وەك ڤانکۆمایسین، لیثیۆم، ئەمیۆدارۆن، کاربامازیپاین، کاپتۆپریل، پێنیسیللین، PUVA، فروسیمايد، ئینتەرفیرۆن، دایکلۆفیناك - تاد دروستی دەکەن، هەندێك باری تر بەهۆی شێرپەنجە یان نەخۆشی بەستەرەشانە دروست دەبن. (وێنەی ٤٢٨)


(وێنەی ٤٢٨) هێلە پێستەسوی IgA

چارەسەر

هۆکارەکەی لابرێت و داپسۆن یان ستیرۆیدی جێیی و سەراپایی یان تێتراسایکلین لەگەڵ نیکۆتینئەماید یان مایکۆفینۆلەیت مۆفێتیل، IVIG، کۆلچیسین یان تێتراسایکلین بەکاردەهێنرێن.

## هێڵە پێستەسۆی IgA منداڵ (بڵقە پێستەسۆی درێژخایەنی منداڵ)

Childhood linear IgA disease (Chronic bullous dermatosis of childhood)

نەخۆشیەکی وەرگیراوی لەخۆوە چاکبووەوەیە self-limited کە لە ٥ ساڵیدا (هەندێك جار ٢-٣ ساڵی تەمەندا) دەردەکەوێت و پێش تەمەنی ١٣ساڵی نامێنێت. (وێنەی ٤٢٩)

بڵق لەسەر پێستی ئاسایی یان سووربووەوە بەتایبەتی خوارەوەی قەد، سمت، کۆئەندامی سێکسی و ران دەردەچن، دەردی دەوری دەم و پێستی سەر باون و لە ٧٠٪ی بارەکاندا ناپۆشی دەم دەگرێتەوە.

زۆربەی جار بڵقەکان بە شێوەی بازنەیی و ریزی (ملوانکەیی) دەردەچن و زۆربەخوروون. لە نموونەوەرگرتن دا بڵقی ژێر توێژی پڕ لە خانەی سپی دیارە و بە دژەتەنە درەوشێی راستەوخۆ DIF نیشتنی هێڵی IgA لە پەردەی بنکەیی دا دەردەخات هەروەك هێڵەپێستەسۆی IgA (سەرەوە) و لە زەرداوی خوێندا لە ٥٠٪ی بارەکاندا IgA بە ئاستێکی کەم هەیە.

### چارەسەر

١- داپسۆن، سەلفاپایریدین.

٢- ستیرۆیدی جێیی بەتەنیا یان لەگەڵ ستیرۆیدی سەراپایی.

٣- مایکۆفینۆلەیت مۆفێتیل، کۆلچیسین یان دایکلۆکساسلین.




(وێنەی ٤٢٩) هێڵە پێستەسۆی IgA منداڵ.

## نەخۆشی بڵقی خێزانی بێوەی (نەخۆشی هەیلی هەیلی)

Familial benign pemphigus (Haily-Haily disease)

بریتییە لە نەخۆشیەکی بۆماوەیی لەشی زاڵ (لە ٧٠٪ بارەکاندا) کە تێیدا داماڵان و بلۆقی سەرهەڵداوە بە تایبەتی لە لۆچەکاندا دروست دەبن، لە ١١ ساڵی تەمەندا یان دواتر دەردەکەوێت و پتر لە ٢٠-٤٠ ساڵیدا بە سکالآیە. دەردەکان پتر لە ژێر باڵ و لاران و ژێر مەمك و مل دا هەن،بەلآم قەد و لۆچی ئانیشك و ئەژنۆ یان شوێنی چەورەبیرۆش وەك پێستی سەر تووشیان دەبیت. ناوپۆشەکان بەدەگمەن دەیگرن. دەردەکان بە شێوەی شلەبڵق و بلۆق لە سەر پێستی سووربووەوە دەردەچن و دواتر قوتکەی داماڵراو و درزاوی پەیدا دەبن. دواتر قەتماغە و کاژ و زلبوون hypertrophy و دەردی گەشەیی دەردەکەون. دەردەکان بۆ پەڕ دەکشێن و شێوەی بازنەیی و فرەکەوانەیی دروست دەکەن، سەرهەڵدانەوە باوە و بێزاری و بۆگەن بەتایبەتی بە وەرزی گەرما و ئارەقکردنەوە یان لێخشانی جل و بەرگ دێنەکایەوە. درێژخایەنە و سەرهەڵداوەیە، بەلآم لەگەڵ تەمەندا سووکتر دەبێت. میکانیزمی پەمپی کالسیۆم تیکچووە، لە نموونە وەرگرتندا وەك نەخۆشی داریەر یان گرۆڤەرە. (وێنەی ٤٣٠)



(وێنەی ٤٣٠)
نەخۆشی هەیلی هەیلی.

**چارەسەر**

١- دژە بەکتریا وەك فیوسیدیك ئەسید، تێتراسایکلین، دژەکەندیدا وەك کلۆترایمازۆڵ (جێیی)، تێتراسایکلین بە دەم، ئەگەر تووشێنی تامیسك هەبوو ئەسایکلۆڤیر دەدرێت.

٢- دژە بەکتریا + ستیرۆیدی جێیی.

٣- تاکرۆلیمۆس ، کالسیتریۆل، ستیرۆیدی سەراپایی بۆ باری بلآو، داپسۆن، سایکلۆسپۆرین.

٤- پێست تاشین dermabrasion، برین بە نەشتەرگەری، لەیزەری $CO_2$، ژەهری بوتیلینەم A، botulinum toxin A، میثۆتریکسەیت، ریتینۆید بە دەم و ئارەق کەمکەرەوەکان.

## کێمە پێستەسۆی ژێر چینی کاژی Subcorneal pustular dermatosis

بریتییە لە پێستەسۆی کێمی هۆنەزانراوی درێژخایەن، بەتایبەتی لە تەمەنی ناوەڕاستدا و پتر لە مێینەدا هەیە. نیشانەکان بریتین لە شلەپیزۆکە و پیزۆکە و بلۆقی رووکەشی و بازنەیی کە بە کۆمەڵ لە قەد و لوچەکاندا دەردەچن، کپ دەبێتەوە و سەرهەڵدەداتەوە، هەندێك بار لەگەڵ مۆخەگموۆڵ myeloma و دەردەگاما (جۆری IgA gamopathy دا هەن، لە نموونە وەرگرتندا پیزۆکەکان لەژێر چینی کاژیدان و پڕن لە خانەی سپی (نیوترۆفیل). (وێنەی ٤٣١)





(وێنەی ٤٣١)
کێمە پێستەسۆی ژێر چینی کاژی.

چارەسەر:

١- ستیرۆیدی جێیی، داپسۆن ٥٠-٢٠٠ ملگم/رۆژ، سەلفاپایردین.

٢- ئەسیترێتین acitretin، تیشکی سەرو وەنەوشەیی تەسك، کۆڵچیسین یان ئازیثرۆمایسین، تێتراسایکلین + نیکوتینئەماید.

٣- ئینفلیکسیماب، تاکالسیتۆل، کیتۆکۆنازۆڵ، ڤیتامین E - تاد.

(وێنەی ٤٣٢) نەخۆشی گروڤەر.

## نەخۆشی دڕکەخانە جیابوونەوەی کاتی (نەخۆشی گرۆڤەر)

Transient acantholytic dermatosis (Grover's disease)

بریتییە لە پێستەسۆی فرەشێوەیی بەخوروو کە تێیدا تەنۆچکە و پیزۆکە و قوتکەی بیرۆیی و تەنۆچکەی بالووکەیی یان گرێۆکەی رووشێنراو لە قەد و مل و سەرەوەی پەلەکان و ژێر مەمك دا دەردەچن و لەوانەیە تا چەند مانگێك سەرهەڵدەنەوە. سەروو تەمەن ٥٠ساڵ تووشی دەبن. (وێنەی ٤٣٢)

لە نموونەوەرگرتندا دڕکەخانەکانی توێژ جیادەبنەوە acantholysis.

چارەسەر:

١- دوورکەوتنەوە لە گەرمی و ئارەقکردنەوە.

٢- ستیرۆیدی جێیی یان سەراپایی.

٣- ڤیتامین A، ئەسیترێتین، ئایزۆترێتینۆین یان PUVA.

# چلمیین Mucinosis

مژادی چلم mucin بریتیە لە گلایکۆسەمینۆگلایکانس glycosdaminoglycans ((واتا ئەسیدمیوکۆپۆلیسەکەرایدەکان acid-mucopolysaccharides))ی مژادی زەمینی (ناواخنە) ground-substance و لەوانەیە رۆڵ لە ئاڵوگۆڕی exchange بەرهەمی زیندەچالاکی metabolites دەرەکی لە بۆریەخوێنەکان ببینێت، ئەم مژادە لە جێل gelly دەچێت و خانەی فایبرۆبلاستەکان (دایکەریشاڵەخانە) fibroblasts دروستی دەکەن.

تەنینەوەی چلم لە پێستدا زۆر بار دروستی دەکەن بەڵام گرنگەکان ئەمانەن:

١- **چلمەئاوسانی** (**بلەئاوسانی**) **پێشئێسکەقامیش** Pretibial myxoedema

زۆربەیان لە نەخۆشی پەریزادەی ژەهراوی hyperthyroidism دا روودەدەن، بە شێوەی قوتکەی پەمەیی یان رەنگ پێستی ئەستوور، ئاوسانی جێیی، دەردی گرێۆکەیی و لوولەیی بڵاو و ئاوسانی پتەو یان هەردوو گرێۆکە و ئاوسان لە بەشی پێشەوە و لاکانی پەلەکانی خوارەوە ،بەڵام دواتر بۆ پشتی لاق و پێ دەکشێت و چاودەرپەڕینی exopthalmos لەگەڵدایە، لە نموونە وەرگرتندا ئاوسان و تەنینەوەی چلمی لە بن توێژدا هەن. (وێنەی ٤٣٣)



(وێنەی ٤٣٣ چلمە ئاوسانی پێشئێسکەقامیش.

چارەسەر: ستێرۆید لە ژێر بەستندا و هەندێك جار نەشتەرگەری.

٢- **بلەئاوسان** Myxoedema (**کەمچالاکی پەریزادە** Hypothyroidism): پێست بە گشتی چلمینییە و وەك نەخۆشی ماسی ئاسایی وشك و زبر دەبێت، دەموچاو ئاوساوە puffy و زمان گەورە بووە و لێو ئەستوور دەبێت و لووت پانە، دەوری چاو تەنراوەیە و پێستی سەر چرچولۆچی تێکەوتووە و موو کەمبوون و پێست زەردبوون و نینۆك ناسك بوون هەن. (وێنەی ٤٣٤)

٣- **چلمەئاوسانی پێستەستووریی** Lichen myxoedematosus: دەگمەنە، زۆربەیان ٣٠-٥٠ ساڵن، نیشانەکانی چەند جۆرێکن:

١) هەڵتۆقیوی پێستەستوورەیی بڵاو بە شێوەی تەنۆچکەی جیاجیا لەسەر هەموو پێست بە تایبەتی لەسەر دەست، قۆڵ، سەرەوەی قەد، مل و دەم وچاو دەردەچێت.

٢) هەڵتۆقیوی تەنۆچکەیی جیاجیا لە قەد و پەلەکان. ٣) ئاوسانی بڵاو یان جێیی.

٤) قوتکەی لیری و گرێۆکەیی.

هۆكاری نەزانراوە،بەڵام پڕبوونی ئیمیونۆگلۆبیولینی G. لەگەڵدایە IgG-paraproteinaemia و هەندێك جار ئەندامەكانی ناوەوە وەك دڵ وكۆئەندامی دەماری و ماسولكەیی تووش دەبن.
ئاكامی ئەم نەخۆشیە باش نییە و چارەسەری ئاسان نییە ، بەڵام مەلفالان melphalan، ڕێتینۆیدەكان، پلازمافێرێسس + ستیرۆیدی سەراپایی – تاد، هەندێك جار بەكارن(وێنەی ٤٣٥).


(وێنەی ٤٣٤) بلەئاوسان.


(وێنەی ٤٣٥) چلمە ئاوسانی پێستەستوورێیی

٤- **سەلكەچلمیین** Follicular mucinosis: ناساغیەكی سۆییە، كە تێیدا قوتكەی تەنراوە و كاژ و مووڕووتانەوە لەگەڵ كۆبوونەوەی ئەسیدمیوكۆپۆلیسەكەرایدەكان، لە ڕژێنە چەوریەكان و پەردەی ڕەگی دەرەوەی سەلكەمووەكان ڕوودەدەن، هۆكاری نەزانراوە، بەڵام لەوانەیە بەرگری گوازراوەی خانەیی ڕۆڵی تێدابیبنێت. (وێنەی ٤٣٦)

كۆمەڵێك لە نەخۆشەكان یەك یان چەند دەردێكی كەمیان هەیە و لە ٢ مانگ – ٢ساڵدا چاكدەبنەوە، لە كۆمەڵێكی تریاندا دەردەكان بەردەوامن و دەردی نوێش بۆچەند ساڵێك دەردێن و درێژخایەنە، كۆمەڵی سێیەمیان لیمفۆمای لەگەڵدایە ( لە ١٥٪ی بارەكاندا).

نەخۆشەكان لە تەمەنی ٢٠–٧٠ ساڵیدان، بەڵام زۆربەیان لە ٢٠–٤٠ ساڵیدا لێیان دەردەكەوێت.


(وێنەی ٤٣٦) سەلكە چلمیین.

دەردەكان ٢–٥ سم دەبن و تەنۆچكە و قوتكەی ڕەنگپێستی بە كۆمەڵ یان سوورباو كە كونی سەلكەكانی تێدا لە ئاسایی زەقترە، لە دەموچاو و پێستی سەر و مل و شان دەردەكەون، مووەكان دەڕووتێنەوە، بۆیە زۆر جار یەكەم سكاڵا مووڕووتانەوەیە.

له باری درێژخایەندا دەردەکان گرێۆکە و قوتکەی قوچەکەیی بەرزبووەوە یان پانی جیلاتینی و نەرمن و هەندێك جار بە هەڵگوشین چڵمیان لێ دێتەدەرێ، هەندێك جار زۆربەی پێست دەگرێتەوە و خوران دروست دەکات.

**چارەسەر:** هەندێکیان خۆیان چاکدەبنەوە، بۆ باری درێژخایەن چارەسەری بنەڕەتی نییە، بەڵام ستیرۆیدی جێیی و بە تێچزاندن، داپسۆن، پوڤا، تیشکەچارە radiotherapy، IFN-∝2b، ماینۆسایکلین، ئایزۆترێتینۆین و ئیندۆمیثاسین ، هەندێك جار بەکاردەهێنرێن.

٥- **تۆڕە سووربوونەوەی چڵمیینی** Reticular erythematous mucinosis (REM):


(وێنەی ٤٣٧) **تۆڕە سووربوونەوەی چڵمینی**

پتر لەمێینەی ٢٠-٤٠ ساڵی دا ڕوودەدات، زۆربەی دەردەکان دوای بەرکەوتنی ت س و (خۆر) بە شێوەی قوتکەی سوور یان پارچەی تۆڕی ،کە چەند سەنتیمەترێکن، لە بەشی ناوەکی سنگ و پشت دەردەچن، بە لەسەرخۆیی سارێژدەبنەوە، تیشکە فرەهەستیاری باوە و لە کاتی تێکەوتن و سکپڕی و بەکارهێنانی خەپلەی نەزۆکاندن دەرووژێن. (وێنەی ٤٣٧)

**چارەسەر:** دژە مەلاریا بەکەڵکە.

٦- **پۆرگی چڵمەگمۆڵ** Myxoid cyst: ئەم پۆرگە پتر لە بەشی پشتی یان تەنیشتی پلی پەنجەی پەڕی دەست و کەمتر لە پێدا دەردەچێت. قەبارەی ٥-٧ ملم و ڕەنگی پێستییە یان تاریکە، هەندێك جار بەشێوەی ئاوسانی بێ سکاڵای نوشتاوەی نزیکی نینۆك یان ژێر نینۆك یان لەسەرجومگەی پەڕی نێوان پەنجەکان ڕوودەدات، ناواخنی پۆرگەکە شلەی لینجی لکێنییە (= کەتیرەییە) sticky. بەرگی پۆرگەکە ناوپۆشی نییە بەڵکو ریشاڵەدیوارە، هەندێك جار چاڵی هێڵی لە پلێتی نینۆك یان درز یان ڕەنگگۆڕانی پلێت یان نینۆك شێبوونەوە دروست دەکات. (وێنەی ٤٣٨)



(وێنەی ٤٣٨) **پورگی چڵمەگمۆڵ.**

**چارەسەر:** درینی پۆرگەکە چەندین جار، دوای دەرکردنی ناواخنی پۆرگەکە ستیرۆید بە تێچزاندن، تەزینەچارە، لەیزەری $CO_2$، کڕاندن curettage، سووتانی ئێلێکتریکی یان نەشتەرگەری بۆ دەکرێت.

# ناساغیه خۆراکیەکان Nutritional diseases

ئەم ناساغیانە بە کەمی یان ناتەواوی یەك یان پتر لە خۆراکە گرنگەکان یان کەم جار بەهۆی فرەبوونیان روودەدەن، پتر لە ولآتە دواکەوتووەکان و بەتایبەتی لە منالٚ و ساوادا هەن.

**ڤیتامین A** ‏(Vitamin A): سەرچاوە خۆراکیە سەرەکیەکان بریتین لە جگەر، هێلکە و کەرە. بێتاکارۆتین beta-carotene لە ریخۆڵە دەمژرێت و لە ناو لەشدا بۆ ڤیتامین A دەگۆرێت وە لە میوە و گێزەر و سەوزەدا هەیە، پێویستی رۆژانە لە ڤیتامین A ‏٥٠٠٠ یەکەی جیهانییە (i.u.) (ی.ج).



**(وێنەی ٤٣٩) کەمی ڤیتامین (A)**
**(زێدە قۆچە کاژی دەوری سەلکی).**

**کەمی ڤیتامین A**: نیشانەکانی بریتین لە چاووشکی xerophthalmia، فرەقۆچەکاژی سەلکی follicular hyperkeratosis و پێستوشکی گشتی، سەلکەتەنۆچکەکان پتر لە پشت و لاکانی قۆلەکان دەردێن. کەمی زنك دەبێتە کەمی ڤیتامین A. شەوکوێری هەندێك جار روودەدات. (وێنەی ٤٣٩)

**پتربوونی(زۆری) ڤیتامین A**: زۆر خواردنی ڤیتامین A (پتر لە ١٠٠,٠٠٠ ی.ج/رۆژ بۆ چەند مانگێك) دەبێتە هۆی بەژەهراویبوون بە ڤیتامین A، بەشێوەی لاوازی، نەخۆری، دابەزینی کێش و مووررووتانەوەی گشتی، پێست وشك و کاژاوی و زبر و بەخورروو دەبێت، لێوەکان وشك و درزاوین، سەلکەقۆچەکاژی، سووربوونەوەی پارچەیی و پەڵەخوێن ، هەروەها روودەدەن.

**کەمی ڤیتامین B2** Riboflavin deficiency – B2: سەرچاوە گرنگەکان بریتین لە هەوێن، دانەوێڵە، جگەر، گۆشت، هێلکە، سەوزە و شیر. پێویستی رۆژانە بریتییە لە ١-٢ ملگم/ رۆژ. (وێنەی ٤٤٠)



**(وێنەی ٤٤٠) کەمی ڤیتامین B2**

کەمی ڤیتامین B2 ،دوای چەند مانگ لە نەخواردنی ئەم ڤیتامینە ،بۆ نموونە لە باری نەخۆشی درێژخایەن و بەدخۆراکی بەتایبەتی لە نەخۆشی گەدە لە پیرەژندا یان بەدمژین لە منالٚدا یان مەی خواردنەوەی درێژخایەن ،روودەدات.

**نیشانەکان**: تیشکەهەستیاری چاو، گۆشەلێوەسۆ، لێوەسۆ، سووربوونەوەی زمان و ناوپۆشی ناودەم، پێستەسۆی وەك

چەورەبیرۆ لە دەوری لووت و چاو و گوێچکە و کۆئەندامی سێکسی. چارەسەر: وەرگرتنی ڤیتامین $B_2$ ٥-١٥ ملگم × ٢-٣/رۆژ بۆ ٢ حەفتە و چاکسازی خۆراکی

**کەمی ڤیتامین** $B_{12}$ (Cyanocobalamine): لە کەسانی رووەکی (واتا رووەکخۆر) ،چونکە لە رووەکدا نییە، دوای چەند ساڵ لە وەرنەگرتنی نیشانەی نەخۆشی روودەدات.هەروەها کەمی ئەم ڤیتامینە بەهۆی تێکچوونی گەدە و ریخۆڵە وەك بەدمژین، نەخۆشی پەنکریاس – تاد،روودەدات، نیشانەکان بریتین لە زمانەسۆ، تۆخبوونی پێست، قژ سپیبوون، کەمخوێنی توند megaloblastic anaemia و تێکچوونی دەماری.

چارەسەر: ڤیتامین B12 ١ ملگم/حەفتە بۆ ١ مانگ بەخوێن، دواتر ١ ملگم/١ مانگ.

**کەمی ترشیی فۆلیك** Folic acid deficiency: لە جگەر و گۆشت و شیر و گەڵای سەوزدا هەیە. کەمی ئەم ڤیتامینە لە سکپڕی و دایکی شیردەر و نەخۆشی بەربڵاوی پێستدا روودەدات بە شێوەی تۆخبوونی بڵاو، زمانەسۆ، لێوەسۆ و کەمخوێنی توند. پێویستی رۆژانە ٠,٤ ملگم بۆ یەك رۆژە.

**کەمی بایۆتین** (**ڤیتامین** H) Biotin deficiency: جۆری بۆماوەیی و وەرگیراوی هەیە، جۆری وەرگیراو بەهۆی بەدمژین، وەرگرتنی دژەبەکتریا (چونکە لە ریخۆڵەدا بەکتریا ئەم ڤیتامینە دروست دەکات) و خواردنی سپێنەی هێلکەی کاڵ (کە ئەڤیدین avidin ی تێدایە و بە بایۆتینەوە دەلکێت) روودەدات بە شێوەی پێستەسۆی دەوری کونەکانی لەش وەك دەم و لووت و گوێچکە و چاو و کۆم یان لاڕان کە تەنۆچکەی سووری داماڵراوی لێ دەردێت. تووشێنی کاندیدا باوە لەگەڵ مووڕووتانەوە، لەوانەیە تووشێنەکە جۆری گشتی بێت. پێڵووپۆشەسۆ و ماکی دەماری وەك خەمۆکی، لەش داهێزران lethargy، هاتنەبەرچاووگوێ hallucination و سرەهەستی paresthesia پەلەکان روودەدەن.

چارەسەر: بایۆتین ١٠ ملگم/رۆژ.

**کەمی نیاسین** (**نەخۆشی گەنمەشامی**) Niacin deficiency (Pellagra): بەهۆی کەمی ترشی نیکۆتینیك nicotinic acid (نیاسین = ڤیتامین B3) یان ترشی ئەمینی amino acid تریپتۆفان tryptophan (کە لە لەشدا بۆ نیاسین دەگۆڕێت) روودەدات. پتر خواردنی گەنمەشامی لەجیاتی دانەوێڵەی تر هۆکارێکە، بەڵام دوای بەدخۆراکی، کەمی ڤیتامینی تر وەك ڤیتامن B6، زۆر خواردنەوەی درێژخایەنی مەی، لووی کارسینۆید carcinoid tumor، نەخۆشی هارتنەپ hartnup disease، تێکچوونی گەدە و ریخۆڵە ( واتا بەدمژین)، نەخۆشی دەروونی وەك نەخۆری دەروونی و دەرمان (وەك INH، ئازاثایۆپرین، ٦-مێرکەپتۆپیورین، 5FU، ئیثیونئەماید، پایرازینئەماید و دژەفێ) روودەدات.

**نیشانەکان:**

١) پێست: **تیشکەپێستەسۆ کە لە بەهار و هاویندا توندتر دەبێت، لە دەم وچاو ، مل ، سەرەوەی سنگ (کە پێی دەڵێن ملوانکەی کاساڵ casal necklace)، بەشی دەرەوەی قۆڵەکان و دەست دەردەچێت. لە سەرەتادا سووربوونەوە و ئاوسان کە بەئازار و خورووە و بە تیشك هەستیارە، بەڵام دواتر پێست ئەستیووربوون و کاژکردن و تۆخبوون روودەدەن، لە باری توند و درێژخایەندا پێست وشك و لووس و تەنك دەبێت، لووت بەهۆی پەستاوتراوی چەوری کونی سەلکەکان زبردەبێت.**





**(وێنەی ٤٤١)**
**نەخۆشی گەنمەشامی.**

٢) لاوازی و نەخۆری و سکئێشە و سکچوون **روودەدەن.** (**وێنەی ٤٤١**)

٣) سکالای دەماری **وەك سەرلێشوان، خەمۆکی، لاوازی ماسولکەیی، میروولەکردنی پێست، سەرئێشە، گێژی، کەوتن falling، دەروون تێکچوون، فێ، لەبیرچوونەوە و بوورانەوە – تاد و هەندێك جار مردن روودەدەن.**

**چارەسەر**

**خۆراکی لەبار وەك پرۆتینی ئاژەڵی، هێلکە، شیر و سەوزە بە نەخۆش دەدرێت.**

- **نیکۆتینەماید nicotinamide ١٠٠ ملگم × ٣/رۆژ بۆ چەند حەفتەیەك، بۆ باری توند نیاسین بە خوێن ٥٠-١٠٠ ملگم × (١-٢)/رۆژ.**
- **هۆکارەکان لابرێن.**

**کەمی ڤیتامین C (ئەسکەرپووت) Vitamin C deficiency (Scurvy): ڤیتامین C زۆر کاری گرنگی هەیە، بەڵام لە پێستدا رۆڵی سەرەکی لە دروستبوونی کۆلاجین و مژادی زەمینیدا دەبینێت، پێویستی رۆژانە ٣٠-٨٠ میللیگرامە و لە پەتاتە و سەوزە و میوەدا زۆرە. کەمی ئەم ڤیتامینە لە ئەنجامی مەی خواردنەوەی درێژخایەن، بەدخۆراکی، بەدمژین و فەرامۆشکردن – تاد، روودەدات.**

**نیشانەکان:**

- **نیشانەی خوێنرێژی: وەك پەڵەخوێنی دەوری سەلکەکان، شینبوونەوە ecchymosis بەتایبەتی لە لاقەکان، لەگەڵ گرێیۆکەی بەئازار یان خوێنرێژی ژێر ئێسك پۆش و ئاوسانی تەختەیی (وەك**

خانەسۆ)، خوێنڕێژی ژێر نینۆك و ژێر پێڵووپۆش و ناو ماسولکە و جومگەکان، پووکەسۆی خوێنڕێژی و بۆگەنی ناودەم و لووتپژان و درەنگ برین سارێژبوون لەوانەیە رووبدەن.

- زێدەقۆچەکاژی سەلکەکان و بوونی مووی لوولخواردوو لە باسك و پشت و سمت و لاقەکاندا هەن. (وێنەی ٤٤٢)
- لەوانەیە کەمخوێنی anaemia و خەمۆکی و شێوانی دەروونی رووبدەن.

چارەسەر: ڤیتامین C (ترشی ئەسکۆربیك ascorbic acid) ١٠٠٠ ملگم/رۆژ بۆ چەند حەفتەیەك لەگەڵ خواردەمەنی پرۆتینی و لەبارکردنەوەی فەرامۆشکردنی سەوزە و میوە خواردن.







(وێنەی ٤٤٢)
ئەسکەرپووت.

## کەمی زینك Zinc deficiency

زینك لە گوێچکەماسی و نۆك و گوێز و دانەوێڵەی بەتوێکڵەوە و سەوزەی گەڵادارا هەیە. مژادی فایتەیت phytates کە لە دانەوێڵەی بێ توێکڵدا زۆرە مژینی زنك کەمدەکاتەوە.

پێویستی رۆژانە بۆ باڵق ١٦ ملگم و بۆ ساوا ٣-٥ ملگم و بۆ مناڵ ١٠ میلیگرامە. ژنی سکپڕ و شیردەر رۆژانە ٢٠-٢٥ ملگم زینکی پێویستە.

زینك بۆ کاری ئاسایی خانە و شانە و ئەندامی لەش گرنگە.

کەمی زینك لەم بارانەدا هەیە:





(وێنەی ٤٤٣)
پەڵە پێستەسۆی دەردەریخۆڵەیی.

١- **پەلە پێستەسۆی دەردەڕیخۆڵەیی** Acrodermatitis enteropathica: بۆماوەیی لەشی بەزیووە، زۆرباو نییە و لەو منداڵانەدا کە باوك و دایکیان خزم بن روودەدات. لە باری ئاساییدا ڕێژەی ٢٥-٦٥٪ی زینکی وەرگیراو لە ریخۆڵەدا دەمژرێت بەلام لەم نەخۆشیەدا بەدی مژینی زینك وا دەکات کە تەنیا ٢-٣٪ی زینکی وەرگیراو بمژرێت. چونکە نەخۆشیەکە دوای ٤-٦ حەفتە لە شیربڕینەوە دەردەکەوێت لەبەرئەوە مژادێکی نەناسراو لە شیری دایکدا هەیە کە مژینی زینك پتر دەکات.

هەندێك جار لە کاتی شیردانیشدا بەهۆی کەمی زینکی شیری دایك یان پتر پێویستی ساواکە بۆ زینك نەخۆشیەکە هەر دەردەکەوێت. (وێنەی ٤٤٣)

**نیشانەکان**: وەك وتمان ٤-٦ حەفتە لە شیربڕینەوە یان زووتر ئەگەر شیری دایکی نەدرابێتێ نەخۆشیەکە بەشێوەی ناتەبایی و دوورەپەرێزی منداڵەکە و تیشکەهەستیاری خۆی نیشان دەدات، هەروەها پێستەسۆی بلۆقی و بڵقی دەست و پێ و دەوری کونەکانی لەش، مووڕووتانەوەی سەر، سکچوون، بەدگەشەیی ، کەمی بەرهەڵستی بۆ تووشێنی بەکتریا و کاندیدا و درەنگ سارێژبوونی برین دەردەکەون و کە چارەسەر نەکرێت لە ٤-٥ ساڵدا نەخۆشەکە دەمرێت.

**چارەسەر**

سەلفاتی زینك zinc sulfate ٢-٣ ملگم/کلگم/رۆژ بۆ ماوەی ژیان. **تێبینی**: یەك کەپسوولی (گولاجی) زینك سەلفەیت کە ٢٢٠ میللیگرامە تەنیا ٥٠ ملگم زینکی تێدایە.

٢- **کەم زینکی نیشتەنی** Endemic-zinc-deficiency:. لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە دانەوێڵەی بێ توێکڵ (گەنم و جۆ - تاد) بەکاردەهێنرێت و زۆر فایتەیت و ریشاڵی تێدایە و دەبێتە هۆی کەم مژینی زینك ،کورتەباڵایی و ناتەواوی توخمدان hypogonadism و نیشانەی تریش وەك پێستەسۆی کەم زینکی، روودەدەن.



**(وێنەی ٤٤٤) کەم زینکی دەستکەوتە.**

٤- **کەم زینکی دەستکەوتە** Acquired zinc deficiency: (وێنەی ٤٤٤) وەك: کەمخواردنی زینك، تێکچوونی کاری ریخۆڵە، برینی بەشێکی زۆری ریخۆڵە بە نەشتەرگەری، ساوای نابەکام prematurity، وەرگرتنی خۆراك بە رێگەی خوێن بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ، نەخۆشی جگەر و پەنکریاس، کیمیکەچارە بۆ شێرپەنجە و ئەیدز، ئەم بارە دروست دەکەن.

## کەمی ئاسن Iron deficiency

به تایبەتی لە مێینەدا بەهۆی تێکەوتنەوە باوە، کەم خواردنی گۆشتی سوور هۆکارێکە.

نیشانەکان: نینۆکی کەوچکی (قوپاو)، زمانەسۆ، گۆشەلێوەسۆ، خوران و بە لێشاو مووڕووتانەوە.

کۆنیشانەی پلەمەر-ڤنسن Plummer-vinson syndrome بریتییە لە کەمخوێنی بچووکەخانەیی microcytic anaemia لەگەڵ گران قووتدان، زمانەسۆ، لێوباریکی، کەمکرانەوە و رەقی دەم، نینۆکی کەوچکی و مووڕووتانەوە بە تایبەتی لە مێینەی تەمەن ناوەڕاستدا.

**چارەسەر**

سەلفاتی ئاسن iron sulfate ٣٢٥ ملگم × ٣/رۆژ تا ئاستی ئاسن بەرزدەبێتەوە.

## گۆڕانکاریەکانی پێست لە ناساغیە کوێرەگلاندەکاندا Endocrine diseases

### زەبەلاحی Acromegaly

بەهۆی فرەدەردانی هۆرمۆنی گەشە growth hormone لە ئەنجامی پۆشەگمۆڵی adenoma ژێرمێشکەگلاند pituitary gland روودەدات، زۆربەی بارەکان لە تەمەنی ٤٠ساڵیدا دەستنیشاندەکرێن، گۆڕانکاریەکان لە پێسدا ئەمانەن: (وێنەی ٤٤٥)



(وێنەی ٤٤٥) زەبەلاحی.

زلبوونی چەناگە و لووت و ژووربرۆ، سووربوونەوە و ئەستووربوون و چرچبوونی پێستی ناوچەوان ، لێو و زمان ئەستووربوون، لۆچبوون و ئەستووربوونی پێستی سەر، دەست زلبوون و پەڕی پەنجە زلبوون، پێست بە گشتی ئەستووربووە، تۆخبوون و تووکنی لەش و فرەئارەق دەردان باون.

### کۆنیشانەی کوشینگ Cushing syndrome

بەهۆی پڕبوونی گلوکۆکورتیکۆیدەکان glucocorticoids لە ئەنجامی فرەچالاکی توێژی ئەدرینال adrenal cortex روودەدات، هەندێك جار (١٠٪ی بارەکان) گچکەپۆشەگمۆڵی ژێرمێشکەگلاند یان دەرمان (ستیرۆیدی سەراپایی و کەم جاریش ستیرۆیدی جێیی بۆ رووبەری زۆری پێست بۆ ماویەکی زۆر) هۆکارن. پتر لە ٢٠-٣٠ ساڵیدا دەردەچێت. (وێنەی ٤٤٦)





(وێنەی ٤٤٦)
کۆنیشانەی کوشینگ.

نیشانەکان: بریتین لە قەڵەوی ناوەندی ( واتا قەڵەوی دەموچاو و قەد بە تایبەتی سك، بێ قەڵەوی پەلەکان) بە تایبەتی لەسەرەوی

پشت. دەموچاو مانگییە (پان و خڕە)، تووکنی، پێست وشکی و ناسکی، زیپکەی عازەبەی دەموچاو، ئامادەیی بۆ تووشێنی هەوێن و کەڕوو، پێست قڵیشان striae لە سك و راندا.
هەندێك جار تۆڕەشینکێ، خاڵەخوێن، شینکی و تۆخبوون هەن.

**نەخۆشی ئەدیسۆن** Addison's disease: باسمانکرد.

## پەریزادەی ژەهراوی Hyperthyroidism

پڕبوونی ثایرۆکسین thyroxin لە خوێندا بەهۆی پەریزادەی ژەهراوی فرەگرێیی یان تاکگرێیی یان پەریزادەسۆی بەرگریخۆیی هاشیمۆتۆ Hashimoto autoimmun thyroiditis یان پۆشەگمۆڵی ژێرلانکەگلاند یان پەریزادەسۆی توند Graves thyroiditis روودەدات. (وێنەی ٤٤٧)



**(وێنەی ٤٤٧)**
**پەریزادەی ژەهراوی لەگەڵ چلمەئاوسانی پێش ئێسکەقامیش.**

**نیشانەکان:** پێست گەرم و تەڕ و لووسە، سوورهەڵگەڕانی دەموچاو و بەری دەست، فرەئارەقکردنەوەی گشتی بەتایبەتی لە بەری دەست و پێدا، قژی سەر لەوانەیە باریك و نەرم و ناسك بێت لەگەڵ موورووتانەوەی سەر. رێژەی ٥٪ یان گۆڕانکاری نینۆکیان هەیە، وەك فرەگەشەی نینۆك و نینۆك نەرمبوون، کەم جار پێست تۆخبوون، خورانی پێست و لیر و پەنەمانی بۆری هەن، چلمە ئاوسان و ماڵەی دەم وچاویش هەروەها هەن.

## دڕکە رەشبوون Acanthosis nigricans

بریتییە لە قوتکەی بالووکەیی نەرمی زێدە قۆچەکاژی و تۆخبوونی چونیەکی لۆچەکان و هەندێك جاریش ناوپۆشەکان، زۆربەی جار نیشانەیەکە بۆ بێوەڵامی بۆ ئینسۆلین و کەم جار بۆ بوونی شێرپەنجە. نەخۆشیەکی باوە. (وێنەی ٤٤٧)

**هۆکارەکان:**

١- **بێوەڵامی بۆ ئینسۆلین** Insulin resistance:

دڕکە رەشبوون دیاردەیەکی باوە بۆ زۆر باری بێوەڵامی بۆ ئینسۆلین (واتا پڕبوونی ئینسۆلین hyperinsulinemia لە خوێندا بێ هاوسەنگی لەگەڵ رێژەی ئاستی گلوکۆز لە خوێندا) وەك:
أ-قەڵەوی Obesity: پەیوەندیەکی پۆزەتیف لە نێوان قەڵەوی و توندی دڕکەرەشبووندا هەیە. دوای دابەزاندنی کێش نەخۆشیەکە نامێنێت، چونکە قەڵەوی لەوانەیە پڕبوونی ئینسۆلین و بێ وەڵامی

بۆ ئینسۆلین و تێکچوونی بەرگە بۆ گلوکۆز impaired glucose tolerance و جۆری ٢ نەخۆشی شەکرە و تێکچوونی چەوری خوێن و بەرزی پەستانی خوێن و فرەبوونی ئەندرۆجینی خوێنی لەگەڵدا بێت. (وێنەی ٤٤٨)





(وێنەی ٤٤٨) درکە رەشبوون لەگەڵ ژمارەیەك پەلە پەتکە.

ب) کۆنیشانەی رود Rud و نەخۆشی شەکرە جۆری ٢.

ج) نەخۆشی فرەپێزگی هێلکەدان .Polycystic ovarian ds

د) هی تریش.

٢- **شێرپەنجە** Malignancy:

درکەرەشبوون پێش (١٨٪ی بارەکان) یان لەگەڵ (٦٠٪ی بارەکان) یان دوای (٢٢٪ی بارەکان) دەرکەوتنی شێرپەنجە دەردەکەوێت، زۆربەی شێرپەنجەکان جۆری گلاندەگمۆلین adenocarcinoma لە گەدە و سی و مەمك دا و کەمتر لە شوێنی تر وەك هێلکەدان، جگەر، گورچیلە، پەنکریاس - تاد، جۆری تری شێرپەنجە و لیمفۆما هەندێك جار لەگەڵ درکە رەشبوونن. (وێنەی ٤٤٩)

بەری دەستی لۆچاوی tripe palms (درکە بەرەدەست acanthosis palmaris) کە تێیدا پێستی بەری دەست ئەستوور و لۆچاویە و زەقتربوونی پەنجەمۆر و شێرپەنجە لە ٩٥٪ی بارەکاندا هەیە و لە ٧٧٪ی بارەکاندا لەگەڵ درکەرەشبوونە.

٣- **دەرمان**: وەك سۆماتۆترۆپین، تێستۆستیرۆن، ترشی نیکۆتینیك، دوو ئەثیل ستیلبیسترۆل ، حەپلەی نەزۆکاندن، ستیرۆید، ترایئەزینەیت و مەرهەمی ترشی فیوسیدیك.

٤- **هۆنەزانراو**: هەندێکجار بۆماوەی لەشی زاڵە.

٥- **کۆنیشانەکان** وەك زەبەلاحی، نەخۆشی ئەدیسۆن، کۆنیشانەی بلوم، کۆنیشانەی کوشینگ، پێستەماسولکەسۆ،مۆنگۆلی



(وێنەی ٤٤٩ ب) لەگەڵ شێرپەنجە.



(وێنەی ٤٤٩ أ ) درکە رەشبوون (گرتنەوەی لێو و تۆخبوونی کەم)

بەرپشاڵبوونی جگەر، کەمچالاکی پەریزادە، گۆرگەسوورە – تاد.
لە نموونە وەرگرتندا: زێدەقۆچەکاژی و کەمێك پڕبوونی چینی درکی و زێدەگۆبوونی بن توێژ dermal papillomatosis هەن.
نیشانەکان: تۆخبوون و ئەستووربوون و زەقتربوونی هێڵەکانی پێست و گۆیاوی بوونی پێست لە ژێر باڵ و مل و کۆئەندامی سێکسی و لاڕان و ڕوومەت و بەشی ناوەوەی ران و لۆچی ئانیشك و ئەژنۆ و ناوك و دەوری کۆم ڕوودەدەن. لەوانەیە پەلەپەتکە (تیسکی پێست) skin tags لەسەر درکەڕەشبوون یان شوێنی تر دەربچن. هەندێك جار کاژە ئەستوورێی بەری دەست و پێ palmoplantar hyperkeratosis، درکە بەرەدەست و زەقتربوونی پەنجەمۆر بەتایبەتی لە باری بوونی شێرپەنجەدا هەن.
گرتنەوەی ناوپۆشەکان بە شێوەی ئەستووربوون و گۆیاوی بوون و کەمێك تۆخبوون لەگەڵ درکەڕەشبوونی بڵاوبووەوە نیشانەی بوونی شێرپەنجەیە.

**پشکنین**

١- پشکنین بۆ هۆکارەکانی قەڵەوی.
٢- ئاستی گلوکۆز و ئینسۆلین (لە خورێنی fasting).
٣- پشکنین بۆ ناساغیەکانی کوێرەگلاندەکان.
٤- پشکنین بۆ بوونی شێرپەنجە.
٥- گەڕان بەدوای دەرمانی هۆکار دا.

**چارەسەر**

١- کێش دابەزاندن و لابردنی هۆکاری تر ئەگەر هەبوو.
٢- ترێتینۆین جێبی + ئەمۆنیۆم لاکتەیت ammonium lactate ١٢٪ جێبی.
٣- مێتفۆرمین metformin بە دەم بۆ ٦ مانگ.
٤- تازەرۆتین جێبی، کالسیپۆتریۆڵ جێبی بۆ ٣ مانگ، ترشی سالیسیلیك، یۆریا.
٥- ئایزۆترێتینۆین بە دەم ٢-٣ ملگم/کگم/ڕۆژ بۆ ٤مانگ.
٦- کیتۆکۆنازۆڵ بە دەم.
٧- سیپرۆهیپتادین ٤ ملگم × ٣/ڕۆژ بۆ ٣ حەفتە.
٨- ڕۆنی ماسی لەگەڵ خواردەمەنیدا.
٩- خەپلەی نەزۆکاندن.
١٠- لەیزەری ئەلێکسەندرایت Long-pulsed (5-msec) Alexandrite laser.
١١- پێست تاشین dermabrasion.

**نیشاستەگموڵێ** Amyloidosis: بریتییە لە نیشتنی deposition یەکێك لە خێزانێکی پرۆتینی کە پەیوەندی کیمیکیان بە یەکەوە نییە، بەڵام هەندێك تایبەتمەندی هاوبەشیان لە بۆیە وەرگرتن staining properties وەك سەوزی سێوی دوای رەنگکردنی شانە بە سووری کۆنگۆیی Congo-red لە ژێر وردبینی جەمسەریدا لە شانەی دەرەوەی خانەکاندا هەیە. هەندێك جار پرۆتینەکە لە زنجیرەی سووکی ئیمیونۆگلۆبیولینەکان (protein AL) light chains یان هەردوو زنجیرەکە (زنجیرەی سووك و قورس) یان کیراتین وەرگیراوە – ئەوسا لە ژێر هەندێك باردا لەشانەدا بە زۆری دوای یەکگرتن لەگەڵ بەشی P کە لە زەرداوی خوێن وەرگیراوە، دەنیشێت.

دوو جۆری سەرەکی هەن:


(وێنەی ٤٥٠)
**نیشاستەگموڵێی سەراپایی.**

١- **نیشاستەگموڵێی سەراپایی** Systemic amyloidosis:
ئەم جۆرە سەرەتاییە primary یان دووەمییە بۆ فرەمۆخەگموڵی چەندانەکی multiple myeloma و پێست دەگرێتەوە، چونکە خوێنبۆریەکانی پیست بە مژادی نیشاستەگموڵ تەنراونەتەوە و بە ئاسانی دەتەقن و خاڵەخوێن و شینکی دروست دەبن. نیشتنی نیشاستەگموڵی مۆمی waxy بە تایبەتی لە دەوری چاڵی چاو لەوانەیە خاڵەخوێنی تێدابێت. جۆری سەراپایی کە دوومی بێت بۆ ناساغیە سۆییە درێژخایەنەکان وەك باداری .R.A و سیل بە دەگمەن پێست دەگرێتەوە. (وێنەی ٤٥٠)

٢- **نیشاستەگموڵێی جێیی** Localized amyloidosis:
لەوانەیە هۆکارەکەی سڕینی(خوراندنی) درێژخایەن chronic rubbing بێت بە هۆی خورانی پێست یان بەکارهێنانی فلچەی نایلۆن لە کاتی خۆشوردندا، ئەمەش دەبێتە هۆی برینداربوونی زەبری خانەی بنکەیی،بەڵام نەزانراوە بۆچی هەندێك کەس بەم هۆکارانە ناساغیەکەیان تووش دەبێت.جۆرەکانی ئەمانەی خوارەوەن:


(وێنەی ٤٥١ أ)
**نیشاستەگموڵێی پەڵەیی.**

أ) **نیشاستەگموڵێی پەڵەیی** Macular A: لە باری نموونەییدا پەڵەی بەخورووی تۆڕیی یان شەپۆلیی قاوەیی لە نێوان هەردوو دەفەی شاندا بە تایبەتی لە باری سڕە

پشتێشەدا notalgia paresthetica دەردەچن(وێنەی ٤٥١ أ)، هەندێك جار ران و پێشی لاق و قۆڵ و مەمك و سمت دەگرێتەوە، بە تایبەتی بەهۆی خورانی بلاّو. ئەم ناساغیە درێژخایەنە.

ب) نیشاستەگمۆڵێی پێستەستورێیی Lichen A: بریتییە لە دەرهاتنی تەنۆچکەی پێستەستورێی بەخورووی قاوەیی جیاجیای کەم کاژی دوولایی لەسەر پێشی لاقەکان، دواتر کۆدەبنەوە و قوتکەی تەنراوەی گەورە دروست دەکەن، هەندێك جار ران و باسك و سەرەوەی پشت دەگرێتەوە. وێنەی ٤٥١ ب)



(وێنەی ٤٥١ ب) نیشاستەگمۆڵێی پێستەستوورێیی.

ج) نیشاستەگمۆڵێی گرێیی Nodular A: دەگمەنە، یەك گرێ وە كەم جار چەند گرێیەك پتر لە پەلەكان دەردەچن، بەلاّم هەندێك جار لە شوێنی تریش. بن توێژ و ژێر پێست بە بلاّوی بە مژادی نیشاستەگمۆڵ تەنراونەتەوە، لەوانەیە بۆ جۆری سەراپایی پەرەبستێنێت وێنەی ٤٥١ ج).

نموونەوەرگرتن: مژادی نیشاستەگمۆڵ کە پرۆتینە، بە شێوەی نیشتنی ناکریستاڵی amorphous لە ژێر توێژدا، گۆکانی توێژ دەکشێنێت و بۆیەی میلانین لە ناو مژادەکەدا هەیە، کەمی و زۆری مژادەکە جۆری ناساغی یەکە دیاردەکات.



(وێنەی ٤٥١ جـ) نیشاستە گمۆڵێی گرێیی.

**چارەسەر**

١- جۆری سەراپایی: خانەکوژەکان وەك مەلفالان melphalan لەگەڵستیرۆیدی سەراپایی وەك پرێدنیزۆلون.

٢- جۆری جێیی:

أ) جۆری پەڵەیی macular A: ستیرۆیدی جێیی بەهێز، UVB ، ناڵتریکسۆن naltrexone، PUVA، ستیرۆید بە تێچزاندن، تاکرۆلیمۆسی جێیی ١,٠٪، کالسیپۆتریۆل . لەگەڵ لابردنی هۆکارەکەی وەك خوراندن و سرین و لفکە و – تاد.

ب) جۆری پێستەستوورێی: وەك جۆری (أ) وە هەندێك جار رێتینۆیدەکان بە دەم، سایکلۆفۆسفەماید، تاشین، لەیزەر وەك Pulsed dye L. ،Nd: YAG.

ج) جۆری گرێیی: نەشتەرگەری، لەیزەری $CO_2$.

## پۆرفیریاکان (ترشێکان) Porphyrias

کۆمەڵێك ناساغین بەهۆی بەدکۆنترۆڵکردنی خوێندروستکردن haem روودەدەن. هەر جۆرێکیان پەیوەندی بە تێکچوونی ئەنزیمێکی رێبازی دروستکردنەکە هەیە، بۆیە پتر وەبەرهێنانی پۆرفیرین porphyrin (ترش = السمّاق) لە جگەر یان مۆخی ئێسکدا بنەمای دابەشکردنی جۆرەکەیە و پتر لە ٧ جۆر ئەنزیم لەم رێبازەدا رۆڵ دەبینن و دەستنیشانکردنی سەرجێیی و پشکنینی میز و پیسایی و خوێن بۆ ترشەکە جۆرەکە دەردەخات کە ئەمانەن:

أ) **جۆری تیژ** Acute types: ئەمانەن:

١- **پۆرفیریای تیژی ناوبەناو** Acute intermittent P.: بۆماوەیی لەشی زاڵە، لە ١٠-٤٠ساڵیدا دەردەکەوێت، ئەگەری ١,٥ کەسە لە ١٠٠,٠٠٠ کەسدا، تیشکەهەستیاری نییە و کاردانەوەی لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکانی پێست بۆ خۆر نییە، بەڵام سکاڵای تێکچوونی دەماری هەیە.

٢- **پۆرفیریای هەمەجۆر** Variegate P.: بۆماویی لەشی زاڵە و لە ١٥-٣٠ ساڵیدا دردەچێت، لە خوارووی ئەفریکادا باوە، تیشکەهەستیاری هەیە، لە پێستدا بلۆق و بڵق و قەتماغە و میلیا و جێ زام و تووکنی هەن. (وێنەی ٤٥٢)



(وێنەی ٤٥٢) **پۆرفیریای هەمەجۆر.**

٣- **مسەپۆرفیریای بۆماوەیی** Hereditory coproporphyria: بۆماوەیی لەشی زاڵە، لە هەموو تەمەنێکدا دەردەچێت، زۆر دەگمەنە و تیشکەهەستیاری بە شێوەی بڵق دروست بوون باوە.

٤- **پۆرفیریای کەمی ئەنزیمیALAD**

- ALA dehydrogenase deficiency P.: هەروەك جۆری I لە سەرەوە وایە و زۆر دەگمەنە.

ب) **جۆری ناتیژ** Non-acute types: ئەمانەن:

١- **پۆرفیریای خاوی پێست** Porphyria cutanea tarda

لە هەموو جۆرەکان باوترە، پتر لە ٢٠-٤٠ ساڵیدا و بە دەگمەن پێش باڵقبوون دەردەچێت، هۆکارەکەی کەمی ئەنزیمی یورۆپۆرفینۆجین دیکاربۆکسیلەیسە uroporphyrinogen decarboxylase کە پێنجەم ئەنزیمی رێباری خوێن دروست بوونە، ئەم جۆرەش دوو بەشە:

أ) جۆری سکالایی symptomatic ، کە ڕێژەی ٨٠٪ی بارەکانە و جۆری یەکی پێدەوترێت و ئەنزیمەکە تەنیا لە جگەردا کەمە.

ب) جۆری بۆماوەیی (بۆماوەیی لەشی زاڵ) ،کە ڕێژەی ٢٠٪ی بارەکانە و کەمی ئەنزیمەکە لە هەموو شانەکاندا ٥٠ ٪ی باری ئاساییە.

جۆری سکالایی (جۆری ١) بەم هۆکارانە خۆی دەردەخات: ئەلکوهول (ئیثانۆڵ)، ئیسترۆجین (وەك خەپلەی نەزۆکاندن)، هێکساکلۆرۆبەنزین، فینۆڵی کلۆرین کراو chlorinated phenols وەك TCDD (tetrachlorodibenzo-p-dioxin)، ئاسن iron و تووشێنی ڤایرۆسی (وەك جگەرسۆ جۆری C و ئەیدز) و خوێن پالاوتن haemodialysis. ((وێنەی ٤٥٣) و ٤٥٤)



(وێنەی ٤٥٤) پۆرفیریای خاوی پێست.



(وێنەی ٤٥٣) پرۆفیریای خاوی پێست.

نیشانەکان: بلۆق و بلّق و دواتر داماڵان و قەتماغە لەو شوێنانەی پتر بەر زەبر دەکەون دەردەچن. پێست ناسکبوون بە تایبەتی لە پشتی دەست و هەندێك جار لە پێدا هەیە، پێستە برینداربووەکە قەتماغە دەبەستێت و بە جێ زام سارێژ دەبێت، ژمارەیەکی زۆر میلیا milia (تەنی گچکەی خڕی سپی زەردەباو کە ١-٥ ملم قەبارەکەیانە) پتر لە دەست و پەنجەکان دەردەچن، دەردەکان لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان پترن و بە بەهار و هاوین توندتر دەبن. تۆخبوون و کاڵبوونی پێست و ڕەنگگۆڕانی پێست بە سوور و ئەرخەوانی لە ناوەڕاستی دەم وچاودا بەتایبەتی لە دەوری چاڵی چاودا ڕوودەدەن، تووکنی لەشی کە لە مێینەدا زەقترە هەیە و لەوانەیە مووەکان ئەستوور یان باریك و کاڵ یان تۆخ بن و پتر لە لاجان و ڕوومەت، بەڵام لە باری توندا قەد و پەلەکانیش دەگرێتەوە. لەوانەیە ئەم دیاردەیە بەهۆی وەرگرە ڕووکەشیەکان، یان فاکتەری گەشەی خانەی کاژی پیازەی موو کە بە تیشك و ترشەکان porphyrins چالاکتر کرابن، ڕوودبدات. پێست ڕەقبوون scleroderma لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان و داپۆشراوەکان، بە شێوەی قوتکەی جیاجیای سپی و زەردی مۆمی تۆکمە indurated دەردەچن و لەوانەیە کالیسیۆم تێیاندا بنیشێت.

هەندێك كۆنیشانەی لە PCT چوو لە شێرپەنجەی جگەر و گورگەسوورەدا دەردەچن.

پشكنین:

١- میز پەمەیی دەبێت و بە تیشكی ود wood's light ڕەنگی پەمەیی زەق bright pink دەنوێنێت.

٢- چڕی پۆرفیرین و جۆرەكەی لە خرۆكەی سووردا، زەرداوی خوێن، میز و پیسایی. میزی كۆكراوە لە ٢٤ كاتژمێردا بۆ ئاستی پۆرفیرین دەپشكنرێت كە لە ١٠٠ مایكرۆگرام كەمترە لە باری ئاساییدا، بەڵام لە PCTدا ٣٠٠-١٠٠٠ مایكرۆگرام دەبێت.

٣- نموونە وەرگرتن: بڵقی ژێرتوێژ و تەنی كاتەرپیلەر caterpillar-bodies هەن.

٤- پشكنین بۆ خانەكانی خوێن و ڕێژەی ئاسن لە زەرداوی خوێندا (كە لە ئاسایی بەرزترە).

٥- كارەكانی جگەر liver function tests، وێنەی جگەر (سۆنار)، نموونەوەرگتن لە جگەر هەندێك جار.

٦- پشكنین بۆ دژە ژیندەری جگەرسۆ جۆری A, B, C.

٧- هەندێك جار پشكنین بۆ ئەیدز.

٨- گلوكۆز لە خوێندا(لە خورێنی) F.B.S.

٩- ANA.

چارەسەر

أ) ١- لابردنی هۆكارەكان وەك ئەلكوهول، دەرمان - تاد.

٢- دژەخۆر جۆری ZnO یان $TiO_2$.

٣- بەربەستی تیشك وەك كاسكێت و جلی لەبار.

ب) ١- خوێنلێگرتن (كەڵەشاخ) phlebotomy: ٥٠٠ س س بە ٢ حەفتە جارێك تا ئاستی هیمۆگلۆبین دەبێتە ١٠ گم/١٠٠س$^{3}$ و ئاسنی زەرداوی خوێن دەبێتە ٥٠-٦٠ مایكرۆگرام/١٠٠ س$^{3}$. ٦-١٠ خوێنلێگرتن پێویستە و چەند مانگێك دەخایەنێت، بەڵام كە ئاستی هیمۆگلۆبین بەم شێوەیە دابەزی نابێت ئاسن بە نەخۆش بدرێت.

٢- دژەمەلاریا antimalarials: لە سەرەتادا بە ژەمی كەم دەست پێدەكەین وەك كلۆرۆكوین ١٢٥ ملگم حەفتەی ٢ جار.

٣- هەندێك جار دێسفێریئۆكسامین desferrioxamine(كە لەگەڵ ئاسندا یەكدەگرێت) و ئیریثرۆپۆیتین erythropoietin، ئینتەرفیرۆن گاما بۆ جگەرسۆی ڤایرۆسی (جۆری C).

٢- سەرەكیە پۆرفیریای سوورەخرۆكەیی Erythropoietic protoporphyria

بۆماوەیی لەشی زاڵە، لە ١-٤ ساڵیدا دەردەكەوێت و دەگمەنە، تیشكەهەستیاری كەمە یان مامناوەندییە. ئاوسان، سووربوونەوە، قوتكەی لیری و بە دەگمەن بلق، پێست ئەستوور و مۆمی بوون هەن.

٣- **زگماکەپۆرفیریای سوورەخڕۆکەیی** Congenital erythropoietic P.

بۆماوەیی لەشی بەزیوە، لە ساوایی تا ١٠ ساڵی تەمەندا دەردەکەوێت، دەگمەنە، تیشکە هەستیاری توند یان زۆر توند بە شێوەی بلۆق و بڵق و داماڵان و تووکنی و تۆخبوون و شێوانی پێست و ئەندامە بەرخۆرکەوتووەکان دەردەچێت.

٤- **پۆرفیریای جگەر سوورەخڕۆکەیی** Hepatoerythropoietic-P

لە ساوایی تا ٢ ساڵیدا دەردەکەوێت، زۆر دەگمەنە، تیشکە هەستیاری توندە و بە شێوەی بلۆق و بڵق و داماڵان و قەتماغە و میلیا و جێ زام و تووکنی و شێواندن mutilations دەردەچێت.

## نیشتنی کالیسیۆم لە پێست دا Calcinosis cutis (C.C.)

بریتییە لە نیشتنی کالیسیۆم و فۆسفات لەناو پێستدا(وێنەی ٤٥٥)، ٤ جۆری هەیە:

١- **جۆری بەدگەشەیی** Dystrophic C.C.: لە دەردی پێست یان پرۆسەی سۆییدا روودەدات. زیندەچالاکی سەراپایی کالیسیۆم ئاساییە و تەنیا کالیسیۆم نیشتن لە پێستدا رووەدات وەك:

أ) جۆری جێیی: کە نیشتنی بڕی کەمی کالیسیۆم بە شێوەی مژادی دەنکۆڵەیی تەباشیری لە دەوری پەنجەکان و ئانیشکدا هەیە و لەوانەیە لەخۆوە فڕێ بدرێت، وەك نەخۆشی پێست رەقبوون، گورگەسوورە، شێرپەنجە، میلانۆما، پۆرگی مووی pilar cysts . نیشتنی کالسیۆمەکە لە بن توێژ و ژێر پێستدا رووەدات.



**(وێنەی ٤٥٥) نیشتنی کالسیۆم لەناو پێستدا.**

ب) جۆری سەراپایی: لە نەخۆشی ماسولکەپێستەسۆی D.M. منداڵیدا، بە شێوەی نیشتنی کالسیۆم لە پێست و ماسولکە و پەتکی ماسولکە و بە شێوەی بڵاو رووەدات.

**چارەسەر**

نەشتەرگەری، یان کەناڵی کالیسیۆم وەستێن، وارفارین، کۆڵچیسین، پرۆبێنیسید و خواردەمەنی کە کەم فۆسفاتی کالیسۆمی تێدابێت، لەگەڵ هایدرۆکسیدی ئەلومینیۆم.

٢- **جۆری تەشەنەکردوو** Metastatic C.C.: دەگمەنە، نیشتنی کالیسیۆم لە ناو پێستدا و بەرزبوونەوەی رێژەی کالیسیۆم و هەندێك جار فۆسفات لە خوێندا و زۆر جار لە ناوچوونی ئێسکی لەگەڵدایە. لووی پاراثایرۆید (ژێر پەریزادە)، سستی گوچیلەی درێژخایەن، فرەبوونی ڤیتامین A، زۆر خواردنی شیر و تفتەکان – تاد هەندێك هۆکارن. نیشتنی کالیسیۆم بە شێوەی تەنۆچکەی پتەوی سپی

بچووك بە ژمارەیەكی زۆر بە چوونیەكی لە لۆچی پشت ئەژنۆ، سەر ئێسكەكلۆت iliac crest و دواوەی ژێربالْ دەردەچن، یان چەوریەسۆی كالیسیۆمی calcifying panniculitis روودەدات.

٣- **جۆری دەرمانی و زەبری** Iatrogenic & traumatic: وەك بەركەوتنی پیشەیی لە كارمەندی كێلْگەی نەوت و سەرچاوەی خەلْوزی بەرد، یان لە نەخۆشخانە بە بەركەوتنی كلۆریدی كالیسیۆم و گلوكۆناتی كالیسیۆم.

٤- **جۆری هۆنەزانراو** Idiopathic C.C.: واتا روودانی نیشتنی كالیسیۆم لە لوو و پێستەئێسكەگمۆلْ (بەئێسكبوونی پێست) osteoma cutis دا.

## تێكچوونی چەوری Lipid disturbances

### زەردەگمۆلْ Xanthomas

بریتییە لە نیشتووی deposits مژادی چەوری لە پێست و ژێر پێستدا و نیشانەی گۆڕانی چەندێتی چەوروپرۆتینەكان lipoproteins و ترشە چەورە سەربەخۆكانە (ئازادەكانە) free fatty acids لە زەرداوی خوێندا. چەوری لە ناو كەفەخانە گەورەكانی large foam cells شانەكاندا كۆدەبێتەوە و ئەم چەوریانە بە زۆری كۆلْیسترۆلْن یان سێ گلیسرایدەكانن. فرەچەوریخوێنی دوو جۆرن:

١- فرەچەوریخوێنی سەرەتایی: كنێتین genetic و بە پێی شیكردنەوەی چەوری خوێنی رۆژوویی fasting blood lipids و جیاكردنە ئێلێكتریكی electrophoresis چەوروپرۆتینەكانی زەرداوی خوێن شەش كۆمەلْن. زۆربەیان مەترسی پڕكردنی چەوریەرەقبوونی atherosclerosis بۆریە خوێنەكانیان هەن.

٢- فرەچەوریخوێنی دووەمی: لە نەخۆشی شەكرە و زەرداوە جگەرریشالْبوونی سەرەتایی primary biliary cirrhosis، كۆنیشانەی گورچیلەیی nephrotic syndrome و كەمچالاكی پەریزادە hypothyroidism روودەدات.



(وێنەی ٤٥٦) نەرمە زەردەگمۆلْی پێلْوو.

**جۆرەكانی زەردەگمۆلْ**

١- **نەرمەزەردەگمۆلْی پێلْوو** Xanthelasma palpebrum: باوترین جۆرە، لە ناوەڕاستی تەمەندا و پتر لە مێینەدا دەردەكەوێت، نیوە یان پتر لە

بارەکان چەوری خوێنیان ئاسایییە و بەشەکەی تریش لە کۆمەڵی II، III، IVی فرەخوێنچەوریدا دەردەکەوێت. (وێنەی ٤٥٦)

**نیشانەکان**: قوتکەی نەرمی شامۆیی یان زەردی پرتەقاڵی لاکێشەیی ( کە ٢-٣٠ ملم درێژن) لەسەر پێڵووی چاو، بە تایبەتی بەشی ناوەوە دەردەچێت و پەرەدەستێنێت و هەندێکیان یەکدەگرن و چوونیەکیین.

**چارەسەر**: نەشتەرگەری، سووتانی ئێلێکتریکی، سووتاندنی کیمیکی بە TCA، لەیزەری $CO_2$ یان Er:YAG.

٢- **زەردەگمۆڵی لوولەیی** Tuberous xanthomas: تەنۆچکە و گرێۆکەی پتەوی پان یان بەرزبووەوەی خڕی بە کۆمەڵی زەرد یان پرتەقاڵی لەسەر جومگەکان بەتایبەتی ئانیشك و ئەژنۆ، بەڵام هەندێك جار لە دەموچاو و جومگەی نێوان پەنجە و مشت، جومگەی پەنجەی پێ و لۆچی لاران و ژێرباڵ دەردەچن، لە باری درێژخایەندا رەنگی نامێنێت و بە ریشاڵدەبێت fibrotic. (وێنەی ٤٥٧)
ئەم جۆرە یان دووەمییە یان سەرەتاییە، جۆری فرەچەوریخوێن کۆمەڵی II یان III هۆکارەکەیەتی.

٣- **زەردەگمۆڵی پەتکەماسولکەیی** Tendinous xanthomas: بریتییە لە تەنۆچکە و گرێۆکەی (٥-٢٥ ملمی) پەتکە ماسولکەکان بە تایبەتی راستکەرەکان extensors لە پشتی دەست و پێ و پاژنەی پێ achilles tendon دا ( واتا ئاوساوی ژێر پێستین). (وێنەی ٤٥٨)
هۆکارەکان وەك جۆری دوو (لە سەرەوە) وان.




(وێنەی ٤٥٧) زەردە گمۆڵی لوولەیی.




(وێنەی ٤٥٨) زەردە گمۆڵی پەتکەماسولکەیی.

٤- **زەردەگمۆڵی هەڵتۆقیوی** Eruptive xanthomas: تەنۆچکەی بچووکی زەردی پرتەقاڵی یان سووری قاوەیی بە کۆمەڵ لەسەر هەموو لەش دەردەچن، لەوانەیە تەنۆچکەکان بە خەرمانەیەکی سوور دەوردرابن . پتر لە سمت و بەشی ناوەوەی باسك و ران و ئەژنۆ و لۆچەکانی لاڕان و ژێرباڵ و ناوپۆشی ناودەم کۆمەڵ دەبن. (وێنەی ٤٥٩) هۆکارەکەی فرەچەوریخوێنە جۆری I، IV و V یان دوومییە بە تایبەتی بۆ نەخۆشی شەکرە.



(وێنەی ٤٥٩) زەردە گمۆڵی هەڵتۆقیوی

٥- **پانە زەردەگمۆڵی** Plane xanthomas: بە شێوەی پەڵەی پان یان قوتکەی کەم بەرزبووەوەی زەرد یان پرتەقاڵی ، کە خێرا بۆ رووبەرێکی زۆری پێست بڵاودەبێتەوە، دەردەچێت. بە زۆری لە پێڵووی چاو و مل و قەد و شان و ژێرباڵ و بەشی ناوەوەی ران و لۆچەکانی ئەژنۆ و ئانیشك دەردەچن.
هۆکارەکەی فرەخوێنچەوری جۆری III یە، یان دووەمییە بەتایبەتی بۆ زەرداوە بەرپشاڵبوونی جگەر یان مۆخەگمۆڵ myeloma. (وێنەی ٤٦٠)

٦- **زەردەگمۆڵی بەری دەست** Palmar xanthomas: گرێێۆکە و قوتکەی نارێکی زەرد لە بەری دەست و بەشی ناوەوەی پەنجەکان دەردەچن، هۆکاری وەك جۆری پێنج "لە سەرەوە" وایە.
زەردەگمۆڵی هێڵی. Striated X بە شێوەی هێڵاوی زەردباو لە ئاستی چاڵە هێڵەکانی بەری دەست و پێدا دەردەچێت. (وێنەی ٤٦١)



(وێنەی ٤٦٠) **پانە زەردەگمۆڵی.**



(وێنەی ٤٦١) **زەردەگمۆڵی بەری دەست.**

**چارەسەر**

١- دیارکردنی جۆرەکە و پشکنین بۆ هۆکارەکەی.

٢- چارەسەری فرەخوێنچەوری hyperlipidemia بە:

أ) پارێز diet: خۆراکی کەم چەوری و کەم کۆلیسترۆڵی.

ب) هۆکاری کەمکەرەوەی چەوری وەك لۆڤاستاتین lovastatin، سیمڤاستاتین simvastatin، پراڤاستاتین pravastatin، فلوڤاستاتین fluvastatin یان ئاتۆرڤاستاتین atorvastatin.

- یان بیزافیبرەیت bezafibrate، فینۆفیبرەیت fenofibrate، یان جێمفیبرۆسیل gemfibrosil.
- کۆلیستایرامین cholestyramine.
- پرۆبیوکۆل probucol.
- ترشی نیکۆتینیك nicotinic acid.

٣- لەناوبردنی زەردەگمۆڵ بە: ١- نەشتەرگەری، ٢- لەیزەری ($CO_2$ ، Er.YAG ، Pulsed Dye یان Argon)، ٣-TCA یان تەزینەچارە cryotherapy.

## چەورە گردە پرۆتینی Lipoid proteinosis

بۆماوەیی لەشی بەزیوە، باو نییە، بازدانی پرۆتینی I (یەکی) ناواخنی دەرەوەی خانە روودەدات و بەمەش مژادێکی پەردەی بنکەیی ئاسا B.M لە چەندەها بەستەرەشانەدا کۆدەبێتەوە و تەنۆچکەکان دروست دەکات.

نیشتنی تەنراوەی سپی زەردباو لە بەشی ناوەوەی لێو، ژێرزمان، چەپەری ئالۆ fauces و گەلالۆچ uvula و بەشی سەرەوەی سیستمی هەناسەدان، وەك قورگ larynx روودەدات، دەنگگری لە ساواییدا باوە و منالْ ناتوانێت بگریت (وێنەی ٤٦٢)

زمان وەك تەختە وایە و بە ئاسانی ناجوولێنرێت و نەخۆش ناتوانێت زمان بێنێتە دەرەوەی دەم، دەنگە ژێکان vocal cords بە مژادی سپی زەردباو تەنراونەتەوە و ئەستوور بوون، هەمان تەنینەوە هەندێك جار تووشی لێوەگەورەی کیلەك، دەرچەی میز، باتوو، نێوان سمت و ژێر باڵ دەبێت. (وێنەی ٤٦٣)



(وێنەی ٤٦٢) چەورە گردە پرۆتینی.





(وێنەی ٤٦٣)
چەورە گردە پرۆتینی.

دەردی گرێۆکەیی یان بالووکەیی زێدەقۆچەکاژی لە پشتی دەست و پەنجە و ئانیشك و ئەژنۆ دەردەچن، لێواری پێڵووی چاو تەنۆچکەی ڕیزی گرێاوی زەردی روونی بچووکی لە ٣/٢ی بارەکاندا لێ دەردەچێت. نیشتنی کالیسۆم لە ٥٠٪ی بارەکاندا لە ناو کەللەی سەردا روودەدات و هەندێك جار دەبێتە هۆی فێداری.

دەرد لە پێستی سەردا دەبێتە هۆی مووڕووتانەوە، لە دەموچاودا پێست ئەستووربوون و چرچبوون هەن، ددانەکان ناثاساین و لەوانەیە لاجانگەگلاندەسۆ parotitis ی سەرهەڵداوەش روودبدات.

چارەسەر

ئاسان نییە وەك:

١- ستیرۆیدی جێیی بەهێز.    ٢- ڕێتینۆیدەکان بە دەم.

٣- نەشتەرگەری.    ٤- پێنیسیلامین.

## خوێنبۆریەقۆچەکاژە گمۆڵی لەشی بڵاو

Angiokeratoma corporis diffusum

بۆماوەیی سێکسی بەزیوە و ئەنزیمی ئەلفاگالاکتۆسیدەیس ∝-galactosidase کەمە و گلایکۆسفینگۆلیپیدەکان glycosphingolipids لە پێست و هەناو viscera دا کۆدەبنەوە. لە پێستدا تەنۆچکەی فرەدەزوولەیی خاڵی بە بڵاوی دەردەچن و هەندێك قۆچەکاژیان بەسەرەوەیە. پەلەکانی خوارەوە ، باتوو ، چووك، خوارەوەی قەد، ژێرباڵ، گوێچکە و ناوپۆشی ناودەم و لێو دەگرێتەوە و مووی لەشیش کەمە.



(وێنەی ٤٦٤)
خوێنبۆریە قۆچەکاژە گمۆڵی لەشی بڵاو.

تووشبوونی دڵ و گورچیلە دەبێتە هۆی مردن بەڵام لە ٤٠-٥٠ساڵیدا. (وێنەی ٤٦٤)

چارەسەر

بۆ پێست لەیزەر، بۆ هەناو جێگرتنەوەی ئەنزیمەکە و چارەسەری سکالایی.

# زینده داڕزانی چەورەگردیٚ Necrobiosis lipoidica

ئەگەری ٣-٧ کەسە لە ١٠٠٠ کەسدا کە نەخۆشی شەکرەیان هەبێت، ڕێژەی ٦٠٪ی بارەکان لە نەخۆشی شەکرەدا هەیە و ٢٠٪ی تریش بەرگەنەگیری شەکرەیان هەیە یان مێژووی خێزانی شەکرەیان هەیە، مێینە ٣ ئەوەندی نێرینە تووشی دەبێت.تەمەنی دەرکەوتنی ناساغیەکە بە تێکڕایی لە ٣٤ ساڵیدایە. (وێنەی ٤٦٥)

نیشانەکان: تەنۆچکەی سووری بچووکی سنووردیار کە کاژێکی کەمی هەیە بۆ دەردی ڕەقبوونی پێستی نارێك وێکی بازنەیی یان هێلکەیی لێوار دیارکراو و رووکەش لووس و رۆشن پەرەدەستێنێت. ناوەندەکەی نزمتر دەبێتەوە و زەردباوی گۆگردی دەنوێنێت، دواتر دەردەکە پتەو و زەردە و لێوارەکەی پەمەیی یان بنەوشەیی و سوور و پانە، لە بەشە زەردەکەدا چەندین فرەدەزوولە دیارن، زۆر جار چاڵەبرین لەسەر دەردەکە و بە دەگمەن شێرپەنجەی کاژی sq. cell. Ca لەسەر دەردەچێت.



(وێنەی ٤٦٥) زینده داڕزانی چەورەگردیٚ.

زۆربەی دەردەکان لە پێشەوەی لاقەکانن (٨٥٪ی بارەکان)، بەڵام هەندێك جار لە باسك و قەد و دەموچاو و پێستی سەر و بەری دەست و پێ دەردەچن. ٢٠٪ی بارەکان لە ٦-١٢ ساڵدا لەخۆوە چاکدەبنەوە.

### چارەسەر

کۆنترۆڵکردنی نەخۆشی شەکرە (هەرچەندە ئەم کۆنترۆڵکردنە نەخۆشیەکە ناوەستێنێت).

١- ستیرۆیدی جێیی و بە تێچزاندن.

٢- بڕینی دەردەکە و متوربەکردنی پێست.

٣- هەندێك جار ستیرۆیدی سەراپایی، پێنتۆکسی فیللین، کلۆرۆکوین، نیکۆتینئەماید، پۆڤای جێیی، تاکرۆلیمۆسی جێیی، سایکلۆسپۆرین، ترێتینۆینی جێیی، کۆلاجینی ئاژەڵی، یان ئۆکسیجینی پەستراو.

## دیارده پێستیەکانی نەخۆشی شەکرە

١- **پێستەناساغی شەکری** Diabetic dermopathy: لە٥٠٪ی نەخۆشی شەکرەدا بەتایبەتی لە نێرینەدا هەیە، بەشێوەی تەنۆچکەی سووری کپ لە پێشی لاقەکان کە دواتر بۆ دەردی تۆخی پووکاوەی خڕی بچووکی سنووردیار پەرەدەستێنێت. (وێنەی ٤٦٦)

٢- **بڵقی شەکری** Diabetic bullae: بڵقی ناسۆیی بێ ئازار لەخۆوە لە پەلەکان دەردەچن و لە ٤-٥ حەفتەدا بێ شوێنەوار سارێژ دەبن. (وێنەی ٤٦٧)

٣- **ڕەنگگێزەربوون** Carotenosis: لە ٥٠٪ی نەخۆشی شەکرەدا کارۆتینی(گێزەرینی) خوێن carotenemia پەیدەبێت و لە١٠٪ی ئەمانەش ڕەنگگێزەربوونی پێست ڕوودەدات بە شێوەی زەردبوونی پێست بەتایبەتی لە بەری دەست و پێدا، هەندێك جار نەخۆشەکان شەوکوێریش دەبن.




(وێنەی ٤٦٧ بڵقی شەکری.



(وێنەی ٤٦٦- پێستە ناساغی شەکری.

٤- **جومگە کەمجووڵەیی و پێستی مۆمی**: لە ٣٠-٥٠٪ی نەخۆشەکانی شەکرەدا لە باری درێژخایەندا هەیە و ناساغی تۆڕی چاو و گورچیلەشی لەگەڵدایە.

٥- سووربوونەوەی ڕووکەشەخانەسۆئاسا لە لاق و پێدا، تێکچوونی ئارەقکردنەوە، سڕبوونی لاق، چاڵەبرینی ژێرپێ، پەترووشێنی کەڕووی ناوپۆش و بەکتریای ستڕێپتۆکۆکەس کۆمەڵی B، لاڕەشەی گازی، دەرەگوێچکەسۆی گران malignant otitis externa، گۆشتەزوونەگمۆڵی بازنەیی بڵاو disseminated G.A.، زەردەگمۆڵی هەڵتۆقیوی، سووری دەموچاو rubeosis، بەدگەشەیی چەوری (چەوریەپووکانەوە) lipodystrophy، ناساغیە بڕەرە دەستکەوتەکان acquired perforating disorders، دڕکەڕەشبوون، پەلەپەتکە (تیسکی پێست) skin tags، قرچۆکی دوپیوتین Dupuyten contracture.

٤- **زیندە دارزانی چەورەگردێ**: باسمانکرد.

# لووەکانی بن توێژ و ژێر پێست Dermal & subcutaneous tumors

## کەمخوێنە نیشانەیی Nevus anemicus

زگماکییە و پڕبوونی هەستیاری خوێنبۆریەکانە بۆ مژادی کاتیکۆلامینەکان (ئەدرینالین و نۆرئەدرینالین) و بە شێوەی پەڵەی چەندین قەبارە و شێوەی کاڵتر لە پێستی دەوری دەردەچێت و لێوارەکانی نارێکن و دیارن و بە زەبر و گەرمی و ساردی سوور نابێتەوە. بەڵام بە پەستانی سلاید لەسەر نیشانەکە و دەوری پێستی دەوری وەك نیشانەکە کاڵ دەبێت، زۆرجار لە بەڵەکی دەچێت. (وێنەی ٤٦٨)



(وێنەی ٤٦٨) کەمخوێنە نیشانەیی.

## زگماکە مەرمەرە پێستی فرەدەزوولەیی

Cutis marmorata telangiectatica congenita

زۆربەیان جوداین sporadic و لە مێینەدا پترە، بەڵام کەم جار خێزانییە. بەشێوەی تۆڕێکی خوێنبۆری ئەرخەوانی پارچەیی segmental لە پەلەکان دەردەچێت، بە گریان و جووڵەی چالاك و سەرما زەقتر دەنوێنێت. زۆربەیان لە تەمەنی ٢ساڵیدا چاکدەبنەوە. لە ٥٠٪ی بارەکاندا شێوانی تر هەن وەك خوێنبۆریەگمۆڵ، نیشانەی گورزەئاگری nevus flammeus، چاڵەبرین، سەرزلی macrocephaly، کەم گەشەیی، زێدەگەشەیی شانەی نەرم و ئێسك – تاد. (وێنەی ٤٦٩)



(وێنەی ٤٦٩ زگماکە مەرمەرە پێستی فرەدەزوولەیی.

## نیشانەی گورزەئاگری Portwine stain (=Nevus flammeus)

زۆربەیان جوداین sporadic بەڵام کەمێکیان خێزانین (بۆماوەیی لەشی زاڵ)، ڕێژەی ٠,٣٪ی کۆرپە هەیانە. بە شێوەی پەڵەی پەمەیی کاڵ یان سووری تیر لە کۆرپەدا بە قەبارەی بچووك یان زۆر بڵاو بە شێوەی نەخشەیی یان ئاستەدەماری دەردەچێت، ڕەنگی نیشانەکە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا تیرتر (قووڵتر) دەبێت (سووری تاریك دواتر بنەوشەیی)، هەروەها رووکەشی نیشانەکە ئەستوورتر و گرێیاوی دەبێت. هەر دەمێنێتەوە و هەندێك جاریش شێواوی تری لەگەڵدایە. (وێنەی ٤٧٠)

**چارەسەر**

١- ماکیاج (ئارایشت) (dermabland یان covermark)

٢- لەیزەری PDL (٦-١٢ کەرەت) Pulsed dye laser و ئاکامی سەرکەوتووە.



(وێنەی ٤٧٠) نیشانەی گورزە ئاگری.

## پەڵەبۆیەی نامێن (ماچی فریشتە) Fading macular stain (Angel's kiss)

ڕێژەی ٤٢٪ی کۆرپەی سپی پێست هەیانە و زۆربەیان دوای یەك ساڵی تەمەن نامێنن. پارچەیەکی پەمەیی کاڵە کە بە پەستان لەسەری کاڵتر دەبێت blanchable و لێواری نارێکە و زۆربەیان (٨١٪یان) لە پشتی ملە و ڕێژەی ٤٥٪ یان لە پێڵووی چاوە، ٣٣٪یان لە نێوان برۆکان هەیانە، لە کاتی گریان و تا دا زەقتر دەنوێنێت، پەڵەی پشتی مل پتر لەوانەی پێڵوو و نێوان برۆ دەمێنێتەوە، بەڵام هەندێك جار هەر دەمێنێتەوە و لاناچێت.

## کەموکووڕی خوێنهێنە قووڵەکان Deep venous malformations

کەموکووڕی خوێنهێنەکان بە شێوەی گرێۆکەی فشۆڵی سووری ڕوون یان ئەرخەوانی تێری خڕ بە تایبەتی لە سەر و مل لە هەردوو پێست و ناوپۆشەکان دەردەچن، بەشێکی قووڵی کە بەستراوە بە سووڕی خوێنهێنی هەیە. چارەسەری ئاسان نییە. نموونەیەك بۆ ئەم جۆرە بریتییە لە کۆنیشانەی نیشانەی شینە جیرە بڵق blue rubber bleb nevus syndrome کە تێیدا دەردی پێست شینە و چەقەکەی نەرم و بەرزبووە و گۆییە و بە زۆری لە قەد و قۆڵدا هەن و ئازار بە شەو نموونەییە. ئەم دەردانە لە ڕێچکەی گەدە و ڕیخۆڵەدا بەتایبەتی لە ڕیخۆڵە باریکەدا هەن و لەوانەیە بتەقن و گووڕەشە melena دروست بکەن.

## کۆنیشانەی کلیپڵ ترینەونەی Klippel-trenaunay syndrome

**پێکهاتووە لە:** (وێنەی ٤٧١)

١- نیشانەی گورزە ئاگری لە پێستی پەلێك لە پەلەکان، زۆربەی جار لە هێڵی ناوەڕاستی پەلەکە کۆتایی دێت، بەڵام لەوانەیە پارچەیی بێت و بۆ سمت و قەد بکشێت، یان دوولایەکی یان بڵاوبێت، لەوانەیە خوێنبۆریە گمۆڵی هەبێت و هەندێك جار کەموکووڕی خوێنهێنەرەکان قووڵتر بۆ ماسولکە و ئێسکەکان دەکشێت. پەلە تووشبووەکە لە ئاسایی درێژتر و گەورەترە و لەوانەیە زۆر شێوانی تریش هەبن.



(وێنەی ٤٧١)
کۆنیشانەی کلیپڵ ترینەونەی.

٢- کەموکووڕی خوێنهێن و لیمفەبۆرییەکان.

٣- زلبوونی شانە نەرمەکان.

## کۆنیشانەی ستێرج – وێبەر Sturg-Weber syndrome

بریتییە لە نیشانەی گورزەئاگری لەو رووبەرەی پێست کە لقی چاوی opthalmic division دەماری سێ لقی (دەماری ٥) تێدایە و نیشانە و سکاڵای تەنکەمێشکەپەردەی leptomeninges (وەك فێ، کەم ژیری، لائیفلیجی، لاهەست تێکچوون ....تاد) لەگەڵدایە ، چونکە خوێنبۆریەگمۆڵی ئەم پەردەشی گرتۆتەوە ، هەروەها لەوانەیە سکاڵا و نیشانەی گرتنەوەی چاو، وەك ئاوی رەش، جیابوونەوەی تۆڕە و کوێربوون، هەبن.

## کەموکووڕی لیمفەبۆریە رووکەشیەکان Superficial lymphatic malformations

**لیمفەبۆریە گمۆڵی سنووردار Lymphangioma circumscriptum:**



(وێنەی ٤٧٢) لیمفە بۆریەگمۆڵی سنووردار.

بریتییە لە کەموکووڕی لیمفەبۆری زگماکی و بە شێوەی تەنۆچکەی بلۆقی قووڵی بە کۆمەڵ ،کە لە گەرای بۆق دەچن، لەکاتی لەدایکبووندا یان دوای کاتێکی کەم لەدایکبوون دەردەچن و رەنگیان زەردە، بەڵام هەندێك جار پەمەیی، سوور یان تۆخە (تاریکە) (وێنەی ٤٧٢). ئەگەر دەرزی بە تەنۆچکەکاندا بکرێت مژادی لیمفی روونی لێ

دێتەدەر، ئەم کەموکوورِیە لە سك، ژێربالْ، کۆئەندامی زاووزێ یان ناودەم بە تایبەتی زمان دەردەچێت.

چارەسەر

١- رەقکرنەچارە (چەقەچارە) sclerotherapy.

٢- دوای پشکنین بە MRI، ئەگەر بە سیستمی لیمفی قوولْ نەبەسترابێتەوە و تەنیا رووکەشی بوو ئەوە لەیزەر($CO_2$ laser) بەکەلْکە.

.

**کەموکوورِی لیمفەبۆری پۆرگی** Cystic lymphatic malformation:

تەنی شانەیی نەرمی قوولْی سنووردیاری فرەکلۆریی multilocular و بە پێستی ئاسایی داپۆشراون و بێ ئازارن و زۆربەیان لە ناودەم و پەلەکاندان. وەك نموونە شێگمۆلْی پۆرگی cystic hygroma لە مل و ژێربالْ یان لارِان دا.

**لیمفەبۆریە گمۆلی** Lymphangiomatosis:

بریتییە لە کەنالْی لیفەبۆری فراوانبووی فرەکلۆریی لە پێست و شانەی نەرم و ئێسك و ئەندامەکاندا . زگماکیە و دەگمەنە.

## فراوانبوونی خوێنبۆری Dilatation of pre-existing vessels

## نیشانەی جالْجالْۆکەیی ( جالْجالْە خالْ ) Spider nevus

لە جالْجالْۆکەی سوور دەچێت، چونکە ناوەڕاستەکەی لەشەکەیەتی کە بریتییە لە خوینبەرۆچکە arteriole و لاقەکانی(کە بریتین لە فرەدەزوولەی بچووك) لەم لەشە بۆ هەموو لایەك دەکشێن. ئەم نیشانەیە بە تاکی یان چەندینی لە دەموچاو و مل و هەندێك جار لە سەرەوەی قەد و پەلەکانی سەرەوەدا دەردەچێت، لە منالْدا پتر لە پشتی دەست و باسك و دەموچاودا هەن. (وێنەی ٤٧٣)



(وێنەی ٤٧٣) جالْجالْەخالْ.

زۆربەیان لە منالْ و ژنی سکپڕدا هەن ،دوای منالْبوون خێرا نامێنن، بەلاّم لە منالْدا دوای چەند سالْ نامێنن. هەندێك جار لە نەخۆشی جگەردا وەك بەرِیشالْبوونی جگەر، جگەرسۆی جۆری C، شێرپەنجەی جگەر و شێواوی تری جگەردا دەردەچن چونکە ئاستی ئیسترۆجین لە خوێندا لە ئاسایی بەرزترە.

چارەسەر

سووتانی ئێلێکتریکی بۆ چەقی نیشانەکە یان لەیزەر جۆری PDL.

## خوێنهێنە دەریاچە Venous lakes

بلۆقی بچووکی شینی کپی کەمێك بەرزبووەوەن کە بەئاسانی بە پەستان فشدەکرێنەوە compressible . لە دەموچاو و گوێچکە و لێو و مل و باسك و پشتی دەست دەردەچن و بەهۆی زەبری درێژخایەنی تیشك دروست دەبن و پێستی دەوریان بە خۆر تێکچووە. (وێنەی ٤٧٤)



(وێنەی ٤٧٤) خوێنهێنە دەریاچە.

چارەسەر

سوتانی ئێلێکتریکی، لەیزەر، مەیاندن بە تیشکی ژێر سوور، ١٪ پولیدۆکانۆڵ بە تێچزاندن، یان تەزینەچارە.

## فرەدەزوولە Telangiectasia

بریتییە لە خوێنبۆریە فراوانبووی پێست ،چ خوێنهێنەرۆچکە یان موولوولە (خوێندەزوولە capillary) یان خوێنبەرۆچکە بێت . بە شێوەی باریکەهێڵی خوێنبۆری بەسەر رووی پێست یان ناوپۆشدا دەکشێن. لەوانەیە لە هەموو تەمەنێکدا لە مرۆڤی ئاساییدا هەبن، وەك گوێچکە بەڵام لە شوێنی بەرخۆرکەوتووی درێژخایەندا پترن. هەروەها لە ئەنجامی پێستەسۆی تیشکی، پێستەوشکەی رەنگاڵە .X.P، گورگەسوورە، پێست رەقبوون، پێستەماسولکەسۆ، نەخۆشی گوڵی، بەرپشاڵبوونی جگەر – تاد هەن.

چارەسەر

سووتاندنی ئێلێکتریکی، لەیزەر PDL ، Nd: YAG.

## فرەدەزوولەی بڵاوی هۆنەزانراو Generalized essential T.

زۆربەیان جوداین sporadic و پتر لە مێینەی ٤٠-٥٠ساڵیدا هەن، لە سەرەتادا لە لاقەکاندا دەردەچن و بۆ سك و باسکەکان بە شێوەی موو دەزوولە و خوێنهێنەری فراوانبوو بە جیاجیا یان بە کۆمەڵ دەکشێن، هیچ سکاڵاو نیشانەی تری لەگەڵدا نییە.

چارەسەر: وەك سەرەوە.

## فرەدەزوولەی یەکلایی نیشانەیی Unilateral nevoid T.

فرەدەزوولەی باریکی دەزوویی لە یەك لا و هەندێك جار لە ئاستە دەماری بە تایبەتی بەشی دەماری سێ لقی یان دەماری ملی ٣ و ٤ یان دەوروبەری دەردەچێت. هەندێك جار زگماکییە و هەندێك جاری تریش کاتی باڵقبوونی مێینە یان کاتی سکپڕی یان نەخۆشی جگەر، دەردەچن.

**فرەدەزوولەی خوێنرێزی بۆماوەیی** Hereditory hemorrhagic T.

بۆماوەیی لەشی زاڵە ، خوێنهێنەر و خوێنبەرەکان راستەوخۆ بێ موولوولە بەیەکەوە بەستراونەتەوە، بازدانی یەکێك لە دوو جین (ENG یان ALK-I)یان هەیە.

**نیشانەکان**: چەمکی بچووکی مووەدەزوولەی فراوانبوو لە ناوپۆش و پێستدا بڵاوبوونەتەوە و کەمێك بەرزبوونەتەوە. بە زۆری لە لێو و زمان و مەڵاشوو و ناوپۆشی لووت و گوێچکە و بەری دەست و کۆتایی پەنجەکان و ژێر نینۆك و ژێر پێدا هەن.

**سێ لەم چوار هەل و مەرجانە بۆ دیارکردنی نەخۆشیەکە پێویستن:**

١- لووتپژانی epistaxis سەرهەڵداوەی لەخۆوە.

٢- فرەدزوولە telangiectasia وەك باسمانکرد.

٣- دەردی هەناوی visceral lesions: فرەدەزوولەی گەدە و ریخۆڵە، سی، جگەر، مێشك یان پەتکە دەمار.

٤- مێژووی خێزانی family history: واتا خزمێکی پلە یەکی تووشبوو.

**چارەسەر**

چارەسەری ماکی خوێنرێزی وەك گەدەوریخۆڵە، سی، مێشك .- تاد پێویستە.

بۆ لووتپژان لە مێینەدا،چارەسەر بە ئیسترۆجین یان حەپلەی نەزۆکاندن. وە بۆ هەردوو رەگەز متوربەکردنی ناوپۆشی لووت بە پێستی ران یان سمت.

## خوێنبۆریە قۆچەکاژەگمۆڵی Angiokeratoma

بریتییە لە فرەدەزوولە کە رووکەشەکەی زێدەقۆچەکاژی بێت ،ئەمانەن:

### خوێنبۆریە قۆچەکاژەگمۆڵی میبێللی Angiokeratoma of Mibelli

تەنۆچکەی ١-٥ ملمی خوێنبۆری سووری رووکەش زێدەقۆچەکاژی دەردەچن و دواتر رەنگیان سووری کپ یان رەشی ئەرخەوانی و شێوەیان بالووکەیی خڕ دەبێت، بە تایبەتی لە پشتی پەنجەی دەست و پێ و ئانیشك و ئەژنۆ دەردەچن و زۆربەی نەخۆشەکان دەست و پێیان شینهەڵگەڕاو و ساردە. (وێنەی ٤٧٥)



(وێنەی ٤٧٥)
خوێنبۆریەقۆچەکاژە گمۆڵی میبێللی.

بۆماوەیی لەشی زاڵە و دەگمەنە و پێش باڵقبوون دەردەکەوێت.

**چارەسەر**: سووتاندنی ئێلێکتریکی، لەیزەری $CO_2$.

## خوێنبۆریە قوچەکاژەگمۆڵی تاکی Solitory angiokeratoma

تەنۆچکەی تاکی بچووکی رەشی شینی بالووکەییە لە پەلەکانی خوارەوەدا، لەوانەیە بەهۆی زەبر دروست بێت.

چارەسەر: نەشتەرگەری (برین)، لەیزەر، سووتاندنی ئێلێکتریکی.

## خوێنبۆریە قۆچەکاژەگمۆڵی باتوو Angiokeratoma of the scrotum

تەنۆچکەی چەندانەکی بچووکی خوێنبۆرین لە پێستی باتوو یان کیلەك لە تەمەنی ناوەڕاست و پیریدا. بە دەستکاریکردن یان لەخۆوە خوێنڕێژیان تووش دەبێت. (وێنەی ٤٧٦)

چارەسەر: سووتاندنی ئێلێکتریکی، برینی تاشین shave exision، لەیزەر.



(وێنەی ٤٧٧)
خوێنبۆریە قۆچەکاژەگمۆڵی سنووردار.



(وێنەی ٤٧٦) خوێنبۆریە قۆچەکاژەگمۆڵی باتوو.

## خوێنبۆریە قۆچەکاژەگمۆڵی سنووردار Angiokeratoma circumscriptum

.

زگماکییە و بریتییە لە کەموکووڕی خوێنهێن و موولوولەی بن توێژ و ژێر پێست ،بە شێوەی دەردی سووری شینی سنووردیاری رووکەش زێدەقۆچەکاژی لە پەلەکانی خوارەوە و هەندێك جار لە سنگ و باسکدا دەردەچن. (وێنەی ٤٧٧)

چارەسەر: نەشتەرگەری (برینی ئەستووری واتا قووڵی تەواوی پێستە تووشبووەکە) + لەیزەر بە یەکەوە.

## کێمینەگۆشتەزوونەگمۆڵ Pyogenic granuloma

بریتییە لە خوێنبۆریەگمۆڵی موولوولەیی کلۆیی و کلۆکان بە دیواری بەستەرەشانەیی جیاکراونەوە و بەشێوەی تەنۆچکەی ناسکی لاسکدار یان پاڵکەوتووی بچووکی هەڵتۆقیوی تاك و کەم جار چەندینی لە

شوێنە بەرچاوەکان وەك دەست ، باسك ، دەموچاو، ناودەم و شوێنی زەبر بە تایبەتی لە منالّدا دەردەچێت، لە ژێر پێ و دۆشەکەی نینۆکدا هەندێك جار دەردەچن. بە ئاسانی خوێنڕێژی بەتایبەتی بە زەبری کەم تووش دەبێت. (وێنەی ٤٧٨)


(وێنەی ٤٧٨)
کێمینە گۆشتەزوونەگمۆڵ.

دەرمان وەك ئایزۆترێتینۆین هەندێك جار هۆکاری چەندین لەم دەردانەیە.

چارەسەر: بە ئامێری تاشێن curette لادەبرێت و بنکەکەی بە نایترەیتی زیو یان TCA یان سووتانی ئێلێکتریکی داخ دەکرێت، یان بە نەشتەرگەری لادەبرێت، یان لەیزەر بەکاردەهێنرێت.

## خوێنبۆریە گمۆڵی ساوایی (تووترکی) Infantile (strawberry) hemangioma:

باوترین لووی ساوایە و ئەگەری ١-٢,٦٪ی کۆرپەی لەدایکبووی هەیە، مێینە بۆ نێرینە ٣:١ دەبێت. ئەم لووە بۆ ٣-٩ مانگ گەشەدەکات و گەورەتر دەبێت (بەدەگمەن تا ١٨ مانگی) و لە ٢-٦ ساڵدا دەپووکێتەوە و لە ٧-١٠ ساڵیدا نامێنێت. ٥٠٪ی بارەکان بێ شوێنەوار و ٥٠٪کەی تر شوێنەواری وەك فرەدەزوولە، جێ پووکاوەیی یان جێ زام جێ دەهێڵن. (وێنەی ٤٧٩)


(وێنەی ٤٧٩ خوێنبۆریەگمۆڵی ساوایی.

لە سەرەتادا پەڵەیەکی کاڵ یان سوور یان شینکی رووکەش و لێوارنارێك دەردەچێت و بۆ ٠,٥-٥ سم گەشە دەکات، بەڵام هەندێك جار گەورەتر دەبێت. ٨٠٪ی ساواکان یەك دەردیان بە تایبەتی لە سەر و دەموچاو (٦٠٪) یان قەد (٢٥٪) و کەمتر لە پەلەکان (١٥٪)دا هەیە، بەڵام رێژەی ٢٠٪ ەکەی تریان چەندانەکین multiple و بچووك و قوچەکەیین و خوێنبۆریەگمۆڵی هەناویان لەگەڵدایە.

چەند جۆرێکی نائاسایی هەن وەك:

١- **خوێنبۆریەگمۆڵی قووڵ** Deep hemangioma: واتا خوێنبۆریە گمۆڵی بۆش .cavernous H لە بەشی قووڵی بن توێژ و ژێر پێستدا گەشەدەکات و بەشێوەی تەنی ژێرپێستی جیڕی پتەوی جێیی ک بەرزبووەوەی شین کە فرەدەزوولەی لەسەرە، دەردەچێت یان ئەوەندە قووڵە کە پێستی سەر لووە ئاساییە. هەندێك جار جۆری رووکەشی و قووڵ بە یەکەوە هەن (بەشی ژێر پێست و بەشی ئاسا سەرەوە کە رووکەشەکەی سوورە). (وێنەی ٤٨٠)

٢- **خوێنبۆریەگمۆڵی فرەدەزوولەیی** .Telangiectatic H: لووی پانی یان کەم بەرزبووەوەی قوو سوورە و رووپۆشەکەی فرەدەزوولەی لەسەرە و لە نیشانەی گورزەئاگری دەچێت، بەڵام و جۆرەکانی سەرەوە لە کاتی خۆیدا دەپووکێتەوە . لەوانەیە ئەگەر زۆر بڵاوبوو سستی دڵ و چاڵەبر دروست بکات. (وێنەی ٤٨١ أ،ب)




(وێنەی ٤٨٠) **خوێنبۆریەگمۆڵی قووڵ.**



(وێنەی ٤٨١ أ)
**خوێنبۆریە گمۆڵی**



(وێنەی ٤٨١ ب)
**لە ١١ ساڵی تەمەندا نە**



(وێنەی ٤٨٢) **خوێنبۆری**
**گمۆڵی چەندانەکی**

٣- **جۆری لە خوێنبەر-خوێنهێن کەموکووڕی چوو** .AVM-like H: خوێنبۆریەگمۆڵی جێیە لەگەڵ لادان shunting و ماکی هەیە، وەك خوێنڕێژی، خوێن مەیین و سستی دڵ و درەنگتر دەپووکێتەوە.

٤- **جۆری چەندانەکی** .Multiple infantile H: (وێنەی ٤٨٢) بچووکن (١-٢٠ ملم) و لە پێست یان لە پێست و هەناو وەك لیمفەگرێکان، جگەر، سپڵ، مێشك و پەردەپۆشەکەی، گلێنە و تۆڕی چاو، لیکەگلاند، ژێر کۆڵەگلاند thymus، دڵ، ڕێگەی گەدە و ڕیخۆڵە، سی، میزەڵدان، گورچیلە، پۆرگی زراو، پەنکریاس و رژێنی ئەدرینال دەردەچن. ئەم جۆرە لە ١-٢ ساڵدا نامێنێت.

٥- **جۆری زگماکی** .Congenital H: ڕێژەی نێرینە و مێینە وەك یەکن و

بەخێرایی لە ساواییدا گەشەناکات، جۆرێکیان زوو دەپووکێنەوە (لە ١٤ مانگدا) و جۆرێکی تریان کە هەر گەشە دەکات ناپووکێنەوە.

**ماکەکان:**

چاڵەبرین، خوێنڕێژی، تووشێنی بەکتریایی، شێواندنی پەرگلێنە و بەرچاوگرتن، گرتنی کونی لووت و قوڕقوڕاگە و کەناڵی گوێچکە، سستی دڵ و شێواندنی ئێسکی.

**چارەسەر**

١- زۆربەیان چارەسەریان ناوێت و دڵنیاکردنەوەی باوك و دایك و ناوەناوە پشکنین بەسە.

٢- لە ٢٥٪ی بارەکاندا بەهۆی چاڵەبرین یان لەبەر بوونی لووەکە لە شوێنی گرنگ وەك باسمانکرد،بەم شێوەیەی خوارەوە چارەسەر دەکرێن.

أ) ستیرۆید بە تێچزاندن بۆ لووی نزیك کونی لووت وگوێچکە و کۆم و چاو و - تاد ، هەر ٤ حەفتە جارێك بۆ ١-٥ جار، یان ستیرۆیدی جێیی بەهێز بۆ دەردی بچووکی رووکەشی.

ب) ستیرۆیدی سەراپایی ٣ ملگم/کگم/رۆژ بۆ ١-٢ مانگ و لە پتر لە ٨٠٪ یاندا گەشەی لووەکە دەوەستێنێت یان دەیپووکێنێتەوە، ئەگەر لە ٢-٣ حەفتەدا بێوەڵام بوو دەیوەستێنین.

ج) ئینتەرفیرۆن ئەلفا ٢أ و ٢ب INF∝ 2a 2b، بۆ باری مەترسیدار بۆ ژیان ، بە ژێر پێست S.C. بە ژەمی ٣ ملیۆن یەکە .I.U/م٢/رۆژ بۆ ٦-١٢ مانگ.

د) لەیزەر: PDL بۆ جێ پووکانەوە بەکار دەهێنرێت. لەیزەری KTD و Nd:YAG بە تێچزاندن بۆ ناو لووەکە بەکاردێت.

هـ) نەشتەرگەری: پێش تەمەنی ٦ساڵی بۆ باری تایبەتی یان چاڵەبرین یان ترسناك.

**بۆریەگمۆڵی گێلاسی (بۆریەگمۆڵی پیری)** Cherry (senile) angioma (=De morgan spots)

بریتییە لە تەنۆچکەی (٠,٥ - ٦ ملمی) خڕی کەمێك بەرزبووەوەی سووری یاقووتی (شەوچرایی) ، باوترین جۆری شێوانی بۆریەخوێنین و پتر لە سەرووی تەمەنی ٣٠ ساڵی دەردەچن و ژمارەیان لەگەڵ تەمەندا پتر دەبێت، زۆربەیان لەسەر قەدن.

**چارەسەر:** چارەسەری ناوێت، یان سووتاندنی ئێلێکتریکی ،یان لەیزەر، یان تاشین shave exision.

## Glomus tumor لووی گلۆمەس

لووی گلۆمەس (خوێنبەرەماسولکەدەمارە لوو neuromyoarterial tumor) گرێیۆکەی رەنگ پێستیە یان کەمێك شینە و ۱-۲۰ ملم دەبێت، لووی ژێر نینۆك لە پلێتی نینۆکەوە دەبینرێت، بەدەست لێدان بە ئازارە و زۆر هەستیارە، پتر لە ژێر نینۆکدا بەلام لە پەنجە و قۆلدا هەندێك جاری تر هەن.
جۆری چەندانەکی بە دەستلێدان بە ئازارنین و لە سەر پێستی لەش زۆر بلاون و لەوانەیە بۆماوەیی لەشی زالبن.
**چارەسەر**: نەشتەرگەری.

## لووی سارکۆمای کاپۆسی Kaposi sarcoma (K.S.):

شێرپەنجەی ناوپۆشەشانەی لیمفی و خوێنبۆریە بەتایبەتی خوینبۆری بن توێژ، جۆرەکانی:

١- جۆری باو Classic K.S.: پتر لە پەنجەی پێ و ژێر پێدا بەشێوەی قوتکە و گرێیۆکەی جیرِی سوور، بنەوشەیی، یان رەش و شین دەردەچێت و لەوانەیە ئاوسانی زۆر لە پەلە تووشبووەکەدا دروست بکات.
٢- جۆری پێستی ئەفریکایی African cutaneous K.S..
٣- جۆری لیمفەگرێدەردی ئەفریکایی African lymphadenopathic K.S..
٤- جۆری لەگەل ئەیدزدا.
٥- جۆری لەگەل سستی بەرگریدا.

## نائاساییەکانی شانەی ریشالی Fibrous tissue abnormalities

### گۆشتپارە Keloid

بریتییە لە دەردێکی بەرزبووەوەی سوور یان پەمەیی یان تۆخی ریشالی نارێك و پتەو، پتر دوای زەبر و برین، برینی سووتان یان زیپکە لە سنگ یان سەرەوەی پشت، شان یان گوێچکە (دوای گوێچکەسمین) دەردەچێت و سنووری زەبرە سەرەتاییەکە بۆ ئەم لاولا بە شێوەی چنگ claw دەبەزێنێت (وێنەی ٤٨٣). لە سەرەتادا سوورە و بەدەستلێدان بەئازارە و جیرە، دواتر گەورە دەبێت و لەوانەیە خوران و ئازاری هەبێت. زۆربەی جار




(وێنەی ٤٨٣) گۆشتپارە.

چەندانەکین و قەبارەیان لەسەری دەرزی بۆ پرتەقاڵ دەبێت، زۆرجار هێڵین و کۆتایەکانی پانتر و خڕترن، هەندێك جار لە مل و پەلەکان و قەد دەردەچن.

هۆکاری نەزانراوە بەڵام: ۱) رەگەز: رەشپێست وگەنمرەنگ پتر دەیگرن، ۲) شوێن: وەك باسمانکرد هەندیك شوین پتر دەیگرن.

۳) زەبر، ٤) خواستیpredisposed ، تەنیا هەندێك کەس تووشیان دەبێت.

جێزامەستوورە hypertrophic scar لە گۆشتپارە دەچێت، بەڵام کشانی چنگی نییە و لە شوێنی زەبری سەرەتایی تێپەڕناکات و لەخۆوە باشتر دەبێت و لە نموونەوەرگرتنیشدا چەمکی کۆلاجینی مۆمی نییە.

چارەسەر: ستیرۆید بە چزاندن (ترایئەمسینۆلون triamcinolone ۲۰-٤۰ ملگم/مل چەند حەفتەیەك جارێك، لەیزەری flash-lamp PDL، تەزینە نەشتەرگەری cryosurgery، برین بە نەشتەرگەری و بەکارهێنانی ستیرۆید بە تێچزاندن لە دەوری برینەکە و بەکارهێنانی پەستان، یان برین + IFN-∝2b + ئیمیکویمۆدی جێیی، یان شلەی سلیکۆن.

## پەنجەقرتێ Ainhum

بریتییە لە تەسکبوونەوەی هێڵی بە دەوری پەنجەی پێدا، بەتایبەتی پەنجە بچووکە و لە ئاکام دا لەخۆوە دەقرتێت (دەبڕێتەوە). زۆربەی جار یەکلا دەگرێتەوە و لە رەشپێستدا باوە، چاڵی هێڵی لە بەشی خوارەوەی نێوان پەنجەی پەڕی و نزیك دروست دەبێت و پەرەدەستێنێت و لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا پەنجەپەڕیەکە دەئاوسێت و نەرم دەبێت و چاڵەبرینی لێ دروست دەبێت و لە ۵-۱۰ ساڵ دا لە خۆوە لێدەبێتەوە. هۆکاری نەزانراوە. (وێنەی ٤٨٤)


(وێنەی ٤٨٤) پەنجەقرتێ.

چارەسەر: نەشتەرگەری (Z-plasty) یان ستیرۆید بە تێچزاندن یان برینەوە.

## بۆریە ریشاڵەگمۆڵ Angiofibromas

بریتییە لە تەنۆچکەی رەنگ پێستی یان سوور کە تێیدا پتر بوونی شانەی ریشاڵی و خوێنبۆری لە سەرەوەی بن توێژدا هەیە، وەك:


(وێنەی ٤٨٥) ریشاڵە تەنۆچکەی لووت.

۱- ریشاڵەتەنۆچکەی لووت Fibrous papule of the nose: بەشێوەی تەنۆچکەی(۳-٦ ملمی) رەنگ پێستی، سپی، یان سووری پاڵکەوتووی sessile قوچەکەیی(وێنەی٤٨٥)، لە تەمەنی پێگەیشتوودا adulthood دەردەچێت و زۆربەی جار یەك دانەیە . چارەسەری برینە بە نەشتەرگەری.

٣- تەنۆچکەی چووکی مرواری Pearly-penile-papules: بریتین لە تەنۆچکەی قووچەکەیی سپی وەك مرواری لە دەوری گوڵینەی (تاجی) چووك ، لەوانەیە نەرم یان پتەو یان دەرزیلەیی بن و پتر لە ٢٠-٣٠ ساڵیدا دەردەکەون و چارەسەری ناوێت. (وێنەی ٤٨٦)



(وێنەی ٤٨٦) تەنۆچکەی چووکی مرواری.

## کرکراگە پێستەسۆی گرێیی پەرەی گوێی درێژخایەن Chondrodermatitis nodularis chronica helicis

بریتییە لە گرێیۆکەیەکی بچووکی بەئازار (بە پەستان)، لەسەر پەرەی گوێ و پتر لە پیاواندا. ئەم دەردە ٢-٤ ملم دەبێت و باوە و هەندێك جار تا ١٢ دەرد هەن و کەمێك سوورە و کاژێکی بە سەرەوەیە، یان چاڵە برینێکی رووکەشی هەیە و درێژخایەنە. دارِزانی کەمخوێنداری ischemic necrosis توێژ هۆکارەکەیەتی و لەو لایەدا کە نەخۆش لەسەری دەخەوێت روودەدات، هەندێك جار مێژووی زەبر، خۆربەرکەوتنی درێژخایەن یان گەستنی سەرما هەن. (وێنەی ٤٨٧)



(وێنەی ٤٨٧) کرکراگە پێستە سۆی گرێی پەرەی گوێی درێژخایەن.

چارەسەر:

١- نەشتەرگەری ( واتا برینی گرێ کە) یان برینی کرکراگەی ژێر پێست.

٢- ستیرۆیدی جێیی بەهێز یان بە تێچزاندن.

٣- لەیزەری $CO_2$.

٤- بەکارهێنانی سەرینی تایبەتی ،کە شوێنی چاڵی لە ئاستی گوێچکە تێدابێت.

## پەلە پەتکە (تیسکی پێست) Skin tags (Acrochordon)

بریتین لە گۆگمۆڵی papillomas لاسکدار pedunculated یان پاڵکەوتووی sessile بچووکی رەنگ گۆشتی یان قاوەیی تاریك، بە قەبارەی سەری دەرزی یان گەورەتر، لە مل و هەندێك جار ژێرباڵ و پێڵووی چاو و ژێر مەمکی مێینە و کەمتر لە قەد و لارِاندا. هەندێك جار بەهۆی لوولخواردنی لاسکەکەی خوێنی لێ دەبرِێت و سۆدەکات و بەئازار دەبێت و لەوانەیە لارەشەی تووشبێت. (وێنەی ٤٨٨)

زۆر باوە و ڕێژەی ٦٠٪ی خەڵکی لە ٦٩ ساڵیدا هەیانە، بەڵام ژمارەیان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا پتر دەبێت و لە نەخۆشی شەکرەدا باوترن.



(وێنەی ٤٨٨) تیسکی پێست.

**چارەسەر:** لە بنکەکەیەوە بە پێڕی کەوانەیی curved scissors دەبڕێت، یان تەزینەچارە یان بە سووتاندنی ئیلێکتریکی لادەبرێت.

## پێستەڕیشاڵەگمۆڵ Dermatofibroma

باوە، پتر لە تەمەنی ناوەڕاستی ژیاندا دەردەچێت و بریتییە لە گرێۆکەیەکی تاکی هێلکەیی یان خڕی (٠,٥ – ١ سمی) قاوەیی سوور و هەندێك جار زەردباو و سنووردیار کە بە بەرجەستەکردن palpation نەك بە تێڕوانین باشتر دەستنیشان دەکرێت. لەوانەیە لە ئاستی پێست بەرزبووبێتەوە یان چاڵتر بێت، دەردەکە ڕەقە و بە توێژەوە نووساوە و هەندێك جار پێستەکەی سەری وەك ناوك دەردەکەوێت. کەم جار قەبارەی بۆ ٥ سم دەڕوات، درێژخایەنە و لەوانەیە دوای چەند ساڵێك بپووکێتەوە. زۆربەیان لە پەلەکانی خوارەوەدان، یان لە سەر ئانیشك، یان لاکانی قەد دان. (وێنەی ٤٨٩)



(وێنەی ٤٨٩) پێستەڕیشاڵە گمۆڵ.

## ماستخانەیی (کۆلکەخانەیی) Mastocytosis

بریتییە لە پتربوون و کۆبوونەوەی خانەی ماست (کۆلکەخانە) بە شێوەی جێیی یان سەراپایی. خانەی ماست mast سەرچاوەکەی مۆخی ئێسکە .B.M ( جۆری +CD34) و گوێزەرە پێشتردروستبووەکان وەك هیستامین، هیپارین و سایتۆکاینەکان هەڵدەگرێت و کە ڕژاندنی بۆ دەرەوەی خانە دەبێتە هۆی سوورهەڵگەڕان، لیر، سکچوون، سکئێشە، سەرئێشە، هەناسەسواری، بورانەوە و دڵەکوتێ.

جۆرەکانی:

أ) **جۆری پێستی .Cutaneous M**: دەگمەن نییە و ئەمانەی خوارەوەن:

١- **ماستخانەگمۆڵی (کۆلکەخانەگمۆڵی) تاک** Solitary mastocytoma

ڕێژەی ١٠-٤٠٪ی بارەکانی منالّییە، لەکاتی لەدایکبوون یان چەند حەفتەی یەکەمی ژیاندا بە شێوەی پەڵەی قاوەیی کە بە لێخشاندن stroking دەبێت بە لیر دەردەچێت، دواتر دەبێت بە تەنۆچکە، قوتکە یان لوو بەلاّم زۆربەی جار لە ١ سم بچووکترە. ڕووکەشەکەی لووسە بەلاّم هەندێك جار پرتەقاڵیە ( پنتی بچووکی لەسەرە). زۆربەیان لە پشتی دەست نزیك مەچەکن، لەوانەیە ئاوسان، لیرکردن، بلۆق یان بڵق کردن لە دەردەکەدا هەبێت . لەوانەیە تاکە دەرد سکالاّی سەراپایی، وەك سوورهەڵگەڕان، دروست بکات. زۆربەیان پێش١٠ ساڵی نامێنن یان بە بڕین چارەسەر دەکرێن. (وێنەی ٤٩٠)



(وێنەی ٤٩٠) کۆلکەخانە گمۆڵی تاك.

٢- **﴿لیری بۆیەیی (لیری ڕەنگی)﴾ (جۆری سەراپایی)**

Urticaria pigmentosa (Generalized Eruption)

ڕێژەی ٦٠-٩٠٪ی بارەکانی منالّییە. لە چەند حەفتەی یەکەمی ژیاندا بە شێوەی پەڵە، تەنۆچکە یان گرێیۆکەی ڕەنگ گوڵی بەخورووی کەمێك تۆخ، هێلکەیی یان خڕی ٥-١٥ ملمی دەردەچێت و دواتر کۆدەبنەوە ، ڕەنگی زەردی قاوەیی یان زەردی سوورە و هەندێك جار بلۆق و بڵق لەسەرەتاوە هەن. لە ٣ ساڵدا نامێنن و لە سەر هەموو پێست دەردەچن.



(٤٩١) لیری ڕەنگی

لێخشاندنی توندی دەردەکان دەبێتە هۆی نیشانەی داریەر Dariers sign (واتا لیرکردنی دەردەکە). لیری نەخشەیی لە ٣/١ تا ٢/١ی بارەکاندا هەیە. (وێنەی ٤٩١)

پێست مۆمی و قاوەیی دەبێت و پێش باڵقبوون نامێنێت.

٣- **ماستخانەیی بڵاوی پێست .Diffuse cutaneous M**: دەگمەنە و بەهۆی ماستەخانەکان هەموو پێست ئەستوور و پرتەقاڵیە و لەوانەیە بڵق، وەك توێژ شیبوونەوە، دەربچن.

٤- **ماستخانەیی باڵقی** Adult mastocytosis: جۆری باڵقییە و پەڵەی فرەدەزوولەیی



(وێنەی ٤٩٢) ماستخانەیی باڵقی.

پەمەیی یان پەمەیی قاوەیی کە بۆ هەموو لەش بڵاودەبنەوە دەردەچن و سپڵ و جگەر و مۆخی ئێسك لە ٢٠٪ی بارەکاندا دەگرنەوە، بەڵام سکاڵای سەراپایی، وەك سوورهەڵگەڕان و دڵەکوتێ و سەرئێشە دەگمەنن. (وێنەی ٤٩٢)

ب) **ماستخانەیی سەراپایی** Systemic M.: دەگمەنە.

**چارەسەر**

١- دوورکەوتنەوە لەو مژادانەی دەنکۆڵەی خانەی ماست دەردەهاوێژن وەك هۆشبەرەکان، ئەسپرین، ئەلکوهول، کوینین - تاد.

٢- چونکە نەخۆشەکان بەهۆی پێوەدانی مێروو (زەردەواڵە - تاد) زۆر تووشی دارمانی سیستمی دەبن ،پێشتر نەخۆش ئێپینەفرینی پێبێت بۆ کاتی تەنگانە و فێرکرابێت چون بەکاری بێنێت.

٣- دوورکەوتنەوە لە خشاندنی friction توند، پلەی گەرمای ئەوپەڕ یان فشار.

٤- دژەهیستامین جۆری $H_1$ و $H_2$ و دژەسیرۆتۆنین وەك نیفیدیپین ١٠ ملگم × ٣.

٥- پوڤا PUVA.

٦- ستیرۆیدی جێیی بەهێز لە ژێر بەستندا یان، هەندێك جار بە تێچزاندن.

## چەوریەگمۆڵ Lipoma



(وێنەی ٤٩٣) چەوریەگمۆڵ.

لووی ژێر پێستە و لە چەوری پێکهاتووە، تەنی زەردی پلۆکەیی lobulated هێلکەیی یان خڕی خەپلەیین disk-shpaed، لە هەموو تەمەنێکدا بەڵام بە تایبەتی لە تەمەنی ناوەڕاستدا هەن. زۆربەیان بێ سکاڵا و بچووکن و بە سستی گەشەدەکەن، بەڵام هەندێکیان گەورەن. لە هەموو شوێنێکی پێست بە تایبەتی لە مل و قەد دا بە تاکی یان چەندانەکی دەردەچن و نابن بە شێرپەنجە . چارەسەری بە نەشتەرگەری ئاسانە. (وێنەی ٤٩٣)

### کۆنیشانەکانی چەوریەگمۆڵی چەندانەکی Multiple lipoma syndromes

**چەوریەگمۆڵی چەندانەکی خێزانی** Familial multiple lipomas

١- بۆماوەیی لەشی زاڵە، پێش ٣٠ساڵی دەردەکەون، بە سەدان چەوریەگمۆڵی جیاجیای

گەشەسستی بێ سکالای ژێر پێستی قەبارە جیا بە بلاوی بە تایبەتی لە پەلەکان( وەك باسك)، دەردەچن. (وێنەی ٤٩٤)


(وێنەی ٤٩٤) چەوریە گمۆلی چەندانەکی خێزانی.

٢- چەوریەگمۆلی بلاو Diffuse lipomatosis: بریتییە لە پەرگەشەکردنی بلاوی بێ سنووری چەوریەخانەی پێگەیشتوو mature adipocytes لە قەد و پەلەکانی سەرەوە و شێوانی لەشی دروست دەکات. چارەسەری: مژتنی چەوری suction lipectomy.

٣- چەوریەگمۆلی چوونیەکی Symmetric lipomatosis (Madelung's disease): پتر لە نێرینەی تەمەن ناوەڕاستی مەی خۆرەوەدا هەیە و هۆی نەزانراوە، لووی چەوری سنوور نادیاری چەندانەکی و چوونیەکی لە ژێرپێست و شانە قووڵەکانی مل و خوار پشتی سەر و بەشی سەرەوەی پەلەکان و سەرەوەی قەد دا دەردەچن و جووڵەی مل کەمدەکاتەوە و لە ملیوانی ئەسپ دەچێت.


(وێنەی ٤٩٥) چەوریەگمۆلی بلاو.

٤- نەخۆشی دێرکەم Dercum's disease: دەگمەنە و پتر لە مێینەی لێچووەوەی قەڵەودا هەیە، چەندەها چەوریەگمۆلی گەشەسستی بەئازار لە قۆڵ و قەد و دەوری گوێچکە دەردەچن، ئازاری زۆر توندە . برین بە نەشتەرگەری وکێشدابەزاندن و دژەئازار چارەسەرەکەیەتی. (وێنەی ٤٩٥)

٥- چەوریەگمۆلی زگماکی Congenital lipomatosis: بە شێوەی تەنی نارێکی گەورەی ژێر پێست لە چەند مانگی یەکەمی ژیاندا دەردەچێت و قووڵە.

## لووسەماسولکەگمۆل Leiomyoma

لووی لووسە ماسولکە smooth muscles یە و بەئازارە، چەند جۆرێکی هەیە:

١- جۆری تاکی پێستی Solitory cutaneous L.: لووی (٢-١٥ ملمی) جولاوی movable خڕی سنووردیاری قووڵە و ناوبەناو بەئازارە، پێستی سەر لووەکە سوورە یان بنەوشەییە.

٢- جۆری چەندانەکی پێستی .Multiple Cu.L: باوترین جۆرە، بۆماوەیی لەشی زاڵە و لە ١٠-٤٠ ساڵیدا دەردەچێت. دەردی تەنۆچکەیی قاوەیی سوور و بەکۆمەڵی (٢-٢٣ ملمی) لووسی پتەوی رووکەشی جوڵاو لە قەد و پەلەکان بە شێوەی هێڵی یان ئاستەدەماری و هەندێك جار لە زمان و ناودەم دەردەچن، بە سەرما و دەست بەرکەوتن یان لەخۆوە بەئازاردەبن. (وێنەی ٤٩٦)



(وێنەی ٤٩٦)
لووسە ماسولکە گموڵی چەندانەکی پێستی.

٣- جۆری کۆئەندامی سێکسی .Genital L: لە باتوو و لێوی گەورەی کیلەك و بە دەگمەن گۆی مەمك دەردەچن، زۆربەیان تاك و بێ ئازارن.

٤- جۆری تریش هەن.

چارەسەر: نەشتەرگەری بۆدەردی تاك. بۆ دەردی چەندانەکی: دۆکسازۆسین doxazocin، نیفیدیپین ١٠ ملگم × ٣ یان گاباپێنتین gabapentin.

# نیشانەکان Nevi

## نیشانەی توێژی (.Epidermal nevi (E.N

بەهۆی بازدانی جینی جێی دوای دروستبوونی هێلکەی پیتراو post-zygotic روودەدات، ئەمانەن:

* نیشانەی توێژی بالووکەیی هێڵی .Linear verrucous E.N

لە کاتی لەدایکبوون یان هەندێك جار لە ١٠ ساڵی یەکەمی ژیاندا دەردەچن (یەك کەس لە ١٠٠٠ کۆرپەی لەدایکبوو هەیەتی) . بە شێوەی تەنۆچکەی رەنگ پێستی، قاوەیی یان قاوەیی خۆڵەمێشی بالووکەیی، لە پاڵ یەك دەردەچن و لەوانەیە بۆ پێکهێنانی قوتکەی گۆگمۆڵی سنووردیار یەك بگرن . شێوەی هێڵی بەتایبەتی لە پەلەکاندا باوە. بە دەگمەن لە تەمەنی پیریدا شێرپەنجەی لێ دەردەچێت.

ئەم نیشانەیە سنووردارە یان بلاوە(وێنەی ٤٩٧)، ئەگەر لە یەك لای لەش بلاوبوو پێی دەڵێن جۆری لایی، ئەگەر بە بلاوی دوولایەکی بوو پێی دەڵێن نەخۆشی ماسی درکی icthyosis hystrix (وێنەی ٤٩٨)، ئەگەر سۆیی بوو (سووربوونەوە و کاژ و قەتماغەی هەبوو) پێی دەڵێن جۆری سۆیی .inflammatory L.V.E.P (وێنەی ٤٩٩).

چارەسەر: نەشتەرگەری (بۆئەوەی سەرهەڵنەداتەوە قووڵایی بن توێژیشی لەگەڵ لادەبرێت)، لەیزەر (تاشین)، تاشینی کیمیکی، سووتاندنی ئێلێکتریکی، تەزینەچارە، یان پێنج فلۆرۆ بوراسیل لەگەڵ ترێتینۆین لە ژێر بەستندا.



(وێنەی ٤٩٧) نیشانەی توێژی بالووکەیی.



(وێنەی ٤٩٨)
نیشانەی توێژی بالووکەیی هێڵی.

(وێنەی ٤٩٩)
نیشانەی توێژی بالووکەیی هێڵی سۆیی.

## * نیشانەی سەرەزیپکەیی Nevus comedonicus

بە شێوەی تەنۆچکەی بەکۆمەڵی کەم بەرزبووەوەی هێڵی (وەك سەرەزیپکە پەستاوتراوی چەوری تێدایە) لە دەموچاو و مل و قۆڵ و سنگ، لە تەمەنی کۆرپەییدا تا ١٥ ساڵی دەردەچێت و پۆرگ و دوومەڵ و ناسۆر و جێ زام لە نیوەی بارەکاندا هەن.



(وێنەی ٥٠٠) نیشانەی سەرەزیپکەیی.

چارەسەر: نەشتەرگەری یان چارەسەری ماکەکان وەك ترێتینۆینی جێیی، ئایزۆترێتینۆین بە دەم، یان دژە بەکتریا و هەندێك جار ستیرۆید بە تێچزاندن. (وێنەی ٥٠٠)

## * پێستەستوورێی ڕێڕێیی Lichen striatus

وەرگیراوە و لە منالی٥-١٥ ساڵی دا هەیە، هەڵتۆقیوی کتوپڕی تەنۆچکەیی بچووکی (١-٣ ملمی) پانی جیاجیای ڕەنگ پێستی سووری یان پەمەیی بە شێوەی هێڵی دەردەچن. تەنۆچکەکان بۆ پەتی (١-٣ سم) پان کۆدەبنەوە و لە چەند حەفتەیەکدا بۆ سەر پەلێکی خوارەوە یان سەرەوە و کەمجار بۆ قەد دەکشێن. هەندێك جار بەخورووە و نینۆکیش دەگرێتەوە و لە ١ ساڵدا نامێنێت.

## * چەوریە قۆچەکاژی Seborrhoeic keratosis

زۆر باوە و هەموو کەسێك یەك دانە یان پتری لە ژیانیدا هەیە، زۆربەیان لە ٣٠-٥٠ ساڵیدا دەردەکەون و هۆکاری نەزنراوە، بەڵام بەرخۆرکەوتنی درێژخایەن و مێژووی خێزانی هەندێك جار گرنگن (وێنەی ٥٠١).



(وێنەی ٥٠١) چەوریە قۆچەکاژی.

زۆربەی بارەکان چەندانەکین و بە شێوەی قوتکە یان تەنۆچکەی سنووردیاری کەمێك بەرزبووەوەی هێلکەیی گەنم ڕەنگی قاوەیی بۆ ڕەش یان ڕەش، بچووکتر لە ٣ سم ،دەردەکەون و رووکەشەکەی زبرە و بالووکەییە و هەندێك جار قەتماغەییە. بە تێڕوانین دەڵێی تەنی دەرەکییە بە پێستەوە نووساوە stuck on، هەندێك جار جۆری بچووکی پەلەپەتکەئاسا، بەڵام رووکەش زبر ، لە مل و ژێر مەمکدا هەن و زۆر جار لەخۆوە

لێدەبنەوە. هەندێك جاری تر جۆری چەندانەکی بچووکی (٣-٤ ملمی) رەنگپێستی یان خۆڵەمێشی سپی چوونیەکی لە لاقەکاندا هەن. هەندێك جار هەڵتۆقینی ژمارەیەکی زۆر لەم دەردانە نیشانەی بوونی شێرپەنجەی هەناوییە وەك رژێنە شێرپەنجەی پۆشەری گەدە adenocarcinoma of stomach و کۆڵۆن و مەمك، هەرچەندە لە شێرپەنجەی تریشدا وەك لیمفۆفا، شێرپەنجەی خوێن و میلانوماش دا هەیە و ئەم نیشانەیە پێی دەڵێن نیشانەی لیسەر ترێلات Leser trēlat.

چارەسەر: تەزینەچارە، سووتاندنی ئێلێکتریکی، لابردن بە ئامێری کراندن (تاشێن) curette، لەیزەر، نەشتەرگەری، پێست تاشین dermabrasion یان کرێمی 5FU.

## * رەشەتەنۆچکەیی پێستی Dermatosis papulosa nigra

ـە رەشپێستدا باوە (٣٥٪یان هەیانە)، بەڵام لە دانیشتوانی ئاسیاشدا هەیە. لە هەرزەکاریەوە بە شێوەی پەڵە ‌ ‌ تەنۆچکەی تۆخی یان رەنگ پێستی خڕی گچکەی تاك تاك یان بە کۆمەڵی تەنك لە کۆڵم و ژێر چاو دەردەکەون و لەگەڵ تێپەربوونی کاتدا ژمارە و قەبارەیان پتر دەبێت و لەوانەیە سەدان دەرد دەربچن و دواتر لە هەموو دەموچاو و مل و سەرەوەی سنگ بڵاو دەبنەوە.



(وێنەی ٥٠٢) رەشەتەنۆچکەیی پێستی.

چارەسەر: تاشین، تەزینەچارە ( بە نایترۆجینی شل) یان سووتاندنی ئێلێکتریکی سووك(وێنەی٥٠٢).

## * قۆچەکاژی خۆری Actinic keratosis

بریتییە لە بەدگەشەیی پێست بەهۆی خۆر، واتا لووی پێستی پێکهاتوو لە پتربوونی خانەی کاژی نائاسایی. بە شێوەیەکی سەرەکی لە شوێنە بەرخۆکەوتووەکاندا وەك دەموچاو و گوێچکە و پێستی سەری رووتاوە و پشتی دەست و باسکدا هەن.

زۆربەی جار چەندانەکین و جیاجیان و پانبووەوە یان کەمێك بەرزبووەوەن، قۆچەکاژیی یان بالووکەیین، سوور تۆخ یان رەنگ پێستین.

(وێنەی ٥٠٣)





(وێنەی ٥٠٣) قۆچەکاژی خۆری.

رووکەشەکەی بەکاژ داپۆشراوە و وەك سمارتە زبرە، هەندێك جار بەدەست بەرکەوتن بەئازارن. قەبارەیان ٣ ملم بۆ ١ سم دەبێت، لەوانەیە جۆری قۆچەکاژیەکە قۆچی لێ دەربچێت. لە پشتی دەست و باسکیشدا هەن. زۆربەیان دوای ٥٠ساڵی

بەڵام هەندێك جار لە ٢٠-٣٠ ساڵیدا لە ناوچەخۆریەكاندا دەردەچن و زۆر باوە، ئەم نەخۆشانە پتر شێرپەنجەی نامیلانۆمایان تووشدەبێت. بەڵام خۆپاراستن بە دژە خۆر و خۆراكی كەم چەوری بەكەڵكە.

**چارەسەر:**

١- خۆپاراستن لە خۆر.
٢- تەزینەچارە بە نایترۆجینی شل.
٣- پێنج فلۆرۆیوراسیلی جێیی ٠,٥-٥٪ كرێم بۆ چەند حەفتەیەك.
٤- ئیمیكویمۆد imiquimod ٥٪ كرێم بۆ چەند حەفتەیەك.
٥- تاشینی كیمیكی، تاشینی لەیزەری.
٦- تیشكەبزیوەچارە photodynamic therapy.
٧- جێڵی ئەداپالین، دایكلۆفیناكی جێیی، لابردن بە ئامێری تاشێن، برین بە نەشتەرگەری.

## * قۆچی پێست Cutaneous horn

بریتییە لە هەڵتۆقینی قۆچی پێستی (٢-٦٠ ملم درێژە) و هەندێك جار چەندانەكی چەمكیە(وێنەی ٥٠٤)، زۆربەیان لە دەموچاو و پێستی سەرن و بیۆەین و لەسەر چەوریەقۆچەكاژێ، بالووكە، خوێنبۆریە قۆچەكاژەگمۆڵ، گوازەرەملێ M.C. - تاد (٦٠٪ی بارەكان) یان لەسەر شێرپەنجەی كاژی و بنكەیی (٢٠٪ی بارەكان) دەردەچن.
**چارەسەر:** چارەسەری دەردی ژێری دەكرێت و قۆچەكە بە نەشتەرگەری لادەبرێت.



(وێنەی ٥٠٤- قۆچی پێست.

## * قۆچەكاژەدڕكەگمۆڵ Keratoacanthoma

بریتییە لە لووی شێرپەنجەیی كە زۆربەی جار وەپاش دەچێتەوە regressing، هەندێك جار بەركەوتنی خۆری درێژخایەن و سپی پێستی و زەبر و نەشتەرگەری هۆكارن. جۆرەكانی:

١- جۆری تاكی .Solitary R: بریتییە لە تەنۆچكەیەكی گەشەخێرا بەشێوەی گرێێكەی نیوگۆیی ڕەنگپێستی رووكەش لووسی ناوەند چاڵی پڕ لە پەستاوتراوی قۆچەكاژی سنووردیار، رووكەشەكەی فرەدەزوولەی تێدایە. زۆربەیان لە بەشی ناوەندی دەموچاو، پشتی دەست، قۆڵ و هەندێك جار لە سمت و ران و چووك و گوێچكە و پێستی سەر دەردەچن. لە نێرینەدا لە پشتی دەست و لە مێینەدا لە خوارەوەی لاقدا باوە. پیری سپی پێست پتر دەیگرن، لە ژێر نینۆكدا لەخۆوە وەپاش ناچێتەوە و نینۆك و ئێسكی پەنجەكە تێك دەدات.

ئەم لووە بۆ ٢-٦ حەفتە گەشەدەكات و بۆ هەمان كات لە گەشە دەوەستێت و بە هەمان كاتیش وەپاش دەچێتەوە، بەڵام لە هەندێك باردا ٦-١٢ مانگ دەمێنێتەوە. (وێنەی ٥٠٥)





(وێنەی ٥٠٥) قۆچە كاژە دڕكەگموڵ

چارەسەر:

١- چاوەڕوانكردن تا وەپاش دەچێتەوە، بەڵام ئەم بۆچوونە باش نییە چونكە شانە تێكدەدات.

٢- نەشتەرگەری (بڕین).

٣- تێچزاندنی شلەی 5-FU ٥٠ ملگم/مل حەفتانە، بلیۆمایسین ٠,٥ ملگم/مل، میثۆترێكسەیت ٢٥ ملگم/مل تا ٤ جار.

٤- ژەمی كەمیمیثۆترێكسەیتی سیستمی.

٥- چارەسەر بە تیشكهاویشتن radiation therapy.

٢- جۆری چەندانەكی(٣-١٠ دەرد) multiple K: خێزانییە و وەك جۆری ١ وایە.

٣- جۆری هەڵتۆقیوی گشتی generalized eruptive K.: زۆر دەگمەنە.

٤- جۆری كشاوی لێواری K. centrifugum marginatum: دەردەكە بەرەو پەڕی دەكشێت و ناوەندەكەی دەپووكێتەوە و تا ٥-٣٠ سم گەورە دەبێت، بەڵام وەپاش ناچێتەوە.

چارەسەر: رێتینۆید بە دەم، میثۆترێكسەیت بە دەم + پریدنیزۆلون.

## شێرپەنجەی خانەی بنكەیی Basal cell carcinoma

لووی شێرپەنجەیی دارێژراوە لە خانەی كاژنەكەری چینی بنكەیی و ئەگەر چارەسەر نەكرێت پەلهاوێژە و شانە وێران دەكات، بەڵام زۆر بە دەگمەن تەشەنەدەكات metastasize.

باوترین شێرپەنجەیە بە تایبەتی لە پیردا هەرچەندە گەنجیش دەیگرێت، رێژەی ٢٥٪ی هەموو شێرپەنجەكان ئەم جۆرەیە و لە نێرینەدا پترە.

هۆكارەكان:

١- جۆری پێستی I و II. ٢- بەرخۆركەوتنی درێژخایەن یان ناو بە ناوی توند.

٣- چارەسەر بە تیشكهاویشتن radiation therapy. ٤- مێژووی خێزانی پۆزەتیف.

٥- سستی بەرگری.

٦- هەندێك جار بوونی شێرپەنجەی تر وەك میلانۆما و شێرپەنجەی لێو یان هەناوی.

نیشانەكان: بوونی دەردی سارێژنەبووی دارزاو گومانی ئەم شێرپەنجەیەی لێ دەكرێت، دەردەكە خوێنڕێژی بۆ ماوەیەكی كورت لێ دێت و سارێژ دەبێت و دیسان سەرهەڵدەداتەوە، زۆربەیان لە شوێن

بەرخۆرکەوتووەکانن وەك دەموچاو و سەر و مل، بەڵام لەوانەیە لە هەموو شوێنێکی پێست دەربچن. ڕوونی، چاڵەبرین، فرەدەزوولە و لێواری لووڵخواردوو جوداگانەن، جۆرەکان:





(وێنەی ٥٠٦) شێرپەنجەی خانەی بنکەیی (جۆری گرێیۆکەیی).

١- جۆری گرێۆکەیی Nodular BCC: باوترین جۆرە (٥٠-٨٠٪)، یەك یان چەند گرێۆکەیەکی بچووکی مۆمی ڕوونی ناوەند تەپیو کە لەوانەیە چاڵەبرینی یان قەتماغەیی یان خوێنڕێژی بێت،دەردەچێت. لێوارەکەی لووڵخواردووە و ڕووکەشەکەی فرە دەزوولەی تێدایە، خوێنڕێژی بە زەبری سووك باوە. جگە لە خوێنڕێژی بێ سکاڵایە، زۆربەیان (٨٥-٩٠٪ ی بارەکان) لە سەر و دەموچاو و مل دان، بە زۆری لە لووت (٢٥-٣٠٪ یان) دەردەچن. (وێنەی ٥٠٦)



(وێنەی ٥٠٧) شێرپەنجەی خانەی بنکەیی (جۆری پۆرگی).

٢- جۆری پۆرگی Cystic BCC: گرێۆکەیەکی پۆرگی شین و خۆڵەمێشی گومەزییە. (وێنەی ٥٠٧)

٣- جۆری پیستەڕەقەیی یان کۆنێتی Morphoeic or cicatricial BCC ٩٥٪یان لە سەر و مل دان . (وێنەی ٥٠٨)، قوتکەی سپی ڕەقن بێ لێواری لووڵخواردوو یان قەتماغە یان چاڵەبرین، بەڵام فرەدەزوولەی لە سەرە و ڕێژەی ٢-٦٪ی بارەکانە و توندە



(وێنەی ٥٠٨) شێرپەنجەی خانەی بنکەیی (جۆری پێستەڕەقەیی).

٤- جۆری تەنینەوەیی Infiltrative BCC: توندە و پارچەی تەنینەوەی دڕکی قووڵی بۆ ژێرەوە هەیە، بەڵام ڕواڵەتی جۆری ڕەقی نییە.

٥- جۆری ڕووکەشی Superficial BCC: بە شێوەی پارچەی سووربووەوەی سنووردیار کە لە بیرۆ دەچێت بەڵام بۆ چارەسەری بیرۆ بێوەڵامە. لە قەددا دەردەچێت

و ڕێژەی ١٥٪ی بارەکانە، کەم جار لە پەلەکان و دەموچاودا هەیە. (وێنەی ٥٠٩)

٦- جۆری تۆخ Pigmented BCC: هەروەك جۆری یەك وایە، بەڵام بەهۆی بوونی میلانین، تۆخە (قاوەیی یان ڕەشە) و ڕێژەی ٦٪ی بارەکانە. (وێنەی ٥١٠)



**(وێنەی ٥٠٩) شێرپەنجەی خانەی بنکەیی (جۆری ڕووکەشی).**



**(وێنەی ٥١٠) شێرپەنجەی خانەی بنکەیی (جۆری تۆخ).**

٧- جۆری چاڵەبرینی کرتێنەر Rodent ulcer: جۆری فەرامۆشکراوە و قەبارەی گەورەیە و ناوەندەکەی دارزاوە. (وێنەی ٥١١)

٨- جۆری ریشاڵەڕووپۆشەگمۆڵی پینکەس Fibroepitheioma of Pinkus: تەنۆچکەی ڕەنگپێستی بەرزبووەوەی پاڵکەوتووی خوارەوەی قەدە یان ڕان یان لاڕان یان بڕبڕەیە و لەوانەیە تا ٧ سم بێت و ڕووکەشییە.

٩- جۆری تریش هەن وەك جۆری فرەگۆپی polypoid، جۆری کونی pore-like، جۆری ناوازە aberrant – تاد.



**(وێنەی ٥١١) شێرپەنجەی خانەی بنکەیی (جۆری چاڵە برینی کرتێنەر).**

**چارەسەر:**

١- لابردن بە نەشتەرگەری (٤-٥ ملم پێستی دەوری دەردەکەش لادەبرێت).

٢- بە ئامێری تاشین (کڕاندن) curettage لابرێت و بە سووتاندنی ئێلێکتریکی بسووتێنرێت.

٣- تەزینەچارە.

٤- چارەسەری جێیی بە ئیمیکویمۆد imiquimod، 5FU – تاد.

## شێرپەنجەی خانەی کاژی Squamous cell carcinoma

دووەم باوترین شێرپەنجەی پێستە و داڕێژراوە derived لە خانەی کاژی سەروی خانەی بنکەیی توێژ، لە بەساڵاچووی سپی پێست و نێرینەدا ( ١:٢ ) باوترە، هۆکارەکان:

- دەردی ڕێخۆشکەر (شێرپەنجەهێن) precursor lesions، وەك قۆچەکاژی خۆری .A.K و نەخۆشی باون .Bowen's ds.
- بەرکەوتنی ت س و (خۆر).
- تیشك هاویشتن radiation.
- شێرپەنجەهێنی ژینگەیی، وەك مەرگەمووش، هایدرۆکاربۆنەکان، جگەرەکێشان و مەی.
- سستی بەرگری.
- جێ زام.
- سووتان و بەرکەوتنی گەرمی درێژخایەن.
- ڤایرۆسی بالووکە HPV.
- نەخۆشیە جینیەکانی پێست، وەك پێستەوشکەی ڕەنگاڵە .X.P، توێژ شیبوونەوەی بلّقی – تاد.

**نیشانەکان:** زۆربەی جار لە شوێنی قۆچەکاژی خۆری لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان وەك دەموچاو و پشتی دەست، بە شێوەی دەردی رووکەشی و ڕەق کە بنکەکەی بەرزبووە و خر و تۆکمەیە دەردەچێت. دوای چەند مانگێك گەورەتر دەبێت و وەك گرێیۆکەی قووڵی لێدێت و دەبێت بە چاڵەبرینی، چاڵەبرینەکە لە سەرەتادا رووکەشیە و بە قەتماغە شارراوەتەوە، بە بەرجەستەکردن palpation هەست بە خەپلەی ڕەقی جیابووەوە ،لە شانەی دەوری، دەکرێت. هەروەها لە سەرەتادا لووەکە جێیە و بەرزبۆتەوە و بەسەربەخۆیی دەجوڵێنرێت، بەڵام دواتر بڵاودەبێت و نزمتر دەبێتەوە و بۆ پێکهاتەکانی ژێری پەلدەهاوێت. لەوانەیە لووی سەرووی ئاستی پێست گومەزی بێت و دەڵاندنی کێمی بۆگەنی لینجی لێ بێتەدەر.

لە لێوی خوارەوەدا پتر دوای خۆرەلێوەسۆ لە شوێنی درز یان قۆچەکاژی بە شێوەی گرێیۆکەی پتەو دەردەچێت کە لەوانەیە بۆ دەرەوە و ناوەوەی دەم وەك چاڵەبرینێکی تێکدەر بکشێت. مێژووی جگەرەکێشان باوە، لە لێوی سەرەوەدا دەگمەنترە و لە پیاواندا باوترە (١:١٢) و زۆربەیان سەرووی ٦٠ ساڵین، لە ١٠–١٥٪ی بارەکاندا تەشەنە دەکات metastasize. (وێنەی ٥١٢)



(وێنەی ٥١٢) **شێرپەنجەی خانەی کاژی.**

جۆری دەوری نینۆك، بە شێوەی ئاوسان و سووربوونەوە و ئازار لە نوشتاوەی نینۆك دەردەکەوێت و هەروەك بالووکە وایە.

ڕێژەی ٠,٥–٥٪ی بارەکانی شێرپەنجەی خانەی کاژی بەتایبەتی بۆ لیمفەگرێ جێییەکان تەشەنە دەکات.

چارەسەر: برین بە نەشتەرگەری (١سم دەوری لووەکە لەگەڵ شێرپەنجەکە لادەبرێت).

## نەخۆشی (باون) Bowen's disease

بریتییە لە شێرپەنجەی خانەی کاژی لە جێی خۆیدا in situ و لەوە دەچێت سەرچاوەکەی رووپۆشەخانەی پاشکۆی پێست بێت، دواتر بۆ توێژی دەوری پەلدەهاوێژێت و توندە.



(وێنەی ٥١٣) نەخۆشی باون.

لەوانەیە لە هەموو شوێنێکی پێست ،بەڵام پتر لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکاندا، دەربچێت. بە تاك و کەم جار بە چەندانەکی هەن. بریتییە لە پارچەیەکی نەتەنراوەی قەتماغەیی و کاژی سووری (چەند میللیمەترێك بۆ چەند سەنتیمەترێك) سنووردیار، هەندێك جار لە نەخۆشی سەدەف یان چەوریەقۆچەکاژێ دەچێت.

ئەگەر پەلی هاویشت، چاڵەبرین و شێوەی قارچکی لێ دێت. (وێنەی ٥١٣)

چارەسەر: برین، تاشین و سووتاندنی ئێلێکتریکی، تەزینەچارە، پێنج فلۆرۆیوراسیل + ئیمیکویمۆد یان لەیزەری Nd:YAG یان $CO_2$ – تاد.

## نەخۆشی پاجێت Paget's disease

بریتییە لە شێرپەنجەی رژێنی adenocarcinoma ناوتوێژ، کە لە سۆ یان تووشێن infection دەچێت(وێنەی ٥١٤). بە شێوەی پارچەی کاژی یان سووری سنووردیاری یەك لایی لە گۆی یان بازنەی دەوری گۆی مەمك (مەمیلە) دەردەچێت و بۆ پێستی دەوری دەکشێت. لەوانەیە دەڵاندن، خوێنرێژی، چاڵەبرین یان گۆی مەمك بەناوداچوون retracted nipple هەبێت، لە سەرەتاوە خوران و ئازار لە ٢٥٪ی بارەکاندا هەیە و لە ٨٢-٩٢٪ی بارەکاندا خانە شێرپەنجەییەکان لە شێرپەنجەی رژێنی ژێر دەردەکە بۆ پێستی گۆی مەمك کشاون و لە٥٠٪ی نەخۆشەکاندا تەنی بەردەست کەوتوو هەیە، ئەگەر لیمفەگرێکانی ژێرباڵ بەردەست کەوتووبن ئەوە شێرپەنجەکە پەلی هاویشتووە، ئەگەرنا شێرپەنجەی لەجێی خۆیە in situ.



(وێنەی ٥١٤) نەخۆشی پاجێت.

نەخۆشی پاجێت لە شوێنی تردا وەك، کیلەك، چووك، باتوو، دەوری کۆم، لۆچی لاڕان و ژێر باڵ بە شێوەی پارچەی داماڵراوی سووری کاژی رووکەشی، قەتماغە و چاڵەبرین و لوو دەردەچن. خوران و خوێنرێژی و ئازار و سووتانەوەش، بۆ چەند مانگ تا چەند ساڵ، باون.

چارەسەر: نەشتەرگەری مەمکی بۆ دەکرێت.

## Sebaceous nevi and tumors نیشانە و لووی چەوری

### Nevus sebaceous نیشانەی چەوری

زگماکییە و لە ۱۰۰۰ کۆرپەدا ۳ یان هەیانە، زۆربەیان تاکن و ڕێژەی ٥٠٪یان لە پێستی سەردان و ٤٥٪یان لە شوێنی تری سەر و مل و ٥٪یان لە قەد دەردەکەون، بە شێوەی دەردی زەردی پرتەقاڵی سنووردیار بە قەبارەی چەند میللیمەترێك تا چەند سەنتیمەترێك و پتربە شێوەی هێڵی دەردەچێت و بە درێژایی ژیان دەمێنێتەوە، لە سەردا جێگاکەی مووی تێدا نییە و لە سەرەتادا کەمێك زبر و گۆییە بەڵام لە تەمەنی پێگەیشتوودا پتر بەرزدەبێتەوە و گۆیاوی ترە و لووی بێوەی یان بە دەگمەن شێرپەنجەی لێ دەردەچێت. (وێنەی ٥١٥ أ)

چارەسەر: نەشتەرگەری.



(وێنەی٥١٥ أ) نیشانەی چەوری.

### Sebaceous hyperplasia زلبوونی ڕژێنە چەوری

لە وڵاتی ئێمەدا باوە و پتر لە دوای ٤٠ساڵی دەردەکەوێت لەو کەسانەی بەرکەوتنی خۆری درێژخایەنیان هەیە ، بەڵام جۆری بۆماوەیی کە دەگمەنە زووتر دەردەچێت.



(وێنەی ٥١٥ ب) زلبوونی ڕژێنەچەوری.

بە شێوەی تەنۆچکەی بچووکی (٢-٦ ملمی) زەردی یان ڕەنگ کرێمی ناوکدار – لە ناوچەوان و ژێر چاڵی چاو و لاجانگ و هەندێك جار ڕوومەت و کەم جار گۆی مەمك و دەوری و چووك و مل و سنگ دەردەچن. سایکلۆسپۆرین هەندێك جار دروستی دەکات. (وێنەی ٥١٥ ب)

چارەسەر: سووتاندنی ئێلێکتریکی، لەیزەر، تاشین یان ئایزۆترێتینۆین

## Sweat gland tumors لووی ڕژێنە ئارەقی

### Syringoma ڕژێنەئارەقەکمۆل

باوە و لووی بێوەیە لە ڕژێنە ئارەقەکاندا و بە شێوەی تەنۆچکەی (١-٣ ملمی) ڕەنگ پێستی یان کەمێك زەرد و پتەوی چەندانەکی لە پێستی پێڵووی چاو و سەرەوەی ڕوومەت ، بەڵام هەندێك جار لە ژێر

باڵ و سك و ناوچەوان و كیلەك و چووك دەردەچن. بە دەگمەن یەك لایە یان هێڵییە و هەندێك جار خێزانییە، لە مەنگۆل دا زۆر باوە(وێنەی ٥١٦ )

چارەسەر: تاشین، سووتاندنی ئێلێكتریكی یان تاشینی لەیزەری.

## پۆرگەنارەقەگمۆڵ Hidrocystoma

بریتییە لە تەنۆچكەی (١–٣ ملمی) روونی پتەوی لووسی سووری شینی جولاّوی بن توێژ یان ژێر پێست،كە بەسستی گەشەدەكات و لە مێینەدا پترە، زۆربەیان تاكن و لە پێستی سەر و دەم وچاو و قەد و سك و بە دەگمەن لە پەلەكان دەردەچن. زۆربەیان لە تەمەنی پێگەیشتوودا دەردەكەون. (وێنەی ٥١٧ )

چارەسەر: برین بە نەشتەرگەری.



(وێنەی ٥١٦ ) رژێنە نارەقەگمۆڵ.



(وێنەی ٥١٧ ) پۆرگە نارەقەگمۆڵ.

## رژێنەپۆرگە ئارەقەگمۆڵی گۆیی Syringcystadenoma papilliferum

بە شێوەی تەنۆچكەی سووری گوڵی پتەو (١–٣ ملمی) بە تاك یان كۆمەڵ دەردەچن، كیسی بچووكی بلۆقی پڕ لە شلەی روون لە ناو كۆمەڵە تەنۆچكەكەدا هەن و هەندێك تەنۆچكە ناوكین (ناوچاڵن) umbilicated و جارجاریش قوتكەی بالووكەیی یان گۆیی دەردەچن. (وێنەی ٥١٨ )



(وێنەی ٥١٨ ) رژێنە پۆرگەئارەقەگمۆڵی گۆیی.

سێیەكی بارەكان لە نیشانەی چەوری لە سەر و دەموچاودا دەردەچن و نیوەی بارەكان لە قەد و لاڕان و كۆئەندامە سێكسیەكان لە كاتی باڵقبووندا دەردەچن، بە دەگمەن شێرپەنجەی لێ دەردەچێت، چارەسەری برینە بەنەشتەرگەری.

## نیشانە و لووی سەلکی موو Hair follicle nevi and tumors

### مووناواخنەگمۆڵ Pilomatricoma

دەگمەن نییە و لووی بێوەی خانەی ناواخنی سەلکی مووە، زۆربەی جار تاکە و لە دەموچاو و مل و سەرەوەی قۆڵ بە شێوەی گرێۆکەی قووڵی (٠,٥ - ٧سم ) پتەوی داپۆشراو بە پێستی ئاسایی یان پەمەیی دەردەچێت، ئەگەر پێستەکە بکشێنرێت نیشانەی چادر tent sign (چەندین روو وگۆشە) دەردەکەوێت. پێست پووکانەوەی سەر نیشانەکە هەندێك جار وەك پێست قلّیشان striae دیارە، پتر لە مێینەدا هەیە. (وێنەی ٥١٩)

چارەسەر: لابردن بەنەشتەرگەری.



(وێنەی ٥١٩) موو ناواخنەگمۆڵ

### مووسەلکەگمۆڵ Trichofolliculoma

لووی بێوەی رژێنەچەوریەمووە و بە شێوەی گرێۆکەی بچووکی (٥ ملمی) گومەزی رەنگ گۆشتی لە دەموچاو و پێستی سەر دەردەچێت، لە چەقی لووەکەدا کونی تێدایە و گەندەمووی لێ رووا‌وە، زۆربەیان لە پێگەیشتوودا هەن، چارەسەری: لابردن بە نەشتەرگەری. (وێنەی ٥٢٠)



(وێنەی ٥٢٠) موو سەلکەگمۆڵ

### مووڕووپۆشەگمۆڵی خێزانی چەندانەکی Multiple familial trichoepithelioma

بۆماوەیی لەشی زاڵە، لە منالّیدا یان کاتی بالّقبووندا دەردەکەوێت، تەنۆچکە و گرێۆکەی (٢-٤ ملمی) دیارکراوی پۆرگی یان رەقی روونی لووسی خڕ کە هەندێك جار چەقەکانیان چالّییە و بە کۆمەڵ بە چونیەکی دەموچاو بە تایبەتی لێوی سەرەوە، لۆچی لووت و لێو و پێڵووی چاو دەگرنەوە. هەندێك جار لە پێستی سەر و مل و قەد دەردەچن.

هەندێك جار بۆماوەیی نییە و تاکە یان قەبارەی گەورەیە(وێنەی ٥٢١).



(وێنەی ٥٢١) موو روو پۆشەگمۆڵی خێزانی چەندانەکی.

چارەسەر: دەردی تاك بە نەشتەرگەری لادەبرێت، بەڵام جۆری چەندانەکی بە تاشین بە لەیزەری CO2 یان تەزینەچارە یان سووتاندنی ئێلیکتریکی، ناوە بەناوە، چونکە لەوانەیە سەرهەڵداتەوە.

## پۆرگی روو پۆشەکان Epithelial cysts

### پۆرگی توێژی Epidermal cyst

زۆر باوە، بریتییە لە پۆرگی پڕ لە قۆچەکاژی و رووپۆشەکەی رووکەشی توێژە، واتا پتر بوونی خانەی رووکەشی توێژ لە بن توێژدا. لە ئەنجامی داخرانی سەلکی چەوریەمووەکان یان روانی خانەی توێژی لە بن توێژدا بەهۆی زەبری برەر وەك دەرزی، یان بەهۆی گرتنی (وەخۆگرتنی) خانەی توێژ لە نێوان یەکگرتنی رووەکانی (چینەکانی) کۆرپەلە embryonic planes دا، روودەدات. (وێنەی ٥٢٢)


(وێنەی ٥٢٢) پۆرگی توێژی.

دوای باڵقبوون دەردەچێت، پۆرگەکە ١-٥ سم دەبێت. لەناو بن توێژ یان ژێر پێستدایە بە شێوەی گومەزیی جوڵاو و هەندێك جار بەتوێژەوە نووساوە یان ناوك لە ناوەندەکەیدا هەیە. جۆری رووکەشی سپی یان زەردە و لە دەموچاو و مل و سنگ و سەرەوەی پشت دەردەچن، بەڵام ئەو پۆرگانەی دوای رووان دەردەچن پتر لە بەری پێ و دەست وسمتدا هەن.

ماکەکان: بریتین لە تووشێنی بەکتریا یان تەقین کە ئەمیش گۆشتەزوونەگمۆڵ دروست دەکات.

چارەسەر: ئەگەر تووشێنی بەکتریا هەبوو دژە بەکتریای دەدرێتێ، ئەگەر تەقیبوو ستیرۆید بە تێچزاندن.برین بۆ لابردنی بە نەشتەرگەری لەگەڵ ناوپۆشی ناوەوەی ئەنجام دەدرێت.

### پۆرگی موویی (مووەپۆرگ) Pilar cyst

وەك پۆرگی توێژی وایە ،بەڵام ٩٥٪ یان لە پێستی سەردا هەن و رووپۆشەکەی بەرگی مووی دەرەوەیە outer root sheath، زۆر جار بۆماوەیی لەشی زاڵە، پتر جوڵاوە و لە پۆرگی توێژی پتەوترە، بەڵام ناوکی نییە. (وێنەی ٥٢٣)

چارەسەر: لابردن بە نەشتەرگەری.


(وێنەی ٥٢٣) پۆرگی موویی.

## بن تویێژە پۆرگ Dermoid cys

بەهۆی دروستبوونی نائاسایی جێیی کۆرپەلەیی لە داخرانی (یەکگرتنی) ناوچەکانی کۆرپەلەیی embroynic closure zones روودەدات، شوێنەکان بریتین لە سەرووی بەشی کۆتایی برۆ، رەگی لووت (سەرەوە)، هێڵی ناوەندی ناوچەوان، پێستی زەمینەی ناودەم و لە بەشی هێڵی ناوەندی پێستی سەر لە پێشەوە بۆ دواوە و هەندێك جار لە سنگ و پشت و سك و دەوری کۆم دەردەچێت. (وێنەی ٥٢٤)

زۆربەیان لە ساڵی یەکەمی ژیاندا دەردەچن، دەردەکە چەند میللیمەترێك بۆچەند سانتیمەترێکە و لە چەوری ژێر پێستدایە و بەشانەی ژێرەوەی نووساوە و چاڵبوونی ئێسکی ژێر پۆرگەکە بە بەرجەستەکردن هەستی پێ دەکرێت. تەقین و تووشێنی بەکتریا هەندێك جار روودەدەن.

بۆ چارەسەر دەبێت پشکنینی بۆ بکرێت نەوەك بە شانەی گرنگی ژێرەوەی (وەك سیستمی دەماری) نووسابێت، ئەوسا لاببرێت.




(وێنەی ٥٢٤) بن تویێژە پۆرگ.

## نیشانە و لووەکانی خانەی تۆخ Melanaocytic nevi and neoplasms

### نیشانەڕژاوە Nevus spilus

بریتییە لە پەڵەیەکی قاوەیی کاڵ کە تێیدا پەڵەی یان تەنۆچکەی بچووکتر و تۆختر بڵاوبوونەتەوە، بە زۆری لە پێستی قەد و پەلەکانی خوارەوەدا هەن و رێژەی ٢٪ی خەڵکی هەیانە. ئەم نیشانەیە لەوانەیە بچووك (کەمتر لە ١ سم٢) یان گەورەبێت (رووبەری ئاستە دەمارییەك بگریت). لەوانەیە چەند شوێنێك لە یەك نەخۆشدا نیشانەکەی تێدابێت. (وێنەی ٥٢٥)

**چارەسەر:** پێویست ناکات یان لەیزەری Ruby بۆ چەند جارێك.



(وێنەی ٥٢٥) نیشانەڕژاوە.

## نیشانەی بێکەر Becker nevus

باوە (یەك لە ۲۰۰ کەس هەیەتی)، بەڵام لەمێینەدا دەگمەنترە. لە کاتی نزیك باڵقبووندا



(وێنەی ٥٢٦) نیشانەی بێکەر.

دەردەکەوێت، یەك لایی یە و چەند سەنتیمەترێکە، پارچەیەکی نارێکی تۆخە (قاوەیی کاڵە) و لێوارەکانی مشارییە، لە ناوەندی نیشانەکەدا ئەستووربوون بەرجەستە دەکرێت(وێنەی ٥٢٦)، تووکی تێدایە و مووەکان لە مووی دەوری نیشانەکە رەشتر و گەورەترن، بە زۆری لە سەرەوەی قەد (شان و ژێر مەمك)دا دەردەچێت.

## نیشانەی خانەی تۆخی بێوەی (نیشانەی رەنگەخانەی بێوەی)
## Benign melanocytic nevi

لە هەموو کەسێکدا کەم یان زۆر هەن و بریتین لە کۆمەڵێك (هێشوێك) خانەی تۆخ (رەنگ)، بەهۆی پتربوونی ئەم خانانە لە لکینی توێژو بن توێژدا. زۆربەیان دوای لە لەدایکبوون دەردەکەون و لەگەڵ تێپەڕبوونی تەمەندا (۱۰–۳۰ساڵی) و دوای بەرخۆرکەوتنی بەردەوام یان بەهۆی وەرگرتنی هۆرمۆنی ACTH و لە کاتی سکپڕیدا پتر دەبن. (وێنەی ٥٢٧ أ ، ب)

۳ جۆری هەیە:

۱– جۆری لکینی (جۆری پێکەنی) Junctional nevus: هێشووی خانەی تۆخ لە لکینی توێژ و بن توێژدایە و کەمێك توێژی سەری و گۆی بن توێژ پاڵپێوەدەنێت و رێژەی ۹۰٪ی باری منداڵییە و ۱ملم –۱ سم قەبارەکەیەتی. پانە یان کەمێك بەرزبۆتەوە و رەنگەکەی قاوەیی کاڵ یان تۆخ یان قاوەیی رەشە، لێواری رێك و شێوەی تەشیلەییە یان خڕە و رووکەشەکەی لووسە. لەوانەیە لە












(وێنەی ٥٢٧ أ، ب) نیشانەی خانەی تۆخی بێوەی (جۆری لکینی).
جـ) جۆری بن توێژی.
د) جۆری ناوێتە.

هەموو شوێنێکی پێست و ناوپۆش هەبن، زۆربەیان لە منالّدا هەن و لەوانەیە کاتی بن و بۆجۆری ۲ پەرەبستێنن جگە لە بەری دەست و پێ و کۆئەندامی سێکسی کە هەر بە جۆری لکینی (پێگەنی) لە منداڵ و پێگەیشتوودا دەمێننەوە.

۲- جۆری ئاوێتە Compound nevus: لەم جۆرەدا هەندێك لە خانەی تۆخی نیشانەکە بەرەوخوار بۆ ناو بن توێژ دەکشێن بۆ دروستکردنی هێلانە و ئەستوون لەم خانانە، شێوەی نیشانەکە بۆ قوتکەی کەم بەرزبووەوە یان دەردی گۆیی دەگۆڕێت و رەنگی نیشانەکە لە قاوەیی لمی بۆ قاوەیی زۆر تۆخ دەگۆڕێت. ئەستووربوون و تۆختر بوون زۆر جار نەخۆش لە شێرپەنجە دەترسێنێت بەڵام بێوەیین. (وێنەی ٥٢٧ د)

۳- جۆری بنتوێژی Intradermal nevus: ئەگەر خانەی تۆخ (رەنگ) لە جۆری I لە پڕبوون وەستایەوە و توێژی سەر خانەکان ئاسایی بۆوە و تەنیا خانەکانی کشاو بۆ بن توێژ مانەوە ئەوسا ئەم نیشانەیە بە شێوەی گرێۆکەی رەنگ پێستی (ناتۆخ) یانە کەمێك تۆخی بەرزبووەوەی گومەزی کە زۆربەیان لە دەموچاودان دەردەچێت، مووی لەسەر دەروێت و فرە دەزوولەی تێدایە، هەندێك جار لە پێگەیشتوودا پۆرگێکی نەرمی بلّی چرچی پاڵکەوتووە (بێ لاسکە sessile) یان لاسکدارە pedunculated لە لۆچەکان و قەد و مل و رەگی پەلەکاندا(وێنەی ٥٢٧ج).

- هەندێك جار ئەم نیشانانە تووشی سۆ و گۆشتەزوونەگمۆڵی( بە تایبەتی دوای هەڵکەندنی مووی ناو نیشانەکە) دەبن.
- هەندێك جاریتر پەڵەی بەڵەکی لە دەوری نیشانەکە دەردەچێت و نیشانەکە وەپاش دەچێتەوە (نیشانەی خەرمانە halo nevus).
- زۆر بە دەگمەن شێرپەنجەی میلانۆمای لێ دەردەچێت، لەبەر ئەوە کە یەکێك لەم دیاردانەی خوارەوەدا بەدی کرا نیشانەکە بە نەشتەرگەری لادەبرێت و دەپشکنرێت:

خوران، گەورەبوونی کتوپڕ، کەمبوونی یان پڕبوونی تۆخی، گۆڕانی شێوە، گۆڕانی لێوار، سۆکرن، چاڵەبرین دروستبوون یان خوێنڕێژی و هەندێك جار ئازار.

## نیشانەی خانەی تۆخی زگماکی = (نیشانەی زەبەلاحی تووکن)

## Congenital melanocytic nevus

بریتییە لە پارچەی تۆخی تووکنی گەورە کە پارچەی بچووکتر و تۆختر لە ناویدا یان لە دەوریدا بڵاوبوونەوە، پێستەکە ئەستوورتر و باڵووکەیە و بە تایبەتی لە قەد دەردەچێت، هەرچەندە لەوانەیە هەموو پێستی مرۆڤ و بەری دەست و پێ و ناودەمیش بگریتەوە، لە ٢-١٥٪ی بارەکاندا شێرپەنجەی میلانۆمای لێ دەردەچێت .ڕێژەی ٤٠٪ی میلانۆمای منالْ لەم نیشانەیە دەردەچێت. (وێنەی ٥٢٨)



(وێنەی ٥٢٨) نیشانەی زەبەلاحی تووکن.

## نیشانەی سپیتز Spitz nevus

لە منالْدا هەیە و لە ١-٢ مانگدا بە شێوەی گرێۆکەیەکی پەمەیی یان سووری بچووکتر لە ١ سم لە دەموچاو و لاقدا دەردەچێت، بێوەیین و چارەسەری لابردنە. (وێنەی ٥٢٩)

## کۆنیشانەی نیشانەی نائاسایی

## (Dysplastic nevus) Atypical mole syndrome

بۆماوەیی لەشی زاڵە و جۆری جودایی sporadic هەیە و ئامادەییان بۆ میلانۆما هەیە. ژمارەیەکی زۆر لە نیشانەی تۆخی نارێکی گەورە لە قەد و هەندێك جار پێستی سەردا هەن، قەبارەیان جیاوازە و هەندێکیان پەمەیین و خەرمانەی سۆیی دەوری داون، هەندێکیشیان رووکەشەکەیان گۆڕییە، دەبێت هەر ٦ مانگ جارێك بە دواداچوونیان بۆ بکرێت. (وێنەی ٥٣٠)



(وێنەی ٥٢٩) نیشانەی سپیتز.





(وێنەی ٥٣٠) کۆنیشانەی نیشانەی نائاسایی.

## شێرپەنجەی میلانۆما Malignant melanoma

شێرپەنجەی خانەی تۆخە (ڕەنگە) لە لکینی توێژ و بن توێژدا، نیوەیان لە دەردی پێشتر (نیشانە) دەردەچن، ڕێژەی ٥٪ی شێرپەنجەی نێرینە و ٤٪ لە مێینەدا میلانۆمان، لە سپی پێستی نێرینەدا پشت و پەلەکانی سەرەوە و لە مێینەدا پشت و پەلەکانی خوارەوە پتر دەیگرن. نیشانە گرنگەکانی ئەم شێرپەنجەیە بریتین لە : ناچوونیەکی، لێواری ناڕێك، جیاوازی ڕەنگی لووەکە (چەند ڕەنگێك) و قەبارەی گەورەتر لە ٦ ملم.

**هۆکارەکان**: پێستی سپی، چاوی کاڵ، جۆری مووی سوور و زەرد، ڕوودانی سووتانی خۆری بڵقی لە منداڵیدا، شڵی زۆر، کەم گەنم ڕەنگبوون بە خۆر، بە ئاسانی بەخۆر سووتان. ئەم نیشانانەی باسمان کردن، پتر ئامادەیی بۆ تووشبوون نیشان دەدەن.

بوونی ژمارەیەکی زۆر لە نیشانەی تۆخ، بوونی نیشانەی تۆخی گەورە یان نائاسایی و نیشانەی خانەی تۆخی زگماکی بۆ تووشبوون ئامادە ترن . هەروەها بۆماوەیی هەندێك جار ئامادەیی پتر دەکات.

پوڤا، چرای گەنم ڕەنگکەر، پێستە وشکەی ڕەنگاڵە .X.P، جێ زامی سووتان و سستی بەرگری هۆکاری ترن.

جۆرەکان:

### ١- میلانۆمای شڵی شێرپەنجەیی Lentigo maligna M.

لە شوێنی بەرخۆرکەوتوو لە پیردا ڕوودەدات، پەڵەیەکی ناڕێك تۆخبوو و شێوە ناڕێك بۆ چەند ساڵ هەیە و بە سستی وەك شێرپەنجەی لەجێی خۆ <u>in situ</u> گەشەدەکات و دواتر گرێیۆکەی لێ دەردەچێت و دەبێت بە شێرپەنجە، هەندێك جار خوێنڕێژی و تاریکتربوونی تێدا ڕوودەدات، ڕێژەی ٥٪ی بارەکانە. (وێنەی ٥٣١)



(وێنەی ٥٣١) میلانۆمای شڵی شێرپەنجەیی.

### ٢- میلانۆمای ڕووکەشی بڵاوبوو Superficial spreading M.

لە تەمەنی پێگەیشتوودا لە سەرەوەی پشتی نێر و مێ یان لاقی مێینەدا ڕوودەدات، چەند ڕەنگێکی وەك ڕەش، سوور، قاوەیی، شین و سپی تێدایە. گرێیۆکە یان تەنۆچکەی لێ دەردەچێت و هێڵەکانی پێست کە شێرپەنجەکە دەکشێت نامێنن. ڕێژەی ٧٠٪ی بارەکانە (وێنەی ٥٣٢).



(وێنەی ٥٣٣) میلانۆمای پەلی شلی.





(وێنەی ٥٣٢) میلانۆمای ڕووکەشی بڵاوبوو.



(وێنەی ٥٣٥) میلانۆمای تەشەنەکردوو.





(وێنەی ٥٣٤) میلانۆمای گرێیی.

### ٣- میلانۆمای پەلی شلی .Acral lentiginous M

پتر لە خەڵکی ئاسیا و ڕەش پێستەکاندا هەیە، زۆربەیان لە پەنجا ساڵیدان، لە پێدا نینۆك و ژێر پێ پتر دەیگرن ، پتر لە بەری دەستدا نەك پشتی دەست دەردەچێت. دوای دەرچوونی گرێ و تەنۆچکە لەسەر پەڵە تۆخە نارێکەکە شێرپەنجەکە دەردەچێت و چاڵە برینی تووش دەبێت. نزیکەی ١٠٪ی بارەکانە. (وێنەی ٥٣٣)

### ٤- میلانۆمای گرێیی .Nodular M

کتوپڕ بێ دەردی پێشتر بە شێوەی گرێۆکە دەردەچێت، نێرینە دوو ئەوەندی مێینە تووشیان دەبێت و پتر لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکاندا وەك سەر و مل و قەد دەردەچێت، لەوانەیە لووەکە لووس و گوومەزی یان قارچکی، چاڵەبرینی یان خوێنڕێژی بێت . ڕێژەی ١٥٪ی بارەکانە و زۆر توندە. (وێنەی ٥٣٤)

### ٥- جۆری ناوپۆش و گۆیی

### ٦- میلانۆمای بەستەرەشانەیی .Desmoplastic M

بە قووڵی دەتەنێتەوە و خانەی تەشیلەیی لە نموونەدا هەیە و لە سەر و ملی پیاوی پیردا پترە، بەڵام تووشی پەنجەش دەبێت.

### ٧- میلانۆمای ناتۆخی .Amelanotic M

دەردەکە پەمەیی، سوور یان گۆشتییە و لە شێرپەنجەی خانەی بنکەیی دەچێت، ئەم جۆرە بە زۆری لە کەورێی پێست و چاودا albinos هەیە.

### ٨- میلانۆمای ژێر نینۆك .Subungual M

### ٩- میلانۆمای تەشەنەکردوو .Metastatic M

واتا میلانۆماکە بۆ پێستی دەوری و لیمفەگرێکان و ئەندامەکانی تر تەشەنەی کردووە و زۆر بە گرانی چارەسەر دەکرێت. (وێنەی ٥٣٥)

ئەم شێرپەنجەیە بۆ ٤ قۆناغ بۆ چارەسەر و بەدواداچوون پلەی بۆ دادەنرێت.

چارەسەر: ١) نەشتەرگەری.

٢) بەرگریە چارەسەر Immunological treatments. ٣) کیمیکە چارەسەر.

## نیشانەی شین Blue nevus (B.N.)

بە شێوەی تەنۆچکە یان گرێۆکەی شینی سنووردیار دەردەچێت، جۆری باو common B.N. لە تەمەنی منالّیدا دەردەچێت و بە سستی گەشەدەکات. قەبارەی ٢-١٠ ملم دەبێت و لە پشتی دەست و پێ و دەموچاودا هەیە. جۆری خانەیی cellular B.N. بە شێوەی گرێۆکەیەکی شینی رەش یان شین و پتەو و گەورە لە سمت و بربڕەی سمت پتر لە مێینەدا دەردەچێت. جۆری رووپۆشەگمۆڵی epitheliod B.N. لە قەد و پەلەکان و کەمتر لە سەر و مل دەردەچێت و زۆر دەگمەنە. (وێنەی ٥٣٦)

چارەسەر: لابردن بە نەشتەرگەری، یان بە لەیزەری Ruby چارەسەر دەکرێت.






(وێنەی ٥٣٦) نیشانەی شین.

## گۆشتەزوونەگمۆلی بازنەیی Granuloma annulare (G.A.)

بریتییە لە ناساغیەکی لە خۆوەچاکبووەوەی بێوەی هۆنەزانراو، تێیدا تەنۆچکەی بنتوێژی زیندەدارزانی necrobiotic رێکخراو بە شێوەی بازنەیی دەردەچن و بە زۆری لە منالّ و گەنج دا و پتر لە مێینە (۱:۲)دا هەیە، زۆر جار لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکان یان شوێنی زەبر ( واتا دیاردەی کۆبنەری تێدایە) یان جێ زام دەردەچێت، هەروەها هەندێك جار زەبر دەبێتە هۆی وەپاش چوونەوەی.

جۆرەکان:

١- **جۆری جێی** Localized G.A.: لە منالّ و گەنج و تەمەنی ناوەڕاستدا بە شێوەی یەك دەرد یان چەند دەردێکی کەم لە پشت و لاکانی پەنجە و دەست و ئانیشك و پێ و قولەپێ دەردەچن. دەردەکان قوتکەی یان تەنۆچکەی سوور یان بنەوشەیی یان پەمەیی کالّن و لێوارەکانیان باریکن و بۆ دەوروبەری دەکشێن و ناوەندەکانیان وەپاش دەچنەوە و دەردی بازنەیی پێك دەهێنن. پێستی سەر دەردەکە ئاساییە، بەلاّم یەکگرتنی چەند دەردێك شێوەی فرەکەوانەیی پێکدەهێنن(وێنەی ٥٣٧)، رێژەی٥٠٪ یان لە ٢ سالّدا وەپاش دەچنەوە، بەلاّم ٤٠٪ یان سەرهەلّدەدەنەوە.



(وێنەی ٥٣٧)
**گۆشتەزوونەگمۆلی بازنەیی**

٢- **جۆری گشتی** Generalized G.A.: پتر تووشی مێینە لە ٤٠-٦٠ سالّیدا، یان هەرزەکار و منداڵ دەبێت. بە شێوەی هەلّتۆقیوی تەنۆچکەیی یان بازنەیی بلاّو و چوونیەکی بەلاّم پتر لە پشتی مل و سەرەوەی قەد و سەرەوەی قۆلّ و هەندێك جار بەری دەست و پێ و پێلّووی چاو دەردەچن. یەك دەرد بەدەگمەن لە ٥ سم گەورەترە، دەیان و سەدان لەم دەردانە هەن، تووشی دەم وچاو و کۆئەندامی سێکسی نابن. زۆربەیان بێسکالاّن، بەلاّم هەندێك جار خورانی توندیان هەیە. لەخۆوە وەپاش چوونەوە لە ٣-٤ سالّدا روودەدات، بەلاّم هەندێك جار زووتر یان درەنگتر وەپاش دەچنەوە. (وێنەی ٥٣٨)



(وێنەی ٥٣٨) **گۆشتەزوونەگمۆلی بازنەیی (جۆری گشتی)**.

٣- **جۆری پەڵەیی** Macular G.A: پتر لە مێینەی ٣٠-٧٠ ساڵیدا هەیە و بە شێوەی دەردی پانبووەوە یان کەمێك بەرزبووەوەی سوور و قاوەیی لە سەرەوەی ناوەوەی ران و لە قەددا دەردەچێت و لە رەقبوونی پێست morphea دەچێت، تاکە دەرد چەند سەنتیمەترێکە.

٤- **جۆری ژێر پێستی** Subcutaneous G.A.: پتر لە منداڵی نێرینە (١:٢) دا هەیە و پتر لە لاق و هەندێك جار لە باسك و پێستی سەردا دەردەچن، چەندانەکین و مێژووی زەبر هەیە، دەردەکان رەنگ پێستین و گرێۆکەی ژێر پێست یان بن توێژی قووڵن و چەند سەنتیمەترێك دەبن و لە چەند ساڵێکدا وەپاش دەچنەوە.



**(وێنەی ٥٣٩) گۆشتە زوونە گمۆلی بازنەیی (جۆری ژێر پێستی و برەر).**

٥- **جۆری برەر** Perforating G.A.: لە پشتی دەست بە شێوەی تەنۆچکە کە چەقەکەی کونی پڕ لە قۆچەکاژی تێدایە دەردەچێت و لە پیزۆکە دەچێت. (وێنەی ٥٣٩)

**چارەسەر**

١- چارەسەری ناوێت ئەگەر بێ سکاڵابوو، چونکە لەخۆوە وەپاش دەچێتەوە.

٢- بۆ باری سووك یان تاك یان چەند دانەیەکی کەم: ستێرۆید بە تێچزاندن چەند مانگ جارێك یان ستێرۆیدی بەهێزی جێی یان تاکرۆلیمۆسی جێی.

٣- بۆ باری بڵاو: تێتراسایکلین ٥٠٠ ملگم × ٢ + نیکۆتینئەماید nicotinamide ٥٠٠ ملگم ×٣.

- پۆڤا (سەراپایی یان جێیی)
- داپسۆن ١٠٠ ملگم/رۆژ، پێنتۆکسی فیللین pentoxifylline ٤٠٠ ملگم × ٣ ، رێتینۆیدەکان بە دەم، پۆتاسیۆم ئایۆداید ١٠ دڵۆپە × ٣ ، سایکلۆسپۆرین ٥ ملگم/کگم/رۆژ، دیفیبرۆتاید defibrotide ٤٠٠ ملگم/رۆژ، ترانیلاست tranilast ٣٠٠ ملگم/رۆژ، دژەمەلاریا، بەڵام لەوانەیە بە هەموو ئەم چارەسەرانە سەرهەڵدانەوە هەبێت.

# لیمفۆمای پێست Cutaneous lymphoma

## کەڕووی قارچکی Mycosis fungoides

ڕێژەی ٧٠٪ی بارەکانی لیمفۆمای پێستە و سەرچاوەکەی خانەی لیمفۆسایت جۆری Tیە (جۆری یاریدەدەری بەبیر memory T-helper cell)، ئەگەری یەکە لە ٣٠٠,٠٠٠ کەس لە ساڵێك دا و لە نێرینەدا پترە (١:٢).

بە گشتی ئەم ناساغیە درێژخایەنە و بە سستی پەرەدەستێنێت و پتر لە پیردا دەردەکەوێت و زۆر جار نەخۆش بەهۆکاری تر دەمرێت نەك بەم ناساغیە. لە سەرەتادا پەڵەی پانبووەوە دەردەچن و بەخوروون، دواتر بۆ قۆناغی قوتکەیی پەرەدەستێنێت (تەنینەوە) و ئەوسا لوو دەرچوون یان پێستەسووریٚ دەردەکەوێت.

**نیشانەکان:** ٣ قۆناغی سەرەکین:

### ١- قۆناغی پارچەیی Patch stage

یان قۆناغی پێش قارچکی pre-mycotic stage، کە قۆناغی زووی ناساغیەکەیە و لەوانەیە چەند ساڵێك بخایەنێت، بە زۆری پارچەی کاژی سنووردیاری کەمێك تۆخی یان سووری کەمێك بەرجەستەکەوتووی palpable بڵاوبووەوەیە و هەروەك نەخۆشی سەدەف یان چەورەبیرۆیە، لێوارەکانیان نارێکە (کەوانەیی یان ناڵی ئەسپیە) و ڕووکەشەکانیان پووکاوە و چرچە و دابەشبوونی ناچوونیەکین، هەندێك جار پێستەگۆڕاوی poikiloderma ( واتا پووکانەوە و فرە دەزوولە و تۆخبوون) بڵاوە. زۆربەیان لە خوارەوەی سك، سمت، سەرەوەی ران و مەمکی مێینە دەردەچن. (وێنەی ٥٤٠)



(وێنەی ٥٤٠) کەڕووی قارچکی (لەگەڵ پێستە گۆڕاو).

### ٢- قۆناغی قوتکەیی Plaque stage

هەندێك لە پارچەکانی قۆناغی یەك تۆکمەتر دەبن و بۆ شانەکانی ژێری دەتەنن‌ەوە و قوتکەی تەنراوە دەردەچن کە لەوانەیە تا ٣٠ سم گەورەبن و هەندێکیان ناوەندەکانیان دەپوکێنەوە و شێوەی خڕ و بازنەیی وەردەگرن. (وێنەی ٥٤١)



(وێنەی ٥٤١) کەڕووی قارچکی (قۆناغی پارچەیی و قوتکەیی گەورە).

### ٣- قۆناغی لووبی Tumor stage

لەوانەیە دوای چەند ساڵ (تا ٢٠ ساڵ یان پتر) ئەم قۆناغە دەست پێبکات، بەڵام بە دەگمەن قۆناغی لووبی لە سەرەتاوە دەست پێدەکات (tumor d' emblee). لەم قۆناغەدا گرێۆکەی گەورەی قەبارە و شێوە جیا لەسەر قوتکە تەنراوەکان یان لە پێستی ئاسایی دەردەچن و زۆربەیان دەبن بە چاڵەبرینی هێلکەیی قووڵ و لێوارلوول و بنکەدارزاوی خۆڵەمێشی ، زۆربەیان لەسەر قەدن، بەڵام کەم جار شوێنی تر و ناودەم و سەرەوەی سیستمی هەناسەدان دەگرنەوە. لەوانەیە پێستەسووریێ لە قۆناغی ٣ پەرەبستێنێت یان پێشتر ڕوودبدات بە شێوەی سووربوونەوەی گشتی، کاژکردن، ئەستووربوونی بەری دەست و پێ، نینۆك تێکچوون و مووڕووتانەوە . هەندێك جار تۆخبوونی سەراپایی هەیە. (وێنەی ٥٤٢)

**سکاڵاو نیشانە سەراپاییەکان**: بریتین لە پەرەسەندنی کەرووی قارچکی لە پێستەوە بۆ لیمفەگرێکان و ئەندامە هەناویەکان وەك جگەر، سی، گورچیلە – تاد.



(وێنەی ٥٤٢) کەرووی قارچکی (قۆناغی لووبی).

**هەڵسەنگاندن و قۆناغ دانان**: بەپێی سیستمی TNMB بۆ ٤ قۆناغ هەڵدەسەنگێنرێت:

- T- گرتنەوەی پێست: لە ١٠٪ی ڕووبەری پێست یان کەمتر $T_1$ ، پتر لەم ڕووبەرە $T_2$، بوونی لوو $T_3$، پێستەسووریێ $T_4$.
- N- گرتنەوەی لیمفەگرێ: No لیمفەگرێی ئاسایی سەرجێی و بە نموونەوەرگرتن، $N_1$ لیمفەگرێی بەرجەستەکەوتوو بەڵام ئاسایی لە نموونەوەرگرتندا، $N_2$ بەرجەستەنەکەوتوو بەڵامی نائاسایی لە نموونەوەرگتندا، $N_3$ لیمفەگرێی بەرجەستەکەوتوو و نائاسایی لە نموونەوەرگرتندا.
- M- گرتنەوەی هەناو Viscera: Mo هەناوی نەگرتۆتەوە، $M_1$ هەناوی گرتۆتەوە.
- B- گرتنەوەی خوێن Blood: Bo خوێنی نەگرتۆتەوە، $B_1$ خوێنی گرتۆتەوە.

قۆناغی I أ $T_1, N0, M0 = (I\ A)$

قۆناغی I ب $T_2, N0, M0 = (I\ B)$

قۆناغی II أ $T_1\text{-}2, N1, M0 = (II\ A)$

قۆناغی II ب $T_3, N0\text{-}1, M0 = (II\ B)$

قۆناغی III أ $T_4, N0, M0 = (III\ A)$

قۆناغی III ب $T_4, N1, M0 = (III\ B)$

قۆناغی IV أ $T_{1\text{-}4}, N_{2\text{-}3}, M0 = (IV\ A)$

قۆناغی IV ب $T_{1-4}$, N0-3, M1 = (IV B)

B (واتا باری خوێنگرتنەوە) کار ناکاتە سەر قۆناغ دانان.

**نموونەوەرگرتن:**

١- دوومەڵۆکە microabscesses لە ناو توێژدا (دوومەڵۆکەی پاوتریەر Pautrier microabscesses).

٢- پەتێکی خانەی لیمفی لە سەرەوەی بن توێژ کە بۆ توێژ دەتەنێتەوە.

٣- خانەی لیمفی نائاسایی.

**چارەسەر**

١- ستیرۆیدی جێیی بەهێز و ت س و B بۆ قۆناغی I (هەندێك جار نایترۆجینی خەرتەلەیی جێی nitrogen-mustard).

٢- پوڤا، ریتینۆیدەکان بە دەم، ئەلفائینتەرفیرۆن، نایترۆجینی خەرتەلەیی جێی بۆ قۆناغی دوو، ئەگەر زۆر پەرەی سەندبوو چارەسەر بە باقەی (چەمکی) ئێلێکترۆنی electron beam therapy.

٣- **چارەسەری لوو** بە ژەمی کەمی تیشکهاویشتن low-dose-radiotherapy.

٤- کیمیکە چارەسەری سیستمی systemic chemotherapy ، بەڵام زۆر کەم سەرکەوتووە.

## کۆنیشانەی سیزاری Sēzary syndrome

بریتییە لە قۆناغی شێرپەنجەی خوێنی کەڕووی قارچکی . بە شێوەی پێستەسووریی بڵاوو، گەورەبوونی لیمفەگرێ دەرەکیەکان و خوران و خانەی نائاسایی لە خوێندا دەردەچێت، هەندێك جار کەڕووی قارچکی پەرەدەستێنێت بۆ ئەم کۆنیشانەیە و هەندێك جاری تریش لە سەرەتاوە بە پێستەسووریێ دەست پێدەکات. لەگەڵ پێستەسووریێ دا دەموچاوی شێری leonine facies، ئاوسانی پێڵووی چاو، هەڵدرانەوەی پێڵووی چاو، مووڕووتانەوەی بڵاو، زێدەقۆچەکاژی بەری دەست و پێ و بەدگەشەیی نینۆك، هەن. تا و لەرز و خوران و کزانەوە باون و داهاتووی نەخۆشەکە بەدە. (وێنەی ٥٤٣)



**(وێنەی ٥٤٣) کەڕووی قارچکی (کۆنیشانەی سیزاری).**

**چارەسەر:** میثۆترێکسەیت بە ژەمی کەم.

## نەخۆشی هوجکن Hodgkin's disease

بە دەگمەن بە شێوەی گرێۆکەی بچووك و چاڵبرین راستەوخۆ لە پێست دەدات، بەڵام لەوانەیە خورانی سەراپایی توند هەبێت.

## شێرپەنجەی خوێن Leukaemia

بەدەگمەن یەکەم نیشانەی شێرپەنجەی خوێن تەنینەوەی شێرپەنجەکەیە لە پێستدا بە شێوەی قوتکە و گرێۆکە یان پێست ئەستووربوون و لۆچبوونی پێستی سەر، بەڵام دەردی پێست لەگەڵ شێرپەنجەی خوێندا بە شێوەی تەنۆچکەی سوور، خوران، تامیسکی دەمار، نەخۆشی ماسی وەرگیراو و خاڵەخوێن هەندێك جار هەن.

## سوورەخوێنی Erythremia = Polycythemia vera

پڕبوونی ژمارەی خڕۆکەی سووری خوێن و خانەی سپی و خەپلەخوێنە لەم ناساغیەدا هەن. لە پێستدا نیشانەکان بریتین لە: سووربوای پێست بە تایبەتی لە دەموچاو و مل و پەلەکان، ناوپۆشەکان پڕخوێن و شینن، فرەدەزوولە و پووکی خوێنڕێژی و لووتپژان باون. لەوانەیە شینبوونەوە cyanosis و خاڵەخوێن و پەڵەخوێن و خوێنئاسنیشتن لە پێست hemosiderosis دا و نەخۆشی گوڵی و نینۆکی کەوچکی هەبن. لە ٥٠٪ی بارەکاندا خورانی بەرئاوکەوتن (بەرئاوکەوتنە خوران) aquagenic pruritus هەیە و ٣٠-٦٠ خولەك دەخایەنێت و خورانی بێ ئاوبەرکەوتنیش هەیە.

چارەسەری خورانەکە گرانە،بەڵام دژە هیستامین جۆری H1 وەك هایدرۆکسی زین و خوێن لێگرتن هەندێك جار بەکەڵکن، هەندێك جار پارۆگزێتین paroxetine ٢٠-٦٠ ملگم/رۆژ زۆر بەکەڵکە.

# ناساغی ناوپۆشەکان Disorders of the mucous membranes

## لێوەسۆ Cheilitis

بریتییە لە باری سۆیی لێو بە شێوەی سووربوونەوە و هەندێك جار ئاوسان و کاژکردن و قەتماغە و درز یان ئازار، زۆر هۆکاری هەیە:

١- هۆنەزانراو: جۆری کاژەوەرێیە.

٢- جۆری دووەمی بۆ نەخۆشی پێست وەك: چەورەبیرۆ، سەدەف، بیرۆی جێگۆڕاو، لێوەسۆی لێککەوتنی هەستیاری یان وروژێنی بۆ زۆر مژاد وەك ماکیاج، کرێم و مەرهەم، مژادی ددان شۆردن و پاککردنەوە، کرێمی دژە وشکەلێوی، دژەخۆر، بۆیەی نینۆك، لاستیك، کانزا، خواردەمەنی وەك مانگۆ، مژادی شمشاڵ (قامیش) و کلارنێت – تاد.


(وێنەی ٥٤٤) لێوەسۆ.

٣- خۆر: دوای خۆربەرکەوتنی درێژخایەن بۆ چەند ساڵ لێوی خوارەوە سۆی تووش دەبێت و لەوانەیە سپیەقوتکە و شێرپەنجەی لێ بێت. (وێنەی ٥٤٤)

٤- لێولێسینەوە و دەرمانی ڕێتینۆیدەکان.

٥- بەشێك لە نەخۆشی بێت وەك کۆنیشانەی پلەمەر–ڤنسن Plummer-vinson syndrome، نەخۆشی جۆگرین Sjogren syndrome و ئەیدز.

٦- لێوەسۆی ڕژێنی Cheilitis glandularis: بە شێوەی ئاوسان و هەڵدرانەوەی لێو بۆ خوارەوە، کونی فراوانی کەناڵی ڕژێنەچڵمیەکان، پۆرگ و بە گشتی گەورەبوونی لێو، دەردەچێت. چڵم بە ئاشکرایی لە کونەکان دێتەدەر و چینێکی کەتیرەیی لەسەر لێو دروست دەکات و شەوان لێوەکان بەیەکەوە دەنووسێنێت. هەندێك جار تووشێنی بەکتریایی هەیە، ئەم بارە دوای وروژانی درێژخایەن، جێگۆڕاو، یان تێکدان بە هۆی خۆر و زەبر ڕوودەدات. (وێنەی ٥٤٥)


(وێنەی ٥٤٥) لێوەسۆی ڕژێنی.

چارەسەر:

١- هۆکارەکەی لابرێت.

٢- تاکرۆلیمۆس یان پیمۆکرۆلیمۆس یان ستیرۆیدی سووکی جێی.

٣- هەندێك جار زنك ئۆکساید یان ڤازیلین.

٤- بۆ هەندێك بار وەك جۆری خۆری، دوورکەوتنەوە لە خۆر +دژەخۆر، تەزینەچارە، 5FU کریم، ئیمیکویمۆد، لەیزەری $CO_2$ یان سووتاندنی ئێلێکتریکی.
٥- نەشتەرگەری (بڕینی لێواری لێو vermilionectomy).

## (Perlēche) = Angular cheilitis گۆشەلێوەسۆ

پێستەسۆی لۆچییە و بە هۆی پڕ تەڕبوون یان وشکبوون دروست دەبێت و درز لە گۆشەی لێوەوە بەرەو خوار و دەرەوە دروست دەبن و زۆر جار تووشێنی دووەمی کاندیدا و بەکتریایی (وەك S. aureus)ی لەگەڵدایە (وێنەی ٥٤٦).


(وێنەی ٥٤٦) گۆشە لێوەسۆ.

هۆکارەکان:

١- بەساڵاچوون: پیر کە تاقمی ددانی لە دەم دابێت، یان بە هۆی هەڵواسینی روومەت و لێوی سەرەوە لە ئەنجامی پووکانەوەی گۆی (دڕکی) ئێسکی شەویلاگەوە.
٢- لە منالدا بەهۆی پەنجەمژین، پووك گەستن (جوین) و شیرینی خواردن روودەدات.
٣- کەمی ڤیتامین (ڤیتامین B2 = رایبۆفلاڤین)، نەخۆری دەروونی، مەنگۆلی، کاندیدای ناودەم بەتایبەتی لە نەخۆشی شەکرەدا، ئەیدز، کاندیدای ناوپۆش و پێست، نەخۆشی جۆگرین، دەرمانی لێو وشککەرەوە (وەك ئایزۆترێتینۆین) و پێستەسۆی جێگۆڕاوی.

چارەسەر:

- چاککردنی تاقمی ددان، پڕکردنەوەی ددانی کەوتوو.
- تێکەڵەی هایدرۆکۆرتیزۆن + ئایۆدۆکلۆرهایدرۆکسی کوین +نیستاتین.
- ستیرۆیدی بەهێزتر وەك دیسۆناید + دژەکاندیدا.
- چاندنی کۆلاجین و مژادی پڕکەرەوە.
- دژەبەکتریا بۆ تووشێنی( بە س. ئوریەس ) وەك میوپایرۆسین.
- نەشتەرگەری: بڕینی شوێنەکە و متوربەکردنی پێست.

## Fissured tongue زمانی درزاوی

یان زمانی باتوویی یان زمانی کوڵکی: زگماکییە یان خێزانییە، بەڵام هەندێك جار لەگەڵ نەخۆشیتر دا هەیە وەك کۆنیشانەی مێلکەرسن – ڕۆزێنتاڵ Melkersson-Rosenthal ( ئەم کۆنیشانەیە پێکهاتووە لە:

سێینەی ئیفلیجی ڕوومەتی سەرهەڵداوە + ئاوسانی نەرمی لێوەکان + زمانی باتوویی)، مەنگۆلی و هەندێك نەخۆشی دەگمەنی تر.


(وێنەی ٥٤٧) زمانی درزاوی.

زمان لە ئاسایی کەمێك گەورەترە و چاڵی هێڵی ڕووکەشی یان قووڵی تێدایە. لە برگەی درێژیدا لە ناوەڕاستی زمان درزە سەرەکیەکەیە و بەشەکانی تری زمان درزی کورتتری تێدایە و لە پێستی باتوو دەچێت(وێنەی ٥٤٧) لە ٥٠٪ی بارەکاندا زمانی نەخشەیی لەگەڵدایە، جگە لە پاك وخاوێنی چارەسەری ناوێت.

## زمانی نەخشەیی Geographic tongue

زۆربەری بارەکان جودابیە و هۆی نەزانراوە ،بەڵام کەمێکیان لە جێگۆڕاو یان نەخۆشی سەدەف دا هەن، پشتی زمان وەك نەخشەیە و پارچەی لووسی سوورتر لە ئاسایی لە پەڕ و لای زمان دەردەکەوێت و لە بەشەکەی دەوری نزمترە و بە سستی بۆ ئەملاولاو دەکشێت و پارچەی سنووردیاری بازنەیی و پێچاوپێچ و لێوار زەرد و سپی دروست دەکات، ڕواڵەتی نەخشەکە ڕۆژانە دەگۆڕێت و لە شوێنێك نامێنێت و لە شوێنێکی تر دروست دەبێتەوە، بۆ ماوەیەك گۆڕانکاریەکە دەوەستێت و دواتر دەست پێدەکاتەوە(وێنەی ٥٤٨).


(وێنەی ٥٤٨) زمانی نەخشەیی.

زۆر جار نەخۆش پێی نازانیت، چونکە بێ سکاڵایە جگە لە کزانەوەیەکی کەمی زمان هەندێك جار.

**چارەسەر:** پێویست ناکات یان ٠,١٪ شلەی تریتینۆین بۆ ٤–٦ ڕۆژ، ڕۆژی جارێك.


(وێنەی ٥٤٩) زمانی تووکنی ڕەش.

## زمانی تووکنی ڕەش Black hairy tongue

لە چەند بارێکدا وەك فرەجگەرەکێشان، بەکارهێنانی دژەبەکتریا بە دەم و بوونی کاندیدا لە ڕووکەشی زماندا، ڕوودەدات. بە شێوەی پارچەی ڕەش، قاوەیی یان زەردی تووکنی واتا دەزوویی (چەند میللیمەترێك درێژە) لە دوو بەشی پێشەوەی پشتی زمان، پێش گۆی لیکی دواوە، دەردەچێت. پێکهاتووە لە زلبوونی گۆی لیکی دەزوولەیی و وەخۆگرتنی دەزووی قووچەکەیی درێژی مژادی کیراتین. لە نێرینەدا پترە. (وێنەی ٥٤٩)

**چارەسەر:** بە فلّچەی ددانشۆردن بە ئەسپایی بکرێنرێت بە تەنیا، یان لەگەڵ بەکارهێنانی شلەی هایدرۆجین پیرۆکساید ١-٢٪ یان جێڵی ریتین A یان ٤٠٪ شلەی ئاوی یۆریا.
هۆکارەکەشی لابرێت.

## زمانی لووس Smooth tongue

یان زمانی رووتاوە یان زمانەسۆی پوکاوەیی: ئەم جۆرە زمانە بە ئازارە و لووسە چونکە رژێنی لیکی گۆیی و قارچکی پوکاوەن، زۆر سوور و بریقەدارە و قووتدان بەئازارە و تامیش دەگۆڕێت و درێژخایەنە و(وێنەی ٥٥٠) لەوانەیە قوتکەسپیەی تووشبێت، هۆکارەکان بریتین لە: کەمی ڤیتامین B12، نەخۆشی گەنمەشامی pellagra، بەدمژین، کەمی ڤیتامین B2، نەخۆری دەروونی، فرەخواردنەوەی مەی، سکچوونی درێژخایەن sprue، کەمخوێنی کەم ئاسنی، کەمی ترشی فۆلیك، سفلس (فەرەنگی)، کۆنیشانەی جۆگرین و ریلی دەی Riley-day syndrome.


(وێنەی ٥٥٠) زمانی لووس.

**چارەسەر:** هۆکارەکەی لابرێت و ڤیتامین B12ی بدرێتێ.

## قوتکەسپیە Leukoplakia

بریتییە لە ئەستووربوونی سپی ناوپۆشەکان بە شێوەی پارچەی رووکەشی شیری چەندین قەبارە و شێوە و لەوانەیە بۆ پێکهێنانی پارچەی گەورە و بلاّو یەکبگرن. رووکەشەکەی کپ و تۆڕییە و هەندێك جار تۆخە و بە چەشنێك بە شانەی ژێرەوە نووساوە کە بمانەوێت بەهێز هەڵیکەنین خوێنرێژی تووش دەبێت. هەندێك جار زۆر ئەستوور و زبر و بەرزبووەوەیە(وێنەی ٥٥١ أ).

لێو و پووك و ناوپۆشی ناودەم و لێواری زمان شوێنە باوەکانن، بەڵام لەوانەیە کۆم و کۆئەندامی سێکسی تووشی بن. لەوانەیە لە ١٪ی بارەکاندا دوای چەند ساڵ شێرپەنجەی خانەی کاژی لێ دەرچێت.

**هۆکارەکان:** جگەرەکێشان، ئەلکهوهول (مەی)، تاقمی ددانی بەد، ددانی تیژ، پیس وپۆخڵی ناودەم، خۆر بۆ باری لێو، ئەیدز (قوتکەسپیەی تووکنی (وێنەی ٥٥١ ب) hairy leukoplakia دروست دەکات) .


(وێنەی ٥٥١ أ ) قوتکەسپیە.


(وێنەی ٥٥١ ب) قوتکەسپیەی موویی.

چارەسەر: لابردنی هۆکارەکەی، سووتاندنی ئێلێکتریکی، بڕین بە نەشتەرگەری، تەزینەچارە یان لەیزەر $CO_2$.

## قوتکەسوورە Erythroplakia

هەروەك قوتکەسپیە وایە، بەڵام چینی کیراتینی بە سەرەوە نییە یان نەیماوە. لە لکینی پێست و ناوپۆشە باوە، بە شێوەی پارچەی سووری مۆڵکەیی focal لە زەمینەی ناودەم، نەرمەمەڵاشوو یان ناوپۆشی ناودەم یان ژێر زمان. شێرپەنجەی لەجێی خۆ لە ٩٠٪ی بارەکاندا هەیە. (وێنەی ٥٥٢)



(وێنەی ٥٥٢) قوتکەسوورە.

## لیکە پۆرگ Mucocele

بریتییە لە پۆرگی نەرمی خڕی روونی شینباوی (٢-١٠ ملمی) بێ ئازاری تورت، بەهۆی زەبر یان داخرانی بۆری رژێنی لیکی و دەرچوونی لیکەکە بۆ ژێر ناوپۆش لە بەشی ناوەوەی لێوی خوارەوە بەهۆی گەستنی چەندجارەی ناوپۆشەکە، بەڵام هەندێك جار ناوپۆشی لێوی سەرەوە و ناودەم تووشیا دەبێت(وێنەی ٥٥٣).

چارەسەر: لابردن بە نەشتەرگەری، تەزینەچارە یان لەیزەری Argon.



(وێنەی ٥٥٣) لیکە پۆرگ.

## پووك و ناودەمەسۆی چاڵەبرینی داڕزێنی توند (= نەخۆشی ڤنسنت)

Acute necrotizing ulcerative gingivostomatitis (= Vincent's disease)

بریتییە لە کتوپڕ دەرهاتنی چاڵەبرینی قارچکی لە گۆکانی نێوان ددانەکان و لێوارەکانی پووك و پەردەیەکی سپی پیس چاڵەبرینەکانی داپۆشیوە، ئەوسا بە خێرایی بۆ ناوپۆشی ناودەم و لێو و زمان و ئاڵوو و گەروو هەموو رێچکەی هەناسەدان بڵاودەبێتەوە. پەستانی کەم ئازار و خوێنڕێژی دروست دەکات، بۆگەنی ناودەمی تایبەتمەندە، هەندێك جار پووك و ئێسکی پووك لێدەبنەوە.

زیندەوەری تەشیلەیی Bacteroides fusiformis لەگەڵ بۆریلیا ڤنسێنتی Borrelia vincentii بەکتریای تریش ئەم بارە( بە تایبەتی لە باری پیس و پۆخڵی ناودەم، ددانی پیس، جگەرەکێشان، بەدخۆراکی و سستی بەرگریدا) دروست دەکەن.

**چارەسەر:** پاك وخاوێنی ناودەم، لابردنی شانەی دارزاو، پەنسیلین و بەکارهێنانی شلەی هایدرۆجین پیرۆکساید ٣٪ بۆ شتنی ناودەم (لەناو دەم وەردان).

## چاڵەبرینەسپیە ناودەمەسۆی سەرهەڵداوە (RAS): Recurrent aphthous stomatitis

بریتییە لە ناساغیەکی بەئازاری سەرهەڵداوەی ناوپۆشی ناودەم . بە شێوەی تەنۆچکەی جیاجیای یان بە کۆمەڵی بچووکی سوور دەست پێدەکات و لە چەند کاتژمێرێك دا دەبن بە چاڵەبرینی دارزێن کە بچووك و خڕ و سپی و رووکەشین (چاڵەبرینەسپیە aphthae) و بەدەست لێدان بەئازارن و لەوانەیە ئازارەکە جوین و قسەکردن گران بکات. سێ جۆری هەیە:

جۆری بچووك: کە ٥-١٠ میللیمەترن و تووشی ٥-٢٥٪ی پێگەیشتووی ساغ دەبێت و لە ٧-١٠ رۆژدا سارێژ دەبێت و بە تێکرایی ٢-٣ جار لە ساڵێکدا سەرهەڵدەداتەوە.



(وێنەی ٥٥٤)
چاڵەبرینە سپیە ناودەمەسۆی سەرهەڵداوە.

جۆری گەورە: لە ١٠ میللیمەتر گەورەترە و قووڵترە و لەوانەیە تا ٦ حەفتە بمێنێتەوە و باو نییە.

جۆری تامیسکەیی: واتا چاڵەبرینی بچووکی (١-٣ ملمی) بە کۆمەڵ ، دوای یەکگرتن چاڵەبرینی گەورەتر پێك دەهێنن و زۆر دەگمەنە. (وێنەی ٥٥٤)

ئەم ناساغیە لە ناوپۆشی ناودەم، لێو، لێواری زمان، درزی نێوان زمان و ناوپۆشی ناودەم و نەرمەمەلاشوو دەردەچێت ( ئەو شوێنانەی بە ئێسکی ژێرەوە بەند نین).

لەوانەیە هۆکاری سەرهەڵدانەوە ئەمانە بن: زەبر، گەستنی ناوپۆش، برینی فلْچەی ددان، برینی ئیشی ددان، خواردنی توون spicy foods، میوەی مزر، ترشی، ئەناناس، گوێز، هەستیاری، فشاری دەروونی و گۆڕانکاری هۆرمۆنی وەك تێکەوتن و لێچوونەوە و سکپڕی.

لەوانەیە هۆکارەکانی ئەم ناساغیە ئەمانە بن: بۆماوەیی، هەستیاری بۆ هەندێك خواردەمەنی یان دەرمان، ناساغی خوێنی و بەرگری، چەند نەخۆشی تر وەك نەخۆشی بەهجەت، ئەیدز، نەخۆشی رایتەر، کرۆن، کەمی خانەی سپی، کەمی پێکهاتی خوێنی وەك کەمخوێنی، بەدخۆراکی وەك کەمی ڤیتامین B، ریخۆڵەسۆی هەستیار بە گلوتێن، تای سووری periodic fever – تاد.

**چارەسەر:** هۆکارەکان لابەرە و کانزا و ڤیتامینی کەم لەبرخستنەوە دابین بکە.

- چارەسەری پاڵپشتی، وەك ستیرۆیدی جێی بە هەویر، یان کرێمی سڕکەر، یان دژەبەکتریا وەك تێتراسایکلین بە شلە ٢٥٠ ملگم بۆ ناودەم بۆ ٢ خولەك ئەوسا قووت بدرێت، رۆژی چوارجار. ستیرۆید بە تێچزاندن بۆ جۆری گەورە major aphthosis، نسایدس، دەمشۆری کلۆرهێکسیدین

٠,٢٪، ئەملیکسانۆکس amlexanox ٪٥ هەویریناودەم، شلەی دێکسامیثازۆن ٠,٥ ملگم/٥ مل وەك دەمشۆر.

ستیرۆیدی سەراپایی (پرێدنیزۆلۆن ٤٠–٦٠ ملگم/رۆژ) لە دوو حەفتەدا کەمبکرێتەوە و ببڕێت.

- کۆلچیسین colchicin ٠,٦ ملگم × ٢–٣/رۆژ، ثالیدۆماید thalidomide ١٠٠–٢٠٠ ملگم/رۆژ، داپسۆن dapson ١٠٠ ملگم/رۆژ، پێنتۆکسیفیللین pentoxifylline ٤٠٠ ملگم × ٣/رۆژ، لیڤامیسۆڵ levamisole ٥٠ ملگم × ٣ بۆ ٣ رۆژ ٢ حەفتە جارێك، سایکلۆسپۆرین جێبی (دەمشۆر) ٥٠٠ ملگم/٥ مل × ٣/رۆژ، IFN-∝2a ١٢٠٠ یەکە/رۆژ بۆ ١ خولەك دەمشۆر ئەوسا قووتبدرێت.
- چارەسەری هۆرمۆنی بۆ تێکچوونی هۆرمۆنی.

## کۆنیشانەی بەهجەت Behçet syndrome

بریتییە لە چاڵەبرینی ناودەمی سەرهەڵداوە کەمەکەی سێ جار لە ١٢ مانگدا لەگەڵ دوو لەمانەی خوارەوەدا: (وێنەی ٥٥٥)



(وێنەی ٥٥٥) کۆنیشانەی بەهجەت.

١. چاڵەبرینی کۆئەندامی سێکسی سەرهەڵداوە.
٢. خوێنبۆریەسۆی تۆڕی چاو یان ناوچاوەسۆی uveitis پێشەوە یان دواوە.
٣. دەردی پێستی وەك: سووربوونەوەی گرێیی گەندەسەلکەسۆ E.N.، pseudofolliculitis، دەردی تەنۆچکەیی و پیزۆکەیی، گرێۆکەی عازەبەیی دوای باڵقبوون بێ وەرگرتنی ستیرۆید.
٤. ئەزموونی پاثـێـرجی پۆزەتیف بێت positive pathergy test. (ئەزموونی پاثـێـرجی بەم شێوەیە دەکرێت: بەشی ناوەوەی باسك دەرزی پێدا دەکرێت و ئەگەر لە ٢٤–٤٨ کاتژمێردا تەنۆچکە لە خاڵی دەرزی بەناوکردنەکەدا دەرچوو ئەوە پۆزەتیڤە).

- دەردی (چاڵەبرینی) ناودەم لە لێو و زمان و ناوپۆشی ناودەم و مەڵاشووە رەقە و نەرمە، ئاڵوو و گەروو و لووت بە تاکی یان چەندانەکی (٢–١٠ ملم یان گەورەتر) سنوور دیاری زەمینە خۆڵەمێشی پیس و لێوار خەرمانەیی سوور، دەردەچێت. هەندێك جار چاڵەبرینەکان زۆر قووڵن و جێ زام جێ دەهێڵن، ناودەم بۆگەنی هەیە.

- له كۆئەندامی سێکسی لە باتوو و چووك و لاڕان و کونی میز و کیلەك و ملی مندالّدان و زێ، کۆم و ڕێکه و ناوگەڵ دەردەچن. هەندێك جار پەڵە و تەنۆچکە و سەلکەسۆ لە باتوودا لەگەڵیدا هەن. لەوانەیە لە کیلەك vulva دا دەردەکان زۆر تێکدەر بن. ئاوسانی لیمفەگرێ جێیەکان و تا باون.
- لە چاودا ئازاری دەوری چاڵی چاو و تیشکە هەستیاری لەسەرەتادا هەن و ئەوسا لەوانەیە خوێنبۆریەسۆی تۆڕی چاو (کە کوێربوون دروست دەکات) روودات، لەوانەیە پێڵووپۆشەسۆ لە سەرەتادا و کێم لە ژووری پێشەوە hypopyon ی چاو لە دواییدا رووبدەن، لە سەرەتادا یەك چاو بەڵام دواتر هەردوو چاو تووشـــی دەبن و کوێربوون لە ئەنجامی پووکانەوەی دەماری چاو یان ئاوی رەش یان ئاوی سپی روودەدات.
- سکاڵا و نیشانەی دەماری لە سەراپای دەماری ناوەندی روودەدەن.
- مەیینە خوێنهێنەسۆ thrombophlebitis، مەیینی شاخوێنهێنی سەرەوە S.V.C.
- ئازاری جومگە و چەندانە جومگەسۆ باون. ئەندامەکانی تری هەناویش تووشیان دەبێت.

هۆی ئەم ناساغیە نەزانراوە ،بەڵام لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەتایبەتی لەوانەی HLA-B51 یان هەیە باوە، زۆربەی بارەکان لە ٢٠-٣٠ ساڵیدا دەردەکەون.

**چارەسەر:**

بۆباری سووك، بەپێی سکاڵاکان، پاڵپشتیە وەك نەخۆشی RAS کە لە سەرەوە باسمانکرد.

أ) گرتنەوەی ناوپۆش و پێست:

١- ستیرۆیدی جێیی، بە تێچزاندن یان سپرای (پرژە) aerosolized.

٢- تاکرۆلیمۆسی جێیی. ٣- کریمی سرکەری جێی.

٤- پێنتۆکسی فیللین. ٥- کۆڵچیسین ٦- داپسۆن

٧- بەیەکەوە ئەمانەی باسمانکرد.

ب) گرتنەوەی ناوپۆش و پێستی توند:

١) ثالیدۆماید، ٢) ژەمی کەمی میشـــۆترێکسەیت حەفتانە،

٣) پرێدنیزۆلۆن، ناو بەناو کەمبکرێتەوە، ٤) ئەلفائینتەرفیرۆن.

ج) گرتنەوەی چاوی توند یان هەناو:

١- پرێدنیزۆلون، ٢- ئازاثایۆپرین ٣- سایکلۆفۆسفئەماید

٤- کلۆرامبیوسیل ٥- سایکلۆسپۆرین ٦- ئینفلیکسیماب

٧- ئیمیونۆگلۆبیولین بە خوێن IVIG،

٨- بە یەکەوە ئەمانەی باسمانکرد

## پەڵەخوێن Purpura

بریتییە لە دەرچوونی خوێن لە خوێنبۆڕیەکان بۆ پێست و ناوپۆش لە چەند شوێنێکدا ، چەند میللیمەترێکە و پەڵەکان سووری قاوەیی یان ئەرخەوانین. زۆر هۆکاری هەیە وەك: (وێنەی ٥٥٦)





(وێنەی ٥٥٦) پەڵەخوێن.

- کەموکووڕی خوێن مەیین: وەك هیمۆفیلیا، نەخۆشی کریستماس، نەخۆشی بەستەرەشانە، ناوخوێنبۆڕیە مەیینی بڵاو DIC، خوێن گەورەگلۆبیولینی macroglobulinemia، نەخۆشی جگەر، دەرمانی دژەخوێن مەیین، کەمی ڤیتامین K و دەرمان وەك (سەلفۆنئەماید، دیجۆکسین، کوینین، کوینیدین، کلۆرۆثایەزایدەکان، پەنسیلین، سیفالۆسپۆرینەکان، ماینۆسایکلین، مەثیل دوپا، نسایدس، فروسیماید، پاراسیتۆڵ، ئاڵتون، ریفامپیسین – تاد).
- کەموکووڕی خەپلەخوێنەکان: وەك أ) کەمی خەپلەخوێن وەك: هۆنەزانراو، نەخۆشی بەستەرەشانە، DIC، کەمخوێنی تێکشکانی hemolytic anemia، گەورەبوونی سپڵ، خوێنبۆڕیەگمۆڵی زەبەلاح، تێکچوونی مۆخی ئێسك بە هۆی شێرپەنجە یان دەرمان، دەرمان وەك (کوینین، ئەسپرین، ثایەزاید، سەلفۆنئەماید) ب) تێکچوونی کاری خەپلە خوێن.
- کەموکووڕی خوێنبۆڕیەکان: وەك بەرزبوونەوەی پەستانی ناو خوێنبۆری (وەك کۆکە، رشانەوە، بەرزی پەستانی خوێنهێن، تاودانی زەوی gravitational)، خوێنبۆڕیەسۆ، توشێنی بەکتریایی و ڤایرۆسی وەك پیسبوونی خوێنی مەنینگۆکۆکەسی یان تای خاڵاوی شاخی بەردی rocky mountain spotted fever، دەرمان وەك کاربرۆماڵ، ئەسپرین، کوینین و سەلفۆنئەماید.
- هۆنەزانراو: وەك پێستەتۆخەی پەرەسەندوو progressive pigmented dermatosis.
- نەمانی پاڵپشتی بۆریەخوێن : وەك پەڵەخوێنی پیری، چارەسەر بە ستیرۆید، نەخۆشی ئەسکەرپووت، پێست رەقبوون – تاد.

## پەڵەخوێنی کەم خەپلەخوێنی هۆنەزانراو Idiopathic thrombocytopenic purpura (ITP)

خاڵەخوێن petechiae و شینبوونەوە ecchymoses ی توند یان لەسەرخۆ لە پێست و ناوپۆش بە تایبەتی ناودەم بە شێوەی خوێنرێژی پێڵووپۆش، لووتپژان، بڵقی خوێنرێژی ناودەم و خوێنرێژی پووك، گوورەشە melena، خوێن رشانەوە و زۆربێنوێژی menorrhagia دەردەچن.

خوێنرێژی دوای کەمبوونی خەپلەخوێنە بۆ ژێر ٥٠,٠٠٠/ملم٣ روودەدات بەڵام کە لە ژێر ١٠,٠٠٠/ملم٣ بوو زۆر مەترسیدارە و کە لە ژێر ٢٠٠٠/ملم٣ بوو خوێنرێژی ناو مێشك روودەدات.

جۆری توند acute پتر لە منالّدا روودەدات و لە ٥٠٪ یان دوای تووشێنی ڤایرۆسی (پارڤۆڤایرۆس B19) بە ٢ حەفتە دەردەچێت و زۆربەیان لەخۆوە چاکدەبنەوە.

جۆری درێژخایەن پتر لە پێگەیشتوودا (مێینە بۆ نێرینە ٢-١:٤) هەیە و بەردەوامە. ئەم ناساغیە بەهۆی برینداربوونی خەپەلەکانی خوێن بە دژەتەنی IgG دروست دەبێت.

**چارەسەر:**

١- لابردنی سپڵ.

٢- ستیرۆیدی سەراپایی ، لە بەرخستنەوەی خەپلەی خوێن لە باری مەترسیداردا. IVIG ، دانازۆڵ، ریتۆکسیماب rituximab، ئازاثایۆپرین، سایکلۆسپۆرین، ئینتەرفیرۆن ئەلفا، ئالوگۆڕی زەرداوی خوێن plasma exchange، داپسۆن، ڤیتامین C و کۆڵچیسین.

**پێستەتۆخەی پەرەسەندوو ( = تۆخە پەڵەخوێنەی پەرەسەندوو**Progressive pigmentary dermatosis)

چەند جۆرێکی هەیە، بەڵام باوترینیان بریتییە لە **نەخۆشی شامبێرگ** Shamberg's disease(وێنەی ٥٥٧) کە تێیدا پەڵە بە قەبارەی پەنجەمۆر دەردەچن و پێکهاتووە لە کۆمەڵێك خاڵەخوێنی وەك سەری دەرزی و لە دەنکۆڵەی بیبەری توون دەچن لە ناو پەڵەی گەورەی قاوەیی ئاڵتوونی دا. بە زۆری لە پەلەکانی خوارەوە دەست پێدەکات و بەرەو سەرەوە بۆ ران و قەد و پەلەکانی سەرەوە بلاو دەبێتەوە.



**(وێنەی ٥٥٧- تۆخە پەڵەخوێنەی پەرەسەندوو (نەخۆشی شامبێرگ).**



**(وێنەی ٥٥٨- تۆخە پەڵەخوێنەی پەرەسەندوو (نەخۆشی ماجۆکی).**

**جۆری نەخۆشی ماجۆکی** Majocchi's disease(وێنەی ٥٥٨) بە پەڵەی بازنەیی (١-٣ سم) سووری شین کە پێکهاتووە لە فرەدەزوولەی سووری تاریك و خاڵەخوێن و خوێنئاسن نیشتن hemosiderin دەست پێدەکات و ناوەندەکەی دەپووکێتەوە و لێوارەکەی پەرەدەسێنێت و شێوەی بازنەیی و نیوبازنەیی و دەردی نیشانەیی و فرەبازنەیی هاوچەق وەردەگرێت. بە چوونیەکی لە لاقەکان دەردەکەوێت و بەرەو سەرەوە بۆ ران و قەد و پەلەکانی سەرەوە بلاو دەبێتەوە. بێ سکالایە.

**جۆری کۆنیشانەی گوگیرۆت-بلوم** Gougerot-blum syndrome به تەنۆچکەی پێستەستوورێی بنەوشەیی بۆ سووری گۆشتی بچووك (کە یەکدەگرن بۆ پێکهێنانی قوتکەی سوور یان وەنەوشەیی یان قاوەیی ) دەست پێدەکات، لە لاق و ران و خوارەوەی قەد دەردەچێت. (وێنەی ٥٥٩)



(وێنەی ٥٥٩- تۆخە پەڵەخوێنەی پەرەسەندوو ( جۆری گۆگیرۆت-بلوم ).

جۆرێکی تریش کە **تێکەڵەی** خاڵەخوێن و بیرۆیە لەگەڵ خوێنناسن نیشان هەیە.

**جۆری پێستەستوورێی ئاڵتوونی** Lichen aureus کە تێیدا یەك یان چەندین تەنۆچکەی پێستەستوورێی یان پەڵەی لەپاڵیەك بە رەنگی گۆشتی یان ئاڵتوونی، لە هەر بەشێکی پێست دەردەچێت. پەڵەکان بۆ دروستبوونی پەڵەی گەورەتر یەکدەگرن و زۆربەیان تاکن، لە پێگەیشتوودا باوترە. (وێنەی ٥٦٠)

**چارەسەر:**

١- ستیرۆیدی جێیی بۆ ٤-٦ حەفتە.

٢- پێنتۆکسی فیللین ٤٠٠ ملگم × ٣/رۆژ بۆ ٢-٣حەفتە.

٣- روتۆساید rutoside بە دەم ٥٠ ملگم × ٢/رۆژ یان ڤیتامین C ٥٠٠ ملگم × ٢/رۆژ.

٤- لەوانەیە هەستیاری بۆ جل و بەرگ هۆکاربێت و بەدواداچوونی بۆ دەکرێت.



(وێنەی ٥٦٠)
تۆخە پەڵەخوێنەی پەرەسەندوو
( جۆری پێستە ستوورێی ئاڵتوونی ).

## خوێنبۆریەسۆی پێست Cutaneous vasculitis

جۆرێکە لەخوێنبۆریەسۆ کە تێیدا تەنینەوەی خانەی پۆلیمۆرف و ناوکەتۆز nuclear dust و گۆڕانکاری مژادی ریشاڵی fibrinoid change لە خوێنبۆریە بچووکەکانی بنتوێژ روودادات و لەوانەیە نیشانەکان لیری، پەڵەخوێنی یان دارزێنی بن و ماکی هەناوی هەبێت.

لە هەموو تەمەنێکدا هەیە و باوە (وێنەی ٥٦١)

هۆکارەکان زۆرن وەك تووشێن (بەکتریا، ڤایرۆس، کەڕوو - تاد)، دەرمان، گورگەسوورە، شێرپەنجە و لیمفۆما، جگەرسۆی ڤایرۆسی جۆری C یان ناساغی بەرگری دژەخۆیی - تاد.


(وێنەی ٥٦١) خوێنبۆریەسۆی پێست.

نیشانەکان:

١- جۆری توند Acute form: دەردی خوێنڕێژی و پەڵەخوێنی و دارزێنی باون و لەوانەیە توند و بڵاوبن ، پتر لاقەکان دەگرێتەوە لەگەڵ قۆڵ و سمت و ران. بلۆق و بڵقی خوێنڕێژی و پارچەی دارزاو بە کتوپڕی دەردەچن و لە ٢-٣ حەفتەدا سارێژ دەبن ، سەرهەڵدانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر باوە.

٢- جۆری ژێر توند Sub acute form: پەڵەخوێن و دەردی پەڵەیی سوور و لیر و تەنۆچکە باون، گرێیۆکە و دەردی دارزێن هەندێك جار هەن، یەکگرتنی تەنۆچکەکان قوتکەی گەورە دروست دەکەن و تێکەڵەی گرێیۆکە و پەڵەخوین و لیر باوە.

٣- جۆری درێژخایەن Chronic form: لەوانەیە کۆمەڵە دەردی نوێ بۆ چەند مانگ یان ساڵ بمێننەوە وەك دەردی پەڵەیی، تەنۆچکەیی، گرێیۆکەیی، پەڵەخوێنی و لیر.

جۆری یەك و دوو تا و لاوازی و ئازاری جومگە و سکاڵای گەدە و ریخۆڵەی ( پێش یان کاتی دەرهاتنی دەردەکان ) لەگەڵدایە.

دەردی سەراپایی: لە ٥٠٪ی بارەکاندا هەن، بۆ نموونە گرتنەوەی گورچیلە (لە ٣٠-٦٠٪ی بارەکان) و جومگەکان و ڕێبازی گەدە و ریخۆڵە و سیستمی دەماری ناوەندی و سییەکان.

چارەسەر:

١- هۆکارەکان لاببرێن.
٢- بۆ باری توند گەرمی و پشوودان.
٣- ستیرۆیدی سەراپایی هەندێك جار بەپێی بارەکە.
٤- کۆڵچیسین، داپسۆن، پێنتۆکسی فیللین، ئیندۆمیثاسین، دژە هیستامین، ئازاثایۆپرین و هایدرۆکسی کلۆرۆکوین.

## پەڵەخوێنی هینۆخ – شەنلاین Henoch-Schönlein purpura

پتر لە منداڵی نێرینەدا (٤-٨ ساڵی) هەیە ،بەڵام گەورەش دەیگریت. تووشێنی ڤایرۆسی یان سترێپتۆکۆکەسی گەروو یان تووشێنی بەکتریایی تر، خواردەمەنی، دەرمان یان لیمفۆما هەندێك جار هۆکارن.

تا و سەرئێشە و ئازاری جومگە و سکئێشە ٢ حەفتە پێش دەردی پێستی هەن.

پەڵەخوێنی جیاجیا لە بەشی راستکەری پەڵەکان extensor-surfaces دەردەچن(وێنەی ٥٦٢) . لەیەك رۆژدا دەبن بە خوێنرێژی و لە ٥ رۆژدا نامێنن. کۆمەڵی نوێ تا چەند حەفتەیەك دەردەچن، لەوانەیە دەردی لیری و بلۆق و پەڵەخوێنی دارزێن و دەردی وەك خوێنبۆریەگمۆڵ هەبن.






(وێنەی ٥٦٢) پەڵەخوێنی هینۆخ -شەنلاین.

ئازاری جومگە کە پەرەدەستێنێت بۆ جومگەسۆ و ئاوسانی ئەژنۆ و ئانیشك (٧٤-٨٤٪ی بارەکان)، خوێنرێژی سی کە لەوانەیە کۆشندەبێت، ئازاری سك و خوێنرێژی رێبازی گەدە و ریخۆڵە (٦١-٧٦٪ی بارەکان)، ئیفلیجی ریخۆڵە و رشانەوە و سك ئاوسان، گرتنەوەی گورچیلە (٤٤-٤٧٪ی بارەکان) بە شێوەی میزی خوێناوی hematuria، هەن. ناساغیەکە ٦-١٦ حەفتە دەخایەنێت.

چارەسەر: پاڵپشتیە. داپسۆن، کۆڵچیسین، دژەهیستامین، ستیرۆیدی سەراپایی، IVIG بەڵام نسایدس بەکارناهێنرێت.

٥-١٠٪ی بارەکان بەردەوامە یان سەرهەڵداوەیە.



(وێنەی ٥٦٣) لیمفەئاوسان.

## لیمفەئاوسان Lymphoedema

بریتییە لە ئاوسانی شانەی نەرم بەهۆی بڕی پڕی لیمف کە تێیدا کەڵەکەبووە و لە باری درێژخایەندا ئاوسانی پتەو (بە پەستان وەلا نادرێت) دروست دەبێت و پێستەکە دەبێت بە پێستێکی لۆچاوی بالووکەیی .

**جۆرەکانی:**

١- جۆری سەرەتایی Primary L.: زگماکییە یان پێش تەمەنی تێکەوتن لەمێینەدا دەردەچێت یان بۆماوەیی لەشی زاڵە ، کەموکووڕی سیستمی لیمفی هۆکارەکەیەتی و ئاوسانی پەلەکانی خوارەوە روودەدات و بەردەوامە. (وێنەی ٥٦٣)

٢- لەگەڵ کۆنیشانەکان وەك کۆنیشانەی زەردەنینۆك، تێرنەر - تاد.

٣- ناساغی پێستی وەك نینۆکی زەرد، خوێنبۆریەگمۆڵ، زەردەگمۆڵ xanthomatosis.

٤- جۆری دووەمی وەك دوای نەشتەرگەری بۆ مەمك، دەرمانی مێلفالان، شێرپەنجە، پەستانی دەرەکی، لیمفەئاوسانی دەستکرد، دوای تیشکەچارە، دوای خانەسۆی سەرهەڵداوە، نەخۆشی گوڵی – تاد.

ماکەکانی لیمفەئاوسان: بریتیین لـە خانەسۆ، ئەستووربوونی پێست، چاڵەبرین و سارکۆما.

**چارەسەر:**

- لابردنی هۆکار..
- پەلەکە بەرزبکرێتەوە، باندەجی گوشەر و گۆرەوی لاستیکی، میزێنەر (میزاوەر) diuretics، چارەسەری لیمفەبۆریەسۆ یان رووکەشەخانەسۆ erysipelas بە پەنسیلین بۆ کاتێکی درێژ، نەشتەرگەری بۆ لابردنی پەستان یان داخرانی لیمفەبۆریەکان.

# گۆڕانكاریەكانی پێست و ناساغیەكان لە سكپڕیدا
## Skin changes and diseases in pregnancy

**گۆڕانكاری هۆرمۆنی** Hormonal changes

لە كاتی سكپڕیدا گۆڕانكاری فیسیۆلۆجی ئاڵۆز و گرنگ روودەدەن بەهۆی:

١- دروستبوونی چەندین هۆرمۆنی پرۆتینی و ستیرۆیدی لە یەكەی وێلاش -كۆرپەلە fetoplacental unit دا.

٢- چالاكتربوونی ژێر مێشكەگلاند، ملەقۆرتە گلاند و ئەدرینال گلاند لە دایك دا.

هۆرمۆنی پرۆتینیی protein hormones ئەمانەن: توخمدان گەشێنی وێلاشیی مرۆڤی (HCG)، شیرێنی وێلاشیی مرۆڤی human placental lactogen (HPL)، ملەقۆرتەگلاندە هەژێنی وێلاشیی مرۆڤی (HCT) و ستیرۆید هەژێنی وێلاشیی مرۆڤی (HCC).

هۆرمۆنی ستیرۆیدی بریتین لە پرۆجێستیرۆن و ئیسترۆجین.

**گۆڕانكاریەكانی پێست بریتین لە:**

ا- **تۆخبوون** Pigmentation

* گۆی مەمك و مەمیلە و كۆئەندامی زاوزێ تۆخ دەبن.
* هێڵی سپی linea alba (هێڵی ناوەڕاستی سك) دەبێت بە هێڵی رەش linea nigra.
* هەندێك جار تۆخبوونی پێستی ژێر باڵ و بەشی ناوەوەی سەرەوەی ران.
* ماڵە chloasma، لە پتر لە ٥٠٪ی مێینەی سكپڕدا روودەدات.
* نیشانەی تۆخ و كونجە تۆختر دەبن.

ئەم گۆڕانكاریانەی سەرەوە دوای منالبوون نامێنن یان كەمتر دەبنەوە، فرەدروستبوونی ئیسترۆجین و بەرزبوونەوەی ئاستی پرۆجێستیرۆن و هۆرمۆنی هەژێنی خانەی تۆخ (MSH) هۆكارن.

٢- **موو** Hair

تووكنی سێكسی hirsutism بە كەمی یان بە مامناوەندی روودەدات و لە دوای منالبوون یان لە سێیەی سێیەمی سكپڕیدا نامێنێت.

بە لێشاو موورووتانەوە telogen effluvium ١-٥ مانگ دوای منالبوون روودەدات و لەوانەیە توند بێت، بەلام لە ماوەی یەك ساڵدا موەكان بە تەواوی دووبارە گەشە دەكەنەوە.

٣- **بەستەرە شانە** Connective tissue

* پێست قڵیشان (پێستەكشاو) striae distensae لە رێژەی ٩٠٪ی بارەكاندا لە سەر پێستی سك و سمت و هەندێك جار مەمك روودەدات، هۆكاری نەزانراوە بەلام لەوانەیە

هۆکاری هۆرمۆنی (هۆرمۆنی هەژێنی ستیرۆید ACTH و ئیسترۆجین و ریلاکسین relaxin) و هۆکاری میکانیکی (کشانی پێست) گرنگ بن. دوای منالبوون لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا کەمتر دیاردەبن.

* پەلەپەتکە skin tags لە لاکانی مل و ژێر باڵ دەردەچن و لەوانەیە دوای منالبوونیش بەردەوام بن.

٤- خوێنبۆری Vascular

* سوورربوونەوەی بەری دەست palmar erythema و جاڵجاڵە خاڵ spider nevi زۆر باون، ئاوسان و خوێنهێنە گمۆڵی لاق و پێ. leg & foot edma & varicosities.
* مایەسیری.
* لووی گلۆمەس glomus tumor و خوێنبۆریە گمۆل hemangioma.
* لووی سکپڕی پووك pregnancy epulis ،کە بریتییە لە گۆشتەزوونەگمۆڵی کێمی لە سێینەی دووەم و سێیەمی سکپڕیدا و دوای منالبوون خێرا نامێنێت.

## نەخۆشیەکانی پێست لە سکپڕیدا Dermatoses of pregnancy

١- ناگرەی تامیسکی Impetigo herpetiformis: باسمانکرد.

٢- بلقەگمۆڵی سکپڕی pemphigoid gestationis: باسمانکرد

٣- قوتکە و تەنۆچکەی لیری بەخورووی سکپڕی

Pruritic urticarial papules and plaques of pregnancy (PUPPP)

بریتییە لە ناساغیەکی باوی زۆر بەخوروو لە سێینەی سێیەمی سکپڕیدا. رێژەی ٠,٣٣ - ٠,٧٦٪ی سکپڕ دەیگرن و دوای منالبوون خێرا نامێنێت و زۆر بە دەگمەن سەرهەڵدەداتەوە.

زۆربەی بارەکان لە ٣٦-٣٩ حەفتەی سکپڕیدا روودەدەن و لەو ژنە سکپڕانەی کێشیان لە کاتی سکپڕیدا بە ئاشکرا پتر بووە یان سکپڕیەکەیان دوانە یان سیانەیە باوترە.

ناساغیەکە بە تەنۆچکەی (١-٢ ملمی) سووربووەوە پتر لە سەر پێستەکشاو striae distensae دا دەست پێدەکات و خێرا بۆ پێکهێنانی قوتکەی گەورە لە دەوری ناوکدا کۆدەبنەوە و لە چەند رۆژێکدا بۆ سمت و ران و هەندێك جار بۆ قۆڵ و باسك و لاقەکان بلاودەبنەوە.

قوتکە و تەنۆچکەی لیری و ئاوساو و شێوەی ژمارەیی زۆر بەخوروون و نەخۆش خەوی نامێنێت و شێواوی دەروونی تووش دەبێت.

سەرووی مەمك و دەموچاو ناگرێتەوە.

چارەسەر: ستیرۆیدی جێیی بەهێز ،رۆژی ٣-٤ جار، بە ئاسانی لە چەند رۆژێکدا کۆنترۆڵی بارەکە دەکات و ئەوسا رۆژی ١-٢ جار تا پێویست بکات بەکاردەهێنرێت.

* ستیرۆیدی سەراپایی بۆ ماوەیەکی کورت هەندێك جار بەکاردەهێنرێت.
* دژە هیستامین جۆری $H_I$ کەمتر لە ستیرۆیدی جێیی کاریگەرە.

٤- زراوەمەنگی سەرهەڵداوەی سکپڕی (تەنۆچکەخورووی سکپڕی):

Recurrent cholestasis of pregnancy (Prurigo gravidarum)

ناساغیەکی پێستە کە پەیوەندی بە باری جگەرەوە هەیە و پتر لە سێنەی سێیەمی سکپڕیدا و لەوانەیە بە دەگمەن زووتریش روو بدات. رێژەی ٠,٠٢-٢,٤٪ی سکپڕ هەیانە و دوای منالبوون خێرا نامێنێت و لە سکپڕی داهاتوودا سەرهەڵدەداتەوە.

خورانی مامناوەندی یان توند کە خێرا بۆ هەموو لەش بلاودەبێتەوە، بێ بوونی دەردی سەرجێیی جگە لە شوێن خوران (رووشان) روودەدات، خورانەکە لە شەودا توندترە و نزیکەی ٤ حەفتە پێش دەرکەوتنی زەردوورییەکە هەیە. هەندێك جار ماندوویی fatigue و نەخۆری و کەمتر هێڵنج و رشانەوە هەن. لەوانەیە لای راستی سەرەوەی سك بە پەستان بە ئازاربێت tender و میزی تۆخ dark urine و پیسایی کاڵ هەبن. ئاستی ئەنزیمی SGOT و SGPT یان خوێی زراو bile salts بەرز دەبنەوە.

لەم بارەدا ئەگەری زیان بە کۆرپەلە لە ئاسایی پترە.

چارەسەر:

- دژەخورانی جێیی وەك شلەی کالامین.
- دژەهیستامین بە دەم، ت س و B.
- کۆڵیستایرامین cholestyramine هەندێك جار بەکەڵکە.
- ترشی یورۆدیئۆکسی کۆڵیك urodeoxycholic acid (١٥ ملگم/کگم/رۆژ) یان س-ئەدینۆسیل-ل-میثیۆنین S-adenosyl-L-methione بۆ خورانەکە بەکەڵکن.
- بەکارهێنانی ڤیتامین K پێش منالبوون بۆ کەمکردنەوەی ئەگەری خوێنبەربوون دوای منالبوون بەکەڵکە.

# پیربوون Aging

بریتییە لە کەم بوونەوەی هێزی خۆپاراستن، پتر ئامادەیی بۆ نەخۆشی و پتربوونی ئەگەری مردن. لە ئەنجامی کارلێککردنی پرۆگرامی (بەرنامەی) جینی و زیانی ژینگەیی (هەڕەمەکی کەڵەکەبوو  بە درێژایی ژیان) روودەدات.

تیۆریەکان ئەمانەن:

## ١- بیردۆزی (تیۆری) بەرنامەیی The programmatic theory

*** کورتبوونەوەی تێلۆمیر (کۆتایی کرۆمۆسۆم) Telomere shortening:**

کۆتایی کرۆمۆسۆمی ئاسایی (تێلۆمیر telomere) لە سەدان ریزبەندی کورتی دووبارەبووەوە پێکهاتووە. لەکاتی خانە دابەشبوونی لەشیدا somatic cell mitosis ئەنزیمی پۆلیمەرەیسی DNA (DNA-Polymerase) ناتوانێت لەبەرگرتنەوەی replication جووتە بنچینەی کۆتایی final base pair کرۆمۆسۆمەکە بکات، واتا لەگەڵ هەر سوورێکی خانە دابەشبووندا کرۆمۆسۆمەکە کورتر دەبێتەوە.

لە تەمەنی پێگەیشتوودا adulthood پتر لە رێژەی ٣٠٪ی درێژی تێلۆمیر کورت بۆتەوە و لە هەندێك ناساغیدا وەك پرۆجیریا (پیربوونی نابەکام progeria) تێلۆمیر لە ئاسایی کورترە. تێلۆمیری کورت بە شێوەیەك لە شێوەکان ئاماژە (سیگناڵ) دەدات بۆ راگرتنی سووڕی خانە دابەشبوون یان مردنی apoptosis خانە بەپێی جۆری خانەکە، هەروەها جێگیری (stability) DNA ی دەشێوێنێت و ناهێڵێت لە بەرگرتنەوەی جینی ژێر تێلۆمیری subtelomeric genes رووبدات و بەمەش پرۆسەی پیربوون پتر دەبێت.

*** پیری خانە Cellular senescence:** بریتییە لە توانای سنووورداری خانە دابەشبوون و لەوە دەچێت پرۆسەیەکی رێگربێت بۆ دروستبوونی شێرپەنجە. پیرەخانەکان senescent cells تێلۆمیری کورتیان هەیە و دابەشبوونی خانەیان نەماوە و بەرهەڵستی نەمان(لە ناوچوون) apoptosis دەکەن و تایبەتمەندبوونی گۆڕاویان هەیە و زاڵن بەسەر خانەی گەنجدا ، کاریگەری جینەکانیان کەوتۆتە سەر کرۆمۆسۆمی ١، ٤، ٧.

ئاماژەکانی پرۆتینی ناواخنی دەرەوەی خانە خانە پتربوون و دابەشبوون رێك دەخەن واتا پرۆسەی پیربوون ئەنجام دەدەن.

## ٢- بیردۆزی رووداوی کارامەیی The stochastic theory

*** فشاری ئۆکسانی و تێکرایی ژین Oxidative stress and the rate of living:**

بڕی ئۆکسیجینی بەکارهاتوو پەیوەندی بە پیربوونەوە هەیە، ئەم گازە بە ئاسانی تاکە ئێلێکترۆن بۆ وەبەرهێنانی $O^{-2}$، $H_2O_2$ و OH وەردەگرێت، ئەمانەش جۆری ئۆکسیجینی کاردەرەوە (ROS)

reactive oxygen Species دروست دەکەن، ئەمیش زیان بە زیندە گەردەکان biologic molecules دەگەیەنێت، بۆ نمونە پیرۆکسانی peroxidation ترشە چەوریەکانی پەردەی خانە، گۆڕینی بنچینەی DNA – تاد، بەمەش ناچالاککردنی ئەنزیمەکان و پتر پرۆتین شیبوونەوە روودەدەن. چونکە سیستمی بەرگری دژە ئۆکسان بە تەواوی کاریگەر نییە بۆیە خانەکان زیانی کەڵەکەبووی لە ئەنجامی ئۆکسان لە گەردەکاندا تێدا کۆدەبێتەوە و هەندێك جار دەبێتە هۆی مردنی خانە.

لەگەڵ تێپەڕبوونی تەمەندا جۆری ئۆکسیجینی کاردەرە و ئاستی DNA و پرۆتینە زیان بەرکەوتووەکان بەهۆی ئۆکسان oxidation وە پتر دەبن.

کەمکردنەوەی بڕی وزەی وەرگیراو (خۆراك) بۆ ژیان تێکڕای زیندەچالاکی کەمتر دەکاتەوە و بەمەش فشاری ئۆکسانی کەمتر دەبێتەوە و تەمەنیش درێژتر دەبێتەوە.

## * پیربوون و زیانی DNA – Aging and DNA damage

لە مرۆڤدا ئەو جینانەی لە تێکڕایی پیربوون بەرپرسیارن هەر ئەو جینانەن کە بۆ نەخۆشییەکانی پیربوونی ناکام (پیربوونی پێش وەخت) بەرپرسیارن ، وەك کۆنیشانەی کۆکاین Cockayne syndrome، کۆنیشانەی وێرنەر Werner's syndrome – تاد، لەم بارانەدا کەم توانایی سارێژکردنەوەی DNA ی زیان بەرکەوتوو تێکڕایی پیربوون خێراتر دەکات.

لە زیندەوەرانی تردا (جگە لە مرۆڤ) جینی درێژکردنەوەی ژیان (بە بازدانی جینی یان جینی پتر دەربڕ "overexpression") هەن و ژیانی زیندەوەرەکە درێژتر دەکەنەوە بە ڕێگەی ئاماژەدان بە پرۆتینەکان بۆ پاڵپشتیکردن دژی فشاری ژینگەیی وەك برسیبوون، ت س و، زیانی ئۆکسانی و کاریگەری بەدی گەرمی، یان بەرزتر دەربڕینی هەندێك لە جینەکان بۆ بەهێزترکردنی کاردانەوەی بەرگری دژی زیانەکانی ژینگە.

* **گورزەبەستی ترشی ئەمینی** Amino acid racemization: واتا جێگرتنەوەی ترشی ئەمینی جۆری L (Levo) بە جۆری D (Dextro) لە پرۆتیندا، ئەم پرۆسەیە لەگەڵ پیربووندا روودەدات و کاردەکاتە سەر کاری پرۆتین و چالاکیەکەی تێك دەدات.

* **بەشەکربوونی نائەنزیمی** Nonenzymatic glycosylation: ئەڵدیهایدی شەکر (گلوکۆز) لەگەڵ ئەمینی پرۆتیندا خەست دەبنەوە و کاری پرۆتینەکە تێکدەدەن، ئەمیش بە لکانی پەڕینەوە cross linking لەگەڵ پرۆتینی ریشاڵی کۆلاجینیدا کاری پرۆتینی کۆلاجین تێکدەدات.

– نابێت ئەوەشمان لەبیربچێت کە سیستمی بەرگری لەش دوو رۆڵی سەرەکی دەگێڕێت، یەکەمیان بەرگری دژی زیانی دەرەکی و دووەمیان هەڵسەنگاندن و راگرتنی بەرگری ناوەوەیە، ئەم سیستمە لەگەڵ تێپەڕبوونی تەمەندا چالاکی کەمتر دەبێتەوە و هۆکارێکە بۆ پتربوونی ئاستی تووشبوون بە میکرۆب و شێرپەنجە.

## پیربوونی پێست Skin aging

١- **پیربوونی ناوەکی** Intrinsic aging: ئەم جۆرەیان بەهۆی تێپەڕبوونی کات (تەمەن) لە هەموو کەسێکدا روودەدات و گۆڕانکاری فیسیۆلۆجی گرنگ و ووردن لە پێستی ساغ و نەخۆش دا . ئەمانەی خوارەوەن:

وشکی و زبری پێست، چرچبوون، شلی پێست، کەم گونجان، درەنگ سارێژبووبن و دروستبوونی لووی بێوەی.

چرچبوونی پێست لە ئەنجامی گۆڕانکاریەکانی بنتوێژ روودەدات، قەبارەی بن توێژ لە ئاسایی کەمتر دەبێتەوە چونکە کۆلاجین لەگەڵ تەمەندا کەم دەبێتەوە، ژمارە و قەبارەی کۆلکەخانە و ریشاڵەخانەکانیش کەم دەبنەوە ،بەلام بڕی ئاوی بن توێژ کەم نابێتەوە بەڵکو لە ٣٠-٥٠ ساڵیدا لە ئاسایی پتر دەبێت، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا باقەی ریشاڵە کۆلاجینەکان پارچە پارچە دەبن و دەشێوێن و ریشاڵە جیرەکانیش کەمتر دەبنەوە و تێکدەشکێن.

لە زۆر شوێنی پێستدا ئەستووری توێژ لە ئاسایی کەمتر دەبێتەوە و ریزبەندی خانەکانی تێکدەچێت و قەبارەکانیشیان کەمتر ریکن و شێوەشیان تێکدەچێت، لە ٣٠-٧٠ ساڵیدا تێکڕایی خانە نوێبوونەوەش دەگاتە ئاستی نیوەی باری ئاسایی. هەروەها تێکڕایی سارێژبوونەوەی توێژ و برین سارێژبوون کەم دەبنەوە. پێستی پیر بۆ مژادی کیمیکی پتر پیارۆییە permeable بەهۆی گۆڕانکاری خانەی کاژ و چینی کاژی کەمتر ئاو وەخۆ دەگرێت.

رەنگی پێست نارێك دەبێت و پەڵەی زەرد یان قاوەیی (شڵی) لە پشتی دەست و دەموچاودا لە پتر لە ٥٠٪ی ئەوانەی سەرووی ٤٥ ساڵن دەردەچن و پێی دەڵێن شڵی پیری senile lentigines ، هەروەها پێست بە گشتی لە پیردا لە شوێنە بەرخۆرکەوتووەکاندا لە ئاسایی تۆختر ە.

لە دوای ٥٠ ساڵیدا نزیکەی نیوەی خەڵکی پتر لە ٥٠٪ی مووی سەریان سپی یان خۆڵەمێشی بووە ، بەهۆی نەمانی یان کەمبوونی ژمارەی خانەی تۆخ لە پیازەی موودا.

نەمانی خانەی تۆخ لە موودا زووتر لە نەمانی خانەی تۆخی پێست روودەدات، چونکە خانەی تۆخی موو لە قۆناغی گەشەی anagen phase سووڕی موودا بە ئەوپەڕی چالاکی زۆر دەبن و میلانین دروست دەکەن، بەلام خانەی تۆخی پێست چالاك نین بۆیە تەمەنیان درێژە.

مووی سەر پێش مووی لەش سپی یان خۆڵەمێشی دەبێت چونکە کاتی قۆناغی گەشەی مووی سەر لە مووی لەش درێژترە.

لە پیردا ژمارەی سەلکەمووەکان (بەهۆی پووکانەوە و بەرِیشاڵبوونی هەندێك لە سەلکەکان) کەم دەبێتەوە، ریژەی مووی پشوودەریش پتر دەبێت و ئەو مووانەی دەمێننەوە قەدیان بچووکتر دەبێت و سستتر گەشەدەکەن.

وەك باسمانکردووە موورِووتانەوەی شێوازی لەگەڵ تەمەندا روودەدات، دوای لێچوونەوەش لە مێینەدا تووکنی دوای ٦٠ ساڵی لە رێژەی٥٠٪ یاندا بەهۆی تێکچوونی هۆرمۆنی روودەدات.

گەشەی مووی ریش لە ٣٠–٤٠ ساڵیدا پترە، بەلاّم مووی سنگ لە ٤٠–٥٠ ساڵیدا و مووی ژێرباڵ و بەر لە ٢٠–٣٠ ساڵیدا پترن، مووی برۆ و گوێچکە لە تەمەنی ناوەڕاستدا پتر دەبن.

دوای ١٠–٢٠ ساڵی دروستبوونی چەوری لە رژێنەچەوریەکاندا بۆ هەر ١٠ ساڵێك بە رێژەی ٢٣٪ کەم دەبێتەوە، بۆگەنەگلاندی ژێرباڵ لەگەڵ تەمەندا بچووکتر دەبنەوە و کەمتر بۆگەن دروست دەکەن. ژمارەی ئارەقەگلاندەکان بە رێژەی ١٥٪ لە تەمەنی پێگەیشتوودا کەم دەبێتەوە و کاردانەوەشیان بۆ گەرما بەهۆی کەم ئارەق دروست کردن کەمترە، هەر بۆیە پیر پتر تووشی لێدانی گەرما heat stroke دەبێت.

تێکرِایی گەشەی نینۆك دوای ٢٥ ساڵی کەمدەبێتەوە.

هەستی دەمارەکانی پێست لەگەڵ تەمەندا کەمدەبێتەوە و ئاستانەی threshold ئازار پتر دەبێت.

بەکورتی فرمانەکانی پێست کە بەهۆی پیربوون کەمدەبنەوە ئەمانەی خوارەوەن:

خانە وەبەرخستنەوە، فرمانی بەربەستی، پاککردنەوەی لەش لە مژادی کیمیکی، هەستی پێست، پاراستن دژی زیانی میکانیکی، برین سارِێژبوون، کاردانەوەی بەرگری، رێکخستنی پلەی گەرمای لەش، ئارەقکردنەوە، چەوری دروستکردن، دروستکردنی ڤیتامین D و نۆژەنکردنەوەی DNA.

٢- **تیشکەپیربوون** Photo aging:

پیربوونی پێست بەهۆی بەرکەوتنی درێژخایەنی خۆر ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

* زبربوون و وشکبوونی پێست: بەهۆی پتر پەستاویی چینی کاژ، ئەستوورتربوونی چینی دەنکۆڵەیی و کەمتربوونی ئەستووری توێژ و بری مژادی چلمیی ناوی.

قۆچەکاژی خۆری actinic keratoses: بەهۆی نائموونەیی ناوکی خانەکان، نەمانی شێوازی رێکی خانەکان، پتر پێگەیشتنی خانەکان، زێدەئەستووربوونی نارێکی توێژ یان تەنکبوونی توێژ.

* تۆخبوونی نارێك: وەك کونجە freckles، شلّی، کەمرەنگی دلۆپەیی guttate hypomelanosis و تۆخبوونی هەمیشەیی.

* چرچبوونی پێست: وەك هێڵی رووکەشی باریك و گنجبوونی قووڵ.

* گەندە جێزامی ئەستێرەیی stellate pseudoscars.
* هەڵوەشانی جیرەریشاڵ elastosis ، بە شێوەی گرێێۆکەی بچووك یان زبری پێست دەردەکەوێت.
* ناجیری پێست inelasticity.
* دروستبوونی فرەدەزوولە.
* خوێنهێنەرە دەریاچەیی venous lakes.
* پەڵەخوێن purpura ، واتا شینکی بوونی لەخۆوە easy bruising. بە تایبەتی لە پشتی دەست و باسکدا.
* سەرەزیپکە comedones لە دەم و چاودا.
* گەورەبوونی رژێنە چەوری sebaceous hyperplasia.
* چەوریە قۆچەکاژی seborrhoeic keratosis.
* پتربوونی شێرپەنجە.

**تێبینی**: جگەرەکێشان بۆ چرچبوونی پێست زۆر گرنگە.

**چارەسەر**:

١- دوورکەوتنەوە لە خۆر بە بەکارهێنانی کاسکێتی سەر و جلی لەبار و چەتر- تاد.

٢- بەکارهێنانی دژەخۆر.

٣- ترێتینۆینی جێیی بۆ ١٠-١٢ مانگ، ئەلفاهایدرۆکسی ئەسیدەکان وەك ترشی لاکتیك (لە شیر و ماستدا هەیە)، ترشی مالیك malic acid و ستریك (لە میوەدا هەیە) یان ترشی گلایکۆلیك (لە قامیشە شەکردا هەیە) بۆ پتر لە ٦ مانگ.

٤- دژە ئۆکسێنەکان anti-oxidants: وەك ڤیتامین A (ریتینۆڵ retinol)، ڤیتامین C (ترشی ئەسکۆربیك ascorbic acid)، ڤیتامین E (تۆکۆفیرۆڵ tocopherols)، بیتا کارۆتین B-carotene و زیندەفلاڤینۆیدەکان (bioflavinoids). ئەمانە پارێزەری ناوەکی دژە ئۆکسانن ، بەلآم بەکارهێنای جێیی ئەم مژادانە بۆ نەهێشتنی کاریگەری رەگە سەربەخۆکان free radicals لە پێستدا باش نەسەلمێنراوە.

٥- چارەسەری هۆرمۆنی hormonal therapy: بۆ مێینە دوای لێچوونەوە ئیسترۆجینی سەراپایی و جێیی و لە نێرینەدا دوای ٦٠ساڵی هۆرمۆنی گەشە growth hormone بەکەڵکن.

# چارەسازی پێست Skin therapeutics

کاریگەری دەرمانی جێیی بۆ چارەسەر پشت بە چەند خاڵێك دەبەستێت:

١- هێزی دەرمانەکە potency.

٢- توانای دەرمانەکە بۆ بڕینی پێست (چوونە ناو پێست) penetration.

٣- باری چینی کاژی، وەك ئەستووری چینەکە لەبەر ئەوە کاریگەریەکە لە زۆرەوە بەرەو کەمتر لە شوێنەکانی لەشدا بەم جۆرەیە: ناوپۆش، پێستی باتوو، پێڵووی چاو، دەموچاو، سنگ و پشت، قۆڵ و سەرەوەی لاق، باسك و خوارەوەی لاق، پشتی دەست و پێ، بەری دەست و پێ و کەمترینیان نینۆکە.

٤- بەستن Occlusion: واتا داخستنی دەرمانە جێییەکە لە ژێر نایلۆندا یان بەکارهێنانی مەرهەمی چەور بە تایبەتی دوای خووساندنی پێست بۆ ٥ خولەك لە ناو ئاودا ئەوسا بەستنی، کاریگەریەکە ١٠-١٠٠ کەڕەت پتر دەکات، بەڵام ماکەکانیش پتردەبن.

٥- چەندجارە بەکارهێنان frequency: بۆ ستیرۆیدەکان یەك جار لە رۆژێکدا بەسە، بەڵام بۆ چەورکەر و نەرمکەرەوەکان emollients چەند جار لە رۆژێکدا کاریگەرترە.

٦- بڕی دەرمانەکە quantity: بڕی دەرمانی جێیی دەبێت هەموو بەشە ناساغەکە داپۆشێت و بۆ ماوەی پێویست لەسەر پێست بمێنێتەوە، بەڵام نابێت زۆر بە ئەستووری یان بە کەمی لە پێست بدرێت.

٧- سڕینی یان شێلانی دەرمانەکە لەسەر پێست کاریگەریەکە پتر دەکات.

٨- بچووکی قەبارەی بەشۆکەکانی (پارچۆڵەکانی) particles دەرمانەکە، کاریگەریەکەی پتر دەکات.

## دەرمانهەڵگر Vehicle

بریتییە لە مژادی ئامادەکراو بۆ هەڵگرتن و بەرکەوتنی دەرمانە کاریگەرەکە بە پێستەوە. ئەم مژادە دەبێت راگیراوی فیزیکی و کیمیکی هەبێت و دەرمانە کاریگەرەکە ناچالاك نەکات و وورووژێن و هەستیارکەریش نەبێت و بە ئاسانی بەکاربێت و رواڵەتی لەبار بێت و نەخۆش لای شیاو بێت. زۆر جار دەرمانهەڵگر جگە لە ئەرکەکانی تری، فێنککەرەوە و پارێزەر و نەرمکەرەوە و داخەرە یان وشککەرەوەیە.

**نموونەکان:**

**شیرینەکان** Emulsifying agents: وەك کۆڵێستیرۆڵ، مێوی نەرمکەرەوە، پۆلیسۆربەیت، سەلفای لۆریلی سۆدیۆم – تاد.

**نەرمکەرەوەی یاریدەدەر** Auxillary emulsifying agents: وەك کاربۆمیر، ئەلکوهولی سیتایل، ئەلکوهولی کارتێریل، گلیسریل مۆنۆستیارەیت، لانۆلین، ئەلکهولی ستیاریل – تاد.

**راگیرکەر** Stabilizers: وەك بێنزایل ئەلکوهول، BHA، کلۆرۆکریزۆڵ، ترشی ستریك، گلیسرین، پارابینەکان – تاد.

**توێنەرەوە** Solvents: وەك ئەلکوهول، گلیسرین، ئایزۆپرۆپیل میستیرەیت، پرۆپیلین گلایکۆل، ئاو – تاد.

**ئەستوورکەر** Thickenig agents: وەك مێوی هەنگ، کاربۆمیر، ڤازیلین، بنێشتی زانثان – تاد.

**نەرمکەرەوە** Emollients: وەك سیتایل ئەلکوهول، گلیسرین، لانۆلین، سکوالین، ترشی ستیاریك – تاد.

**تەڕکەر** Humectants: وەك گلیسرین، پرۆپیلین گلایکۆل و شلەی سۆربیتۆل.

زۆربەی دەرمانهەڵگرەکان تێکەڵەی بۆدرە powders و شلە liquids و چەورین Greases (زۆربەری چەوریەکان لێوەرگیراوی نەوتن) و ئەم مژادانە جواداگانەییان لە دەرمانهەڵگردا تێدا دەمێنێت.

دروستکردنی جۆری دەرمانهەڵگر بەم شێوەیە:




**بۆدرە** Powders

بریتین لە ئۆکسیدی زنك zinc oxide، دووەم ئۆکسیدی تیتانیۆم titanium dioxide، تالك talc، بێنتۆنایت bentonite و کالامین (کاربۆناتی زنك zinc carbonate یان ئۆکسیدی زنك ٩٨٪ + ئۆکسیدی ئاسن ferrous oxide 2%). بەڵام بۆدرەی ئەندامی organic powders بریتین لە نیشاستە starch و زنك ستیارەیت، بۆدرە تەڕی هەڵدەمژێت و لێخشاندن کەم دەکاتەوە.

**چەوری** Greases

بریتین لە:

١- ڕۆنی ڕاستی و چەوری True oils & fats: بۆ نموونە ڕۆنی ئاراکیس arachis oil، ڕۆنی زەیتون، لانۆڵین، ئەلکهولی سیتایل و ستیاریل، چەوری BP، لانۆڵینی بێ ئاو anhydrous lanolin، ئیوسێرین eucerin (ئەلکهوهوڵی خوری BP)، کەرەی کۆکۆوا cocoa butter، مێوی سیتایل ئیستەر، سیتۆستیاریل ئەلکهوهول – تاد.

٢- مێو Waxes: وەك مێوی هەنگ bee wax BP، مێوی شیرین emulsifying wax، مێوی لانێت lanette wax – تاد.

٣- چەوری کانزایی Mineral greases: لەوانەیە شلە یان نەرم یان ڕەق بێت، بۆ نموونە چەوری شلە fluid greases وەك شـلـەی پـارافین liquid paraffin، ڕۆنـی کـانزایی mineral oil و پۆلیەثیلین گلایکـۆل ٣٠٠ polythelene glycol 300. چـەوری نـەرم soft greases وەك پـارافینی نـەرمی سـپی یـان زەرد yellow & white soft paraffin، ڤـازیلین vaseline و پلاستیبەیز plastibase. چەوری ڕەق وەك ماکرۆگۆلی ڕەق solid macrogols.

٤- ماکرۆگۆل Macrogols: وەك سیتۆماکرۆگۆل ١٠٠٠ cetomacrogol 1000.

چەوری ئامادەکراوێکی نیوەڕەقە semisolid کە بە ئاسانی لەسەر پێست بڵاودەکرێتەوە و پارێزەر و تەڕکەر و لووسکەرە.

بنچینەی مەرهەمی ointment base کە بۆ پێست بەکاردەهێنرێت پێنج جۆرە:

١- بنچینەی هایدرۆکاربۆنی Hydcrocarbon bases: وەك ڤازیلین، نەرمکەرەوەن emollients.

٢- بنچینەی هەڵمژ Absorption base: وەك لانۆلین، نەرمکەرەوە و پارێزەرن و ئاو وەخۆدەگرن.

٣- کرێم (شیراوی ئاو لە ناو ڕۆن) Creams (water in oil emulsions): بریتییە لە یەك یان پتر لە شلەی تێکەڵنەبوو immisible liquids (کەمتر لە ڕێژەی ٢٥٪ی ئاوە) لە ناو شلەی دووەمدا کە ڕۆنییە بە یارمەتی مژادی سێیەم بۆ شیراندنی emulsification. دوو شلەکە لە یەك جیا دەبنەوە بۆیە پێش بەکارهێنانی پێویستی بە شڵەقاندن هەیە. مژادی شیرێن لە ناو هەردووکیاندا دەتوێتەوە و دەوری دڵۆپۆکەکانی مژادی یەکەمی داوە بۆ ئەوەی بەیەکەوە نەلکێن. نموونەی شیرێن وەك سۆدیۆم لۆریل سەلفەیت.

٤- کرێمی ئاوی (شیراوی ڕۆن لە ناو ئاو Aqueous cream (oil in water emulsion: پتر لە ٣١٪ ئاوی تێدایە و هەندێك جار تا ٨٠٪ی ئاوە، ئەم جۆرە پتر دەرمانی پێستی تێدەکرێت و مژادی پارێزەری preservative تێدایە و بە ئاسانی لە سەر پێست بڵاو دەکرێتەوە و بە ئاو باش لادەبرێت و تەڕکەری humectant وەك گلیسرین، پرۆپیلین گلایکۆل یان پۆلیەثیلین گلایکۆلی تێدەکرێت.

٥- بنچینەی تواوەی ناو ئاو Water soluble bases: لە پرۆپیلین گلایکۆل پێکهاتووە و بەپێی کێشی گەردیەکەی molecular weight شلەیە یان ڕەقە. ئەم جۆرە لە ناو ئاودا تواوەیە و شی نابێتەوە و هەوێنی تێدا نارووێت و پارێزەری پێویست نییە و بە ئاسانی بە ئاو دەشۆردرێتەوە. پتر دژەکەڕوو و بەکتریای تێدەکرێت.

**جێــڵ** Gels

بریتییە لە تێکەڵەی ئەم جۆرەی پێنجی سەرەوە (پرۆپیلین گلایکۆل) لەگەڵ ئاو و وەرگیراوی سیلیلۆز یان کاربۆپۆل carbopol.

دوای ئەوەی کە جێڵ لە پێست دەدرێت، بەشە ئاوەکەی یان ئەلکوهولەکەی دەبێت بە هەڵم و دەرمانە چالاکەکەی ناوی بە خەستی لەسەر پێست دەمێنێتەوە و بۆ شوێنە تووکنەکان زۆر شیاوە.

**هەویــر** Paste

بریتییە لە تێکەڵەی چڕی زۆری بۆدرە (تا ڕێژەی ٥٠٪) لە ناو چەوری واتا مەرهەم دا. هەویر لە چەوری وشککەرەوەترە و کەمتر داخەرە less occlusive و کەمتریش چەورە.

دەرمانی وروژێن وەك ئەنثرالین anthralin یان ڕەنگکەر پتر لە ناو هەویردا بەکاردەهێنرێن، هەروەها ناپیارۆیە impermeable هەر لەبەر ئەوەیە وەك پارێزەر protectants یان دژەخۆر بەکاردێن.

**شــلە** Liquids

سێ جۆرە، شلە solution یان هەڵواسین suspension یان شیراو emulsions.

١- **شــلە** Solution: بریتییە لە توانەوەی دوو مژاد یان پتر لە ناو یەکدا بە شێوەیەکی روون. لەوانەیە شلەی دەرمانهەڵگر ئاو یان ئاو و ئەلکوهول یان نائاوی (وەك ئەلکوهول، ڕۆن یان پرۆپیلین گلایکۆل) بێت. نموونەکان:

شلەی ئاوی Aqueous solution: وەك شلەی بورۆ burrow's solution (ئەلومنیوم ئەسیتەیت).

شلەی ئاو و ئەلکوهول Hydroalcoholic solution: وەك چڕی ئەلکوهول ٥٠٪ لە ناو ئاو دا پێی دەڵێن تێهەڵسوو tincture.

شلەی نائاوی Nonaqueous solution: وەك کەتیرەئاسا collodion کە بریتییە لە پایرۆکسیلین pyroxylin لە ناو ئیثەر ether و ئیثانۆڵ ethanol دا. یان کەتیرەئاسای گونجاو flexible collodion کە بریتییە لە کەتیرەئاسا کە ڕۆن گرجەك castor oil و کافوور camphor ی تێدایە و ڕێژەی ١٠٪ ترشی سالیسیلیك و کانثاریدین cantharidin ی تێدەکرێت بۆ چارەسەری بالووکە.

یان ملەشلە liniments کە بریتییە لە شلەی ئاناوی دەرمان لە ڕۆن دا یان شلەی ئەلکهولـی سابوون. ملەشلە وەك دژە ورووژێن، وشککەرەوە، دژەخوران، نەرمکەرەوە یان ئازارشکێن بەکاردەهێنرێت.

٢- **هەڵواسین** Lotion (suspension): بریتییە لە پارچۆڵەی زۆر وردی دەرمانی نەتواوە بە چڕی تا ٢٠٪ لە ناو شلەدا. لەوانەیە پێش بەکارهێنانی پێویستی بە شلەقاندن هەبێت، نموونە وەك هەڵواسینی کالامین یان ستیرۆید.

* شڵەقاوە شلە Shake lotion: بریتییە لە هەڵواسین کە بۆدرەی تێکرابێت بۆ پتر بە هەڵمبوونی و پتر فێنککردنەوە و وشککردنەوەی پێستی تەڕ و دەڵێنەر. پێش بەکارهێنان پێویستی بە شڵەقاندن هەیە.

٣- **شیراو** Emulsions:باسمانکرد.

**پـرژە** Aerosols

پرژە بۆ دەرمانی جێیی بە شێوەی شلە، هەڵواسین، شیراو، بۆدرە و نیوەڕقی بەکاردەهێنرێت و دەرمانەکە لەسەر پێستدا دەبێت بە کەف و بەهۆی گەرمی پێست و سڕین خێرا نامێنێت و دەرمانەکە زۆر کەم پاشماوە جێدەهێڵێت.

**راگیرکەر** Stabilizers

تێکراوی ناچارەسازی دەرمانە، وەك پارێزەرەکان preservatives، دژەئۆکسانەکان antioxidants و گرەرەکان chelating agents.

دژەئۆکسانەکان دژی شیبوونەوەی دەرمان و دەرمانهەڵگر بە ئۆکسان، دەوەستن. بۆ نموونە BHA، BHT، ڤیتامین C، سەلفاکان – تاد.

گرەرەکان وەك EDTA و ترشی ستریك بە لکان لەگەڵ کانزا قورسەکان heavy metals دەیانخەنە شێوەی ئاوی aqueous phase.

**ئەستوورکەر** Thickneing agents

وەك مێوی هەنگ کە لینجی دەرمانەکە پتر دەکات.

## ستیرۆیدی جێیی Topical steroids

گەردی بنچینەی ستیرۆید کۆرتیزۆڵە cortisole، بە خستنەسەری یان گۆڕینی کۆمەڵی فرمانی functional groups لە شوێنی تایبەتمەند لەسەر گەردەکە ، چەندین جۆر لە بەهێزی ستیرۆید بەرهەم دێن.

کاریگەری ستیرۆید چوار جۆرە:

١- چوونەوەیەکی خوێنبۆری (گرژبوون) vasoconstriction.

٢- کاریگەری دژی خانە پڕبوون antiproliferative effect.

٣- سستکردنی بەرگری immunosuppression.

٤- کاریگەری دژەسۆیی anti-inflammatory effects.

چوار پۆلی سەرەکی ستیرۆید هەن کە ئەمانەن:

١- ستیرۆیدی سووک Mildly potent: وەك هایدرۆکۆرتیزۆن ٠,٥٪، مەثیل پرێدنیزۆلۆن ٠,٢٥٪ فلوسینۆلۆن ئەسیتۆنایتد ٠,٠٠٢٥٪، فلومیثازۆن، دێکسامیثازۆن – تاد.

٢- ستیرۆیدی مامناوەندی Moderately potent: وەك کلۆبێتازۆڵ بیوتیرەیت ٠,٠٥٪، فلوسینۆلۆن ئەسیتۆنایدە ٠,٠٦٢٥٪، فلوکۆرتۆلۆن ٠,٢٥٪، فلوئەندرینۆلۆن ٠,٠٥٪ – تاد.

٣- ستیرۆیدی بەهێز Potent: وەك بێکلۆمیثازۆن دایپرۆپیۆنەیت ٠,٠٢٥٪، بێتامیثازۆن ڤالێرەیت ٠,٠٢٥٪ و ٠,١٪، بودیسۆناید ٠,٠٢٥٪، فلوسینۆلۆن ئەسیتۆناید ٠,٢٥٪، فلوسینۆناید ٠,٠٥٪ – تاد.

٤- ستیرۆیدی زۆر بەهێز Superpotent: وەك کلۆبێتازۆڵ پرۆپیۆنەیت ٠,٠٥٪، هالسینۆناید ٠,١٪ – تاد.

**ماکەکانی ستیرۆید:**

١) تەنکبوونی توێژ، ٢) گۆڕانی ڕەنگی پێست بۆ کاڵتر بەهۆی نەهێشتنی خانەی تۆخ، ٣) پێستەقڵیشاو، ٤) خوێنڕێزی پێست، ٥) جێزامی ئەستێرەیی stellate scar، ٦) پێست ناسکبوون و دڕان، ٧) فراوانبوونی خوێنبۆری و فرەدەزوولە و سووربوونەوەی هەمیشەیی، ٨) پووکانەوە، ٩) زیپکەی عازەبەی ستیرۆیدی، ١٠) پێستەسۆی دەوری دەم و چاڵی چاو، ١١) سستکردنی تەوەرەی axis ژێر مێشکەگلاند و سەر گوچیلەگلاند، سستکردنی گەشەی لەش و نەخۆشی کوشینگ. ١٢) وروژێنە پێستەسۆی لێککەوتنی بۆ ستیرۆید یان دەرمانهەڵگرەکەی، هەندێك جار پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری ڕوودەدات. ١٣) سستکردنی بەرگری جێیی و ڕوودانی تووشێنی دووەمی.

# ڕێتینۆیدەکان Retinoids

١- **جێبیی** Topical: بریتین لە ترێتینۆین (all-trans retinoic acid =) tretinoin، ئایزۆترێتینۆین (جێیی) isotretinoin، ئەداپالین adapalene و تازارۆتین tazarotene.

لە ناو ناوکی خانەدا وەرگری ترشی ڕێتینۆیك "retinoic acid receptors "RARs هەن و ڕێتینۆیدەکان بەم وەرگرانە دەلکێن و چالاکیان دەکەن و بەهۆی چالاککردنی لەبەرگرتنەوەی transcription جینەکانی بەوەلاّم بۆ ترشی ڕێتینۆیك کاردانەوەی زیندەگی ڕوودەدات.

بۆ زۆر ناساغی بەکاردەهێنرێن وەك:

قۆچەکاژی خۆری، زیپکەی عازەبە، نەخۆشی سەدەف، تیشکە پیربوونی پێست، تۆخبوونی دواسۆیی، گوازەرەملی M.C، بالووکە ، نەخۆشی ماسی – تاد.

باشتر وایە لە کاتی سکپڕیدا بەکارنەهێنرێن هەرچەند بڕی هەڵمژراو بۆ ناو خوێن یەکجار کەمە.

ماکەکان:

ورووژاندنی جێیی (سووربوونەوە، کاژکردن، پێست وشکی و خوران) و تیشکە هەستیاری.

٢- **سەراپایی** Systemic: ڕێتینۆیدەکان کاردەکەنە سەر گەشە و تایبەتمەندبوونی خانە، شێوە دروستبوون morphogenesis، گەشەی لوو، گەشەی خانەی شێرپەنجەیی، گۆڕینی بەرگری و خانە بەیەکەوەلکان.

بریتین لە ڤیتامین A (ڕێتینۆڵ)، ئیترێتینەیت etretinate، ئەسیترێتین acitretin، ئایزۆترێتینۆین isotretinoin و بێکسارۆتین bexarotene.

بەکاردێن بۆ:

نەخۆشی سەدەف، زیپکەی عازەبە و لیمفۆمای خانەی T ی پێست CTCL، هەندێك جاریتر بۆ شێوانی کاژکردن وەك نەخۆشی ماسی، نەخۆشی کێرلی .Kyrle's ds، قۆچەکاژی بەری دەست و پێ، دڕکەڕەشە .A.N، نینۆکەگنجەستووریّ زگماکی .P.C، نەخۆشی داریەر، کاژەسووریّ موویی شێرپەنجە و باری پێش شێرپەنجەیی، نەخۆشی گوڵی، پانەپێستەستووری .P.R.P، .L.P، گۆشتەزوونەگمۆڵی بازنەیی، سەلکەسۆی گرام نێگەتیڤی، سەلکەسۆی پیتیرۆسپۆرەم، سەلکەچڵمین، گورگەسوورە، توێژشیبوونەوەی بلّقی سانا .E.B، نەخۆشی گرۆڤەر – تاد.

ماکەکان:

کۆرپەشێوێنی، پێست وشکی، کاژکردنی بەری دەست و پێ، پێستەسۆ، تیشکەهەستیاری، کێمە گۆشتەزوونەگمۆڵی .P.G، هەستی نووسانی بەری دەست و پێ، تووشێنی ستافیلۆکۆکەسی، لێوەسۆ، دەموشکی و هەست بە تینوێتی، وشکی ناوپۆشی لووت و خوێنڕێژی، چاووشکی و تێکچوونی بینین، پێڵووپۆشەسۆ، پێڵووسۆ، کەمبوونەوەی شەوبینین، تیشکەهەستیاری چاو، ئاوی سپی، هێڵنج،

سكچوون، سك ئێشە، سەهەڵدانەوەی ریخۆڵەسۆ، مووڕووتانەوەی بە لیشاو، باریکبوون و وشکبوونی موو، نینۆك ناسکبوون و نەرمبوون، سۆی نوشتاوەی نینۆك، نینۆك شیبوونەوە، سەرئێشە، خەمۆکی، بیری خۆکوشتن (زۆر دەگمەنە)، پڕبوونی ترشی یوریك، کەم چالاکی پەریزادە (بۆ بێکسارۆتین)، ئازاری ماسولکە و جومگە، ئێسك تێکچوون، نیشتنی کالسیۆم لەسەر ماسولکەبەندی بڕبڕەپشتی پێشەوە و دواوە، فشۆڵی ئێسکی درێژ، دەردەماسولکەیی myopathy، بەرزبوونەوەی ئاستی سێ گلیسراید، سۆی پەنکریاس، زەردەگمۆڵی هەڵتۆقیوی، بەرزبوونەوەی ئاستی کۆلێستیرۆڵ و VLDL و LDL، نزمبوونەوەی ئاستی HDL، بەرزبوونەوەی ئەنزیمەکانی جگەر، جگەرسۆ، کەمبوونەوەی خانەی سپی، پڕبوونی خوێنەخەپلە یان کەمبوونەوەی – تاد.
بۆ ئەسیترێتین و ئێترێتینەیت لە مێینەدا دەبێت دوای وەستانی ئەم دەرمانانە تا ١–٢ ساڵی داهاتوو سکپڕ نەبێت، بەڵام بۆ ئایزۆترێتینۆین دەبێت تا ٢ مانگ دوای وەستانی دەرمانەکە سکپڕ نەبێت.

## دژەهیستامین Antihistamines

دژەهیستامین دژایەتی antagonizes وەرگری هیستامین histamine receptors دەکات. چوار جۆر وەرگری هیستامین هەن:

١) وەرگری جۆری I – $H_1$-receptors لە پێست دا ٢) وەرگری جۆری ٢ $H_2$-receptors لە ناوپۆشی گەدەدا هەن، ٣) وەرگری جۆری ٣ $H_3$-receptors لە مێشك و سی دا هەن، ٤) وەرگری جۆری ٤ $H_4$-receptors لە هەندێك شانە و خانەدا هەن.

١– دژەهیستامینی جۆری ١ $H_1$ type antihistamines، ئەمانیش دوو جۆرن:

أ) **جۆری ئارامێن** Sedating type: بە رێگای دەم لە ماوەی ٣٠ خولەکدا ئیش دەکەن و لە ١–٢ کاژێردا زۆرترین کاریگەریەکەی دەردەکەوێت و بۆ ٤–٦ کاژێر بەردەوامە، بەڵام هەندێکیان تا ٢٠ کاژێر کاریگەرن.

جگە لە کاریگەری دژەهیستامینی،کاریگەری تریشیان هەیە، وەك ئارامکردنەوە sedation، چالاکی دژەوزەکۆڵینی anticholinergic activity، کاریگەری بەنجی جێیی، دژە رشانەوە و دەردەجوولان motion sickness.

شەش کۆمەڵن:

١– برۆمفێنیرامین مالیەیت، کلۆرفێنیرامین مالیەیت و تانەیت، دێکسبرۆمفێنیرامین مالیەیت، دێکسکلۆرفێنیرامین مالیەیت، دایمێتیندین مالیەیت، ترایپرۆلیدین هایدرۆکلۆراید.

٢- کاربینۆکسامین مالیەیت، کلیماستین فیومارەیت، دایفێنهایدرامین سترەیت و هایدرۆکلۆراید، دۆکسیلامین سەکسینەیت، ئیمبرامین هایدرۆکلۆراید، میفێنیدرامیۆم مەثیل سەلفەیت، ترایمیـثۆبێنزامین سترەیت.

٣- میپایرامین مالیەیت، ترایپیلینامین سترەیت و هایدرۆکلۆراید.

٤- دایمیـثۆثایازین مێسیلەیت، میکویتازین، مێـثدایلازین و مێـثدایلازین هایدرۆکلۆراید، پرۆمیثازین هایدرۆکلۆراید و ثیۆکلەیت، ترایمیپرازین تارتارەیت.

٥- ئازاتادین مالیەیت، سیپرۆهیپتادین هایدرۆکلۆراید، دایفەنیل پایرالین هایدرۆکلۆراید، فێنیندامین تارتارەیت.

٦- هایدرۆکسی زین هایدرۆکلۆراید و پامۆوەیت.

بەکاردێن بۆ:

لابردنی خوران، چارەسەری لیردەرکردن و لیردەرکردنی زەبەلاح و لیردەرکردنی فیزیکی، بۆ نەهێشتنی کاردانەوەی خوێنپێدان، خورانی بیرۆ و پانەپێستەستورێ و پێوەدانی مێروو و مشەخۆر و خوران لە ئەنجامی ناساغی هەناوی.

دوای سێینەی یەکەمی سکپڕی بۆ باری پێویست هەندێکیان بەکاردەهێنرێن.

ماکەکان:

ئارامبوون، نەخۆری، هێڵنج، رشانەوە، سکچوون، قەبزی، دەموشکی، وشکی ناوپۆشەکان، بەگرانی میزکردن، میزگیران، میزەچوڕکێ، شل وشۆڵی پیاو impotence، پێستەسۆی بیرۆیی، پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاری، لیر، خاڵەخوێن، هەڵتۆقیوی چەسپاوی دەرمان .F.D.E و تیشکە هەستیاری.

لە منالّدا بەژەهربوون بەم دژە هیستامینانە دەبێتە هۆی هاتنەبەرچاووگوێ hallucination، لارەلارە ataxia، شەپلە athetosis، نەگونجان incoordination و گەشکە، سوورهەڵگەڕان، بیبیلە فراوانبوون و زێدەگەرمی hyperthermia.

هەندێك جار دژەهیستامین دەبێتە هۆی زیانی میکانیکی پیشەیی لە کاتی ئیشکردندا، هەروەها لەوانەیە ببێتە هۆی گێژی، گوێ زرنگانەوە، شێوانی هاورێکی disturbed coordination، لێڵ بینین، کەمبوونی جەخت، دووبینی diplopia، هەڵچوون nervousness، بێ ئارامی irritability، خەوزڕان و لەرزین tremor.

ئەگەر نەخۆش ئاوی ڕەشی glaucoma چاو یان زلبوونی پرۆستاتی هەبێت دەبێت زۆر بە وریایی ئەم دژە هیستامینانەی بدرێتێ.

دژەهیستامین کاریگەری هێورکەرەوەی تر وەك دایازیپام یان مەی بەهێزتر دەکات بۆیە ژەمەکەی کەمتر دەکرێتەوە.

ئەگەر سکالاّ و نیشانەی ناساغی بە یەکێك لە دژە هیستامینەکان کۆنترۆڵ نەکرا ،ئەوە دژە هیستامین لە کۆمەڵێکی تر بەکار دەهێنین یان دوو یان پتر دژە هیستامین لە کۆمەڵی جیاواز بە یەکەوە بەکار دەهێنین.

ب) جۆری کەمئارامێن Low-sedating antihistamines: ئەم جۆرە نارامێن و کاریگەری دژەوزەکۆلێنیان نییە و ماکی کەمتریشیان لە جۆری (أ) هەیە و زۆربەشیان پتر لە لەشدا دەمێننەوە، بۆیە بۆ کاریگەرییان رۆژی یەکجار بەسە.

ئەمانەن:

تێرفینادین و ئەستێمیزۆڵ، خەریکە لە بازاڕدا نامێنن.

سیتیریزین، لۆراتادین، فێکسۆفینادین، دێسلۆراتادین، ئەکریڤاستین، میزۆلاستین، ئیباستین، ئەزیلاستین و ئۆکزاتۆماید oxatomide.

بەکاردەهێنرێن بۆ:

لیردەرکردنی درێژخایەنی هۆنەزانراو، لیردەرکردنی زەبەلاح، خورانی کۆلکەخانەیێ و لیردەرکردنی توند – تاد.

ماکەکان:

تێرفینادین و ئەستێمیزۆڵ دەبنە هۆی زۆردڵلێدانی زگۆڵەیی V.T.

سیتیریزین و ئەکریڤاستین و ئیباستین کەمێك ئارامێنن.

ئۆکزاتۆماید ئارەزووی خواردن پتر دەکات.

٢- دژەهیستامینی جۆری ٢ H2-type antihistamines: ئەم جۆرە بۆ چارەسەری چاڵەبرینی هەرسی peptic ulcers بەکاردەهێنرێن، بەلاّم وەرگری هیستامینی ٢ لە ڕیخۆڵە و خوێنبۆری پێستدا هەن بۆیە هەندێك جار لە پێستدا بەکاردەهێنرێن بە تایبەتی لەگەڵ دژەهیستامینی جۆری ١ بۆ لیردەرکردنی درێژخایەنی هۆنەزانراو، لیردەرکردنی زەبەلاح و هەندێك لیردەرکردنی فیزیکی و کۆلکەخانەیێ و سوورهەڵگەڕانی کارسینۆیدی – تاد.

نموونە: سیمیتیدین، رانیتیدین، فامۆتیدین و نیزاتیدین nizatidine.

دەرمانی تر کە کاریگەری دژەهیستامینیان هەیە ئەمانەن:

* دژەخەمۆکی antidepressants: وەك دۆکسێپین doxepin بە خەپلە و مەرهەم.
* کیتۆتیفین ketotifen: کاریگەری دژەهیستامینی جۆری١و کەناڵی کالسیۆم وەستێنی Ca. channel blocker هەیە.

بەکاردەهێنرێن بۆ: لیردەرکردنی درێژخایەنی هۆنەزانراو، لیردەرکردنی فیزیکی، کۆلکەخانەیێ و خورانی دەمارەڕیشاڵەگمۆلی N.F.

## دژەڤایرۆسەکان Antiviral Drugs

أ) دژەتامیسك و تامیسکی دەمار anti HSV and V-Z infections: ئەمانەن:

١) ئەسایکلۆڤیر acyclovir، ٢) ڤالاسایکلۆڤیر valacyclovir، ٣) فامسایکۆڤیر famciclovir و پێنسایکلۆڤیر penciclovir ، ٤) ترایفلوریدین trifluridine کریم ١٪.

ب) دژەڤایرۆسی خانەگەورەکەر anti-cytomegallovirus infections: ئەمانەن:

١) جانسایکلۆڤیر ganciclovir، ٢) ڤاڵجانسایکلۆڤیر valganciclovir، ٣) فۆسکارنێت foscarnet، ٤) سیدۆفۆڤیر cidofovir.

ج) ئینتەرفیرۆنەکان interferones: وەك:

١- ئینتەرفیرۆن ئەلفا ٢أ interferon-∝2a (1FN-∝2a).

٢- ئینتەرفیرۆن ئەلفا ٢ب 1FN-∝2b.

٣- ئینتەرفیرۆن ئەلفا ٣ 1FN-∝3.

د) دژەئەیدز anti-HIV infections وەك:

زیدۆڤودین zidovudine، دیدانۆسین didanosine، زالسیتابین zalcitabine، ستاڤودین stavudine، لامیڤودین lamivudine، ئەباکاڤیر abacavir و تینۆفۆڤیر tinofovir.

ساکویناڤیر saquinavir، ئیندیناڤیر indinavir، ریتۆناڤیر ritonavir، نیلفیناڤیر nelfinavir، ئەمپریناڤیر amprenavir و لۆپیناڤیر lopinavir.

## دژەکەڕوو Antifungal Drugs

١- سەراپایی Systemic: وەك:

١) تێربینافین terbinafine، ٢) ئیتراکۆنازۆڵ itraconazole، ٣) فلوکۆنازۆڵ fluconazole، ٤) کیتۆکۆنازۆڵ ketoconazole، ٥) گریزیۆفولڤین griseofulvin.

٢- جێیی Local: وەك:

نافتیفین naftifine، تێربینافین terbinafine، بیوتینافین butenafine، سایکلۆپایرۆکس ئۆلامین ciclopirox olamine، کلۆترایمازۆڵ clotrimazole، ئیکۆنازۆڵ econazole، کیتۆکۆنازۆڵ ketoconazole، مایکۆنازۆڵ miconazole، ئۆکسیکۆنازۆڵ oxiconazole، سەلکۆنازۆڵ sulconazole، ئەمفۆتێریسین ب amphoterecin B، نیستاتین nystatin، تۆلنەفتەیت tolnaftate، ترشی ئەندیسیلینیك undecylenic acid.

## Sun protective agents دژەخۆر

دوو جۆرن:

أ) دژەخۆری کیمیکی (هەڵمژی کیمیکی) Chemical absorbers: وەك، ئافۆبێنزۆن avobenzone (parsol)، سینامەیتەکان cinnamates، ئۆکتۆکریلین octocrylene، ئۆکسیبێنزۆن oxybenzone (واتا بێنزۆفینۆنەکان benzophenones)، ترشی پارائەمینۆبێنزۆیك (para-aminobenzoic acid = PABA)، پادیمەیت ئۆ padimate-O و سالیسیلەیتەکان salicylates.

ب) دژەخۆری فیزیکی (بەربەستە فیزیکیەکان) Physical blockers: وەك، زنك ئۆکساید ZnO و تیتانیۆم دایئۆکساید $TiO_2$.

## Lasers in dermatology لەیزەر و پێست

لەیزەر Laser بریتییە لە فراوانکردنی (بەهێزکردنی) رووناکی بەهۆی تیشکی دەرچووی هەژاو.

لە ئامێری لەیزەردا سێ قۆناغی سەرەکی هەن:

١- سەرچاوەی وزە Pumping source: لەوانەیە کارەبایی، کیمیکی یان تیشکی بێت، بۆ نموونە کلپەچرای زینۆن (xenon flash lamp).

٢- مژادی گوێزەر Medium: لەوانەیە شلە، گاز یان مژادی رەق بێت و درێژی شەپۆلی لەیزەر دروست دەکات.

٣- سیستمی پێدان Delivery-system: لەوانەیە قۆڵی جومگەیی articular arm یان بینینەریشاڵ fiberoptic بێت.

کە ئەلیکترۆنێك لە خولگەیەکی (بازنەیەکی) orbital بەرز بۆ نزمتر( کە وزەی کەمترە) بازی دا ئەوە فۆتۆنێك دروست دەبێت و ئەمەش لە زۆربەی سەرچاوەکانی رووناکی دا پرۆسەیەکی هەرەمەکی لەخۆوەیە، بەڵام لە لەیزەردا بە پێچەوانەوە فۆتۆنەکان یەك یەکێکی تر دروست دەکات کە هاوشێوەیەتی و بەم جۆرە یەك جۆر درێژی شەپۆلی بەهێز لە رووناکی دێتەکایەوە.

کەواتا بە پێچەوانەی رووناکی سروشتی، رووناکی لەیزەر ١) یەك رەنگە، ٢) بەهێزە، ٣) یەکگرتووە coherent، ٤) یەك ئاراستەیە و بە ئاسانی لە نیشانە دەدرێت.

کاریگەری لەیزەر لە سەر پێست پشت دەبەستێت بە: ١) درێژی شەپۆلی لەیزەرەکە، ٢) کاتی بەرکەوتنی لەیزەرکە، ٣) لێشاوی لەیزەرەکە fluence (واتا وزە بۆ رووبەرێکی دیاریکراو $\frac{\text{جول}}{\text{سم}^2}$ )

٤- قەبارەی پێستی بەر لەیزەرکەوتوو spot size.

هەروەها درێژی شەپۆلی لەیزەر و بە ئاستێکی کەمتر قەبارەی پێستی بەرلەیزەرکەوتوو شوێنی مژینی لەیزەرەکە لە پێستدا دیاری دەکات.

کاتی پێدانی (بەرکەوتنی) لەیزەر لە چەند چرکەیەك تا چەند نانۆچرکەیە ($١٠^{-٩}$ چرکە).

چەند جۆر شەپۆلی لەیزەری هەن کە ئەمانەن:

١- **جۆری شەپۆلی بەردەوام** Continous wave (CW): وەك:

أ) لەیزەری $CO_2$ (درێژی شەپۆلەکەی ١٠,٦٠٠ نم)، بەکاردەهێنرێت بۆ لابردنی دەردی پێست وەك قۆچەکاژ، بالووکە – تاد، نوێ کردنەوەی رووکەشی پێست بە لابردنی چرچی پێست، جێ زام و پێستی بەخۆر پیربوو.

ب) لەیزەری ئارگۆن Argon (درێژی شەپۆلەکەی ٤٨٨ نم، ٥١٤ نم، ٦٣٠ نم)، بەکاردێت بۆ لابردنی خوێنبۆری یان وەك سەرچاوەی رووناکی بۆ تیشکەبزێوەچارە.

٢- **جۆری تریپەیی** Pulsed mode: وەك:

أ) لەیزەری بۆیەی تریپەیی زەرد Yellow pulsed dye laser: (درێژی شەپۆلەکەی [دش ٥٧٧–٦٠٠ نم)، بەکاردێت بۆ لابردنی خوێنبۆری، بالووکە، پێستە قڵیشاو و جێ زامی گۆشتپارەیی و بنتوێژ نوێکردنەوە. یان بۆیەی سەوز (دش ٥١٠ نم) بۆ لابردنی خاڵ کوتان و رەنگی ناوپێست.

ب) لەیزەری دایۆد Diode laser (دش ٥٣٢ نم): بەکاردێت بۆ لابردنی خوێنبۆری و رەنگی ناو پێست وەك شڵی وە هەروەها بۆ موولابردن.

ج) لەیزەری روبی Ruby laser (دش ٦٩٤ نم): بەکاردێت بۆ لابردنی رەنگی ناوتوێژ و بنتوێژ وەك شڵی، نیشانەی ئۆتا، خاڵ کوتانی رەش و شین و سەوز.

د) لەیزەری ئەلێکساندرایت Alexandrite laser (دش ٧٥٥ نم): کارەکەی وەك لەیزەری روبی وایە، یان بۆ لابردنی موو و چارەسەری خوێنهێنەگمۆڵی لاق بەکاردێت.

هـ) لەیزەری ئیربیۆم یاگ Erbium: YAG (دش ٢٩٤٠ نم): بەکاردێت بۆ لابردنی لوو و نیشانە و نوێکردنەوەی رووکەشی پێست – تاد.

٣- **جۆری شەپۆلی بەردەوامئاسا** Quasi-continous wave: وەك:

أ) لەیزەری KTP (پۆتاسیۆم تیتانیل فۆسفەیت potassium titanyl phosphate) [دش ٥٣٢ نم]: بەکاردێت بۆ لابردنی خوێنبۆری و رەنگی ناوپێست.

ب) لەیزەری هەڵمی مس Copper vapor (برۆماید) [دش ٥١٢ نم، ٥٧٨ نم]: بەکاردێت بۆ لابردنی خوێنبۆری و رەنگی ناو پێست.

ج) لەیزەری ئێگزایمەر Excimer (دش ٣٠٨ نم): بۆ نەخۆشی سەدەف و بەڵەکی و نەخۆشی تری پێست بەکاردێت.

٤- **جۆری تریپەی تەتەڵەیی** Stuttered pulse mode: وەك:

أ) لەیزەری بۆیەی تریپەدرێژ Long pulsed dye laser **وەك روبی Ruby (دش ٦٩٤)**.

ب) رووناکی ترپاوی بەهێز IPL (Intense pulsed light) **(دش ٤٠٠-١٢٠٠ نم) ، بەکاردێت بۆ نویێ کردنەوەی رووکەشی پێست، لابردنی موولوولە، رەنگی ناو پێست و موولابردن – تاد. ئەم رووناکیە لەیزەر نییە چونکە شەپۆلەکەی هەرەمەکیە.**

٥- **جۆری لەپڕگۆڕاو** Q-swsitched mode (QS): وەك:

أ) لەیزەری روبی لەپڕ گۆڕاو QS Ruby **(دش ٦٩٤ نم).**

ب) لەیزەری ئێندیاگ Nd:YAG **(دش ٥٣٢ نم، ١٠٦٤ نم) بەکاردێت بۆ لابردنی رەنگی ناوتوێژ، خاڵ کوتانی سوور، شڵی، نیشانەی ئۆتا – تاد.**

ج) لەیزەری ئەلێکساندرایت: **بەکاردێت بۆ لابردنی رەنگی ناوتوێژ و بنتوێژ (خاڵ کوتان، نیشانەی ئۆتا، شڵی – تاد).**

**زیانەکانی لەیزەر:**

**ئەگەر لەیزەر بە رێکوپێکی بەکار بهێنرێت ماکی زۆر کەمە، بەڵام هەندێك ماك بە دەگمەن روودەدەن وەك:**

**ئاگرکەوتنەوە، کارەبا لێدان، تەقینەوەی ئامێری پێدان delivery piece، زیانی چاو، سووتانی پێست، هەڵمژینی دووکەڵی بەشی پێستی سووتاو یان میکرۆبی دەردی سووتاو، بۆ نموونە ڤایرۆسی بالووکە، وروژێنی هەڵمژاو وەك دوای موولابردن – تاد.**

**بۆ زۆربەی بارەکان ،خۆپاراستن لە خۆر و بەکارهێنانی دژەخۆر پێویستن، نەخۆش دەبێت رەچاوی رێنماییەکانی پزیشك بکات.**

**لەیزەر نابێتە هۆی دروستبوونی شێرپەنجە یان نەزۆکی، تەنانەت لە کاتی سکپڕیشدا ماکی نییە و بەکاردێت.**

**هەندێك جار تووشێنی دووەمی بەکتریایی و ڤایرۆسی بەتایبەتی تامیسك روودەدەن و چارەسەریان ئاسانە، هەندێك جاری تریش تۆخبوون، کەمڕەنگی یان جێ زام دروست دەبن.**

# ئارایشت و چاودێری پێست Cosmetics and skin care

**ئارایشت** cosmetics بریتین لەو بەندانەی (مژادانەی) articles بەکاردێن بە سڕین rubbing، ڕۆکردن pouring، پڕژە یان ڕشاندن بۆ سەر لەش یان دەخرێنە ناولەش یان بەشێك لە لەش بۆ پاککردنەوە، جوانکردن، سەرنج ڕاکێشان یان گۆڕینی ڕووالەتی.

ماکەکانی ئارایشت:

کۆنیشانەی وروووژان irritation syndrome: وەك کاردانەوەی توند یان سووتانی، پێستەسۆی وروووژان، کاردانەوەی وروووژان، وروووژانی کەڵەکەیی، وروووژانی میکانیکی، هەڵتۆقیوی عازەبەیی و پیزۆکەیی، کاردانەوەی ژەهرەتیشکی، وروووژانی هەستی sensory irritation، کۆنیشانەی لیردەرکردنی لێککەوتنی و کاردانەوەی فرەهەستیاری درەنگ (DHR).

ڕێژەی ٥٪ی بەکارهێنی ئارایشت،پێستەسۆی لێککەوتنی هەستیاریان تووش دەبێت و ٥٩٪یان لە پێستی دەموچاو دایە و ڕێژەی ٧٩٪یان مێینەن.

زۆربەی ئارایشتەکان وروووژێن نین، بۆیە هەستیاری بە ئەزموونی پارچە patch test بە ئاسانی دەدۆزرێتەوە، بەڵام بۆ باری پۆزەتیفی لاواز بۆ ئارایشتەکە مێژووی هەستیاریەکە و دووبارەکردنەوەی ئەزموونی پارچە و ئەزموونی بەشە پێکهێنەکانی ئارایشتەکە دەکرێن.

سینی جیاکەری ئەزموونی (بە پەلە بەکارهێنانی چینی تەنکی سەر پێست) thin-layer rapid use epicutaneous (T.R.U.E.) test screening tray بەکەڵکە و بریتییە لە سینیەك کە پێکهاتە جیاکانی ئارایشتەکەی لەسەرە، ئەم پێکهاتە تاکانە بە چینێکی تەنك لە پێستی پێشەوەی باسك دەدرێن، بۆ دۆزینەوەی هەستیاری بەم تاکە مژادەی ناو ئارایشتەکە.

ئەزموونی دووبارە هەستێکردنەوە provacative use test ، بریتییە لە لێدانی ئارایشتەکە بۆ ڕووبەری ٥ سم٢ لە پێستی ناوەوەی باسك نزیك لۆچی ئانیشك ،ڕۆژی ٢ جار بۆ ٤ حەفتە بۆ زانینی هەستیاری بە ئارایشتەکە.

بۆ دۆزینەوەی تیشکە هەستیاری بۆ ئارایشتەکە، شوێنی پارچەکە ت س و A ٥-١٠ جول( دوای ٢٤ کاژێر دوای لێدانی ئارایشتەکە) لێ دەدرێت و دوای ٤٨ کاژێری تر دەپشکنرێت بۆ هەستیاربوون. ئەو مژادانەی لە سینی جیاکەری ئەزموونەکە (T.R.U.E)دا هەن ئەمانەن:

کولۆفۆنی (ڕۆزین) colophony (rosin)، تێکەڵی بۆن fragrance-mix، پارافەنیلین دایئەمین P.P.D، ئەلکوهولی لانۆلین، فۆرمەڵدیهاید، کواتێرنیەم ١٥ quaternium-15، بەڵسەمی پیرو، تیکەڵی پارابین، ئایمیرۆساڵ و مەثیل کلۆرۆئایزۆثایازۆلینۆن + مەثیل ئایزۆثایازۆلینۆن.

* **بۆن** Fragrances: ڕێژەی ١٪ی خەڵکی تووشی هەستیاری دەکات و پێستەسۆ لە دەموچاو و مل و دەست و ژێر باڵ یان هەموو لەش دروست دەکات. مژادەکانی بۆن زۆرن وەك: ئیوجینۆڵ

eugenol، ئایزۆئیوجینۆڵ isoeugenol، oak moss absolute، جیرانیۆڵ geraniol، سیناماڵ cinnamal، ئەلفائەمیل سینامیك ئەڵدیهاید ∝-amyl cinnamic aldehyde، هایدرۆکسی سیترۆنێلاڵ hydroxycitronellal و سینامیك ئەلکوهول cinnamic alcohol – تاد.

پارێزەرەکان Preservatives: ئەم مژادانە بەکاردێن بۆ نەهێشتنی پیسبوونی ئارایشتەکان بە میکرۆب کە دەبنە هۆی تێکشکاندنی ئارایشتەکە یان تووشێن لە بەکارهێن دا، بەڵام هەندێك جار ئەم پارێزەرانە بەکاردێن بۆ بەرهەڵستیکردنی تێکشکانی ئارایشتەکە بە ئۆکسان یان ت س.و. نزیکەی ٦٠ جۆر پارێزەر هەن وەك: ئیستەری پارابینەکان paraben esters، پروپیلین گلایکۆل propylene glycol ، فۆرمەڵدیهاید formaldehyde، کواتێرنیەم ١٥ quaternium 15، ئیمیدازۆلیدین یوریا، دایازۆلیدینیل یوریا، هایدانتۆین DMDM – تاد.

پاککەرەوەکان Cleansing agents: بۆ لابردنی پیسکەری ژینگەیی، ئارەق، چەوری و کاژی فرێدراوی پێست بەکاردێن. وەك:

## سابوون Soap

بریتییە لە هۆکارێکی چالاکی رووکەشی و لەگەڵ ئاودا بەکاردەهێنرێت بۆ شۆردن و پاککردنەوە. شێوەی رەقی یان شلەی لینجی هەیە، سابوون لە خوێی پۆتاسیۆم یان سۆدیۆمی ترشە چەورەکان پێکهاتووە. بەرهەمهێنانی سابوون بە کارلێککردنی رۆنی باو یان چەوری لەگەڵ شلەی بەهێزی تفتی دا دەکرێت بە پرۆسەیەك پێی دەڵێن بەسابوونبوون saponification.

کاری سابوون: گەردی سابوون دوو سەرجەمی هەیە، یەکێکیان ئاوخواستە hydrophilic کە لە ناو ئاودا دەتوێتەوە و یەکێکیشیان ئاونەخواستە hydrophobic کە دەتوانێت گەردی چەوری بێجەمسەری nonpolar (بە دروستکردنی گەردیلە بە دەوری چەوریەکەدا) بتوێنێتەوە. کەواتا ئەو مژادانەی لە باری ئاساییدا لە ناو ئاودا نەتواوەن، بە سابوون لە ناو ئاودا دەتوێنەوە. نزیکەی ٢٨٠٠ ساڵ پێش زایینی سابوون هەبووە، لە کارخانەدا لە ساڵی ١٧٨٩ لە لەندەن بەرهەمهێنراوە.

زۆر جار بۆن و دژەبەکتریا وەك کلۆرۆگزیلینول chloroxylenol و ترایکلۆسان triclosan یان بۆدرەی تیتانیۆم، نیکڵ، ئەلەمنیۆم، زیو یان مژادی چارەسەری وەك گۆگرد – تاد ی تێدەکرێت. هەندێك جار ورووژان و هەستیاری بە سابوون دروست دەبن ئەمەش بەپێی پێکهاتەی سابوون، بڕی وەسەرخەر surfactant، زەبری میکانیکی، پلەی گەرمای ئاوەکە و ماوە و کەم و زۆری بەکارهێنان، دەگۆڕێت.

# Shampoo شامپۆ

بەرهەمێکە بۆ گرنگیپێدانی قژ بەکاردێت و چەوری و پیسی و گەردیلەی پێستی و کرێش و پیسکەری ژینگەیی – تاد لادەبات. زۆربەی جار دوای شامپۆ لەبارکەر (دواشامپۆ) conditioner بۆ کارئاسانی قژ شانەکردن و مامەڵەکردن بەکاردەهێنرێت، هەندێك جار شامپۆ و لەبارکەر بە یەکەوەن.

کاری شامپۆ وەك سابوونە بەڵام لەوانەیە بۆ سەرشۆردن سابوون پتر لە ئاستی پێویست چەوری دەوری موو و پێستی سەر لاببات، بەڵام لە شامپۆدا وەسەرخەر surfactant جۆرێکی وایە کە زۆر ئەم چەوریە لانەبات و زێدە وشکبوون و کزانەوە و دێزبوونی مووی سەر وەك سابوون،دروست نەکات.

شامپۆی باش ئەم جوداگانانەی تێدایە:

بە ئاسانی بە ئاو لادەچێت و قژ بە جوانی جێدەهێڵێت، کەمترین ورووژانی چاو و پێست دروست دەکات، زیان بە قژ ناگەیەنێت، بۆنی خۆشە، زۆر کەم ژەهراویە، باش شیدەبێتەوە، کرێمییە یان ئەستوورە بە قژەوە و کەمێك ترشییە slightly acidic ($P^H$ی لە ۷ کەمترە)، چونکە تفتی موو دەشکێنێت.

پێکهاتە سەرەکیەکانی شامپۆ بریتین لە کلۆریدی ئەمۆنیۆم، سەلفاتی لۆریل ئەمۆنیۆم، گلایکۆڵ، سەلفاتی لۆریلی سۆدیۆم و سەلفاتی لۆریثی سۆدیۆم.

جۆرەکانی شامپۆ:

١) شامپۆی باو.

٢) شامپۆی کرێش Dandruff، ئەم شامپۆیانە کەڕووکوژیان تێدایە وەك کیتۆکۆنازۆڵ ketoconazole، پایریـثیۆنی زنك zinc pyrithione و سەلفادی سیلینیۆم seleniun sulfide کە کەڕووی مالاسیزیا فەرفەر malassezia furfur دەکوژن یان قیری خەڵوزی coal tar و سالیسیلەیتیان تێدایە.

٣) شامپۆی سروشتی All-natural: مژادی رووەکی سروشتیان تێدایە، وەك رۆن و پۆختەی رووەکی، بەڵام کاریگەری ئەمانە جێگای گومانە.

٤) شامپۆی منالّ Baby: ئەم جۆرە کەمتر ورووژێنە و هەستی کزانەوە و گەستن کەمتر دروست دەکات.

٥) شامپۆی ئاژەڵ Animal.

٦) شامپۆی رەق Solid.

٧) شامپۆی جێلّ Gel.

٨) شامپۆی هەویر Paste یان کرێم.

٩) شامپۆی وشك Dry: بێ ئاو کاریگەرە، بۆ نموونە بنچینەکەی بۆدرەی نیشاستەی یان تالکی تێدایە و چەوری لە مووی سەر لادەبات و دوایی قژ شانە دەکرێت.

١٠) شامپۆی چارەسەری Therapeutic: هەندێك دەرمان لە ناو شامپۆدا بەکاردێن وەك گاما بەنزین هێکساکلۆراید بۆ رشکی سەر یان پێرمیثرین permethrin – تاد.

**دوا شامپۆ (لەبارکەر)** Hair conditioner (after shampoo): بەرهەمێکی گرنگیپێدانی قژە بۆ گۆڕینی پێکهاتە (ناوەرۆکی) و رووالەتی موو وەك ئاسانکاری بۆ مامەڵەکردنی قژ، ئاسانتر شانەکردنی قژی وشك و تەڕ، لابردنی بارگەی کارەبایی قژ، جوانی قژ، دەرخستنی بریقە و پڕی قژ.

مژادی لەبارکەر ئەمانەن:

تەڕکەر، موو بەهێزکەر ، ترشکەر (بۆ ئەوەی pH ٢,٥-٣,٥ بێت) بۆ توندکردنی رووکەشی موو، دژەئالۆسکان، پارێزەری دژەگەرمی لە کاتی بەکارهێنانی ئوتوی قژ و قژ وشککەرەوە یان لوولکردنی گەرم، خۆردەرەوە reflectants، رۆن بۆ نەرمکردنەوەی قژ، وەسەرخەر surfactants، لووسکەر، جیاکەرەوە sequestrants بۆ ئەوەی بە تەڕبوون موو تێك نەچێت، هۆکاری دژی نەجوولانی موو و پارێزەرەکان preservative وەك ترشی سترێك citric acid بۆ ترشکردنی موو.

چوار جۆر لەبارکەر هەن:

١- جۆری کۆك Pack: ئەستوور و چڕە و کاژی رووی موو بەیەکەوە دەلکێنێت و بۆ ماوەیەکی درێژتر بە قژەوە دەمێنێتەوە، چونکە چینی ئەستوور لەسەر مووەکان دروست دەکات.

٢- جۆری جێهێڵ Leave-in: چینێکی تەنك لەسەر رووی موو جێ دەهێڵێت.

٣- جۆری ئاسایی Ordinary: تێکەڵەی ئەم دوو جۆرەی سەرەوەن.

٤- جۆری راگر Hold: شێوەی قژ بە ئارەزووی بەکارهێن رادەگرێت و هەروەك جێڵی شلکراوە وایە.

## جێڵ (بریقێن) Brilliantines

هۆکارێکی ئارایشتی قژە بۆ راگرتن و بریقاندنی قژی سەر. جێڵی سەر لە ئاو و پۆلیمەرەکان polymers (وەك پلاستیك، بۆن، هۆکاری بریقێن و رەنگ) پێکدێت. ئەم پۆلیمەرانە جەمسەری پۆزەتیڤیان هەیە کە دەبێتە هۆی کشانی جێڵەکە و لینجکردنی و بەرهەڵستی رۆیشتنی توێنەرەوەکان بە دەوریدا دەکات و جێڵەکە بە ترشە ئەمینیەکانی کیراتینی موو (کە

بارگەی نێگەتیڤی هەیە ) دەبەستێتەوە. دوای لێدانی جێڵ ئاوەکەی ناوی دەبێت بە هەڵم و چینێکی تەنکی کەتیرەیی جێڵەکە بەسەر مووەکان دەمێنێتەوە و مووەکان بەیەکەوە دەلکێنێت.
چەند جۆرێکی هەیە.

١- بریقێنی رەق: وەك :جێڵی ڤازیلین + مێوی پارافین + رەنگ و بۆن یان رۆن گرچەك + رۆنی بادام + ئایزۆپرۆپیل میریستەیت + ڤازیلین + لانۆلینی وشك + ئەلکوهول.

٢- چەوری نیورەقی نائاوی: وەك رۆنی گوێزی هیندی (لە رابووردوودا بەکاردەهات).

٣- بریقێنی شلە: وەك: رۆنی کانزایی سووك + نەوتی بۆن لابراو + رەنگ و بۆن. یان ئایزۆپرۆپیل میریستەیت + لانۆلین + رۆنی کانزایی سووك + بۆن و رەنگ.

٤- بریقێنی ئەلکوهولی: وەك: رۆن گرچەك + ئەلکوهولی پیشەسازی + بۆن و رەنگ یان ئایزۆپرۆپیل میریستەیت + ئەلکوهولی سیتایل + ئەلکوهول + بۆن و رەنگ.

٥- گچکەجێڵ micro-gel: روونە و کەمتر چەورە، وەك:
سۆربیتان مۆنۆلۆرەیت + پوختەی نەوتی سووکی بۆن لابراو + رۆنی کانزایی سووك.

٦- جێڵی راستی true-gels: کە بریتییە لە پۆلیئەثیلین گلایکۆلی ئاوی + ئەستوورکەری سلیلۆزی.

## بۆیەی قــژ Hair dyes

بەکاردێت بۆ گێڕانەوەی مووی سپی بۆ رەنگی ئاسایی یان بۆ گۆڕینی رەنگی موو بۆ رەنگی خواستراو یان بۆ گێڕانەوەی رەنگی ئاسایی دوای رەنگ گۆڕانی موو بە مژادی کیمیکی.

**جۆرەکان:**

١- **بۆیەی کاتی** Temporary: بە شێوەی شامپۆ، تێهەڵسوو، جێڵ، پرژە یان کەف بەکاردێت. ئەم جۆرە لە جۆرەکانی تر روونترە و گەردەکانی گەورەن و بە رووی مووەوە دەلکێن، بەڵام قەدی موو نابڕن، بۆیە بە یەك جار شۆردن لادەچێت. مژادەکانی بریتین لە بۆیەی تفتی، ئیندۆلامین، ئیندۆفینۆنەکان، ئازۆ، ئازین و دارێژراوی ئایازین. زیانیان نییە.

٢- **بۆیەی پەرەسێن** Progressive (بۆیەی کانزایی Metallic dyes): پیاوان بەکاری دەهێنن و بریتین لە خوێی کانزایی وەك ئەسیتەیتی قورقوشم lead acetate، نەتراتی زیو و خوێی بزمۆث. لەم جۆرەدا ئەم کانزایانە قەدی موو نابڕن، بەڵام کارلێککردن لەگەڵ گۆگردی کیراتینی موو دەکەن یان ئۆکسان روودەدات و جاربەجار بە چینی ئەستوورتر لە سەر قەدی موو دەنیشن و بە ئاو لاناچن. پتر رەنگی خۆڵەمێشی، زەرد، قاوەیی – تاد دروست دەکەن، لەوانەیە قورقوشم زیانبەخش بێت.

٣- **بۆیەی نیمچەهەمیشەیی** Semi-permanent dyes: ئەم جۆرە گەردەکەی لە جۆری کاتی بچووکترە، بۆیە توێکڵی موو دەبڕێت و پێویستی بە پەرەسێن developer کە پیرۆکسیدی هایدرۆجینە $H_2O_2$ نییە و بە یەك سەرشۆردنی شامپۆ کە ئامۆنیای تێدابێت لادەچێت،بەڵام بە شامپۆی ئاسایی ٦-١٠ کەڕەت سەرشۆردنی پێویستە. بەم جۆرە،قژ کاڵتر لەخۆی، بۆیە ناکرێت. هەروەها لە جۆری هەمیشەیی بێ زیانترە و بە شامپۆش بەکاردێت.

مژادەکانی بریتین لە داڕێژراوی (لێوەرگیراوی) نایترۆئەنیلین، نایترۆفەنیلین دایئەمین و نایترۆئەمینۆفینۆڵەکان.

٤- **بۆیەی نیوە-هەمیشەیی** Demi-permanent dye: هەر وەك جۆری هەمیشەییە ، بەڵام لەجیاتی ئامۆنیا مژادی تفتی وەك ئیثانۆڵ ئەمین یان کاربۆناتی سۆدیۆمی تێدایە، بەڵام پەرەسێنی بە چڕیەکی کەمتر لەگەڵ بەکاردەهێنرێت و بۆ لابردنی ٢٠-٢٨ شۆردنی پێویستە، ئەم جۆرە ئاسایی تر لە جۆری هەمیشەیی بۆیەی قژ دەکات و بێ زیانتریشە.

٥- **جۆری هەمیشەیی** Permanent dye: ئەم جۆرە ئامۆنیا و پەرەسێنی تێدایە. گەردەکانی بچووکن و توێکڵی موو دەبڕێت و میلانینی موو دەشکێنێت و ڕەنگی بۆیەکە جێگەی دەگرێت. بە ئاو لاناچێت بەڵام لەوانەیە لەگەڵ کاتدا کاڵتر بێت. نابێت لە ٢-٣ حەفتە جارێك پتر بەکاربهێنرێت.

مژادی پارافەنیلین دایئەمین para-phenylene diamine یان پارا ئەماینۆفینۆڵ p-aminophenol لەگەڵ پیرۆکسیدی هایدرۆجین کارلێك دەکەن و دیسان لەگەڵ زۆر لە جووتکەرەکان couplers وەك ریزۆرسین resorcin و پۆلیهایدریك فینۆڵ polyhidric phenols کارلێك دەکەن بۆ دروستکردنی جۆرەها ڕەنگ.

ئەم جۆرە لە ١٠٪ی خەڵکیدا هەستیاری (جۆری ٤) دروست دەکات و هەندێك جاریش ورووژان و شکانی موو دروست دەکات. هەندێك جار پێستەسۆی درێژخایەن یان بەڵەکی یان لیردەرکردن و دارمانی سەراپایی دروست دەکات.

شێرپەنجەی خوێن و لیمفۆما ئەگەری دوورن، بەڵام کەمێك لە زانایان پێیان وایە ئەم ئەگەرە هەیە.

٦- **بۆیەی رووەکی** Vegetable dyes: وەك:

أ) خەنە Henna : ڕەنگی سوور دروست دەکات، مژادە چالاکەکەی بریتییە لە لۆسۆن lawsone (نەفثۆکوینۆنی ترش acidic naphthoquinone) کە بە کیراتینی مووەوە دەلکێت و نیمچە هەمیشەییە (بە شۆردن لە ٢ مانگدا لادەچێت) یان هەمیشەییە بەپێی جۆری موو، بەڵام بە لێدانی دووەم جار هەر هەمیشەییە. چونکە ڕەنگی سوورە بۆیە بۆیەی تری ڕووەکی یان دەستکردی لەگەڵ تێکەڵ دەکرێت بۆ دروستکردنی ڕەنگی خواستوو. شۆرەی

خەنە henna rinses بریتییە لە تێکەڵەی خەنە و پاودەری ئیندیگۆ indigo بۆ دروستکردنی چەندین رەنگی شین بۆ رەش.

ب) سەری گوڵی بەیبوونی Chamomile هاڕاو، مژادی ئەپیگمێنینی apigmenin تێدایە و قژ کاڵتر و بریقەدارتر دەکات و کاتییە.

ج) توێکڵی گوێز Walnut shell.

د) درەختی (البَقّم Logwood) ، بۆ ئەوانەی هەستیارن بە بۆیەی ئاسایی.

## قژ مێشکردن Bleaches

شلەی پیرۆکسیدی هایدرۆجین ٦٪ لەگەڵ ئامۆنیا بەکاردێت بۆ ئۆکسانی میلانین بۆ کاڵترکردنی موو بۆ سوور، زەرد و رەنگی پلاتینی.

بۆ موو زیانبەخشە ، لەبەر ئەوە باشتر وایە پێشتر قژ شەپۆل waving بکرێت.

کاردانەوەی هەستیاری جۆری ١ و ٤ لەوانەیە رووبدات.

## قژ شەپۆلکردن waving

واتا گۆڕینی شێوەی قژ، سێ قۆناغە:

أ) نەرمکردنەوە ب) شێوەگۆڕین ج) راگرتن (رەقکردنەوە).

زیانی موو، ورووژانی پێست و هەستیارکردن هەندێك جار روودەدەن.

## بۆیەی نینۆك Nail polish

بنچینە base و بەرگی سەرەوە top-coat ی تێدایە.

لەوانەیە کاردانەوەی هەستیاری رووبدات ، بەڵام زۆرجار دەموچاو و پێڵوو و لاکانی مل و دەوری دەم دەگرێتەوە و هەندێك جار دەست و پەنجەکان بێ سکاڵان.

# سەرچاوەکان

Fitzpatrick's Color Atlas and Synopsis of Clinical Dermatology: Sixth Edition by Klaus Wolff and Richard Johnson

Handbook of Dermatology: A Practical Manual by Margaret W. Mann, David R. Berk, Daniel L. Popkin, and Susan J. Bayliss

Clinical Dermatology: Expert Consult by Thomas P. Habif

Clinical Dermatology: A Color Guide to Diagnosis and Therapy by Thomas P. Habif

Dermatology Secrets in Color: by James E. Fitzpatrick and Joseph G. Morelli

Cosmetic Dermatology: Principles and Practice, Second Edition by Leslie Baumann

Andrews' Diseases of the Skin: Clinical Dermatology by William D. James MD, Timothy Berger MD, and Dirk MD Elston MD

Fitzpatrick's Dermatology in General Medicine by Klaus Wolff, Lowell Goldsmith, Stephen Katz, and Barbara Gilchrest

Rook's Textbook of Dermatology by Tony Burns, Stephen Breathnach, Neil Cox, and Christopher Griffiths

Color Textbook of Pediatric Dermatology by William L. Weston, Alfred T. Lane, and Joseph G. Morelli

Color Atlas of Cosmetic Dermatology: A Medical and Surgical Reference by Marc Avram, Sandy Tsao, Zeina Tannous, and Matthew Avram

Atlas of Clinical Dermatology by Anthony Du Vivier

Color Atlas and Synopsis of Pediatric Dermatology: Second Edition by Kay Kane, Peter Lio, Alexander Stratigos, and Richard Johnson

Comprehensive Dermatologic Drug Therapy by Charles Camisa

Skin Disease: Diagnosis and Treatment by Thomas Habif

Genital Dermatology Atlas by Libby Edwards and Peter J Lynch

Manual of Dermatologic Therapeutics with Essential Diagnosis by Kenneth A Arndt

Pocket Color Atlas of Dermatology by Joseph Kimmig and Michael Janner

Clinical Dermatology: An Illustrated Textbook by Rona M. MacKie

Treatment of Skin Disease by Mark G Lebwohl, Warren R Heymann, John Berth-Jones and Ian Coulson

Clinical Dermatology by John Hunter, John Savin, and Mark Dahl

A Colour Atlas of Dermatology by G. M. Levene and C. D. Calnan

A Colour Atlas of Venereology by Anthony Wisdom

## سەرچاوەکانی وەرگێڕان بۆ کوردی

هەنبانە بورینە – هەژار

فەرهەنگی دوانەی ئۆکسفۆرد – سەلام ناوخۆش

فەرهەنگی هەڵۆی زانستی – د. هیوا عمر أحمد

فەرهەنگی ژیر – رزگار کەریم

المورد – منیر البعلبکی

Students Medical Dictionary – Dr. Hiwa Omer Ahmed

Dorland's Pocket Medical Dictionary

English Reader's Dictionary by A. S. Hornby and E. C. Parnwell

# ناوەرۆك

